# ژیان و نهێنییەکانی

# نەوشیروان مستەفا



ئامادەکردنی:

مستەفا

چەند جارێکەو لەچەند موناسەبەتێك دا مەلا بەختیار لەلایەك و ئەرسەلان بایز لەلایەکی ترەوە باسی ئەوە ئەکەن کە گوایە:

ئەوان پارەیان داوە بە من.

پارەیان نەداوە بە من تا دژی یەکێتی بەکاری بهێنم.

پارە و ئەرزیان داومەتێ بۆ ئەوەی سەنتەری زانستی دابمەزرێنم، نەك ڕۆژنامە و تەلەفیزۆن.

بۆ ئەوەی بەر چاوی کادرەکانی یەکێتی و ڕای گشتی ڕونتر بێت و، خوێندەوار و گوێگر بە هەڵەدا نەچن بە چاکی ئەزانم ئەم چەند نوقتەیە ڕون بکەمەوە:

یەکەم: کۆمپانیای وشە نە "مەڵبەندی ڕێکخستن" ە تا سەر بە مەکتەبی ڕێکخستنی ئەرسەلان بایز بێت و نە "ڕێکخراوی دیموکراتی جەماوەری" یە تا سەر بە مەکتەبی ڕێکخراوە دیموکراتیەکانی مەلا بەختیار بێت، تاوەکو ئەوەی موچە و میزانیە لەوان وەربگرێت. نە من و نە هاوکارەکانم بۆ دامەزراندنی کۆمپانیای وشە و داودەزگاکانی موچە و پارە و ئەرزمان لەم دو زاتە وەرنەگرتوە، دامەزراوەکانی ئێمە دەسندەخۆری ئەوان نین، بۆیە ئیدیعاکانیان بێ بناغەو نا ڕاستە و هەرچیەك ئەڵێن قسەی خۆیانە.

دوەم: من یەکێك بوم لە دامەزرێنەرە سەرەکیەکانی یەکێتیی نیشتمانی کوردستان و هێزی پێشمەرگە و هەمو داوودەزگا دارایی و ڕێکخراوەیی و ڕاگەیاندنەکانی، بەشدارێکی سەرەکی بوم لە رابردوی یەکێتی و لە دروستکردنی ئێستای یەکێتی دا، بە هەمو لایەنە سەلبی و ئیجابیەکانیەوە، من هەروەکو شەریکم لە هەڵگرتنی ئۆباڵی مێژویی هەمو سەرکەوتن و دەسکەوت و شکستەکانی یەکێتی‌دا، هەروەها شەریکم لە هەمو سەروەت و سامان و دارایی یەکێتی دا، کەس بۆی نیە منەت بەسەر مندا بکات.

سێیەم: لەسەرەتای دامەزراندنی کۆمپانیای وشەوە تا ئێستا زیاتر لە ١٠ جار و لە تایبەتی ئاشکرادا بە سوپاسەوە ئیشارەتم داوە بەو هاوکاریەی مام جەلال کردوینی، هەر بۆ نمونە:

١. لە یەکەم چاوپێکەوتن دا دوای دەس لە کار کێشانەوەم، لەگەل هەفتەنامەی هاولاتی.

٢. لە پەیامی سبەی دا، کە تا ئێستەش لەسەر سایتەکە ماوە.

٣. لە یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەدا باسی کراوە.

٤. لە گفتوگۆی ڕۆژنامەوانی دا لە گەڵ نوسەری ناسراوی فەرەنسی کریس کۆچێرا.

هاوکاری مام جەلال بۆ ئێمە (١٠) دە ملیۆن دۆلار و بینایەکی حکومەت و گردێکی موڵکی کۆمپانیای نۆکان بوە ئەوەش یەکەم هاوکاری و دوا هاوکاری مام جەلال بوە بۆ ئێمە و، هەمو ئەوانەش بە ناوی کۆمپانیای وشەوە تۆمار کراون کە شەخسیەتێکی مەعنەوی و قانونیە. ئەمەشمان ئەوەندە وتۆتەوە کە خەریکە نرخی سیاسی و مەعنەوی هاوکاریەکە نامێنێ.

چوارەم: "کۆمپانیای وشە بۆ ڕاگەیاندن" وەکو لە سەرەتاوە "گرێبەستی دامەزراندنی" دا نوسیومانە، ڕاگەیاندنێکی "بینراو و بیستراو و نوسراو" ئەبێ. بۆیە بە هەقی خۆمانی ئەزانین چۆن دەزگای ڕاگەیاندنی حیزبەکان بە پارەی حکومەت و لە دارایی گشتی و لە سەر بودجەی میللەت ئەژین، یان بودجەی ئەوانیش ببڕن و بۆ ژیانی دەزگاکانیان با پشت بە خۆیان ببەستن بۆ ئەوەی ئێمەش هەمان ڕێگە بگرین، یان ئەبێ حکومەت لە دارایی گشتی بودجەی ئێمەش دابین بکات، ئەگینا ((بانێك و دو هەوا)) قبوڵ ناکرێ. هەروەها چەند جارێکە باسی ئەوە ئەکەن کە من بەپێی ئەو ڕێککەوتنەی لەگەڵ ئەوانـدا کردومە بۆم نییە ڕۆژنامە دەر بکەم و تەلەفزیۆن دابمەزرێنم، بەڵکو بۆم هەیە سەنتەرێکی لێکۆڵینەوەی زانستی دابمەزرێنم.

نەمەوقسانەش وەکو ئەوانەی پێشو بێ بناغە و ناڕاستن.
یەکەم، هیچ گرێبەست یان ڕێککەوتنێکی نوسراو یا زارەکی لە بەینی من و ئەو دو برادەرەدا و لە بەینی من و هیچ ئەندامێکی تری مەکتەبی سیاسی دا نیە تا من پابەندی بم و یان مەرجەکانیم پێڕەوی نەکردبێ.
دوەم، من کە دەستم لە کار کێشاوەتەوە و خواحافیزیم لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی کردوە لەبەر ئەوە نەبوە کەمن تۆراوم یان توڕە بوم، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو، من لەسەر چەند مەسەلەی چارەنوسساز ناکۆکی سیاسیم لەگەڵیان هەبوە. بەتایبەت لەشێوەی بەڕێوەبردنی یەکێتی نیشتیمانی و حکومەتەکەیدا.
سێ یەم، ئەگەر یەکێ خۆی نەبان نەکا ئەزانێ ناکۆکی سیاسی من لەگەڵ ئەو برادەرانەدا لە چەند دیکۆمێنتی نوسراودا بلاوکراوەتەوە:
١- ئەو یاداشتەی بەهاوکاری چەند ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی داومانە بە سکرتێری گشتی.

٢- ئەو بەرنامەیەی کە بەر لە هەڵبژاردن خراوەتە بەردەم م.س و لە سنورێکی فراواندا بلاوکراوەتەوە.

٣- لە پەیامی سبەی دا.

ئەمانە جگە لەو چەند چاوپێکەوتنەی لەگەڵ دەزگاکانی ڕاگەیاندنی کوردی و عەرەبی و ئەوروپی دا کراوە و لە چەند کۆڕی تەلەفیزیۆنی تر باسکراوە، لەماوەی چەند مانگی رابردودا بە وتار لە سایتی سبەی و ڕۆژنامەی ڕۆژنامەدا بڵاوکراوەتەوە.
سێیەم، لەو ڕۆژەی کە دەستم لە کار کێشاوەتەوە و بەبێ شاردنەوە باسم لەوە کردوە کە ئێمە کۆمپانیایەك بۆ ڕاگەیاندنی نوسراو، بیستراو، بینراو، دادەمەزرێنین. لە گرێبەستی دامەزراندنی کۆمپانیای وشەدا ئەوە بە ئاشکرا نوسراوە، لە ەەمو چاوپێکەوتنە ڕۆژنامەوانییەکانیشم دا دوبارەم کردۆتەوە.

بەختیار و ئەرسەلان بایز خۆیان ئازادن چۆن بەرنامەی مەکتەبەکانی خۆیان دائەنێن و ن ئەکەن، بەڵام ناتوانن بەرنامە بەسەر ئێمەدا بسەپێنن، ئێمەش ئازادین بەرنامەی کاری خۆمـــــــــــان چـــــــــــۆن دائـــــــــــەنـــــــــــێین.

چوارەم، یەکێتی زیاتر لە ١٠ ساڵە سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی هەیە، ئەگەر ئـەم برادەرانە هێندە بە پەرۆشی لێکـۆڵینـەوەی زانـستی و سـتراتیجییەوەن بـا پـێش ئـەوەی چاوەڕوانی بەرهەمەکانی ئێمە بن گوێ لە هەڵسانگاندن و لێکۆڵینەوەکانی ئەوان بگرن و ئـــــــەو دەزگـــــــا گرنگـــــــە کـــــــارا بکـــــــەن.

پێنجەم، لە چوارچێوەی ئەو بەرنامەیەی بۆ کارەکانی خۆمان دامان ناوە تائێستا توانیمانە سایتی سبەی، رۆژنامەی رۆژنامە، سەنتەری راپرسی، چاپخانەی زەرگەتە دابمەزرێنین، بەم نزیکانە تەلەفیزیۆنی سەتەلایت ئـەکـەوێتـە کـارو، بـەوپـواین تاکۆتـایی سـاڵ دەزگـای لێکۆڵینەوەش دابمەزرێنین.

نوسین و ڕەخنەودیداری گۆڤارەکان

لەژێر کاریگەریی مام جەلالدا یەکێتی تەنازولی گەورەی بۆ پارتی کردووە

قادری حاجی عـەلی، ئەنـدامی ئەنجومـەنی کۆمپانیـای وشـەو کـارگێڕی پێـشووی مەکتەبی سیاسی یەکێتی لـەسەر کێشە سیاسـییەکانی نـاوخۆی کوردسـتان وەڵامـی پرسیارەکانی لڤین دەداتەوە

لڤین گفتوگۆی سۆران پالانی و گۆران دوکانی

لڤین: هۆکاری دەست لەکارکێشانەوەی تۆ لەمەکتەبی سیاسی چ بوو؟ دەڵێن بەهۆی ئەوەوە بوو کە د.بەرهەم کرا بەسەرۆکی حکومەت و ئەو پۆستە بەتۆ نەدرا؟ ئەمە تاچەندە حەقیقەتە؟

قادری حاجی عەلی: هیچ حەقیقەتێکی تێدا نییە، کاتێك من دەستم لەکار کێشایەوە، د.بەرهەم نەگەڕابووەوەو پەیوەندیی بەبوونی د.بەرهەم بەسەرۆکی حکومەتەوە نییە، دووەم، من هەرگیز بەتەمای پۆستی سەرۆك وەزیران نەبووم، من هەرگیز کاری حکومەتم نەکردووە، من پێمخۆش بوو کەهەمیشە کاری حیزبی بکەم، بۆیە ئەساسی نییە.

لڤینك دەوترێت جەنگێکی سارد لەنێوان هەردووکتاندا هەیە لەسەر ئەوەی کامتان ڕەمزی شاری سلێمانین؟

قادری حاجی عەلی: خۆم موقارەنە ناکەم لەگەڵ کەسی تردا.

لڤین: ئەی هۆکارەکانی دەستلەکارکێشانەوەت چی بوو؟

قادری حاجی عەلی: من لەساڵی (٢٠٠١٩ دەستم لەکار کێشایەوە، هەروەها لەساڵی (١٩٩٥) جارێکی تر دەستم لەکار کێشایەوەو چوومە دەرەوە بۆ سوید، کاتێك مام جەلال هاتە دەرەوە، چەند جارێك ئاگاداری کردم کەبێمەوەو کار بکەمەوە، ئاخر جار منی بانگکرد بۆ فەرەنساو لەماڵی کاك حەمە سابیر دانیشتین بەحزووری مام جەلال و ئەحمەدی بامەرنی و کاك حەمەتۆفیق، کارێکی وایان کرد کەقەناعەتیان پێهێنام جارێکی تر کار بکەمەوە، بۆیە بووم بەبەرپرسی یەکێتی لەدەرەوەی وڵات، من پێموابێت ئەساسی شتەکان ڕای جیاوازە کەخەڵك واز دەهێنێت، کە لەئاستێکی بەرزدایت و دەزانیت کە بۆچوونەکانت لەبەرچاو ناگیرێن، گوێت لێناگیرێت و ئەوەی دەتەوێت، ناکرێت. لەبەرئەوە ئەزعەفل ئیمان ئەوەیە کەخۆتی لێ بکشێنیتەوە، بۆئەوەی بەرپرس نەبێت لەو خراپانەی کەڕوودەدەن.

یەکەم کەس بووم دەستم لەکار کێشایەوە کەکارگێڕی مەکتەبی سیاسی بووم،

بۆ کارەکانی هەموو کەسیش پێش من دەیانزانی، تا ساڵ (١٩٩٧) ئەوەی کەمن بینیم دەکرد، ئەندامی مەکتەبی سیاسی لەناو یەکێتیی نیشتمانیی بەرپرسیارێتییەکی گەورەو شەخسییەتێکی گەورە بوو، بەڵام وردەوردە دەوری مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەیت کاڵبووەوەو رۆڵیان نەما لەسیاسەتی گشتیی یەکێتیدا، لەبەرئەوە هەموو کەسێکیش کەبزانێت رۆڵی نامێنێت لەسیاسەتی گشتیدا، خەڵك چاوەڕێی شتی گەورەی لێدەکات و بزانێت بۆ ناکرێت، لەمپەری گەورە لەبەردەمیدا هەیە، دەبێت حیسابی ئەوە بکەیت لەو کاتەدا کەسایەتیت دەشکێت و نامێنێت. بۆیە پارێزگاریی لەکەسایەتیت ئەوەیە، کارێك دەکەیت کەتەکەتول بۆخۆت دروست بکەیت، کەمن بڕوام بەوە نەبوو، یان دەست لەکار دەکێشیتەوە، بۆئەوەی بەشداریی نەبێت لەو شتانەی کەدەکرێت.

لڤین: بەڵام ئێستا تۆ هاتوویتەتەوەو جارێکی تر لەگەڵ نەوشیروان مستەفاو هاوڕێیاندا دەتەوێت بەشداریی ئەو ململانێیە بکەیت؟

قادری حاجی عەلی: من نەچوومەتەوە بۆ ناو یەکێتی بۆ مەئسولیەت، هاتوومەتەوە بۆ سیاسەت، هەمیشەش کە لەدەرەوە بووم، بۆچوونم هەبووە، چەند جارێك جەنابی مام جەلال لەسلێمان و بەغدا منی بانگ کردووەو رای خۆم بەڕاشکاوی پێوتووەو ئەو حاڵەتەی کە لەناو یەکێتی و خەڵك هەیە، راستیم پێوتووە. ئەو پێشنیارانەشی کەپێموتووە، بەباشی زانیوەو بەڵێنی داوە کەجێبەجێی بکات، بەڵام بەداخەوە نەکرا، لەم قۆناغەدا منیش حەزم لەگۆڕانەو یەکێکم لەوانەی کەدەمەوێت گۆڕانکاریی لەکۆمەڵگەکەدا دروست ببێت.

لڤین: تۆ وەکو هاوڕێی نەوشیروان مستەفا، دەتەوێ هاوکارێکی ببیت، یان بەشێکیت لەم دەزگایە کەدایمەزراندووە؟

قادری حاجی عەلی: لەسەرەتادا کەدامەزرا، من کاری باشم تێداکرد، هەم سایتەکەو هەم رۆژنامەکەش خۆم دامەزراندووە کارم تێداکرد، دوای ئەوەش کەپێویستی بەمن نەما، دەستبەرداری بووم، هەروەها لەتەلەفزیۆنەکەش رۆڵم

هەبوو، من لەسەرەتادا هەر بۆچوونم لەسەر شتەکان دەدا، بەڵام ئێستا بەشێکم لەو بڕوای گۆڕان و باوەڕیشم هەیە کەدەتوانین گۆڕانکاریی بکەین.
ڕەنگە پێشبینی من وانەبووبێت کەئەم ڕەوتە بەم ئاقارە گەورەیەدا بڕوات، بەڵام لەیەکەم ڕۆژی هەڵمەتی هەڵبژاردنەوە بەنیسبەت منەوە لەوانەیەی هەندێك موفاجەئەی تێدابێت، زیاد لەڕاددەی چاوەڕوانکراو، بوو بەبزووتنەوەیەکی جەماوەریی گەورە.

لڤین: پێشبینی ئەمەتان دەکرد؟

قادری حاجی عەلی: پێشبینی دەکرا، بەڵام بەو ئەندازەیە نا.

لڤین: ئێوە پێشبینی ئەمەتان نەدەکرد، ئێستا لەم هەڵمەتی هەڵبژاردنەدا چۆن توانیوتانە ئەمانە ڕێکبخەن، کەئێوە دەڵێن بزووتنەوەیەکی جەماوەرییە؟

قادری حاجی عەلی: ئەوەی ڕاستی بێت، ڕەوتەکە لەپڕێکدا وەکو تەقینەوەیەك تەقییەوە ئێمە پێشبینیمان دەکرد خەڵك نارازییە، بەگشتی لەسیستمەکەو لەگەندەڵی و نەبوونی عەدالەتی کۆمەڵایەتی، بەڵام پێشبینی ئەوەم نەدەکرد هۆشیاری گەیشتبێتە ڕاددەیەك، کەخەڵك لەئێمە شتەکان زیاتر لێکدەدەنەوەو بیزانن و بەهەوڵێکی کەم بتوانێت، قەناعەتی پێبکەیت، بۆئەوەی دەسەڵاتمان بەسەریدا هەبێت، ئەوەندە توانا هەیە لەڕەوتی گۆڕاندا کەبتوانین سەرپەرشتی بکەین، خەڵکیش زۆر هاوکارەو گوێ دەگرێت، ئەم ڕەوتەش لەبەرئەوەی جەماوەرییە، هەندێك جاریش گوێگرتنی تێدا نابێت، بەتایبەت ئەو خەڵکەی لەگەڵ ئەم ڕەوتەدایە، لە (٧٠٪)ی گەنجن و ئیلتیزامی حیزبییان نەبووەو تووڕەشن، زۆربەشیان لەوانەن کەبێکارن و ئینتیمایان لاواز بووە بەرامبەر نیشتمان و وڵات، بەڵام لەدەروونیاندا ئینتمایەکی بەهێز هەیە کە بەهەر
ئەو خەڵکەی لەگەڵ ئەم ڕەوتەدایە، لە (٧٠٪ی گەنجن و ئیلتزامی حیزبییان نەبووەو تووڕەشن
وەسیلەیەك بێت، ئەو ئینتیمایە بهێنێتە کایەوە.

لڤین: ئێوە لەدەرەوەی یەکێتین و تائێستاش ناڵێن یەکێتی نین، بەبەرنامەش خەڵك لەریزەکانی یەکێتی دەهێننە دەرەوە، ئایا ئێوەش مەبەستی ئەوەتان نییە لەدەرەوەی ئەو حیزبە بەناوی ئەم رەوتەوە کار بۆ هەڵوەشانەوەی یەکێتی بکەن؟

قادری حاجی عەلی: ئەوانەی لەناو یەکێتییەوە هاتوون، بەشێکن لەلیستی گۆڕان و ئەم رەوتە، ئەمانە لەمەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی و لەخوارەوەش هەبوون و بۆچوون و رەخنەیان هەیە، سەرکردایەتی یەکێتی و ئەو برادەرانەی کەزۆربەمان لێرەین، ئەوانەین کەزۆربەمان رۆڵی بچینەییمان هەبووە، نەك ئەوانە بین ساڵێك لەرێکخستندا بووبین، یان لەو حیزبەدا هاتبینە دەرەوەو دژی کارمان کردبێت، من کەس لەخۆم بەیەکێتیتر نازانم، خۆم بەیەکێتی و یەکێتیش بەخۆم دەزانم.

لڤین: بەڵام دروستکردنی لیست لەدەرەوە، بەتەجاوزی پەیڕەوی ناوخۆ لەقەڵەم دەدرێت؟

قادری حاجی عەلی: ئەگەر بەتەجاوزیش حیساب بکرێت، بەڵام تۆ هیچ دەرەتانێك و تروسکاییەکیشت نەبێت، ناچاریت لەدەرەوەی حیزب دەستپێبکەیت کەبشزانیت لەدەرەوەی زەمینەیەکی زۆر فراوان و گەورەتر هەیە.

لڤین: بەڵام دەوترێت لەنەوشیروان مستەفاوە تا خوارەوە لەدەسەڵات بوون و تۆمەتی گەندەڵی و خراپی بارودۆخ بەشێکی دەخەنە ئەستۆی ئێوەش، ئەمە چۆنە؟

قادری حاجی عەلی: وانییە، راستە ئێمە مەسئولیەتمان هەبووە لەیەکێتیدا، بەڵام دەسەڵاتی گەورەمان نەبووە، من کارگێڕی مەکتەبی سیاسی بووم، دەسەڵاتی یەکێتی بەتایبەت لەم دواییانەدا، لای مام جەلال بووە، کاك نەوشیروانیش راستە کەسێکی بەهێز بووە لەناو مەکتەبی سیاسیدا، بەڵام ئەگەر حیساب بکەیت، بیروبۆچوون و قسەکانی پێموابێت نەڕۆیشتووە، لەپەنای ئەوەدا کەکۆمەڵێك مەکتەبی سیاسی هەبوون لەگەڵ مام جەلالدا بوون، لەڕاستیدا لەگەڵ چاکسازی و باشبووندا نەبوون، کاك نەوشیروان دەسەڵاتی هەبووە، بەڵام زۆرینە دەیخوات.

لڤین: بەڵام یەکێك لەکێشە سەرەکییەکان کەباسی لێوەدەکرێت، ئەوەیە کەیەکێتی

لەسەر ئاستی سیاسی لەکوردستاندا تەسلیم بەپارتی بووە، بۆیە نەوشیروان مستەفا ئەمەی قبوڵ نەکردووە، تۆ لەمبارەیەوە چی دەڵێیت؟

قادری حاجی عەلی: پێمان خۆش بوو هاوسەنگی لەنێوان یەکێتی و پارتیدا هەبێت، هەر لەساڵی (١٩٩٢) کەهەڵبژاردن بوو، هەوڵماندا هاوسەنگییەك رابگرین، بۆئەوەی بتوانین ئیدارەی کوردستان بکەین، بەڵام بەداخەوە لەم چەند ساڵەی دواییدان دەبینیت بێسنوور تەنازول بۆ پارتی دەکرێت و رەنگە زیاتریش یەکێتی کەتەنازول دەکات، لەژێر کاریگەریی جەنابی مام جەلالدا بێت، (ئیتر نازانم خۆی چۆن بیری لێدەکاتەوەو بارودۆخەکە هەڵدەسەنگێنێت)، بەڵام یەکێتی گەورەیەو خاوەنی جەماوەرو قارەمانێتییەو قوربانییدانە، پێویستە خەڵك دەنگی بێت لەمەدا، بەڵام لەمەیاندا گوێ لەئێمەو خەڵکی تریش نەگیرا، کەدەبێت یەکێتی کەسایەتی خۆی رابگرێت و بۆ هەموو شتێك تەنازول بۆ پارتی نەکات، کاتێك دەبێت بیکات، کەپارتیش لەبەرامبەردا بیکات، من پێمباشە تەنازول هەبێت، بەڵام نەك لەسەر حیسابی یەکێکیان، ئەگەر ئەو هاوسەنگییە بمایە، بارودۆخەکە باشتر ئیدارە دەکرا، بەڵام ئێستا هاوسەنگییەکە تێکچووە، زیاتر بەلای پارتیدا کەوتووە.

لڤین: بەڵام ئەوەی دەوترێت ئەم تەنازولە پەیوەندیی بەئێوەشەوە هەیە، وەکو ئەوەی کێشەکانی ناو یەکێتی کەیەکێك لەباڵەکان نەوشیروان مستەفا سەرکردایەتی کردبوو لەململانێدا بوون، واتە کێشە ناوخۆییەکان وایکردووە لەدەرەوە لاواز بن، بۆچوونت لەبارەی ئەم بابەتەوە چۆنە؟

قادری حاجی عەلی: ئەمە پێچەوانەکەی راستە، بوونی ئەو کێشەو ناکۆکییانە لەسەرەتای دروستبوونی یەکێتییەوە هەبووەو نهێنی بەهێزبوونی یەکێتی بووە، نەك لاوازی، بەڵام لەم کۆتاییانەدا تەکەتول بوو، ئەویش تەکەتولی ئیمتیازات، ئەمە یەکێتی کوشت، نەك کاك نەوشیروان، تەکەتولیش کەدروست بوو، پیاوی بێکەفائەت دەهێنێتە پێشەوە، بەڵام لەڕابردوودا تەکەتولەکان لەسەر فیکر بوون، نەك ئیمتیازات و پیاوپیاوێن.

لڤین: کەوابوو، هەندێك لەبەرپرسانی یەکێتی لەبەر ئیمتیازاتی خۆیان رازین بەتەسلیمبوونی یەکێتی بەپارتی؟

قادری حاجی عەلی: ئەوەی کەمن بیزانم، ئەو برادەرانە لەسەردەمی شۆڕشیشدا رۆڵێکی گرنگیان هەبووەو هیچیان بۆ ئیمتیازات کاریان نەکردووەو وەکو شتێکی ویژدانی، وەلائیان تەنها بۆ یەکێتی هەبووە نەك بۆ کەس، بۆیە نەیانتوانی جێگەی خۆشیان بکەنەوە.

لڤین: ئەی وەلائیان بۆ نەوشیروان مستەفا نەبووە؟

قادری جاجی عەلی: من دڵنیات دەکەمەوە، ئەوانە وەلائیان بۆ هیچ شەخسێك نییە (بەکاك نەوشیرانیشەوە) ئەوان خاوەنی کەسایەتی و رای خۆیانن و بەقەناعەت و رەزای خۆشیان هاتوون و ئەو

خەڵك هەیە ئێستا بەناوی یەکێتییەوە قسەدەکات و پۆزمان بەسەردا لێدەدات و پێماندەفرۆشێتەوە، هەر نەیزانیوە یەکێتی چییە؟

مامەڵەیەش لەلەگەڵ کاك نەوشیرواندا دەیکەن، ئەو مامەڵەیە نییە کە لەگەڵ مام جەلالدا دەیکەن، چۆن لەوێ بۆچوونیان هەبوو، لێرەش هەیانە، لەوانەیە لێرە گوێیان لێبگیرێت و لەشوێنێکی تر گوێیان لێنەگیرێت.

لڤین: لەقسەکانتدا، ئەوە دەردەکەوێت یەکێتی تەسلیم بەپارتی بووە، ئایا ئێوە دەتانەوێت لەدەرەوە کار بۆ گەرشانەویە ئەو یەکێتییە بکەن کەخۆتان دەتانەوێت؟

قادری حاجی عەلی: ئەوە بزووتنەوەیەکی جەماوەرییەو پەیوەندیی بەیەکێتییەوە نییە، پێمان ناخۆشە یەکێتی وایلێهاتووەو لاواز دەبێت، پێمان خۆش بوو یەکێتی هەمووومان کاری تێدا بکەین و بەهێزی بکەین، بەڵام تۆ لەحیزبێکدا وات لێبێت، بڕوات بەشێوەی ئیشکردن و تەرحەکانی ئەو حیزبە نەبێت، ناچاریت یان دەبێت مەوقیف وەربگریت یان لەکەناربیت، کێ پێیخۆشە یەکێتی لاواز بێت؟ ئێمە خۆمان پێمان ناخۆشە، ئێمە خاوەنی یەکێتی بووین، خەڵك هەیە ئێستا بەناوی یەکێتییەوە قسەدەکات، پۆزمان بەسەردا لێدەدات و پێماندەفرۆشێتەوە نەیزانیوە یەکێتی چییە.

لڤین: بەلاّم بۆچونێك لەسەركردایەیت بالّی ریفۆرم هەیە، كەئەگەر هاتو گۆڕان زۆربەی دەنگەكانی بەدەستهێنا، ئەوا ئەوان خاوەنی راستەقینەی یەكێتین؟

قادری حاجی عەلی: ئەوە بۆچوونی خۆیانە ئەوان بەشێكن لەڕەوتی گۆڕان، لەوانەیە شەخس هەبێت بۆچوونی وابێت، بەلاّم بۆچوونی گشتی ئەم بۆچوونە نییەو ئێستاش هەموو تەركیزمان لەسەر هەلّبژاردنە.

لڤین: ئایا ئێوە دوای هەلّبژاردن دەتانەوێت وەكو ڕەوتێكی سیاسی میللی بمێننەوە، یان ببنە حیزبێكی سیاسی؟

قادری حاجی عەلی: هێشتا زووە كەباس لەوە بكەین، دوای ئەنجامی هەلّبژاردن پێویستی بەدیراسەیەكی قوولّ هەیە.

لڤین: هەلّمەتی هەلّبژارد هەندێك توندووتیژیی بەخۆوە بینی، هەردوولا یەكتریان تۆمەتبار كرد، ئایا ئێوە هیچ پلانێكتان هەبووە بۆ ئەو گەنجانە بێنە سەر شەقام، هەروەها دەشوترێت هاتنی ئەو گەنجانە وەكو ئەوەیە هێزی خۆتان نیشانبدەن؟

قادری حاجی عەلی: ئەگەر تێبینی بكەیت، لەیەكەم ڕۆژەوە تائێستا پێموابێت، سێ ڕۆژە سەرەتای زۆر گەرمتر بوو، خەلّك دەچووە سەر شەقام و ئێمە بەخەلّكیشمان نەوتبوو، بەلاّم لەدوای ئەوەوە تەوجیهاتمان دانێ و ڕێكمانخستن، ئەو كێشانە لەئاكامی ئەوەیە، كەبەرامبەرەكەت قبوولّی ناكات، هەندێك بەرپرس هەیە قبوولّی ناكات لەسەر شەقامێك وا (٣٠٠) سەیارە ئالاّی گۆڕانی هەلّگرتووەو هی ئەو (١٠) سەیارەیە، ڕەنگە بۆ ئەو قبولّ نەكرێت، كەتائێستا بكوژرو ببڕ خۆی بووە، ژیان و ئیمتیازاتی باشی هەیە، ڕەنگە وابیربكاتەوە كەئەمەی لێ تێكدەچێت.

لڤین: سەبارەت بەو هێرشانەی كە لەلایەن ڕاگەیاندنەكانی پارتییەوە دەكرێتە سەرتان، وەلاّمیان نادەنەوەو كێشەكانتان زیاتر لەگەلّ یەكێتیدایە، هۆكاری ئەمە چییە؟

قادری حاجی عەلی: باوەڕ ناكەم وابێت و ئەوەی بەپێویستمان زانیبێت، بەلاّمان داوەتەوەو هەندێك شتیش پێویستی بەوەلاّم نییە، ئەوانەی كەسیاسیین، هەر لایەنێك

بێت بەبەرنامە وەڵاممان داونەتەوە.

لڤین: سەبارەت بەدەستوور زۆر شت لەسەر ئێوە وترا، کەپەناتان بۆ مالیکی و بەغدا بردووە بۆئەوەی دەستوورەکە دوابخرێت، وەڵامتان بۆ ئەوان چییە سەبارەت بەم بابەتە؟

قادری حاجی عەلی: ئەمە گەورەترین هەڵەیە ئەوان دەیکەن و گەورەترین تۆمەتە کەبۆ ئێمەی دروستدەکەن، کەزۆر ناحەقییە، بەغدا لەڕوانگەی خۆیەوە دەیکات، لەوانەیە ڕەوانگەیەکی شۆڤێنی بێت، ئەوەی ئێمە کردوومانە، ئەوەیە کەنابێت دەستوور دەستووری حیزبێك یان دوو حیزب بێت کەبۆ خۆیان دایبنێن، بەڵکو دەستوور هی هەموو کۆمەڵگەیە، تەنها بۆ ئێستاش نییە، بەڵکو بۆ داهاتووشە.

لڤین: تاچەند لەزۆریی دەسەڵاتەکانی سەرۆکی هەرێم ترسان، کەسەڵاحیەتی ئیفلیجکردنی پەرلەمانی لەداهاتوودا هەیە؟

قادری حاجی عەلی: بەڵێ دەتوانێت پەرلەمان ئیفلیج بکات، ئەو هەوڵەی ئێمە بۆ پەرلەمان و چاککردنی هەمان، هەستمان دەکرد کەئەمە لەکارخستنی دەوری پەرلەمانە، بەو دەسەڵاتانەی کەدراون بەسەرۆك، ئیتر هەر کەسێك بێت.

لڤین: ئێوە لەمارکسیەتەوە بەرەو ئایین هاتوونەوە، بەوەی کە لەبانگەشەی هەڵبژاردندا وتاری دروشمی ئایینی بەکاردەهێنن، ئەمە تاچەندە لەگەڵ رابردووتاندا دەگونجێت؟

قادری حاجی عەلی: ئێمە پەنامان بۆ دروشمی ئایینی نەبردووە، ئێمە بزووتنەوەیەکی عەلمانیین و بەرنامەکەمان روونە، لەم کۆتاییەدا کەهەستمان کرد، پڕوپاگەندەیەکی زۆر هەیە کەکاریگەریی لەسەر بەشێك لەتاکەکانی کۆمەڵگە هەیە، کەگوایە ئێمە دژی نیین. ئێمە بۆ دژی دین بین؟ بۆ ئەوان دژی دین نەبن، کەحیزبایەتییان بردووەتە ناو دینیشەوە، کەسانێك هەن فەخر دەکەن، کە لە تەلەفزیۆن و رۆژنامەکانەوە بڵێن، من تەنها مەکتەبی سیاسیم کە لەسەر دین قسەم کردووەو تەحەداتان دەکەم کەئەوان نەیانتوانیوە قسەبکەن و تەحەدای کاك نەوشیروان

دەکات، کەڕۆژێك لەڕۆژان قسەی نەکردووەو دژی دین نەبووە؟ بۆ ناچنەوە بەگژ ئەوانەدا، کەهەندێکیان خۆیان ناودەنێن شێخ و هەندێکیان خۆیان ناودەنێن مەلاو دژی دین قسەدەکەن، ئەمە خۆی حەقە مامۆستایان بەئیهانە بۆ خۆیان بزانن، ئەوانەش کە ناسراون لەم ڕەوتە، زۆربەیان لەبنەماڵەی ئایینییەوە هاتوون، ئەوەندەی ئێمەش ڕێزی هەستی دینییمان گرتووە، هیچ لایەنێکی تر نەیگرتووە.

لڤین: داهاتووی یەکێتی دوای هەڵبژاردن چۆن دەبینیت؟

قادری حاجی عەلی: یەکێتی و پارتی بەلیستێك دابەزیون، ئەوەی کەئێمە بیزانین و ئەو زانیارییانەی کە لەسەرچاوەکانی پارتییەوە پێماندەگاتەوە، سەرۆکی حکومەت دەدرێتەوە بەپارتی و سەرۆکی هەرێم هەر پارتییە، لەبەرامبەر ئەمەدا، سەرۆك کۆمار بەشی یەکێتییە لەبەغدا، دوای هەڵبژاردن هەندێك کێشە لەسەر دابەشکردنی پۆستەکان دروست دەبێت، وەك بیستوومانەتەوە، پارتی چاوەڕوانی ئەنجامی هەڵبژاردنە.

من واپێشبینی دەکەم لەگەڵ ڕاگەیاندنی ئاکامی هەڵبژاردن، کۆمەڵێك پرسیار دێتە پێشەوە لەنێوان ئەم دوو لایەنەدا، کە لەسەر کۆمەڵێك شتی تر ڕێك بکەون، ئەوەی کەداهاتووی یەکێتی چی لێدێت، من نازانم و ئەوەش بەدەست ئەو برادەرانەیە، کە لەئێستادا سەرکردایەتی یەکێتی دەکەن.

لڤین: ئێوە ئامادەن لەحاڵەتێکی وادا گەر یەکێتی پێویستی هەبوو، فریای بکەونەوە، چونکە سەرکردەکانی یەکێتی بەوە ناسراون کە لەڕۆژانی سەختدا فریای دەکەونەوە؟

قادری حاجی عەلی: یەکێتی ئێمە وامان لێنەکردووە تافریای بکەوینەوە، ئێمە ویستوومانە بەهێز بێت، خۆیان قبوڵیان نەکردووە، تەنانەت ئێمە ڕۆڵیشمان هەبێت، لەبەرئەوە ئەوان وایان لێکردووە، بەرپرسیارێتی و چاککردنی یەکێتیش، لەسەر شانی ئێمە نییەو لەسەر شانی ئەوانەیە کەوایانلێکردووە.

لڤین: بەڵام ئێوە ئامادەن دەستبەرداری ڕابردوی خۆیان بن؟

قادری حاجی عەلی: دەستبەرداری خەبات و قوربانیدانی خۆم نابم و هاوڕێیانی تریش بەهەمان شێوە.

لڤین: بەڵام تاچەند پێت ناخۆشە کەیەکێتی ئێستا وایلێهاتووە؟

قادری حاجی عەلی: زۆرم پێناخۆشە کەوایلێهاتووە، خۆزگە یەکێتیی (٩١) بوایە، کەهاتەوە خەڵك بەرپرس و پێشمەرگەکانی لەسەر چاو دادەنان.

لڤین: پێتوایە ئەمە پەیوەندیی بەو ڕێککەوتننامەیەوە لەگەڵ پارتیدا هەیە، کەجەماوەر لەیەکێتی دووربگرێت؟

قادری حاجی عەلی: بەشێك لەجەماوەرەکەی لەبەرئەوەیە، بەڵام بەشی زۆری لەسەر هەڵسوکەوتی ناو یەکێتی خۆیەتی.

لڤین: یەکێتی تەئکید لەسەر ئەوە دەکاتەوەن کەپێویستی سەرۆکی حکومەت بۆئەوان لەم هەڵبژاردنەدا، چونکە ئەوان ڕێککەوتنی ستراتیژییان لەلەگەڵ پارتیدا هەیە، ئێوە ئەمە چۆن دەبینن؟

قادری حاجی عەلی: بەڵام تائەم دەقیقەیە، بەرپرسێکی پارتی دیوە بڵێت سەرۆکی حکومەت دەدرێت بەیەکێتی؟

لڤین: بەڵام نێچیرڤان بارزانی دەڵێت: کورسییەکەم بۆ کاندیدی یەکێتی چۆڵدەکەم؟

قادری حاجی عەلی: بەڵام لەبەرامبەر قسەکانی کاك نێچیرڤان، چەندان قسەی تر کراوە کەمەعمەعەی تێدایەو ساغیناکاتەوە، بەڵام جارێ ئەگەری تر لەبەردەمدایە، کێدەڵێت ئەوان هێندەی دەنگ دەهێنن، کەحکومەت دروستبکەن و تووشی ئەو شەڕە بن.

لڤین: بەڵام عیماد ئەحمەد لەچاوپێکەوتنێکدا دەڵێت: ئێمەیەکەم لیستین و چوار حیزبەکەش دووەم دەهێنن، کەواتە ئێوە دەبنە سێیەم؟

قادری حاجی عەلی: ئێمە مونافەسە لەسەر یەکەم دەکەین، بۆئەمەش گەشبینین.

لڤینك لەسەر کاندیدی سەرۆکایەتی هەرێم پێتوایە جەماوەری یەکێتی دەنگ بەمەسعود بارزانی دەدات یان نا؟.

قادری حاجی عەلی: ئەوەندەی من دەیبیستمەوە، ڕەنگە بەشێکی دەنگ بەکاك نەوشیروان نەدات.

لڤینك پەیوەندییەکانت لەگەڵ سکرتێری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان چۆنن؟

قادری حاجی عەلی: تاچەند مانگێك لەوەو پێش هاتوچۆشم هەبوو لەگەڵ جەنابی مام جەلال و ڕێزی لێگرتووم و ڕێزی تایبەتم بۆی هەیە، پیاوێکە بەرپرسی هەمووان هەبووە، بەڵام لەو ڕۆژەوە ئەم بەزمە دەستپێکردووە، هیچ پەیوەندییەکمان نەبووە.

لڤین: تائێستاش ئەندامی یەکێتیت؟

قادری حاجی عەلی: دەریاننەکردووم.

لڤین: کەوابوو، ئەندامی یەکێتیت؟

وەڵام: وەك وتم تائێستا دەریاننەکردووم.

==================

(نیوجەلالییەکان)و هەوڵی مانەوە

جەلالییە نوێیەکان هەوڵی کۆکردنەوەی میراتەکەیان دەدەن

ئا:لڤین: م.ڕۆژە

کۆمەڵگەی کوردستانی ژانی گۆڕاکارییەکی گرنگ تێدەپەڕێنێت ئەم قەیرانەش کە بەژان وەسفکرا، ژانی بەر لە لەدایکبوونی ئەو منداڵەیە کە «دیموکراسی»ی ناوە، لەمەشیاندا هەموو پێمانوابوو کەکرانەوە زۆرتر بناغەی هێزە محافزکارو نەریتییەکە دەلەرێنێتەوە، بەڵام پێشهاتەکان پێچەوانەی پێشبینییەکانمان دەرچوون.

گۆڕینی کۆمەڵایەتی و سەرەنجام گۆڕانی سیاسی کۆمەڵگەی کوردستان نەك لایەنی چەپی ناوەڕاستی بەهێزنەکرد، بەڵکو لەناو جەستەی خۆی هێزی تازەی خستەوە کە لەخوێنی خۆی هەڵمژی، ئەم کارلێکەش بەپلەی یەکەم (ی.ن.ك)ی تەکان دا.

لەوەوە ئۆپۆزسیۆن نەك لەدەرەوەی دوو هێزی سەرەکییەکەوە سەریهەڵنەدا، بەڵکو لەپەیکەری یەکێکیان باسێك ترازاوە، بەرەی ئۆپۆزسیۆنی شێرگیری

کوردستانی پێکهێنا، بەم جۆرە ئەو باسکە لەهەناوی (ی.ن.ك)دا گۆشتی گرت.
ـەوەتی ئۆپۆزسیۆن وەك هێزێکی بەرجەستەی سیاسی تای تەرازووەکانی هاوکێشەی سیاسی کوردستانی گرتووەتەوە، لەخوێنی هێزی بەرواڵەت چەپی ناوەڕاستی کوردی خۆراکی وەرگرتووە، لەو ساوە دوو مەیلی نوێ لەناو (ی.ن.ك) بەهێزبوون، پێدەچێت هەر ئەمانەش چارەنووسی ئەم هێزە یەکلایی بکەنەوە.

زەواڵی درێژخایەنی (ی.ن.ك) کە لەلێدوان نیۆلیبرالیزم، سۆسیال= دیموکراسی و نەریتی ئۆتۆکراتییانەدا چەقبەستووە، سەرەتای قەیرانی گۆڕانی سیاسی لەخۆدا کۆکردووەتەوە، ئەمەش کۆمەك بەدەرکەوتنی ئەو هێزە تازەیە دەکات کەدوای ژانسێکی تراژیك لەلەشی دێتە دەرەوە، ئێمەش پێشوەخت ناومانناوە (نیو جەلالیزم).

هیچزێك لەیەکانگیربوونی چەند ئاراستەیەكئەم هێزەی کەئەمڕۆ بە (ی.ن.ك) دەناسرێت، قەت بریتی نەبووە لەیەك مەیل و ئاراستەی سیاسی، بەڵکو هەر لەسەرەتاوە بریتی بووە لەچەندین ئاراستەی بیرو پراکسیس.

لەناوەڕاستی شتەکاندا کاتێك باڵی رووناکبیرو چەپەکان لەباڵی ڕاستی نەریتی (پ.د.ك) جیابووەوە، وەك باڵێکی چەپی ماوەی خۆی پێناسەکرد، ئەمەش زیاتر پەیوەندیی بەکەسایەتی جەلال تاڵەبانییەوە هەبوو، هەر ئەوسا رووناکبیران و نێوەندە سیاسییەکانی کوردستان ئەم باڵەیان ناونا (جەلالی) زۆریشی نەخایاند کەئەم پێناسەیە چووە ناو ئەدەبیاتی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستانەوە.

ئەمە لەکاتێکدا روویدا کە لەناو باسکی (مەکتەبی سیاسی)دا کەسانی وەکو ئیبراهیم ئەحمەد، عومەر دەبابە، نوری ئەحمەد تەهاو هتدی تێدابوون، کەچی رەوتەکە بەناوی جەلال تاڵەبانییەوە ناوی دەرکرد، ئەمەش نیشانەی ئەوەبوو کەناوبراو زۆرترین کاریگەریی لەسەر ئەم رەوتە هەبوو.

لەوساوە گۆڕەپانی سیاسی کوردستان کێشمەکێشی دوو باسکی سیاسی (مەلایی)و

(جەلالی)ی بەخۆوە بینی. جەلالییەکان وەك هێزێکی چەپی ماوی بەتایبەتی لەبەشی خوارەوەی باشووری کوردستان و لەناوەندە گەورەکانی وەك سلێمان و کەرکوك و تارادەیەك هەولێر ریشەیان داکوتا.

ئەوسا چەپی ماوی بوون، جارجارێکیش مەیلیان بەلای چەپی مارکسی سۆڤێتیدا هەبوو، خۆی چەپەکانی ئەوسا بریتیبوون لەسێ هێڵك هێڵی یەکەم بریتیبوو لەهێڵی چەپی سۆڤێتی، هێڵی دووەم بریتی بوو لەچەپەکانی رزگاریی نەتەوەیی وەك ڤێتنام و چین و کوبا، هێڵی سێیەمیش لەو چەپانە پێکدەهات کەسەر بەهیچ یەك لەو کەمپە ناسراوانە نەبوون و لەدژی ئەو هێلانە بوون، لەنێوەند سیاسییشدا بە(چەپی هەتیو) ناوزەند دەکران.

سەرباری ئەوەی چەپی ناوەڕاستیش هەبوو کە بەسۆسیال – دیمورات یاخود چەپی ئەورووپایی و چەپی ناوەڕاست پێناسەدەکران، ئەوسا لەخۆرهەلاتی ناوەڕاست نزیکبوون لەچەپی ناوەڕاست وەك کفر لەقەلەمدەدراو کێش باسێکی وای بخستایەتەڕوو، خۆ تووشی جۆرێك لەخۆکوژیی سیاسی دەکرد.

ئا لەم کەشوهەوایەدا جەلالییەکان سەریانهەلدا، لەناوەڕاستی شەستەکانەوە هەتا سەرەتای حەفتاکان لەناوەندەکانی کوردستان لەبرەو سەندندا بوون، لەسەرەتای حەفتاکانەوە دوای ئەوەی ریککەوتنی ۱۱ی ئازار مۆرکرا، چی تر گۆڕەپانی مانۆڕکردنیان نەماو بەشێوەی کاتی پاشەکشێیانکرد.

هەلوەشانەوەی (پارتی دیموکراتی کوردستان–هێڵی جەلالی)، بواری بۆ لەدایکبوونی چەند رەوتێکی چەپ خۆشکردن دوای رووداوەکانی پەیمانی جەزایرو پاشەکشێی (پ.د.ك)، ئەم رەوتە پەرتانە کە بەزۆری لەژێر کاریگەریی کاریزمای تالەبانیدا بوون، لەپڕ نەشونمایکردو لەگۆشەو کەناری ولاتدا رەگیان داکوتا.

ئەو هێزانەی کەدواتر یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانیان هێنایەکایەوە، لەچەند رەوتێکی هاوتەریب پێکدەهێن، یەکێك لەو هێزانە (کۆمەلەی مارکسی–لینینی کوردستان)بوو، کۆمەلە بالی چەپی (ی.ن.ك) بوو، یەکێتیی شۆڕشگێڕانی

کوردستان و بزووتنەوەی سۆسیالیستی کوردستانیش باڵی مەیلەو راستی (ی.ن.ك) بوون.

ئێستا ئەگەر بێین و رەچەڵەکناسییەك بۆ ئاراستە سیاسییەکانی ناو کۆمەڵە بکەین، بۆماندەردەکەوێت کەهەر لەسەرەتاوە چەند هێڵێکی هاوتەریب و هاو ئاراستە لەپێکەوەنانی ئەم هێزەدا رۆڵیان هەبووە.

هێڵی ناو شارەکان و دواتر شاخ، هێڵی سوریاو ئەورووپاو هێڵی ناو زیندان، ئەم سێ ئاراستە پراکتیکییە تاماوەیەك پێکەوە هەڵیانکرد، لەناوەڕاستی هەشتاکانی سەدەی رابردوودا کێشەکانی نێوانیان تەقینەوە، بەشێك لەهێڵی ناو شارەکان و رەوتی شاخ، خۆیان لەچوارچێوەی ئالای شۆڕشدا رێکخست.

باسکی لەسوریاو ئەورووپا گەڕاوە ئەم باسکەیان پاکتاوکرد، هەڵبەت بۆ ئەمەش باسکی زیندان و باسکی ئەورووپا یەکیانگرت، ئەم یەکگرتنەش نەیهێشت (ئاش گەشەبکات و ببێتە رەوتێکی پەرەسەندوو.

بەم جۆرە لەکۆتایی هەشتاکان و سەرەتای نەوەدەکاندا باسکی ئەورووپا-سوریا کە لەخودی تاڵەبانی و نەوشیروان مستەفا پێکدەهات، بەیەکگرتوویی (ی.ن.ك)یان گەیاندە قۆناغی راپەڕین.

قۆناغی راپەڕین و درزە تازەکان

لەدوای راپەڕین (ی.ن.ك) بۆئەوەی پێشوازی لەقۆناغی تازە بکات، یەکەم کۆنگرەی خۆی بەڕێوەبرد، نەوشیروان مستەفا لەبەرئەوەی سکرتێری کۆمەڵە بوو، کۆمەڵەش ٪۸۰ی (ی.ن.ك)ی پێکدەهێنا، خۆی بۆئەوە ئامادەدەکرد کە لەکاتی هەڵوەشاندنەوەی گرووپە ناوبەرەییەکان و رێکخستنیان لەچوارچێوەی یەك هێزی یەکگرتوودا ببێ بەسکرتێری گشتی (ی.ن.ك).

بێگومان کارێزمای تاڵەبانی ئەم ئارەزووەی ناوبراوی رەواندەوە، لەوساوە ناوبراو دڵی لە(ی.ن.ك) هەڵکەند، ئەم درزە بووە سەرەتای ئەم دابڕانەی کە ئەمڕۆ گۆڕان مانۆڕی لەسەر دەدات.

تاڵەبانی کەمتر دەهاتە نـاو ملـملانێـی باسـکەکانەوە، لـەسـەرەوە ئەنـدازیاریی ئـەم ململانێیەی دەکرد، کاتێکیش ئەم ملـملانێیە بگەیشتایەتە ئاسـتێکی ترسـناك، ئـەوە لایەکیانی مەقەست دەکردو هاوکێشەی سەرەوبن دەکرد.

لەسەرەتای نەوەدەکانەوە باسکی ئاڵای شۆڕش هاتەوە ناو پەیکەری (ی.ن.ك) بـەم جۆرە باسکی ناوشار جارێکی تر لـەکایە سیاسییەکانی (ی.ن.ك)دا بەشـداربوونەوە، بەلاوازبوونی باڵی ئەورووپا، باسکەکەی شاخ و ناوشاری کۆمەڵە گەشەیانکرد.

سەرباری ئەمە باسکبەندییەکی پراکتیکی و رواڵەتی دیکە هاتـە ئاراوە، کۆسـرەت رەسوڵ و جەبار فەرمان سەری ئەم باسکانە بوون، ئەمەش لـەبۆشـایی نەوشـیروان و لاوازبوونی ئاشەکان هاتبووە کایەوە.

لەسەرەتای (٢٠٠٠)ەوە تاڵەبانی جارێکی تر هێڵـە سیاسـییەکانی نـاو(ی.ن.ك)ی ئەندازیاریی کردەوە، ئەم جارە ناوبراو سەرلـەنوێ دوو یاریکەری پێشووی هێنایەوە ناو رێساکانی گەمەی ناو (ی.ن.ك)، ئەمانەش بریتیبوون لـەباسـکەکەی ئـەورووپاو ئاشەکان.

نەوشیروان مستەفا، حەمەتۆفیق رەحیم، سەلاح رەشیدو..هتد وەك باسکی ئەورووپا رۆڵیان وەرگرتـەوە، لـەملاش بـەرە بـەرە رۆڵ بەمـەلا بـەختیارو عیمـاد ئەحمـەدو ئاشەکانی تر درایەوە، لـەکۆتایی دە ساڵی یەکەمی ئەم سەدەیەدا باسـکی ئـەورووپا لـەتەنـەی (ی.ن.ك) هاتـە دەرەوەو ئاشـەکان (ی.ن.ك) یـان کـۆنترۆڵکرد، مـەلا بەختیارو عیماد ئەحمەد رۆڵی کلیلیان وەرگرت و ئەم ململانێیەیان ئەندازیاریکرد.

ئێستا ئەم هێزە بەقۆناغێکی هەستیاکدا دەربازدەبێت، واتا قۆناغێکی یەکلاکـەرەوەو چارەنووسی تێدەپەڕێنێت، (ی.ن.ك) لـەم سەرو بەندەدا قەیران دەربازدەکات، لـەم دۆخەشدا دوو ئاراستە تێیدا بەهێزدەبن و پێدەچێت لـەئاینـدەدا ئـەم دوو ئاراسـتەیە چارەنووسی بنووسنەوە.

ئەم دوو ئاراستەیەش بریتین لـە(باسـکی ئاشـەکان)و باسـکی نـوێ و گـەنجی (نیـۆ جەلالییەکان)، ئاشەکان دەناسرێن، ئەی جەلالییە نوێیەکان کامانەن؟

جەلالییە كۆنەكان، یاخود جەلالییەكانی وەچەی یەكەم لەڕووی شوناسنامەو ڕێبازی سیاسییەوە چەپگربوون، دەمێك چەپی ماوی بوون و ڕێبازی چینییەكانیان پێباشبوو، دەمێك سەرنجی چەپی روسیایان دەداو دواجاریش بەجۆرێك تووشی قەیرانی شوناسنامەی سیاسی بوون كاتێك بەگشتی لەجیهاندا ڕەوتی چەپ تووشی قەیران بوو، ئەم قەیرانە جەلالییەكانیشی گرتەوە، ئەمانە هەوڵیاندا لەچەپی ناوەڕاست نزیكببنەوە، لێرەوە بەلای سۆسیال-دیموكراسیدا ڕۆیشتن و سەرسام بوون بەچەپی ئەورووپایی. كایەكان و ڕێساكانی دیموكراسییان قبوڵكردو تەنانەت بوونە ئەندامی سۆسیالیست ئەنتەر ناسیۆنال.

واتا وەچەی یەكەمی جەلالییەكان هەوڵیانداوە شوناسنامەی چەپی خۆیان بەهەر شێوەیەك بووە بپارێزن، بۆئەمەش لایان گرنگ نەبووە كام چەپ بكەنە نموونە هەر ئەوەندە بەسبووە كەئەم شوناسنامەیە رابگرن، جا ئەمە بەچەپی چینی بووبێ، بەچەپی لینینی بووبێ یاخود بەچەپی ئەورووپایی زۆر گرنگ نییە، ئەوە گرنگە بتوانی لەنێوان ئەم ڕێبازانەدا مانۆڕ بكەیت و قەیرانی شوناسنامە دەرباز بكەیت.

ئێستا نیۆجەلالییەكان پەیدابوون و پێچەوانیە وەچەی یەكەمن، ئەمان پتر شەیدای لیبراڵ دیموكراسین، سەرباری ئەوەی پێناسەی فەرمیی (ی.ن.ك) ئەوەیە كەهێزێكی سەر بەئەنتەرناسیۆنالی سۆسیالیستەو چەپی ناوەڕاستە، كەچی وەچەی دووەمی جەلالییەكان بەنیۆلیبرالیزم سەرسامن!

ئەمان بەڕوانین و بەكردەوە پرەنسیپەكانی نیۆلیبراڵیزم پیادەدەكەن و ئەو بەهایانەشی پروپاگەندەی بۆدەكەن، بەهای لیبراڵ دیموكراسیین، كەوابێت نیۆجەلالییەكان بەشێوەیەك نیۆلیبراڵن. لەكاتێكدا جەلالییەكانی وەچەی یەكەم ماوی سۆسیال دیموكرات بوون.

لەڕووی ڕێسای كردەیی و روانینی ماتریاڵیشەوە ئەگەر ڕێبازی چەپی ناوەڕاستی لێ دابماڵین و لەم پێناسەیە رووتیبكەینەوە، ئەوە تێدەگەین كەئەم هێزە خۆی هێزێكی

ئۆتۆكراتی شێوە پلورالـە، کەگـەلێك مـەیلی محافزەکـاری نەریتیـشی لـەخۆی [illegible]ردووەتەوە، ئەمە پێناسەی ڕەوتی وەچەی یەکەمی جەلالییەکانە.

لەبەرانبـەر ئەمـەدا وەچـەی دووەمـی جەلالییـەکان یـاخود نیۆجەلالییـەکان، چ لەڕووی بیروبۆچوونەوە، چ لەڕووی پراکسیسی سیاسییەوە باوەڕیان بەپرەنسیپ و ڕێساکانی نیۆلیبرالیزم هەیـە، تەنانـەت لـەکردەی ڕۆژانـەو لەلێـدوانی سیاسـی و لەگوتاریشدا ئەمە بەزەقی دەردەکەوێت.

تاڵەبانی کەسایەتییەکی سیمبۆلـی و کارێزمایی وەچەی یەکەمـەو خـۆی ئـەم شـێوە قوتابخانەیە بنیاتناوە، بێگومـان تائـەو بمێنێ نیۆجەلالییـەکان نـاتوان بـەزەقی ڕۆڵـی یەکلاکەرەوەی خۆیان بنوێنن. کاری ئەمانە قۆناغی دوای تاڵەبانی دەستپێدەکات.

کەسایەتییەکی کلیلـی نیۆجەلالییەکان کێیە؟ پێشتر پێمانوابوو کەنەوشیروان مستەفا بۆشایی قۆناغی پاش تاڵـەبانی پڕدەکاتـەوە، بـەڵام دوای ئـەوەی گـۆڕان پەیـدابوو لەئەنجامی ململانێیەکی چڕی ناو-گرووپیدا نەوشیروان خـۆی لـەم میراتـە بـڕی و لەبازنەی ململانێیەو ناو-گرووپەکان دەرپەڕێنرا، ئەوە گۆڕەپـان بـۆ سـەرهەڵدانی نیۆجەلالییەکان بەیەکجاری خۆشبووە.

کادرەکـانی نیۆجـەلالی لـەبواری سیاسـی، کـارگێڕی، دیپلۆماسـی، سـەربازی، هەواڵگریدا بەرە بەرە ڕوخساری خۆیان دەردەخەن، پراتیکی سیاسی پێشەڕۆژ ئـەم ڕوخسارانە دەنوێنێت، کەسانی وەکو قوباد تاڵەبانی، د.بـەختیار جـەبار، د.ڕەهێـڵ، باڤێڵ تاڵەبانی، هانا شوان و ... هتد لەئایندەدا پتر گەشەدەکەن، کەسایەتیی کلیلی لەناو ئەمانەشدا د.بەرهەم ئەحمەد ساڵحە.

(ی.ن.ك)و قەیرانی شوناسنامە

یەکێك لەو کێشانەی ئەمڕۆ (ی.ن.ك) بەدەستییەوە ناڵانە، قـەیرانی شەوناسـنامەیە، سەرباری ئەوەی ئەم هێزە خۆی وەك قوتابخانەی سۆسیال دیموکراسی لەکوردسـتان دەناسێنێت،بەڵام پێدەچێت ئەمە پرسی شوناسنامەو ڕێبازی سیاسی لەلای ئەم هێـزە بەلایەکدا نەخستبێت!

ئێستا ئەم هێزە قاچێکی لەناو سۆسیال دیموکراسیدایەو قاچەکەی تریشی بەکۆمۆنیزمی چینی سەرسامە! لەلایەك هاوبەندیی لەگەڵ ئەمریکا هەیەو لەلایەکی تریشەوە سەرسامە بەپێشکەوتنی ئابووری چین. لەملا ئۆتۆکراتێکی شێوە پلورالەو لەولاش لاف کایەکانی دیموکراسی لێدەدات!
لەلایەك باس لەفرەیی سیاسی و کەلتووری دەکات و سیمبۆلی چەپکەگوڵ بەرجەستەدەکات، لەلایەکی دیکەشەوە جیاوازییەکانی ناوخۆی راناگرێت و هەوڵی یەکپارچەساییان دەدات! لەمبەر قاچێکی لەپلورالیزمدایەو لەوبەر قاچەکەی تری لەناو ئۆتۆکراسیدایە، لەلایەك وەك هێزی مۆدێرنی کوردی خۆی دەنوێنێ لەلاکەی دیکەش تا ناوقەدی لەناو نەریت چەقیوە!
دوای قەیرانەکەی تەمموزی ۲۰۰۹، جەلالییە نوێیەکان نیگەرانی لەدەستدانی بەشێکی بەرچاو لەتوانای گرووپەکەیانن، بۆ دەربازکردنی ئەم قەیرانە وەچەی دووەمی جەلالییەکان هاتوونەتە ناو گۆڕەپانەکەوە، ئەمانە هەوڵدەدەن میراتە سیاسییەکەیان کۆبکەنەوە، راستییەکەی ئەمان لەهەوڵی مانەوەدان، گوتاری هەنوکەشیان گوتاری مانەوەیەو هێشتا ئەو قۆناغە نەهاتووە تێیدا بەلای قەڵەمبازێکی تردا وەربچەرخێن.
ئەمبەرو ئەوبەرکردن لەناو جەمسەرەکانی پەکین و واشنتۆندا حیکایەتی ئەم تەنگژەی شوناسنامەیەمان بۆ دەگێڕنەوە، پێدەچێ بەکەمبوونەوەی ئەکتەرە سیاسییەکانی وەچەی یەکەم ئەم تەنگژەیە دەرباز ببێت، چونکە نیۆجەلالییەکان روویان لەڕووگەی نیۆلیبرالیزمە.
حەفتا- ۲۰۰۹و هەفتاوپێنج- ۲۰۱۳
ئەم قوتابخانەیەی کەئەمڕۆ لەکوردستان بە(ی.ن.ك) دەناسرێت، لەسەروبەندی بەیانی ۱۱ی ئازاردا لەگەڵ بەهێزبوونی (پ.د.ك)ی باسکی بارزانی، رووبەڕووی قەیران بووەوە، ئەوەبوو لەساڵی حەفتادا جەلالییەکان پاشەکشێیان کردو تارادەیەك گۆڕەپانەکەیان بۆ مەلاییەکان چۆڵکرد.

ساڵی ٢٠٠٩ش بۆ (ی.ن.ك) ساڵێکی شووم بوو، لەهەڵبژاردنەکانی تەمموزی [illegible]ودا ئەم قوتابخانەیە تەنگژەیەکی توندی دەربازکرد، کە لەپاشەکشێیەکەی ساڵی حەفتا کەمتر نەبوو! باسکێك لەپەیکەری ئەم هێزە ترازاو بەدەرکەوتنی (گۆڕشان) ئاڵۆزییەکی سیاسی و ڕێکخستەیی لێکەوتەوە.

لەساڵی حەفتاو پێنج ئەوجا نۆرەی پاشەکشێی (پ.د.ك) هات، دوای پەیمانی جەزایر، ئەمجا (پ.د.ك) پاشەکشێیکردو مەیدانی بۆ (ی.ن.ك) چۆڵکرد، لەمەوە (ی.ن.ك) جارێکی تر فەلسەفەی بوونی خۆی ڕاڤەکردەوەو بەگوڕێکی ترەوە سەریهەڵدایەوە.

ئێستا پرسارەکە لێرەدایە: وەك دەزانین ڕێساکانی مێژوو تاڕادەیەك خۆیان دووبارە دەکەنەوە، قەیرانی حەفتای (ی.ن.ك) لەهەڵبژاردنی تەمموزی ٢٠٠٩ خۆی دووبارە کردەوەن داخۆ قەیرانی حەفتاوپێنجی (پ.د.ك) لەهەڵبژاردنە پەرلەمانییەکەی ٢٠١٣دا دووبارە دەبێتەوە؟

========================

تاڵەبانی فتوای خائینبوونی هەڵگەڕاوەکاین دەرکرد

ی بیانوویەکی ماوە بۆ تەقینەوە

لڤین: ڕاپۆرتی شیکاری–هێمن باقر



جەلال تاڵەبانیی سەرۆك کۆماری عیراق و سکرتێری گشتیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لەو دۆسیە تایبەتەدا کە لەپلینۆمی یەکێتیدا لەسەر نەوشیروان مستەفاو بزووتنەویە گۆڕان پێشکەشیکردووە، چەندین تۆمەتی قورسی وەك (خۆفرۆشتن، خیانەت لەکوردایەتی و دەستێکەڵاوکردنی لەگەڵ جاش و جاسووسەکانیان) دەخاتەپاڵ و بە(هەڵگەڕاوەکان) ناوزەدیان دەکات.

بڵاوکردنەوەی ئەم وتارەی سکرتێری گشتیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لەم کاتەدا لەڕاگەیاندنەکانی یەکێتیی کە لەهەڵبژاردنەکانی عیراق نزیکدەبینەوە، نیشانەی گەیشتنی ناکۆکییەکانی نێوان یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و بزووتنەوەی گۆڕانە بەهێڵی سوورو ئەگەری ئەوەی هەیە لەهەر ئان و ساتێکدا شەڕی چەکدارییی لەسلێمانی بهێنێتە ئاراوە.

تاڵەبانی لەو وتارەیدا نەوشیروان مستەفاو بزووتنەوەی گۆڕان بە(هەڵگەڕاوەکان) ناوبردووەو چەمکی (هەڵگەڕاوە)ی لەبەرامبەریان بەکارهێناوە، کەئەمەش ئاماژەیەکی ترسناکە بۆ شەرعییەتی پاکتاوکردنی جەستەیی ئەو بزووتنەوەیە لەلایەن تاڵەبانییەوە.

(هەڵگەڕاوەکان) چەمکێکی سیاسی و ئاییینییە لەساڵی یازدەیەمی کۆچییدا لەلایەن خەلیفەی مسوڵمانان ئەبوبەکری سدیقەوە بەکارهات، وەکو ناونیشانی ئەو شەڕەی بەرانبەر بەو هۆزو گرووپانەی کە لەدوای کۆچی دوایی پێغەمبەرەوە (د.خ) لەئایینی ئیسلام هەڵگەڕانەوە.

ئەبوبەکری سدیق، خەلیفەی مسوڵمانان فەرمانی لەئایین دەرچوون و لەناوبردنی ئەم گرووپەی دەرکردو بۆ خۆیشی سەرکردایەتی وپای ئیسلامی کرد بۆ کوشتن و لەناوبردنی هەڵگەڕاوەکان.

هەربۆیە بەکارهێنانی ئەم دەستەواژەیە لەلایەن خودی تاڵەبانییەوە دەکرێت وەکو گرساندنی گڵۆپی سەوزی پاکتاوی بزووتنەوەی گۆڕان سەیر بکرێت.

تاڵەبانی لەووتارەکەیدا دەیەوێت بیسەلمێنێت کەنەوشیروان مستەفاو بزووتنەوەکەی لەسەر ئاستی ناوخۆیی و هەرێمی و جیهانی خیانەتیان دژی یەکێتی و ئەزموونی کوردستانی کردووە.

لەم رووەوە دەڵێت: (سیاسەتی شارراوە یان نیمچە شارراوەیان دژی کوردایەتی و فیدراڵییەتە، دژی یەکێتیی خاکی کوردستانە، دژی گەڕانەوەی کەرکوکە بۆ باوەشی هەرێم، دژی هێزی پێشمەرگەی کوردستان و یەکێتی خەڵکی کوردستانە).

هەروەها دەڵێت (دژی فیدراڵییەتی کوردستانن، گەر بۆیان بکرێت سلێمانی لەهەرێم جیادەکەنەوەو هەرێم پارچەپارچە دەکەن، هەر پارێزگایەك بۆ خۆی لامەرکەزییەتێکی هەبێت).

هەروەها دەڵێت: (دژی کوردایەتین، بۆ نەهێشتنی ئەو کیانە سیاسییەی کوردستان، دژی هەرێم و فیدراڵییەتی کوردستانن)، هەروەها ئاماژە بەوە دەکات (لای هەندێك دەوڵەت و هەندێك لایەنی سیاسی عیراقی دەڵێن هێزی پێشمەرگە زیادەیەو پێویستمان پێنەماوە)، هەروەها دەڵێت: دژی هاتنەوەی کەرکوکە بۆ سەر کوردستان).

جگە لەمانە تاڵەبانی ئاماژە بەوە دەکات کەئەوان خائین و کۆنە جاش و جاسوس و دووژنەکانی کورد یارمەتی نەوشیروان مستەفایان داوە، لەدژی پارتی و یەکێتی و حکومەتی هەرێم و کوردایەتی)، لەم رووەوە تاڵەبانی دەڵێت: (بۆچی لەسەرۆك جاش و بابەلباب خائینەکان، تا سەر مەلا کرێکار، تاسەر جاشە هارەکانی خۆماڵی، تا سەرکۆنە جاسووس و کۆنە بەعسی، هەروەها باڵی تۆرانی جەبهەی تورانی جەبهەی تورکمانی، بەگەرمی دەنگیان بۆ دان؟ ئایا لەدژی یەکێتیی و پارتی و حکومەتی هەرێم و کوردایەتی نەبوو؟)

بڵاوکردنەوەی ئەم وتارەی تاڵەبانی لەکاتێکدایە کەپارێزگای سلێمانی چەند

ڕووداوێکی نائاسایی بەخۆوە دەبینێت، لەوانە: کوشتنی پێشمەرگەی دێرین (ڕەئوف نمایـەنی) ئێـوارەی ڕۆژی ٢٤/١٢/٢٠٠٩، هەرچـەندە نازانرێـت هۆکارەکـەی چییە؟ بەڵام ئەوەندە دەزانرێت کە لـەهەڵبژاردنی (٧/٢٥)دا دەنگی بەلیستی گۆڕان داوەو پشتگیریی خۆی بۆ گۆڕان دەربڕیوە، هـەروەها تەقـەکردن لـەسـەردار قـادر کاندیدی گۆڕان بۆ پەرلـەمانی عیراق و لـێـدان لــەدارای تۆفیـق بـەگ کەسـایەتیی ناســراوی شــاری ســلێمان و خۆنیــشاندانی توندووتیــژئامێزی پیرەمـــەگرون، کەهەموویان ڕووداوی گوماناوین.

هەرچــەندە بــەپێی ڕاســپاردەکانی پلینــۆم بڕیــاردرابوو ئــەم وتــارەی تاڵـــەبانی بڵاونەکرێتەوەو لەناو دیکۆمێنتەکانی ڕاسپاردەی پلینۆمیـشدا دەربهێنرێـت تـاوەکو نەبێتە وەرەقەیەکی فەرمیی پلینۆم، بەڵام بڵاوکردنـەوەی لەئێـستادا مانـای ئەوەیـە کەیەکێتی دوا بڕیاری خۆی بۆ ڕوبەڕووبوونەوەی بزووتنەوەی گۆڕان داوە.

هەروەها بڵاوکردنەوەی ئەم وتارە هەموو جۆرە دەرگایەکی لەکۆبوونەوەو دیداری نێوان نەوشیروان مستەفاو تاڵەبانی داخـست، کـە لـەماوەی ڕابـردوودا سـەرەڕای ناکۆکییەکان لەخوارەوە، بەڵام تاڵە موویەك مابوو بۆ خاوکردنەوەی بارودۆخەکە، کەئەویش دانیشتنە دوو قۆڵییەکانی نێـوان تاڵـەبانی و نەوشـیروان مـستەفا بـوون، بـەڵام بڵاوکردنـەوەی ئـەم وتـارەو یاداشـتەکانی نەوشـیروان مـستەفا لـەپێـشتردا دەرگایان بەرووی ئەم ئەگەرەشدا داخست، هەربۆیە ئێستا گۆڕان و یەکێتی وەکـو دوو هێزی ناو سەنگەر ڕووبەڕووی یـەك وەسـتاون و تەقینـەوەی بارودۆخەکـەش چاوەڕێی بیانوویەکی بچووکە.

تاڵەبانی لەو وتارەدا چەندین تۆمەتیداوەتە پاڵ نەوشیروان مستەفا، کە بەوتـەی ئـەو لەمێژووی سێ ساڵەی یەکێتیدا ئەنجامیداون، لـەوانە (تاوانی کوشتنی خەڵکی بـەبێ ئاگاداریی سکرتێری گشتی).

لەم بارەیەوە دەڵێت (بەبێ ئاگاداریی سکرتێری گشتیی و نیوەی مەکتەبی سیاسی و ناوەندی کۆمەڵەش بڕیاری کوشتنی خەڵکی لەشارو لادێ دەرکـرد، ئەمـەش بـوو



بەهۆیەکی گەورەی ناکۆکیی ئێمەمانان لەگەڵ هێڵی نەوشیروان مستەفا لەساڵی ١٩٨١ەوە لەناو کۆمەڵەدا).

تاڵەبانی دەڵێت (لەسەرەتادا ئەنجامدانی ئەو بریارانەو گەلێك بڕیاری ترمان لێدەشارانەوە، بەڵام سەرەنجام دوای ماوەیەکی کەم لەڕێگەی بەرپرسانی گەورەی ناو شارەوە راستییەکانمان هەموو زانی و چینی دیکە فڕوفێڵ دادی نەدا، ئەم راستییانەش وایان لێکردین بتوانین دوای سنوور بۆ پاکتاوی جەستەیی نارەوا دابنێین).

دواتر دێتەسەر شەڕی قڕناقاو پشتئاشان و دەڵێت: (بەهۆی گرتنەبەری سیاسەتێکی عەسکەریی بڕیار لێنەدراوەو خراپ و نامرۆڤانە شکانەوەو رووداوی زۆر نالەبارییان لێکەوتەوە).

لەبەشێکی دیکەی وتارەکەیدا تاڵەبانی دێتەسەر باسی کارەساتی کیمیابارانی هەڵەبجەو نەوشیروان مستەفا بەبەرپرسی یەکەمی ئەو کارەساتە دادەنێت، لەم رووەوە دەنووسێت: (بەبێ رەزامەندیی سکرتێری گشتی، کەفەرماندەی گشتی هێزی پێشمەرگەش بوو، بەڵکو بەبێ رەزامەندیی زۆربەی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتیی یەکێتی، فەرمانی عەسکەریی دابوو بەفەرماندەو هەڤالانی دەڤەری هەڵەبجە، کە وەکو بەشێك لەهاوکێشە عەسکەرییەکانی جەگی عیراق-ئێران هەوڵی رزگارکردنیهەڵەبجە بدەن، گوایە بۆ کەمکردنەوەی گوشار بوو بۆسەر سەرکردایەتی کەرژێم پەلاماریدەدا، ئەم بڕیارەش بەو شێوەیە بەبێ لێکدانەوەی هەلومەرجی جەنگ و سروشتی فاشییانەی سەدامییەکان لەدوو ساڵی کۆتایی جەنگەکەدا پاساوی دایە دەست سەدام کەسروشتە فاشییەکەی لەشاری هەڵەبجە جێبەجێ بکات)، بەتایبەت کەحکومەت پێشتر هەرەشەی بۆ ناردبووین کەهەر پەلامارێك لەگەڵ پاسداران بۆ سەر هەر شوێنێك بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی جوابی دەبێت، تەنانەت ئەگەر شاری سلێمانیش بێت).

لەجێیەکی دیکەدا ئاماژە بەوە دەکات کەناکۆکییەکی دیکەیان لەگەڵ نەوشیروان

مستەفا لەکات راوەستانی شەڕی نێوان عیراق ئێراندا بووە، چونکە وەکو تاڵەبانی دەڵێت: (سکرتێریی کۆمەڵە باوەڕی بەشۆڕش نەمابوو، لەدوای شەڕی سەرکردایەتی ورەی بەردابوو، بەپەلەپڕوزە ناوچەکەی جێهێشت بەسەر هەڤاڵانی سەرکردایەتی بەبێ ئەوەی پرس و راوێژیان پێبکات، بەتایبەت دوای ئەنفالەکان) هەر لەم بارەیەوە دەنووسێت (سکرتێری کۆمەڵە بەئارەزووی خۆی بڕیار دەداو سەرەنجام سەربەخۆ کەوتە بلاوەپێکردنی شۆڕش و دەستیکرد بەناردنە دەرەوەی کادرەکانی و هاندانی پێشمەرگەش بۆ چوونە ناو ماڵی خۆیان، یان بۆ ئێران، بەکەڵك وەرگرتن لەدەسەلاتی جێگریی سکرتێری گشتی، لەغیابی سکرتێری گشتیدا خەریکبوو شۆڕشەکە بلاوەپێبکات).

پاشان دێتە سەر باسی ئەوەی کە لەچەندین جێگەدا بەهۆی لێکدانەوەی سیاسییانەی هەڵەی نەوشیروان مستەفاوە کورد دەرفەتی گرنگی لەدەستچووە، لەم رووە ئاماژە بەوە دەکات کەنەوشیروان مستەفا باوەڕی وابوو کە لەدوای گرتنی کوێتیش لەسەدام نادرێت، لەسەر بنەمای ئەو لێکدانەوە چەوتە یەکێتیی تووشی هەڵەیەکی مێژوویی کرد (کەبەڵێنی ئەمریکییەکان بوو ئەگەر لەو شەڕەدا کورد بەشداری بکات ئەوە ئەمریکا یارمەتی چەك و ماددی دەدات بەکوردو فیدراڵییەتی لەعیراقدا بۆ دەسەپێنێت).

تاڵەبانی لەمە زیاتر لەسەر نەوشیروان مستەفا دەڕوات و دەڵێت: (بێ پرسی هەڤالان، بەتایبەتی سکرتێریی گشتی، کەوتە نامەناردن بۆ سەدام و هەوڵدانی لاواز بۆ رێککەوتنێکی لاواز، بەهیوای ئەوەی سیاسەتی خۆی بباتەسەر، کەچی نەك سەدام ئامادەنەبوو چارەسەرێکی لاوازیش بۆ کێشەکە بسەلمێنێت، بەڵکو شەخسی خۆی ئامادەنەبوو وەلامی یەك نامەی جێگری سکرتێری یەکێتی بداتەوە).

پاشان ئاماژە بەوە دەکات لەدوای ئەو دوو هەڵەیە تووشی هەڵەیەکی دیکەش هات، ئەویش ئەوکاتە کەراپەڕین بەهاتنەوەی لەشکری عیراق بۆ شارە گەورەکان تووشی شکان هات، لەجیاتی ئەوەی سەرکردایەتیی بەربەرەکانێ بکات وەك

جێگری سکرتێری گشتی و جێگری فەرمانـدەیی گـشتیی هێـزی پێـشمەرگە، بـەبێ بڕیاری مەکتەبی سیاسی بەرنامەیـەکی سیاسـی بـۆ ڕوبەڕووبوونـەوەی ئـەو دۆخـە ناڵەبارە وتبووی من دەمزانی وامان بەسەردێت، بەڵام مـام جـەلال ئـەم سیاسـەتەی سەپاندو تووشیکردین.

دواتـریش ئامـاژە بـەوە دەکـات لـەکاتێکـدا کۆسـرەت ڕەسـوڵ و جـەبار فـەرمان لەهـەولێرو سـلێمانی خـەریکی دەرپەڕانـدنی مـیری بـوون (نەوشـیروان مـستەفا لەناوزەنگ خۆی شاردبووەوە، پەیتاپەیتا ڕەخنەی ڕووخێنەری دەگرت).

تاڵەبانی لـەدرێژەی وتارەکەیدا دێتـە سـەر باسـی دروسـتکردنی کۆمپانیـای وشـەو دەڵێـت: (بـەپێی نەخـشەیەکیش کەپاشـان ئاشـکرابوو، داوایکـرد کـەبۆ دانـانی (پەیمانگای ستراتیژی بۆ توێژنەوە) یەکێتی و حکومەتی هەرێم و کوردایەتی یارمـەتی بدرێت، سکرتێری گشتی سەرەڕای بۆچـوونی جیـاواز لـەناو مەکتـەبی سیاسـی و سەرکردایەتی باوەڕپێکردو ئەو پارەی کەداوایکرد (١٠) ملیۆن دۆلارو گردەکـەو هەندێك شتی تری بۆ دابینکرد، ئەویش لەجیاتی توێژینـەوەی سـتراتیژی کۆمپانیـای وشەی پێداناو کەوتە دژایەتی یەکێتی.)

دواتر دێتە سەر باسی هاوڕێکانی لەمەکتـەبی سیاسـی و سـەرکردایەتی و دەڵێـت: دەستەو دایەرەکەی بەکـەڵك وەرگـرتن لەپۆسـتەکانیان لـەناو یەکێتیـدا هەرچـی توانایان بۆیان ئەنجاما، لەهەموو خـراپترو بێئەمەکتـەر بڵاوکردنـەوەی نهێنییـەکانی یەکێتی بوو لەمیدیاکاندا، کەئەمە ناپاکی بوو بەرامبەر بەئەمانەتی مەئسولیەت).

دواتر ئاماژە بەوە دەکـات کەنەوشـیروان مـستەفاو هاوڕێکـانی بەرپرسـی یەکـەمن لەوەی کە سێ هەزار ملیۆن دۆلاریان لـەکیس سلێمانی دا، بـەهۆی ئـەوەی ڕازی نەبوو کۆرییەکان بێنە سلێمانییەوە نیشتەجێ بن.

لەکۆتاییدا دێتەسەر باسی سلێمانچێتی نەوشیروان مستەفاو دەڵێت (هەنـدێك جـار نەوشیروان بەئاشـکرا دەڵێـت: بـادینی کـوردی نـیین، کـەرکوکی نازانێـت چـین، هەولێریش (قسەی قێزەون دەکات) هەربۆیە سلێمانییان بەسە).

========

نەوشیروان یەکێك بوو لەوانەی مام جەلالی کردووە بەم کەسەی ئەمڕۆ
نەوشیروان مستەفا لەپێناوی مام جەلالدا نەیهێشتووە کەس لەیەکێتی بەرامبەر
تاڵەبانی سەرهەڵدا

دیداری: سۆران عومەر، سیروان ئەحمەدی

بەشی یەکەم

مامۆستا عەتا قەرەداغی ئەدیب و نووسەری ناسراو، لەسەر مێژووی ململانێکانی ناو یەکێتیی نیشتمانیی و کێشەکانی نێوان مام جەلال و نەوشیروان و کۆسرەت رەسوڵ قسەدەکات.

رێگا مەگەزین: سەرکردەکانی کورد تانەمرن هەر سەرکردەن، ئەمە چ نەریتێکە؟

عەتا قەرەداغی: بۆ وەڵامی ئەم پرسارە نابێت ئێمە پشت لەکۆمەڵگەی کوردی بکەین و بمانەوێت لەبۆشاییدا وەڵامی پرسیارێکی لەم شێوەیە بدەینەوە، هەرکەسێك لەم کۆمەڵگەیەدا کەناوی کۆمەڵگەی کوردییە، بووبێتە بەرپرسێکی سیاسی، بووبێتە سەرکردە، نەك لەم قۆناغەی ئێستادا کەباسی دەکەین، بەڵکو هەر لەدێر زەمانەوە، لەسەردەمی دروستبوونی میرنشینەکانەوە، هەر لەسەرهەڵدانی بزووتنەویە نەتەوەییەکانی کوردەوە، ئەوەی دەسەڵاتی بەدەست گرتبێت، ئەوەی شوێن و پلەو پایەیەکی هەبووبێت بەدەر نییە لەو واقیعەتەی کۆمەڵگای کوردی کەدەشێت خەڵکێك بەئاسانی تێیدا بەرزببنەوەو دەربکەون، ئەگەر توانایەکیان هەبێت یان لێهاتووبن، یان پێگەیەکی جەماوەرییان هەبێت، ئەوا دەتوانن شوێنی خۆیان بگرن، بێگومان پێگەی جەماوەری گرنگە، هەروەك دەزانن لەبەرئەوەی کۆمەڵگەی کوردی کۆمەڵگەیەکی خێڵایەتی بووەو تاکو ئێستاش هەر هەمان عەقڵ و ستراتیژو کەلتوورو کاری تێدا دەکات، بۆیە دەشێت ئەم عەقڵیەتە بەئاسانی پێگەو جێگە بەکەسانێك ببەخشێت، دیارە لەپێش هەر کەسێکدا ئەوەی بووەتە

خاوەن دەسەلات و نفوز لەکۆمەڵگەی کوردیدا ئاغلا بەگ و شێخەکان بوون، [illegible] کەو دەتوانین پێیان بڵێین سەرۆك عەشیرەت یان سەرۆك خێڵ، لەدوای ئەوەش کەمیرنشینەکان دروستبوون هەر بنەماڵەیەك یان هەر تیرەو عەشیرەت یان خێڵێك هاتووە دەسەڵاتێکی ناوچەیی دروستکردووەو هەندێك لەو دەسەڵاتانە زیاتر پەرەیان سەندووەو سنووری دەسەڵاتیان فراوان بووە بۆ دەسەڵاتی میر نشین، ئەو میرنشینە تاکاتی رووخانی دەسەلات نەوە بەنەوە لەباپیرەوە بۆ باوکوو لەباوکەوە بۆ کوڕ گواستراوەتەوەو هەر خۆیان فەرمانڕەوایەتییان کردووە، تائەوکاتەی میرنشینەکە رووخاوەو تەرمی میرنشینەکەیان لەگەڵ خۆیان بردۆتە ژێر گڵ و کۆتایی بەدەسەڵاتیان هاتووە، سەیری بزووتنەوەکانی کورد بکە، بۆنموونە بزووتنەوەی بەدرخانییەکان، هەر لەسەرەتاوە تارووخانیان هەر پیاوانی ئەو بنەماڵەیە رابەرایەتییان کردووە، بزووتنەوەی (شێخ عوبەیدوڵڵا نەهری) یان بزووتنەوەی (شێخ مەحمودی حەفید کەئێمە بەرێزەوە سەیری خەباتیان دەکەین، هەرچەند ئەو رێزە وامان لێناکات کە لە کەموکورتییەکانیشیان بێدەنگ بین، ئەوانیش دەسەلات لەسنوری بنەماڵەکانی خۆیان نەچۆتە دەرەوە، تەنانەت ئێستاش لەنێو کۆمەڵگەی کوردیدا نەوەکانیان بەرێزەوە سەیر دەکرێن و حسابیان بۆ دەکرێت، تەنانەت بارزانییەکان لەشێخ عەبدولسەلامی یەکەمەوە تاکو ئێستا، کوڕ لەباوکەوە دەسەڵات و رێبەرایەتی وەردەگرێت و سەرکردایەتی دەکات.

(مام جەلال) تاکە سەرکردەیە کە لەبنەماڵەیەکی هەژارو باوکێکی تارادەیەك نادیار هەڵکەوتووە، بەتواناو لێهاتوویی خۆی هاتووەتە پێشەوەو ئێستاش ئەوە پێگەیەتی کەدەیبینن و چۆن ناتوانێت کورسی دەسەلات بەجێبهێڵێت، دیارە ئەوە تەنیا خاسێتی مام جەلال و کاك مەسعود نییە کەدەبێت هەر خۆیان سەرکردەبن، بەڵکو ئەوە بەشێکە لەکەلتووری کوردی و رۆژهەڵاتی کەدەڵێت: ئەگەر بۆ تەنیا جارێك هەلت بەدەست کەوت و بوویتە سەرۆك، ئیتر بۆ هەتا هەتایەو تادەمریت تۆ سەرۆکیت).

لەعەقڵی کوردی و ڕۆژهەڵاتیدا ئەوەی جارێك بوو بەسەرۆك ئیتر ناتوانێت دوری بوونی خۆی لەدەرەوەی کورسی دەسەڵات بکات، هەر لەبەرئەوە سەرکردەکانی کورد کورسی دەسەڵات بەجێ ناهێڵن و تا دواساتەکانی ژیانیان هەر بەسەرکردەیی دمێننەوە.

دەتوانم بڵێم حزبی کوردی جێگرەوەی سیستمی خێڵایەتییە، عەقڵییەتی خێڵایەتی عەقڵیەتێکی عەرەبی و کۆمەڵگە دواکەوتووەکانە کەتیایدا ئاراستەی فەرمان لەلوتکەوە دەکێشێت بۆ خوارەوە، فەرمانەکان فەرمانی لووتکەن، هەمانشێوەی هەرەمی دیینی کەچۆن دەسەڵات لەخوداوە دێت بۆ پێغەمبەرو لەوێشەوە بۆ پنتەکانی خواروترو بۆ کۆی بڕواداران، دەسەڵاتی خێڵایەتی کەحزبی کوردیش جیجگرەوەی خێڵایەتییە، سەرۆکی حزبەکانی ئێمە بەبێ جیاوازی لەگەورەوە بۆ بچووك کەسیان ئامادەنین بەئاسانی جێگەی خۆیان چۆڵبکەن، بۆنموونە (بارانی نەمر) تا ئەوکاتەی کەکۆچی دوایی کردووە، هەر سەرۆکی حزب بووە، لەدوای ئەوەش کە(کاك ئیدریس و کاك مەسعود) هاتوون، لەساڵی (١٩٧٩)وە تاکو ئێستا (کاك مەسعود) سەرۆکی حبە، یەکێتیی نیشتمانی کەدروستبوو هەر لەساڵی (١٩٧٦)ەوە (مام جەلال) سەرۆکی حزبە، تەنانەت ئەو حزبە بچووکانەش کەدروستبوون لە(سۆسیالیست و زەحمەتکێشان)ەوە تا(کۆمەڵەی ئێران) کە(کاك عەبدوڵڵای موهتەدی) سکرتێری بەشێکیانەو سەید برایمی عەلیزادە سکرتێری بەشێکی تریانە، تادەگاتە (پارتی کرێکارانی کوردستان) کەئەوەندە ساڵە سەرۆکەکەی لەزیندانە، ئەو حزبە نەیتوانیوە سەرۆکێك بۆ خۆی دیاریبکات، مانای ئەوەیە ئەمە واقیعێکە کەکۆمەڵگەی کوردی تێدا دەژی و ئەو عەقڵە سیاسییەی لەکۆمەڵگەی کوردیدا ئامادەیەو کاردەکات، عەقڵی خێڵەو رووکەشکراوە بەخاسێتی ستالینی و سیستمە سیاسی و حزبییە داخراوەکان کەئەمەش عەقڵێکی باش نییەو ڕێگەخۆشکەرە بۆ دروستکردنی دیکتاتۆرو سیستەمی تۆتالیتاری، ئەمەش لەوەوە دێت کەسەرکردە تائەوکاتەی دەمرێت هەر سەرکردەیەو لەماوەی تەمەنیدا

لارێ یەکەسی تر نادات جێگای بگرێتەوە، ڕێگاش خۆشدەکات بۆئەوەی کەسە نزیکەکانی خۆی هەموو پلەکانی دەسەڵات لەحزبا بگرنە دەست و ئەوەش وادەکات روبەری ئازادی و ڕووبەری دیموکراسی و ڕووبەری بەشداریی ئەوانی تر لەدەسەڵاتدا زۆر بەرتەسك ببێتەوە، ڕەنگە کەمبن ئەو کۆمەڵگایانەی بەئەندازەی کۆمەڵگەی کوردی باسی دیموکراسی و ئازادی و مافیان تیادا دەکرێت، بەڵام داخۆ بەچی دەپێورێت کەکۆمەڵگەی ئێمە کۆمەڵگەیەکی ئازادو دیموکراسییە، کام حزبی کوردی دەتوانێت لەناو پێکهاتەی حزبەکەیدا مومارەسەی دیموکراسی بکات، بۆئەوەی ئاڵوگۆڕی دەسەڵات بکات لەڕیزی حزبەکەی خۆیدا، بێگومان نەك ناتوانێت بۆ سکرتێر یان سەرۆکەکەی بگۆڕێت، بەڵکو سەرکردایەتییەکەشی بۆ ناگۆڕێت، بۆنموونە ئەندامی (م.س)و سەرکردایەتی پارتی مەگەر بمرن، ئەگینا تائەوکاتەی کەدەمرن هەر (م.س)ین و سەرکردایەتین، ئەندامی (م.س)و سەرکردایەتی یەکێتی هەر هەمانشێوەیە، دەبێت هەموویان بەسەرکردایەتی ببرێن بۆ گۆڕستان، ئەو سەرکردانەی پارتی و یەکێتی لەساڵی (١٩٧٢)وەوە بوونەتە سەرکردایەتی، مەگەر ئەوانەی شەهید بوون یان کۆچی دواییان کردووە، ئەگینا ئەوانی تریان هەر سەرکردەن، بڕواناکەم شتی لەمجۆرە لەهیچ شوێنێکی دنیادا بوونی هەبێت.

ڕێگا مەگەزین: تاڵەبانی لەبنەماڵەیەك نەبووە وەك بارزانییەکان، بەڵام ئێستا تاڵەبانی بۆتە بنەماڵەیەك و یەکێتیی نیشتمانی بەرەو ئەوە دەبەن کەتەنها خۆیان خاوەنی بن، بەتایبەتی دوای ئەوەی کەگۆڕان چۆتە دەرەوە، ئەوەتا هێرۆخان بۆ یەکەمجار پۆستی حزبی لەسلێمانی وەردەگرێت، چاوەڕوانی ئەوە ناکرێت هێرۆخان بۆ جێگرتنەوەی تاڵەبانی هاتبێتە پێشەوە؟

عەتا قەرەداخی: بێگومان ئەگەر ئێمە سەیری مێژووی مام جەلال تاڵەبانی بکەین، من خۆم لەو کەسانەم سەرەڕای ئەوەی کەڕای تایبەتی خۆم هەیە لەسەر ئەم مەسەلەیەو چەند جارێك باسمکردووە مام جەلال و بوون بەسەرکردەیی ئەو بریتییە

لەهەڵکەوتنی تاکە کەسی نوخبەی رۆشنبیریی بەهەوڵو تواناى لەبننەهاتووی خۆی، بەڵام ئەوەی کەبۆ بنەماڵەی بارزانی دروستبووە یان بۆ بنەماڵەی شەرەفکەندی یان بۆ شێخانی سلێمانی و بنەماڵەی نەهری دروستبووە هەروا بەئاسانی بۆ بنەماڵەی تاڵەبانی دروست نەبووە، وابزانم مام جەلال هیچ هێزێکی مەعنەویشی لەنازناوی تاڵەبانیش وەرنەگرتووە، بەڵکو بەپێچەوانەوە تاڵەبانی لەناوو ناوبانگی مام جەلالدا گەورەتربووە، لەبەرئەوەی کەعەشیرەتی تاڵەبانی لەسەر جوگرافیای خێڵایەتی کوردی عەشیرەتێکی ئاسایین و لەئەسڵدا شێخی بەرماڵن و نەیانتوانیوە ببن بەو هێزە مەعنەوییە کەپاڵپشتێکبن بۆ مام جەلال، (مام جەلال) بەپێچەوانەوە وەکو کوڕی بنەماڵەیەکی هەژارو گەنجێکی خوێندەوار کەهەر لەسەرەتای گەنجێتییەوە هاتووە، کەسێتی سەرکردەیی هەبووەو ئەوە بۆ ماوەی (٥٠) ساڵە ئامادەبوونی هەیەو هەر لەسەرەتای تەمەنی سیاسی خۆیدا هەوڵیدا دەسەڵات لەگەڵ پیاوێکی گەورەی وەکو بارزانیدا دابەشبکات، تۆ سەیری ئەوە بکە هەمووومان دەزانین ساڵی (١٩٦٦) کەجیابوونەوە روویدا، ئەوکاتە کەسی یەکەمی مەکتەبی سیاسی مامۆستا برایم ئەحمەد بووە، مام جەلال کەسێکی گەنج و چوست و چالاك و خوێندەواری تەمەن نزیك (٣٠) ساڵ بوو، هەتاکو ماوەیەکی کەم بەدەستەی جیابووەوە دەگوترا تاقمەکەی برایم جەلال، بەڵام لەماوەی چەند مانگێکدا برایمەکەش نەما بوو بەجەلالی، لەوێوە توانای مام جەلالمان بۆ دەردەکەوێت، ئێستاش بەو تەمەنەوە لەهەموو مەکتەب سیاسی حزبەکەی چالاکترو خوێنەوارو بەهیممەتترەو لەهەمووان زیاترو باشتر کۆمەڵگەی کوردی ناسیوەو زانیویەتی چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ کۆمەڵگەی کوردی بکات، خاڵێکی تری (مام جەلال) ئەوەیە کە لەگەورەترین شکستدا لەو پیاوانەیە کەبەئومێدەوە دەڕوانێت و هەرگیز نابەزێت و هەمیشەش بەپێچەوانەی کاك مەسعودەوە ئەم پێیوایە بەخونچەیەك بەهار دێت، هەمووومان دەزانین کە لە(٣١ ئاب)دا کەیەکێتی لەسلێمانی وەدەرنراو گەیشتە سەیرانبەن و حزبێك بەو دەسەڵات و قەوارە گەورەوە ئاوارەکراو زۆریش لەسەرکردەو

[illegible]انی ئەم حزبە بێ ئومێدبوون، بەڵام (مام جەلال) لەژێر خێمەکانیشدا گەشبینانە [illegible]ری داهاتووی دەکردو پێیوابوو ئەوە شتێکی کاتییە، ئەمە واقیعییەتی دەروونی و بایۆلۆژی مام جەلالــە، لەبەرئــەوە ئــەم پیــاوە لەئەســڵدا جۆرێـك لەشەخـسییەتی سەرکردەیی تێدایە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوانەی کە لــەدەوری (مـام جـەلال) بـوون و هەر ئەویش دەستی دابوو بەپشتی زۆریانداو کردبوونی بەسەرکردە لەگـەڵ ڕێزمـدا بۆ هەموویان، بەدرێژایی مێژوو لەهەموو ڕوویەکەوە لە(مام جـەلال) لاوازتربـوون، هەرگیز نەیانتوانیوە لەبەرامبەر (مام جەلال)دا بووەستن یان قسە لەڕوویدا بکـەن و بڵێن ئەم شتە نابێت، تەنانەت بەکاك نەوشیروانیشەوە لەگەڵ ڕێزمدا بـۆ کەیـەکێك لەو کەسانەیە یارمەتی زۆری مام جەلالی داوە کەببێت بەو مامـە جەلالــەی ئێستا کەحساب بۆ کەس نەکات بەخودی کاك نەوشیروانیشەوە، ئەم پیـاوە یـەکێك لــە کەسە هەرە نزیکەکانی ســەردەمی منـداڵ و گـەنجێتی ئـەو بـووە، لەهـەموو کـەس جەلالی تر بووەو هەمووومان دەزانین کەچەندە چالاك بووە، مام جەلال ئـەم پیـاوەی بەکارهێناوە بۆ لێدانی ئەو کەسانەی کەپێیوابووە سەر بەرزەکەنەوە لەناو یەکێتیداو دەشــێت ئەگــەری ئــەوەیان لێبکرێــت لــەڕووی مـام جەلالــدا بووەســتن، هــەر لەسەردەمی (شەهید ئارام)ەوە، بۆ سەردەمی (ســالارو بــەختیارو جەعفــەر)و تائــەو قۆناغەی دوایــی کــە لەنووســینەکانی نێـوان کــاك نەوشــیروان و کــاك کۆســرەتدا بڵاوبۆوە، بۆ خەڵك دەرکەوت کە(مـام جـەلال) هـەتا ئێـشی بـەکاك نەوشـیروان هەبووە بەکاریهێناوە، کاك نەوشیروانیش هەر پشتگیریی ئـەوی کـردووەو خۆیـشی دەڵێت جارێك بەمام جەلالم وت (تۆ تەسەور دەکەی کەمن تـۆم خۆشـبوێت؟ (مـام جەلال)یش وتوویەتی: بەڵێ).

پێموانییە کاك نەوشیروان ئەو قسەیەی هەروا بـۆ ســەرفی مەحەلی گوتبێـت، بـەڵکو خۆیشی و مام جەلالیش ئیشیان بەو قسەیە هەبووە، لێکدانەوەکان هەر بەو جۆرەن کە لەدڵەوە مام جەلالی خۆشویــستووەو بــەو کەســەی زانیــوە کەشـایەنی ئەوەیـە هەموو شتێکی بۆ بکات.

پێموایە ئەوەی کەئێمە باسی لێوە دەکەن کە(مام جەلال) بەتەمایە ببێت بەبنەماڵەو دەسەڵات لەناو خۆیاندا بهێڵنەوە! پەیوەندییەکی کەمی بەمام جەلالەوە هەیە، بەشێکی زۆری دەگەڕێتەوە بۆ لاوازی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی یەکێتی، سلێمانی قەڵای یەکێتیی نیشتمانی بوو، ئێستا حاڵی یەکێتی لەناو سلێمانیدا باش نییەو بەدۆخێکی خراپدا تێدەپەڕێت، رەنگە بیریان لەوە کردبێتەوە کەبەهێزترین کادیری یەکێتی لەئێستادا بکەن بەمەسئولی مەڵبەندی سلێمانی، پێشتر بەرزانی کاك ئەحمەدیان کردە بەرپرسی سلێمانی، دەشێت هەستیانکردبێت کارەکان لەو بارودۆخەی ئێستای یەکێتیدا بەو ناڕەوات بەڕێوە، چونکە بەشێکی زۆری کادیرەکانی مەڵبەندی سلێمانی لەگەڵ گۆڕان بوون و ئێستا ریزەکانی یەکێتییان بەجێهێشتووەو رۆیشتوون، یەکێتی کۆمەڵێك کادیری بەژمارەکەمی لەئاستی سەرکردایەتیدا لەسلێمانی ماوە کەکاك (عومەر فەتاح)و کاك (بەرهەم) لەمەکتەب سیاسین، لەگەڵ (دکتۆر کەمال فوئاد) کەهیچیان هی ئەوە نین تازەببن بەبەرپرسی مەڵبەندی سلێمانی، پێموایە کەسێکی باشتر لە(هێرۆخان)یان

نەوشیروان لەهەموو کەس جەلالی تر بووە، مام جەلال ئەم پیاوەی بەکارهێناوە بۆ لێدانی ئەو کەسانەی کەپێیوابووە سەر بەرزەکەنەوە لەناو یەکێتیدا

نەبووە، بەو ئومێدەشەوە (هێرۆخان)یان هێناوە کەبتوانێت وەزعەکە هەڵبسێنێتەوە یان بتوانێت ئیعتیبار بۆ یەکێتی بگێڕێتەوە، من نازانم تاچەندە سەرکەوتوو دەبێت.

ڕێگامەگەزین: بۆئەوەندە باسی لاوازی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی یەکێتی دەکەیت؟ بۆئەمانە لاوازن لەکاتێکدا کەسێکی وەکو کۆسرەت رەسوڵ خۆی بەکوتلەیەکی گەورە زانیوە، دکتۆر بەرهەم پێیوایە تەکەتوولێکی گەورەیە، ئایا ئەم لاوازییە تەنها لەبەرامبەر تاڵەبانیدایە؟

عەتا قەرەداخی: ئەمانە هەموو جێگای خۆیان هەیە، هەموویان هەریەکە بەپێی توانای خۆی خەباتی کردووەو شوێنی خۆیان هەیە، ئەمانە لەمەکتەب سیاسی و سەرکردایەتیدا جێگەی خۆیان هەیە، بەڵام گرنگ ئەوەیە تۆ لەسیاسەتدا بۆ خواری

[illegible] چۆن ئیش دەکەیت و چۆن خوارەوە بەڕێوەدەبەیت، لەمەش گرنگتر ئەوەیە [illegible] سەرەوەی خۆت چۆن دەتوانیت بۆچوونت هەبێت، چۆن دەتوانیت بەشداربیت لەبڕیاردان، چۆن دەتوانیت بەشداربیت لەگۆڕینی هەندێك بڕیاری نابەجێ، بەشداربی لەوەی کەئەم بەشەی وڵات کە لەژێر دەستی کورددایە، چۆن بەڕێوەدەچێت، چۆن بڕیاری لەسەر دەدرێت، ئابوورییەکەی لەکوێوە دێت و چۆن سەرف دەکرێت، شێوەی ئیدارەکەی چۆنەو بەپێی چ عەقڵ و بڕیارێك بەڕێوەدەبرێت، ئایا مەکتەب سیاسی دەتوانێت ئەوە بکات؟ بەداخەوە تائێستا نەیتوانیوە دەوری کاریگەرییان هەبێت لەبڕیارە چارەنوسسازەکاندا، ئایا ئەم مەکتەب سیاسییە بەدرێژایی تەمەنی خۆیان توانیویانە ڕێگە لە(مام جەلال) بگرن بۆئەوەی کارێك نەکات؟ یان ڕێگەی لێبگرن بۆئەوەی سەفەرێك نەکات؟ ڕێگەی لێبگرن باجارێك وتارێك پێشکەش نەکات لەموناسەبەیەکدا؟ ڕێگەی لێبگرن کەتەسریحێك نەدات؟ ڕێگەی لێبگرن کەگفتوگۆیەك لەگەڵ تەلەفزیۆنی شوێنێك نەکات؟ من پێموایە نەپرسی پێکردوون و نەبەشایانی ئەوەشیان دەزانێت کەپرسیان پێبکات، نەئەمانیش دەتوانن لەو بوارانەدا قسەیەك بکەن و نەقسەشیان وەردەگیرێت، ئەمە واقیعەکەیە، ئەوەی کەمن دەڵێم لاوازن لەئاستی سکرتێری گشتیدا لاوازن، ئەگەر لاواز نەبوونایە، کۆدەبوونەوەو بە(مام جەلال)یان دەگووت بەڕێز (مام جەلال) هەموومان دەزانین کەشوێن و پێگەش تۆ چەند ەگورەیە، تۆ خاوەنی (٥٠) ساڵ خەباتی نەپساوەیت، تۆ لەمێژووی کورددا یەکەمین کەسیت گەیشتووی بەکورسی سەرۆك کۆماری عیراق، واز لەسکرتێری حزب بهێنە، ئەگەر ئەم مەکتەب سیاسی و سەرکردایەتییە لاواز نەبوونایە، هەر ئەو کاتەی (مام جەلال) بوو بەسەرۆك کۆمار عیراق، کۆبوونەوەی تایبەتی خۆیان دەبەست و هەموو پێکەوە پێیان دەگووت (ئێمە هەمووومان تۆ بەباوکی ڕۆحی خۆمان و حزبەکەمان دەزانین، تۆ دامەزرێنەری ئەم حزبەی، تۆ دروستکەری ئێمەی، بەڵام ئیتر تۆ وەکو سەرۆك کۆمار دەبێت بێیتە دەرەوەی حزب، چونکە پۆستی سەرۆك کۆماری عیراق لەهەموو دنیا حیسابی بۆ

دەكرێت، كەواتە بەراورد بەسەرۆك كۆماری عیراق، سكرتێری یەكێتیی نیشتمانی پۆستێكی نزمترە لەچاو سەرۆك كۆماری عیراقدا، بۆیە دەبێت رێگەمان پێبدەیت كەسكرتێرێكی دیكە بۆ خۆمان هەڵبژێرین!)، ئایا توانیویانە بەهیچ شێوەیەك لەناو خۆشیانداو لەپشتی مام جەلالیشەوە باسی شتی وابكەن؟ تەنانەت تەسەوریش ناكەم لەپەنا دیوارو دوو دووش بوێرن باسی شتی وا بكەن، من مەبەستم لەلاوازییان ئەمەیە، ئەگەر ئەمەیان بكردایە بەقازانجی حزبەكە بوو.

پێموایە ئەگەر ئەمەیان بكردایە نەحزبەكە تووشی ئەم كێشەو گرفتانە دەبوو، نەخودی مام جەلالیس بەو شێوەیە شپرزەو پەك كەوتوو دەبوو، هەم دەیانتوانی هەندێك ریفۆرم لەحزبەكەیاندا بكەن و حزبەكە ئاوا تووشی قەیران و دابەشبوون نەدەبوو.

رێگا مەگەزین: تاڵەبانی زۆر كات بۆی ئیمزاكردوون كەجێگرەكانی هەمان دەسەڵاتی ئەویان هەیە لەرووی بڕیاردانەوە، زۆرترینیش جێگرەكانی لەكوردستاندا بوونیان هەبووە، چ كاك كۆسرەت بێت، چ د.بەرهەم یان ئەوكات كاك نەوشیروان بووە، تاڵەبانی هەمیشە داكۆكی لەوە دەكات ئەوانە هەمان دەسەڵاتی ئەویان هەبووە، دوایین یاداشت و داواكرایی كەتاڵەبانی لەبەغدا بۆ ئیمزاكردن، ئەوەبوو كەهەموو مەكتەب سیاسی و جێگرەكانی بۆیان بردوو پێیان وت تۆ ئەگەر ئەمانە ئیمزا نەكەی و پێوەی پابەند نەبیت، ئێمە ئیتر لەگەڵ تۆ نابین؟

عەتا قەرەداخی: ئەوەی كەبۆ جەنابتانم باسكرد، هەمووی خەتای تاڵەبانی نییە كەبارودۆخەكە وایە، بەڵكو بەشێكی بەهۆی لاوازیی ئەوانەی خوار ئەوەوەیە، تۆ سەیركە لێرەوە لاوازییەكە دەرەكەوێت، یاداشتێك دەبەنە بەردەم مام جەلال، مام جەلالیش دەڵێت وەرەقەی سپیتان بۆ ئیمزا دەكەم، بڕۆن حزب رێكبخەنەوە، بڕۆن باری دارایی رێكبخەنەوە، حكومەت رێكبخەنەوە، پەیوەندییەكانی دەرەوە رێكبخەنەوە، بەڵام ناكرێت! بۆ؟بەڕاستی وەڵامی ئەم پرسیارە بەلای منەوە سەیرە! ئایا هەموو گیروگرفتەكان پەیوەندییان بەلاوازی مەكەبی سیاسی وسەركردایەتییەوە

هەیان مام جەلالیش لەبنەڕەتدا ئەم قسانە دەکات، بەلاّم ڕێگەی بەجێبەجێکردنیان نادات؟ من ئەمە دەگێڕمەوە بۆ دوو حاڵەت، بەشێکی بەدرێژایی مێژوو بەپێی ئەو ئەزموونەی کەسەرکردایەتی یەکێتی بەوانەی ماونەتەوەو بەوانەشی کەچوونەتە دەرەوە یان لەژیاندا ماون، لەگەڵ مام جەلال هەیانەو باش لەوە تێگەیشتوون کەچۆن کاربکەن لەلەگەڵ مام جەلال، هەروەها پێموانییە بتوانن وا بەئاسانی دەست وەردەن لەهەندێك کار کەمام جەلال پێی نازازی بێت، هەروەك مام جەلال هەندێك شتی دروستکردووە کەبڕواناکەم ئەمان بوێرن دەستی لێبدەن، بۆیە سەد وەرەقەی سپیشیان بۆ ئیمزا بکات، پێموانییە تەجاوزی ئەو حاڵەتانە بکەن، ئەمە ڕوویەکی مەسەلەکەیە، با بڵێین هەر لەبنەڕەتەوە ئەمان بەشێوەیەك ترسێندراون کەناتوانن دەستبخەنە ئەو کارانەوە کەمام جەلال خۆی کردوونی، ڕووی دووهەمیشی ئەوەیە من پێموانییە مام جەلال هەروا بەئاسانی ئەو هەموو دەسەلاّتەی خۆی بداتە ئەوان و وەرەقەی سپییان بۆ ئیمزا بکات، پێیان دەڵێت وەرەقەی سپیتان بۆ ئیمزا دەکەم، بەلاّم ئەمە لەناو پرۆتۆکۆلێکی ڕەسمیدا نەبووە لەناو کۆبوونەوەیەکی فەرمی نەبووە، مام جەلال لەکاتی تووڕەبووندا هەموو جارێك ئەوە دەڵێت.

من پێموایە وتوویەتی ئێوە هیچتان لەبارا نییە ها ئەوە وەرەقەی سپیتان بۆ ئیمزا دەکەم بڕۆن کاربکەن، ئەمە هەر شێوەی دەربڕینەکە مانای لێسەندنەوەی مافە لەوان کە لەو بوارانەدا کاربکەن یان بڕیاربدەن، ئەگەر سەنج لەسیستمی حزبی بدەین لەوڵاتێکی ئاسایی یان لەکۆمەڵگەیەکی ئاساییدا، ئەوا وەکو هەموو دامەزراوەکانی تر دەسەلاّت و سەلاّحیاتەکان دابەشکراون، دەسەلاّت یسکرتێری حزب دیارە، سەلاّحییەتەکانی جێگر دیارە، مەکتەب سیاسی سەلاّحییەتی دیاریکراوە، سەرکردایەتی سەلاّحییەتی دیاریکراوە، بەلاّم لێرە دەتوانم بڵێم هەموو دەسەلاّتەکان لەکەسێتی سەرۆك و سکرتێردایە، ئیتر ئەو سەرۆك و سکرتێرە کاك مەسعود بێت یان مام جەلال یان مامۆستا سەلاّحەدین بەهائەدین یان هەر کەسێکی ترن بەتایبەتی ئەو

شتانەی کەپڕ بایەخ و گرنگن و پەیوەندییان بەمەسەلە چارەنوسسازەانی حزبەوە نییە، ئەوانی تر هەندێك دەسەلاتیان هەیە کە لەسنوورێکی دیاریکراودایە، دەسەلاتیان هەیە بۆ پارە سەرفکردن،دەسەلاتیان هەیە بۆ خەڵك کڕین بۆ ئاراستەکەی خۆیان، دەسەلاتیان هەیە کەسە نزیکەکانی خۆیان بهێننە پێشەوەن دەسەلاتیان هەیە بەپارەی حزب و خەڵك لەخوار سەرۆك و سکرتێرەوە زمە بکرِن و هێز بۆ خۆیان پەیدا بکەن. دەسەلاتیان هەیە بۆ ململانێکردن بەمەرجێك ئەو ململانێیە لەخوار کەسی سەرۆك یان سکرتێرەوە بێت، بەلام دەسەلاتی ئەوەیان نییە دەوریان هەبێت لەبڕیارە چارەنوسسازەکانی حزبدا.

==========

گۆڕان یەکێکە لەو خەونانەی کەهەموو ئایدۆلۆژییەکان بانگەشەیان کردووە لەکۆمەڵگەی کوردیدا، کەچی لەو بەهەشتەی پەیمانی دروستکردنیان داوە زۆر جار دۆزەخێکیان بۆ هاوولاتییان خوڵقاندووە.

لڤین: هادی حەمە ڕەشید-هەڵەبجە

خەونی گۆڕان

لەشۆڕشی سووری شاخەوە تادانیشت

سەرنجدانێکی وردی کۆمەڵگەی لەنیو سەدەی ڕابردوودا دەبینین ئەو هێزە کۆمەلایەتی و سیاسییانەی کەوەك هێزی گۆڕان چاکساز خۆیان بەیانکردووە، کۆمەڵە هێزێك بوون زیاد لەپێویست دەروێشی ئایدۆلۆژیاکەیان بوون و دوور لەواقیعی کۆمەڵگە تاکی کوردییان بارکردووە بەکۆمەڵێك وەهم و خەیاڵ و میسالییەت، لەدواجاردا دوای بێئەنجام لەگەڵ کۆمەڵگادا وردەوردە پاشەکشەیان لەوەهم و خەون و دروشمە گەورەکانیان کردووەو هەندێك جاریش (بەهەمان هەناسەی پێشوو) وەك نەیارێکی توندی بۆچوونەکانی پێشوویان دەرەوتوون و لەو بوارەدا یاریزانێکی شارەزاو هەرچییان پێکراوە کردوویانە.

ئەوەی لەو نیوەندەدا باجی ئەو شەڕە بێئاکامەی داوە (پرۆسەی) گۆرشان بووە

سەرەنجام لەباربراوە!

خەیاڵی شاعیرانە



پڕۆسەی گۆڕان وەك پڕۆژەو بەرنامەی سیاسی و دوور لەخەیاڵ و فانتازیای شاعیرانە دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای نیوەی دووەمی سەدەی رابردوو.

خەیاڵی شاعیر بەو پێیەی کەفراوانەو توانای خوڵقاندن و دروستکردنی وێنەی واعیقی و دوور لەواقیعی هەیە، زۆر جار شاعیرانی کورد خەونیان بەکوردستانێکی باشترەوە بینیوەو وەك (ئەحمەد موختار جاف بەهیوایە رۆژێك هێڵی شەمەندەفەر بگاتە چیاکانی هەورامان، یان گۆران دەیەوێت کۆشکی وڵات بنیاتبنێت و بیکاتە بەهەشت، هێمن سەرزەنشتی کورد دەکات و داوایان لێدەکات وەك کچی نەتەوەکانی تر ئەمانیش بگەنە ئاسمان و کەشفی ژێر دەریا بکەن و لەپێشکەوتنی تەکنەلۆژیادا کوردستان بگەیەنن بەئاستی وڵاتان، نەك کاریان تەنیا گۆرەوی چنین و لەبەردەرگا دانیشتن بێت، هەروەها فایەق بێکەس بەشیعر وێنەی فڕۆکە بۆ منداڵانمان دەکێشێ...)، هەرچەندە ئەمە بابەتێکی ئەدەبییە، بەڵام دەمەوێت بڵێم خەیاڵ و فانتازیای شاعیرانمان کەمتر ناواقیعین بەبەراورد لەگەڵ خەونی نوخبەی سیاسی و کۆمەڵایەتییمان، چونکە سەرەڕای کەمیی خزمەتگوزاریی، بەڵام پێشکەوتنە بەردەوامەکانی دنیا بەجۆرێکن ئەوەی دوێنێ شاعیرەکانمان بەخەیاڵ بیریان لێدەکردەوە، ئەمڕۆ (کەم تازۆر) بەواقیع دەبینرێت، بەپێچەوانەشەوە خەیاڵ و وەهم بووە بەرنامەو پڕۆژەی هێزە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی کوردستان و خەونی گۆڕان بووە!

لەتبوونی خەونەکان

سەرەتای ١٩٦٤ خەڵکی کوردستان بینەری درامای لەتبوونی شۆرشی کوردستان بوون، کە لەهەمان کاتدا پەرتبوونی خەون و ئامانجەکانی شۆڕش بوو.

کەرتبوونی هەڵوێستەکان و ئاژاوەی ناوماڵی پارتی جیابوونەوەی (باڵی مەکتەبی سیاسی)ی لێکەوتەوە.

دەتوانرێت ئەم جیابوونەوەیە بەجیابوونەوەیەکی فیکری ناوبەرین، بەوپێیەی هێزی [illegible]م کە(پارتی و سەرۆکەکەی و هەماهەنگ لەگەڵ هێزی زۆرینەی حیزب و هەرەمەکی خەڵکدا) وەك هێزی بنەرەتخوازو کۆنسێرفاتیف، هێزی دووەم ( باڵی مەکتەبی سیاسی پارتی، برایم ئەحمەدو مام جەلال و هاورێکانیان) وەك هێزی نوخبەی چەپ و ئۆپۆزسیۆن بوون!

ئەم باڵە لەیەکەم کاردانەوەیاندا (وەك لەکتێبەکانی پەنجەکان یەکتر دەشکێنن-ی نەوشیروان مستەفا، بیرەوەریی پێشمەرگەیەك - سەید کاکە، هاورێنامە- هاورێ باخەوان... دا هاتووە)، لە ٤-٩/٤/١٩٦٤ لەماوەت کۆنفرانسێکیان بەست دوای چەند رۆژێك بەیاننامەیەکیان راگەیاندو تێیدا (بارزانی)یان تاوانبارکردو رەخنەیان لەئاگربەستی نێوان شۆرش و دەوڵەتی عیراق گرت و بەشێکی بێسوودیان وەسفکرد.

(مەکتەبی سیاسی) خۆیان بەپارتییەکی رەسەن هەژمار کردو کۆنگرەی شەشەمیان لەکەلار بەست وەك درێژەپێدەری کۆنگرەی شەشەمی کۆیە، لەو کۆنگرەیەدا برایم ئەحمەد بەسکرتێر هەڵبژێردرایەوەو مەلا مستەفایان لەپارتی دەرکرد! واتە لەیەك کاتدا دوو (پ.د.ك)و دوو رۆژنامە بەناوی خەباتەوە هەبوون! وەك نەوشیروان مستەفا دەڵێت: (لەبری ئەوەی هەوڵی رێگەچارەی بەلاداخستنی هێمنانەی ناکۆکییەکان بدەن، ناکۆکییەکانیان قووڵتر کردو بیانووی سیاسی و ئایدۆلۆژییان بۆ تاشی و سەرکردایەتی بارزانییان بەخیانەت و جاشایەتیی ئێران تاوانبار کرد، هەروەك ئەوانیش لەلای خۆیانەوە هەوڵی ئاشتییانەیان نەداو (م.س)یان بەجاشایەتی عیراق تاوانبار کرد).

پاشان لەماوەیەکی کورتدا لەئەنجامی زبر مامەڵەکردنی ئەم ستافەدا دووژمنێکی زۆریان بۆ خۆیان دروستکرد (پارتی و گرووپی بارزانی، حیزبی شیوعی عیراق کە لەکۆنەوە ناکۆکی لەگەڵ پارتی هەبوو لەئەنجامی ترسیان لەباڵی مەکتەبی سیاسی بۆ یەکجاری و تائێستاش لەگەڵ پارتی پێکهاتن، کاژیك کەپارتێکی نەتەوەیی بوون و گلەیی و رەخنەیان لەپارتی ئەوەبوو نانەتەوەیی و-فەریکە مارکسی-ن، بۆیە

جیابوونەوەی ئەو باڵەیان بۆ تێکشکان و نەمانی بۆن و بەرامە مارکسی لەناو پارتیدا [illegible] حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران سەرسەختانە دژایەتی مەکتەبی سیاسی و پشتگیریی بارزانییان کرد، حکومەت پشتگیریی لەباڵی نەرمی بارزانی و دژایەتی ئەوانی تر کرد، لەسەر ئاستی عەرەبی و هەرێمی و جیهانیش هەروابوو).

بۆیە پرۆژەیەکی بەم جۆرە جگە لەدروستبوونی دوو تێرم (مەلایی – جەلالی) هیچی لێ شین نەبوو، (وەك گۆڕان)، بگرە گۆڕان نرخی ئەم راستییە تاڵەی داوە!

چەپێکی توندڕەو..

مەست بەشۆڕشی نێو کتێبەکان!

هێزی گۆڕان لەساتێکدا کەدێت، خۆی بەپەیامبەری خێرو هێزی بەرانبەریش بەخوای شەڕو درێژەپێدەری باری چەقبەستوو دژە گۆڕان دەزانێت!

لەدوای هەرەس و لەناو گەرمەی ململانێی رۆژهەڵات و رۆژئاوا، پەنابردنی گەلانی ژێر دەست بۆ بیری چەپی شۆڕشگێڕانە لەپێناوی سەندنەوەی مافیان، هاوکات ململانێی مەلایی و جەلالی هێڵێکی چەپ لەنێوا شۆڕشی کوردیدا فۆرمەلە بوو، کە لەزۆرینەی گرووپی مەکتەبی سیاسی و هەندێك گەنج و لاوی خوێنگەرم و گۆشکراو بەبیری مارکسی- لینینی کە لەناو شارەکانی زانکۆو نێوەندەکانی خوێندنەوە هاتبوون، کۆمەڵەی مارکی – لینینی کوردستان، پاشان کۆمەڵەی رەنجدەرانیان دروستکرد، لەگەڵ بزووتنەوەی سۆسیالیست و هێڵی گشتیی (ی.ن.ك)یان پێکهێنا.

گەرچی لەشۆڕشی نوێدا ئەم گرووپە کاریگەریی زۆریان هەبوە، بەڵام وەك پشکۆ نەجمەدین لە(ئەزموون و یاد)دا دەڵێت: (زۆربەی زۆری ئەو خوێندەوارانە کەجێگایان لەریزەکانی کۆمەڵەدا گرتبوو لەو رۆژگارە سەختانەدا دێنەمۆی ئەو بزووتنەوە فیکری و سیاسی و چەکدارییەیان هەڵدەسووڕاندو ئاڵا هەڵگرانی شۆڕشی (نوێ)بوون، لەهەندێك کات و شوێنیشدا موعجیزەیان دەخوڵقاند..).

بەڵام هیچ کەسێك لەو بەڕێزانە کەمێژووی ئەو شۆڕش و بزووتنەوەیەیان

نووسیوەتەوە باسیان لەکاڵفامی و پێنەگەیشتن و زبریی هەڵوێست و پێشنیارەکانیان بۆ گۆڕان نەکردووە، پشکۆ نەجمەدین باس لەکەم ئەزموونی خۆی دەکات و لەهەمان کتێبدا دەڵێت: ((هەندێك لەدانراوەکانی لینین و دوو کتێبی جیڤاراو (چەپکێك لەوتەکانی ماو)م خوێندبووەوە، ئیدی خۆم بە(رامبۆ)یەکی لەشکاننەهاتوو دەزانی))، لەبری ئەوەی ئەم هێزە دیوە جوانەکەی مارکسی لە(گیانی بەرخودان و فەلسەفەی ئیداری و عەدالەتی کۆمەڵایەتی و ...) بخەنە بەرچاوی تاکی کورد، بەپێچەوانەوە هاتن تەرجەمەی (مارکسیەت)یان بە(ئیلحاد)و راگەیاندنی شەڕ دژی کۆمەڵگەو ئایین و بیروباوەڕی کۆمەڵگا کرد، هەر وەك سەید کاکە لە(بیرەوەریی پێشمەرگەیەك)دا باس لەپێشمەرگەکانی (ح.س.ع) دەکات کەزۆر جار بەبەرچاوی خەڵکی گوندەکانەوە گۆشتی بەرازیان دەخواردو مەییان دەخواردەوەو دەچوونە نێو مزگەوتەکانەوەو پیسییان دەکرد... نەوشیروان مستەفاش بەسەرهاتی دوو کچ دەگێڕێتەوە کە لەسلێمانییەوە هاتبوونە شاخ و هەواڵی ئەوەیان وەك سکرتێری کۆمەڵە پرسیبوو... دەڵێت: یەکێك لەکچەکان بەیکەم پرسیار لێی پرسیم وتی: ((بڕوات بەخوا هەیە؟!)) پاشان دەڵێت: ((بەلامەوە سەیر بوو موناقەشەکانی بەم پرسیارە دەستپێکرد، بەلام تێگەیشتم خۆی بەچەپێکی ئازادیخوازو سەربەست و کراوە دەزانێت، بۆیە وتم: ئەوە شتێکی تایبەتییەو پەیوەندیی بەویژدانی مرۆڤ خۆیەوە هەیە))، لەمەوە دەردەکەوێت لەو ساتەدا دەربڕینی نەبوونی خوا یەکسان بووە بەچەپێکی ئازادیخوازو کراوەو پێشکەوتنخواز!!

خێڵی درۆ!

هەندێك لەهەڵگرانی بیری مارکسیەت چەند هەنگاوێك زیاتر دەچوون و پێیانوابوو پێویست بەشۆڕشی چەکداری و خەباتی شاخ و تێکۆشان ناکات، بەڵکو ئەوە تەنیا کۆمەڵگای کۆنەپەرست و ئایینە رێگرە لەبەردەم پێشقەچوونی کۆمەڵگەدا، ئایین تریاکی گەلانەو نەریتی کۆمەڵایەتی کۆسپی بەردەم سەرکەوتنی خەباتی چینایەتییە!

لەنێوان شارەکانی کوردستاندا دادەنیشتن، لەکاتێکدا لەپلەو پۆستە حکومی و

ئیمتیازات و زەماڵەی خوێندن لەوڵاتان بێبەش نەدەکران لـەبڵاوکراوەکانی رژێم و دەزگا رۆشنبیرییەکاندا پێگەیەیك باشیان هەبوو، چەند بابەتێکی ئـەدەبی و فیکـری و سیاسی کاڵ و کرچیان دەنووسی، ئیدی خۆیان لێدەبوو بە(مارتن لۆسەر)!

سوارەی ئیلخانی زادە لەشیعری (خێڵی درۆ)دا رووبەڕوویان دەوەستێ (کەخۆیشی هەڵگری هەمان فیکرە) کۆمەڵێك زاراوەیان بۆ بەکاردێنێت وەك خێڵی درۆ، گـەلی دەم پڕ لـەهەرا، کرمـی کتێـب، حاشـارگری رووبەنـدی وشـە، بـووکی بـن تـارای سوور...) لەرێگای ئەم دەقـەوە پێیانـدەڵێت گـۆڕان بـەهات و هـاوارو چـەلەحانێ ناکرێت، گەلانی دی ئالای سووری چەکوش و داس دەکەنـە هـۆی سـەربەخۆیی و پێشکەوتن، بەڵام ئێوە وەك تارای بـووك دەیـدەن بەسـەرتاندا! لـەبن سـێبەری ئـەو ئالایەدا وەك (مارەیی) ئیمتیازات وەردەگرن!

وەهمی ئیسلامی و دروستکردنی دارولئیسلام!

لەگەڵ رووخانی بلۆکی رۆژهەڵات و هەرەسهێنانی یەکێتی سـۆڤیەت و یۆگـسلاڤیاو سەربەخۆیی زۆرێك لەکۆمکارەکانیان، بەتایبـەت ئەفغانـستان و چیـچیان و بۆسـنەو کۆسـۆڤۆ..و بووژانـەوەی بیریـی ئـایینی و دەرکـەوتنی ئـەوەی پێیـدەوترا (بێـداری ئیسلامیی)...

لەکوردسـتانیش لەگـەڵ راپەڕینـداو بەهاتنـەوەی هێـزە نەتـەوەیی و نائاینییـەکان لەشـاخەوە بزووتنـەوەی ئیـسلامیش گەڕایـەوە، پاشـان یـەکگرتووی ئیـسلامی و بزووتنەوەی راپەڕین وئیسلامی (لاجەماعە)... دەستیان بەبانگەواز کـردو شـەپۆلێك لەگەنجان و رۆشنبیران و کەسانی چالاك لەدەوریان کۆبوونەوە.

هاوکـات لەئـەنجامی شـەڕی نێوخـۆی نێـوان یـەکێتی و پـارتی و ناعەدالـەتی لەدابەشکردنی ئیمتیازات و بوونی گەنـدەڵی ئیـداری پەروەردەیی و کۆمەڵایـەتی.. تادەهات بازاڕی ئیسلامییەکان گەرم و گەرمتر دەبوو، لێرەوە جـارێکی دی ئومێـدی گۆڕان لای تاکی کوردی چـرۆی کـردەوە، پرسـی گـۆڕان کەماوەیـەك بـوو تـۆزو گەردی لێنیشتوبوو، بگرە خەریکبوو لەیادەوەریماندا کاڵدەبووەوە، ئـاهێکی بەبـەردا

هات...

بەڵام ئەم هێزەش بەهەمان هەناسەوە لەبری بەکارهێنانی دیوە هیومانییەکەی ئیسلام بۆ دەربازبوون لەنادادگەری و بەهێزکردن و ڕێکخستنەوەی ریزەکانی کۆمەڵگەو بەکارهێنانی چەکی ئایین بۆ یارمەتیدانی سەروەریی یاسا لەکوردستان، هاتن و شەڕە لاوەکییەکانیان کردە پڕۆژەی خۆیان لەنێو کۆمەڵگەی کوردیدا، وەك فاروق ڕەفیق ناوی ناوە (پڕۆسەی بەئیسلامکردنەوە)، دروستکردنی کێشە لەسەر کۆمەڵێك زاراوەو پرسی لاوەکی کەهیچ لەمانە نەك ئامرازی گۆڕان نەبوون، بگرە پرسەکەشیان بەئاقارێکی ناتەندروستدا دەبرد.

یۆتۆپیای عەلمانیەت

سەرەتاو ئەلف و بێی عەلمانیەت بریتییە لەسەروەریی یاساو ڕێزگرتن لەکەرامەت و مافە مرۆییەکان، هاووڵاتیبوون و مافەکانی ژن، جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان لەیەکدی، بوونی ڕێکخراوەکان، بوونی شەفافیەتی زیاترو بەهێزکردنی دەسەڵاتی چوارەم، ململانێی دیموکراسی و هەڵبژاردنی ئازادانەو دوور لەدەستێوەردانی حیزب و حکومەتن، دواجار گۆڕین و دەستاودەستکردنی دەسەڵات، نەك تەنیا جیاکردنەوەی دین لەدەوڵەت.

عەلمانیەت لەتاپیە کوردییەکەیدا شتێی ترمان پێدەڵێت و جیاوازە لەو عەلمانییەتەی کەبەم موفرەداتانە دەستپێدەکات! بەڵکو جارێکی دی دابەشکردنی کۆمەڵگە بۆ (ڕەش و سپی، پێشکەوتنخوازو کۆنەپەرست، کراوەو داخراو...)

ناتوانین بڵێین لەکوردستاندا هێزی عەلمانی و ئەنتی عەلمانی چوونەتە مەیدانی ململانێی پراکتیکییەوە، چونکە ئەو هێزانەی کەناوی عەلمانییان لەخۆیان ناوە، لەقەیرانێکی قووڵی نوێنەرایەتیکردندا، نەیانتوانیوە تەنانەت متمانەی نوخبەی سیاسی و دەستەبژێری حیزب بەدەستبهێنن، وەك لەدانیشتنەکانی ئەم دوناییەی پەرلەمان بینیمان لەسەر یاسای باری کەسێتی و بەتایبەتی پڕ}ژەی ڕەتکردنەوەی فرەژنی لەکوردستان..

هەرچەندە ئـەم هێـزە بتـوانێ پێـشنیارەکانی لـەچوارچـێوەی یاسـاو شـەعریعەتیدا لەمەزهـەبی جیاجیاکانـدا جێبکاتـەوە، بـەڵام لەدەربڕینـدا نـەیانتوانیوە خۆیـان لەختوکەدانی هەستی ئایینی خەڵکی بپارێزن، زۆرجاریش بەبێ ئـەوەی پێویـست بـێ دەست بۆ پیرۆزییەکانی خەڵکی و نـەگۆڕەکانی ئـایین (پوابـت) دەبـەن، لەکاتێکـدا شـەڕی دژایـەتیکردنی گەنـدەڵی و بەمـەدەنیکردنی کۆمەڵگـەو دابینکردنـی خزمەتگوزاری و بەرخوردی لۆژیکی لەگەڵ ئـایین –نـەك هەوڵـدان بـۆ کوشـتنی– شەڕی ئەوانە.

ئەمانە نەك هـەر خـەونی گۆڕانیـان دروسـتنەکرد، بـەڵکو ڕەوشەکەشیان بەچـەند فەرسەخ بەرەو دواوە گەڕاندەوە.



## بۆچی نەوشیروان مستەفا رابوردووی کۆسەرت رەسوڵی هەڵدایەوە؟

ی نێوان نەوشیروان مستەفاو کۆسرەت رەسوڵدا، تاڵەبانی براوەی یەکەمە نەوشیروان مستەفا (٢٥/١١/٢٠٠٩)ی کردەی سەرەتای شەڕکردن لەسەر ئایندەی خۆی و بزووتنەوەکەی لەڕێی کارتەکانی رابردووەوە، بۆئەمەش سوودی زۆری وەرگرتووە لەو تایبەتمەندییە سیاسییەی کەپێناسراوە، ئەویش بریتییە لەبەر دیکۆمێنتکردنی هەموو ئەو رووداوانەی کە لەکوردستاندا روودەدەن، ئەمجارە نەوشیروان مستەفا بەبلاوکردنەوەی یاداشتەکانی هەستیارترین قۆناغی خەباتی سیاسی خۆی و هاوڕێکانی، گەلێك پرسیارو سەرنجی بەدوای خۆیدا هێنا، بەجۆرێك کەزۆرێك لەچاودێرانی سیاسی تووشی شۆك کرد بەوەی گرێ یادەوەرییەکانی بەردایە رابوردووی نزیکترین هاوڕێی خۆی، کە(کۆسرەت رەسوڵ)ە، ئەوەی لەم نێوەندەدا بەهای سیاسی خۆی هەیە، ئەوەیە کەبۆچی نەوشیروان مستەفا بێباکانە دوور لەڕەچاوکردنی پاراستنی پەیوەندییەکانی خۆیی و کۆسرەت رەسوڵ بۆچوونە مێژووییەکانی خۆی ئاراستەی جێگرەکەی تاڵەبانی کرد؟ بۆچی نەوشیروان مستەفا هەڵوێستی کۆسرەت رەسوڵی لەکاتی هەڵمەتی هەڵبژاردنی ٢٥ی تەمموزی رابوردوو لەبەرچاو نەگرت؟

ئەمانە ئەو پرسیارە سیاسییانەن کەدەبێت شرۆڤەی وردیان بۆ بکرێت، بەبۆچوونی ئێمە بلاوکردنەوەی یاداشتەکاین نەوشیروان مستەفا لەم کاتەدا دەگەڕێتەوە بۆ چەند خاڵێکی گرنگ، رەنگە گرنگترینیان پەیوەندیی بەو سیاسەتە توندەی تاڵەبانییەوە هەبێت بەرانبەر بەگۆڕان، لەزۆر شوێندا بەڕاشکاوی ئەوەی وتووە کەدەبێ بەهەر شێوەیەك بێت بزووتنەوەی گۆڕان لەنەخشەی سیاسی کوردستاندا بتوێنێتەوەو بەهیچ جۆرێك مامەڵەی سیاسییان لەگەڵدا نەکات.

### نەوشیروان مستەفا کارتەکەی کۆسرەت رەسوڵ دەسووتێنێت

هەرچەندە نەوشیروان مستەفا ناونیشانی ئەو بەشەی یاداشتەکانی ناونابوو (لەنێوا من و مام جەلالدا)، بەلام تەرکیزی تەواوەتیی لەسەر کۆسرەت رەسوڵ بوو،

لەبەرئەوەی نەوشیروان مستەفا گەیشتووەتە ئەو بڕوایەی کەهەمیشە کۆسرەت رەسول لەناو یەکێتیدا بەدوای کارتی شەڕدا دەگەڕێت لەگەڵ مام جەلالدا، لەماوەی رابردووشدا کۆسرەت رەسول گۆڕانی وەکو کارتێکی بەهێز بەرانبەر بەتاڵەبانی و مەکتەبی سیاسی یەکێتی بەکارهێناوە، بەوەی وای لەمام جەلال و مەکتەبی سیاسی گەیاندبوو کەدەتوانیّ گۆڕان بەکاربهێنێت، لەم رووەشەوە بەشی زۆری ئەندامانی کوتلەکەی لەسەر ئەوە راهێنابوو بەردەوام ئەوە بڵێن کەئەوان پشتیوانی گۆڕان و ریفۆرمن لەناو یەکێتیدا، هەروەها بەرانبەر بەگۆڕانیش یەکێتی وەکو کارتی موجامەلەو هێشتنەوەی پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ گۆڕاندا بەکاردەهێنا، بەمە نەوشیروان مستەفا ئەو کارتەی کۆسرەت رەسولی سوتاند.

لەلایەکی ترەوە لەدوای ئەوەی مام جەلال رێکخستنەوەی یەکێتی لەهەولێر سپارد بەکۆسرەت رەسول، ئەویش لەچەند رێگەیەکی جیاوازەو هەولیدا کەپلانێکی تۆکمە بۆ رێکخستنەوەی یەکێتی لەهەولێر دابڕێژرێت بۆ دەوڵەمەندکردنی پلانەکەشی کەوتە هەوڵدان بۆ گەڕاندنەوەی کادرانی ناو یەکێتی، بەتایبەتی ئەو کەسانەی کەگۆڕشان کاندیدی کردبوون بۆ پەرلەمانی عیراق لەرێی پێدانی ئیمتیازاتی شەخسییەوە.

هەروەها رەنگە بلاوکردنەوەی یاداشتەکاین نەوشیروان مستەفا لەم کاتەدا هەڵوێستێکی شەخسی بووبێت بەرانبەر بەکۆسرەت رەسول، بەتایبەتی دوای ئەوەی کەنەوشیروان مستەفا سەردانی هەولێری کردو لەگەڵ هەرێمی کوردستان هەواداران گۆڕاندا کۆبووەوە، کۆسرەت رەسول لەچوارچێوەی پلانەکەی خۆیدا ئەو کادرانەی سەر بەباڵەکەی خۆی کەچووبوونە ناو گۆڕانەوە گەڕاندەوە بۆ ناو یەکێتی، ئەمەشە گورزێکی کوشندەی دەروونی لەنەوشیروان مستەفا دا، هەر بۆیە دەوترێت یەکێك لەهۆکارەکانی بلاوکردنەوەی یاداشتەکانی نەوشیروان مستەفا لەم کاتەدا پەیوەندیی بەو هۆیەوە هەیە، چونکە بەبۆچوونی نەوشیروان مستەفا کۆسرەت رەسول زۆر بەنووسین لەسەری تێکدەچێت، نووسین کاریگەریی گەورەی لەسەری

دەهێڵێت.

گۆڕان بڵاوکردنەوەی یاداشتەکانی نەوشیروان مستەفایان بەدڵ نییە

دوای بڵاوکردنەوەی یاداشتە ئاگراوییەکانی نەوشیروان مستەفا، رای جیاوازی لەناو بزووتنەوەی گۆڕاندا دروستبوو، هەندێك لەسەرکردەکانی

**

رەنگە بڵاوکردنەوەی یاداشتەکانی نەوشیروان مستەفا لەم کاتەدا هەڵوێستێکی شەخسی بووبێت بەرانبەر بەکۆسرەت رەسوڵ دژی ئەو هەڵوێستەی کۆسرەت لەکاتی سەردانەکەیدا لەهەولێر بەنەوشیروان مستەفای نواند

گۆڕان لەم هەڵوێستەی نەویروان مستەفا وەکو کاردانەوەی دەربڕینی هەڵوێست سەیر ناکەن، بەڵکو پێیانوایە ئەوەی بەشێکە لەنووسینەکانی سەرۆکەکەیان، تەنیا بریتییە لەگێڕانەوەیەکی مێژوویی و پەیوەست نییە بەهیچ بارودۆخێکی سیاسی ناو هەرێمی کوردستانەوە، هەندیچکی تر لەسەرکردەکانی گۆڕان لەگەڵ ئەو بۆچوونەدا بوون کەنەدەکرا لەم بارودۆخەدا نەوشیروان مستەفا یاداشتە ئاگرینەکانی بڵاوبکاتەوەو بێدەنگی باشترین وەڵامە بۆ تاڵەبانی و یەکێتی، ئەوان هەڵوێستی نەوشیروان مستەفا دەربارەی قسەکانی تاڵەبانی لەپلینۆمدا بەگەورە دەزانن کەچۆن بەتەنیا رستەیەك وەڵامی تاڵەبانی دایەوە، ئەوان ئەو رستەیە بەرستەیەکی مێژوویی ناودەبەن بەکاریگەرترو گرنگتری دەزانن لەبڵاوکردنەوەی یاداشتەکانی.

بەڵام هەندێکی تر پێانوایە گۆڕان لەبەرانبەر یەکێتیدا نەرمیی نواندووەو پێویستە زۆر توندتر وەڵامی هێرشی راگەیاندنی یەکێتی بۆ سەر گۆڕان بدرێتەوە.

کێ سوودمەندبوو؟

تاڵەبانی سوودمەندی یەکەمی بڵاوکردنەوەی ئەو یاداشتانە بوو، چونکە پێش بڵاوکردنەوەی ئەو یاداشتانە مەکتەبی سیاسی و تاڵەبانی لەکۆسرەت رەسوڵ بەگومان بوون بەوەی کەپشتگیریی گۆڕان دەکات، ئەمەش بووبووە قەڵغانێك بۆ

پۆستی بـەهای کۆسـرەت رەسـوڵ لـەناو یەکێتیـدا بـەوەی تاڵـەبانی نەیـدەتوانی [illegible] لەکۆسرەت رەسوڵ بدات، ناچـاربووم موجامەلـەی بکـات، بـەڵام ئێـستا دوای بڵاوکردنـەوەی یاداشـتەکانی نەوشـیروان و لێـدان لـەڕابردووی کۆسـرەت رەسولّ، دەرگا بەڕووی تاڵەبانیدا کرایەوە بۆئەوەی لەژێرەوە باڵەکەی برووخێنێـت. هەرچەندە لەڕووکەشدا لەکەناڵەکانی راگەیاندندا ستایشی رۆڵی کۆسرەت رەسـوڵ دەکـات، ئەمـە لەکاتێکدایـە کەهـەموو مەکتـەبی سیاسـی یـەکێتی دژی کۆسـرەت رەسولّن و لەهەوڵی لاوازکردنی پێگەی ئەودان.

وەڵامەکـەی کۆسـرەت رەسـوڵوەك چـاوەڕواندەکرا کۆسـرەت رەسـوڵ وەڵامـی نووسـینەکەی نەوشـیروان مـستەفای دایـەوە، وەڵامەکـەی زیـاتر لەنامەیـەکی بـەرگرییکاری دەچـوو لـەخۆی و دەچـێتە خانـەی کاردانـەوەوە، نـەك وەڵامێکـی گونجاوبێت بۆ نووسینەکانی نەوشیروان مستەفا، چونکە لەسەر لەبەری وەڵامەکەیـدا پاساو بـۆ کەموکوڕییـەکانی ئەوکاتـەی خـۆی و حکومەتەکـەی دەهێنێتـەوە، بـەڵام بەبڕوای کادرانی یەکێتی وەڵامەکە پڕ بەپێستی نووسینەکانی نەوشیروان مستەفا بـوو، بەتایبەت

رۆژ لەدوای رۆژ بەرژەوەندییەکانی کۆسرەت رەسوڵ لەناو یەکێتی دەکەونە بەردەم مەترسییەوە، چونکە لەناو سەرکردەکانی یەکێتیدا تاکو ئێستا ئەو زیانمەندی یەکەمە لەوەدا کەنەوشیروان مستەفا کەوتە هەڵەیـەکی مێژوویی گرنگـەوە، لـەو شـوێنەدا کەباسی کۆنگرەی دووەمـی یـەکێتی دەکـات و دەنووسـێت کـە(جـەبار فـەرمان و کۆسرەت رەسـوڵ و ئەرسـەلان بـایز پاسـەوانەکانیان هێنایـە نـاو هـۆڵی کـۆنگرەو کردیاننـە ئەنـدامی کـۆنگرە، چـونکە شـتێکی ئاشـکرایە کەجـەبار فـەرمان لـەو کۆنگرەیەدا ئامادەنەبوو، بەڵام نەوشیروان مستەفا بۆئەمە پاساو بۆ ئەوە دەهێـنێتەوە کەپاسـەوانانی جـەبار فـەرمان لـەڕێی ئەرسـەلان بـایزەوە هاتوونەتـە نـاو هـۆڵی کۆنگرەوە).

وەڵامەکەی کۆسرەت رەسوڵ خۆماندووکردنێکی زۆری پێوە دیارەو بەشـی ئاشـتی و

دروستکردنەوەی پەیوەندیی لەگەڵ نەوشیروان مستەفای تێدا هێشتووەتەوە وەك دەوترێت دوای بلاوکردنەوەی وەڵامەکەی کۆسرەت رەسوڵ گلەیی خۆی بۆ نەوشیروان مستەفا ناردووەو باسی ئەوەی کردووە کەنەدەبوو ئەو نووسینانە بلاوبکاتەوە، داواشی لێکردووە باکۆتایی بەهەڵدانەوەی لاپەڕەکانی رابوردوو بهێنرێت.

بەرهەم ساڵح پشت لەکۆسرەت رەسوڵ دەکات

وەك پێشتر وتمان لەمەکتەبی سیاسیدا کەس لەگەڵ بۆچوونەکانی کۆسرەت رەسوڵ یەکنا گرێتەوە، تەنانەت (د.بەرهەم ساڵح)یش، هەرچەندە لەکاتی هەڵبژاردنەکانی ٢٥ی تەمموزی رابوردوودا هەست بە لەیەکتر نزیکبوونەوەی (بەرهەم ساڵح و کۆسرەت رەسوڵ) دەکرا، کۆسرەت رەسوڵ پشتی (د.بەرهەم)ی گرت تاگەیشتە سەر کورسیی سەرۆکی حکومەت، بەڵام لەدوای ئەوەوە بەرهەم ساڵح لەو بەڵێنانەی کەدابوونی بەکۆسرەت رەسوڵ پەشیمان بووەوە، بەتایبەت پشتگیرییکردنی یەکێك لەکوڕەکانی بۆئەوەی پۆستی وەزیریی وەربگرێت.

هەرچەندە پێش هەڵبژاردنەکان

گۆڕان پێیوایە ئەوانەی لەهەولێر هاتوونەتە ناو گۆڕان لەداخی کۆسرەت رەسوڵ وازیان هێناوە، بۆیە کۆسرەت ناتوانێت لەهەولێر پاشەکشێ بەگۆڕان بکات

کێبڕکێیەکی توند لەنێوان بەرهەم ساڵح و کۆسرەت رەسوڵدا هەبوو، تاکار گەیشتە ئەوەی کەکۆسرەت رەسوڵ (د.نەجمەدین کەریم) بهێنێتەوە بۆ کوردستان و بەڵێنی پێدانی پۆستی سەرۆکی حکومەتی پێبدات، بەڵام بەهاوکاریی تاڵەبانی (بەرهەم ساڵح) لەم کێبڕکێیەدا براوە دەرچوو.

بۆیە رۆژ لەدوای رۆژ بەرژەوەندییەکانی کۆسرەت رەسوڵ لەناو یەکێتیدا دەکەونە مەترسییەوە، بەتایبەت دوای ئەوەی کە(د.بەرهەم ساڵح) لەگەمەکەدا براوە دەرچوو، مام جەلالیش بەپشتیوانی ئێران پۆستی سەرۆکی کۆمار مسۆگەر کردووە، بۆیە ئەوەی لەم نێوەندەدا زیادمەند ماوەتەوە، تەنیا کۆسرەت رەسوڵە.

دوای ئەوەی لەمانگی شوباتی رابردوودا کۆسرەت رەسوڵ لەگەڵ چوار ئەندامی تری مەکتەبی سیاسی دەستیان لەکارکێشایەوە، چاودێرانی سیاسی پێیانوابوو ئەگەر بێت و کۆسرەت رەسوڵ بگەرێتەوە ناو یەکێتی، کۆتایی بەژیانی سیاسی خۆی دەهێنێت، بەڵام دروستبوونی گۆڕان و هاتنە پێشەوە هەڵبژاردنەکانی ٢٥ی تەموز جارێکی تر کۆسرەت رەسوڵی کردەوە بەکارتی ژمکارە یەك لەناو یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندا، هەربۆیەش لەماوەی پێنج مانگی رابردوودا کۆسرەت رەسوڵ کاری بۆ جێگرتنەوەی تاڵەبانی دەکرد، وەکو کەسی یەکەم لەناو یەکێتیدا خۆی نمایشدەکرد، سەرەڕای بەربەستە گەورەکانی بەردەم لەناو مەکتەبی سیاسیدا.

بەڵام زەمەن لەماوەیەکی کورتدا پێچەوانەی خەونەکەی کۆسرەت رەسوڵ کردە واقیع، بەوەی کەئەو لەدوو لایەنەوە رووبەڕووی کێشە بووەتەوە، لەئێستادا سیفەتی جێگری سەرۆکی هەرێمی نەماوە، پاش تێپەڕبوونی سێ مانگ بەسەر تێپەڕبوونی سوێندخواردنی سەرۆکی هەرێمدا تائێستا پۆستی جێگری سەرۆکی هەرێم بەخاڵی ماوەتەوەو ئەو ماوەیەش کە لەو پۆستەدا بووە نەیتوانیوە رۆڵی پێویست بگێڕێت.

لەناو یەکێتیشدا رووبەڕووی کۆمەڵێك بەربەستی ناوخۆیی بەهێز بووەتەوە، بەبڵاوکردنەوەی یاداشتەکانی نەوشیروان مستەفا ئایندەی کۆسرەت رەسوڵ رووبەڕووی لەقبوون دەبێتەوە، بەتایبەت وەکو سەرکردەکانی گۆڕان ئەوە رادەگەیەنن کەگۆڕان لەهەولێر بەرەو بەهێزی دەچێت و پێیانوایە کەئەوانەی لەهەولێر هاتوونەتە ناو گۆڕان لەداخی کۆسرەت وازیان لەیەکێتی هێناوە، کۆسرەت ناتوانێت لەهەولێر پاشەکشێ بەگۆڕان بکات.

ململانێی گۆڕان و یەکێتی بەکوێ دەگات؟

هەرچەندە رۆژبەڕۆژ راگەیاندنی یەکێتی باس لەوە دەکات کەشەپۆل بەشەپۆل هەڵسوڕاوانی گۆڕان دەگەڕێنەوە بۆ ناو یەکێتی، لەبەرانبەریشدا گۆڕان باس لەوە دەکەن کەڕۆژ بەڕۆژ کادرانی یەکێتی پەیوەندیی بەگۆڕانەوە دەکەن، بەڵام ئەوان

ناتوانن ئیستیعابیان بکەن، وەکو سەرچاوەکاین ناو گۆڕان ئاماژەی بۆ دەکەن ئێستا ..ران لەلوتکەدان، رۆژ بەرۆژ بەرەو گەورەبوون دەچن، لەمەشدا چەند خاڵێك یارمەتی گەورەبوونیان دەدات، هەڵسوکەوتی توندی تاڵەبانی و یەکێتی بەرانبەر بەگۆڕان، کەبەڕای ئەوان گۆڕان سوودی زۆریان لەو هەڵسوکەوتە توندانەی تاڵەبانی بینیوە، هەروەها کەرکوك و کوردانی تاراوگە پاڵپشتی سەرەکیی گۆڕانن و خۆڕێکخستنەوەی بزووتنەوەی گۆڕان و هەڵبژاردنەکانی داهاتوو یارمەتیدەری سەرەکین بۆ گەشەکردنی گۆڕان.

بەبۆچوونی سەرکردەکانی گۆڕان لەئێستادا یەکێتی تەنیا قاڵبەکەی ماوە، بۆنموونە ماوەی دوو مانگە ناتوانێت کەسێك بکاتە پارێزگاری سلێمانی، قورسایی یەکێتی لەئێستادا تەنیا سێ شتن: راگەیاندن و ئیمتیازات و فشارخستنەسەر گۆڕان.

لەبەرانبەریشدا یەکێتی نیشتمانیی کوردستان دەڵێت کەگۆڕان بەرەو هەڵوەرین دەڕوات، هەڵبژاردنی داهاتوو جاڕی مردنی بزووتنەوەی گۆڕانە.

ئەوە دەکەن کەهیچ کوتلەو پارتێکی عیراقی نەماوە کەداوای هاوپەیمانییان لەگۆڕان نەکردبێت، بەڵام ئەوان هەموو پەیوەندییەکی خۆیان بۆ دوای هەڵبژاردنەکان هەڵدەگرن، داهاتووش ئەو پەیامەمان دەداتێ کەکام لەم دوو هێزە سیاسییە کۆتاییان پێدێت؟

یەکێتی پێیوایە کەگۆڕان بەرەو هەڵوەرین دەڕوات و لەهەڵبژاردنی داهاتوودا جاڕی مردنی گۆڕان لێدەدرێت

=====

پەجەکان یەکتری دەشکێننەوە

راپۆرت: چۆمان ئەحمەد

نەوشیروان مستەفا لەبەشێکی دیکەی یاداشتنامەکانیدا بەناوی (لەنێوان مام جەلال و مندا) کۆمەڵێك رووداوی شاراوەی گێڕاوەتەوە کەپەیوەندیی بەهەندێك لەسەرکردە

دیارەکانی یەکێتییەوە هەیە بەتایبەت خودی سکرتێری یەکێتی جەلال تاڵەبانی و ڕەسوڵی جێگری یەکەمی، بەمەش دەنگدانەوەی ڕاگەیاندنەکانی لێکەوتەوە، دواجار کۆسرەت ڕەسوڵیش لەهەردوو ڕۆژنامەی کوردستانی نوێی زمانحاڵی یەکێتی و ڕۆژنامەی ئاسۆدا بڵاوکردەوە، ڕاگەیاندنەکانیش باس لەوە دەکەن کە تاڵەبانیش وەڵامی دەداتەوە.

پەنجەکان یەکتری دەشکێننەوە

نەوشیروان مستەفا یەکێك لەو سەرکردانەی یەکێتی کەڕووداوە سیاسییەکانی سەردەمی شاخ و بوونی خۆی لەو بازنەیەدا بەچەند کتێبێك وەکو یاداشتنامە نووسیوەتەوە دیارترینیان کتێبی (پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن) کەباس لەچەندین ڕووداوی پشت پەردەو ململانێی سیاسی ناو یەکێتیی و یەکێتی لەگەڵ لایەنەکانی تردا لەم کتێبەدا دەخاتەڕوو، نەوشیروان بەردەوام دەبێت لەبڵاوکردنەوەی یاداشتەکانی و دوا بەشی یاداشتەکانیشی لە ٢٠٠٩/١١/٢٥ بڵاویکردەوە کەتێیدا بۆچوونەکانی خۆی لەسەر کۆسرەت ڕەسوڵ بڵاودەکاتەوە، لەبەشێکی نووسینەکەیدا دەربارەی کۆسرەت ڕەسوڵ ئاماژە بەوە دەدات ئەودەمەی کۆسرەت ڕەسوڵ سەرۆکی حکومەت بووە داهاتی حکومەت لەتاریکی تەواودابووە، دەنووسێت (داهاتی حکومەت لەتاریکی تەواودایەو جگە لەکۆسرەت و وەزیری دارایی و چەند کارمەندێکی پەیوەندییدار کەسی دیکە نازانێ چەندەو چی لێدەکرێ و چۆن سەرف دەکرێت).

نەوشیروان لەبەشێکی دیکەی نووسینەکەیدا باس لەوە دەکات کە لەکابینەکەی کۆسرەت ڕەسوڵدا وەزارەتەکان تاڵان کراون (لەسەردەمی حکومەتەکەی کۆسرەت ڕەسوڵدا وەزارەتەکان تاڵانکران و ئامێرو سەیارەکانیان فرۆشران بەئێران).

نەوشیروان ئەوەش ڕووندەکاتەوە کەئەو سەردەمە کۆسرەت ڕەسوڵ سەرۆکی حکومەت بووە بەفیڕۆدانی دارایی گشتی و پێڕەوینەکردنی پێوانەی قانوونی لەدابەشکردنی وەزیفەو پارەو زەوی و خانوو لەکابینەکەیدا ڕەنگدانەوەی هەبووە

دەنووسێت (بەفیڕۆدانی دارایی گشتی و پێڕەوی نەکردنی پێوانەی قانوونی لەدابەشکردنی وەزیفەو پارەو زەوی و خانوو و پێڕەوینەکردنی یەکسانی لەرەفتار نەکردن لەگەڵ هاوولاتیاندا بووەتە دیاردەیەکی زەق).

لەبەشێکی دیکەی یاداشتەکانیدا نەوشیروان مستەفا دەربارەی کۆسرەت رەسول دەنووسێت (وەختێ حکومەتی هەرێممان

ئەو سەردەمەی کۆسرەت رەسوڵ سەرۆکی حکومەت بووە بەفیڕۆدانی دارایی گشتی و پێڕەوینەکردنی پێوانەی قانوونی لەدابەشکردنی وەزیفەو پارەو زەوی و خانوو لەکابینەکەیدا رەنگدانەوەی هەبوو

تەسلیمی دەستی ئەم برادەرە کرد یەکێتی هەر لەزاخۆوە تا کفری بەدەستەوە بوو، ئێستا ئەوەتا خۆی و حکومەتەکەی لەسلێمانین).

لەسەردەمی هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆدا نەوشیروان مستەفا پێیوتووە شەڕو نیوە شەڕ هەر یەکێکن شەڕەکە تەواو

لەدوای بڵاوبوونەوەی ئەم یاداشتەی نەوشیروان مستەفا ئەمین، کۆسرەت رەسوڵ بەجۆرێك توورە دەبێت دوای چەند رۆژێك وەکو بەرگرییەك وەڵامێك بۆ ئەم نووسینەی نەوشیروان مستەفا لەهەردوو رۆژنامەی کوردستانی نوێ و ئاسۆ لەژێر ناونیشانی (پەنجەکانی نەوشیروان خەباتی هاورێکانی دەشێوێنێت) بڵاودەکاتەوە، کۆسرەت لەوەڵامەکەیدا ئەو شتانەی کەنەوشیروان دەربارەی نوسیوتێتی بەتۆمەت هەڵبەستن ناودەبات و نەوشیروان مستەفاش بەئەندازیاری تێکەڵکردنی حیزب و حکومەت ناودەبات.

کۆسرەت رەسوڵ عەلی لەبەشێکی وەڵامەکەیدا بۆ نەوشیروان دەڵێت: (گەرچی نووسینەکەی بەقەولی خۆی باس لەپەیوەندیی و کێشەکانی لەگەڵ مام جەلال دەکات، بەڵام لەبەشێکی زۆری گێڕانەوەکانیدا کۆمەڵێك تۆمەت و قسەی ناڕەوای ئێمەو مێژووی تێکۆشانمان لەناو یەکێتی و سەردەمی بەرپرسیارێتیم لەسەرۆکایەتی حکومەتی هەرێمی کوردستاندا، هەڵبەستووە).

کۆسرەت رەسوڵ باس لەوەش دەکات کە لەسەردەمی هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆدا نەوشیروان مستەفا پێیوتووە شەڕو نیوە شەڕ هەر یەکێکن شەڕەکە تەواو بکە دەنووسێت (لەسەر داوای د.ئەحمەد چەلەبی سەرۆکی (□□□) کەئەوکات لەناوبژیوانەکانی شەڕی ناوخۆ بوو، کاتێك مام جەلال و کاك نەوشیروان هاتنەوە لەئەورووپاوە هاتنەوە شام و بڕیاربوو کاك مەسعود بچێتە ئیبراهیم خەلیل و پێشوازییان لێبکات و پێکەوە بێنەوە، لەوکاتانەدا کاك نەوشیروان چەندین جار تەلەفۆنی بۆ من و برادەران دەکرد دەیوت شەڕو نیوە شەڕ هەر یەکە هەمووی تەواو بکەن، منیش لەوەڵامدا پێمدەوت قەت شتی واناکەم! ئەوە ئێوەو بەڕێز چەلەبی و هەموو برادەران ماون بۆ شاهیدی).

سەبارەت بەتێکەڵکردنی حیز و حکومەت وسەردەمی کابینەکەیدا کۆسرەت رەسوڵ پێیوایە نەوشیروان مستەفا ئەندازیاری تێکەڵکردنی حیزب و حکومەت بووە لەو بارەیەوە نووسیوێتی (لەو سەردەمەدا کاریگەریی حیزب لەسەر حکومەت ئاشرا دیار بوو، ئەندازیاری ئەم پڕۆسەیە حکومەت و حیزب تێکەڵکردنە هەر خودیکاك نەوشیروان بوو، کەوەکو جێگری سکرتێری گشتی لەساڵی ۱۹۹۳ داوای لەمن دەکرد سەدان دۆنم زەوی لەسلێمانی تاپۆ بکەم بەناوی یەکێتی نیشتمانیی کوردستانەوە کەیەکێك لەو زەوییانە شوێنی ئەم ئوتێلەی شاری جوانی کاك فاروقی مەلا مستەفا بوو).

سەرچاوەیەکی ئاگادار نزیك لەکۆسرەت رەسوڵ دەربارەی هەڵوێستی کۆسرەت رەسوڵ دوای بڵاوبوونەوەی یاداشتەکانی نەوشیروان مستەفا وتی: (وەڵامی کۆسرەت رەسوڵ بۆ نەوشیروان مستەفا وتی: وەڵامی کۆسرەت رەسوڵ بۆ نەوشیروان مستەفا بەتەنها ئەوە نەبووە کە لەڕۆژنامەکان بڵاوبووەوە، بەڵکو کاك کۆسرەت تووڕەییەکەی گەیشتووەتە ئاستێك کەتوندوتیژیی لێبکەوێتەوە).

سەرچاوەکە ئەوەشی روونکردەوە کەنووسینەکەشی زۆر لەوە توندتر بووە کەبڵاویکردووەتەوە.

## لەنێوان نەوشیروان و مام جەلال یان نەوشیروان و کۆسرەت؟

کۆسرەت رەسوڵ لەدەستپێکی وەڵامەکەیدا بەنیگەرانییەوە باس لەوە دەکات کەئەو یاداشتەی نەوشیروان هەرچەندە بەناوی لەنێوان مام جەلال و مندا بلاوکرایەوە، بەڵام بەشێکی زۆری تۆمەت بەخشینە بەمن، ئەمە لەکاتێکدایە لەدوای دەرچوونی باڵی ریفۆرم لەیەکێتی و دواتر دەرکەوتنی لیستی گۆڕان کەمترین ململانێیە لەنێوان کۆسرەت رەسوڵ و نەوشیرواندا بەدیەکرا، بەڵام لێرەوە بەخەستی ململانێی نێوانیان دەستپێکرد.

عارف قوربانی رۆژنامەنووسی دیاری ناو یەکێتی و سەرنووسەری رۆژنامەی ئاسۆ پێیوایە ئەم نووسینەی نەوشیروان مستەفا زیاتر ئاراستەی ژیانی سیاسی کۆسرەت رەسوڵ تاکو مام جەلال قوربانی دەڵێت (بەگوێرەی ئەوەی کاك نەوشیروان وای ناونا بوو، لەنێوان من و مام جەلالدا، بەڵام دوای بلاوکردنەوەی ئەوە دەرکەوت نوسینەکە ئاراستەی کاك کۆسرەت بوو، جۆرێك بوو لەگێڕانەوەی بیرەوەریی کەپەیوەندە بەژیانی سیاسی کاك کۆسرەت تا مام جەلال).

کۆسرەت رەسوڵ یەکێکە لەو سەرکردانەی یەکێتی کەهەمیشە خاوەنی پێگەی تایبەتی خۆی بووە، لەکاتی هەڵبژاردنی مەڵبەندەکانی یەکێتی کۆسرەت خاوەنی باڵی خۆی بووە، ئێستاش باڵەکەی لەناو یەکێتیدا دیارە، زۆرینەی دۆست و لایەنگرانی لەناوچەی هەولێرە، هەندێك لەچاودێران ئەم یاداشتەی نەوشیروان والێکدەدەنەوە کەبۆ بێهێزکردنی پێگەی کۆسرەت رەسوڵ بێت لەناوچەی هەولێر محەمەد تۆفیق رەحیم ئەندامی ئەنجومەنی کۆمپانیای وشە ئەمە بەگێڕانەوەی بیرەوەریی ناودەبات و دەڵێت: (ئەمە بەشێکە لەیاداشتەکانی خۆی، شتێکی سرووشتییەو بلاویکردوونەتەوە، مافی هەموو کەسێکە لەسیاسەتدا بێت بابەت و رووداوەکان وەکو یاداشت بنووسێتەوە، ئەگینا هیچ مەسەلەیەکی دیکە نییە)، محەمەد تۆفیق ئەوەشی بۆ کورد تایمز رونکردەوە کەهەرکەسێك مافی خۆیەتی وەڵام بداتەوە.

"لەوسەردەمەدا کاریگەریی حیزب لەسەر حکومەت ئاشکرادیاربوو ئەندازیاری ئەم

پرۆسەیە حکومەت و حیزب تێکەڵکردنە هەر خودی کاك نەوشیروان وبو، کەوەکو جێگری سکرتێری گشتی لەساڵی ١٩٩٣ داوای لەمن دەکرد سەدان دۆنم زەوی لەسلێمانی تاپۆ بکەم"

بڵاوکردنەوەی یاداشت وەکو هەڵمەتی هەڵبژاردن

ماوەیەك پێش هەڵبژاردنی پەرلەمانی وکردستان نەوشیروان مستەفا بەشێکی دیکەی یاداشتەکانی بەناوی (خەون یان مۆتەکە) بڵاوکردەوە کەباسی لەڕوداوەکانی شەڕی ناوخۆی نێوان یەکێتی و پارتی دەکرد، بەمەش یەکێتیی تووشی شۆك کرد، کار گەیشتە ئەوە یکەمام جەلال خۆی داوای لەنەوشیروان مستەفا کرد ئەو یاداشتانەی رابگرێت بەمەش دوای بڵاوبوونەوەی لەسایتی سبەی دوای چەند رۆژێك لەسەر سایتەکە لابرا.

زۆرێك لەچاودێران ئەم کارانەی نەوشیروان مستەفا بەهەڵمەتی هەڵبژاردن ناودەبەن، ەتایبەتی لەئێستاشدا هەڵبژاردنی پەرلەمانی عیراق نزیکبووەتەوە، وەکو عارف قوربانی دەڵێت (من پێموایە ئەمە جۆرێکە لەهەڵمەتی راگەیاندنی پێش وەخت بۆ پڕوپاگەندە هەڵبژاردن، بۆ دروستکردنی کەشێکە بیوروژێنن و سوودی لێوەربگرن بۆ هەڵمەتی هەڵبژاردنەکان).

لەبەرامبەردا محەمەد تۆفیق دەڵێت (ئەمە پەیوەندیی بەهیچ مەسەلەیەکی دیکەوە نییە تەنها گێڕانەوەی بیرەوەرییە، ئەگەر باس لەهەستیاری کاتەکەش بکەین هەموو کاتێك هەستیاە).

لەپلینۆمی ئەم ساڵی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندا مام جەلال کۆمەڵێك قسەی دەربارەی نەوشیروان مستەفا باسکردبوو وەکو کیمیاویبارانکردنی هەڵەبجە بەهۆی ئەوەی نەوشیروان مستەفا سوپای ئێرانی هێناوەتە هەڵەبجەو لەدرێژەی وتەکانیدا گەرمکردنی شەڕی ناوخۆشی خستووەتە ئەستۆی نەوشیروان، هەرچەندە دوای چەند رۆژێك نەوشیروان مستەفا لەچاوپێکەوتنێکی لەکەناڵی □□□ وەڵامی وتەکانی مام جەلالی دایەوە، بەڵام زۆرێك لەچاودێران پێیانوایە کەئەم بەشەی یاداشتەکانی بۆ



وەڵامدانەوەی قسەکانی مام جەلال بێت لەپلینۆمی یەکێتیدا.

توندووتیژیی لێناکەوێتەوە؟

لەدوای بڵاوبوونەوەی یاداشتەکان کەزیاتر هێرشێك بوو بۆسەر کەسایەتی کۆسرەت رەسوڵ، هەندێك لەسەرچاوەان باسی تورەیی کۆسرەت رەسوڵیان دەکردو ئەوەیان دەخستەڕوو کەکۆسرەت ویستوویەتی کاردانەوەی توند بەرامبەر نەوشیروان مستەفا بنوێنێت، وەکو سەرچاوەکەی نزیك کۆسرەت رەسوڵ وتی: (کۆسرەت رەسوڵ زیاتر لەوە نیگەران بووە کەئەو بەپێچەوانەی سەرکردەکانی دیکەی یەکێتییەوە دژایەتی نەوشیروان مستەفای نەکردووە). ئەو سەرچاوەیە باسی لەوەشکرد کەکۆسرەت رەسوڵ وەڵامی توندتری لایە رەنگە لەئایندەشدا بەبەڵگەو دیکۆمێنتەوە وەڵام دەداتەوە، سەبارەت بەئەنجامدانی توندووتیژیی لەلایەن کۆسرەتەوە سەرچاوەکە وتی: (ئێستا کۆسرەت لەگەڵ ئەوەدا نییە توندووتیژیی بنوێنێ، بەڵام بەردەوام دەبێت لەوەڵامدانەوەی بەشێوەی نووسین).

لەبارەی لێکەوتنەوەی توندووتیژیی لەنێوان کۆسرەت رەسوڵ و نەوشیروان مستەفادا، عارف قوربانی دەڵێت: (ئەوەی من ئاگادار بم وەڵامی کاك کۆسرەت تەنها ئەم نووسینە بوو نووسینەکەش روونە)، عارف وتیشی: (ئێمە کاك کۆسرەت دەناسین لەملململانێکانی ناو یەکێتی و دەرەوەی یەکێتیش پەنای بۆ توندووتیژیی نەبردووە، کەسێکە زیاتر باوەڕی بەوە بووە کەکێشەکان بەهێمنی بەلادا بخات)، عارق ئاماژەی بەوەش کرد کەکۆسرەت رەسوڵ هەڵوێستی بەرامبەر بەگۆڕان روون بووە، بیری لەکاری خراپ نەکردووەتەوە، هەروەها محەمەد تۆفیق سەرکردەی گۆڕان هاوڕایە لەگەڵ عارف قوربانیدا پێیوایە توندووتیژیی نایەتە کایەوە، دەڵێت: (من پێشبینی ئەوە ناکەم توندووتیژیی بکەوێتەوە).

لای خۆشیەوە نەوشیروان مستەفا بڕیاریداوە وەڵام نەداتەوە وەکو سەرچاوەیەکی نزیك لەکۆمپانیای وشە وتی: • کاك نەوشیروان بڕیاری داوە وەڵام نەداتەوە).

++++++++++++++

هەوڵی لێکنزیککردنەوەی مام جەلال و نەوشیروان مستەفا–م نەدا، چونکە دەمزانی [illegible]کەن

بەخیلی بەبەرهەم ساڵح نابەم، دەڵێم خودا لەکابینەی نوێدا رەحمی پێبکات

سیاسەتمەداری کورد، سەلاحودینی موهتەدی، لەگفتوگۆیەکی والادا لەگەڵ والاپریس:

زەمانی دۆستایەتی و برادەرایەتی نەماوە، ئەو زەمانە رۆیشت کەهەموان بەپێی رێککەوتنێك لەدەوری مام جەلال کۆببوونەوە

سەلاحودینی موهتەدی یەکێکە لەسیاسەتمەدارانی کوردستانی رۆژهەلات و ئێستا لەشاری سلێمانی نیشتەجێیە، موهتەدی بەوردی چاودێری گۆڕانکارییەکانی کوردستان و عیراق و ناوچەکەو جیهان بەگشتی دەکات و بیروبۆچوونی خۆی هەیە، ئێمەش لەوالاپریس لەسەر پرسی کورد بەگشتی و بەتایبەتی لەرۆژهەلاتی کوردستان ئەم گفتوگۆیەمان لەگەڵدا سازکرد.

سازدانی: لەتیف حسێن

*دیارە لێکترازان و جیابوونەوە لەناو حزبە کوردییەکانی رۆژهەلاتی کوردستاندا زیانێکی مەعنەوی داوە لەئۆپۆزسیۆنی کورد لەئێران، ئێوە وەك سیاسەتمەدارێك چۆن سەیری ئەو دیاردەیە دەکەن و چی بکرێت بۆئەوەی هێزە کوردییەکانی رۆژهەلات لەدەوری پرۆژەیەکی نەتەوەیی کۆببنەوە؟

–ئەم دیاردەیە نەشتێکی تازەیەو نەتایبەتیشە بەکورد لەرۆژهەلاتی کوردستاندا، بەڵکو دیاردەیەکی جهانییەو لەناو زۆربەی بزووتنەوە سیاسییەکاندا روویانداوە، لەلایەکی ترەوە لەناو کورددا بۆتە تەقلیدێك، بەلام لەناو کوردو بەتایبەت لەناو کوردانی رۆژهەلاتدا هۆکاری تایبەتی هەبووە، لەوانە: شۆڕش و خەبات لەوێ درێژخایەن بووە بەبەراورد لەگەڵ شۆڕش و بزووتنەوە جیهانییەکان کەئەوەندە کاتی نەویستووەو سەرکەوتوون، هەر بۆیە ئەو ماوە زۆرە وایکردووە شەڕە دەندوك و بێنەوبەردەی زۆر لەناو بزووتنەوەکانی ئێمەدا دروست ببێت، هۆکارێکی تر

ئاسۆیەکی روون نەبووە بۆ سەرکەوتن، کەئەمەش هۆکار بووە بۆئەوەی
پشمەکێشم و بێزاری دروست ببێت و دواجار جیاببنەوە، هۆکاری تر ئەوەی
کەحزبە کوردییەکانی ئێران لەسەر خاکی خۆیان دوورن و لەناو جەماوەری خۆیاندا
نین و فشاری خەڵکی خۆیان لەسەر نەبووە بۆ یەکگرتنەوەو یەکبوونیان، چوارەم
ئەو حزبانە وەك حەوزێکی ئاو وان کەئاوی لەبەر بڕوا، بەڵام ئاوی نەیەتە سەر،
حزبە کوردییەکانی ئێران خەڵکیان شەهید دەبێت پیر دەبێت و دادەنیشن و دەتۆرێن
لەبەرامبەریدا کەسی تازەو گەنج و خوێنەواران نایەنە ناویان، چونکە لەناو خاکی
خۆیاندا نین، بۆیە کاتێك کەحزبە کوردییەکانی ئێران لەناو خاکی ئێران کە لەناو
خاکی ئێراندا بوون بەردەوام خەڵکی تازە پەیوەندیی پێوەدەکردن، بەڵام ئێستا نایەنە
کوزدستانی عیراق و پەیوەندییان پێوە ناکەن، هۆکارێکی تریش دەستی دەرەکییە
کەبەشێوەی نادیار دەستیان لەو تەفرەقەیەدا هەبووە، هەموو ئەوانە وایکردووە لەناو
حزبی کوردیی لەئێران بەردەوام تەفرەقەو جیابوونەوە رووبدات، ئەگەر سەیری
سروشتی مرۆڤیش بکەین کەحەزی بەسەربەخۆبوون و بیر لەبەرژەوەندیی خۆی
دەکاتەوەو ئەگەر ماوەیەکی زۆر نەیتوانی ئەوەی دەیەوێت لەناو دەستەیەك یان
حزبێکدا بەدەستی بێنێ ئەوا دەچێتەوە سەر ئەسڵی خۆی کەحەزی سەربەخۆبوونەو
دەڕواو دەتۆرێ.
سەبارەت بەوەی چی بکرێت بۆئەوەی هەمووان لەدەوری پرۆژەیەکدا کۆببنەوە من
شتێکم شك نایەو باوەڕناکەم وابەئاسانی یەك بگرنەوە، چونکە ئەگەر یەکگرتنەوەیان
ئاسان بوایە ئەوا هەر لەئەسڵدا جیانەدەبوونەوە، ئەگەر لەڕووی دیپلۆماسییەوە
قسەبکەم دەبێت بڵێم کەبەڵێ دەبێت هەوڵبدەین کەیەکیان بخەینەوەو ئومێد هەیە
کەئەو کارە بکەن، بەڵام لەواقیعدا وانییەو تازە یەکگرتنەوەیان ئەستەمەو پێموانییە
بتوان لەجەبهەیەکی کوردیدا ئەوان وا بەئاسانی یەکبخرێن.
*دۆخی ئێستای کوردی ئێران چۆن دەبینینت لەسایەی کۆماری ئیسلامی ئێراندا، ئایا
پێتوایە چارەسەری کێشەی کورد لەچوارچێوەی کۆماری ئیسلامی ئێراندا کارێکە

دە[illegible] بکرێت؟
[illegible] سەردێنم و سەردەبەم لەئێستادا رەوشێك و دۆخێکی لەمە خراپتر بۆ کورد لەئێراندا شك نابەم، بۆیە نەك دەوڵەتی ئێران هەوڵی باشکردنی رەوشی کورد نادات لەناوخۆیدا، بەڵکو هەوڵدەدات هەرچۆنێ پێی بکرێت رەوشی کوردانی پارچەپارچەکانی تر تێکدەدات، هەروەك ماوەیەك لەمەوبەر داوایان لەتورکیا کربوو کەبێن بەیەکەوە هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەی کورد بدەن و تورکیاش چاو لەئێران بکات کەچۆن چارەسەری کێشەی کوردیان کردووە، ئاشکراشە ئەو داوایە، داوایەکە بۆ سەرکوتکردنی کورد

لەکوێ جوابی شاعیرێك یان هونەرمەندێك یان نووسەرێك دەدەنەوە، لەدونیای سیاسەتدا بەرژەوەندیی حوکم دەکات نەك ئامۆژگاریی و نەسیحەتی من و ئەوو ئەم چونکە نایەوێ وەك ئەوەی تورکیا بکات، چونکە دەزانێت چارەسەری کێشەی کورد لەتورکیا زیان بەوان دەگەیەنێ، هەروەك ئاشکرایە ئێران و تورکیا رێککەوتنی سەعدئابادو حلفی بەغداو پاشانیش هەروەك چۆن دەوڵەتی سەفەوی و عوسمانی وێڕای شەڕو ناکۆکی لەناو خۆیاندا یەکیان گرت بۆئەوەی سەرکوتی میللەتی کورد بکەن، بۆیە ئێران دەیەوێ وەك چۆن ئەوانەیان لەکۆندا لەگەڵ تورکیا دەرهەق بەکورد کردووە ئەوهاش ئێستا بیکەن، لەبەرئەمە نەك ئێران نایەوێ کێشەی کورد چارەسەر بکات، بەڵکو هەرچی پێبکرێت هەوڵی ئاڵۆزکردنی هەر چارەسەرێکی دیکە دەدا کە لەپێناو کورددا بێت، هەروەها چاوەڕوانیکردنی دانیشتن و چارەسەری کێشەی کورد لەئێران چاوەڕوانییەکە کەمەگەر ئەوانەی ئێران نەناسن ئەمە چاوەڕێ لەئێران بکەن، چونکە ئێران هەرگیز کاری واناکات، ئەوەتا ئێران نایەوێ لەناو خۆیانداو لەگەڵ ئەوانەی کەسەردەمێك حاکمی ئەو وڵاتە بوون دابنیشێ و گوێیان لێبگرێ وەك خاتەمی کەهەشت ساڵ سەرۆك کۆمار بووەو لەگەڵ کەڕوبی چوار ساڵ سەرۆکی دەزگای شەهیدان و نوێنەری خومەینی

ئێرانێك گوێ لەخاتەمی و گەڕوبی و موسەوی ناگرێت کەسەردەمێکی زۆر حاکمی




ئەو وڵاتەبوون، چۆن گوێ لەکورد دەگرێت و کێشەکان چارەسەر دەکات
...ار ساڵیش سەرۆکی پەرلەمان بووەو موسەوی هەشت ساڵ سەرۆك وەزیر بووە، سەرکوتیان دەکات و زیندانیان دەکات و لێیان دەدات کەتەنها داوای ئەنجامدانی هەڵبژاردنێکی پاك و شەفاف دەکەن، ئەمانە جوابیان نادرێتەوە کەپیاوی حکومەت و دیاریشن ئیتر لەکوێ ئامادەیە لەگەڵ گەلێکدا دەدەنیشێ کەدونیایەك داوای ئازادی و دیموکراتی دەکەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئومێد هەیە کەئەو دەسەڵاتە دیکتاتۆرو توندڕەوە بگۆڕێ هەروەك دەڵێن زاڵم زەواڵی بۆ پەیدادەبێت و ئێستاش ئەو زەواڵە خەریکە لەسەر دەستی پیاوانی خۆیاندا پەیدا دەبێت و داوای گۆڕین و چاکسازی دەکەن، کەمن پێموایە ئەو مەسەلەیە دەمێکە لەناو میللەتی ئێراندا هەیەو ئەو کەفوکوڵەش هەڵبژاردنی ئەمجارە لەلایەن ئەو پیاوانەی خۆیانەوە کەبەناوی بزووتنەوەی سەوزەوە سەریهەڵداوە هەوڵی گۆڕان دەدەن، کەئەمەش وایکردووە کەلێنێکی زۆر لەنێوان جەماوەرو دەسەڵاتدا دروست ببێت و وابەئاسانیش ئەو کەلێنە پڕنابێتەوە.

ئێستا بۆچوونێك لەناو هەندێك کەس و منیشدا سەریهەڵداوە کەپێمانوایە دەبێت ئۆپۆزسیۆنی کوردی لەئێران خۆی لەگەڵ ئەو تەوژم و بزووتنەوەیەدا خۆی بگونجێنێ و پەیوەندیی پێوەبکات، نابێت بەتەنهاو گۆشەگیریی کار بکات، چونکە گۆشەگیریی و بەتەنها کارکردن و شەهیددان و قوربانیدانی بەتەنهای کورد کۆتایی هاتووە، چونکە سی ساڵە بەتەنها خەبات دەکەین و بەتەنها ئاوارە دەبین و دەکوژرێین، بۆیە دەبێت هەر لەئێستاوە لەلەگەڵ ئەم بزووتنەوە تازەیەی ئێراندا خۆی بگونجێنێت، چونکە ناکرێت خۆی بکات بەدووژمنی حوکم و دەسەڵاتێکی تازەو سی ساڵی تریش خەریکی خەبات و قوربانیدان بێت، بۆیە دەبێت هەرچی زووە ئۆپۆزسیۆنی کوردی خۆی ڕێکبخات و پەیوەندیی بەو شەپۆلە نوێیەی ئێرانەوە بکات.

*سەبارەت بەکوردستانی عیراق، هەندێ پێیانوایە ئایندەی کوردستانی عیراق بەرەو خراپی دەچێت، چونکە لەماوەی شەش ساڵی ڕابردوودا بەشێك لەکێشەکانی کورد

لەگەڵ حکومەتی ناوەندا چارەسەر نەکراون و گرژی بەردەوامە، تۆ پێتوایە دەبێت [illegible] کردایەتی کورد چۆن مامەڵە بکات بۆئەوەی دەستکەوتەکانی لەعیراقدا بپارێزرێت و ئەوەی بەدینەهاتووە بەدەستی بێنێت؟

–بارودۆخی ئێمە لەکوردستانی عیراق بەرەو خراپی دەڕوات، خۆ هیچ نەبێت ئێمە لەماڵی خۆمان بەبێ ترس دانیشتووین ئەو سێ پارێزگایەش لەبن دەستماندایە خۆ لێمان ناسەنەوە، ئەوەتا خۆ ئێستا نەکەرکوك و نەموسڵ لەبندەستی ئێمەدا نییە، مەگەر ئەوەندە نەبێت ئەو دوو شارەمان نەدەنەوە، بەڵام یەکبوون و یەك نەبونی ئێمە بێ کاریگەر نییە بۆ مافەکانی ئێمە، ئێستاش لەکوردستانی عیراق تەفرەقەو جیابوونەوە هەیە، بەڵام پێمباشە هەروەك چۆن تۆ لەمن دەپرسیت ئەو جیابوونەوەیەی لەناو کوردانی ئێراندا چ کاریگەرییەکی هەیە بۆ سەر مافەکانیان، دەکرێت هەمان پرسیاریشم لەسەر کوردانی ئێرەش لێ بکەیت، بۆیە پێموایە چەندە لەناو یەکدا تەفرەقەو جیاوازییمان هەبێت لەڕووی فکرەوە، بەڵام دەبێت لەناوەندو لەبەرامبەر کێشەکان و مافەکانمان لەناوەند یەك بین، با ئێمە لێرە حزبمان زۆر بێت با ئۆپۆزسیۆنمان لەناو پەرلەماندا هەبێت، خۆ ئێمە بەفرنین لەبەر هەتاو بتوێینەوەو کڵۆ شەکرنین بتوێینەوە، بارەخنە بگرن و ئێمەش وەڵامیان دەدەینەوە.

ئاساییە بەرەی دەسەڵات لەهەڵبژاردندا بدۆڕێن و ببنە ئۆپۆزسیۆن و ئۆپۆزسیۆن حاکم بێت خۆ کارەسات نییە، ئەوە کارەساتە لەناوەند یەك نەبین و لەبەرامبەر داواکانمان جیاوازییمان هەبێت.

*بەڕێزت لەسەر ئەو ناکۆکی و جیابوونەوانەی ئێرەش بەتایبەتی لەنێو ریزەکانی یەکێتیدا کەڕوویاندا، تۆ هەم کەسێکی نزیکی و دۆستایەتیت لەگەڵ خودی مام جەلال و هەم نەوشیروان مستەفادا هەیە، هیچ هەوڵێکت بۆ نزیککردنەوەیان نەداوە؟ هەوڵت نەداوە ئەو جیابوونەوەیەی نەوشیروان مستەفا کەئێستا بزووتنەوەیەکی خاوەن (٢٥) کورسی دروستکردووە نەگاتە ئەوە؟

–بەڵێ من دۆستێکی باشی هەم جەنابی مام جەلال و کاك نەوشیروان بووم و هەشم،

ئەگەر مەم و زینی ئەحمەدی خانیت خوێندبێتەوە کە لەشوێنێکیدا دەڵێ: ئەو عەیبە ئەوە گەورەکانە، گوناهیان چییە خەڵکی هەزاران گوناهیان چییە نووسەرو هونەران، بۆیە پاوە گەورەکان لەکوێ جوابی شاعیرێك یان هونەرمەندێك یان نووسەرێك دەدەنەوە، لەدونیای سیاسەتدا بەرژەوەندیی حوکم دەکات نەك ئامۆژگاریی و نەسیحەتی من و ئەوو ئەم، ئەگەر تەفرەقەیەك هەبێت ئەوەنییە کەئەوان نەیزانن و نەزانن خراپەو ئێمە بچین ئامۆژگارییان بکەین، من وەك خۆم هیچ هەوڵێکم نەداو قسەی خۆمم خەسار نەکرد، چونکە دڵنیابووم کە
ئاساییە بەرەی دەسەڵات لەهەڵبژاردندا بدۆڕێن و ببنە ئۆپۆزسیۆن و ئۆپۆزسیۆن حاکم بێت خۆکارەسات نییە، ئەوە کارەساتە لەناوەند یەك نەبین و لەبەرامبەر داواکانمان جیاوازییمان هەبێت
بەقسەم ناکەن هەروەك چۆن بەقسەی ئەوانەیان نەکرد کەئەو هەوڵەیاندا، چونکە هەروەك باسمکرد لەسیاسەتدا بەرژەوەندیی هەیەو ئەگەر ئەو کەسە یان ئەو تاقمە ئەو بەرژەوەندییەی نەیەتەدی ئەوا بەنەسیحەت و ئامۆژگاریی نایەتەوە سەر ئەو رێیەی تۆ دەتەوێ، خۆ ئەمە لەناو خێزان و لەناو دێهاتدا نییەو ریش سپی هەستێ قسەی خێری تیا بکات، بۆیە پێموایە هەروەك چۆن ئەو شتەم بۆ کوردەکانی ئێران وت، هەمان شتیش بۆ کوردەکانی ئێرە دەڵێم کەهەتا بەرژەوەندییەکانیان ناکۆك بێت ئەوا مەحاڵە یەك بگرنەوە مەگەر کوردو کوردستان بکەوێتە مەوقیعێك کەهەموان هەست بکەن کەدەبێت یەك بگرن، چونکە میللەت لەمەترسیدایە.
پێموایە ئەو زەمانە رۆی کەهەمووان بەپێی ئیتیفاقێك لەدەوری مام جەلال کۆدەبوونەوەو بەرژەوەندییان یەك بوو، ئێستا بەرژەوەندییەکان زۆر بوون، ئەوکات کەس نەیدەوێرا قسە بکات، ئێستا قسەدەکات، ئێستا زەمانی برادەرایەتی و دۆستایەتی نەماوەو هەموو دوای بەرژەوەندیی خۆی دەکەوێت، ئەگەر کەسێکی زۆر باشیش بێت مادام بەرژەوەندیی لەگەڵیدا یەك نەیەتەوە ئەوا برادەرایەتی و دۆستایەتی ناخوات، من دڵنیام مام جەلال نەك لەعیراق و کوردستاندا بەڵکو لەهەموو

ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا کەسێکی شایستەو بەئەزموون و سیاسییەکی زۆر بەهێزە، لەدنیا کوردو عەرەب بەشیعەو سوننەو لایەنەکانی ترەوە لەبەرئەوە متمانەی پێدەدەن؟ نا، لەبەر بەرژەوەندییە، ئەگەر بەرژەوەندییان لەگەڵیدا هەبێت دەنگی دەدەنێ، نەك لەبەرئەوەی لەڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا هاوشانی نییە، هەروەها بۆنموونە بەرهەم ساڵك کەئێستا سەرۆکی حکومەتی کوردستانەو پێموایە نە لەکوردستان و نە لەعیراقیشدا کەسێك دەست ناکەوێت وەك ئەو بەتواناو لێهاتوو بێت، بەڵام ئەگەر بەرژەوەندییان لەگەڵی نەبێت ئەوا دەنگی پێنادەن و ئەگەر لەداهاتوودا لەحکومەتی عیراقیشدا پۆستێکی وەك ئێستای هەبێت، بۆیە من پێموایە دەبێت لەئێستاوە بیر لەهاوپەیمانی بکەینەوە چ لەناوخۆو چ لەئاستی عیراقدا کەبمانکاتە یەك و پێکەوە کاربکەین.

*بەڕێزت باسی دکتۆر بەرهەمت کرد، لەم سەروبەندەدا کەبەرهەم ساڵح گەڕایەوە کوردستان و بوویە سەرۆکی کابینەی شەشەمی کومەت، تۆ پێتوایە ئەو بەرپرسیارێتییەی دەکەوێتە ئەستۆی لەم کابینەیەدا چییە؟ ئەم کابینەیە چی بکات بۆئەوەی سەرکەوتووبێت؟

-بەرهەم چەندین ئەرکی گرنگی لەسەر شانە، بەخیلی پێنابەم، بەڵام خودا رەحمی پێبکات. لەگەڵ ئەمەشدا لەکوردستاندا کەسێك نییە جگە لەبەرهەم بەتواناتر بێت بۆ بەجێهێنانی ئەو ئەرکانە، یەکەمین ئەرکی بەرهەم زیاتر حزبییە، ئومێددان و بەرزکردنەوەی ورەی جەماوەری یەکێتییە بەوەی کە لەم هەڵبژاردنەدا تووشیان هات و تەفرەقەیان تێکەوت و تووشی نائومێدی بوون و ئاشتکردنەوەیان لەگەڵ ئەو حزبەدا، دووەم بەفیعلی یەکگرتنەوەی وەزارەتەکانی حکومەتە کە هەتا ئێستاش یەکی نەگرتۆتەوە، چونکە خاوەنی دوو بودجەو دوو وەزارەتی پێشمەرگەو ئاسایشین، کەبەڕاستی ئەوە یەکگرتنەوە نییەو ئێمە حکومەتێکمان لەسلێمانی و حکومەتێکی ترمان لەهەولێر هەیە، دەبێ بەرهەم ئەم کارە بکات و بەفیعلی یەکیان بخاتەوە، ئەرکی سێهەمی قسەکردن و ڕێککەوتنە لەگەڵ حکومەتی ناوەند لەسەر کێشە

هەڵراساوەکانی نێوانیان، کەئەمەش بەهۆی لێهاتوویی و هێمنی و زیرەکی خۆیەوە لەڕێگەی هێزی جەماوەرو خەڵکەوە دەبێت، چونکە بەتەنها نەرمی و هێمنی بەرهەم بەس نییەو دەبێت جەماوەر لەگەڵیدا بێت و پێشموایە دەتوانێت ئەم کارە بکات. ئەرکی چوارەمی بەرهەم کەمن و خەڵکانی تری کوردی پارچەکانی تر چاویان لێیەتی و ئومێدیان پێیەتی بەوەی کەبتوانێ بەهۆی ئەو دۆستایەتییە بەهێزەیەوە کە لەگەڵ وڵاتانی ئەورووپاو ئەمریکا هەیەتی دۆسێی کورد زیاتر بەنێودەوڵەتی بکات و چارەسەری بکات، کەئەمەش هەر بەو دەکرێت.

## ...رمەنی کاک (نەوشیروان) منیش قسەم هەیە !

### بەشی یەکەم

حسێن بەفرین

بۆ ماوەیەك ئەچێت کاك(نەوشیروان) دەرگایەکی بەناوی (پڕۆژەی چاکسازی) کردووەتەوە، ئەگەرچی مەبەستی سەرەکی ئەو هەوڵدانە بۆ بووژاندنەوەو زیندووکردنەوەی حیزبێکی سیاسی دەسەڵاتدار کەڕۆژ بەڕۆژ بەرەو گلبوونەوەو پووکانەوە دەچێت و ئەو دەیەوێت بەو پڕۆژەیە ڕێگەی مردنی لێبگرێت و مانەوەی بۆ مسۆگەر بکات، لەبەرئەوەی من هیچ سەروکارێکی دوور یا نزیکم بەو حیزبەوە نییە بەهیچ جۆرێك تەداخول لەو کێشەیەدا ناکەم و باسەکەی من لەو بارەیەوە نادوێت و هیچ هەقێکیشم بەسەریەوە نییە، بەڵام بوونی ئەو حیزبە وەك یەکێك لەدوو حیزبە دەسەڵاتدارەکەی ئێستای گۆڕەپانی سیاسی کوردستان نەك هەر من بەڵکو هەموو کەسی تریش وەك هاووڵاتی مافی خۆیانە قسە لەسەر دەسەڵاتی ئەو حیزبە بکات کەئیدارەی ژیانی کۆمەڵایەتی لەدەست گرتووەو خۆی بەرپرسیاریی باری ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و تەنانەت چارەنووسی نەتەوەیی ئەو کۆمەڵگایەش دەزانێت.

ئەو پڕوژەیەی ئەویش لەدواجاردا بۆئەوەیە نەخۆشی گەندەڵی چارەسەر بکات کەبەهۆی ئەو حزبەو دەسەڵاتی ئەو حزبەوە خراوەتە ناو ڕەگ و ڕیشەی ئەو ئیدارەو ئیدارەکردنەوە کەبەدەستی حزبەوەیە، ئەو لەپڕۆژەکەیدا وای بۆدەچێت ئەگەر هاتوو گەندەڵی ناو ڕێکخستنەکانی حزبی چارەسەر کرد ئەوا بێ سێ و دوو کردن گەندەڵی ناو ئەو ئیدارەو ئیدارەکردنەش لەوێوە خۆبەخۆ چارەسەر دەکرێت، واتە ئەو دەیەوێت بەیەك بەرد دوو چۆلەکە مل بشکێنێت، بەڵام کێشەی گەندەڵییەکە بەو جۆرە چارەسەر ناکرێت و بەیەك بەردیش دو چۆلەکەی بۆ ناکوژرێت. من وەك وتم وەك هاووڵاتییەك کەبەدەست دەسەڵاتی ئەو حزبەوە گیرم خواردووەو بووەتە مۆتەکەیەکی مەرگ بەسەر ژیانمەوە ئەمەوێ و مافی خۆشمە قسە

لەسەر ئەو باری گەندەڵییە بکەم کەژیانی من و تەواوی کۆمەڵگاو بوونی نەتەوەیی زۆریشی خستووەتە ژێر باڵەپەستۆی کولەمەرگییەوە. لەم قسەکردنەشدا نامەوێت کوێخای کەس بم و لەسەر کەس هەڵبدەمێ، بەڵام دڵنیام کاتێك بەناوی منی تاکەوە قسە دەکەم (لەسەدا هەزار) هەموو منەکانی تری کۆمەڵی شەهموو بەیەك دەنگ دەڵێن: (ئێمەش هەموو وەك تۆین و یەك دەردو یەك مەرگ تووشی کردووین)، ئەمە راستییەکە تەنها ئەوانە دەیزانن کە لەخوارەوەی کێشەکەن لەبنەوە بۆ سەرەوە دەڕوانن، بەڵام خەڵکانی وەك کاك (نەوشیروان) لەبەر ئەوەی لەسەرەوەی کێشەکەن و لەسەریشەوە تەماشای خوارەوە دەکەن کێشەکە بەوجۆرە دەبینن و دەیانەوێت دەسەڵات و حزبی دەسەڵاتدار پینە بکەن، گوایە بەو پینەکردنە چارەسەری دەردەکە دەکەن و هەموو خراپەیەك دوایی دێت و دەبڕێتەوە، ئێمە لێرەدا دەپرسین ئەم گەندەڵییە لەکوێوە هات؟

خەڵکی (گەندەڵچی) کێیەو چی هێنای و لەچییەوە پەیدابوو..؟!

کاتێك کەسێکی وەك کاك نەوشیروان بیەوێ وەڵامی.ئەو پرسیارانە بداتەوە رێك ئەو پرۆژەیە بەرز دەکاتەوەو دەڵێ ئەم نەخۆشییە لە(ئێستا)دا پەیدابووەو (ئێستاش) ئایەو مایەی بوونییەتی، بەڵام لای کەسێکی وەك من کەچەشنی ئەو لەو دەسەڵاتەدا نیم و چەوساوەی دەستی دەسەڵاتەکەم، بەجۆرێکی تر گەندەڵییەکە دەناسم و دەتوانم بەبۆچوونێکی تر قسە لەسەر کەسی (گەندەڵچی) بکەم و دەریخەم لەچییەوە هاتووەو لەچییەوە پەیدابووە، لەبەرئەوە خۆم بەو (ئێسا)یەوە نابەستمەوە، بەڵکو ئەو ئێستایە لەرابردووەکدا دەبینم کەمن دەتوانم شایەتی لەسەر بدەم، چونکە خەڵکی ناو دەسەڵاتەکە نیم و لەژێر باڵەپەستۆی دەسەڵاتەکەوەم و گیرم بەدەستییەو خواردووە، بەڵام کەسێکی وەك کاك نەوشیروان، چونکە خەڵکی ناو دەسەڵاتەکەیەو بەئازادی بای باڵی خۆی دەدات نایەوێ پەردە لەسەر ئەو رابردووە لابدات و پەنجە بۆ هۆکانی (زووی) رابکێشێت، بەڵکو پێی باشە هەر لەچوارچێوەی ئەو ئێستایەدا قسە لەو بارەیەوە بکات، ئەمەیە جیاوازیی نێوان هەردوولا، کاتێك ئەو لەسەرەوە سەیری

خنێنەوە دەكات تەنها چارەسەری لەو جۆرە چاكسازییەدا دەبینێتەوە كەچی كاتێك من لە خوارەوە سەیری سەرەوە دەكەم نەك چارەسەرن بەڵكو پەیدابوونی نەخۆشییەكە لەگرێدانی رابردوو بەئێستاوە دەبینم و دەتوانم دەردی خۆم و كۆمەڵگەكەشی لەناودا دەستنیشان بكەم و چارەنووسی ئەو (گەندەڵییە)و (گەندەڵچی)یانەش ببینمەوە كە بەرەو كوێ مل دەنێ و چی بەسەردێت و بەكام رێگادا دەبرێتەوە، بەرێگای چاكسازی یان هی پاكسازی یان هی رێكسازی؟!

كاتێك بڕیارەكە وەهای بەسەردابێت، من لای خۆمەوە وای بەچاك دەزانم روو بكەنەوە ناو رابردوویەك كە لەسەرەتاوە بوو بەمناڵدانی ئەو، دیارە كوشندەیی ئەمڕۆ بەناوی (گەندەڵی)یەوە سەریهەڵداوەو بووەتە مۆدێكی تازەی سەردەم، زۆر بەكورتی و بەكوردی رابردووەكە وەها دەستپێدەكات:

ساڵی ١٩٧٥، ساڵێكی شوومە لەژیانی كورد بەگشتی و تاكی كۆمەڵی كوردەواری بەتایبەتی، لەم ساڵەدا زۆر شت هاتە سەر چۆك و لەبەردەم قەدەرەی خۆیدا ملی كەچكردو خۆی تەسلیم كرد، زۆر شتی تریش لەدەرەوەی سنووری كوردستان تەسلیم بەڕاكردن و خۆ دوورخستنەوەو دوورەپەرێزكردن بوو، لەبارودۆخێكی وەهادا تەنها خەڵكانێكی زۆر كەم مانەوە كە لەچاو بەرینی كۆمەڵدا، وەك دڵۆپ بەدەریا وابوون، ئەم خەڵكە كەمە ئامادەی خۆ بەدەستەوەدان و هاتنە سەر چۆك نەبوون ئەگەر نرخەكەشی بەمەرگی خۆشیان تەواو ببوایە، بەغەیری ئەو خەڵكە كەمە كەسێكی تر لەم وڵاتە نەبوو، ئەو دەستە خەڵكە هەموو جۆرە رێگایەكی یاخی بوونیان گرتەبەر، وردەوردە تاریكی ئەوە زەنگ رووناكی تێزا، بەڕووخاندنی دێوەزمەی (شای ئێران) بارودۆخەكە دەرگای لەسەر كرایەوە، ماوە هەناسەدان بەرینتر بوو، بواری روانین كرایەوە، ورە پەرەی سەند، ژمارەی حیزب و رێكخراوەكان زۆر بووون، بۆچوونەكان زۆرتر بوون، تموح و هەڵپە سیاسییەكان زیاتر بوون، پێشمەرگایەتی تەكانێكی گەورەی پێدراو گەشەی سەند، گیانی بەرگریكردن رویداو چەكەرەی كرد، چرپەكان بەدەنگی بەرز قسەیان نەكردو سامی




دووژمن شکاوی چاوەکانی یەکتریان دەبینی و گیانبازی شتێکی ئاسایی بوو، ئازادی [illegible]ی سەر زمانی زۆرینەی خەڵك و کوردستان بوو بەپیرۆزترین خواستی ئەو خەڵکانەی لەپێناویدا کاری سیاسی و پێشمەرگایەتییان دەکرد، لێرەدا تەنها یەك نموونەی جوامێری و جوانمەردی دەگێڕمەوە:

(محەمەدی حاجی سابیر) یەکێك لەو رۆڵانەی ئەو رۆژگارەو لەگەڵ کاك (نەوشیروان)دا لای (حسك) گیرابوون. (محەمەد) نێردرابووە لای (یەکێتی) تا ئەو چەکانە بەرێت بۆیان کەئەوان داوایان کردبوو، ئەو چەکانەش وەك بیرم مابێت (٥٠) چەك بوون، من ئەو شەوە شایەتم کەبرادەرانی هەرێمەکانی (یەك و سێ و پێنج) دانیشتبوون، تا بەهەموو لایەك ئەو پەنجا چەکە ئامادە بکەن و بەیانی (محەمەدی حاجی سابیر) بیباتەوە بۆ (حسك) تا کاك نەوشیروان ئازاد بکەن و کێشەکە کۆتایی بێت، برادەران هەموو سەریان کردبووە سەر (محەمەدی حاجی سابیر)و بۆ خۆشی دەیان دوان و دەیان وت: (پیاوی ئازا ئاوا دەبێت بەپێی خۆی بەرەو زیندان و باوەشی دووژمنەکەی دەگەڕێتەوە، لەبەر سەلامەتی گیانی هاورێکەی) ئەویش منالە بچووکەکانی لەباوەش گرتبوو بەقەناعەت و بەدەمی پڕ لەپێکەنینەوە دەیوت: (چی بکەم چار نییەو رێگایەکەو گرتوومە)، ئەوانەی بەو ئاواتە بەرزانەوە دەژیانن دەیانزانی ئەم جۆرە مرۆڤەی لەپێناوی بیروڕایەکدا کەهەییوو خۆی بەخت دەکردن چەند جوان و بەرزو پیرۆزە، ئەو گیانبازییەی هاورێیەك بۆ هاورێیەکی خۆی لەدەستی دەکات برا بۆ برای نەدەکرد، ئەم سیفەتە جوان و جوامێرە هیچ حیزب و رێکخراوێك دروستی نەکردبوو، بەڵکو خۆبەخۆ لەو گیانی بەرگریی و بەرەنگارییەوە هەڵقوڵابوو کەئەو مرۆڤانە بەگشتی بەرامبەر بەدڕندەیی دوژمن و داگیرکەر بوویان و وەك سەنگەر تیایدا دەجەنگان.

لەوکاتەدا لەزیندانەکان و لەژیانی ئاسایی و لەناو شاخەکانیشدا مرۆڤەکانی بۆ ئازادی دەجەنگان و وەها بەنرخ و پاك و بەرزو جوان بوون و نموونەی چاولێکردن بوون.

دا ئەگەر ئەم پرسیارانە بێنە پێشەوەو بڵێن: ئاخۆ بارودۆخەکە هەروا مایەوە؟ ئەو گیانبازی و هاوڕێیەتییە چی بەسەرهات و هۆی بەسەرهاتەکانی چی بوون؟ شۆڕش بەرەو پێشچوو یان پاشەکشەی کردو بۆچی؟ من هەوڵ دەدەم وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەمەوە، بەڵام لەبەرئەوەی ئەم شوێنە ڕێگەی وەڵامی دورروودرێژم نادات هەوڵ دەدەم بەسەر سەرجەم بەسەرهاتەکاندا بەگورجی گوزەر بکەم و ئەو شتانەی زۆر گرنگن و پەیوەندییان بەباسەکەوە هەیە پەنجەی ئاماژەیان لەسەر دابنێم بۆئەوەی بەهۆیەوە ڕووناکی بخەمەسەر کێشە بنەڕەتییەکەی مەبەستمە، حەز دەکەم جارێکی تریش ئەوە دووبارە بکەمەوە، من لێرەدا بەشێوەی ڕاگوزەر بەناو ڕووداوەکاندا تێدەپەڕم و ئاماژە بەشتەکان دەکەم و هیچی تر، ئەویش وەهایە:

لەو ڕۆژگارەدا بەحساب (ی.ن.ك) لەسێ باڵی (کۆمەڵەی ڕەنجدەران و خەتی گشتی و بووتنەوە) پێکهاتبوو کە (کۆمەڵە) باوترین و زۆرترین خەڵکی ناو (ی.ن.ك) بوو ئەویش لەبەرئەوەی ئیدیعای مارکسیەتی بۆ خۆی نەکردو خۆی بەنوێنەری چەوساوەکانی کوردستان دەزانی، بۆیە ئەو جەماوەرەی تێئاڵابوو، ئەگەرچی جیاوازییەکی زۆر لەنێوان (قاعیدەی کۆمەڵە)و (سەرکردایەتی کۆمەڵە)دا لەڕووی مارکسییەت و ویستن و نەویستنیا هەبوو، ئەوەندەی (قاعیدە) کێشەی یەکلاییکردنەوەی بیروباوەڕی سیاسی بەلاوە گرنگ بوو، (سەرکردایەتی) یا (ناوەندی کۆمەڵە) نیو ئەوەندەش ئەو کێشانەی بەلاوە گرنگ نەبوو، تەنها کەسانێکی کەم نەبێ حەزیان بەو (خۆ دابڕانە) نەدەکرد، تا لەساڵی ١٩٨١ و لەکۆنفرانسی یەکەمی کۆمەڵەدا کێشە شەخسییەکان بەیەکتردا تەقینەوە بەناوی (کوتلە)و (تەکەتولچی)یەوە سەریان هەڵداو وردە وردە ناکۆکی و ڕقەبەرایەتی تەشەنەی کردو (بەدبوون)و (بەدکردنی) پێشمەرگەو پێشمەرگایەتی دەستی پێکرد بەتایبەتی دوای دامەزراندنی مەڵبەندەکان)و نیزامی (تیپەکان) بەمەش تادەهات کۆمەڵە سیفەتی شۆڕشگێڕی لەدەست ئەداو دەسەڵاتێکی (عەسکەرتاریزم) جێی

دەكرێتەوە، هەرچی پێی دەوترا هاوڕێیەتی و خۆشەویستی بەرە بەرە بەدەستی ئەمان لەبرییەوەو رق لێبوون و رق لێهەڵگرتن جێی گرتەوە، بەو جۆرە تا دەهات (قاعیدەی كۆمەڵە)و (سەركردایەتی) لەناكۆكی و ململانێی بەردەوامدا بوون و بەردەوامیش رێكخراوی تازە تازە لەناو ریزەكانی كۆمەڵەدا دروست دەبوون و جیادەبوونەوە وەك (كارگەران و كارو كۆمەڵەی ماركسی لینینی رزگار كوردستان، رێكخراوی تێكۆشانی رەنجدەرانی كوردستان، دواجاریش (ئاش) ئالآی شۆڕش) تا (عەسكەرتاریزم) پێی زۆرتر دابگرتایە ناكۆكی و دووژمنایەتی كردنی یەكتری توندووتیژتر دەبوو، دەسەلاتی (عەسكەرتاریزم) بەهانەیەكی سیاسی بوو بۆ دەمكوتكردنی ئەوەی دژی شەڕی براكوژ بووایەو ناڕازی و گلەیی لەكەموكورتی ناو ریزەكانی پێشمەرگایەتی هەبووایە، ئەوساش بەتۆمەتی (عێراقچێتی) یا دەربەدەر دەكرا، یا هەوڵی لەناوبردنی دەدرا، ئەم كردەوانەش چ لەناو هێزی پێشمەرگایەتیدا ببووە مایەی رق و بێزاری، یەكێك لەو زیانانەی لەو دەسەلآتی (عسكەرتاریزمە) كەوتەوە ئەوەبوو لەساڵی ١٩٨٢ سەدان هەزار سەربازی هەڵاتووی ناو ناوچە رزگاركراوەكانی ناچار بەتەسلیم بوونەوە كرد كە بەلێشاو بۆ باوەشی رژێم گەڕانەوە لەدواتردا بوونە زەخیرەی لەشكری بێ پایانی بوون بە(خەفیفە).

یەكێكی تر لەزیانەكانی ئەو دەسەلآتە عەسكەرتاریزمە، درێژەكان بەشەڕی براكوژی بوو، لەزۆربەی ناوچەكاین كوردستانداو لەگەڵ زۆربەی رێكخراوو حزبەكانی تردا كەئەمەش لەلایەك بوو بەهۆی لەناوچوونی سەدان پێشمەرگەی دڵسۆزو نیشتمانپەروەری هەموو لایەنەكان كەئەوەندەی لەو شەڕە لابەلایانەدا پێشمەرگە شەهید دەبوو لەبەرامبەر دووژمندا (یەك لەسەر چواری) ئەوەش تیا نەدەچوو، لەلایەكی تریشەوە بوو بەهۆی تۆوی ناكۆكی و دووبەرەكی چاندن لەناو ریزەكانی خەڵكی كوردستانداو هەستی تۆڵەسەندنەوە لەیەكتری و دژایەتی یەكتر كردن تاسەر ئێسقان و هەوڵی لەناوبردنی ئەم لەئەو جگە لەو دەیان كارەساتە دڵتەزێنانەی لێرەو لەوێ روویدا.

ئەمەبوو هەر لەناو ریزەکانی خودی (ی.ن.ك)دا ناکۆکی و رکەبەری و دووژمنایەتی دژبە سەخسییەکان گەیشتە ئاستێکی وەها ناخۆش و ناقۆلا کەدەیان کارەساتی دڵتەزێنی ناو خۆی لێکەوتەوە بەهۆی تۆمەتی جۆربەجۆری وەك شەهیدکردنی (خەلیفەو ریاو سالاری حاجی دەروێش و جوامێرو... هتد) ئەمانە جگەلەوەی بەدەستی هاورێکانی خۆیان شەهید کران لەهەمان کاتیشدا بوو بەهۆی بڵاوبوونەوەی دوودڵی و بێ متمانەیی بەیەکتری و بیرکرنەوەی خراپ بەرامبەر بەیەك.

ئەم ژیانە پڕ مەرگەساتە بەوجۆرە درێژەی کێشا تا گەردەلولی ئەنفال بەجارێك لەهەموو ناوچەکانی کوردستاندا هەڵیکردو کۆمەڵگەکەی شەق و پەق کرد، جگەلەوەی خەڵکێکی بێ اوانی زۆر ئەنفالکران، بزووتنەوەی چەکداری کوردستانیش بوو بەدوو بەشەوە، بەشێکی خۆیان تەسلیمی رژێم کردەوەو بوونە (جاش و تەواری) بەشێکیشی بەرەو دیوی (ئێران) ئاودیو کران و هەڵهاتن کە لەدوای خۆیانەوە نیشتمانێکی چۆڵکراوی ویرانەکراوی بێ خەڵك و بێ گوزەرانیان جێهێشت، ئیتر شتێك نەمایەوە ناوی پێشمەرگەو پێشمەرگایەتی بێت، هەموو ئەم مەرگەساتانە لەکاتی ئەنفالەکاندا دوای رێککەوتنی (ئێران و عیراق) لەسەر شەڕ وەستاندن هات بەپێی ماددەی (٥٩٨)ی ولاتە یەکگرتووەکان بوو کەهەردوولا لەسەری پێکهاتن و کوردیش تیایدا بووە قۆچی قوربانی.

ئەو هێزە تێکشکاوانەی چوونە دیوی ئێران بەتەواوەتی لەواقیعی خۆی دابڕاو زۆرتر خۆی دایە دەستی قەدەرێکی کوێر کەنەیدەزانی بۆ کوێی دەبات، ئەوانیش بوونە سێ جۆر:

یەك/ جۆرێکیان هەوڵیان دەدا بەرەو هەندەران بڕوات، ئیتر بەهەر رێگایەکدا بێت لای گرنگ نەبوو، هەبوو ملی بەرەو پاکستان دەنا، هەبوو بەرەو تورکیاو یۆنان دەچوو.

دوو/ جۆرێکیان پاش ئەوەی دەیزانی شاری نەماو بەو (عەفواتە) بەردەوامانەی جار لەدوای جار تازە نەکرانەوە بەرەو باوەشی رژێم دەگەڕایەوەو خۆی دەدایە دەستی

قەدەر.

بەڕ جۆرێکیان مانەوەیان هەڵبژارد، ئەوانەی (سەڵت) بوون لەو بارەگانەی سەر سنوور نەژیان کەرێیان پێدرابوو، ئەوانەی (خێزاندار) بوون لەناو شارەکاندا دەژیان، تا دەهات ئەمانەش رۆژ بەرۆژ ژمارەیان کەم دەبووەوە یان بەتەسلیم بوونەوە یان بەملنان بەرەو هەندەران.

سەرجەمی ئەو خەڵکە تووشی نائومێدی و بێ بڕوایی و دەردی رووخاوی ببوو، زۆربەی زۆری سەرکردەکانی بەرەو ئەورووپا هەڵهاتن و ئەو واقیعە کەدوورکەوتنەوە، باشترین نموونەش (عەلی بچکۆل) بوو کە لە(بەرەی کوردستانی)دا چ راستییەك روویدابوو بڵاوی کردەوەو بەخۆی و منالەکانییەوە بەرەو (پاکستان) هەڵهات و رۆیشت.

بەباشی دەزانم یەك دوو قسە لەسەر شتێك کەناوی (بەرەی کوردستانی) بوو بکەم، ئەم (بەرەیە) پێش چوونە (ئێران) لەناو حیزبە کوردستانییەکاندا لەدەمە دەمی ئەنفالەکاندا وەك (هودنەیەك) وابوو لەنێوان ئەو حیزبانە بۆ راگرتنی شەڕی براکوژی لەوە زیاتر رۆڵێکی ئەوتۆی نەبوو کەکرانە ئێرانەوە بارەگاکەی لە(راژان)ی ناوچەی (مەرگەوەڕ) بوو، تەنها ئیشی قسەی زل بوو هیچی ترو هیچ رۆڵێکی نەبینی.

بارودۆخەکە بەجۆرێك رووخابوو نە(بەرەی کوردستانی و نەهیچ (سەرکردەیەکی زۆر ئازا)و نەهیچ حیزبێکی گەورە یا بچووك بۆ سەربێ نەدەکەوتەوە، مەگەر بەدیاریەوە هەڵتروشکایەو باوکەڕۆی بکردایە، لەبەرئەوە کێشەی کورد لەلێواری مەرگدا بوو بەرێککەوتنی (تەواوەتی) نێوان عیراق و ئێران ئەگرە بکرایە یەکسەر دەمردو دەبڕایەوە، کەسێك نەبوو، هەرچەندە سیاسی و زاناو ئاش بووایە، بڕوای بەوە هەبێت بەبێ تەسلیم بوونەوە جارێکی تر سەر بەعیراقدا ئەکاتەوەو چاوی بەزێدی خۆی دەکەوێتەوە، ئەمە ئەو راستییە تاڵەبوو هەرهەموو کوردێکی ئاوارە لەناویدا دەژیاو چاوەڕوانی (لەدایکبوونی گۆدۆ)ی تیادەکرا.

بەدرێژایی ئەو شەوگاری تەنگانەیەو پڕ بەبەرینی دەشتی نائومێدی خەڵکی ئاوارە بوو، دەنگی رووداوێك قیژاندی و مژدەی بارانێکی خۆشی راگەیاندو چاوە کزەکانی گەشانەوە، ئەویش (رووداو)ی داگیرکردنی (کوەیت) بوو، هەرچەندە سەرکردەکانی (بەرەی کوردستانی) ترس بەری نەدابوون تاماوەی چەند مانگێکیش دوودڵ بوون لەوەی (سەدام) چی بەسەردێت، چونکە کەرژێم وەفدێکی بۆ (مفەوەزات) نارد لای (بەرە) ئەوان هەموو ئامادەبوونێکیان نیشاندا، کەچی کەوەفدەکەی رژێم گەڕایەوە ئیتر ببڕای ببڕ نەهاتەوە، تا داگیرکردنی کوەیت، لەلایەن عیراقەوە درێژەی بکێشایەو ئیستەرەمی مانەوەی بکردایە، ئومێدی بەرپابوونی شەڕی (کەنداو) زۆرتر دەبوو، روودانی ئەو شەڕەش لەناوچوونی (سەدام)ی پێوەبوو، دوای ئەوەی حیزبە گەورەو بچووکەکانی (بەرە) وەك (یەکێتی و پارتی و شیوعی و پاسۆك و حسك و پارتی گەل) لە نەهاتنەوەی وەفدەکەدڵنیابوون، ئەوجا کەوتنە خۆئامادەکردن بۆ (وەزعی عیراقی دوای شەڕ) بەتایبەتی (یەکێتی)و (پارتی) کەزلترین حیزبی ناو (بەرە) بوون بەچاکی دەزانم بۆ تێگەیشتن لەحاڵ و وەزعی ئەو دوو حیزبە بەرلەوەی (راپەڕین) روویدات کەمێك بەکورتی باسیان لەسەر بکەم، ئەویش وەها بوون:

-یەك/ (یەکێتی) دوای ئەنفالەکان سەرومڕ کەوتە ئێرانەوە، لە ۱۹۸۸ بۆ ۱۹۹۱ هێزێکی زۆر کەمی بەدەستەوە مایەوە کە بەزۆری لەناوچەکانی (مەریوان و بانەو سەقز)دا کۆکرابوونەوە خۆی لەهەزار کەس کەمتر دەدا لەناو شارەکانی کوردستانی عیراقیشدا رێکخستنەکانی دووچاری داوەرین و تەنگەتاوییەکی تەواو ببوون، بەپێی ئەو بەڵگەنامانەی لامن، هەرە بەرپرسی گرنگی رێکخستن کە (جەباری حاجی رەشیدو برادەرانی بوو) لەنێوان هەولێرو سلێمانیدا گیران و زۆربەیان (ئیعتراف)یان لەسەر چۆنییەتی ئیش و کارەکانیان کردووە، ئەگەر رژێم بەهۆی ئەو تەنگانەیەوە

ئەبرایە کە لەئەنجامی داگیرکردنی کوەیت رووبەڕووی بووەوە حەتمەن چۆرپڕی کردن، حیزبێکیگەورەو بەرفراوانی وەك یەکێکی تاکێت هەموو رێکخستنی هاتبێتەسەر خەڵکانێکی وەها کەم، بمانەوێ و نەمانەوێ ئەوە بەڵگەی خراپترین وەزعی سیاسی ئەو دەردەخات، حاڵ و وەزعێکی وەهاش لەفەرهەنگی سیاسیدا مانای تایبەتی خۆی هەیە، پێویست بەهیچ جۆرە ئەملاو ئەولایەك ناکات.

دوو/ (پارتی دیموکرات) کەپێش ئەنفالەکان بنکەو بارەگا بەرپرسەکانی لەناوچەکانی (راژان و زێوێ و شنۆو...هتد)بوو جگەلەوەی خەڵکێکی زۆر لەناوچەی (بادینان)و لەناوچەکانی لقی (دوو/سێ/چوار) بوو دوای ئەنفالەکان بەشی (بادینان)ی بەزۆری روویدەکردە دیوی (تورکیا)و رۆژبەڕۆژ بەرەو کەمبوونەوە دەچوون، بەڵام (بەرزانییەکان) زۆرینەی خەڵکی (پارتی) بوون کەمابوونەوەو لەو مانەوەیەدا ئەو زۆرترین خەڵکی مابوو.

یە ك دوو مانگ بەر لەدەستپێکردنی شەڕی (کەنداو) دەزگاکانی ئەعلامی ئەمریکی و ئەورووپی فوویان کردە (عیراق)ەوەو ئەوەندەیان گەورەکردەوە لەسنووری (ئەفسانە)ش دەچوو، دیارە ئەوان لەوەدا مەبەستی خۆیان هەبوو:

یەك/ بیکەنە هۆی روودانی شەڕ تابەو شەڕە دەستیان بگاتە ناوچەکە.

دوو/ رای خەڵکی ئەورووپا دنیاش رازی بکەن بەوەی (عیراق) مەترسییەکی ئەوەندە گەورەیە بۆسەر مرۆڤایەتی، چونکە خەڵکی سەرزەوی بەگشتی (گوێ لەمستی) ئەعلامەو رازیکردنی ئەو خەڵکە نیوەی گرەوەکە مسۆگەر دەکات.

تاڕوودانی شەڕەکە نزیکتربووایە خۆئامادەکردنی ئەو حیزبانە بۆ (وەزعی عیراقی دوای شەڕ) باشتر هەنگاوی چوونە پێشەوەی دەنا، (یەکێتی) لەو کارەدا دەستی خۆی وەشاندبوو بەوەی لەهەموویان چاکتر خەڵکی لەخۆی کۆکردبووەوەو قایمتر جێی پێی خۆی کردبووەوە، ئەویش بەم چەشنە بوو:

یەك/ (رادیۆ)کەی خۆی کرد بەرادیۆی (بەرەی کوردستانی) توانی بەو هۆیەوە لەدەرگای هەموو ماڵێك بدات و جارێکی تر خۆی بەخەڵکی کوردتسان بناسێنێتەوە

ئەمەش ئەوەندەی قازانجی بە(یەکێتی) دەگەیاندو نیو ئەوەندەی قازانج بە(بەرە) [illegible] ئەمەش گۆڵێکی خشکەیی بوو (یەکێتی) لە(بەرە)و لە(پارتی) کردبوو هەر ئەوەش بوو بەهۆی ئەوەی •یەکێتی) لەو رۆژەوە تائێستا دەنگی ئەعلامی (زاڵ) دەنوێنێ.

دوو/ پێش حیزبەکانی تر لەچەند قۆڵێکی جیاجیاوە بەهۆی ئەو (مەفرەزانە)ی لەناوچە چۆڵکراوەکان دای بەزاندبوو پەیوەندیی کرد بەجاشەکان و پیاوانی رژێمەوە بەتایبەتی ئەوانەی کەوردەمانێك پێشتر پێشمەرگەی ی.ن.ك بوون و لەبەر هەندێك هۆی (هونەری) تەسلیم ببوونەوەو ببوونە جاش و پیاوی رژێم بەمانە (شانە چەکدارەکان)ی بۆ (راپەڕین) ئامادەکرد.

سێ/ کاك (مەسعود بارزانی) کرد بەرابەرو بەرپرسی راپەڕینەکە، ئەمەش گۆڵێکی خشکەیی تر بوو یەکێتی) لە (پارتی) و لە(بەرە)ی کردو بەقازانجی خۆی تەواوبوو، ئەویش ئەوە بوو توانی بەهۆی ئەوەوە ئەو جاشانە دەمکوت بکات کەلایەنگری (پارتی) بوون و ناچاریان بکات یا بچنە ناو جەماوەری راپەڕیوەوە یا بێدەنگی خۆیان رابگەیەنن.

لێرەدا ئەو پرسیارە دێتەپێش کەدەڵێ: بۆ جاشەکان پێویستیان بەرابەرێکی سیاسیی هەبوو؟ لەوەڵامدا دەڵێم: کاتێك زۆربەی زۆری جاشەکان برابوونە ناو کوەیت بۆ شەڕکردن ئەوا بەرلەوەی شەڕ رووبدات هەڵهات و گەڕانەوە کوردستان، ئەگەر رژێم جارێکی تر بگەڕایەوەو لەو شەڕەدا سەرکەوتوو بوایە تەواوی ئەو جاش و سەربازانەی هەڵهاتبوون دەکردە پێخۆری مەرگ، جا ئەوان پێویستیان بەهێزێکی سیاسی هەبوو بەمەرجێك ئەو هێزە لە(دەورەی خۆیان) بێت و رابەری ئەمان بکات تابتوانن بەهۆی ئەو رابەرەوە جەماوەری خەڵك لەخۆیان کۆبکەنەوەو دژایەتی رژێمی پێبکەن.

لەبەرامبەر ئەوانیش حیزبەکانی کوردستان و مەفرەزەکانی پێویستیان بەو جاشانە بوو تابەهۆی ئەوانەوە جەماوەری خەڵك راپەڕێنن و ئەو ناوچانە لەدەستی دەوڵەت

ئینکار بکەن کەحکومەت ئەوپەڕی تیایدا لاوازەو بکرێتە سەنگەری بەرامبەر بدەنەوە، هەموو ئەمانەش لەڕێگەی ئەو بانگەوازانەوە جێبەجێ دەکران کەداوای (ئاشتبوونەوەی گشتی) دەکردو خەڵکی بۆ خۆئامادەکردن هان دەداو داوای دەکرد کاری هەم ئاهەنگی بکەن، جاشەکان لەوە دڵنیابوون کە لەهەموو کارو کردەوەیەکی کردوویانە بەخشراون و کەسێك پەنجەی خراپیان بۆ درێژ نەکات و بەخراپیش ناویان نابرێت، لەبەرئەوە بەدڵسۆزی کاریان دەکردو خۆیان بۆ ڕۆژێك ئامادەدەکرد کەفەرمانی کارکردنیان پێڕانەگەیەنرا، ئەوان دڵنیابوون لەوەی ئەو کارەی دەیکەن لەدوو سەرەوە گرەو دەبەنەوە:

یەك/ خۆیان لەو چاوەڕوانی و هەڕەشەی مەرگە رزگار دەکەن کەبەسەریاندا سەپاوە.

دوو/ لەکاتی رزگاریدا خۆیان هەموو کاروبارەکانی دوارۆژ دەگرنە دەست و خۆیان گەورەی خۆیان دەبن و کەسێك نابێت بەهیچ شێوەیەك پەنجەی خراپەیان لەڕوودا بەرز بکاتەوەو ناویان بهێنێ، لەبەرئەوە باشترین هێزی (دەرەوە)ی خۆیان کەئاواتەکانیان سەوز دەکات (بەرە)یە هەر بۆئەو مەبەستە لەژێرەوە رێکەوتن و ئامادەبوونی خۆیان نیشاندا، لەسەرەکەی تریشەوە (یەکێتی) بەخەیاڵی خۆی دەتوانێ بەو هێزی جاشانە هەم خەڵکی ناچار بە(راپەڕین) بکات و هەم بەلای کەمەوە هەندێك ناوچەی رزگارکراو بۆ خۆی مسۆگەر دەکات و جارێکی تر دێتەوە مەیدان و ئامانجە سیاسییەکانی خۆی جێبەجێ دەکات، هەم بەم کردەوەیەش جەماوەر لەخۆی کۆدەکاتەوەو خۆی لەو تەنگانەیە رزگار دەکات کەتێی کەوتبوو، ئەوسا ئەو بەپشتی جەماوەرو جەماوەریش بەپشتی ئەو دەسەڵاتێکی ئەوتۆ پەیدا بکەن بەهۆیەوە جڵەوی رای گشتی کورد بگرێتەدەست، بەمەش هیچ نەبێ بەشێکی کورسی دەسەڵاتی سیاسی بۆخۆی دابین دەکات، لەبەرئەوە بوو (یەکێتی) بەناوی (لێبوردنی گشتی و ئاشتبوونەوەی گشتی)یەوە هەموو رێگایەکی کۆکردنەوەی جەماوەری بەکارهێناو باوەشی بۆ هەموو کەس کردەوەو بەبێ جیاوازیکردن و خۆ بۆ



کا... گونجاوی (وەزعی عیراقی دوای شەڕ) ئامادەکردو چاوەڕوانی هەلی زێڕین)ی دەدەدا بۆئەوەی گۆڵی سەرکەوتن بکات و بەرنامەکانی خۆی تیادا پیادەبکات.

## بەشی چوارەم

لەمێژووی گەلاندا زۆرجار (درۆی ئەعلام) بووەتە هۆی سەرکەوتن یان تێکشکانی جووڵانەوەیەکی کۆمەڵایەتی یا سیاسی، زۆرجاری تریش هەر ئەو جۆرە درۆیەبووە بەهۆی ناوبانگ پەیداکردنی کەسێکی سیاسی یان نووسەرێك یا شاعیرێك، لەلای ئێمە کوردیش ئەو (درۆی ئەعلام)ە هەمان دەوری دیوە، یەکێك لەو ڕووداوانە (درۆی ئەعلام) دەوری تیغادا گێڕا (ڕاپەڕین)ی ١٩٩١ بوو کەپاش ئەوەی کۆنە چەکدارەکانی (مەڵبەندی سێ)ی (پێش ئەنفال) لەگرتنی (ڕانیە)دا دەوری سەرەکییان بینی و بەشوێنیدا کاك (مەسعود بارزانی)یش وەك ڕابەری ڕاپەڕینەکە (بەیانێکی شەش خاڵ۹ی دەرکردو داوای لەڕژێمی عیراق کرد کەئەوە ڕاپەڕینی خەڵکی کوردستان خۆیەتی بۆ (دەستەبەر کردنی بەیانی ئازاری ١٩٧٠و هیچ دەستێکی ئەملاو ئەولا دەستی تێوەرنەداوە، بەدوای ئەوەدا کە(ڕانیە) بووە پێگەی (ڕاپەڕین) زۆر بەخێرایی ڕاپەڕینەکە خۆی گەیاندە ئۆردوگای (پیرەمەگروون)و دەوروبەری (بازیان)یش پێموایە هۆی سەرەکی ئەو تەنینەوەیە کێشەی خزمایەتیی خەڵکی ئەو ناوەبوو کە لەگەڵ یەکتردا هەیانە، بەوجۆرە (سلێمانی) دابڕا لەشارەکانی ترو ئەمەش بۆخۆی هاندەرێك بوو بۆ جووڵەخستنە ناو شارەکەوە، هاوکاتیش چەند (درۆیەکی ئەعلامی) کاریان کردە سەر خەڵکی (سلێمانی) تا بەرابەری (شانە چەکدارەکان) ڕاپەڕن، یەکێك لەو درۆیانە درۆی ئەعلامی ئەورووپی و ئەمریکی بوو بەوەی (سەدام) داوای پەنابەری کردووە دەمێك لە(ڕوسیا)و دەمێك لە(هندستان) لەکۆی و کوێی تر، یەکێکی تری درۆکان درۆی (بەرەکی کوردستانی) بوو بەوەی حکومەتی عیراق فەرمانی ڕەمیکردنی هەموو ئەو سەربازانەی دەرکرد کە لەشەڕی (کوەیت)



هەڵهاتوون، ئەمەش خۆبەخۆ هەموو ماڵە کوردێکی دەگرتەوەو هەمووش کورکوژراو دەبوون.

ئەم ترسە بەجارێك (سلێمانی) تەقاندەوە، خەڵکی لێرەدا بوونە دوو بەش، بەشێکیان گیانی خۆی بەخت دەکردو دەستەو یەخە لەگەڵ هێزەکانی پاشماوەی (بەعس)دا شەڕی مان و نەمانیان دەکرد، بەشەکەی تریان خەریکی تاڵان و بڕۆیی بوون، کاتێکیش پێشمەرگەکانی (بەرە) گەیشتنە شار هەموو شتێك لەتەواوبووندابوو، ئەوەبوو دوای رزگارکردنی (سلێمانی) خەڵك بەلێشاو پەلاماری هەموو شارو ناوچەکانی تری دا تا بەڕزگارکردنی (کەرکوك)یش گەیشت.

ئەم تاقیکردنەوەیە دەریخت هە جووڵانەوەیەکی کۆمەڵایەتی ئەگەر هاتو لافاوی خەڵکی (تاڵانچی) لەگەڵدابێت هەمیشە سەرکەوتنی مسۆگەرە، لەڕاستیدا ئەم کردەوە ناشرینە هەر تایبەت بەکورد نییە، بەڵکو لەمێژووی گەلاندا نموونەی زۆرە، هەر ئەوەش هۆ بوو بۆئەوەی ئەو راپەڕینە بەرگەی مانگێکی نەگرت.

ئەویش کاتێك بۆیان دەرکەوت (سەدام)و رژێمەکەی هەر ماوەو بەر شاڵاوی دانەوە، ئیتر بەجارێك کورد سەرو ماڵی بەجێهێشت و بەرەو (تورکیاو ئێران) هەڵهاتن و رایانکرد، لەڕاستیدا ئەو راکردن و هەڵهاتنە تێکڕاییەی گەلی کورد لەترسی دڕندەیی رژێم بوو کە تۆڵەیان لێبکاتەوە، چونکە ئەگەر خەڵکی کورد پێشتر بۆیان دەرکەوتایە (سەدام)و رژێمەکەی دوای ئەوەی کردیان هەر دەمێنێ و دواتریش خودی (بەرەی کوردستان) بوو بەوەی حکومەتی عیراق فەرمانی رەمیکردنی هەموو ئەو سەربازانەی دەرکردووە کە لەشەڕی (کوەیت) هەڵهاتوون، ئەمەش خۆبەخۆ هەموو ماڵە کوردێکی دەگرتەوەو هەمووش کورکوژراو دەبوون.

ئەم ترسە بەجارێك (سلێمانی) تەقاندەوە، خەڵکی لێرەدا بوونە دووبەش، بەشێکیان گیانی خۆی بەخت دەکردو دەستەویەخە لەگەڵ هێزەکانی پاشماوەی (بەعس)دا شەڕی مان و نەمانیان دەکرد، بەشەکەی تریان خەریکی تاڵان و بڕۆیی بوون، کاتێکیش پێشمەرگەکانی (بەرە) گەیشتنە شار هەموو شتێك لەتەواوبووندابوو،

ئەوەبوو دوای رزگارکردنی سلێمانی خەڵك بەلێشاو پەلاماری هەموو شارو [illegible] تریدا تا بەرزگارکردنی (کەرکوك)یش گەیشت.

ئەم تاقیکردنەوەیە دەریخت هەر جوڵانەوەیەکی کۆمەڵایەتی ئەگەر هاتوو لافاوی خەڵکی (تالانچی) لەگەڵدابێت هەمیشە سەرکەوتنی مسۆگەرە، لەڕاستیدا ئەم کردەوە ناشرینە هەر تایبەت بەکورد نییە، بەڵکو لەمێژووی گەلاندا نموونەی زۆرە، هەر ئەوەش هۆ بوو بۆئەوەی ئەو راپەرینە بەرگەی مانگێکی نەگرت.

ئەویش کاتێك بۆیان دەرکەوت (سەدام)و رژێمەکەی هەر ماوەو بەر شالاویدانەوە، ئیتر بەجارێك کورد سەرو ماڵی بەجێهێشت و بەرەو (تورکیاو ئێران) هەڵهاتن و رایانکرد، لەڕاستیدا ئەو راکردن و هەڵهاتنە تێکڕاییەی گەلی کورد لەترسی درندەیی رژێم بوو کەتۆڵەیان لێبکاتەوە، چونکە ئەگەر خەڵکی کورد پێشتر بۆیان دەرکەوتایە (سەدام)و رژێمەکەی دوای ئەوەی کردیان هەر ئەمێنێ و دواتریش خودی (بەرەی کوردستانی) ئەچێتە خزمەتی و ماچ و مووچی دەکەن هەرگیز غیرەتی (راپەڕین)ی نەدەبوو، ئەوەبوو دواتر راکردن و هەڵهاتنە بۆ کورد بەباش گەڕاو کورد لەلایەن (وڵاتە یەکگرتووەکان)ەوە خراپە ژێر چاودێری دەسەڵاتی ئەمریکاوە، ئەوەش بۆی بووە نیمچە سەربەخۆییەك و لەدەسەڵاتی رژێم دابڕا.

ئەمە حیکایەت نەبوو، ئەمە گێڕانەوەیەکی کورتی ئەو راستییانە بوو کەزۆر بەخێرایی بۆنموونە هێنامنەوە بۆئەوەی لەدواییدا هەندێك بەڵگەی تیادا دەستنیشان بکەم تالییەوە ئەو رۆژە دیاری بکەم کەهەموو شتێکی تیادا (پیس بوو) کەئەویش رۆژی (راپەڕین)ی ۱۹۹۱و ئەم ئێستایەی لەسەر دەژی و ئەم ئێستایەی تیادا بەرهەم هات و ئەیکەم بەجێگەی قسەلەسەر کردنەکەم، وەك پێشتر گێڕامەوەو ئاماژەم پێکرد هۆ زۆر بوون کەئەو (پیس بوون)ی رۆژەیان بەرهەمهێناو خستیانە ملی گەلێکی لێقەوماوی و بێ دەسەڵاتەوە، دەتوانم بڵێم ئەم هۆیانە هەرە گرنگەکانیەتی:

یەك/ ناسیاسیەتی (یەکێتی) کەبونێکی گەورەی لەمەیدانەکەدا هەبوو ئەویش بەهۆی ئەوەی ئەو باڵانەی ناو یەکێتی لەبنەڕەتەوە سەربەخۆیی سیاسی و فیکری خۆیان

نەبوو، بەڵکو شتێك بوون و دەرهەق رۆژگار قووت کرابوونەوە، بەڵگەش پێکەڵاوکردنی (خەتی گشتی و بزووتنەوە) بوو لەساڵانی هەشتاکاندا بۆ دروستکردنی (شۆڕشگێڕان) کە ئەمە لەفەرهەنگی بەسەرهاتی کۆمەڵایەتیدا نییەو نەبووە، ئەگەر راست بێت رێکخراوێکی سیاسی نوێنەری چینێکی کۆمەڵایەتی بکات تێکەڵکردنی دوو رێکخراو واتە تێکەڵکردنی دوو چین، شتی واش لەدنیادا نەبووە، دواتر کە یەکێتی تەواو لاواز ببوو هاتن (کۆمەڵەو شۆڕشگێڕان)یشیان تێکەڵ کردو بوونە (یەکێتی) ئەم جۆرە تاکتیکە سەیرو بێ بناغانە هەر لەسەرەتاوە (یەکێتی) کرد بووە هێزێکی چەکداری رووت و هەموو شت ملکەچی چەك بوو، چەك هەڵگریش لەسەرووی کادری سیاسییەوە بوو، لەهەموو شتێکیشدا (یەکێتی) بەچەك وەڵامی هەموو شتەکانی دەدایەوە، تەنها (یەکێتی لەزمانی چەکی دەزانی و هەر لەبەرئەوە چ لە(راپەڕین)و چ دواتریش (یەکێتی) خۆی بەڕابەرێکی چەکداری زانیوەو تازە بەم (پیریی)یەش فێری پلاوخواردنی سیاسەت نابێت و دەست بۆ لووتی دەبات.

دوو/ دوای ئەنفالەکان ئەوەی ناوی پێشمەرگەو پێشمەرگایەتی بوو کۆتایی پێهات و ئەو خەڵکە مایەوە هەرگیز نەیان دەتوانی ئەو رۆژگارە بۆ دواوە بگێڕنەوەو بەو مانایە ببنەوە بەپێشمەرگە، تا دونیا بەدونیایە باهەر خۆشیان بڵێن پێشمەرگە، هەر ئەوەش بوو وایکرد (راپەڕین) جڵەوەی بەدەستی رابەریکردنی • شانە چەکدارەکان)ەوە بێت و ئەوان لەگەڵ دووژمن شەڕ بۆ خەڵك بکەن و بەرەو سەرکەوتنی بەرن.

سێ/ ئەگەر (سەدام) پەلاماری کوەیتی نەدایەو خۆی دووچاری ئەو تێکشکانە نەکردایە هیچ پیاوێکی ئازای کورد (ئەگەر کڵاوەکەی خدری زیندە)یشی لەسەردا بووایە بەخەویش نەیدەتوانی سەر بەم کوردستانەدا بکاتەوە، مەگەر بەعەفوات تەسلیم ببوایەوە، ئەمەش بەڵگەیەکی ترە بۆئەوەی پێشمەرگایەتی لەدوای ئەنفالەکانەوە بەسەرچوو، هەرچی هەبوو نەبوو لەو سەنگەرە رووخاوەدا لەگەڵ تفەنگێکی شکاودا بەجێی هێشت و خۆی و سێبەرەکەی هەڵهات و رۆیشتن.

چوار/ ئەو راپەڕینە لە ١٩٩١ دا کرا بەزەبری ترس و نەخشەدانانی ئەسکەری بوو،

لەڕاستیدا بەزۆر دروستکراو لەناخی تێگەیشتن و قەناعەتی خەڵکییەوە نەبوو، ئەگەر لەوێوە سەرچاوەی بگرتایەو بەقەناعەتەوە کاری بۆ بکرایەو نەخشەی سەرکەوتنی سیاسییانەی بۆ لەبەرچاو بگیرایە ئەوا ئەوسا بەشێوەیەك دەبوو کە نە(ڕاکردن)ی بەکۆمەڵی لێدەکەوتەوەو نەدزی و تاڵانی ناشیرینی دەکردو نەهێزێکی ناواقیعی رابەرایەتی دەکردو دوارۆژی خۆی لەسەر بینا دەکردەوەو کۆمەڵگاشی بەم دەردە دەبرد کەتێی کەوتووە، بەڵکە بەپێچەوانەوە سیاسییانە مامەڵە لەگەڵ هەموو ڕووداوەکان دەکردو بەشێوەیەکی ڕەواو گونجاو بەسەرکەوتنی دەگەیاندو نەیدەهێشت تۆزی ناشرینی پێوە بنیشێتەوەو کۆمەڵگەکەشی لەبەر ڕۆشنایی و جوانی ئەو سەرکەوتنەدا بینا دەکردەوەو مرۆڤەکانی بەرەو ئومێدو گەشانەوە دەبردو ژیانی لەهەموو ناهەمووارییەك پاك دەکردەوەو حەقیقەتەکان بۆخۆیان دەدوان.

## بەشی پێنجەم و کۆتایی

یەکەم چەپکە گوڵی دیاری دەستی دیکتاتۆریەتی (بەرەی کوردستانی) بەگشتی و (یەکێتی) بەتایبەتی بۆ خەڵکی شارەکان پەلاماردانی (شووراکان) بوو ئەگەرچی ئەو (شوورانە) خەڵکانی کەم ئەزموون و (کتێی) سەرپەرشتی دەکردن و ڕەفتاری منالآنەیان دەنوان، بەلاّم لەڕاستیدا ویستی خەڵك دروستی کردبوون، لەبەرچی چەکدارەکانی (بەرەی کوردستانی) بەگشتی پەلاماری (شووراکان)یان داو نەیان هێشت بەردەوام بیّ؟ من لەوەلاّمی ئەم پرسیارەوە بەرەو ناخی باسەکە ئەڕۆم و دەڵێم: هەرچەند مەبەستی پەلاماردان و لێدان و سەرکەوتکردنی (شوراکان) بەڕواڵەت بۆ ڕازیکردنی دڵی ئەمریکاو ئەورووپا بوو وەك (د.فوئاد مەعسوم) چەند ساڵ لەوەوبەدوا دریکاندی، بەلاّم لەجەوهەردا بۆ خۆفەرزکردن و دەسەلاّت بەدەستهێنان و (بەرەڵلایی) دروستکردن بوو تائەو چەکدارانە بەو هۆیەوە ڕێگە بۆ نیازو مەبەستە شاراوەکانی خۆیان خۆش بکەن و قەزایەکی ئازاد پێکبهێنن بۆئەو نیاو

مەبەستانەی لەدوای ئەنفال و لەڕۆژانی ئاوارەییدا لەدڵ و دەروونی دەر یەکەیاندا
[illegible]ەرەی کردبوو کە بەئاواتەوە بوون ڕۆژێك دابێتەوەو دەسەڵات بکەوێتەوە
دەستیان و بەدڵی خۆیان تۆڵەی ئەو ڕۆژە تاڵ و ناخۆش و پڕ لەنەبوونی و بێ
دەرەتانییەی چەشتبوویان بە(دەقات) بکەنەوەو تادەشتوانن هەم خۆیان (مڕ) بکەن و
هەم خۆیان (پڕ) بکەن و هەم خۆیان (سڕ) بکەن، بەو جۆرە دروشمەکانی
(خۆمڕکردن)و (خۆپڕکردن)و (خۆسڕکردن) لای هەر چەکدارێکی (بەرەی
کوردستانی) بەگەورەو بچووکیانەوە بەڕۆژانی ڕاپەڕینەوە ڕوونوئاشکرا دیاربوون و
خەڵکی کوێریش دەیبینین کەچیان کردو چیان دەبرد، بەتایبەتی ئەوانەی
لەڕابردوودا لەکارەساتی (هەڵەبجە)و شوێنەکانی تردا لەم کردەوانە ڕاهاتبوون هەر
باسیان ناکرێت چۆن (لووشدەر)ێك بوون، من دڵنیام ڕاکردنی بەکۆمەڵی خەڵکی
کوردیش بۆ ئەوە دروستکرا تادروشمەکانی (خۆمڕکردن)و (خۆپڕکردن)و
(خۆسڕکردن)ی پێ پەردەپۆش بکرێت یەکێك لەو بەڵگانەی ڕاستی ئەو قسەیەم
دەسەلمێنێ ئەو (بەڵگەنامانە)ی کاك (عومەر فەتاح)ە کەخۆم لەڕۆژنامەی
(هەڵوێست)ی ژمارە (١٨)ی ساڵی ٢٠٠٥دا بڵاوم کردنەوە، هەروەها بەندە لەناو
ڕەوی خەڵکی بەکۆمەڵ ڕاکردوودا بەئاشکرا هەستم بەو دەستە دەکرد کەخەڵکی
هاندەدا تازۆرترو زووتر ڕابکەن و لەکوشتنی بەکۆمەڵ دوور بکەونەوەو سەریان
سەلامەت بێت.

پاش ئەوەی کراو برا خەڵکی بەپەشێمانییەوە وردەوردە بەرەو شاروماڵی خۆی
گەڕایەوەو تەنها لەو ڕاکردنەدا یەك (دەسکەوت)یان بەدەست هێنا ئەویش
دیاریکردنی هێڵەکانی پاراستن بوو لەلایەن وڵاتە یەکگرتووەکان و ئەمریکاوە
بەمەش جۆرە دابڕان و نیمچە جیابوونەوەیەك بۆ ناوچەکانی کوردستان پێکهات،
ئەوەش جارێکی تر هیوای لەدڵ و دەرونی خەڵکیدا سەوز کردەوە، بەبێ ئەوەیش
هیچ دەسەڵاتێك ڕابەریان بکات و بەرنامەی گوزەرانی ژیانیان بەسەردا فەرز بکات
ئەوان بۆ خۆیان هەموو شتێکیان بەبێ هیچ (موقابیل)و هیچ (مووچە)و دەسکەوتێك

بەڕێوە دەبرد لەگەڵ ئەوەی بەدیار چاویانەوە خەڵکانی (بەرەی کوردستانی) بەردەوام ڕێژەیان بەبردنی تالآنی و خەباتی (ئەودیوکردن) دەداو وەستانیان نەبوو.

دوای ئەوە لێبوونەوە هەموو شتێك بڕایەوەو کۆتایی هات و بەتەواوی (مڕبوون)و (پڕبوون)و (سڕبوون) ئەوسا هاتن دەروازەی حەوشە گەورەی حزبایەتییان خستە سەرپشت بۆ خۆ قەرەباڵغ کردن و جەماوەر پەیداکردن و ئامادەکردن بۆ خەباتی زۆرانبازی لەگەڵ یەکتریدا.

هەموو دەزانین لەناوچەی (سۆران)دا (یەکێتی) لەبەر هەندێ هۆی تایبەت لەهەموو حزبەکانی تر زیاتر بە(پارتی)یشەوە جەماوەرێکی زۆر زەبەندی لێ کۆببووەوە، ئەو جەماوەرەش زۆربەی خەڵکی گەنج و منداڵکار بون تا چاو بڕی دەکرد سەوز دەچوونەوە.

لای هەموو حیزبەکان هیچ مەرج و خاڵبەندییەك بۆچوونە ناو حیزب لەبەرچاو نەگیرابوو، جگە لەمەرجی خۆزۆرکردن، چونکە حیزب حیزبی جەماوەر بوو، (بەپیس و بەپاکەوە)، (بەخراپ و بەچاکەوە)، بەداش و بەباشەوە)، (بەجاش و بەئاش)ەوە هەر دەهات و خۆی بەحەوشە گەورەی حیزبدا دەکردو دەبووە کوڕی حیزب و ماڵی حیزب و پیاوی حیزب و ئاو بێنەو دەست بشۆ، لەهەڕەتی ئەو خۆ قەرەباڵغ کردنەدا، هەوای لەخۆبایی بوون و ئارەزووی کورسی دەسەڵات پەیداکردن کەوتە کەللەی سەرانی (بەرەی کوردستانی)یەوەو داخوازی دروستکردنی (پەرلەمان)و (حکومەت)و شتی وا هاتە ئاراوەو شەڕەپەڕۆو شەڕە قین و یەکتر بوغزاندن هاتەپێش و هەرچی هیوایەك زووتر خەڵك هەیبوو درایە بەر شەق و سەرجەم کۆمەڵگەکەش بەزۆر بەرەو دووبەرەکی و تێکوپێکدان ڕاپێچ کراو (پەرلەمان)ێکی (دووڕەگ)و (حکومەت)ێکی (هار) قوتکرایەوە کەئەنجامەکەی بەشەڕی براکوژی و دووکەرتکردنی کوردستان و وێرانکردنی کەسێتی مرۆڤی کورد دوایی هات.

لەساتەوەختێکی وەهاداو لەسایەی پازدەساڵ دەسەڵاتی ئێرەو ئەوێداو لەماوەی پازدە

[illegible] فەرمانڕەوایی چ لەمبەرو چ لەوبەردا بەجێی خۆی دەزانم روو بکەمە سەردوولاو بلێم: کەتەشریفتان هێنایەوە لەبری گەورەکردن، بچووکتان کردینەوە.
کەهاتنەوە وەك داگیرکەران هاتن نیشتمانەکەتان داگیرکردینەوەو لەسەرتان نووسی ولاتێك بۆ کرێ، کەگەڕانەوە دزو جەردەی دنیاتان تێ بەردواین تەنانەت کاسەی سەرو رەنگی روخسارو گلێنەی چاویشیان لێ دزین، کەگەڕانەوە هەرچی هەتیوەی دنیا بوو لەئێمەتان کرد بەقارەمان و تێکۆشەرو کۆڵنەدەر، کەگەڕانەوە کۆمەڵگەکەتان شێواندین و خێزانەکانتان تێکداین و براو کەس و کارەکانتان لەبەر چاو رەش کردین.
کەهاتنەوە بەپۆل کوڕو کاڵی ئەم ولاتەتان فریودا تابەرەو هەندەران رەوبکەن.
کەهاتنەوە هیوا بڕاوتان کردین و حەزەکانتان تاڵ کردین و ژیانتان ناخۆش کردین.
کەگەڕانەوە سڕوسوالکەرەکانتان لێکردین بەملیۆنەرو بەخاوەن تەلارو باخ و باخات.
لەو رۆژەوە گەڕانەوە رۆژ نییە لەزمانی ئیستگە دەم شڕو لەچاوی رۆژنامە رووزەردەکانەوە بەردەوام برینی شەهیدەکان نەکولێننەوە، لەورۆژەوە چەقۆی درۆ لەملی ئێمە دەسوون، لەورۆژەوە بێ دەرەتانی دەکەن بەماڵی ئێمەو بۆ خۆشتان ئاسوودە دەژین، لەورۆژەوە ئاگری ترسەکانی خۆتان بەسەر ئێمەدا دەکوژێننەوەو بۆ خۆشتان بادەی ئازادی هەڵدەدەن، لەورۆژەوە ئێوە لێرەن گەردەلوولی دوو دڵیتان لەدەشتی بڕوای ئێمەدا هەڵدەکەن بۆئەوەی بەسەری رەحەت خەونی خۆش ببینن.
لەورۆژەوە لێرە ماونەوە ئەوە پێمان ناخۆش بوو کردتان و ئەوە دڵمان پێی خۆش بوو بردتان، شوێن نەماوە نارنجۆکی رقی ئێوەی تیا نەتەقی بێت، کات نەماوە رمی کینەی ئێوەی پیا نەچەقیبێت، لەورۆژەوە ئێوە لێرەن هەرچی جوانی سرووشت هەبوو بەدەستی ناشرینی لیخن کرا، ئەستێرەش بەبەرزیوە داگیرا، درەختی شادی هەڵکۆڵرا، تەنانەت رووباری خۆزگەش وێران کرا، تەنانەت شیعریش کوژراو مانای نووسین خنکێنراو مێژووی ئاوەژووکرایەوە، تەنانەت بۆ بلاوکردنەوەی

([illegible]واری)و تێکدانی ڕەوشتی (پەروەردە)ش هاتن بەدەستی ئەنقەست (نووزەهاتی عەبەسوور) تان لەجێی (ئەلف و بێ) یەکەی (باڵدار) قووتکردەوە، لەدواجار ئەپرسم لەوڵاتێکی وەها شێواودا کەدز پاسەوانی دەکات و خۆفرۆش پیاسەی تیا دەکات و درۆزن شیوەنی لەسەر دەگێڕێت، (سەری کام ناپیاو لەجێ پێی کام ناپیاوی تر دادەنرێ؟)!.

رۆژنامەی کوردستانی نوێ ...ژمارە ( ٥٠٢٧ ) دوو شەممە ( ٢٠٠٩/١١/١٦ )

## بۆچی پلینیۆم دۆسێی سەرکردایەتییە جیابووەکانی بە یەکجاری داخست؟

**ئازاد جندیانی: بەشی یەکەم**

پلینیۆم * بەتێکڕای دەنگ دۆسێی ئەندامێتی ئەو مەکتەب سیاسی و سەرکردایەتیانەی یەکێتی داخست، کە بە ویستی خۆیان لە یەکێتی چوونە دەرەوە و چوونە پاڵ لیستێکی رکابەری یەکێتی، کە سەرۆکی ئەو لیستەش رایگەیاندووە ئەوان ئێستا خۆیان بەبزوتنەوەیەکی جیاواز ئەزانن و یەکێتیان بۆ خاوەنەکانیان جێهێشتووە.

مانەوەیان تەکتیك بوو نەك ستراتیژ

یەکلایکردنەوەی چارەنوسی ئەو چەند ئەندامەی رێبەرایەتی یەکێتی، بەجۆرێك لە جۆرەکان، یەکلایکردنەوەی کاری ئایندەی یەکێتی بوو، بۆیە چیتر دواخستنی هەڵنەئەگرت، بە تایبەت کە لەچەند ساڵی رابردوودا، دەیان دەرفەت بۆ ئەوە رەخسا و دەیان هەوڵی جۆراوجۆر لەلایەن یەکێتییەوە دران تا ئەو کێشەیە بە مانەوەی ئەوانیش، لە ناو خودی یەکێتیدا، چارەسەر بکرێت، بەڵام ئەوان نە دەرفەتیان بە هێند وەرگرت و نەهەوڵەکانیشیان بۆ ئەو مەبەستە ئیستیغلال کرد، ئەمەش تەنیا ئەوەی لێدەخوێندرایەوە کە ئەو سەرکردایەتیانە، چ ئەوانەی زوو لە پۆستەکانیان کشانەوە و چ ئەوانەش تا چەند رۆژێکیش دوای پرۆسەی هەڵبژاردنەکان لە ناو یەکێتیدا مابونەوە، مانەوەی خۆیان لە ناو یەکێتی و بگرە مانەوە و پاراستنی یەکێتییان وەك مەسەلەیەکی تاکتیکی تەماشا ئەکرد و مامەڵەیان لەگەڵ ئەکرد، بۆ مەسەلەیەکی تری ستراتیژی، جیاواز، کە ئەویش دامەزراندنی حزبێك، یان بزوتنەوەیەکی جیابوو.

گەرچی لەو کاتەوە کە رەوتی گۆڕان ، وەك رێکخراوێکی دایکی بزوتنەوەی (گۆڕان ) لە مانگی (دە) ی ٢٠٠٨ دا راگەیەندرا و دواتریش لیستی جیاواز و

لیستی سەربەخۆ تەنزیراتی بۆ کرا و بوو بە واقع، لە ناو ریزەکانی یەکێتیدا گفتوگۆ و [illegible]ی لەنێو دوو رەوت دەستی پێکرد.

رەوتێکیان هەموو تێز و بۆچوون و هەوڵەکانی بۆ ئەوەبوو کە یەکێتی سەرەڕای جیاوازی بیروبۆچونیش بە یەکگرتوویی بمێنێتەوە، کە هەڤاڵان سکرتێری گشتیی و جێگرانی سکرتێری گشتیی و زۆرینەی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی و کادرە سەرەکییەکانی یەکێتی و ئاستەکانی خوارەوە تری یەکێتی ، خاوەنداریەتی ئەو رەوتەیان دەکرد.

ئاراستەی دوو رەوتەکە

رەوتی دووەمیش، ئەو رەوتە بوو کە نەوشیروان مستەفا سەرکردایەتی ئەکرد و لە ماوەیەکی زۆر پێشوو تر لە رووداوە زانراوەکانی ئەو مەسەلەیە نەخشە ڕێگای بۆ ئەوە کێشابوو کە یان یەکێتی کۆنترۆڵ بکات یان تێکی بدات.

بەواتایەکی تر دوو رەوت لە ململانێدا بوون، رەوتی پاراستن و مانەوەی یەکێتی و رەوتی تێکدانی یەکێتی یان لە باشترین حاڵدا دەستبەسەراگرتنی.

رەوتی پاراستنی یەکێتی، سەرەڕای ئەوەی کە مێژوویەکی لەبەردەستدا بوو لە ناسینی رەوتی دووەم و هەوڵەکانی رێبەری ئەو رەوتە بۆ تێکدانی یەکێتی، بەڵام هەمدیسان، راست یان هەڵە، بەپشوودرێژیەکی زۆرەوە رووبەڕووی رەوتی تێکدانی یەکێتی ئەبووەوە و هەوڵی ئەوەی ئەدا کە خاڵە هاوبەشەکان لەسەر حسابی خاڵە ناکۆکەکانی نێوان هەردوولا پتر بکا و دەرفەت بۆ مانەوەی کارەکتەرە سەرەکییەکانی رەوتی دووەم لە ناو یەکێتیدا بە کراوەیی بهێڵێتەوە.

لەو رۆژەوە نەوشیروان مستەفا، دەستی لەپۆستی خۆی لەناو یەکێتیدا کێشایەوە بە کردەوە بناغەیەکی بۆ بزوتنەوەی گۆڕان دانا، کە وردە وردە ئاستی پلانەکەی بۆ تێکدانی یەکێتی بەرەو سەروتر هەڵئەکێشا، تا کار گەیشتە بڵاوکردنەوەی بەیاننامەی نهێنی و هەروا دامەزراندنی رەوتی گۆڕینی دیموکراتی لە مانگی (١٠) ی ٢٠٠٨

دا، ئەو رووداوە ململانێکەی گەیاندە خاڵێکی ترسناك، کە یەکێتی لە دووڕیانێکدا بوو، یان ئەوەتا ئەبوایە مل بدات کە یەکێتی بەوشێوە تاکتیکانە هەلا هەلا ببێ، یان ئەبوایە بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوە لەبەرامبەر ئەو کارەکتەرانەدا بوەستێتەوە کە رەوتی دووەم بۆ مەبەستێکی تاکتیکی هێنابونیە واجیهە.

بە واتایەکی تر سکرتێری گشتیی و لەگەڵیشیدا زۆرینەی مەکتەبی سیاسیی و سەرکردایەتی و کادرەکان و قاعیدەی یەکێتی ئەبوایە بەو رەوتە بڵێن ستۆپ، چیتر ئەو یارییە مەترسیدارانەتان لێ قبوڵ ناکەین، چیتر ڕێگاتان پێنادەین بە ناوی یەکێتی خۆیەوە، یەکێتی تەفروتونا بکەن، بۆیە مەکتەبی سیاسی رۆژی ١٠/ ١٠/ ٢٠٠٨ لە کۆبونەوەیەکی خۆی و لە رێی دەنگدانەوە، بڕیاری دەرکردنی ئەو چوار کادرەی دەرکرد کە لەو پلانەدا کرابوونە واجیهە.

ئەم هەنگاوەی مەکتەبی سیاسی یەکێتی، پەیامێکی روون بوو بۆ نەوشیروان مستەفا و هاوڕێکان کە ئیتر سەردەمی یاریکردن بەیەکێتی کۆتای پێ هاتووە، سەرەڕای ئەوەی کە روون بوو ئەو پیلانە کێی لەپشتە و ئامانجەکانی چین، بەڵام هێشتا سەرکردایەتی یەکێتی، بە تایبەتی هەڤاڵ سکرتێری گشتیی، دەرگاکانیان بەکراوەیی هێشتنەوە، هەر ئەمەش وایکرد لە ناو ریزەکانی یەکێتیدا گلەیی لە هەڤاڵ سکرتێری گشتیی بکرێ و باس لەوە بکرێ کە داخۆ بۆچی لە چارەکردنی ئەو دۆسێ ترسناکەدا یەکلاکەرەوە نییە، بێگومان هەموو یەکێتی لەوە ئەگەشت کە بۆ سەرکردایەتی وەك هەڤاڵ مام جەلال ئاسان نەبوو، تا دوا دەرفەتێکی بچوکیش مابێ دەستبەرداری ئەو هاوڕێ دێرینانەی خۆی بێت.

بە تایبەتی کە پتر لە ماوەی سی ساڵی کارکردن لەگەڵ نەوشیروان مستەفادا، دەیان جار زویر بوون و خۆڵەکار و ئەرك کێشانەوەی ئەوی دی بوو، لەو هەل و مەرجەدا بوو کاتێك سکرتێری گشتی پرۆژەی لێك جیاکردنەوەی حزب و حکومەتی راگەیاند، بەڵان وەك خۆشی لە پلنیۆم ئاشکرای کرد، پێش ئەوەی پرۆژەکە رابگەیەنێ بۆ نەوشیروان مستەفای ناردبوو و رای پرسیبوو، ئەویش هەندێك تێبینی

حزب خستبووه سەر، ناردنی ئەو پرۆژەیە خۆی لەخۆیدا دەستپێشخەرییەکی تر بوو بۆ ئەوەی هەردوولا لەو جومگەیەوە بکەونە دیالۆگ و دواجار جارێکی تریش لێك نزیك بوونەوە، چونکە نەوشیروان مستەفا خۆی وا ناساندبوو کە خوازیاری چاکسازی و ریفۆرمە وای نیشان ئەدا کە گوایا ئەو لەپێناو ریفۆرمدا ململانێکەی لەگەڵ سکوتێری گشتیی و برادەرانی تری سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی دەست پێکردووە، ناردنی پرۆژەکە بۆ ئەو، ئەو پەیامە بوو کە بەداخەوە ئێمەمانانی راگەیاندنیش لە وەختی خۆیدا پەیمان بەو پەیامە گرنگە نەبرد کە لەپشت ناردنی پرۆژەکەوە بوو بۆ نەوشیروان مستەفا، پەیامەکەش وەك وتمان ، ئەوە بوو کە نەشیروان مستەفا بلّێ: تۆ بەردەوام ئەوە ئەڵێیتەوە کە یەکێتی پێویستی بە چاکسازییە، دواتریش وتت، سیستەمی سیاسی کوردستان پێویستی بە چاکسازییە، کە بەبۆچوونی پسپۆڕ و شارەزایان لێکجیاکردنەوەی دەستەڵاتەکان و لێکجیاکردنەوەی دەستەڵاتی حزب و حکومەت هەنگاوی یەکەمی ئەو چاکسازیەیە کە ئەبێت لە سیستەمی سیاسیدا روویدا، مام جەلال بە ناردنی پرۆژەکەی ئەو ئەو پەیامەی دایە کە: ئەگەر هەموو مەبەستێکی تۆ، چاکسازییە، وەرە ئەوە پرۆژەکە و با پێکەوە کاری لەسەر بکەین، کە رەنگە چۆن لە ساڵی ٢٠٠٦ دا پرۆژەی چاکسازی ناو یەکێتی بەو سپارد، پرۆژەی چاکسازی سیستەمی سیاسی کوردستانیش بەو سپاردبا.

بە تایبەت کە تەوەرەکانی پرۆژەکەی مام جەلال لەگەڵ ئەو تەوەرانەی نوسینەکانی ئەودا یەکیان ئەگرتەوە، کە لەو کاتەدا لە رۆژنامەی رۆژنامە و سایتی سبەیدا بڵاوی ئەکردنەوە و دواتر لە نامیلکەی (ئێمە و ئەوان) دا لە ژێر ناونیشانی حیزب و حوکم: ئەزموونی کوردستان لە ٤٤-٥٤ بڵاوی کردنەوە ئایا ئاماژەی لەوە روونتر هەیە بۆ ئەوەی رایبکێشیتەوە ناو پرۆسەیەکی یەکێتیانە؟

ئێمە و ئەوان سەرەتا بۆ لیست جیایی

کاك نەوشیروان دوای ئەو وتارانەی ئاماژەمان پێیان دا، ئیتر بۆچونەکانی لە

باسکردنی بیروڕا و تێزی جیاواز، کە ئەبێ و ئەشێ لە ناو یەك حزبیشدا بۆچوونی جیاواز هەبێ، گواستنەوە بۆ لێکدانەوە و نوسین دەربارەی لێك جیاکردنەوەی فیزیکی حزب و لەوبارەیەوە زنجیرە نوسینێکی خۆی لە ژێر ناونیشانی (ئێمە و ئەوان) دا دەستپێکرد، بەکارهێنانی دەستەواژەی ئێمەو ئەوان چیتر نەبوو بێجگە لەوەی کە پەیامی ئەوە بدا، ئیتر ئەوان لە یەکێتی جیاوازن، لانی کەم ئەوان شتێکن و ئێمەش شتێکی تر، واتە بابەتەکەی لە هەبوونی بیروبۆچون و تێز و خوێندنەوەی جیاوازەوە گەیاندە سەر چوارچێوەی سیاسی جیاواز، ئەو نوسینانەی بەو ناونیشانەوە زەنگێکی ترسناك بوو سەبارەت بە ئایندەی یەکگرتوویی یەکێتی لەناو مەنجەنیقی ململانێکەدا.

لە لایەکی دیکەوە، باڵی نەوشیروان لەناو یەکێتیدا، ماوەیەکی زۆر پێش هەڵبژاردنەکانی کوردستان، قسەوباسیان سەبارەت بە لیستی جیاواز لەناو ڕاگەیاندنەکانەوە گەرم کردبوو، لەبەرامبەردا بۆچونی یەکێتی روون و ئاشکرابوو کە بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمان و نوێنەرایەتییەکانی نابێت حزبێك بە دوو لیستی جیاواز بەشداری بکا، چونکە ئەمە پێچەوانەی پرەنسیپی حزبایەتییە و بە مەبەست بێ نا، یەکێتی لە هەڵبژاردنەکاندا شکست پێ دێنێ، بۆ ئەو مەبەستە هەڵمەتێکی بەرفراوانی ڕاگەیاندنیان ئەنجامدا و چونکە هێشتا هەمووشمان بەکردەوە لە یەك جەستەدا بووین، بۆیە ڕەتکردنەوەی ئەو تێزە ناحزبییە لە ناو ریزەکانی یەکێتیدا ئاسان نەبوو، بەتایبەت کە ئەوان لە ڕوانگەی هەبوون یان نەبوونی بیروڕای ئازادەوە ئەو تێزەی خۆیان خستبووە ناو ریزەکانی یەکێتییەوە.

نایشارمەوە کە تێگەشتن لە مەترسییەکانی ئەو تێزە و ناسیی وەك پلانێکی تر بۆ تێکدان، لای هەمووومان، هەتا لە ئاستی سەرکردایەتیشدا وەك خۆی وەرنەگیرا و تەماشا نەئەکرا.

ڕەتکردنەوەی تێزەکە وای لێهاتبوو سەردەمانێك لەسەر قبوڵکردن یان ڕەتکردنەوەی تێزەکە هەندێك کەس لە ناوخۆشدا، یەکێتییان بەسەر دوو بەرەی کۆترەکان و هەڵۆکاندا دابەش ئەکرد، کە ئەمە گوتارێکی ئامانجدار بوو بۆ

لێکترازاندنێکی تر و بۆ ناشیرینکردنی ئەوانەی پێیان وابوو کە هەبوونی دوو لیست [illegible] سیاسەتێکە بۆ تێك و پێکدانی یەکێتی و هیچی تر ، بۆ ئەوانەی کە بەراشکاوی بۆنی پیلانەکەیان بە ریزەکانی یەکێتی ئەناساند.

نایشارمەوە ئەو هەڵمەتەی ئەوان، لە نەبوونی پرۆسەیەکی هۆشیاری دارێژراودا، گومان و دوودڵی و دڵەڕاوکێی لە ناو ئاستەجیاجیاکانی یەکێتیدا دروستکرد، بەڵام هاوکات بەرەیەکیشی دروستکرد کە لەدژی لیستی جیاواز بوەستنەوە و بەلیستی تێکدانی یەکێتی و لیستی شکاندنی یەکێتی بیناسێنن.

ئەوسا، واتەی دوای ئەوەی یەکێتیخوازان تێزی لیستی جیای ئەوانیان خستە بەر مەنگەنەی گومان و ڕەتکردنەوە، ئەوان لە گۆڕانێکی دراماتیکیدا، قەڵەمبازێکیان بەسەر ئەو تێزەداو تێزێکی دیکەی ئەڵتەرناتیڤیان هێنایەپێش، کە بەلیستی سەربەخۆ ناوزەندیان کرد.

ساغبوونەوەی کۆتاییان لەسەر لیستی سەربەخۆدا، گەرچی بەرەسمی لەلایەن یەکێتییەوە ڕەتکرایەوە، بەڵام هەموو کارەکتەرەکانی ئەو ڕەوتە یەکێتییان بەجێ نەهێسشت، مانەوەی بەشێکیان لەناو یەکێتیدا وەك دواتر بینیمان بۆ دوو مەبەست بوو، یەکەمییان: تا بۆیان بکرێت کارکتەری کارا لە ناو یەکێتی بۆ ناو ڕەوتەکەیان رابکێشن و یەکێتی دووچاری راتەکانێکی گەورە بکەنەوە و دووەمیشیان: لەوەختێکدا، کەخۆیان دیاری بکەن لە یەکێتی بچنەدەر و دووچاری موفاجەئەمان بکەن.

لەو ململانێیەدا، کە چەند ساڵێکی خایاند، بەردەوام ڕەوتی جیابووەکان بوو کە وەختەکانیان هەڵئەبژارد، بەڕای من ساغ نەبوونەوەی زوو بە زووی یەکێتی لەسەر دۆسێی ئەو گرووپە، هەلومەرجێکی خوڵقاندبوو کەبەشێوەیەکی بەردەوام فاکتەری کات لەدەست ئەواندا بێ، ئەمەش ئەو هەڵەیە بوو کە دواتر لەوەختی هەڵبژاردنەکاندا ئەنجامەکەیمان چنیەوە، چونکە زۆر لە ڤاڵان و دەنگدەران بێ ئەوەی بەرچاویان بە تەواوەتی ڕوون بێت چوونە ناو هەڵبژاردنەکان و دەنگۆیان بە لیستی

گۆڕاندا و پێشیان وابو، کە ئەوان شتێکی جیاواز نین لەیەکێتی، لانی کەم ئەوانەی کە لەبواری سیاسەت و یارییەکانیدا شارەزانەبوون و ئاگادارنەبوون.

بزوتنەوەی گۆڕان لە ماوەی پێش هەڵبژاردن و لە وەختی بانگەشەی هەڵبژاردنیشدا، گوتاری خۆیان بە ئاراستەی یەکێتی و بەئاراستەی دەرەوەی یەکێتی تاودا، بۆ ناو یەکێتی، بێجگە لە گوتارە گشتییەکەیان، قورسایی خۆیان خستبووە سەر ڕێککەوتنی ستراتیژی نێوان یەکێتی و پارتی، بەجۆرێك کە ئەو ڕێککەوتنەیان بە تەسلیم بوون بە پارتی وێنا ئەکرد، کە بێگومان لەیادەوەری خەڵکی کوردستاندا و بە تایبەتی یادەوەری ئەندامان و هەوادارانی دوو لایەنەکەی ڕێککەوتنەکەدا ئەوساش هێشتا ئاسەواری شەڕی ناوخۆ هەر مابوو، بۆیە خوێندن لەسەر ئەو تەلە بۆ ئەوان کارتێکی کارکردنی ئەوتۆ بوو ئەیتوانی کاریگەری بەجێبهێڵێ، بە تایبەت کە ئەوان گوتارەکەیان لەسەر بنەغەی دروستکردنی مەترسی زاڵبوونی پارتی دیموکراتی کوردستان داڕشتبوو و وایان نیشان ئەدا کە ئەو لایەنەی لە ڕێککەوتنەکەدا قازانج ئەکا، تەنها پارتییە، بێگومان ئەوان ڕووی ئەو گوتارەیان کردبووە ناوخۆی یەکێتی، لە سلێمانی بە پلەی یەکەم و لە هەولێر بە پلەی دووەم.

دروستکردنی مەترسییەك لای یەکێتییەکان، بەتایبەت لە سلێمانی سەبارەت بەوەی یەکێتی تا ئەو ئاستە بچوك ئەبێتەوە گوایا سلێمانی سیما سیاسییەکەی بەتەواوەتی ئەگۆڕێ، کەم نەبوو، بەتایبەت کە یەکێتی نەیتوانی پێچەوانەی ئەو مەسەلەیە بەسەر رایگشتی کوردا زاڵ بکا، هۆکاری ئەو نەتوانینەش زۆربوون، بەڵام لەهەموویان کاریگەرتر ئەو گومانە بوو کە هەر لەسەرەتاوە لەبارەی ئەو ڕێککەوتنە دروست بوو گوایە ڕێککەوتنەکە بەندی نهێنی و ئاشکرانەکراوی تیایە، وەرنەگرتنەوەی پۆستی سەرۆکی حکومەتیش لە نیوەی دووەمی کابینەی پێنجەمی حکومەتی هەرێم، هەم ئەو گومانەی گەورەکرد هەم مەترسییەکە، کە لە ڕاستیدا پاودانی وەرنەگرتنەوەی حکومەتی هەرێمیش لەو وەختەدا کارێکی ئاسان نەبوو.

ئاماژەمان بۆ سلێمانی، بۆ ئەوەیە کە فاکتەرێکی تری بردنەوەی شەڕە سیاسییەکان

ڕوون بکەینەوە ئەویش هەڵبژاردنی شوێنە، کە لەپاڵ هەڵبژاردنی ساتەوەختدا وەك لەسەرەوە ئاماژەم پێیدا، چانسی پێشکەوتنی ئەوان لە سلێمانی زۆرتر کرد.

ئاڕاستەی دووەمی گوتاری ڕەوتی گۆڕان، ڕوو لە ڕایگشتی بوو، بەجۆرێك ئەو ڕەوتە کە ماوەیەکی زۆر پێشتر لەسەر وروژاندنی شەقام و ڕایگشتی کاری کردبوو و شوێنەکانی ناڕەزایی و چین و توێژەکانی بە وردی هەڵبژاردبوو.

لە هەڵەبجە و کەلار و دواتریش لە سلێمانی و هەروا پشت بەستنی بەچین و توێژی ئەوتۆ کە ئاسانتر ئەجولێنرێن، بەشێك بوو لە تاکتیکی پشێوی نانەوە و ڕاهێنانی ئەو توێژانە لەسەر ناڕەزایەتی دەربڕین و پێ بەخشینی ئەزموون پێیان .

هەموو ئەو خۆپیشاندان و سوتاندن و ویرانکردنانەی لەو ناڕەزایەتیانەدا بینیمان، ئەگەرچی بۆ زۆریان زەمینەی ماددی ئەوتۆ لەئارادا بوو کە بەئاسانی قەناعەتی ناڕەزایەتی دەربڕین دروست بکا، بە تایبەت سستی و نارێکی پرۆژە خزمەتگوزارییەکان و کەمی کارەبا و ئاو و خراپی خزمەتگوزارییەکانی تر و دیاردەی گەندەڵیی و بەرتیلخواردن و ڕۆتین.

ڕەوتی گۆڕان لەو زنجیرە کردەوە ناڕەزایەتیانەی کە هەمووی بەشێوەیەکی بەرنامەڕێژکراو ئەوانی لەپشت بوون، لە داخستنی زانکۆی ئایندەی سلێمانیدا یەکەم سەرکەوتنی مەعنەوی بۆ خۆی تۆمارکرد.

لەو ناڕەزایەتیانەدا ژمارەیەکی بەرچاو لە ئەندامان و هەوادارانی یەکێتیش بەشداربوون، بەمەش نەوشیروان و هاوەڵانی توانیان پەرتکردنی ڕیزەکانی یەکێتی بەکردەوە تاقیی بکەنەوە و تیایدا سەرکەوتنی ڕێژەی وەدەست بهێنن.

قۆناغی پەرتکردنی یەکێتی

سیاسەتی پەرتکردنی یەکێتی، بۆ گرووپی نەوشیروان کارێکی سەخت نەبوو ، چونکە لەناو هەموو ئۆرگانەکانی یەکێتی کەسانی کاربەدەستی سەر بەو گرووپە هەبوون، نەك هەر هێندە، بەڵکو لە هەندێك ناوەندی دەستەڵاتیشدا بگیر و ببر هەر کەسانی ئەو گرووپە بوون، لەوانەش وەزارەتی ناوخۆ و فەرماندەیی هێزی پێشمەرگە،

[illegible]مەنی شارەوانی سلێمانی و پارێزگای سلێمانی و دەیان ئۆرگانی حزبی و [illegible]انکەی حکومی تر .



ئەو پەرتکردنە، کە دەمێك بوو کاری بۆ کرابوو، بە مانای رای جیاواز نەبوو ، بەڵکو بەمانای هەڵوێست و کردەوەی جیاواز بوو، بۆیە ئەو سیاسەتە مەودای تری بەخۆوە بینی کە زەمینەسازی لێکترازانی رێکخراوەیی دواتری فەراهەمکرد.

نەوشیروان، چەند مانگێك پێش هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی کوردستان تیۆریزەکردن و تیزپەردازییەکی بۆ لێکترازاندنی ریزەکانی یەکێتی دەست پێکرد و بەمەش ستراتیژیەتی ناسراوی خۆی لەبارەی چاکسازی لەناو حزب گۆڕی بە ستراتیژیەتی چاکسازی لەدەرەوەی حزب (نامیلکەی ئێمە و ئەوان) .

ئەو ستراتیژی نوێی خۆی لەسەر بناغەی سەرنەکەوتن لە چاکسازی حزب دارِشت و لەوبارەوە دانی بەفەشەلی خۆیدا هێنا لەپرۆسەی چاکسازی حزب، بەڵام ئەو دانپێدانانەی نیشانەی واقعبینی نەبوو، بەقەدەر ئەوەی هەوڵێك بوو بۆ ئەوەی بەشێواز و دەربرِینێکی نەرمتر دوو ئامانج بپێکێ، یەکەمیان: هاوسۆزی زۆرتری قاعیدەی حزب بە تیزە تازەکەیدا رابکێشێ، بێ ئەوەی بەوە تۆمەتبار بکرێ کە ئەو ئەیەوێ یەکێتی لێك هەڵبوەشێنەوە.

دووەمیان: پەیامێکی روونتر بداتە دەرەوەی یەکێتی لەیەکێتی و دەستەڵات نارِازی بوون، کە رووی کاری ئەو ، رووی گوتاری ئەو لە ناوخۆی یەکێتی نییە بە تەنیا، بەڵکو رووی لەدەرەوەی یەکێتیشە، بە واتایەکی تر ئەو پەیامە بۆ دەرەوەی یەکێتی بەو مانایەش بوو کە ئەو کارەکتەرەکانی چالاکی سیاسی لە کوردستان ئەگۆرِێ.

ئەمەش بەخششێکی کەم نەبوو بۆ ئەوانەی بەپشت بەستن بە خۆیان لە ماوەیەکی نزیکدا بتوانن کارەکتەرەکانی چالاکی سیاسی لە کوردستان، کە سەر بەحزبە بەهێزەکان بوون، پەراوێز بخەن و بەچالاکوانی سیاسی تازە جێگەیان بگرنەوە.

لەبارەی ناوخۆی یەکێتییەوە، سەرکردایەتی هەڵوێستی تری گرتەبەر، کە ئەتوانین ناوی بنێن هەڵوێستی رازیکردنی ئەو گروپە لەناو یەکێتی، رەوتی ئەو رازیکردنە تا

[illegible] ڕۆیشت کە بەتەواوی دەستەڵاتەکانی پەیڕەوی ناوخۆش بەزێندران، گەورەترین نموونەی ئەو پەیڕەو بەزاندنە کە لەلایەن مەکتەبی سیاسییەوە ئەنجامدرا، دانانی کارەکتەرێکی کارای ئەو گروپە (شەماڵ عەبدولوەفا) لە دەرەوەی پرەنسیپەکان پەیڕەو کرا و کرا بەئەندامی کۆمیتەی سەرکردایەتی و دەیان بڕیاری تری لەو شێوەیەش بۆ کادیرانی ئاستی خوارتری سەر بەو گروپە دەرکران، سەرکردایەتی یەکێتی و ئۆرگانەکانی خواروتری یەکێتی لەبەرامبەر ئەو جۆرە بڕیارانە بێدەنگ بوون، تەنیا بۆ ئەوەی ئەو گروپە قەناعەت پێ بێنن کە سیاسەتی سەرکردایەتی پەراوێزخستن و وەدەرنانی ئەوان نییە، ئەو سیاسەتی ڕازیکردنەش هەر دادی نەدا و ئەوانی لەسیاسەتی هەلاهەلاکردنی یەکێتی پەشیمان نەکردەوە.

سیاسەتی ڕازیکردنی نەوشیروان پێش ئەو وەختەش هەر دادی نەدا، بۆ نموونە مەکتەبی سیاسی یەکێتی کە پرۆژەی نەوشیروان مستەفای بۆ هەڵبژاردنەکان پەسەند کرد، وەك کاتی خۆشی بەشێك لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی باسیان لێوەکرد، زۆر لەو ئەندامانە بەو پرۆژەیە ڕازی نەبوون، بەڵام دواجار هەڤاڵ سکرتێری گشتی وای کرد کە ڕووبەڕووی پرۆژەکە نەوەستنەوە و بۆ هێشتنەوەی نەوشیروان مستەفا لەناو یەکێتی مل بۆ ئەو پرۆژەیە بدەن کە هەر لەسەرەتاوە ئەیانوت پرۆژەیەکی سەقەتە و زۆریش لە کادر و ئەندامانی یەکێتی بەمەترسیدار وەسفیان ئەکرد، دوای جێبەجێکردنیشی سەقەتی و مەترسیدارییەکەی بەدەرکەوت و ڕوون بووەوە.

ئەوسا و ئێستاشی لەگەڵ بێ زۆرینەی کادرانی یەکێتی بەچاوی گومانەوە ئەیانڕوانییە پرۆژەکە، بە تایبەت دوای ئەوەی کەوتە بواری جێبەجێکردنەوە و دەرەنجامە خراپەکانی ئاشکرابوون، زۆرینەی کادرانی یەکێتی ئەو پرۆژەیە بە پیلان ئەزانن.

ڕوونکردنەوەکەی هەڤاڵ سکرتێری گشتی لە ڕاپۆرتەکەی لە بەردەم پلۆنیۆمدا ٢٠٠٩/١٠/٢٩ کە تیایدا ئاماژەی بەتێزێکی دێرینی نەوشیروان مستەفادا کە وتبووی با یەکێتی هەڵوەشێنینەوە و شتێکی تر دروست بکەین، ڕاستی ئەو بۆچوونەی کادرانی یەکێتی سەبارەت بەوەی پرۆژەی هەڵبژاردنەکان پیلان بووە بۆ

...کردن یان هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی، لەو تێزەی نەوشیروان مستەفاوەیە.
بەرچاو روونی زۆرتر لەوبارەیەوە سکرتێری گشتی لە راپۆرتەکەی خۆیدا بۆ بەردەم دوا پلنیۆمی یەکێتی وتی: لە ناو یەکێتیدا هەر لەسەرەتاوە دوو بۆچوونی دژبەیەك هەبووە، بۆچوونێك کە کاری کردوو یەکێتی بێ هێز بێت، بۆچونەکەی تریش کاری کردووە کە پارێزگاری لە مانەوە و بەهێزی یەکێتی بکا.
ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە نەوشیروان مستەفا بەردەوام بەدوای هەلێکی گونجاودا گەڕاوە تا یەکێتی لاواز و بچوك بکاتەوە و دواجار هەڵیبوەشێنێتەوە.
بەپێی ئەو راستیانەی کە لە راپۆرتەکەی هەڤاڵ سکرتێرەی گشتیدا ئاماژەیان پێدراوە و بەپێی رەفتار و سیاسەتەکانی نەوشیروان مستەفا هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی، ئەگەر لەپەنای تێز و پرۆژەی چاککردنی یەکیتیشدا شاردرابێتەوە، ئەوا لەبنەڕەتدا سیاسەتێکی رانەگەیەندرا و بووە و پەیوەندی بەوەوە نەبووە و نییە کە گوایا یەکێتی، وەك نەوشیروان مستەفا لە نامیلەکەی (ئێمە و ئەوان) و لە دەیان نوسین و لێدوانی خۆی و هاوەڵەکانیدا باسیان ئەکرد، گەندەڵی لەجەستەی داوە و چاك نابێ و زەمەن یەکێتی تێپەڕاندووە.

## بەشی دووەم

لە کۆنگرەی یەکەمەوە کار بۆ هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی دەکەن
ئەی نەوشیروان مستەفا بۆچی ئەیوەیست یەکێتی هەڵبوەشێنێتەوە؟ ئەو یەکێتیەی کە ئەویش یەکێك بوو لە دامەزرێنەراکانی و یەکێك بوو لە کەسە دیار و کارەکتەرە بەرچاو و کاریگەرەکانی و بەردەوام کەسی دووەم و هەنێ جاریش ئەوەڵی موکەڕەڕ بووە تیایدا؟ پرسیارێکی تریش ئەوەیە بۆچی لە دوای راپەڕینەوە، بە تایبەت دوای کۆنگرەی یەکەم ئەو رایەی هەبوو؟ بۆچی سالانی پێش راپەڕین ئەو رایەی نەبووە؟
سالانی خەباتی شاخ، بە حوکمی ئەوەی کۆمەڵە باڵی سەرەکی یەکێتی بوو، بە

[illegible] دوای کارەساتی هەکاری و دوای جیابوونەوەی بزوتنەوەی سۆسیالستی کوردستان، لەرێی کۆمەڵە و بەهۆی کۆمەڵەوە کە سەرکردە بنچینەییەکانی زوو شەهید بوون (خاڵە شیهاب و هەڤاڵانی)، نەوشیروان مستەفا ببوە کەسی یەکەمی کۆمەڵە (سکرتێر) و هەمووشمان ئەزانین کە ئەو سەردەمە دەستەڵاتی سکرتێری کۆمەڵە هیچی لە دەستەڵاتی سکرتێری گشتی یەکێتی کەمتر نەبوو، بۆیە ئەو وەختە نەوشیروان مستەفا کێشەیەکی بە ناوی دەستەڵاتەوە نەبوو، بەڵام دوای راپەڕین و دوای ئەوەی لە یەکەمین کۆنگرەی گشتیدا کۆمەڵە هەڵوەشایەوە، ئیتر سکرتێری پێشووی کۆمەڵە بۆ هێشتنەوەی دەستەڵاتەکانی پێش راپەڕینی خۆی بەدوای فۆرمێکی دیکەدا گەڕا، ئەویش ئەوە بوو کە لە کۆنگرەدا زۆرینەی کورسییەکانی سەرکردایەتی بگرێتەدەست، ئاڕاستەی ناو کۆنگرە بەویست و دڵی ئەو نەڕۆشت، هۆیەکەشی جۆراوجۆر بوون، بەڵام بە رای من چوار هۆی سەرەکی هەبوون (ریزبەندی ئەو هۆکارانە لەم وتارەدا مەبەستدار نییە) .
یەکەمیان: زۆر لە کادرانی کۆمەڵە کە لە ناوە کۆنگرەدا بوون، وەك رێکخراوێکی مارکس لینینی لەوە ناڕەحەت بوون کە نەوشیروان مشتەفا کۆمەڵەی هەڵوەشاندوەتەوە و دووەمیشیان: زۆر لە ئەندامانی کۆمەڵە ئاکار و شێوازی مامەڵەی توندی ئەویان ئەزانی و لەوە تێگەشتبوون کە بۆ قۆناغی شار کەسێکی کراوەتر و نەرمتر و وردبینتر و کاریزماتر پێویستە، کە ئەو سیفەتەیان لە مام جەلالدا ئەبینییەوە نەك لە نەوشیروان، بۆیە ئەوانەی لە هەڵبژاردنی کۆنگرەدا بە کاندیدی ئەو ناسرابوون، کە زۆرینەشیان هی جوگرافیایەکی بەرتەسك بوون، دەنگی پێویستیان نەهێنا، ئەمە یەکەم شکستی رێکخراوەیی نەوشیروان مستەفا بوو لە دوای راپەڕینەوە، کە بۆی قوت نەچوو، هەر بۆیە لە دوا رۆژی کۆنگرەدا، پێش ئەوەی قۆناغی دووەمی هەڵبژاردن دەست پیٚ بکا، گرووپی نەوشیروان ئاژاوەیەکی ترسناکیان لەناو کۆنگرەدا نایەوە، ئەگەر حیکمەت و نەرمی نواندنی مام جەلال و لەخۆبوردووی هەندیٚ کاندیدی هەڵبژاردنەکانی کۆنگرە نەبوایە، کە لەپێناو

ئانەوەی یەکێتی بەیەکگرتوویی لە ململانێی هەڵبژاردنەکان هاتنە دەرەوە (بەندەش یەکێك بوو لەوان) ئەوا لەو وەختەوە، کە سەردەمێکی زۆر هەستیاری نەتەوەیی و ڕێکخراوەیی بوو، یەکێتی دووچاری کەرت بوون دەبوو، سێیەمیشیان: ئەوەبوو کە لەناو کۆمەڵەدا کارەکتەری بەهێزی تری وەك هەڤاڵ کۆسرەت ڕەسوڵ هاتبوونە پێش و شانی لە شانی ئەو ئەدا و لە قۆناغی یەکەمی هەڵبژاردنیشدا دەنگی زۆرینەی هێنا، چوارەمیشیان ئەو هەموو شەڕ فرۆشتنانە بوو کە لە ناو کۆنگرەدا گرووپی نەوشیروان بە سکرتێری گشتییان فرۆشت و هەر لەوێوە ئەیانویست هەڤاڵ مام جەلال بچوك بکەنەوە، کە بۆیان نەچووە سەر.

کە باس لە کۆنگرەی یەکەم ئەکەین بێ جێ نییە، کە ئاماژەیەکی خێرا بەوە بدەین ئەو کۆنگرەیە لە کەشوهەوایەکی پڕ لەکێشمەکێشدا بەڕێوەچوو، ململانێکان گەیشتە ڕۆخی تێکچوونی ناوخۆیی و ڕەنگ بوو کۆنگرە بەهۆی ئەو کەشوهەوایەی نەوشیروان و گرووپەکەی لەوێ دروستیان کردبوو، لەنیوەی ڕێدا پەکی بکەوێ، بەڵام دواتر لەپشتی کەوالیسەوە و بەهەوڵێ چەند هەڤاڵێك بارودۆخەکە هێمن کرایەوە، شەو دانیشتنێکی نارەسمی و پرۆتۆکۆلی لەنێوان نەوشیروان مستەفا لە ماڵی کاك کەریم مەلا لە هەولێر ئەنجامدرا، کە هەر لایەك هەشت کەسی ناو کۆنگرەیان بۆ ئەو دەعوەتە بانگ کردبوو، کە وەك دەعوەتی ڕاگەیاندنی ئاشتبوونەوە و ڕێککەوتنەوەی هەردوولا ناوی دەرکرد، ئەنجامدرا، بەندە یەکێك بووم لەو هەشت کەسەی کە لەلایەن هەڤاڵ مام جەلالەوە بانگ کرابوون.

ئێستا جێی خۆیەتی جارێکی دیکەش بپرسین ئاخۆ: نەوشیروان مستەفا، ئامانجی چاککردنی یەکێتی بووە، وەك ماوەیەکی زۆر باسی ئەکرد؟ ئایا ئامانجی لە تێکدان و هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی هێنانە کایەی بەدیلێکی کاراتر بووە؟ ئایا مەبەستی لەجیابوونەوە و ڕکابەرێتی یەکێتی گۆڕین بووە؟ ئایا مەبەستی دژایەتی کردنی گەندەڵی بووە؟ ئایا مەبەستی باشکردنی یان گۆڕینی سیستەمی سیاسی کوردستان بووە؟ یان مەبەستی دەستەڵاتی خۆی بووە؟

گومانی تیادا نییە کە، هەم یەکێتی و هەم حکومەتی هەرێم و هەم سیستەمی سیاسی کوردستانیش پێویستیان بەپێداچوونەوە و نەهێشتنی کەموکوڕی و کەمکردنەوەی کەلێنەکان و نەهێشتنی دیاردەکانی گەندەڵییە و، کوردستانیش پێویستی بەپەرەپێدان و بوژانەوەی بە بەرنامەترە و هاوڵاتیانیش پێویستیان بەخزمەتگوزاری زۆرتر هەیە و بودجە و گرێبەستەکان و زۆر شتی تریش پێویستیان بەوە هەیە کە روونتر و کراوەتر مامەڵەیان لەگەڵ بکرێ ، بەڵام ئایا مەبەستی نەوشیروان و گروپەکەی لەو مەسەلانەدا کورت ئەکرێتەوە؟ واتە ئایا ئەوە ستراتیژی نەوشیروانە یان ستراتیژەکەی دەستەڵاتی خۆیەتی؟ بەجۆرێکی دیکە، ئایا چاککردنی ئەو مەسەلانە تەنیا لەرێی لاوازکردن و دواجار هەڵوەشاندنەوەی یەکێتییەوە وەدی دێن؟

نەوشیروان کە هەر لە کۆنگرەی یەکەمەوە، تا یاداشتەکەی و تا هەڵبژاردنی مەڵبەندەکان، شکست لەدوای شکستی چنییەوە و نەیتوانی زۆرینەی سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی و رایگشتی ناو یەکێتی بە قازانجی زاڵبوونی خۆی وەدەست بێنێ ، ئیتر ستراتیژی تێکدانی یەکێتی گرتەبەر.

ریفۆرم یان خود میحوەری نەوشیروان؟

ستراتیژی تێکدانی یەکێتی لای نەوشیروان لەگەڵ ستراتیژی خۆ زاڵکردن یەکی گرتەوە، ئەو زاڵبوونی خۆی لە تێکدانی یەکێتیدا ئەبینییەوە، بۆیە شکست پێهێنان و تێکدانی یەکێتی بۆ ئەو لە یەك وەختدا هەم تاکتیکە و هەم ستراتیژ.

لە بنچینەدا دیدی ئەو گروپەی نەوشیروان سەروکاری ئەکا لەسەر خۆزاڵکردن بنیادنراوە، بە واتایەکی تر ستراتیژی گۆڕان و ریفۆرم لای نەوشیروان ستراتیژی خودزاڵبوونە، هەر بۆیە ماوەیەکی دووررودرێژ هەموو ئەو هۆکار و نەخشە رێگایانەیان تاقی دەکردەوە تا لەرێی یەکێتییەوە خود زاڵبوون دابین بکا، خودزاڵبوون لە تێگەشتنی ئەودا، گۆڕینی خودە، بە خودتەوەرەیی ، واتە نەوشیروان گۆڕانی، وەك چەمك و دنیابینی نەك وەك رەوت، بەوەسیلەیەك ئەبینێ بۆ وەدی هێنانی خودزاڵبوون.

خود لە دیدی نەوشیروان دا خودی خۆیەتی، سرود بەودا هەڵدان و ڕێگەدان بە بەرزبوونەوەی ئەو سرودانە لە هۆکارەکالنی ڕاگەیاندنی وشە لە وەختی بانگەشەی هەڵبژاردندا، تەعبیرێکی ڕوونی ئەو خود تەوەرییەیە (خود میحوەری) کە فەلسەفەی گۆڕانی لای نەوشیروان پێ ئەناسرێتەوە.

وەك چۆن نەهاتنە ناو جەماوەری لیستەکەی و بردنی جەماوەرەکەی بۆ لای ئەو بۆسەر گردەکە شێوازێکی تر بوو بۆ وەدی هێنانی خود تەوەری لای نەوشیروان، ئەو جۆرە لە هەوڵدان بۆ دروستکردنی کەسایەتی تەوەرەیی، کارکردنە بۆ دروستکردنی مەرجەعیەتی تاقانە و پێ بەخشینی قودسیەت، کە ئەم شێوازە کەڵك وەرگرتنە لە کەسایەتی شێخ لەسەر شێوەی تەریقەتەکانی سۆفیگەری، بەڵام بۆ تەوەحد لەگەڵ خوا نا، بەڵکو بۆ تەوەحد لەگەڵ کەسێك کەناوی نەوشیروانە، بە تایبەت کە سەراپای باسکردنی نەوشیروان لە نوسین و ئەدەبیاتەکاندا، بە نوسین و لێدوانەکانی خۆشیەوە باسکردنی پاکی و نەزاهەتی خودی ئەوە.

نەوشیروان کاتێك خۆی باس لە پیسبوونی ژینگەی حزب و ڕەوتە سیاسییەکان ئەکا بەهی خۆشیانەوە، هەرگیز باس لەوە ناکا کە ئەشێ ئەویش برێك لەو ناتەواوی و پیسییەی ژینگەکانی بەرکەوتبێ، بەڵکو لەباشترین حاڵەتدا دان بەوەدا ئەنێ کە لەناو ئەوانیشدا کەسانی گەندەڵ هەن، بەڵام لەپشتی ئەو دێڕانەشدا کە لەوەڵامی ئەو ڕەخنانەدا هاتنە پێش کە ئەوان بەوە تۆمەتبار ئەکران کە ئەوان فریشتە نین و ئەوانی تریش شەیتان، لەو پاساودانەشیدا هەمیشە ئەو لە دەرەوەی ئەو هاوکێشەیەدا خۆی نیشانداوە و هەموو هەوڵێکی بۆ ئەوەبووە کە هەرکێیەك هەیە، بە هاوکارنی خۆشییەوە ئەکرێ شەیتان بن، لەرێگەی بە شەیتان کردنی نەیار و هاوەڵەکانی خۆیەوە چەپەرێك لەنێوان هەموو پیسییەکان و خۆیدا دروست ئەکا، ڕەنگە ڕۆژگارێك بیت هەموان وەك شەیتان نیشان بدا تا خۆی وەك فریشتە یان شێخە مەعسومەکە بنوێنێ و بەوجۆرە ئەو بە تەنیا ببێتە کەسە میحوەرییەکە.

هەربۆیەش سەرەڕای ئەوەی ڕۆژانە کەسانی سەر بەو ڕەوتە دەیان نوسین و لێدوان و

شیكردنەوە و تیۆرپەردازی ئەكەن، بەڵام هەر ئەو بە تەنیا تەفسیرەكانی پێیە، هەر ئەو بە تەنیا هەفتەی رۆژێك دێتە سەر شاشە و تیۆرپەردازی ئەكا، واتا تەفسیری گۆڕان، وەك چەمك و پرۆسەیەكی فیكری —سیاسی لای ئەوە و لای كەسی تر نییە، بێگومان تاكە كەس لەهەر بزوتنەوەیەكی سیاسی ، كۆمەلایەتی یان فیكری رۆلی بەرچاوی خۆی هەیە، بەلام كاتێك رۆلی تاكە كەسی ئەبێتە رۆلی خود میحوەری، ئەوەی لێی وەبەرهەم دێ كەسێكی خود میحوەری دیكتاتۆرە، مەرجیش نییە جەماوەری دیكتاتۆرەكان زادەی ترس و تۆقین و دەزگای سەركوتكەری پۆلیسی بێ، بەلكو ئەشێ ئەوە جەماوەرە زادەی قودسیەت بەخشین بێت بە كەسێكی شەیدای خود محوەری، بە تایبەتی لە چركە ساتێكی تێپەڕی مێژوودا.

دیكتاتۆریەت بە یەكێك لە ماناكان كۆنترۆلكردنی خەلكە، كۆنترۆلكردنی ئیرادەی خەلكە، كە ئەشێ ئەو كۆنترۆلكردنە بەكەلك وەرگرتن لە قەیرانێكەوە هاتبێت، یان نەبوونی ئومێدێك، یان قەرەبووكردنەوەی شكستێكی مێژوویی، وەك ئەوەی لە هاتنە سەر كاری هیتلەردا كەوتەوە، گەرچی بەشێوازێكی دیموكراتیانەش هاتبووە سەر كار.

نەوشیروان مستەفا، سیاسەتی خۆ بەمحوەركردنی بە گومان خستە سەر هەموو شتێكی یەكێتی و بە تایبەت مام ەجەلال دەست پێكرد و لەرێی بەشێك لەو نوسەرانەی دۆستی بوون و هەروا لەرێی هەندێ ناوەندی راگەیاندنی وەك سایتی كوردستان پۆست و چەند رۆژنامەیەكی دیكە گومانە دروستكراوەكانی خستە ناو رایگشتی بەجۆرێك سەرەنجام وای لێهات حزبی بوون و بە دیاریكراوتریش یەكێتی بوون لەناو نەوەی تازەدا بكرێ بە عەیبە.

هەموو كارەكتەرە دیارەكانی یەكێتی بە مشەخۆر و گەندەڵ نیشانی رایگشتی بدرێ، وا لە خەلكی بگەیەنرێ كە مام جەلال لەبەر بەغدا كوردستان و یەكێتی بیرچووەتەوە، لەوەش پتر وایان لە خەلكی ئەگەیاند كە مام جەلال هەموو شتێك، بە یەكێتی و كوردستانیشەوە ئەكاتە قوربانی ئەوەی كە لەبەغدا سەرۆك كۆمار بێت،

ناشیرینکردنی هێزی پێشمەرگە و فەرماندەکانی، شوبهاندنی ڕاگەیاندنی یەکێتی بە ر[illegible]نی بەعس و لەو بارەوە هەمیشە ئەیوتەوە کە ڕاگەیاندنی یەکێتی ستراتیژی دێواندنی مام جەلال پەیڕەو ئەکا، لە کاتێکدا ئەو بووە خاوەنی سایت و ڕۆژنامە و دواتریش سەتەلایت هەمان ئەو خالانەی کە ماوەیەکی زۆر لای ئەو ببونە جێی ڕەخنە و نارەزایەتی ئەو، لە ناوەندەکانی ڕاگەیاندنی وشە بە خراپتر دووبارە ئەبوونەوە .

بۆ نموونە بەدرێژای هەموو تەمەنی ڕاگەیاندنی یەکێتی هەرگیز مام جەلال وەك شێخێك یان تیۆرسینێك هەفتانە و بە بەرنامە نەهێناوەتە سەر شاشە و وەعز دابدا، بەڵام نەوشیروان مستەفا ئەوەشی کرد، چونکە مام جەلال هەواڵ و کۆرەکانی کە بۆ ڕێکخستن یان هێزی پێشمەرگە یان بۆ ڕێکخراوەکان ئەنجام ئەدا بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان بەشێوەی ڕاپۆرت بڵاو ئەکرانەوە، کە دەمی قسەکانی مام جەلال هەمیشە بۆ ئەندامانی ئۆرگانێکی حزبی بوون، نەك وەك ئەو کە بیەوێ لەسەر هەموو خەڵك کار بکا و بۆچونەکانی خۆی وەك مەوعزە بەگوێی هەموو خەڵکدا بدات. لە خوێنەران ئەپرسم : کامەیان دروستکردنی دیکتاتۆرە؟

دوای ئەوەی نەوشیروان بەهۆی تۆڕێکی فراوان لە هاوکارانی لە نوسەر و ڕۆژنامەنوسان بۆی چووە سەر کە یەکێتی لەهەموو جومگەکانییەوە بخاتە ژێر پرسیار و دوای ئەوە لەپشت چەندین نارەزایەتی خوێندکاران و جەماوەرەوە وەستا بە کوردی زەمینەسازییەکی زۆری بە تایبەت لە سلێمانی بۆ هەڵگەڕانەوە سازکرد، ئاراستەی سیاسەتەکانی بۆ لاوازکردن و هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی دیاریکراو توندوتیژتر کرد. لەو ڕووەوە سلێمانی کردە ناوەندی بەڕێوەچوونی ئەو سیاسەتەی.

# بەشی سێیەم
## خاوەنداریێتی لە سلێمانی

سلێمانی، لەمێژووی پتر لە پەنجا ساڵی کوردایەتیدا به مەڵبەندی چەپی کوردستان و بەدرێژای تەمەنی یەکێتیش بەقەڵای یەکێتی ناسرابوو، بۆیە نەوشیروان مستەفا قورسای خۆی خستە سەر سلێمانی.

دنە دانی رایگشتی سلێمانی لەدژی یەکێتی بووە سیما و ناوەڕۆکی سیاسەتەکەی و بەدەیان شێوە خەڵکی سلێمانی لە یەکێتی هان ئەدا. جارێك ئەیانوت ئەو پارەیەی یەکێتی لە کەرکوك سەرفی ئەکا هی خەڵکی سلێمانییە، بەمەش رقی سلێمانییەکانی لە دژی کەرکوك و کەرکوکییەکان هەڵئەساند، جارێکی تر ئەوەیان بلاوئەکردەوە کە چۆن ئەبێ ماموستایەکی زانکۆ کە خەڵکی سلێمانی نییە ببێتە راگری کۆلیژێك، جارێکی تر لەوە راست ئەبوونەوە کە چۆن ئەبێ بەرێوەبەری فلانە فەرمانگەی حکومەت ئەسڵی سلێمانی نەبێ یان چۆن ئەبێ کەسانی دەرەوەی سلێمانی بکرێنە بەرێوەبەری هیچ دەزگایەك، هەمووومان ئەزانین کە خەڵکی سلێمانی شارەکەی خۆیان خۆشئەوێت و ئەمەش شانازییە بۆ هەر کەسێك و بەر لە هەمووانیش شانازییە کە خەڵکی سلێمانی شارەکەی خۆیان خۆش بوێت، بەڵام ئەو خۆش ویستنە هەرگیز نابێ ببێتە هۆی رقبونەوە لە خەڵکی تری شارەکانی کوردستان وەك ئەوەی نەوشیروان گەرەکیەتی، نەوشیروان زۆر زووتر تیۆریزەی ئەوەی کرد کە خەڵکی سلێمانی جگە لە خۆیان کەسی تریان قبوڵ نییە و ناتوانن لەگەڵ کەسی تری خەوارەدا هەڵبکەن، ئەمەشی بەوە تیۆریزە ئەکرد سلێمانی هەمیشە کۆمەڵگایەکی یەك دەست بووە و نەتورکومان نە عەرەبی تیا نەژیاوە تا سایکۆلۆژیەتی کۆمەڵگەی سلێمانی بایی ئەوە بێ کەخەڵکانی تر لەگەڵ خۆیدا ئیندماج بکا.

ئەم تیۆریەی نەوشیروان مستەفا پێچەوانەی ئەو ئاراستەیەشە کە ئەمارەتی بابان کاری لەسەر کردووە و ویستویەتی ببێتە قەوارەی سیاسی بۆ هەموو کوردستان،

بە تاسەیەکی تر نەوشیروان مستەفا سیاسەتی دەرپەڕاندنی لەسلێمانیدا گرتەبەر و پێویست سلێمانی یەك دەست بێت بۆ ئەوەی بەوجۆرە سلێمانی لەدەست یەکێتی دەربێنێ لەجیاتی ئەوەی سیاسەتی ئیندماج لە ناو سلێمانیدا پەیڕەو بکا کە هەموو شارە زیندووەکانی دنیا خەڵکی تر لە ناو خۆیاندا ئەتوێننەوە و سلێمانیش هەمیشە شارێکی زیندوو بووە و ئەوەی تیا ژیاوە مام جەلال وتەنی سلێماناوی کراوە.

بۆ دەرهێنانی سلێمانی لەدەستی یەکێتی لەرووی سایکۆلۆژییەوە پەنای بردە بەر نامۆکردنی خەڵکی سلێمانی بە یەکێتی ، بۆ ئەو مەبەستەش هەم خۆی و هەم بەشێك لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی یەکێتی بەپێی پلانێکی وردەوردە هەڵکشا و لەیەکێتی دوورخستەوە، تا سەرەنجام بەخەڵکی بڵێ: ئەها یەکێتی هیچ پەیوەندییەکی بە سلێمانییەوە نەماوە؟ سلێمانی لەکوێی یەکێتیدا خۆی ئەبینێتەوە؟ کوا یەکێتی هی سلێمانییەکانە؟ ئەوە نییە لە ڕێبەرانی یەکێتی کەسی سلێمانی تیادا نەماوە؟ لێدانەوەی قەوانی ئەوەلای کە سەرکردایەتی یەکێتی لە سلێمانییەکان خاڵی بووە بەجۆرێکی خەست و خۆڵ لێ ئەدرایەوە و لەو رووەشەوە هەرگیز باسی کەسە دەست رۆشتووەکانی سلێمانی لەناو یەکێتیدا نەئەکرا، هەرگیز باسی دکتۆر بەرهەم نەئەکرا، باسی دکتۆر کەمال فواد نەئەکرا، باسی عومەر فەتاح کە ماوەیەك سەرۆکی وەزیران و دواتریش جێگری سەرۆك وەزیران هەموو کوردستانی عێراق بوو نەئەکرا، باسی ئەندامانی تری سەرکردایەتی کە خەڵکی سلێمانی بوون نەئەکرا، ڕەنگە یەکێك لە هۆکارەکانی رقبوونەوەی نەوشیروتان مستەفا لە بەرهەم ساڵەح و ئەوانی تر بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە ئەوان تێزەکەی ئەو یان لەمەڕ نامۆبوونی یەکێتی بە سلێمانی و نامۆبوونی سلێمانی بەیەکێتی بەدرۆ ئەخستەوە، بۆیە وا رقی لێیانە.

لە لێکدانەوەیەکی سادەی ئەو بۆچوونەی نەوشیرواندا ئەوەمان بۆ روون ئەبێتەوە کە لەدیدی ئەودا تەنیا لەیەك حاڵەتدا هی سلێمانیەکانیشە کە نەوشیروان مستەفای تیا بێ، کە ئەوی تیا نەبوو ئیتر مانای وایە سلێمانی بە یەکێتی نامۆیە و سلێمانیش بە یەکێتی نامۆ، سەیری ئەو بۆچوونە بکەن کە لەپشت سیاسەتەکەی نەوشیروان

[illegible] خۆی بەروونی ئەنوێنێ، ئەو بۆچوون و تیزە بۆچوونی خود میحوەرکردنی [illegible] نییە؟

سلێمانیچێتی

ئەبێ دان بەوەدا بنێین کە هەندێك هەڵەی یەکێتی و بەخەستی کارکردنی گروپی نەوشیروان لەسەر سلێمانی تێهەڵچوونەوەی هەندێ کۆنە سەرکردایەتی یەکێتی کە خەڵکی سلێمانی بوون بۆ پشتیوانیکردنی تیز و تیۆرییەکانی نەوشیروان لەمەڕ سلێمانیچێتی توانییان لە هەڵبژاردنەکاندا لەشاری سلێمانی دەنگ لەیەکێتی زۆرتر بێنن و تیزی نامۆکردنی سلێمانی بە یەکێتی بخەنە پانتاییەکی فراوانترەوە ، بەڵام لەراستیدا ئەوەی ئەو ئەیکا سلێمانیچێتی نییە، بەڵکو نەوشیروان چێتییە؟

سلێمانیچێتی، دیاردەیەکە وەکو هەولێریچێتی ، بەغداچێتی، پاریس چێتی، برلینچێتی، ئەسفەهانچێتی و تارانچێتی و هیتر، ئەمە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە و بەجۆرێك لە جۆرەکان پەیوەستە بە نوستۆلژیا و ئولفەتەوە و زیان بە پەیوەندییەکانی ئەو شوێنە لەگەڵ شوێنەکانی تر ناگەیەنێ و شتێکە لەدەرەوەی خیتابی سیاسی تۆکمەی نیشتیمانی و هیچ زیانێك بە سیاسەتە نەتەوەیی و نیشتیمانییەکان ناگەیەنێ، جۆرێك تەعبیرە لە خۆشەویستی کەسانی شارێك بۆ شارەکەی خۆیان، شانازیکردنە بە سەروەرییەکانی شارەکە بەجۆرێك کە زۆرجار کەسانی شارێکی دیاریکراو ، بۆ نموونە رەواندز ئەهێنمەوە کە شانازی بە پاشای گەورەی ئەمارەتی سۆرانەوە ئەکەن، بەڵام لەهەمان کاتدا وەك ترادسیۆنێکی بەریئانە جۆرێك خۆشەویستییان بۆ شێتەکانی شارەکەشیان هەیە و هەن کە لەنێوان خۆیاندا وێنەی شێتەکانی شار بۆ یەکتری ئەنێرن، ئەمە هیچ پەیوەندییەکی بەخۆبەزلزانی و خۆهەڵکێشانەوە نییە بەسەر کەسانی شارەکانی ترەوە . وەك چۆن بۆ نموونە، حەزو ویستی سلێمانییەکی ئاوارە بۆ ترخێنە، حەزو عاشق بوون نییە بەخواردنێکی لەو جۆرە ، بەڵکو جۆرێکە لە نوستۆلژیا بۆ کلتوری شارەکەی خۆیان، بۆ کلتوری ماڵەکەی خۆیان ، بیرهاتنەوەی دەست و پەنجەی نەرمی دایکە

که ئەو خواردنە دروست ئەکا، سۆز و پەیوەست بوونە بەو ڕێوڕەسمەی لە ماڵدا بۆ
ڕخێنە خواردن بەڕێ ئەکرا، شارویستی بەرلەوەی مەسەلەیەکی سیاسی بێت ،
مەسەلەیەکی سایکۆلۆژییە و تا ئەو شوێنەی گونجاو و جوان و جێی شانازییە کە
لەسۆسیۆلۆژیاوە ناگۆڕدرێ بۆ سیاسەت.

خۆشەویستی بۆ سلێمانی، کاتێك بە وردی تەماشای ئەکەین، تەنیا هی سلێمانییەکان
نییە، بەڵکو هی هەموو کوردستانە، بەشارەکان و بەشەکانی تری کوردستانیشەوە،
گەورەیی و مەزنی سلێمانی لە یادەوەری و لە قەناعەتی خەڵکی کوردستاندا،
لەدایك بووی خۆبەزلزانینی هەندێ کەسی سلێمانییەوە نییە، بەڵکو پەیوەندی بە
مەزنزانینی سلێمانییەوە هەیە کە لەکوردایەتیدا بینیویەتی، ئەو رۆڵەی کە مافی
سلێمانییەکانە شانازی پێوە بکەن، بەڵام بۆ هەندێك نییە ئەو رۆڵە تەنیا بۆ خۆیان
مۆنۆپۆڵ بکەن، چونکە گەورەیی سلێمانی و رۆڵی سەربەرزانەی سلێمانی لە
کوردایەتیدا بەرهەمی هەموو خەڵکی کوردستانە، بەتایبەت هی رەوتی چەپی
کوردستان، لەدێر زەمانەوە بەرهەمی یەکێتی نیشتیمانی کوردستانە لە سێ دەیەی
رابردوودا، وەك چۆن بەرهەمی نالی و سالم و کوردی و ئەورەحمان پاشای بەبەشە.

ئەو قسانەم بەو مانایەیە کە سلێمانی بە سلێمانیچێتی هەموو خەڵکی کوردستانەوە
جوان و پێشەنگە، نەك تەنیا بە سلێمانیچێتی هەندێ کەس کە سلێمانیچێتیەکەیان
روو لە نامۆکردنی سلێمانییە بەهەموو کوردستان، تێزی نەوشیروان مستەفا لە
سلێمانیچێتیدا زادەی تێزی خودمیحوەری نەوشیروان مستەفایە و بەرهەمەکەی
لاتەریك کردنی سلێمانی و کورتکردنەوەی سلێمانییە بە ئێستای مێژوییەوە لە
شێخێکی وەك نەوشیروان مستەفادا، ئەمەش مەزنترکردنی سلێمانی نییە، چونکە ئەو
تێز و بۆچوونەی سلێمانیچێتی کە نەوشیروان پەسەندی ئەکا و کاری بۆ ئەکا
سەراپای لە دژی سلێمانی و ئایندەی سلێمانییە و ئەکرێ ناوی سلێمانیچێتی لێ
بسەنینەوە و پێی بڵێن نەوشیروانچێتی.

## بەشی چوارەم و کۆتایی

## نەوشیروانچێتی چییە؟

نەوشیروان مستەفا بۆ وەدی هێنانی خود میحوەرییەکەی، یەکێتی کردوەتە ئامانج و پێی وایە بە نەمانی یەکێتی یان لاوازبوونی تەواوی سلێمانی لەدەوری میحوەرەکەی خۆی کۆبکاتەوە و بیخاتە جەنگێکی فرە مەوداوە لەدژی بەشداریکردنی ناوچەکانی تر لە نوسینەوەی مێژووی لەمە بەدوای کوردستاندا. ئەیەوی ئەو شانازییە لە سلێمانی بسەنێتەوە کە خوێندنگای کوردایەتی بووە، کە ناوەندی بڕیاری سیاسی کوردستان بووە، کە پایتەختی روناکبیری و بزوتنەوەی سیاسی کوردستان بووە، ئەو شانازییە کەپشکی هەموومانی تیایە.

تێزی خودمیحوەری نەوشیروان مستەفا، بردنەوەی خۆی لەسەر وەدەرنانی یەکێتی لە سلێمانی بنیادناوە، لەکاتێکدا لێکدانەوە و خوێندنەوەیەکی مەنتقی بۆ مێژووی نوێی سلێمانی و مێژووی کوردایەتی لەعێراقدا ئەو راستییە تەئکید ئەکاتەوە کە مێژووی نوێی ئەو دوولایەنە بەیەکەوە گرێ دراوە و هەر هەوڵێك بۆ لێکترازاندنی یەکێتی و سلێمانی تەنیا بە زیانی یەکێتی تەواو نابێ، بەڵکو زیاتر لەوەش بە زیانی سلێمانی تەواو ئەبێ، چونکە هاوکێشەی نێوان یەکێتی و سلێمانی هاوکێشەیەکی سادە نییە تا بە ئاسانی هەڵبوەشێنرێتەوە.

لەلایەکی ترەوە، تێزی خودمیحوەری نەوشیروان، تێز گۆڕینی میحوەر بوونی سلێمانییە لە مێژووی سیاسی و رووناکبیری کوردستاندا بە نەوشیروان میحوەری. بەدەربڕینێکی دیکە، گۆڕینی میحوەر بوونی سلێمانی لە کوردایەتیدا، لەژێر هەر ناو و بیانویەکدا بێ زاڵکردنی میحوەرێکی ترە لە پرۆسەی سیاسی کوردستاندا، کە ئەگەری زۆرە سەروەرییەکانی پێشوش بسڕێتەوە.

، نەوشیروان مستەفا، باش ئەوە ئەزانێ کە پارسەنگی سلێمانی یەکێتی بووە، وەك چۆن پارسەنگی یەکێتیش سلێمانی بووە، بۆیە تێزی نەوشیروان میحوەری خۆی

[illegible] چەك كردنی یەكێتی لە سلێمانی بنیادناوە، ئەمە تێزەكەیە، وەك پێشوتریش [illegible] هیچ ئاراستە و ئامانجێكی نییە تەنیا نەوشیروان میحوەری نەبێت و باسكردنی گۆڕان و ریفۆرم لەوبارەوە جگە لەچاوبەستەكی شتێكی تر نییە، ئەمەش ئەو حەقیقەتەیە كە رۆژ لەدوای رۆژ روونتر ئەبێتەوە ، هیوادارم روون بوونەوەی تەواوەتی رۆژگارێك نەبیٚ كە گەڕانەوە لێی قورس و نەكراو بێت.

یەكێتی، یان وردتر بلێم بەشێك لە یەكێتی و سەركردایەتی یەكێتی ، لە زووەوە ئەو راستیەیان بۆ روون بووەوە كە سیاسەتی نەوشیروان بە ئاراستەی نەوشیروان میحوەرییە و باقی شتەكانی تری لە بابەتی شین و واوەیلا بۆ یەكێتی لە سەردەمێك و شین و واوەیلا بۆ سلێمانی لە دواتردا و شین و شەپۆڕی گۆڕینی سیستەمی سیاسی كوردستان و ئایندەی كوردستان ئەو دێوجامە و دەمامكانە بوون كە لەپشتیانەوە تاكە شتێك خۆی مەلاسدابوو ئەویش، نەوشیروان میحوەری بوو و هیچی تر.

ئاراستەی سیاسەتی نەوشیروان

تێگەشتن لە ئاراستەی سیاسەتی نەوشیروان مستەفا، بەو مێژووە دوورودرێژەی لە ناو یەكێتیدا هەیبوو، بەو ئەخلاقیاتانەی كە یەكێتی لەناو خۆیدا پێی ئەناسرایەوە، بەو دیماگۆگیەتەی بۆ پەرتەوازەبوونی یەكێتی و لێكترازاندنی یەكێتی و سلێمانی گرتووبویەبەر، بەرچاولێلّییەكی زۆری لە ئاستی جەماوەری یەكێتی و دەنگدەرانی كوردستان و بگرە لەئاستی مەكتەبی سیاسی و سەركردایەتی یەكێتیشدا دروست كردبوو، بەجۆرێك لە رۆژی دوای تەواوبوونی هەڵبژاردنەكانی پەرلەمانی كوردستانیش زۆر لە هاوڵاتیان دەنگیان بەگۆڕان دا و بەو نیاز و نیەتەوە دەنگیان پێدا كە ئەوانیش یەكێتین و بەشێكی دابڕاونین لە یەكێتی.

ئەنجامەكانی هەڵبژاردنی ٢٠٠٩/٧/٢٥ جەماوەری یەكێتی و سەركردایەتیەكەشی هەژاند و رایچەڵەكاندن، سلێمانیشی راچەڵەكاند و ئیتر دوو دڵییەك لەبارەی نیازی گرووپی نەوشیروانەوە نەمایەوە؟

لەلایەكی دیكەوە تا رۆژی هەڵبژاردنیش جەماوەری یەكێتی پێی وابوو كە

[illegible]كانی مام جەلال و بەشێك لە مەكتەبی سیاسی و هەوڵەكانی دكتۆر عومەر شێخ موس ئەتوانن ئەو لێك ترازانەی گروپی نەوشیروان دروستیان كردبوو چارە بكەن، بەڵام دوای هەڵبژاردنەكان ئیتر هەموو لایەك لەو راستییە گەیشتن نەخێر گروپی نەوشیروان ستراتیژێی خۆی لەسەر بنەغەی نەهێشتن و تەفروتوناكردنی یەكێتی و روونتر بڵێن لەسەر نەهێشتنی یەكێتی میحوەر بووون دارِشتووە و سەركەوتنی خۆی لە وەدیهێنانی نەوشیروان میحوەریدا لەسەر دارووپەردووی نەمانی یەكێتی بینا كردووە. لەپلنیۆمدا راپۆرتی هەڤاڵ سكرتێری گشتی لە باسكردنی هەوڵەكانی ئەودا بۆ یەكخستنەوەی یەكێتی بە روونی دەریخست كە لای نەوشیروان كار گەیشتە ئاستێكی نادیبلۆماسی ئەوتۆ ، كە نە وەڵامی نامەی مام جەلالی داوەتەوە و نە بەو پێشنیازەش رازی بووە كە یەكتر ببینن، لە كاتێكدا بەدرێژایی ساڵانی رابردوو گلەیی زۆر لە مام جەلال ئەكرا كە دەستبەرداری نەوشیروان نابێ و لەهاتنەوەی زۆر كەم وەختیشدا بۆ سلێمانی خۆی ئەكردە میوانی نەوشیروان مستەفا و لەراگەیاندیشدا بە گەورەیی و رێزەوە باسی لێوە ئەكرد.

شكستهێنانی هەموو ئەو هەوڵانەی بۆ خستنەوە سەر رێی ئەو گروپە، بە بەرچاوی هەموومانەوە شكستیان هێنا، بەجۆرێك بەماوەیەك پێش هەڵبژاردنەكان ، بەهۆی ئەو ئەندامانەی گروپەكەوە كە هێشتا لە ناو یەكێتیدا مابوونەوە، قەیرانی ناوخۆی یەكێتی چرِتر بووەوە و یەكێتی گیرۆدەی بارودۆخێك كردبوو كە وەك پێویست نەیئەپەرژایە سەر ئەركەكانی خۆ ئامادەكردن و هەوڵەكان بۆ راكێشانی دەنگدەران بەلای بەرنامەی خۆیدا، بەهۆی ئەو گروپەوە، كە بەشێوەیەكی ئەنارشستیانە لەناو ریزەكانی یەكێتیدا كاریان ئەكرد و گەرەكیان بوو كە یەكێتی لەناو فەوزایەكدا بچێتە ناو قۆناغ و ئەركەكانی هەڵبژاردن كە فریای خۆی نەكەوێ.

یەكێك لە ئامانجە سەرەكییەكانی فریای خۆنەكەوتنی یەكێتی لای ئەو گرووپە، بۆ ئەوەبوو كە ئامانجەكانی هەڵبژاردن، بە تایبەت لەسلێمانی بەقازانجی ئەوان بێت و سەرەنجام لە كۆی دەنگەكانی نێوان یەكێتی و پارتی ، یەكێتی وەك هێزێكی سیاسی

بچوك بێتە بەر چاو، کە بەمەش ئەیانویست نیشانەیەکی تریش بپێکن کە ئەویش بێسەنگ بوونی هاوپەیمانێتی بوو، بە قازانجی پارتی بۆ ئەوەی ئەو لاسەنگییە ببێتەهۆی مشتومڕێك لەنێوان ئەو دوو لایەنە هاوپەیمانەکە و دواجار هاوپەیمانێتییەکەیان هەڵبوەشێتەوە، بەڵام خۆشبەختانە هەست بە بەرپرسیارێتی کردنی هەردوو لایەنی یەکێتی و پارتی پێشی بەو پیلانە گرت.

هەموو ئەو رەفتار و کارانەی کە ئەو گروپە بەدرێژایی سێ ساڵ لە ناو هەموو ئاستەکانی یەکێتیدا کردیان، بۆ یەك مەبەستی گشتی و دیاریکراو بوو، ئەویش زیانگەیاندن بوو بە یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، کە مەسەلەی زیان گەیاندن بە یەکێتی لە ماددەی (شەشەم/ سزادان) ی پەیڕەوی ناوخۆدا سزاکەی لێسەندنەوەی ئەندامێتییە، بۆیە ئەبوایە یەکێتی لەوبارەیەوە نەرمی نەنوێنێ و پەیڕەوی ناوخۆ بەسەر هەموو ئەو کەسانەدا کە مادە ئاماژە پێدراوەکەی پەیڕەو ئەیانگرێتەوە، جێبەجێ بکا، جێبەجێکردنی ئەو سزایەش هۆکارێکی گرنگ بوو و دەرەنجامی دواتری بەدوای خۆیدا هێنا.

ئەوەی کە پلینیۆم لەبارەی ئەو سەرکردایەتیانەی یەکێتی کە جیابوونەوە، بڕیاری لێدا و پەسەندی کرد، بڕیارێك بوو تەواو گونجاو لەگەڵ پەیڕەوی ناوخۆ، بەڵام بێگومان لە ئەنجام و ئاکامدا بۆ ژیان و ناوخۆی یەکێتی و بۆ رۆڵی یەکێتی ئاسایی نییە، چونکە بەپێی شەرعیەتی پلینیۆم کۆتای بە مەترسیدارترین پیلان و هەرەشە هێنا و بەمەش ئاراستەی رووداوەکانی پێچەوانە کردەوە و ئیتر یەکێتی لە نەوشیروانچێتی و ئاسەوارەکانی رزگاری بوو بەم مانایە، داخستنی دۆسێی ئەندامێتی ئەوان، داخستنی دەرگا بوو لەسەر پیلانگێڕی.

**[illegible] ئاوێنە ژمارە ١٩٦ ی سێشەممە ٢٠٠٩/١١/٣**



## [illegible]بانی : گۆڕان دژی فیدراڵی و گەڕانەوی کەرکوك و پێشمەرگەن

لەیەکەم رۆژی پلینیۆمی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان کە ئێوارەی ٥/٢٩ لەسلێمانی دەستی بەکارەکانی کرد، سکرتێری گشتی یەکێتی تاڵەبانی هەموو نسکۆکانی یەکێتی و خەڵکی کوردستانی خستە ئەستۆی نەوشیروان مستەفای سەرۆکی لیستی گۆڕانەوە.

سەرچاوەیەکی تایبەت کە ئەندامی پلینیۆم بوو بە ئاوێنەی راگەیاند تاڵەبانی لە قسەکانیدا لەسەر نەوشیروان مستەفا و سیاسەتی گۆڕان وتویەتی " گۆڕان و سیاسەتەکەیان دژی فیدراڵی ، دژی گەڕانەوەی کەرکوك و دژی پێشمەرگەیە".

تاڵەبانی بۆ شیتەڵکردنەوەی ئەو بۆچوونانەی لەسەر گۆڕان و نەوشیروان، وتویەتی" دژی فیدراڵیەتن، چونکە دەیانەوێت سلێمانی جیابکەنەوە و دەیانەوێت کەرکوك بکەنە هەرێمێکی سەربەخۆ و وتویانە کەرکوکییەکان هەموو کوردستانیان دۆشیوە، هەروەها بادینیەکانیش بەکورد نازانن، سەبارەت بەپێشمەرگەش لەلای هەندێك دەوڵەت وتویانە پێشمەرگە زیادەیە".

دەربارەی هەولێرییەکانیش تاڵەبانی وتویەتی"نەوشیروان مستەفا گاڵتەی بە بیروڕای هەڤاڵ کۆسرەت رەسوڵ دەکرد و دەیوت شقارتە هەڵدەن بۆ راکانی".

سەرچاوە باوەڕپێکراوەکەی ئاوێنە رایگەیاند راپۆرتەکەی سکرتێری گشتی، واتە تاڵەبانی، نزیکەی نیو کاتژمێر بووە و زیاتر لەنیوەی قسەکانی بۆ هێرشکردنە سەر جێگرە پێشووەکەی، نەوشیروان مستەفا بووە.

سەرچاوەکە ئاماژەی بۆ ئەوەکرد کە تاڵەبانی لەسەرەتای قسەکانیدا گەڕاوەتەوە بۆ مێژووی دامەزراندنی یەکێتی و وتویەتی هەر لەکاتی دامەزراندنی یەکێتییەوە دوو تێڕوانینی جیاواز لەناو یەکێتیدا هەبووە، یەکێکیان توندڕەو نامولتەزیم و بێدەربەست لەیەکێتی، ئەوی تریشیان بەتەنگ موستەقبەلی یەکێتیەوە هاتووە و بەپەرۆشەوە بووە بۆ ئایندەی یەکێتی و میللەتەمان.

تاڵەبانی باسی لەوە کردووە کە هەر لە سەرەتای گەڕانەوەیانی بۆ کوردستان، ململانێ لەنێوان نەوشیروان و عەلی عەسکەری، واتە سۆسیالیستیەکاندا دەستیپێکرد و لەبەرئەوەی یەکێتی تێکنەچێت من هەر فریای ئەوە ئەکەوتم ئاشتیان بکەمەوە.

هەروەها سەرچاوەکە ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە تاڵەبانی باسی لەوە کردووە هەر لەسەرەتاوە گاڵتەی بە برایەتی کورد و عەرەب هاتووە، لەهەشتاکاندا جیاوازیمان لەسەر ئاڵای شۆڕش دەستیپێکرد و ئەوە بوو بەهۆی توندڕەوی نەوشیروان و لاساری سالار عەزیزەوە کێشەکە گەیشتە ئەوەی ئاڵای شۆڕش لەیەکێتی جیابووەوە.

تاڵەبانی بەپێی سەرچاوەکەی ئاوێنە لەوتارەکەیدا ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە لەسەرەتای هەشتاکانی سەدەی رابردوودا کۆمەڵێك خەڵك لەناو شارەکانی کوردستاندا کوژراون، سەرەتا نەمانزانیووە کێ ئەو کارانە ئەنجام دەدات تا جەمال تاهیر کە ئەو دەمە بەرپرسی رێکخستنەکانی کۆمەڵە بووە لە ناوشارەکاندا کە هاتووەتە دەرەوە، ئینجا زانیومانە ئەو کارانە بەبڕیاری تاکڕەوانەی نەوشیروان مستەفا ئەنجام دراون، پرس و رای بەبرادەرەکانی نەکردووە.

لەسەر مەسەلەی شەڕی ناوخۆی هەشتاکانیش سەرچاوەکە هێمای بۆ ئەوە کرد کە کەسی بەرپرس لەو شەڕە نەوشیروان مستەفایە و هەر بەبڕیاری ئەویش دیلەکانی پشتئاشانی حیزبی شیوعی و سۆسیالیستی کوژراون.

تاڵەبانی لەراپۆرتەکەیدا رایگەیاندووە کە لەدوای ئەو رووداوەوە، بڕیاری کوشتن گواستراوەتەوە بۆ دەستەڵاتی سکرتێر و کەس بۆی نەبوو بڕیاری کوشتنی کەس بدات بەبێ بڕیاری سکرتێر.

دەربارەی کیمیابارانی هەڵەبجە، تاڵەبانی لەپلینیۆمەکەدا وتویەتی ئەو دەمە ئەو لەوێ نەبووە، شەڕ لەسەر سەرکردایەتی یەکێتی گەرم بووە بۆ کەمکردنەوەی فشار لەسەر سەرکردایەتی، نەوشیروان مستەفا بەبێ ئاگاداری سکرتێر لەگەڵ پاسداراندا هێرشیان کردووەتە سەر شاری هەڵەبجە، هەرچەندە رژێمی عێراق پێشتر ئاگادرای کردبوینەوە کە ئەگەر پاسدار بهێننە سەر هەر ناوچەیەك، ئەم بەچەکی کیمیای لێیان دەدات.

تاڵەبانی ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە لەوەستانی شەڕی عێراق-ئێراندا، نەوشیروان بڕوای بە شۆڕش نەماوە و ئەگەر جەبار فەرمان و کۆسرەت ڕەسوڵ نەبوونایە یەکێتی و پێشمەرگەی پەرتەوازە دەکرد، زۆرێك لە کەسە نزیکەکانی خۆشی ناردە دەرەوەی وڵات.

لەشەڕی کوێتدا بەقسەی تاڵەبانی بەسکرتێری یەکێتییان وتووە ئەگەر پارتی و یەکێتی پاڵپشتی سەربازیمان بکەن، ئەوان بەرامبەر ئەو ئیلتیزامە فیدراڵی بۆ هەرێمی کوردستان مسۆگەر دەکەن، بەڵام کاتێك سکرتێری گشتی یەکێتی پەیوەندی بە نەوشیروان مستەفاوە دەکات بۆ ئەوەی ڕای سەرکردایەتی بزانێت، نەوشیروان بەبێ گەڕانەوە بۆ ڕای سەرکردایەتی ئەو داوایەی ئەمریکای ڕەتکردۆتەوە.

سەرچاوەکەی ئاوێنە ئاماژە بۆ ئەوە کرد کە تاڵەبانی وتویەتی لە کاتی ڕاپەڕینەکەی ساڵی ١٩٩١ و بەتایبەتی لە کاتی ڕەوەکەدا لەجیاتی مقاوەمەت و بەربەرەکانێ، نەوشیروان چوو بۆ زەڵێ و خۆی شاردەوە، بەبیانوی ئەوەی خەڵك تۆڵەمان لێ دەکاتەوە.

تاڵەبانی دەڵێ هەر لەو کاتەدا نامەیەکی بۆ سەدام نوسیوە و تیایدا ناوی سەدامی وەك سەرکردەیەکی پێویست بۆ گەلەکەی ناوزەند کردووە.

سکرتێری گشتی یەکێتی لەراپۆرتەکەیدا ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە لەدوای ڕاپەڕینەوە نەوشیروان مستەفا هەمیشە جەختی لەسەر ئەوە کردووەتەوە کە یەکێتی تێکبدەن و شتێکی نوێ دەستپێبکەنەوە.

بەپێی قسەی سەرچاوەکەی ئاوێنە تاڵەبانی ڕایگەیاندووە کە نەوشیروان مستەفا لەدوای ڕاپەڕینەوە ناوبەناو بێتاقەت و تورە بوو، داوای کرد بچێتە دەرەوەی وڵات، ئێمە ٢٠٠ هەزار دۆلارمان پێدا، خەرجی کردو گەڕایەوە.

تاڵەبانی هێمای بۆ ئەوە کردووە کە دەستەگەریی و تەکەتول لە ناو یەکێتیدا کە لەلایەن نەوشیروانەوە دروستکراوە، مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٩٢.

سکرتێری گشتی یەکێتی ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە لەدوای ڕووخانی ڕژێمی

[illegible] و هاتنی هێزە فرەڕەگەزەکان بۆ ناو عێراق، نەوشیروان نەیهێشتوو سوپای کۆرییەکان بنکەی سەرەکییان بێتە پارێزگای سلێمانی (هێزەکانی کۆریا بەوە ناسراون کە خزمەتێکی زۆری ئەو شوێنە دەکەن کەلێی نیشتەجێن-ئاوێنە) ئەوەبوو لە هەولێر نیشتەجێبوون.

تاڵەبانی ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە دوای ئەوەی وازیشی لەجێگری سکرتێری یەکێتی هێنا، ئێمە ١٠ ملیۆن دۆلارمان پێداوە بۆ دامەزراندنی ناوەندێکی رۆشنبیری و توێژینەوە، بەڵام ئەمەی نەکرد و لەو دەزگایانەوە کە دروستیکردن کەوتە تەقەکردن لەیەکێتی. تاڵەبانی باسی لەوەکردووە پێش هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی کوردستان ویستویەتی لەگەڵ نەوشیروان دابنیشێت، بەڵام ئەو ئامادە نەبووە.

تاڵەبانی ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە لەپرۆژەکەی خۆیدا کە (بەپرۆژەی جیاکردنەوەی حزب لە حکومەت ناسراوە)، نەوشیروان بەشداری تێدا کردووە.

تاڵەبانی لەکۆتای قسەکانیدا لەسەر نەوشیروان مستەفا و سیاسەتی گۆڕان وتویەتی "گۆڕان و سیاسەتەکەیان دژی فیدراڵی، دژی گەڕانەوەی کەرکوك و دژی پێشمەرگەن".

## رۆژنامەی رووداو..ژمارە ٨٤ دووشەممە ٢٠٠٩/١١/٢ چاوپێکەوتن لەگەڵ نەوشیروان مستەفا

نەوشیروان مستەفا، سەرۆکی بزوتنەوەی گۆڕان: نابینە حیزبێکی پێکهاتە ستالینی یەك کاژێر و نیو، لە نوسینگە بچوکەکەی گفتوگۆی دەرەوەی رێکۆردمان لەگەڵ سەرۆکی بزوتنەوەی گۆڕان نەوشیروان مستەفا کرد، قسەکانمان تێکەڵی دوکەڵی کەم کوژاوەکانی ئەو و ئێمە بوو، ئەو دوو بەکالۆریۆسی لە بواری زانستی سیاسیدا هەیە، بەڵام گوتی تەنیا لەو دوو ساڵەدا ئەو زانستەی خۆی تەو بەکارهێناوە. دوای ئەو گفتوگۆیانە هەڤپەیڤینێکی ٢٦ خولەکیمان لەبارەی بۆچوون و هەنگاوە ئایندەییەکانی بزوتنەوەی گۆڕان لەگەڵ ئەنجامدا:

رووداو-سلێمانی

رووداو: بزوتنەوەی گۆڕان چی لێدێت، وەك خۆی دەمێنێتەوە یان لەچوارچێوەیەکدا رێکیدەخەن؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە نابین بەحیزب، کە دەڵێم نابین بە حیزب مەبەستم ئەوەیە بە مەفهومی ستالینی نابین بەحیزب، واتە مەکتەبی سیاسی و کۆمیتەی ناوەندی و لق و مەڵبەندی نابێت. دەمانەوێت ئەم بزوتنەوە نوێیە لەگەڵ خۆیدا کۆمەڵێك مەفهومی سیاسی تازەش بهێنێتە ئاراوە کە لەجیاتی ئەوەی حیزب ئەداتێك بێت بۆ کۆنترۆڵ کردنی کۆمەڵ و بەحیزبیکردنی، جوڵانەوەیەك بێت زیاتر پشت بە هەڵبژاردن و بەرنامەی سیاسی ببەستێ بۆ هەڵبژاردن.

ئەو جوڵانەوەیە لە جیاتی ئەوەی لەشێوەی دامەزراوەیەکی سەربازیدا رێکبخرێ وەك ئەوەی حیزبە ستالینیەکان و تارادەیەکیش تا ئێستا حیزبە کوردییەکان بەوشێوەیە کاردەکەن، ئێمە دەمانەوێت شێوەیەکی نوێی کاری سیاسی بێنینە ئاراوە کە زیاتر حیزبەکانی ئەو وڵاتانە پەیڕەوی لێدەکەن کە تێیاندا هەڵبژاردن و پەنابردن بۆ

ی هەڵبژاردن کراوەتە پێوەری یەکەم، لەوانەیە بڵێین ئێمە ناتوانین لاسای بەریتانیا یان فەرەنسا بکەینەوە، بەڵام خۆ دەتوانین لاسای پاکستان و هیندستان بکەینەوە.

رووداو: واتە دەتانەوێت ببنە حیزبێك لەسەر شێوازی مۆدێرن؟

نەوشیروان مستەفا: تائێستا بڕیارمان نەداوە ببینە حیزب.

رووداو: ئەو چوارچێوەیەی خۆتانی پێ رێکدەخەن بەشێوەیەك دەبێ کە بتوانن سود لە یاسای کۆمەڵ و حیزبەکان وەربگرن کە لە پەرلەمانی کوردستان دەرچووە؟

نەوشیروان مستەفا: یاسایەکی لەوە نوێتر هەیە کە لەسەردەمی پۆل بریمەر دەرچووە، ئەویش یاسای رێکخستنی قەوارە و حیزبە سیاسییەکانە، ئێمە زیاتر پەیڕەوی لەوە دەکەین و، ئێمە بەگوێرەی ئەو یاسایە مافی ئەوەمان هەیە وەك قەوارەیەکی سیاسی لەسەرتاسەری عێراقدا کاربکەین و بارەگامان هەبێت. ئێمە پشتمان بە فەرمانی ژمارە ٩٧ ی سەردەمی بریمەر بەستووە کە کۆمسیۆنی باڵای هەڵبژاردنەکانیش تا ئێستا بەگوێرەی ئەو فەرمانە کاردەکەن.

رووداو: زۆر داوادەکرێ لەئێوەش کە بۆ هەڵبژاردنەکانی بەغدا لەگەڵ یەکێتی و پارتیدا بن، دوا بڕیاتان لەبارەی بەشداریکردن لە هەڵبژاردنی داهاتووی پەرلەمانی عێراقدا چییە، بەلیستی سەربەخۆ بەشداری دەکەن؟

نەوشیروان مستەفا: بەداخەوە ئەو دوو حیزبە پەیوەندی کوردستانی عێراق و پەیوەندی نەتەوەی کوردیان کورت کردوەتەوە بۆ پەیوەندی دوو حیزب لەگەڵ بەغدا کە ئێمە پێمان وایە ئەوە پەیوەندی نەتەوەی کورد لەگەڵ نەتەوەی عەرەب و پەیوەندی هەرێمی کوردستانە لەگەڵ حکومەتی ناوەندی بەغدا، ئێمە دەمانەوێ ئەمە بگۆڕین، ئەو گوتارە سیاسیەی ئێمە هەمانە، جیاوازە لە گوتاری ئەو دوو حیزبە، گوتاری ئێمە دەیەوێ سەرلەنوێ پەیوەندی نێوان ئێمە و حکومەتی ناوەندیی عێراق لەسەر بنەمای دوو نەتەوە بنیات بنرێتەوە، نەك لەسەر بنەمای چەند حیزبێك لەگەڵ حکومەت .

لەمەسەلە نەتەوەیەکاندا شتی جێگیر و شتی گۆڕاویشمان هەیە، لەمەسەلە جێگیرەکاندا بێگومان ئێمە لەگەڵ هەموو حیزبە کوردستانییەکان دەبین، وەك چۆن ئەمجارە لەمەسەلەی هەڵبژاردن و دانی تایبەتمەندیتی بە کەرکوك ئیسپاتمانکرد و پشتیوانیمان لە نوێنەرانی کورد کرد لە بەغدا، چ لە پەرلەمانی کوردستان و چ لە پەرلەمانی عێراق.

رووداو: دوای دەرکەوتنی ئەنجامەکانی هەڵبژاردنەکان، ئێوە خۆتان ئازاد دەبینن لە هاوپەیمانێتی دروستکردن، بۆ نموونە کە هاوپەیمانێتی کوردستان (پارتی و یەکێتی) ئیئتیلاف لەگەڵ لیستی ئیئتیلاف بکەن و ئێوەش لەگەڵ لیستی دەوڵەتی قانون بیکەن بۆ پێکهێنانی حکومەت؟

نەوشیروان مستەفا: ئەوە پرسێکی پێشوەختە، لەپاش هەڵبژاردن دەتوانین باسی ئەوە بکەین، چونکە دیار نییە کێ دەردەچێ و کێ دەرناچێ.

رووداو: بەڵام خۆتان بە پابەند دەبینن لەگەڵ هاوپەیمانی کوردستاندا ئیئتیلاف لەگەڵ یەك لیستی عێراقیدا بکەن؟

نەوشیروان مستەفا: ئەگەر شتی هاوبەشی نەتەوەیمان هەبێت بەڵێ.

رووداو: کابینەی نوێی حکومەت ڕاگەیەندرا و پاش چەندین ساڵ سەرۆك وەزیرانێکی یەکێتی چووە هەولێر، ئەو پرۆسەیە چۆن دەبینن؟

نەوشیروان مستەفا: پێموایە کابینەی شەشەمیش بەهەمان سیستەمی سیاسی دانانی کابینەی پێنجەمە، کاتێك ئێمە باسی گۆڕینی شێوەی بەڕێوەبردن دەکەین، باسی گۆڕینی سیستەمی سیاسی دەکەین، مەبەستمان کودەتا نییە، باسی ئەوە دەکەین کە لە کوردستان هەڵبژاردن کراوە، وەك هەموو شوێنێکی دنیا کە هەڵبژاردنی پەرلەمان دەکرێت، سەرۆکی فراکسیۆنی زۆرینە ڕادەسپێردرێ بۆ ئەوەی حکومەت دروست بکات، ئەویش دەڕوات خۆی وەزیرەکانی دەدۆزێتەوە و پاشان وەزیرەکانی دەباتە بەردەم پەرلەمان و لەوێ دەنگی بۆ دەدرێ، ئەوەی من بیستومە ئەمجارەش وەك جارەکانی دیکە هەردوو مەکتەبی سیاسی کۆمەڵێك وەزیریان ئامادەکردووە و

دامانەتە سەرۆك و جێگری سەرۆكی حكومەت، ئەمە هەمان سیستەمی سیاسی پێشووە، بۆیە لەو باوەڕەدانیم ئەمانیش بتوانن ئەركەكانی خۆیان بە تەواوی جێبەجێ بكەن، چونكە تا ئەو كاتەی دەستێوەردانی ڕاستەوخۆی حیزب لە كاری ڕۆژانەی حكومەتدا بمێنێ و تا ئەو ڕۆژەی دەستێوەردانی حیزب لە دانان و لابردنی وەزیرەكاندا بمێنێ، لەسەر ئاسایش و پێشمەرگە پۆلیس بمێنێ، لەسەر زانكۆ و بازاڕ لەسەر دەستەڵاتی دادوەری بمێنێ، گومانم نییە ئەوەی ئێمە دەمانەوێ نایەتەدی.

ڕووداو: بەڵام زۆربەی كەس دەڵێن وەزیر پۆستێكی سیاسییە و دەبێ حیزب داینێ، ئێستا كوردستان گەیشتووەتە ئەو قۆناغە وەزیری تەكنۆكرات دابنرێن و سەرۆك و جێگری سەرۆكی حكومەت بە پاڵێوراوەكانی حیزب بۆ وەزیرەكانی ڕازینەبن؟

نەوشیروان مستەفا: ئەمە پرسیارێكی زۆر زۆر گرنگە، یەكێك لەو شتانەی كە ئێمە دەمانەوێ ئەوەیە كە تۆ باسی دەكەی، یەكێك لەو شتانەی كە ئێمە دەمانەوێ ئەوەیە كە وەزیرەكان سیاسی بن و خاوەن بڕیار بن، بۆ ئەوەی ئەنجومەنی وەزیران بڕیارە سیاسییەكان بدات، نەوەك مەكتەبی سیاسی بڕیاری سیاسی بدات و ئەمانە فەرمانبەربن و تەنیا فەرمانەكانیان جێبەجێ بكەن، ئێمە دەمانەوێ دەزگای بڕیاردان بریتی بێ لە ئەنجومەنی وەزیران و پەرلەمان، زۆر بەلامەوە ئاساییە كە هەموو وەزیرەكانیش حیزبی بن، هیچ گرنگ نییە تەكنۆكرات بن یان نا، بەڵام سیاسی بن و خاوەنی دەستەڵاتی بڕیاردان بن، بۆ ئەوەی لەمەولا بڕیارە سیاسییەكان لە ئەنجومەنی وەزیران بدرێن نەك لە مەكتەب سیاسییەكان.

ڕووداو: مەبەستت ئەوەیە كە كەسانی بەهێزتر لە ئەندامانی مەكتەبی سیاسی بچوبانایە نێو حكومەت؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ بێگومان، تۆ ئەگەر بتەوێ مەركەزی بڕیاردان لە مەكتەبی سیاسییەوە بگوازیتەوە بۆ پەرلەمان و ئەنجومەنی وەزیران، پێویست بوو ئەوانەی دەیانەوێ لە بڕیاردانی سیاسیدا بەشداری بكەن، خۆیان بچن لە پەرلەمان و حكومەتیشدا بەشداری بكەن، بۆ ئەوەی ئیزدیواجیەت دروست نەبێ.

ڕووداو: ئەگەر لە هەڵبژاردنەکانی داهاتوودا زۆرینەتان هێنا خۆت دەچیتە نێو حکومەتەوە؟



نەوشیروان مستەفا: ڕەنگە تەمەنم یارمەتیدەر نەبێ بچمە حکومەتەوە.

ڕووداو: گفتوگۆ لەگەڵ ئێوەش کرا بۆ بەشداریکردنتان لە حکومەت، دکتۆر بەرهەم و ئازاد بەرواری هاتنەلاتان ، ئێوە بەشێوەیەکی بنبڕ ئەوەتان ڕەتکردەوە، یان دانوسانێك لەنێوانتاندا هەبوو بۆ شێوەی بەشداریکردن؟

نەوشیروان مستەفا: خەڵك دەنگیان بەئێمە دا بۆ ئەوەی ئەگەر زۆرینەمان هێنا ئێمە حکومەت دروست بکەین و ئەگەر زۆرینەشمان نەهێنا ببینە ئۆپۆزسیۆن، لەبەر ئەوە پێشوەخت ڕامانگەیاندبوو کە ئێمە ئۆپۆزسیۆن دەبین، بۆیە کە ئەو برایانە هاتنە لای ئێمە و قسەمان کرد نە ئەوان داوایان لە ئێمە کرد کە بەشداری لە حکومەت بکەین نە ئێمەش ڕەتمانکردەوە، تەنیا پرس و ڕاوێژ بوو لەسەر پێکهێنانی حکومەت و منیش بۆچوونەکانی بەراشکاوی پێگوتن.

ڕووداو: زۆر باسی ئەوە دەکرا کە تۆ و مەسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان کۆبونەوە دەکەن، بەڵام ئەو کۆبونەوەیە تا ئێستا نەکراوە، هۆی ئەوە چییە؟

نەوشیروان مستەفا: نازانم.

ڕووداو: هیچ ڕێککەوتنێکی پێشتر هەبوو کە لەگەڵ یەکتری کۆببنەوە؟

نەوشیروان مستەفا: نەخێر، بەڵام بەڕاستی یەکێك لەو شتانەی کە هاندەر نەبوو بۆ من کە بچم بۆ کۆبونەوەکانەوە ئەوەبوو کە ژمارەیەکی زۆر لەوانەی لەکاتی هەڵبژاردن پشتیوانیان لە ئێمە کرد سزا دران، ئێمە چاوەڕێمان دەکرد سەرۆکی هەرێم قبوڵ نەکات هیچ کەسێك لەسەر بیروبۆچونی سیاسی لە دامودەزگاکانی حکومەت و لەناو پێشمەرگە و ئاسایش و لەناو کەرتی پەروەردە لە کار دووربخرێنەوە و سزا بدرێن.

ڕووداو: بەڵام دواتر لیژنەیەك بۆ ئەوە پێکهات، هەست ناکەیت زەمینەکە لەبارتر

نەوە بۆ ئەو یەکتر بیبینە؟

نەوشیروان مستەفا: بەنیسبەت منەوە هەرکاتێك بیانەوێ من خەڵکی ئەم وڵاتەم و یەکێکم لەوانەی لەژیانی سیاسیدا بەشداری دەکەم، هەر کاتێك پێویست بە کۆبونەوە بکات لەلای منەوە هیچ ڕێگرییەك نییە و ئامادەم بۆ کۆبوونەوە.

ڕووداو: ئێستا لە بەغدا گفتوگۆیەکی گەرم هەیە لەسەر یاسای هەڵبژاردن، ئێوە پێشنیاری نوێنەری سکرتێری گشتی un لە عێراق بۆ چارەسەری ئەو کێشەیەچۆن دەبینن؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە لەم گرفتە سیاسیەی ئێستا هاتوەتە پێشەوە، ئاگاداری ئەو نوێنەرانەی بەغدامان کردووەتەوە کە هەر بڕیارێك ئەوان بیدەن ئێمە پشتیوانییان لێدەکەین، وەك چۆن لە پەرلەمانی کوردستانیش فراکسیۆنی ئێمە دەنگی خۆی خستەپاڵ ئەوانی دیکە، ئەوە مەسەلەیەکی نەتەوەییە، لەبەر ئەوە لەگەڵ ئەواندا دەبین.

ڕووداو: لەسەر مەسەلەی لیستی کراوە و داخراو گفتوگۆ زۆرە، لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستانیشدا داوای لیستی کراوەتان دەکرد، بۆ بەغداش هەمان ڕاتان هەیە؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ ئێمە بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراق لایەنگری لیستی کراوە و فرەبازنەیین، واتە هەر پارێزگایەك لە عێراق لیستی تایبەتی خۆی هەبێ.

ڕووداو: پێتوانییە لە فرەبازنەیدا کورد زەرەر دەکات؟

نەوشیروان مستەفا: نەخێر کورد زەرەر ناکات.

ڕووداو: خۆت بەنیازی بچیتە پەرلەمانی عێراق؟

نەوشیروان مستەفا: نەخێر بۆ پەرلەمانی عێراقیش ناچم، بەڵام پشتگیری کۆمەڵێك خەڵك دەکەم وەك فراکسیۆنێك بچنە پەرلەمانی عێراق، من بەنیاز نیم هیچ وەزیفەیەکی حکومەتی وەربگرم.

ڕووداو: لەبەشە عەرەبییەکەی عێراقدا ناوەندێك هەیە بۆ ئاراستەکردن، بۆ نموونە

کەسێکی وەك سیستانی کە رای خۆی لەسەر مەسەلەیەکی سیاسی هەستیار دەڵێ، پێی ئێوە دەبێتە ناوەندی هێز بۆ ئاراستەکردنی بڕیاری سیاسی، پێتوایە ئەوە خاڵێکی لاوازی بێت بۆ کورد، کە عەرەب ناوەندی وەهای هەیە و کورد نییەتی؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ وەك چۆن شیعە مەرجەعیەێکی مەزهەبییان هەیە، سیستانی مەرجەعێکی مەزهەبییە نەك سیاسی و لە حاڵەتی پێویستدا باسی سیاسەت دەکا، پێویستە کوردیش لە هەرێمی کوردستان مەرجەعێکی سیاسیمان هەبێت کە سەرۆکایەتی هەرێم پەرلەمان و حکومەتە.

رووداو: ئێوە وەکو بزوتنەوەی گۆڕان کێشەیەکتان لەگەڵ یەکێتی هەیە کە لێی جیابونەتەوە، بەڵام ئایا هیچ کێشەیەکتان لەگەڵ پارتی هەیە، یان پارتی بەپێی حسابی یەکێتی مامەڵەتان لەگەڵ دەکات، ئایا هیچ دەستپێشخەرییەك هەیە بۆ دروستکردنی پەیوەندی کە ئێوە ئێستا بوونەتە واقیعێکی سیاسی لە کوردستان، هیچ پەیوەندیەکتان هەیە ئەگەر لە ئاستی خوارەوەشدا بێت؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە رۆژانە خەڵکمان یەکتری دەبینێ لە ناو بازاڕ و لەناو زانکۆ و شوێنە گشتییەکان، بەڵام تائێستا پەیوەندی بەشێوەی فەرمی لەنێوان ئێمە و پارتی نییە، جگە لەپەیوەندی ناو پەرلەمان، دەتوانن پرسیارەکەش لەوان بکەن.

رووداو: کاتی ئەوە نەهاتووە کە نەك هەر لەگەڵ پارتی، بەڵکو لەگەڵ یەکێتیش بکەنە گفتوگۆ وەك چۆن هەموو حیزبەکان لەگەڵ یەکتری دادەنیشن؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ، ئێمە لەلای خۆمانەوە ئامادەین بۆ ئەوە بەیەکێتیشەوە، ئەگەر لایەنەکانی تر ئامادەبن.

رووداو: عیماد ئەحمەد لە هەڤپەیڤینێکیدا لەگەڵ (رووداو) دا باسی ئەوەی کردبوو کە هاتوچۆ و گفتوگۆیەکی نافەرمی لەنێوان ئێوە و پارتیدا هەیە؟

نەوشیروان مستەفا: تائێستا شتێکی فەرمی نییە، جگە لەو کۆبونەوەیەی کە سەرۆکی هەرێم کردبووی لەگەڵ هەموو قەوارە سیاسییەکان، تائێستا بەشێوەیەکی فەرمی وەفدێکی بزوتنەوەی گۆڕان لەگەڵ پارتی، یان وەفدێکی گۆڕان لەگەڵ

یەکێتی بەشێوەیەکی فەرمی دانەنیشتووە.

ڕووداو: ئێستا کە کابینەی نوێی حکومەت پێکهاتوو، هەندێك لایەن لەوانەی بڕیاربوو بەشداری حکومەت بکەن، بەشدارنەبوون و کەوتنە دەرەوەی حکومەت، لەوانە کۆمەڵ و یەکگرتووی ئیسلامی، ئێوە هیچ بەرنامەیەکتان هەیە بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەو لایەنانە بەرەیەکی ئۆپۆزسیۆن دروست بکەن، یان هەریەکە و بۆخۆتان بەجیا کاردەکەن؟

نەوشیروان مستەفا: بێگومان لەشتە هاوبەشەکاندا پێکەوە کاردەکەین، نەك هەر لەگەڵ ئەوان بەڵکو لەگەڵ فراکسیۆنەکانی دیکەشدا کە بەشدار و لایەنگری حکومەت دەکەن، هەر کاتێك شتی هاوبەش هاتەپێشەوە بەیەکەوە کاردەکەین و لەکارە باشەکاندا پشتگیرییان دەکەین.

ڕووداو: لەگەڵ لایەنەکانی ئۆپۆزسیۆن قسەوباسێکتان کردووە لەسەر ئەوە؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ لەنێوان خۆماندا کردوومانە.

ڕووداو: ئێوە وەك بزوتنەوەی گۆڕان هیچ نەرمییەك پیشاندەدەن بۆ ئەوەی لە کەرکوك یەك لیستییەك لەگەڵ پارتی و یەکێتی و لایەنەکانی دیکەدا دروستبکەن؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە لە کەرکوکیش بەلیستی سەربەخۆ بەشداری دەکەین، پێشمانوایە ئەو حاڵەتەی ئێستا لە ناوچە دابڕاوەکانی پێگەیشتووە، لەنێویشیاندا کەرکوك، سەرکردایەتی سیاسی کورد لێی بەرپرسیارە، لە کەرکوك یەکێك لە هۆکارەکانی ئەوەی کە دۆخەکە بەوەی ئەمڕۆ گەیشتووە ئەوەیە کە ئیدارە کوردییەکەی کەرکووك لەئاستی پێوستدا نەبووە، تائێستا هەردوو حیزبەکە لەوێ وەك دوو هێزی جیاواز کاردەکەن و زیاتر حیزبایەتی دەکەن وەك لەوەی کوردایەتی بکەن، تائێستا لە زۆر داوودەزگادا دوو ئیدارە هەیە، بۆیە پێمانوایە ئەوە هەر شتێکی روکەشە کە باسی یەك لیستی دەکەن، یەك لیست بوون، بەڵام دوو ئیدارە بوون، ئێمە هەوڵ دەدەین چەند لیستێك بین، بەڵام یەك ئیدارە بین.

ڕووداو: لە تورکیا سیاسەتێك بە ناوی (کرانەوەی دیموکراسی) یان وەك ئەوەی

پێشتر ناوی (کرانەوە بەرووی کورددا) لێنرابوو، دەستپێکردووە، لەو پرۆسەیەشدا pkk دوو گرووپی ئاشتی ناردووە، تۆ ئەو رووداوە چۆن دەبینی و پێتوایە دەبێ رۆڵی هەرێمی کوردستان لەو پرۆسەیەدا چۆن بێت؟



من ئەو پرۆسەیە بەشتێکی باش دەبینم و پێموایە حیزبی داد و گەشەپێدان کە ئێستا لە تورکیا لەسەر کارە، حیزبێکی کەمالیست نییە و لەرووی ئایدۆلۆژییەوە لەحیزبە شۆڤێنییەکانی تورك جیاوازە، ئومێدەوارم ئەمە هەنگاوێك بێت بەرەو چارەسەری کێشەی نەتەوەی کورد لە تورکیا، ئومێدیشم وایە کە حکومەتی هەرێمی کوردستان و حیزبە سیاسییەکانی کوردستانی عێراق ئەوەندەی پێیان بکرێ رۆڵێکی ئیجابی ببینن لەپشتیوانیکردنی چارەسەرکردنی ئاشتیانەی کێشەی کورد.

رووداو: ئێوە لە هەڵمەتی هەڵبژاردندا بەرەنگاربوونەوەی گەندەڵییانە کردبووە یەکێك لە دروشمەکانتان، ئێستاش سەرۆکایەتی لیژنەی نەزاهە لەنێو پەرلەمان بەر فراکسیۆنی گۆڕان کەوتووە، پلان و بەرنامەی ئێوە بۆ کاراکردنی ئەو لیژنەیە چییە؟

نەوشیروان مستەفا: پیموایە گەندەڵی تەنیا بەوە بنبڕناکرێ کە دوو موچەخۆری گەندەڵ بدەیە دادگا، دەبێ لەسەرو هەموو شتێکەوە دەزگایەك بۆ نەزاهە دابمەزرێ کە دەزگایەکی بێلان بێت، دیوانی چاودێری دارای کارابکرێ، داواکاری گشتی و دادگا کاراتر بکرێن لەوەی ئێستا، زیاتر رێگە بە رۆژنامە و گۆڤارەکان بدرێ سەرچاوەی زانیارییان دەستبکەوێ، هەروەها پەرلەمان کاراتر بێت بۆ لێپرسینەوە لە وەزیرەکان و لەو گرێبەستانەی کە دەکرێن، پێویستە بودجەی هەرێمی کوردستان بە تەواوی روون و ئاشکرا بێت لەرووی سەرفکردنی پارە و سەرچاوەی داهات، شەفافیەتی بودجە چاودێریکردن لەرێی ئەو داوودەزگایانەوە ئاسان دەکات، پێشم وایە ئەوە پرۆسەیەکی یەك رۆژە نییە و پرۆسەیەکی درێژخایەنە، ئەگەر بتوانین ئەو کارانە بکەین، دڵنیام بەڵێ دەتوانین چارەسەرێك بۆ گیروگرفتی گەندەڵی لە کوردستان بدۆزینەوە، بەڵام کارێکی قورسیشە.

رووداو: پرۆسەیەك بۆ گەڕاندنەوەی نانبڕاوەکان دەستی پێکردبوو، هەندێك گلەیی

[illegible]دەکرد کە بەزۆری فۆرمی پەشیمان بونەوەیان پێ پڕکراوەتەوە، بەگشتی ئێوە هیچ دەستپێشخەرییەك دەبینن بۆ گێڕانەوەی ئەو خەلْکانە بۆ سەر کاری خۆیان؟

نەوشیروان مستەفا: بەڕاستی پڕکردنەوەی فۆرمی پاکانەکردن بەخەلْك کارێکی زۆر ناشیرینە، ئەوەیان بەخەلْك کردووە و من خۆم چەند نموونەیەکم لەلایە، خەلْکێك لە شوێنێکەوە دوورخراوەتەوە بۆ شوێنێکی دوور بەناوی ئەوەی کە ئەمە دەرنەکراوە، من دەپرسم دوورخستنەوەی کەسێك لە کفرییەوە بۆ لای چۆمان، یان لە ماوەتەوە بۆ سەنگاو بگوازرێتەوە ئەوە دەرکردن نییە؟ لەوەش خراپتر کە بەڕاستی ئەوە جۆرێکە لەسوکایەتیکردن بەیاسا، کەسانێك هەن ١٠-١٥ ساڵە سەرپەرشتیاری پەروەردەین، کەچی بەبڕیارێك لادراون کراونەتەوە بە مامۆستا لەبەردەستی کەسێك کە کاتی خۆی قوتابی خۆیان بووە.

رووداو: بەلام ئێستا راگەیەندراوە کە دەستکراوە بە گەڕاندنەوەی ئەو کەسانە بۆ سەر کاری خۆیان؟

نەوشیروان مستەفا: تا ئێستا لەو پرۆسەیە رازی نیم، چونکە بانگی کەسێك بکەی و پێی بلێی دەتگەڕێنمەوە بەمەرجێك پاکانە بکەی ئەوە بەراستی پێشێلکردنی کەرامەتی ئینسانە.

## ژماره ١٩٦ ی رۆژی سێشەممە ٢٠٠٩/١١/٣ رۆژنامەی ئاوێنە..

## چاوپێکەوتن لەگەڵ (فوئاد مەعسوم)

دەربارەی ئەنجامەکانی پلینیۆم و یاسای هەڵبژاردن بۆ پەرلەمانی عێراق، ئاوێنە ئەم چاوپێکەوتنەی لەگەڵ کارگێڕی مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان و سەرۆکی لیستی هاوپەیمانی کوردستان لەپەرلەمانی عێراق، دکتۆر فوئاد مەعسوم دا سازکرد.

ئاوێنە: هەڵسەنگاندنی تۆ بۆ پلینیۆم و ئەنجامەکانی چییە؟ ئایا هەست دەکەی ئەم پلینیۆمە ببێتەی مایەی بەرەوپێشچوونی یەکێتی و ببێتە فاکتەرێك بۆ زاڵبوون بەسەر ئەو کێشانەدا کە چەندین ساڵە پێوەی دەناڵێنن؟

د.فوئاد مەعسوم: دەتوانم بڵێم پلینیۆم سەرکەوتوو بوو لەڕووی گفتوگۆکردن لەسەر هەموو ئەو بابەتانەی هاتبوونە پێش کە بابەتی گرنگبوون، هەروەها لەڕووی ئەوەی کەئەندامانی پلینیۆم بە ئازادانە هەر قسە و رەخنەیەکیان هەبوو کردیان، بەبێ بوونی هیچ سانسۆرێك بەشێوەیەکی زۆر تەندروست بەڕێوەچوو. بابەتی هەرە گرنگی پلینیۆمیش ئەو یەکبوونە بوو کە لە ناو پلینیۆمدا دەستەبەر بوو، کە هەمووی بەئاراستەی یەکبوون و بەهێزبوونی یەکێتی راکانیان دەربڕی. هەتا رای ئەندامانی پلینیۆم لەسەر پڕکردنەوەی حەوت ئەندامی سەرکردایەتیش کەس لەخەمی ئەوەدا نەبوو کە خۆی بچێتە سەرکردایەتی، بەڵکو زۆر بابەتیانە لەخزمەتی بەرژەوەندییەکانی یەکێتیدا بڕیاری لەسەردرا کە دوا بخرێت تا بەستنی کۆنگرە.

هەروەها لەمەسەلەی پێکهێنانی ئەنجومەنی ناوەندیشدا کە هەرچەندە بەداخەوە ماوەی هەشت ساڵە دواکەوتووە، چونکە سەرەتا جەمسەرە بەهێزەکانی ناو یەکێتی دژی بوون، بەلاّم مام جەلال وەك موساوەمەیەك بەو تێڕوانینەی ئێستا بڕیاردرا ئەو ئەنجومەنە دروست بکرێت. لەوباوەڕەدام ئەرکەکانی ئەو ئەنجومەنە زۆر زۆر گرنگتربێت لە دوای بەستنی کۆنگرەی یەکێتییەوە، هەروەها بڕیاردان لەسەر

بەڵگەنامەی ئاکار.

من وای بۆدەچم کە ئەنجامەکانی پلینیۆم هەنگاوێکی چۆنایەتی بوو بۆ یەکێتی، هەروەها یەکێتی بەچاوێکی پڕ لەقینەوە تەماشای ئەوانەی نەکرد کە جیابونەتەوە لە یەکێتی، تەنها بۆ ئەوانە نەبێت کە سەرکردایەتی بوون، هەرکەسێك بگەڕێتەوە بۆ ناو یەکێتی ماڵی خۆیەتی.

ئاوێنە: ئایا ئەو بەڵگەنامە ئاکارەی کە ئیمزاتان کرد، ترسێکە لەوەی کە جارێکی تر یەکێتی دووچاری دوولەت بوون بێتەوە، یان بەربەستێکە بۆ ئەوەی هەمان ئەو کێشانەی پێشتر دووبارە نەبێتەوە؟

د.فوئاد مەعسوم: بۆ دڵنیابوونی ئەندامانە لەلایەك و ، لەلایەکی تریشەوە بۆ ئەوەیە کە کەس جارێکی تر تەکەتول نەکات، هاوکات لەمپەرێك دەبێت لەبەدەم ئەوانەی بیانەوێت تەکەتول بکەن.

ئاوێنە: ئایا دانانی ئەندامانی ئەنجومەنی ناوەند بەهەمان شێوەی تەکەتول و تەکەتولکاری جاران پێکناهێنرێت؟

د.فوئاد مەعسوم: زۆری ژمارەکەی کە هەشتا کەسە، ڕێگرە لەبەردەم تەکەتولدا، زۆر زەحمەتە تەکەتولێك بتوانێت ئەو ژمارە زۆرەی خۆی بسەپێنێت، ئەمە لەکاتێکدا کۆمەڵێك پرانسیپیس لەئارادان بۆ دانانی ئەندامانی ئەو ئەنجومەنە، لەوانە ئەندامی سەرکردایەتی پێشووی یەکێتی ئەوانەی کە مێژوویەکیان هەیە و ئێستاش توانای کارکردنیان هەیە، هەروەها لەبەرچاوگرتنی ڕێژەی ژن، دەبێت ڕێژەیەکی باش لە ژنان بێنە ناو ئەو ئەنجومەنەوە، هەروەها ژمارەیەك لاوی گەنج بهێنرێتە ناو ئەنجومەنەوە و تەنانەت هەندێك خەڵکی پیشەیی شارەزا بکرێنە ئەندام.

بەلەبەرچاوگرتنی نوێنەرایەتیکردنی ناوچەکانی کوردستانیش، ئیستا داوا لە خەڵکێك کراوە کە (CV) خۆیان بنێرن تا هەڵسەنگاندنی بۆ بکرێت، ئەو ئەنجومەنە بەپێی پەیڕەوی ناوخۆی یەکێتی مافی چاودێریکردنی هەموو ئۆرگانەکانی یەکێتی هەیە، بەپێی پەیڕەو هەندێ دەستەڵاتی بڕیاردانیشی هەیە و بەرەورووی

بەدەرکاوەتەوە، تەنها رای راوێژکاری نییە.

ئاوێنە: بەپێی ئەو زانیاریانەی دزەیانکرد لە پلینۆمەوە وترەکەی مام جەلال وتارێکی زۆر توند بووە لەسەر کاك نەوشیروان و لیستی گۆڕان، بەڵام ئەو راگەیاندنەی لەکۆنگرەوە دەرچوو جیاوازییەکی زۆری هەبوو لەگەڵ ئەو وتارەدا، ئایا ئیرادەی پلینۆم زاڵ بوو بەسەر وتارەکەی مام جەلالدا، یان ئایا بۆ راگەیاندنەکەی پلینیۆم هیچ ئاماژەیەکی لە وتارەکەی مام جەلال تیا نەبوو؟

دزفوئاد مەعسوم: مام جەلال باسی موعاناتی خۆی و یەکێتی کرد، بەڵام راگەیاندنەکەی پلینیۆم باسی بڕیار و هەڵوێستی داهاتووی یەکێتی کرد، وتارەکەی مام جەلال مێژووی موعاناتەکە بوو، ئەو موعاناتە بەدرێژای ئەو مێژووە کەڵەکە بووە و چیتر تەحەمول نەکرا، جا ئەو باسی لەو موعاناتە کرد.

ئاوێنە: ئایا هەست ناکەیت ئەم وتارەی مام جەلال بۆ ئەزموونی دیموکراتی کوردستان باش نییە؟ یەکێتی و پارتی بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراق دەیانەوێت ریزبەندییەکی کوردستانی پێکبهێنن، ئایا ئەمە زەرەر بەو تێڕوانینە ناگەیەنێت؟ ئایا کاتەکەی باشە، ئایا ئەمە کاری مێژوونوس نییە؟

د.فوئاد مەعسوم: مێژوونوس کە دەست بەکاردەکات، دەبێت مادەیەکی لەبەردەستدا بێت و تەماشای ئەو مادانە دەکات، ئینجا خۆی بڕیار دەدات. بەڵام ئەگەر هەر تۆ بێدەنگ بیت، ئینجا واهەست دەکرێت هیچ لە گۆڕێدا نییە و ئەوەی دەوترێت هەمووی راستە. من وای دەزانم کە یەکێتی پێویستی بەوە بوو کە لە رێی ئەو راستیانەوە هەندێك لەو بنکە جەماوەریانەی کە لە هەڵبژاردنەکەی دوایدا لەدەستیدا بیگەڕێنێتەوە، چونکە هەندێك پڕوپاگەندەی وا کرابوو کە ئەوانە تا ئێستا یەکێتین و بەشێکن لەو ئاڕاستانەی لە ناو یەکێتیدا هەن، یان تاکتیکێکە لەنێوان مام جەلال و کاك نەوشیرواندا، بۆ ئەوەی بەهێزێکی زۆرەوە بێنە ناو پەرلەمان بەرامبەر پارتی، بۆیە پێویست بوو ئەو قسانە بکرێت و مەسەلەکان بگەنە ئەو ئاستە و بوترێت ئەوانە یەکێتی نین و هیچ پەیوەندییەکیان بەیەکێتییەوە نەماوە، ئەمە پێویست بوو

لەناو حزبدا بەتەواوی روونبکرێتەوە.

ئاوێنە: بەڕێزت وەك كەسێك لە سەركردە دیارەكانی یەكێتی كە لەگەڵ ئەو كاروانە مێژوویەدا هاتویت، ئایا تۆش هاوڕایت لەگەڵ هەموو ئەو شتانەدا كە مام جەلال لە پلینیۆمدا لەسەر كاك نەوشیروان وتویەتی؟

د.فوئاد مەعسوم: مام جەلال باسی لە موعاناتێك كرد كەبەشی هەرە زۆرمان ئەو موعاناتەمان بینیوە.

ئاوێنە: ئایا دەكرێت بڵێین جەنابیشت هاوڕایت لەگەڵ ئەو قسانەی مام جەلالدا؟

د.فوئاد مەعسوم: مام جەلال هیچ شتێكی باس نەكردووە كە دوور بێت لە واقیع.

ئاوێنە: ئایا ئەو راپۆرتەی مام جەلال دەبێتە یەكێك لە بەڵگەنامەكانی پلینیۆمی یەكێتی؟

د.فوئاد مەعسوم: جەنابی مام جەلال باسی موعانات كردووە، كە كێشەیەك هەبووە چۆن پەرەی سەندووە و بەچی گەیشتووە، بەڵام ئەوەی كە پەیوەندی بە ئەدەبیاتی حزبەوەیە ئەو بڕیارانەیە كە لەپلینیۆمدا دراون و ئەو وتارەیە كە مام جەلال تێیدا باسی ئەوەی كردووە كە چۆن ئیش بكەین و بارودۆخە سیاسسەكە چۆن دەچێتە پێش، چ لەسەر ئاستی كوردستان چ لەسەر ئاستی عێراق. پلینیۆمیش ئەو دەرفەتە بوو كە ئەو رێژەی زۆرەی لە كادیرانی تێدا بوو تا ئەو قسانەی تێدا بكرێت.

چارەسەركردنی مەسەلەی كەركوك بەهێز ناكرێت

ئاوێنە: ئایا پێشبینی چی دەكەین بۆ یاسای هەڵبژاردنەكانی عێراق؟

د.فوئاد مەعسوم: كێشەی دوو لایەنە، لایەنێكیان لەو كەسانەوەیە كە حەز بە بە سەركەوتنی پرۆسەی سیاسی لە عێراقدا ناكەن و دەیانەوێت دووچاری كێشە بێت و مەسەلەی هەڵبژاردنیان كردووەتە كارتێك بۆ سەرنەكەوتنی پرۆسەكە، هاوپەیمانی كوردستانی بەرپرس نییە لە كێشەكە، ئێمە دەڵێین هەڵبژاردن بكرێت، ئەوان كێشەیان دروستكردووە، لاكەی تری كەسانێك هەن نایانەوێت ئەو سیاسەتەی سەدام لە كەركوك و ناوچەكانی تر گرتبویەبەر هیچ گۆڕانێكی بەسەردا بێت،

دەنوێنێت ئەو گۆڕانە کەمەی کە هەیە و خەڵکەکەی گەڕاوەتەوە بە ناشەرعی دانیشتن بۆ ئەوەی کەرکوك بگەڕێتەوە دۆخی جارانی و هاوردە عەرەبەکانیش بگەڕێنەوە بۆ کەرکوك و باروودۆخەکە وەك پێش رووخانی لێبێتەوە.

مەسەلەکە حەساسە، هەندێك لە هێزە عەرەبییەکان پێیان ناخۆشە کە کورد دەنگی زۆر بێنێت و کەرکوك بەرەو هەرێم بگەڕێتەوە، هەندێکی تریشیان ئەگەر بەدەستیان بێت نایەڵن ئەو دەستەڵاتەی هەرێمی کوردستانیش کە ئێستا هەیەتی بمێنێت، مەسەلەی کەرکوك نە لەلایەن ئێمەوە نە لەلایەن بەغداوە بەهێز چارەسەر ناکرێت.

ئاوێنە: هەست ناکەن لە ململانێی چەند رۆژی رابردوودا لە پەرلەمانی عێراق، کورد کەنارگیر کەوتووە و کەس لەو هاوپەیمانیانەی هەمیشە باسیان دەکەین لەگەڵمان نین؟

د.فوئاد مەعسوم: من ناتوانم وا بڵێم، چونکە هەندێکیان هەن لەگەڵ ئەو ئاراستەیە نین کە عەرەب و تورکومانەکانی کەرکوك بەرزیان کردووەتەوە و دەیانەوێت حاڵەتێکی تایبەت بدەن بە کەرکوك، چونکە لەوە گەیشتوون کە مەبەستی ئەوان کەرکوك نییە و راگرتنی تێکڕای پرۆسە سیاسییەکەیە، نابێت ئەوەشمان لەبیر بچێت ئێمە لەخراپترین حاڵدا دوو ڤیتۆمان بەدەستەوەیە، کە دەتوانین هەر بڕیارێکیش بدرێت بیگەڕێنینەوە، بەمەش هەڵبژاردن دوادەکەوێت و کێشەیەکی گەورە لەعێراق دروست دەبێت.

ئاوێنە: ئایا وەك جارانی پێشوو ئەمریکییەکان بێنە سەر خەت و گوشارمان بخەنەسەر وەك جارانی پێشوو، مل نادەین بۆ داواکارییەکانیان؟

د.فوئاد مەعسوم: تائێستا لەسەر ئاستی عێراق لەسەر هیچ شتێك تەنازولمان نەکردووە، لەوانە دەستکاریکردنی دەستور، چوارساڵە گفتوگۆ بەردەوامە تەنازولمان نەکردووە، هەروەها کێشەی نەوت و هەموو یاسا هەڵپەسێردراوەکانی تر.

ئاوێنە: پێدەچێت لە هەڵبژاردنی داهاتووی عێراقدا، زیاتر لە سێ لیست لە کوردستاندا هەبێت، ئایا بۆ لەسەر نەخشەیەکی ڕێگا یان هەندێك پرەنسیپی نەتەوەی

[illegible]کەون، بۆ ئەوەی کورد یەك گوتاری سیاسی هەبێت؟

د.فوئاد مەعسوم: ئومێدەوارین ئەگەر چەند لیستێك هەبێت بەهەمان رۆحیەتی ئێستای ئێمە و لیستی یەکگرتوو کار بکەین، ئەوەی لە بەغدادیش گرنگە ئەبێت کورد لەسەر مەسەلە ستراتیژییەکانی خەڵکی کوردستان هەڵوێستیان یەك بێت.

ئاوێنە: لەوباوەڕەدایت کورد بەم لیستە جیاوازانە، پۆستە سیادییەکانی وەك سەرۆك کۆمار، وەزیری دەرەوە، جێگری سەرۆك وەزیران، وەربگرێتەوە لەبەغدا؟

د.فوئاد مەعسوم: سەرۆك کۆمار وەردەگرینەوە، ئەو پۆستە سیادیانەی لە عێراقدا هەن یەکێکیان وەردەگرینەوە، بگرە لایەنی تریش باسی ئەوە دەکەن پۆستی سەرۆك کۆمار هەر بۆ کورد دەبێت و هەر مام جەلالیش دەبێت، بۆ ئەم هەڵبژاردنە نا، بەڵام بەپێویستی دەزانم بۆ هەڵبژاردنی داهاتووتر پێویستە کورد لیستی فراوانتر بکات، بۆ ئەوەی بچووك نەبینەوە.

## گۆڤاری جیهان – ژمارە (٧) چوارشەممە ٢٠٠٩/٤/١

## د. فوئاد مەعسوم: تا ئەو کاتەی نەوشیروان وازی هێنا بە کوتلەی مام جەلالم دەزانی

## سازدانی. جیهان. سلێمانی

دکتۆر فوئاد مەعسوم ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتیمانی و سەرۆکی فراکسیۆنی هاوپەیمانی کوردستانی لەپەرلەمانی عێراق، بەدوو تەوەرە دواندمان کە یەکێکیان کێشەکانی ناو یەکێتی و هۆکارەکانی روودانیان، ئەوی دیکەشیان مەسەلەی کێشەکانی بەغدا و هەرێم، فوئاد مەعسوم بەشێوەیەکی راشکاوانە بیروراکانی خۆی دەربڕی.

تەوەری یەکەم کێشەکانی ناو یەکێتی و هۆکارەکانی روودانیان

جیهان: بەشێوەیەکی گشتی رات چۆنە سەبارەت بەکێشەکانی یەکێتی؟

د. فوئاد مەعسوم: ئەوە جاری یەکەم نییە ئەو کێشانە لەناو یەکێتیدا روودەدەن، چەندجارێك ئەو کێشانە روویانداوە، چونکە یەکێتی سەرەتا سێ باڵ بووە و دواتر بونەوەیەك و دیسانەوە بوون بەسێ باڵ و دواتر هەندێکیان لێی جیابوونەوە و زۆریان گەڕانەوە، ئەوەی کە هەیە زۆر ئاساییە، کە نابێت کەس وازبێت، کەس رەخنەبگرێت، چونکە ئیشکردن لەناو حیزب ئینتیمایە و مەسەلەی بڕیاری شەخسییە کە لەناو کام حیزبدا کاردەکات، ئەوجا لەسەر هەر پلە و پایەك بێت، ئەو کێشەیەش ئەوەنییە گەشتبێتە ئاستێك کە چارەسەر نەکرێت و مومکینە چارەسەر بکرێت، رەنگە هەندێك بیانەوێ بەیەکجاری نەگەڕێنەوە یان هەندێکی دیکە وازبهێنن، ئەوە شتێکی ئاساییە، چونکە یەکێتی ئێستا بۆتە حەقیقەتێك، هێزێك کە ناتوانرێ وا بەئاسانی لاواز بکرێت و لەبن بێت، دەبێ یەکێتی وەك حیزب هەموو هەوڵێك بدات کە ئەندامەکانی خۆی بگرێتەوە باوەش، بەڵام ئەوەش کەلێی دەردەچن ئەوە شتێکی ئاساییە، چونکە لەدنیادا حیزب خەڵك دێتە ناوی خەڵکیش لێی دەردەچێت، ئەوەش وانییە کە ئەوەی وازی لێهێنایت دژایەتی بکەیت و بەدوژمنی دابنێیت، دەکرێت لەحیزبیش نەمێنێ و پەیوەندیشی باش بێت. لەگەڵ

[illegible] من لەوباوەڕەدام ئەوانەی کە موبەرریان هەیە بۆ بەجێهێشتن هەوڵ بدرێت مەسەلەکانیان چارەسەربکرێت و بگەڕێنەوە بۆ ناو باوەشی یەکێتی.

جیهان: باسی دیالۆگت کرد زۆرێك لەو بەڕێزانەی وازیان لەمەکتەبی سیاسی هێناوە ئەوەیان بلاوکردوەتەوە، کە مەکتەبی سیاسی یەکێتی باوەڕیان بە دیالۆگ نییە، بۆیە دەستیان لەکارکێشاوەتەوە و باوەڕیان بەچاکسازی و ریفۆرم نییە لەناو یەکێتی؟

د.فوئاد مەعسوم: بۆ زانیاریت ئەو هەڤالانە نەمانبینی رۆژێك لەرۆژان لەناو مەکتەبی سیاسی پرۆژەیەکیان تەرح کردبێت بۆ چاکسازی و زۆرینە رەفزی ئەو پرۆژەیەی کردبێت شتی وا نەبووە و حەق وابوو چ کێشەیەکیان هەبێت، بێن لەکۆبونەوەی مەکتەبی سەرکردایەتی لە کۆبونەوەی مەکتەبی سیاسی باسی بکەن و ئێمە باوەڕمان وایە کەیەکێتی ناتوانێت بەمشێوەی ئێستا بێت و پێویستی بەم چارەسەرانە هەیە تکایە باگفتوگۆی ئەو پرۆژەیە بکەین ئەگەر ئەو پرۆژەیە رەتکرایەوە، یان ئیهمالکرا گوێ نەگیرا ئەوا حەقیان بوو وازبهێنن، بەلام دەستلەکارکێشانەوەی راستەوخۆ لە راگەیاندنەوە بلاوبکرێتەوە، ئەوە خۆش نییە، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە هەموو هەولێك بدرێت بۆ چارەسەری ئەو کێشانە، چونکە ئێمە هەڤالی یەکین و پێکەوە ماوەیەکی زۆرە کارمان کردووە. پرۆژەیەك کاتی خۆی پێشکەشکرا لەوە زیاتر نەبووە.

من وەك فوئاد مەعسوم راموایە تا دەستەلات مەرکەزی بێت لەناو یەکێتی، ئێمە رزگارمان نابێت لەو کێشانە، نەك ئێمە هەموو حیزبێك بە مەرکەزیەت کێشەی بۆ دروست دەبێت، پێویستە دەستەلات دابەش بکرێت بەسەر چەند دەزگایەکدا بۆ نموونە دوو دەزگا هەبێت بڕیارەکان جێبەجێبکات، بەلام هەموو دەستەلاتەکان لەدەست کۆمەڵە کەسێك بێت کە خۆیان بڕیار بدەن و خۆشیان جێبەجێیبکەن، ئەمەیان مومکین نییە چارەسەری کێشەکان بکات، هەروەك پەرلەمان چۆن بڕیار دەردەکات و دەزگایەکیش هەیە کە حکومەت بڕیارەکەی پەرلەمان جێبەجیدەکات،

پێویستە لەناو حیزبیشدا دوو دەزگا هەبێت، بۆ ئەوەی بزانرێت ئەو بڕیارە چۆن جێبەجێدەکرێن؟ کێ مەسئولە لەو جێبەجێکردنە؟ ئەو دەزگایانە نەبن کێشەکان بەردەوامن، لە کۆنگرەی دووەمی یەکێتی پێویست بوو ئەم کارە بکرێت، بەڵام لەو کۆنگرەیە بەشەرمەوە پاشکۆیەك خرایە ناو پەیڕەوەکەوە، چونکە ئەوانەی مەرکەزی هێزبوون لە کۆنگرە قبوڵی ئەوەیان نەکرد، کە زانرا زۆرینە لەگەڵ ئەوەدایە، ئاخرجار مام جەلال پێشنیاری ئەوەی کرد وەك پاشکۆیەك بخرێتە ناو پەیڕە و هەوڵبدرێت جێبەجێبکرێت، بەڵام کەس لەگەڵ ئەوەنەبوو جێبەجێبکرێت و تائێستاش وەك خۆی ماوەتەوە.

جیهان: وا بڵاوکراوەتەوە کە دارایی و مەکتەبەکان و شوێنە گرنگەکان بەدەست کوتلەی تاڵەبانیەوەیە، ئەم بیروڕایە بەردەوام میدیاکان و ناوەندەکانی ڕاگەیاندنی پڕکردووە، تاڵەبانی بڕیاردەری یەکەمە؟ ئەمە چۆن دەبینی.

د.فوئاد مەعسوم: وابزانم بەشێکی زۆری ئەو برادەرانە، ئەگەر وا ناوی بێنین بە کوتلەی مام جەلال دادەنرا، چونکە لەناو مەکتەبی سیاسی ئەوە نەبوو مام جەلال کوتلەیەکی هەبووبێت و ئەوەی دیکە کوتلەیەکی هەبووبێت، گوناهە بەوشێوەیە مەسەلەکان تەرح بکرێت، لەناو مەکتەبی سیاسی ئەو بەڕێزانە خاوەن بڕیاربوون و ئەو کاتەش بەوشێوەی ئێستا نەبووە، کێ کوتلەی مام جەلال بووە و کێ کوتلەی مام جەلال نەبووە، ئەمن ڕەنگە بەکوتلەی مام جەلالم دانێن، بەڵام تا ئێستا هیچ دەستەڵاتێکم نەبووە لەناو یەکێتیدا، بەڵام من دەورم هەبووە و تەنها یەکجار پۆستم وەرگرتووە ئەویش وەك سەرۆکی حکومەت.

جیهان: یانی نەوشیروان مستەفا خاوەنی بڕیاربوو لەناو یەکێتیدا؟

د.فوئاد مەعسوم: بەتەئکید خاوەنی بڕیاربووە، زۆرجار قسەکانی ئەو بووە بەدوا بڕیار، لەبەرئەوە کەسایەتیەکی ئەساسی ناو یەکێتی و مەکتەبی سیاسی بووە.

جیهان: زۆرێك لەو سەرکردانەی یەکێتی دەستیان لەکارکێشاوەتەوە ئەوەیان بڵاوکردوەتەوە، کە مام جەلال گوێی لێ نەگرتوون، هەروەها ئەوەش دەڵێن ئەوان

[illegible]یان بۆ گۆڕانکاری کردووە، بەڵام بەگوێیان نەکراوە پرۆژەکانیان پشتگوێ خراوە؟

د.فوئاد مەعسوم: مەحزەری جەلسەمان هەیە و ماوە، لەیەك مەحزەردا ئەوەنییە وترابێت چاکسازی دەکەین و نەکرابێت، یان وترابێت نابێت بکرێت، بەردەوام کۆبونەوەکانی مەکتەبی سیاسی بەپێکەنین و قسەی خۆش تەواو بووە، ڕەنگە قسە و پروت و بۆڵە کرابێت، بەڵام لەناو مەکتەبی سیاسی هیچ کێشەیەك نەهاتووەتە پێش، بۆچوونی جیاجیا نەهاتووەتە پێش کە نەگەینە ئەنجام، کێشەی واش نەهاتووەتە پێش کە داوایەك کرابێت یان پرۆژەیەك لە کۆبونەوەکانی مەکتەبی سیاسی باس نەکراوە کە بڵێین، ئەوە مام جەلال ڕەفزی دەکات و قبوڵی نییە، چونکە ئێمە تا ئەو ڕۆژەش کاك نەوشیروان وازی هێنا بەکوتلەی مام جەلالمان دەزانی، چونکە ئەو بەهەموو هێزی خۆیەوە پشتگیری لەمام جەلال دەکرد و مام جەلالیش پشتی بەو دەبەست.

جیهان: ئایا تاڵەبانی دەتوانێت ئەو کێشانە چارەسەر بکات؟

د.فوئاد مەعسوم: ئومێدمان وایە، مام جەلال مرونەت لەبیروڕایدایە و ڕق و غەرەزی لەناودا نییە ئەو بەحوکمی ئەوەی کە وەك کەسایەتییەکی مێژووی دەرکەوتووە، هەوڵ دەدا و دەتوانێت ئەو کێشانە چارە بکات.

جیهان: بەشێوەیەکی گشتی ڕات چۆنە سەبارەت بە ریفۆرم و بڵاوبونەوەی ئەو چەمکە؟

د.فوئاد مەعسوم: من کارم بەو زاراوەیەوە نییە، من لەگەڵ ئیسلاحم و لەو بارەوەش بیروڕام دەربڕیوە پێویستمان بەگۆڕانکارییە، بەحوکمی ئەوەی ئێمە لەشاخ بووین و هاتوینەتە ناو شار، بەعس نەماوە و ئەزموونی حکومەتمان کرد، پێویستمان بە بەخۆداچونەوەیە، چونکە کەسانێك هەیە ئیستیغلالی وەزیفەکەیان دەکەن بۆ خۆدەوڵەمەندکردن غەدر لەخەڵك کردن، بەڵام نەك ریفۆرم بکەی بەشیعارێکی سیاسی، بەڵکو پێویستە وەك گۆڕانێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی سەیر بکرێت، نەك وەك شیعارێکی سیاسی بۆ ئەوەی شەڕی پێ بکەیت، من لەگەڵ ئەوەنیم ئەو زاراوەیە

[illegible] بکرێت، لەگەڵ ئەوەم پێویستە ئیسلاح بکەین، چونکە هەموو لەبەردەم [illegible]ردنین، زەمانی جاران نییە فلانە کەس بۆ ئەندامی کۆنگرە، پێویستە خەڵك دەنگمان بداتێ لە ڕێگای دەنگدانەوە پۆستی حیزبی و حکومی وەرگرین، چونکە خەڵك دەنگمان ناداتێ ئەگەر گەندەڵ بین، بەرگری لەبەرژەوەندییەکانیان نەکەین و داواکانیان جێبەجێ نەکەین.

جیهان: یانی ئەو ئیسلاحە وەك خۆت دەیڵێیت تەنها دروشمە؟

د.فوئاد مەعسوم: ئەوە تەنها دروشمە، چونکە ئەگەر ریفۆرم دروشم نەبێت، پێویستە چارەسەری هەموو ئەو حاڵەتانە بکات، خەڵك دەیەوێت خزمەتگوزرای هەبێت، حیزب دەستنەخاتە ناو کاروباری خەڵك، پرۆژەکەی مام جەلال پرۆژەیەکی گرنگ بوو بۆ ئەوەی کاری لەسەر بکرێت، بەتایبەتی دوای ئەو زیاد و سەرنجانەی کە خرانە سەر پرۆژەکەی تەنانەت کاك نەوشیروان نامەی بۆ بەڕێز مام جەلال نارد کە هەندێ تێبینی هەبوو سەبارەت بە میکانیزمی جێبەجێکردنی پرۆژەکە.

جیهان: یانی نەوشیروان نامەی بۆ تاڵەبانی ناردووە بۆ جێبەجێکردنی پرۆژەکە؟

د.فوئاد مەعسوم: بەڵێ نەوشیروان نامەی نارد بۆ مام جەلال تێبینییەکانی لەسەر پرۆژەکە لەنامەکەدا روونکرابووەوە و ئەو لایەنانەی خرابوونەڕوو بۆ ئەوەی پرۆژەکە جێبەجێبکرێت.

جیهان: گوایا جەنابت و دکتۆر بەرهەم و مەلا بەختیار ڕێگرن لەگەڕانەوەی نەوشیروان مستەفا؟

د.فوئاد مەعسوم: یەکەم: شتێکی وا نەبووە بەدەنگ لام کە نەوشیروان دەگەڕێتەوە یان ناگەڕێتەوە.

دووەم من لەگەڵ کاك نەوشیروان هیچ کێشەیەکم نەبووە تەنانەت ئەو کاتەی کە یەکێتی بریتی بوو لەسێ باڵ ئەو بەرپرسی باڵی ریفۆرم بوو، من بەرپرسی باڵی شۆڕشگێڕان بووم، کێشە لەنێوانماندا نەبووە، ماوەیەکی زۆر لەبەرگەڵو بوین و هیچ کێشەیەکمان نەبووە، ئەکرێت رای جیاوازمان هەبوبێت و ئەو رایەکی لەسەر

مەسەلەیەك هەبوبێت و منیش رایەکی تر، کێشەیەکی تایبەتی نەبووە کە لە مەکتەبی سیاسی وتبێتم نەگەڕێتەوە، ئێستاش دەیڵێم گەڕانەوەی کاك نەوشیروان شتێکی باشە، وتووشمە کە کاك نەوشیروان دەگەڕێتەوە نە ئەو شەرت بەسەر ئێمەدا فەرز بکات نەئێمە شەرت بەسەر ئەودا فەرز بکەین.

جیهان: ئایا تۆش شەڕی پۆستی باڵای یەکێتی ناکەیت؟

د.فوئاد مەعسوم: تائێستا نە رۆژێ لە رۆژان، نە لای هیچ کەسێکم باس نەکردووە و ئەوەشم راگەیاندووە لەم کۆنگرەیە بەشداری ناکەم و دوور دەکەومەوە لەژیانی سیاسیم و لەکاری سیاسیم لەو پلەیەی هەمە ناشمەوێ لەو پلەیە کاربکەم، بەڵام وەك ئەندامێك دەمێنمەوە و شانازیش دەکەم کە یەکێکم لە دامەزرێنەرانی یەکێتی.

تەوەرەی دووەم: کێشەکانی هەرێم و بەغدا

جیهان: رۆژ بەرۆژ کێشەکانی نێوان هەرێم و بەغدا رووی لە پەرەسەندنە هۆکارەکانی پەرەسەندنی ئەو گرژیانە چین؟

د.فوئاد مەعسوم: وادەزانم ئەگەر زمانی گفتوگۆ و دیالۆگ بگیرێتەبەر لەنێوان بەغداد و هەرێم ئەوا کێشەکان بەزووی چارەسەر دەکرێن، چونکە بەشێکی زۆری ئەو کێشانەی کە هەیە ئەوە نییە کێشەی دەستوری بن و هەریەکێ و بەلایەکدا بەرێت، راستە بۆچوونی جیاجیا هەیە، راستە مەسەلەکە دەسەڵاتە، بەغداد وا تەماشا دەکات کە دەستەڵات لە عێراقدا مەرکەزی بێت، بۆ ئەوەی بتوانێت ئەو سیاسەتەی کە خۆی هەیەتی ئەو سیاسەتە جێبەجێبکرێت، لەلایەکی ترەوە هەرێم دەستوور مافێکی زۆری پێداوە و چۆن دەبێت دەست لەو مافانە هەڵگرێت بۆ بەغدا، بەڵام وادەزانم ئەگەر گفتوگۆیەکی جددی دەستپێبکات لەنێوان هەردوولا نەك بەسێ رۆژ و چوار رۆژ و تەواو، گفتوگۆیەکی جددی، چونکە نە کوردستان دەتوانێت لەمڕۆدا دەست لە بەغدا هەڵگرێت، نە بەغدا دەتوانێت دەستبەرداری هەرێم ببێت.

جیهان: تۆ پێتوایە بەدەستوور کێشەکان چارەبکرێت لەکاتێکدا ئێستا مالیکی داوای کەمکردنەوەی هەرێم و دەسەڵاتەکانی و گۆڕانکاری لەدەستووردا دەکات؟

د.فوئاد مەعسوم: دەستوور شتێك نییە وا بەئاسانی دەسکاری بکرێت، چونکە [illegible]یەکی دەستووری هەیە ئەو ماددە دەستووریە دەڵێت کە هەر گۆڕانکارییەك لەدەستووردا بکرێت، ئەگەر لە سێ پارێزگادا دوو لەسەر سێ ڕازی نەبن بەو دەسکارییە ئەوا گۆڕانکارییەکان هەڵدەوەشێنرێتەوە، ئێستا ئەگەر مالیکی لە پەرلەمانی داهاتووشدا زۆرینەی کورسییەکانی بەدەست بهێنێت، ئەوا دیسان ناتوانێت گۆڕانکاری لە دەستوور بکات، چونکە هەرێمی کوردستان سێ پارێزگایە و بەبێ ویستی ئەو هەرێمە ناکرێت گۆڕانکاری لە دەستووردا بکرێت کاتێ ریفراندۆم بکرێت، لەبەرئەوە مەسەلەکە ئاسان نییە ئەگەرێ سەرۆك وەزیران ئەو قسانە بکات، بەڵام ئەو قسانە بەو جێبەجێ ناکرێن.

جیهان: ئەگەر وتوێژی جددی لەنێوان هەرێم و بەغدا هەبێت ئەوا کێشەکان چارەسەر دەکرێت ڕۆڵی ئێوە چییە وەك ئەندامانی پەرلەمان و نوێنەری خەڵکی کوردستان لەپەرلەمانی عێراق بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشانە؟

د.فوئاد مەعسوم: ئێمە لەبەغدا نوێنەری کوردستانین، نوێنەری کوردستانین بەهەرێم و دەرەوەی هەرێم ئێمە نوێنەری حکومەتی هەرێم نین ئەو کێشانە پێویستە لەسەر ئاستی دەسەڵاتی تەنفیزی چارەسەر بکرێن، حکومەتیش وەك دەستەڵاتی تەنفیزی نوێنەری خۆی هەیە، لەبەغدا سەرۆکی حکومەت و لەهەرێمیش سەرۆکی حکومەت هەیە ئێمەش لەبەغدا کەمپینی بۆ بکەین واتە کێشەکان لەنێوان دەسەڵاتی تەنفیزیدان لە بەغدا و هەرێم.

جیهان: زۆر کەسایەتی و لایەن گلەیی لەئێوە دەکەن؟

د.فوئاد مەعسوم: ئەو گلەییانە کە دەکرێن لەجێی خۆیان نین، چونکە لیستی هاوپەیمانی سەنگەری هاوپەیمانی کوردستانە لە بەغدا بەرگری لە مافەکانی کوردستان لە بەغدا و پەرلەمانی عێراق دەکات لەو پێناوەشدا دەوری خۆی گێڕاوە، لیستی هاوپەیمانی دەتوانێت کاریگەری لەسەر بڕیاری ناو پەرلەمانی عێراق هەبێت بۆ نموونە میزانیەی ئەمساڵ کێشەی بۆ نەهاتە پێش، بەڵام ساڵی پار کێشەی

دەوری بۆ دروست بوو.

جیهان: تۆ پێتوایە کە حکومەتی هەرێم جددی بووە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی لەگەڵ بەغدا یا ئێمە بەردەوام نەڵێین بەغدا نایەوێ، بۆ جارێکیش ئەو پرسیارە لەخۆمان بکەین بزانین حکومەتی هەرێم دەیەوێت ئەو کێشانە چارەسەر بکات؟

د.فوئاد مەعسوم: من ناتوانم بڵێم خەتای ئەوانە وا پێویست دەکات هەردوولا دانیشن بۆ ئەوەی کێشەکان چارەسەر بکەن بەڕێز مام جەلال ڕۆڵی سەرەکی هەیە بۆ ئەوەی کێشەکان نەگەنە بن بەست و نەگاتە تەقینەوە.

جیهان: سەفەری سەرکردەکانی هەرێم بۆ دەرەوە چەند دەوری هەیە لە گرژییەکانی هەرێم و بەغدا بەتایبەتی سەردانەکەی سەرۆکی هەرێم؟

د.فوئاد مەعسوم: لەرووی دەستوورییەوە هیچ شتێك نییە ڕێگری لەو سەفەرانە بکات، بەڵام ڕەنگە سەرۆك وەزیران پێی خۆش نەبێت کە سەرۆکی هەرێم پرس بەو نەکات، سەرۆك وەزیرانی عێراق وای پێخۆش بێت کە پرسی پێبکرێت ئەو سەفەرەکان دیاری بکات، بەڵام هەرێمیش حەقی خۆی هەیە ئەو چالاکیانە بنوێنێت بەتایبەت بەڕێز کاك مەسعود کە قورسایی خۆی هەیە.

جیهان: پێتوایە گرژی نێوان بەغدا و هەرێم بەتایبەت لەسەر مەسەلەی کەرکوك ڕووەو ئاڵۆزی زیاتر بچێت؟

د.فوئاد مەعسوم: باسی شەڕ دەکەن کە هەڵدەگیرسێت لەنێوان پێشمەرگە و سوپا، هەندێ جموجوڵ بووە، بەڵام هەندێ دەیانەوێ لەنوسینگەکانیان ئەوە دەربخەن کە عێراق پڕیەتی لەکێشەی سیاسی هەندێك وایشان دەدەن کە کورد دژی عێراقە و نایەوێ عێراق بەوشێوەیە بمێنێتەوە و تەنانەت ئەوەش دەخەنەڕوو کە ڕژێمی سەدام حەقی بووە کە کوردی لەناوبردووە، چونکە کورد دژی عێراق بووە و هەمیشە کێشەی بۆ عێراق دروستکردووە کە ئەمەش عەقڵی شۆڤێنییەکانە.

جیهان: شتێك هەیە بەناوی شەڕی کورد و عەرەب؟

د.فوئاد مەعسوم: تائێستا شەڕی کورد و عەرەب لەئارادا نەبووە، لە ڕابردووشدا

شەڕی کورد و حکومەتە یەك لەدوایەکەکانی عێراق بووە نەك شەڕی کورد و عەرەب. بەڵام تائێستا حکومەتی عێراق لەتوانایدا نییە شەڕ دروست بکات ئەگەر ئەمەش بکات ئەوا وەك حکومەتەکانی پێشوو دەبێت لەبەرئەوە نە وەك سیاسەت نە لەرووی هێزەوە نە لەرووی بیرکردنەوە حکومەت عێراق نایەوێ شەڕ لەگەڵ کورددا بکات.

جیهان: بەڵام زۆرێك لەچاودێرانی سیاسی پێیانوایە کە ئەگەر راپۆرتەکەی نەتەوە یەکگرتووەکان خراپ بێت ئەوە ئەگەری تەقینەوەی هەیە؟

د.فوئاد مەعسوم: مەسەلەی ماددەی ١٤٠ پەیوەندی بەکوردستانەوە نییە کاتی خۆی مەسەلەی ١٤٠ باسکرا لایەنی شیعە دەیانوت مەسەلەی کەرکوك مەسەلەیەکی مێژووییە لەبەرئەوە پێویستە کارێك بکرێت، کە ئێمەش حەقمان لەدەستچووە، ئەو حەقەمان بۆ بگێڕدرێتەوە. مەسەلەی کەرکوك کێشەیەك نییە بە نەتەوە یەکگرتووەکان چارەسەر بکرێت و ئێمەش مولتەزیم نین بەوەی کە بۆچوونەکانی جێبەجێبکەین، نەتەوە یەکگرتووەکان دەیانەوێت یارمەتی ئێمە بدەن بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشانە سەرەتا من خۆم تێبینیم دایە دیمستۆرا کە راپۆرتەکەی هەڵەیە پێویستە مەسەلەکە بەشێوەیەکی گشتی وەرگرین، نەك چەند ناوچەیەك فەرامۆش بکەین و تەنیا خۆمان ببەستینەوە بەکەرکوکەوە، ئێمە مولتەزیم نین تا نەتەوە یەکگرتووەکان بەگوێرەی بڕیارێك حەکەمێك دانەنێت و بە بڕیار شەرعیەتی پێبدات کە ئەمە حەکەمە و پێویستە هەموولایەك بەگوێی بکەن ئێمە مولتەزیم نین بەبڕیاری نەتەوە یەکگرتووەکانەوە، ئەوان تەنها یارمەتیمان دەدەن هەروەك چۆن یارمەتیمان دەدەن بۆ مەسەلەی هەڵبژاردنەکان و دەستوور و زۆر لایەنی دیکە.

نەوشیروان مستەفا بۆ لڤین: ئەگەر خەڵکانێك بیانەوێت بۆ مەبەستی سیاسی گۆڕی رابردوو هەڵبدەنەوە، ئێمە لەرابردووی خۆمان ناترسین، لەبەرئەوە هیچ شتێکمان نییە

بەشۆفێری ئەو تەکسیەمان وت کە بردینی بۆ گردەکە: ئەگەر تۆ نەوشیروان مستەفا ببینیت، چ پرسیارێکی لێدەکەیت؟ وتی: پێیدەڵێم چۆن و بەچی ئەم بارودۆخە دەگۆڕێت؟

نەوشیروان مستەفا ئەمین جێگری پێشووی تاڵەبانی و سەرۆکی لیستی (گۆڕان) ی رکابەری سەرەکی تاڵەبانی و بارزانی، لەدیدارێکی گۆڤاری لڤیندا لەسەر هەڵبژاردنەکانی کوردستان و بەرنامەی قەوارەکەی و هەڵمەتی راگەیاندن لەهەڵبژاردنەکاندا دەدوێت.

ئەو دوای نائومێدبوونێکی زۆر لە تاڵەبانی و حیزبەکەی، هاتە دەرەوە و کۆمپانیای (وشە) ی دامەزراند و دواتریش دەستی بەبلاوکردنەوەی رابوبۆچوونەکانی خۆی کرد دەربارەی سیستەمی سیاسی لەکوردستاندا، ئەمەشی کردە بناغەی دروستکردنی لیستی (گۆڕان).

نەوشیروان بەحەزەرێکی زۆرەوە مامەڵە دەکات، ئێستا نەوشیروان مستەفا لە هیچ کاتێکی تر ناچێت، ئەو هەم سڵەدەکاتەوە و هەم شادمانە.

سڵەدەکادتەوە لەوەی کە رێگرییەکان بواری ئەوەی نەدەنێ خەونەکانی بکاتە حەقیقەت و شادمانیشە بەوەی کە تێکڕای شەقامی نارازیی کوردی چاویان لە ئەوە و ئومێدی گۆڕانیان پێوە بەستووەتەوە.

نەوشیروان مستەفا دەیەوێت بەوە بە هەمووان بڵێت ئەو ئێستا جیاوازتر لە جاران بیردەکاتەوە و جیاوازتریش کاردەکات.

هەر لەبەر ئەو هۆیەشە، هەمووان چاویان لەو پیاوەیە کە ساڵانێکی زۆر جێگری تاڵەبانیی رکابەری بووە و ئێستاش دەیەوێت لەهەڵبژاردنەکاندا بە زۆر سیاسی

ئاوڤبکات.

گفتوگۆی: ئەحمەد میرە و هێمن باقر

لڤین: لیستەکەی ئێوە ناوی گۆڕانە و دروشمەکەشتان گۆڕانکارییە، بەبڕوای تۆ ئەم بارودۆخە دەتوانرێت بگۆڕێت، بەو مانایەی گۆڕان تەنیا بەدروشم و پروپاگەندەی هەڵبژاردنە یان خەونێکە دەتوانرێت بهێنرێتە دی؟

نەوشیروان مستەفا: لەم قۆناغەی ئێستای هەرێمی کوردستاندا، باشترین هەلومەرج رەخساوە بۆ ئەوەی گۆڕانێکی بنەڕەتی بکرێت. ئێمە کە باسی گۆڕان دەکەین، مەبەستمان ئینقیلابی عەسکەری نییە، کە باسی گۆڕان دەکەین مەبەستمان روخاندن نییە، مەبەستمان ئەوە نییە ترس لەهەرێمی کوردستان دروست بکرێت، بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە کە مۆدێلێکی سیاسی لە کوردستان هەیە، ئەو مۆدێلە پێویستی بەگۆڕانکاری هەیە.

رەنگە (٥) ساڵ لەمەوپێش ئەو مۆدێلە زۆر لەبار و گونجاو بوبێت. (١٠) ساڵ لەمەوپێش، گونجاو و لەبار بوبێت، تەنانەت تا ١٥ ساڵ لەمەوپێش رەنگە پێویست بە گۆڕانی ئەو سیستەمە نەکرابێت، بەڵام ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە ئەو سیستەمە سیاسییەی لە کوردستانی عێراقدا حوکم دەکات، جۆرێك لەگۆڕانی بەسەر بێت کە بشوبهێت بە سیستەمە سیاسییەکانی دونیا، نەك سیستە تۆتالیتارییەکانی دنیا. ئەم سیستەمەی ئێستا کە ئێمە هەمانە، ئێمە لە کوردستانی عێراقدا پەرلەمانمان هەیە، دەسەڵاتی جێبەجێکردنی هەیە و دەسەڵاتی دادوەریمان هەیە، بەڵام لەسەرووی ئەوانەوە سەرکردایەتیی سیاسیمان هەیە. بۆ نموونە لە هەڵبژاردنی ئەمجارەدا، کێ بڕیاریدا کە هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان بەلیستی داخراو بێت؟ مەکتەبی سیاسی بڕیاریدا نەك پەرلەمان، کێ بڕیاریدا جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران بگۆڕێت؟ لەمەکتەبی سیاسی بڕیاری لەسەر درا، نەك ئەوەی کە پەرلەمان یەکێك بانگبکات و متمانەی لێبسێنێتەوە و یەکێکی دیکە بانگ بکات و متمانەی پێ بەبەخشێت. ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە ئەو کارە بکەین. رەنگە جاران بوونی ئەو

سەرکردایەتییە سیاسییە لەبەر بوونی ئاسایشی نەتەوەیی زەرور بوویێت، بەڵام لەقۆناغی ئێستادا بەرەو ئەوە دەڕۆین، کە هەموو چوارچێوەیەکی سیاسی و یاسای و دەستووری و ئابووری جێگیربووە. لەبەرئەوە ئیتر پێویستە ناو ماڵی خۆمان ڕێکبخەینەوە، ڕێکخستنەوەی ناو ماڵی خۆمان بەمانای ئەوە نییە، کە کەس زەرەری لێبکات، بەڵکو بەمانای ئەوەی کە دەسکاری شێوەی حوکمڕانی سیاسی وڵاتەکەمان بکەین. ئەویش ئەوەیە ئیتر ئێمە وڵاتەکەمان بەرەو ئەوە بەرین، کە دەسەڵاتی مەکتەبی سیاسی بەسەر ئەنجومەنی وەزیران و دەسەڵاتی دادوەرییەوە نەمێنێت.

لڤین: باست لەوەکرد کە گۆڕان لای ئێوە پرۆژەیە، ئایا نەخشەیەکتان بۆ ئەم گۆڕانکارییە هەیە، ڕوونتر بڵێین: ئەو جومگانەی کۆمەڵگا کامانەن کە بەبڕوای ئێوە پێویستیان بەگۆڕان هەیە؟

نەوشیروان مستەفا: لەسەروو هەموو شتێکەوە، گۆڕان لەوەی کە دەستوەردانی حیزب نەبێت، بەمانایەکی تر، جیاکردنەوەی حیزب لەحکومەت، دەستێوەردانی حیزب لەکاروباری پەرلەمان، ئەنجومەنی وەزیران، لەکاروباری دەسەڵاتی دادوەری، دەستێوەردانی حیزب لە زانکۆکان، دەستێوەردانی حیزبە لە بازاڕ، ئەمانە ئەو شتانەن کەدەبێت سنورێکیان بۆ دابنرێت، هەموو دەزگایەك لەو دەزگایانەی ئێمە هەمانە لە کوردستاندا، دەبێت ئەرکەکانی خۆی وەکو ئەوەی لە یاسای دەستووریدا باسکراوە لە هەموو دنیادا باوە، جێبەجێ بکات.

لڤین: ئەمانە هەموو ئەو قسانەن کە تاڵەبانی و بارزانیش دەیانکەن، بەڵام ئەمە چۆن دەچنە بواری جێبەجێکردنەوە؟

نەوشیروان مستەفا: پێموایە قسەکەی من تازەیە.

لڤین: بۆ نموونە مام جەلال پرۆژەیەکی هەیە بۆ جیاکردنەوەی حیزب لە حکومەت، کاك مەسعودیش لەچەند بۆنەیەکدا باسی ئەوەی کردووە کە دەبێت دەستێوەردان لە حکومەتدا نەبێت و سەربەخۆیی دادگاکان پارێزراو بێت، بەڵام لەسەر ئاستی واقیعی هیچکام لەمانە نەبینراون، پرسیاری خەڵکی ئەوەیە کە ئەم بانگەشانە چۆن

حیزب دەچنە بواری جێبەوجێکردنەوە، ئێوە چ میکانیزمێکی کردەییتان بۆ ئەم کارە هەیە؟



نەوشیروان مستەفا: من نازانم تاچەند نوسینەکان و بەرنامەکانی ئێمەت خوێندووەتەوە، ئەو مەسەلەیە کەئێمە باسیدەکەین، کە حیزب لەحکومەت جیابکرێتەوە، بەو ڕۆشنییەی کە ئێمە ئاماژەمان پێکردووە، کەسی دیکە باسی نەکردووە، هیچ لایەنێکی سیاسی باسینەکردووە، وەختێك ئێمە باسی ئەوە دەکەین کە پەرلەمان خاوەن دەسەلات بێت، لەوەی سێ ئەرکی سەرەکی هەیە جێبەجێی بکات، یەکێکیان یاساداناە، کە ئێستا دەیکات. دوو، ئەرکی تری ماون کە جێبەجێینەکردوون، یەکێکیان ئەوەیە کە هەمیشە لەپەرلەمان هەموو جێگاکانی دنیا ئەوانەن کە متمانە بە وەزیرەکان دەبەخشن و متمانەی لێدەسێننەوە. دەتوانن وەزیرەکان بۆ لێپرسینەوە بانگبکەن، لەکاتێکدا ئەرکەکانی جێبەجێنەکات متمانەی لێبسێنێتەوە، ئەمە یەکێکە لەو ئەرکانەی کە پەرلەمانەکەی ئێمە نەیتوانیوە بەتەواوەتی جێبەجێیبکات. ئەرکێکی دیکە ئەوەیە کە دەبێت ساڵانە داهات و خەرجی حکومەت بەوردی لێکۆڵینەوەی لەسەر بکات و بزانێت داهات چەندە؟ خەرج چەندە؟ چۆن خەرجکراوە؟ دەسەڵاتی ئەوەی هەبێت لە کەرتێکەوە بگوێزێتەوە بۆ کەرتێکی تر. پەرلەمان ئەم ئەرکەشی جێبەجێنەکردووە.

هەروەها دەسەڵاتی دادوەریمان هەیە، بەتەنیشت دەسەڵاتی دادوەرییەوە مەکتەبی کاروباری کۆمەڵایەتیی حیزبەکان هەیە، کە ئەوانیش کاروباری دادگا جێبەجێدەکەن. ئەمە پێویستی بەوەیە کە لە پەرلەماندا یاسا دەربکرێت کە کاروباری دادگا تەنیا دادگا بتوانێت بیبینێت، نەك لەتەنیشت ئەوانەوە دەسەڵاتێکی دیکەش هەبێت، ئەو شتانەی کە باسمانکردوون، ئەوانی دیکە لەوانەیە وەکو دروشم باسیان کردبێت، بەڵام وردەکارییەکانیان باسنەکردوون.

لڤین: واتە دەتانەوێت لەڕێگەی پەرلەمانەوە ئەو کارە بکەن؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ دەمانەوێت لەڕێگەی پەرلەمانەوە ئەو کارە بکەین.

لڤین: بەڵام خەڵکی دەڵێن بەشێك لە ئەندامانی پەرلەمان کە لەسەر لیستی [illegible]، کەسی نزیکی نەوشیروان مستەفان و خۆی دایناون، ئەگەر نەوشیروان مستەفا دەتوانێت ئەم کارە بە پەرلەمان بکات، بۆچی تا ئێستا ئەم کارەی نەکردووە؟

نەوشیروان مستەفا: دەگەڕێینەوە بۆ ئەوەی کەموکوڕی لەسیستەمی سیاسیی وڵاتەکەماندا هەیە، مەسەلە ئەوە نییە کەموکوڕی لەئەندامانی پەرلەماندا هەیە، زۆرێك لەئەندامانی پەرلەمان خەڵکی بەتوانا و لێوەشاوەن، پاشان هەرچەندە من پەشیمانیش نیم کە بەشێك لەوان من دامنابن، یاخود بەئیمزای من بوبن بەئەندامی پەرلەمان ئەوانە هەموویان مرۆڤی دڵسۆز و نیشتیمانپەروەرن، کەموکوڕی لە سیستەمی وڵاتەکەی ئێمەدایە کە لەسەروو ئەوانەوە شتێك هەیە پێی دەوترێت سەرکردایەتی سیاسی یان مەکتەبی سیاسی، دوا بڕیار بەدەست ئەوانە، بەدەست پەرلەمان نییە، کە پێویست بوو بەدەست ئەوان بێت.

لڤین: هەندێك دەڵێن نەوشیروان مستەفا جێگری مام جەلال بووە، جێگری سکرتێری یەکێتی بووە، ئەو کاتەی کە لەیەکێتیدا بوو بۆ ئەم کارانەی نەکردووە، کە ڕەنگە لەپۆستەکەیدا بیتوانیایە بیانکات؟

نەوشیروان مستەفا: ئێستا دوو جێگری هەیە، دەتوانیت بڕۆیت پرسیار لەجێگرەکانی بکەیت، کە دەسەڵاتیان چەندە؟

لڤین: هەندێك پێیانوایە لەدوای ئەوەی کە نەتانتوانی لەڕێگەی هەڵبژاردنە ناوخۆییەکانی یەکێتییەوە دەست بەسەر یەکێتیدا بگرن، ئێستا دەتانەوێت یەکێتی لاواز بکەن، دروستکردنی ئەم لیستەش بەبەشێك لەو کارە دەزانن؟

نەوشیروان مستەفا: ئەوە بۆچونێکی چەوتە، ئێمە بەنیازنین دەست بەسەر یەکێتیدا بگرین، ئێمە دەمانەوێت گۆڕانکاری لە هەموو وەزعی سیاسی هەرێمی کوردستاندا بکەین، گۆڕانکاری لە پەرلەمان و دەسەڵاتی جێبەجێکردندا بکەین، بەپێچەوانەوە، هەبوونی چەند لیستی جیاواز لەملململانێی سیاسی لەگەڵ یەکتری، بیروبۆچونی جیاواز لەناو پەرلەمان دەهێنێتە پێشەوە، ڕەنگە ئەوە یارمەتیدەر بێت بۆ ئەوەی

[illegible]یکی دیکە بەخۆیاندا بچنەوە، ئێمە نەداوامان لەکەس کردووە حیزبەکەی پارچە [illegible] بکات، نەداوامان لەکەس کردووە بکشێتەوە، نە بەتەمای ئەوە بووین شتێکی لێبکەین، منیش و هاورێکانیشم ماوەیەکی زۆر پێمانوابوو لە رێگەی ریفۆرمی ناو حیزبەوە، دەتوانین کاریگەریمان لەسەر ئەوە هەبێت کە بتوانین چاکسازی لەبارودۆخی گشتی کوردستاندا بکەین، دوای بەکردەوە بۆمان دەرکەوت کە چاکسازی لەناو حیزبدا ناکرێت، بەڵکو لەدەرەوەی حیزب دەکرێت بەپشتبەستن بەخەڵکی ناحیزبی و ئەو کەسانەی کە لەبنکەی حیزبەکاندا قازانجیان لە گۆڕیندایە.

لڤین: هەندێك دەڵێن کێشەی نەوشیروان مستەفا لەیەکێتیدا کێشەی دەسەڵات و کێشەی پارە بووە؟

نەوشیروان مستەفا: بەشێوەیەکی گشتی هەموو کێشەکان لە کوردستان کێشەی دەسەڵات و پارەن. کێشەی دەسەڵاتە بۆ ئەوەی دەسەڵاتێکی یاسایی کە عەدالەتی کۆمەڵایەتی جێبەجێبکات، بێتەکایەوە. کێشەی پارەشە بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی عەدالەت بەسەر خەڵکدا دابەشبکرێت، بۆ ئەوەی نە دەسەڵاتەکە بەخراپی بەکاربهێنرێت، نە پارەکە بەکاربهێنرێت.

بەبۆچونی ئێمە، تائێستا دەسەڵاتەکەش خراپ بەکاردەهێنرێت و پارەکەش خراپ بەکاردەهێنرێت. ئێمە لایەنگری ئەوەین کە پارە و دەسەڵات بە قازانجی خەڵك و عەدالەتی کۆمەڵایەتی بەکاربهێنرێت.

لڤین: لەناو یەکێتیدا دەسەڵات و پارە لەدەستی تۆدا لە چ ئاستێکدا بوون؟

نەوشیروان مستەفا: لەناو یەکێتیدا نەك من، رەنگە برادەری تریش دەسەڵاتی ئەوەی هەبوبێت، زەوی دابەش بکات، پارە بەسەر خەڵکدا دابەش بکات، پلەوپایە ببەخشێتەوە، بەڵام لەناو مەکتەبی سیاسیدا هەمیشە کەسی یەکەم بڕیاری سیاسی بەدەست بووە.

لڤین: تۆ هەرگیز کێشەی ئەوەت هەبووە داوای ئەوە بکەیت ببیتە سەرۆکی حکومەت یان سەرۆکی پەرلەمان و رێگری کرابێت؟

نەوشیروان مستەفا: من خۆم نەمویستووە، بەڵام دەمتوانی ببم.

لڤین: لە مانگی رابردوودا کاتێك ناوی لیستەکەتان لە کۆمسیۆنی تۆمارکرد، لەلایەن راگەیاندنی پارتی و یەکێتییەوە هێرشێکی توند کرایە سەرتان، پێتانوایە ئەو هەڵمەتەی کە کرایە سەر خۆتان و لیستەکەتان، هۆکارەکەی بۆچی دەگەڕێتەوە.

نەوشیروان مستەفا: پێموایە لە کۆمەڵێکی وەکو کۆمەڵی کوردیدا، ئەوانە شتی نائاسایین. ئەگینا لە وڵاتە دیموکراتەکاندا، ئەو هێرشی راگەیاندنە لە کاتی هەڵبژاردنەکاندا، شتێکی ئاساییە، لە کوردستانیشدا ئەگەر هێزی چەکداری بێلایەن بوایە و موڵکی حکومەت بووایە، نەك لەژێر دەستی حیزبدا بووایە، زۆر شتێکی ئاسایی بوو، بەڵام لەبەرئەوەی لەلای ئێمە هێزی چەکدار بێلایەن نییە، بۆیە شتێکی ئاسایی نییە.

لڤین: پێتوایە لە هەڵبژاردنەکاندا هێزی چەکداری کوردستان بێتە ناوەوە و لایەنگری لیستێك لە لیستەکان بکات؟

نەوشیروان مستەفا: هیوادارم شتی وا نەبێت.

لڤین: نەیارەکانت دەڵێن نەوشیروان مستەفا هەمیشە لە ململانێکاندا نەفەسی کورت بووە، بۆنموونە: لە دانوستاندنەکاندا، لەشەڕەکاندا، باس لەوە دەکەن کە لەململانێدا زوو بێزار دەبێت و وازدەهێنێت، ئایا ئەمجارە بە ئاسانی گۆڕەپانەکە بەجێدەهێڵیت؟

نەوشیروان مستەفا: من لەکاتی پێشمەرگایەتیدا (١٥) ساڵ لەشاخ بووم، لەدوای راپەڕین کاتێك هاتووەتە سەر دابەشکردنی دەستکەوت و پلە و پایە لەو کاتەدا و لەکاتی شەڕی ناوخۆدا، من بۆم بەجێهێشتوون، پێشموایە ئەو کارەم جێگەی سەربەرزییە، بەجێهێشتنی مەیدانەکە لەبەر نەفەسکورتی نەبوو، لەبەر نارەزایەتی بوو، لەبەرئەوە هەندێکجار لەبەر نارەزایەتی بووە کە بەجێمهێشتووە، نەمویستووە ململانێبکەم، نەمویستووە پێکدادانی چەکداری بکەم.

لە هەموو زەمەنێکدا شتی یەکەم هەیە و ئەولەویات هەیە. لەسەردەمێکدا پارێزگاری

لەیەکێك، ئەولەویەتی هەبووە، لەسەردەمێکی دیکەدا، پارێزگاریکردنی هەرێمی کوردستان ئەولەویەتی هەبوو، لەبەرئەوە چاوپۆشیمان لە زۆر شت کردووە و پێمان لە زۆر شت ناوە، وازمان لە زۆر شت هێناوە، لەسەردەمێکدا لەپێناو قەوارەی یەکێتی نیشتیمانی و لەسەردەمێکی دیکەدا، لەپێناو قەوارەی گەلی کوردستاندا، بۆ خۆشبەختی ئەو دوو قەوارەیە ئێستا هیچ مەترسییەکیان لەسەر نەماوە، بۆیە دەتوانم ئێستا بە ئازادی جولە بکەم.

لڤین: پێتوایە لەئێستادا مەترسی لەسەر هەرێم نەماوە؟ ئەی مەترسی دەرەکی؟

نەوشیروان مستەفا: وەکو جاران نییە، گرنگترین شت بۆ ئەوەی کە بتوانیت بەرەو رووی مەترسی دەرەکی ببیتەوە، ئەوەیە کە جەبهەی ناوخۆیی خۆت بەهێز بێت، دەبێت متمانە بگێڕیتەوە بۆ نێوان خەڵك و حکومەت، خەڵك حکومەت بەهی خۆی بزانێت و حکومەتەکەش جێگەی متمانە و باوەڕی خەڵك بێت، ئەگەر جەبهەی ناوخۆیی بەهێز بوو ، ئەو کاتە ئەگەر مەترسی لەدەرەوەش هەبوو، پێموایە ئەسڵەن ئەهمیەتی نییە، بۆ نموونە: دەوڵەتێکی وەکو ئەمەریکا هەمیشە دەڵێت مەترسی دەرەکیم لەسەرە، روسیا دەڵێت مەترسی دەرەکیم لەسەرە، هەمیشە کەوەختێك تیۆری ئاسایشی نەتەوەیی خۆیان دادەنێن، لەسەر بنەمای مەترسی دەرەکی و ناوەکی دایدەڕێژن. دەوڵەتێك هەرچەندە بەهێزیش بێت، خۆی بەبێبەش نازانێت لەوەی کەمەترسی دەرەکیی لەسەر بێت. دەبێت گومان بکات کە مەترسی دەرەکی لەسەرە، بەڵام شێوازەکانی گۆڕاون لەگەڵ (١٠) ساڵی لەمەوپێشدا.

لڤین: رات چییە لەسەر متمانەی نێوان خەڵك و دەسەڵات؟

نەوشیروان مستەفا: پێموایە متمانە لەنێوانیاندا نەماوە، دەلاقە کەوتووەتە نێوانیانەوە.

لڤین: دوایەمین نوسینی خۆت پێشکەشی ئەوانە کردووە کە تۆ بە ئەندازیاری شەڕی ناوخۆ دەزانن، لێکدانەوەی تۆ چییە بۆ ئەم بابەتە؟ بۆچی هەندێك دەیانەوێت تۆ وەکو ئەندازیاری شەڕی ناوخۆ بناسێنن؟

نەوشیروان مستەفا: ئەوانە دوو جۆرن، جۆرێکیان بڕیاری پێشوەختیان داوە

[illegible] من بکەن. کاری باش بکەم و کاری خراپ بکەم، ئەوان لەقەناعەتی خۆیان ئەو بڕیارەیانداوە، من ناتوانم قەناعەتی ئەوان بگۆڕم، بەڵام توێژێکی دیکەش لەناو خەڵکدا هەیە، کە کەوتونەتە ژێر پڕوپاگەندەی نەیارەکانەوە. بۆ نموونە: کە باسی ئەوە دەکەن کە ئەندازیاری شەڕی ناوخۆیە، هەندێك کەس هەیە ئاگاداری ڕووداوەکان نییە، ڕەنگە بڕوا بکات. من بۆیە ئەو یاداشتانەم بڵاوکردەوە کەدوای خوێندنەوەی خوێنەران خۆیان داوەری بکەن، کەسێکی بێلایەن بتوانێت داوەری بکات، ئایا بەڕاستی وەکو نەیارەکانی من دەڵێن، من ئەندازیاری شەڕی ناوخۆ بووم یان ئەندازیار نەبووم؟!

لڤین: بەبڕوای تۆ بەکارهێنانی ئەم کارتە (واتە کارتی شەڕی ناوخۆ)، کارتێکی بێبەهایە لەهەڵبژاردندا؟

نەوشیروان مستەفا: من تەمەنای ئەوەم دەکرد ئێستا گفتوگۆ لەسەر سبەینێ و دوو سبەی بکەین، نەك گفتوگۆ لەسەر پێرێ و بەسرپێرێ، من خۆم لایەنگری ئەوەبووم گۆڕی ڕابردوو هەڵنەدەینەوە، بەڵام کاتێك کە خەڵکی تر بۆ مەبەستێکی دیاریکراو و بۆ مەبەستێکی سیاسی بیانەوێت ڕابوردوو هەڵبدەنەوە، ئێمە لەڕابردووی خۆمان ناترسین. لەبەر ئەوە هیچ شتێکمان نییە.

لڤین: بەپێی یەکێك لەو بەڵگەنامانەی لەبەردەستی (لڤین) دان، کە فاکسێکی تۆیە لەئیرلەنداوە بۆ مەکتەبی سیاسیت ناردووە، لەدوای ڕێککەوتنی دبلنی نێوان یەکێتی و پارتی. بەئاشکرا وتووتە جارێکی دیکە بەشداری دانوستاندن لەگەڵ یەکێتی و پارتی ناکەیت، ئایا ئەمە مانای ئەوە ناگەیەنێت کە تۆ دانوساندنت ڕەتکردووەتەوە؟

نەوشیروان مستەفا: هێشتا ئەو بەشەم لەیاداشتەکان بڵاونەکردووەتەوە، ئەو کاتەی ئەو بەشەم بڵاوکردەوە، دەتوانیت ئەو پرسیارەم لێ بکەیت.

لڤین: هۆکار چییە کە لەبڵاوکردنەوەی یاداشتەکانت وەستایت؟

نەوشیروان مستەفا: بۆ ئەوەی گرژی زیاتر نەبێت، وەستاندمن.

لڤین: دوای دروستکردنی لیستەکەت، پەیوەندی خۆت لەگەڵ یەکێتی لە چ

ئاستێکدایه؟



نەوشیروان مستەفا: لەسەر ئاستی شەخسی پەیوەندییەکانم ئاسایین، چونکە من ساڵانێکی دورودرێژە لەگەڵ هەموو ئەوانەدا هاوڕێ و هاوسەنگەر بووم و پێکەوە کارمانکردووە، ئێستا بۆچونی سیاسیمان جیاوازە، ئەگینا هیچ کێشەیەکی ترمان نییە، بەڵام بەداخەوە کە لە رۆژنامەکاندا هەندێك جار هێرش و شتی وا دەکرێت، من پێموایە جۆرێك لەبێویژدانی هەیە.

لڤین: چ رێوشوێنێك دەگریتەبەر بۆ ئەوەی لە هەڵبژاردنەکاندا دەستێوەردانی سەربازی روونەدات؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە پەنا دەبەینە بەر دادگا، پەنادەبەینە بەر یاسا. ئەگەر پێویستیشی کرد، پەنا دەبەینە بەر دەسەڵاتی دادوەری بەغدا، ئێمە بەهیچ جۆرێك باوەڕمان بەوە نەماوە کە چەك و توندوتیژی بەکاربهێنرێت، پێمانوایە پاراستنی ئاسایشی پرۆسەی هەڵبژاردن لە سەرەتاوە تا کۆتایی، لەئەستۆی حکومەتی هەرێمی کوردستاندایە.

لڤین: پێشبینیدەکەیت لەهەڵبژاردندا هیچ گرژی و کارێکی نائاسایی رووبدات؟

نەوشیروان مستەفا: هیوادارم بەشێوەیەکی ئاسای بەرێوە بچێت.

لڤین: بەتێڕوانینی تۆ رکابەریی نێوان لیستەکانی هەڵبژاردن چۆن دەبێت؟

نەوشیروان مستەفا: دەبێت چاوەڕێ بکەین، ئومێدم وایە بەسەرکەوتوویی کۆتاییبێت.

لڤین: چ جیاوازییەك لەنێوان ئەم هەڵبژاردنە و هەڵبژاردنەکانی پێشوودا دەبینیت؟

نەوشیروان مستەفا: قۆناغەکە گۆڕاوە، لەقۆناغەکانی پێشوودا سەردەمێك ئەولەویەت بە پارێزگاریکردنی قەوارەی حیزب دەدرا، سەردەمێکی تر بۆ پارێزگاریکردن لە قەوارەی هەرێم بوو، ئێستا قەوارەی حیزب و هەرێم پارێزراوە، ململانێیەکی سیاسی لەنێوان بۆچونی سیاسی جیاواز لەسەر جۆری بەرێوەبردنی حکومەت و لەسەر ئیدارەی دەوڵەت هەیە.

لڤین: بەنیازن بچنە حکومەت یان وەك ئۆپۆزسیۆن دەمێننەوە؟

نەوشیروان مستەفا: ئەوە بەندە بەوەی چەند کورسی لە پەرلەمانی داهاتوودا بەدەست دەهێنین. ئێمە هەوڵدەدەین دەسەڵات بگرینەدەست لەلای ئێمە تەنیا خەون نییە، بەڵکو هەوڵیشی بۆ دەدەین.

لڤین: لەم هەڵبژاردنەدا بە چ ئەنجامێکەوە بێیتە دەرەوە، خۆت بە سەرکەوتوو دەزانیت؟

نەوشیروان مستەفا: هەر شتێك میللەتەکەم هەڵیبژێرێت، من بەسەرکەوتنی دەزانم.

لڤین: هەندێك دەڵێن ئەگەر لیستی گۆڕان لە ئاستی ئەو چاوەڕوانییەی کە هەیەتی، دەنگ نەهێنێت، ئەوکات نەوشیروان مستەفا بە ئێجگاری دەچێتە دەرەوە و کوردستان جێدەهێڵێت.

نەوشیروان مستەفا: بۆچی دەچمە دەرەوە، هەلومەرجێکی ئاسایی هەیە، نەشەڕی ناوخۆ هەیە، نە کێشە هەیە، خەڵك چۆن بیردەکاتەوە، کەیفی خۆیەتی.

لڤین: واتە مەیدانەکە بەجێناهێڵیت؟

نەوشیروان مستەفا: بێگومان بەجێیناهێڵم، نەخێر.

[illegible] نایەوێت نەوشیروان مستەفا هەڵبژاردن بباتەوە

لەبەرامبەر نەوشیروان مستەفا و چوار حیزبەکە، ئێران پشتگیری لیستی یەکێتی و پارتی دەکات، نایەوێت دۆخی سیاسیی هەرێم بگۆڕرێت.

## راپۆرتی شیکاریی ئەحمەد میرە

ئەگەر هەڵبژاردنی داهاتووی کوردستان کە لە ٢٠٠٩/٥/١٩ ئەنجامدەدرێت، ئەوا دەبێتە تاکە هەڵبژاردن لە کوردستاندا کە لەماوەی ١٨ ساڵی رابردوودا پڕ کێبرکێیانە ئەنجام بدرێت، چونکە لەم هەڵبژاردنەدا لیستە جیاوازەکان بەهێزتر و کاریگەرتر ملململانێدەکەن و چەندین لیستی بەهێز لە دەرەوەی یەکێتی و پارتی دێنە مەیدانەکەوە، ئەوەی روونە تائێستا نەوشیروان مستەفای جێگری پێشووی تاڵەبانی بەتەنیا خۆی بێهاوپەیمانی لەگەڵ لیستی تردا دەچێتە ناو ناو ململانێی هەڵبژاردنەکانی کوردستانەوە، زانیارییەکان لەنزیکی گردەکەوە ئاماژە بۆ ئەوەدەکەن دۆخی ناوخۆی یەکێتی هەر گۆڕانێکی بەسەردا بێت کارناکەتە سەر ئەوەی نەوشیروان مستەفا لە لیستەکەی پەشیمانبێتەوە.

گردەکە حوکم دەگرێتەدەست؟

گردەکەی زەرگەتە لەسلێمانی تائێستا نەوشیروان مستەفا و هاوڕێکانی لێیەوە دەڕواننە ئایندەی سیاسیی کوردستان، رەنگە هەڵبژاردنی داهاتوو بیکاتە شوێنێکی گرنگ لە حوکمڕانیی کوردستان و شوێنی قەلاچۆلان و سەری رەش بگرێتەوە.

نەوشیروان مستەفا و باڵەکەی ئەمجارە بەهەموو هێزی خۆیانەوە دێنە مەیدانی ململانێوە، بەجۆرێك رەنگە زەبر و زەنگی پارتی و یەکێتی نەتوانێت پاشەکشێیان پێبکات، پێدەچێت بانگەوازی قۆناغی نهێنی تێبپەڕێنن و سیاسەتی مەسیح پەیڕەو نەکەن و لەکاتی لێدانی زللەیەکدا رووەتەکەی تریان رانەگرن بۆ زللەیەکی تر، بەڵکو رەنگە سیاسەتی لەکوێوە زەبر هەبوو لەوێ زەبر هەیە بۆ وەڵامدانەوە پەیڕەوبکرێت.

نەوشیروان مستەفا لەم هەڵبژاردنەدا چاوی لەوەیە کە بتوانێت دەنگی جەماوەری بزاری کوردستان بەدەستبهێنێت و بەقورساییەکی زۆرەوە بچێتە هەڵبژاردنەوە، هەرچەندە بەوتەی کەسەکانی نزیك لە نەوشیروان بەبۆچوونی ئەو گۆڕان لەوەدا خۆی نابینێتەوە کە ژمارەیەکی زۆر ئەندام پەرلەمان هەبێت، بەڵکو رەنگە ئەو بەنیازبێ بە ژمارەیەکی کەمیش ئاگر لەخەرمانی بەرژەوەندی حیزبیی دەسەڵات بەربدات.

خەملاندنە سەرەتاییەکان لە بەرژەوەندیی لیستی نەوشیروان مستەفادان، ئاماژەکان بۆ ئەوە دەچن کە لیستەکەی نەوشیروان مستەفا دەتوانێت بەلایەنی کەمەوە لە ١٥٪ ی دەنگەکان بەدەستبهێنێت، بەڵام رەنگە هێنانی کورسی زۆر و کەم کارنەکاتە سەر بەرنامەکەی نەوشیروان مستەفا لە هەڵبژاردنی داهاتوودا، ئەگەر لیستەکەش نەتوانێت رێژەیەکی زۆر بەدەستبهێنێت بەچەند کورسییەکی کەمەوە دەیەوێت کاری زۆر بەو دەنگە نارازیانە بکات، کە دەنگێکن لەسەر رابردووی خەباتی نەوشیروان مستەفا دەچنە پەرلەمانەوە و رەنگە ببنە دەنکە شقارتەیەك کە کاری گەورە بەدوای خۆیاندا بهێنن.

نەوشیروان مستەفا پیشت بەکێ دەبەستێت؟

رەنگە ئەمجارەیان نەوشیروان مستەفا سیاسەتی هەڵەی سەرەتای راپەڕین دووبارەنەکاتەوە، کەپشتی لەعەشایەر و خەڵکی رابردوو خراپ کرد، چونکە لەهەڵبژاردندا دەنگەکان بەباش و خراپیەوە یەکسانن بەیەك ، هەربۆیە ئەوەی پێشبینی دەکرێت نەوشیروان مستەفا پشت بەکەسانی عەشایەر و کەسایەتی دیاری کۆمەڵایەتی و ئەکادیمییەکان و گەنجە نوسەرەکان ببەستێت، بەتایبەتی لەناوچەی هەولێر و دهۆك، نەوشیروان دەتوانێت سود لە عەشیرەتە گەورەکانی دەڤەرەکە وەربگرێ، ئەگەر نەوشیروان مستەفا لەمەدا سەرکەوتووبێت، ئەوا لەهەڵبژاردنەکاندا گورزێکی گەورە لەپارتی دەدات.

ئایا یەکێتی و پارتی دەتوانن تەزویر بکەن؟

هەڵبژاردنەکانی پێشوودا یەکێتی و پارتی بەئاسانی توانیویانە گزی (غش) بکەن، لەو ڕووەوە شارەزاییەکی باشیان هەیە، بەڵام ئەوەی لەم هەڵبژاردنەدا ڕەنگە ببێتە ڕێگرێکی سەرەکیی بەردەمیان، بریتییە لە خودی نەوشیروان مستەفا و باڵەکەی، کەڕەنگە لەتەواوی فێڵی غەشکردنی ئەوان شارەزا بن، هەربۆیە دەوترێت کە نەوشیروان مستەفا پێشت بە فەرماندە سەربازییەکانی باڵەکەی خۆی دەبەستێت و بەنیازە لەسەر هەر سندوقێکی دەنگدان پێشمەرگەیەکی دێرین دابنێت، بۆ ڕێگە گرتن لە گزیکردن.

لیستی سێبەر

نەوشیروان مستەفا لەهەموو بارێکدا لیست بۆ هەڵبژاردن دروست دەکات، وەك دەوترێت لەحاڵەتی گەڕانەوەشدا بۆ ناو یەکێتی لیستی سێبەر لە ڕۆشنبیران و نوسەران دروستدەکات، کە ڕەنگە جەمال عەبدول سەرۆکایەتیی بکات.

نەوشیروان مستەفا و چوار حیزبەکە

هەرچەندە بەرپرسێکی باڵای باڵی نەوشیروان لەلێدوانێکی ڕۆژنامەوانیدا ڕایانگەیاندووە کەبەهیچ جۆرێك هاوپەیمانی لەگەڵ حیزبە ئیسلامییەکاندا ناکەن، بەڵام ئاماژە کان بەرەو ئەوەن کە ڕاستە هاوپەیمانی ڕوونادات لەنێوان لیستەکەی نەوشیروان و ئیسلامییەکاندا، بەڵام ڕەنگە ڕێککەوتنی گرنگ لەنێوانیاندا ئەنجامبدرێت، سەرەڕای ئەوەی کە تائێستا نەوشیروان مستەفا و چوار حیزبەکە پێکەوە دانەنیشتوون، ڕەنگە ڕێککەوتنەکە لەسەر تەکنیکی هەڵبژاردن بێت، جیاوازییە قووڵە ئایدۆلۆژییەکانی نێوان نەوشیروان مستەفا و ئیسلامییەکان ڕێگری سەرەکین لەبەردەم هاوپەیمانیدا، هەروەها جیاوازییە قووڵە سیاسییەکانی نێوان دوو حیزبەکەی تر نەوشیروان مستەفا هەمدیسان ڕێگرێکی ترن لەبەردەم دروستبوونی هاوپەیمانێتیدا، لەبەرامبەریشدا چوار حیزبەکە لەڕووی ئەمنییەوە هەست بەمەترسی دەکەن، ئەگەر لەگەڵ نەوشیروان مستەفادا هاوپەیمانی ببەستن، چونکە دەستبردن بۆ هاوپەیمانی لەگەڵ نەوشیروان مستەفادا واتە بەشداریکردن لە لەتکردنی یەکێتیدا، کە

بەرچونی دەسەڵات مەترسییەکی گەورەیە و هەرلایەك بەشداربێت تێیدا دەبێت کەی بدات، سەرەڕای ئەو نزیکییە سیاسییەی نێوان نەوشیروان مستەفا و چوار حیزبەکە ئێستا ئەو بۆچوونە لەئارادایە کە نەوشیروانیش دەیەوێت ریزی چوارحیزبەکە پەرت بکات ، چونکە راستەوخۆی بەهێزی دوای یەکێتی و پارتییان دەزانێت، بۆیە دەوترێت کە رۆژی ٥ شەممە ٢٠٠٩/٢/٢٢ نەوشیروان مستەفا وەفدێکی بەسەرۆکایەتی مام رۆستەم و خەلیل سەرکانی (دوو فەرماندەی سەربازیی ناسراوی باڵەکەین) ناردووە بۆ مەکتەبی سیاسیی حیزبی سۆسیالیست و داوایان لە محەمەدی حاجی مەحمود کردووە تا لە هاوپەیمانی لەگەڵ سێ حیزبەکەی تر پەشیمانببێتەوە، بەڵام کاکە حەمە ئەم داوایەی رەتکردوونەتەوە و وتویەتی بەڵێنمانپێداون.

نەوشیروان مستەفا و کاڵکردنەوەی یەکگرتوو

رەنگە لیستی نەوشیروان مستەفا بتوانێت پشکێکی گەورەی بەرەی ئۆپۆزسیۆن بۆ خۆی بەرێت و ناوی یەکگرتوو وەکو ئۆپۆزسیۆنی پلە یەك کاڵبکاتەوە، بەڵام بەلای یەکگرتووەوە دابەزینی نەوشیروان لەهەمانکاتدا دەبێتە هاوکارێك بۆ کەمکردنەوەی فشاری ئەمنی لەسەریان و لەپەرلەمانیشدا دەبێتە پاڵپشتێکە گەورە بۆیان.

ئایا چوار حیزبەکە پێکەوە دادەبەزن

هەرچەندە تائێستا چوار حیزبەکە یەکلانەبوونەتەوە لەسەر ئەوەی ئایا بەیەك لیست دادەبەزن یاخود بەجیا، بەڵکو ئێستا لەدڵەڕاوکێی سیاسییدا دەژین و زۆرجاریش خۆیان لەیەکتری بەدوور دەگرن.

گەورەترین گرفت لەبەردەم لیستی هاوبەش لەوەدایە کە پێکهاتەی لیستەکە چۆن بێت؟ پاش هەڵبژاردن دەسکەوتەکانی لیستەکە چۆن بەشبکەن؟ پەیوەندییەکانیان لەگەڵ یەکێتی و پارتی سەرچاوەیەکی تری مەترسی بەردەم دروستبوونی لیستی هاوبەشە، بۆنموونە نێچیرڤان بارزانی گلەیی زۆری لەدارا حەمەئەمینی وەزیری ژینگە

ئەسە، لیستی کۆمەڵی ئیسلامی کردووە، کەچۆن دەچنە ناو لیستی چوار حیزبەکەوە؟ لەکاتێکدا کۆمەڵێك ئیمتیازی گەورەیان داوە بە کۆمەڵ، ڕەنگە پارتی لەکاتی هەڵمەتەکانی هەڵبژاردندا ئەم کارتە رابکێشێت و کاردانەوەی خراپی بەسەر لیستی هاوبەشەوە هەبێت، ئەمە سەرەڕای فشار و پێدانی ئیمتیازات بەچوار حیزبەکە کە لەهەموو کاتێکدا ئەگەری بەهێزە بۆ هەڵوەشاندنەوەی لیستی هاوبەش.

ئەگەری گەورەبوونی لیستەکە

تائێستا چوار حیزبەکە کە لەسەر لیستێکی هاوبەش ڕێکنەکەوتوون و کێشەی زۆریان هەیە و لیدوانی بەرپرسە باڵاکانیان جیاوازیی زۆری تێدایە، بەڵام ڕەنگە لەساتەوەختی ڕاگەیاندنی لیستی هاوبەشدا چوار حیزبەکە بیر لەفراوانکردنی لیستەکەیان بکەنەوە بەجۆرێك زۆرترین حیزب و کەسایەتیی نارازی لەخۆ بگرێت.

ئێستا باس لەوە دەکرێت کە لەرێی حیزبی زەحمەتکێشانەوە چەپەکان بانگبکرێن و تەنانەت لەگەڵ پارتی چارەسەری دیموکراتی کوردستان (باڵی باشوری کوردستانی پەکەکە) قسەیانکردووە، بەڵام ترسیان هەیە لەوەی کە هێنانە ناوەوەی ئەم دوو ڕەوتە لە ڕووی هەرێمییەوە بەتایەت لەگەڵ ئێران و تورکیا کێشە بۆ چوار حیزبەکە دروستبکات، چونکە ئەوان لەدەسەڵاتدا نین و زۆر بەوردییەوە مامەڵە لەگەڵ ئەم دۆخەدا دەکەن، لەلایەکی ترەوە هەوڵدەدەن کە بزوتنەوەی ئیسلامیی بهێننە ناو لیستی چوار حیزبەکەوە، ئەمەش دەبێتە پاڵپشتێکی گرنگ بۆ ڕاکێشانی دەنگی ئیسلامییەکانی تر بۆ لیستەکەیان، ئەمە لەکاتێکدا پارتی لەهەوڵی بەکارهێنانی بزوتنەوەی ئیسلامیدایە وەك کارتێك لە بەرامبەر یەکگرتووی ئیسلامی و کۆمەڵی ئیسلامی.

هەروەك دەوترێت تاڵەبانی لە تاران بەچاودێری ئێرانییەکان لەگەڵ عیرفانی مەلا عەلیدا کۆبووەتەوە بۆ ئەوەی بزوتنەوەی ئیسلامیی لەگەڵ لیستی پارتی و یەکێتی دابېەزێت، ئەم ئەگەرە زۆر نزیکە سەربگرێت، چونکە وەك بەشێك لەداوای ئێرانییەکان حسابی بۆ دەکرێت، بزوتنەوەش بۆ خۆی هێزێکی بچووك و پەرتەوازەیە

[illegible]وای پاڵپشتی بەهێزدا دەگەڕێت، تاوەکو هەر هیچ نەبێت نووزەیان بباتەوە ناو [illegible]مەت و پەرلەمان.



ئەگەری جیابوونەوەی چوار حیزبەکە لەیەکتری

ئێران نیگەرانە لەپێکەوە کۆبوونەوەی سێ دۆستەکەی خۆی (یەکگرتوو، کۆمەڵ و سۆسیالیست) لەگەڵ هێزێکی چەپی وەکو زەحمەتکێشان کە ڕەنگە کاربکاتە سەر پەیوەندی چوار حیزبەکە و ئێران، هەروەها کۆمەڵی ئیسلامیی چاوی لەوەیە کە بەهۆی فراوانبوونی بنکەی جەماوەرییەکەیەوە بیەوێت هێزی خۆی تاقیبکاتەوە. ئەمە بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە کۆمەڵی ئیسلامی لەهەڵبژاردنی پێشوودا دوو سەرچاوەی گرنگی دەنگ کۆکردنەوەی هەبوو لەم هەڵبژاردنەدا لەدەستیداون، یەکەمین گرتنی ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامی (م.عەلی باپیر) بوو، وەك چەکی مەزلومی خۆیان بەکاریانهێنا بۆ ڕاکێشانی سەرنجی موسوڵمانانی کوردستان، دووەمیشیان ئەوەبوو یەکگرتووی ئیسلامی لە لیستی هاوپەیمانیدا بوو، ئەمەش سەرچاوەیەکی گرنگ بوو بۆ ڕاکێشانی دەنگی ئەندامان و لایەنگرانی یەکگرتوو بەلای خۆیدا، بەتایبەتی کە کورسییەکانی یەکگرتوو لە لیستی هاوپەیمانیدا جێگیربوون.

هەربۆیەش ئێستا لەبیری ئەوەدان لە ئەگەری نەبوونی لیستی هاوبەشدا لەژێر دروشمی (واعتصموا بحبل الله) بچنە هەڵبژاردنەوە، ئەمەش لەئێستاوە هەوڵێکە بۆ ڕاکێشانی سەرنجی موسوڵمانانی کوردستان، هەروەها یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان توشی غرورێکی گەورەبووە و دەیەوێت هەیبەتی خۆی بەسەر سێ حیزبەکەی تردا بسەپێنێت، لەڕێی زۆری ژمارەی ئەندامانی لەپەرلەمان و حکومەتدا لەچاو حیزبەکانی تر. هەروەها دەنگی زۆری ئەوان لەهەڵبژاردنەکانی پێشوودا و فراوانیی بنکەی جەماوەری ئەوان لەناوچەی بادینان کە حیزبەکانی تر بوونیان نییە لەو ناوچەیە.

ئێران دژی لیستەکەی نەوشیروان پشتگیریی یەکێتی و پارتی دەکات

ڕۆژبەڕۆژ پارتی ویەکێتی زیاتر دەگەڕێنەوە باوەشی ئەو دۆستە پشتشکێنەیان، کە

[illegible]ێکی زۆرە بەجێیانهێشتووە، دوای گۆڕانی هەڵوێستی ئەمەریکا بەرامبەر بەکورد و ستراتیژی نوێی لەناوچەکەدا، پارتی و یەکێتی دەیانەوێت جارێکی تر بگەڕێنەوە باوەشی تاران.

هەرچەندە دەبێت ئەو راستییە بزانین کە ئێران لەمامەڵەی ئێزدیواجیانەی پارتی و یەکێتی نیگەرانە، چونکە هەر رۆژە و لەسەر ئاوازێکی سیاسی گۆرانی دەچڕن، کە ئاوازێکە لەگوێی سیاسی ئێراندا زبر و ناخۆشە، بەڵام ئێران لەترسی گۆڕینی هاوکێشە سیاسییەکان لە کوردستاندا رەنگە ئەمجارەش باوەشیان بۆ بگرێتەوە، ئێران بەبیانووی تێکچوونی ئاسایشی ناوچەکە حەز بەگۆڕانی هاوکێشەی سیاسیی هەرێم ناکات، بەبۆچوونی ئەوان هەڵبژاردنەکانی ئەمجارەی کوردستان دۆخی سیاسیی هەرێم دەشڵەقێنن، ئێرانییەکان بڕوایان وایە کە لەرێگەی مەدەنییەوە هیچ هێزێك ناتوانێت گۆڕان لەهەرێمدا دروستبکات، لەبەرئەوە هەمیشە بۆ یەکلایکردنەوەی هاوکێشەکان هێزی چەك دێتەپێشەوە، ئەمە لەکاتێکدا ئەگەری بەکارهێنانی هێزی چەکداریی لە کوردستان ئەگەرێکی لاوازە، چونکە دۆخی هەرێم و ناوخۆیی بوار بە بەکارهێنانی چەك نادات و ئەمەریکیەکانیش بەردەوام دژی بەکارهێنانی هێزن لەیەکلایکردنەوەی کێشەکانی ناوخۆی عێراقدا، ئێران لەم قۆناغەدا بەدروستبوونی لیستی نەوشیروان مستەفا بۆ هەڵبژاردنەکانی داهاتوو نیگەرانە و سڵی لێدەکەنەوە، پێیانوایە لەئەگەری دروستبوونی لیستێکدا کە نەوشیروان مستەفا سەرکردایەتی بکات، لەوانەیە دۆخی سیاسیی هەرێم بگۆڕێت و زیان لەبەرژەوەندییەکانی ئەوان بدات، چونکە نەوشیروان مستەفا ئەوەی تائێستا روونە دوای دەستلەکارکێشانەوەی لەجێگری سکرتێر هیچ پەیوەندییەکی ژێربەژێری لەگەڵ ولاتانی دراوسێی هەرێمدا نەکردووە، ئەم هەڵوێستەی نەوشیروان مستەفا پێچەوانەی هەموو ئەو هەڵوێستە سیاسییە یاخیانەیە کە لەمێژووی سیاسیی کوردیدا روویانداوە، کە هەمیشە هێزە یاخییەکان بۆ بەهێزکردنی پێگەی خۆیان پشتیان بەهێزی دەرەکی بەستووە، ئەمەش وایکردووە کە ئێرانییەکان بەگومانەوە لە نەوشیروان مستەفا و سیاسەتەکەی بڕوانن

بەردەوام وەکو سەرچاوەی نیگەرانی سەیری دەکەن، پێیانوایە نەوشیروان مستەفا تاکە سیاسیی کوردە کە لەگەمە سیاسییەکاندا زەمانەتی نییە، هەرچەندە ئەو بەپێی بیرورِا بڵاوکراوەکانی خۆی دەیەوێت ئاستی پەیوەندییە دیبلۆماسییەکانی بەرزبکاتەوە، ئەوە بەدنیای دەرەوەی هەرێم بڵێت کە ئەو دژی رێککەوتنەکانی کورد و لایەنەکانی دەرەوەی تری هەرێم نییە.

نەوشیروان مستەفا بەدرێژایی مێژووی پەیوەندییەکانی ئێران و یەکێتی نیشتیمانی ئەندازیاری رێککەوتنەکان بووە و رۆڵی گەورەی گێراوە لەراگرتنی پەیوەندییەکی سەرکەوتوو لەگەڵ ئێراندا، لەگەڵ ئەوەشدا نەوشیروان مستەفا سیاسییەکە کە درەنگ متمانە بە بەرامبەرەکانی دەکات، تەنانەت لەهەڵوێستی ئەمەریکییەکانیش بەرامبەر بەکێشەی کورد، دوردونگە و بروای بەپاڵپشتی ئەوان نییە.

هەرچەندە ئەمەریکا بۆ گۆڕینی دۆخی سیاسیی چاوی لەسەر نەوشیروان مستەفا و لیستەکەیەتی ئەویش دەیەوێت ئەو سەرەنجە لەسەر خۆی لابەرێت کە نەیارەکانی لای ئەمەریکا و هێزەکانی تر بۆیان دروستکردووە، ئەویش سەپاندنی پێناسەی توندڕەوییە بەسەریدا.

وەکو دەوترێت لەیەك کاتدا هەم ئەمەریکا هەم ئێرانیش لەگەڵ مانەوەی یەکێتی و پارتیدان لەدەسەڵاتی هەرێمدا، چونکە دەتوانین باش بەرژەوەندییەکانیان بپارێزن، بە تایبەتی کە ئەمەریکییەکان خول بۆ کادیرانی یەکێتی و پارتی دەکەنەوە بۆ ئەوەی فێریانبکەن چۆن لەهەڵبژاردنەکاندا براوە دەبن، هەروەها تاڵەبانی هەموو قورسایی دیبلۆماسیی خۆی و پۆستی سەرۆك كۆماری بەکارهێناوە بۆ لێدانی پێگەی نەوشیروان مستەفا و باڵەکەی لەلای ئەمریکی و ئێرانییەکان، چونکە تاڵەبانی باش لەو راستییە گەیشتووە کە هیچ هێزێك ناتوانێت لە کوردستاندا گەورە ببێت و گەشە بکات بەمەرجێك ئێرانی لەپشت نەبێت، هەربۆیەش هەوڵدەدات نەوشیروان مستەفا لەلای ئێرانییەکان بشکێنێت و لەناوخۆی کوردستانیش لەرێگەی هەڵمەتی میدیاییەوە وایکردووە کە لەدیدی پارتیدا نەوشیروان مستەفا وا بناسێنێت، کە

گەورەبوون و گەشەسەندنی خۆی و باڵەکەی پێش ئەوەی مەترسی بێت بۆسەر یەکێتی مەترسییە بۆسەر پارتی.

بەپێی زانیارییەکانی لڤین تاڵەبانی لە تاران دوای لە کاربەدەستانی ئەو وڵاتەکردووە کە پاڵپشتی رێککەوتنی ستراتیژی نێوان یەکێتی و پارتی بن و دژی گۆڕانی دۆخی سیاسیی هەرێمی کوردستان بووەستنەوە، هەڵوێستی ئاشکرای قەرارگای رەمەزان و مەکتەبی خامنەیی لەئێستادا بەم جۆرەیە، بەڵام رایەك هەیە کەپێی وایە وەزارەتی ئیتلاعاتیش لەم رووەوە بەرنامەیەکی دیکەی هەیە و پێیباشە هێزگەلی جیاواز لە یەکێتی و پارتی لەم هەڵبژاردنەدا بێنەپێشەوە، کە کەمتر چاویان لەدەستی ئەمەریکا بێت و هەموو پرۆژەی خۆیان بە ئەمەریکاوە نەبەستنەوە.

**بالی گشتی به چ حەقێك داوای یەكێتیبوون و سەركردایەتی دەكەن، ئەوان یەكێتیان گەیاندە ئەم رۆژە**

**عومەری سەید عەلی كارگێڕی پێشووی مەكتەبی سیاسیی یەكێتی و سەركردەی دیاری ئێستای لیستی گۆڕان بۆ لڤین**

گفتوگۆی هیمداد حەمید و سۆران پالانی

لڤین: دوای بلاوبونەوەی ئەنجامی هەلبژاردنەكان، هەندێك لە لیست و لایەنەكان باسیان لەپێشێلكارییەكی زۆر كرد، ئێوە بەگشتی پرۆسەكە چۆن هەلدەسەنگێنن؟

عومەری سەید عەلی: پرۆسەیەكی زۆر زۆر گرنگ بوو لەرووی سیاسییەوە. نزیكەی سەد سالە كورد خەبات دەكات و شۆڕش بەدوای شۆڕش بەرپا ئەكات دژ بەرژێمی عێراق، بۆ مافە نیشتیمانی و نەتەوەیی و كۆمەلایەتییەكانی تێدەكۆشێت. دیارە بەرهەمی خەباتی گەلەكەمان لە راپەڕیندا تاجی سەركەوتنی لەسەر نا، دواتر پەرلەمانی هەلبژێردرا و حكومەتی هەرێم پێكهات، هەژدە سالە كورد دەسەلاتی بەدەست خۆوەیەتی ، بەشەڕی ناوخۆ و ئاشتی و سەركەوتنەوە. ئەم دەسەلاتە بەتایبەت بەدەست یەكێتی و پارتییەوە بووە. بەلام دوای ئەو هەژدە سالە ئێستا كۆمەلانی خەلكی كوردستان هۆشیاری سیاسییان گەیشتە ئەو ئاستە ی كە بەم دەسەلاتە بلێن: نا . نا بۆ دیموكراتینەبوون. خەلك داوای ئازادی و دیموكراتی و دادپەروەری كۆمەلایەتی مافی مرۆڤ دەكەن، دژی گەندەلی قسەدەكەن و دەنگ بەرز دەكەنەوە، هەموو چین و توێژە كۆمەلایەتییەكان و زۆر لەرەوت و رێكخراوە سیاسییەكان و هەلبژاردەی رۆشنبیرانی گەلەكەمان ئەو (نا) یە یان بە دەسەلات وت. گوێیان نەگرت، رەنگە ئەو لایەنە سیاسیانەی كەئێستا لەدەسەلات و حكومەتدان، بلێن: ئەوە ئازادی و دیموكراتی نییە كە هەموو كەسێك بەوپەڕی سەربەستییەوە رەخنە دەگرێ و بەئازادی قسەدەكات، رەنگە ئەمە وابێ، بەلام ئەوە

وەکو ئەوە وایە کە دەسەڵات بڵێت: تۆ هەرچی دەڵێیت بڵێ، منیش چۆنم ویست بەرژەوەندی خۆم دەیکەم، واتە دەسەڵاتێکی بێباکە و ئازادییەکی شکڵی هەیە. بودجە شەفاف نییە، دەسەڵات کۆنتڕۆڵە بۆ هەردوو حیزب، خەڵك لەسەر دەنگدان دەردەکرێت و دەگوازرێتەوە، وەکو ئەوەی تاکەکانی کۆمەڵ بەندە بن و حزب و دەسەڵات کڕیبنی. ئەوانە زۆربەیان پۆست و پلەی حکومییان هەیە لایان دەبەین، دەسەڵات بەوانەی خوارتر ئەڵێت: مادام دەنگت بەلیستی گۆڕان داوە، موچەکەت دەبڕین، بەتایبەت لەسنوری پارێزگای سلێمانی و گەرمیان و کۆیە لەکاتێکدا ئەمانە ئەرکێك جێبەجێ دەکەن و مافێکیان هەیە، کە ئەو موچەیە خێزان و خۆیانی پێ دەژێنن، ئەرکی حکومەت ئەوەیە کار بۆ خەڵك بدۆزێتەوە، بەڵام ئەوان لەم ڕێگەیەوە بێکاری دروستدەکەن.

کە دەشپرسیت بۆ موچە دەبڕن؟ دەڵێت من موچەم نەبڕیوە، بەڵکو گواستومەتەوە و کێشەی هەیە. باشە کەسێك کێشەی هەبوو لەکارەکەیدا، (١٠) کەس کێشەی هەبوو، (١٠٠) کەس کێشەی هەبوو، یاخود ئەمە بەپلان و بەرنامەیە، بۆ پێش هەڵبژاردنەکان کێشەی نەبوو؟، ئەوانەش کە لەهێزەکانی ئاسایش و پۆلیس و پاسەوانی سنور و هێزی پێشمەرگە و وەزارەتی پێشمەرگە دەنگیان بەلیستی (گۆڕان) داوە، نزیکەی چەندین هەزار بوون. ئەکرێت ئەمە هەمووی دەرکەن یان خۆیان گرفت بۆ خۆیان دروست دەکەن قەیناکا حیزبەکان با پۆستە سیادییەکان هی خۆیان بێت، بەڵام بۆچی مامۆستا و بەڕێوەبەری قوتابخانە و فەرمانبەر دەردەکرێت، پۆست و پلەی لێبسەننەوە و بیگوازنەوە و زیندانی بکرێ و موچەی ببڕێ و دەربکرێ؟! ئەبێت هەموو شتێکی خوارەوەش کە لەجومگەکانی حکومەتدایە بە ئارەزوی خۆیان ڕەفتاری لەگەڵ بکەن ؟، حکومەت هی خەڵکە یا ئەم دوو حزبە؟.

لڤین: با واز لەدیوە ئەخلاقییەکەی ئەم دیاردەیە بهێنین و باس لەدیوە سیاسییەکەی بکەین، پێتوانییە ئەگەر کەسێك کار بۆ حیزبەکەی خۆی نەکات و کار بۆ لیستێکی دیکە بکات، ئەو حیزبە مافی خۆیەتی موچەی نەداتێ و کارەکەی لێبسەنێتەوە؟

نوێوە بۆ ئەو یەکتر بیننە؟
نەوشیروان مستەفا: بەنیسبەت منەوە هەرکاتێك بیانەوێ من خەڵکی ئەم وڵاتەم و یەکێکم لەوانەی لەژیانی سیاسیدا بەشداری دەکەم، هەر کاتێك پێویست بە کۆبونەوە بکات لەلای منەوە هیچ ڕێگرییەك نییە و ئامادەم بۆ کۆبوونەوە.
ڕووداو: ئێستا لە بەغدا گفتوگۆیەکی گەرم هەیە لەسەر یاسای هەڵبژاردن، ئێوە پێشنیاری نوێنەری سکرتێری گشتی un لە عێراق بۆ چارەسەری ئەو کێشەیەچۆن دەبینن؟
نەوشیروان مستەفا: ئێمە لەم گرفتە سیاسیەی ئێستا هاتوەتە پێشەوە، ئاگاداری ئەو نوێنەرانەی بەغدامان کردووەتەوە کە هەر بڕیارێك ئەوان بیدەن ئێمە پشتیوانییان لێدەکەین، وەك چۆن لە پەرلەمانی کوردستانیش فراکسیۆنی ئێمە دەنگی خۆی خستەپاڵ ئەوانی دیکە، ئەوە مەسەلەیەکی نەتەوەییە، لەبەر ئەوە لەگەڵ ئەواندا دەبین.
ڕووداو: لەسەر مەسەلەی لیستی کراوە و داخراو گفتوگۆ زۆرە، لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستانیشدا داوای لیستی کراوەتان دەکرد، بۆ بەغداش هەمان ڕاتان هەیە؟
نەوشیروان مستەفا: بەڵێ ئێمە بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراق لایەنگری لیستی کراوە و فرەبازنەیین، واتە هەر پارێزگایەك لە عێراق لیستی تایبەتی خۆی هەبێ.
ڕووداو: پێتوانییە لە فرەبازنەیدا کورد زەرەر دەکات؟
نەوشیروان مستەفا: نەخێر کورد زەرەر ناکات.
ڕووداو: خۆت بەنیازی بچیتە پەرلەمانی عێراق؟
نەوشیروان مستەفا: نەخێر بۆ پەرلەمانی عێراقیش ناچم، بەڵام پشتگیری کۆمەڵێك خەڵك دەکەم وەك فراکسیۆنێك بچنە پەرلەمانی عێراق، من بەنیاز نیم هیچ وەزیفەیەکی حکومەتی وەربگرم.
ڕووداو: لەبەشە عەرەبییەکەی عێراقدا ناوەندێك هەیە بۆ ئاراستەکردن، بۆ نموونە

کەسێکی وەك سیستانی کە رای خۆی لەسەر مەسەلەیەکی سیاسی هەستیار دەڵێ، پێی تێرە دەبێتە ناوەندی هێز بۆ ئاراستەکردنی بڕیاری سیاسی، پێتوایە ئەوە خاڵێکی لاوازی بێت بۆ کورد، کە عەرەب ناوەندی وەهای هەیە و کورد نییەتی؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ وەك چۆن شیعە مەرجەعیەێکی مەزهەبییان هەیە، سیستانی مەرجەعێکی مەزهەبییە نەك سیاسی و لە حاڵەتی پێویستدا باسی سیاسەت دەکا، پێویستە کوردیش لە هەرێمی کوردستان مەرجەعێکی سیاسیمان هەبێت کە سەرۆکایەتی هەرێم پەرلەمان و حکومەتە.

رووداو: ئێوە وەکو بزوتنەوەی گۆڕان کێشەیەکتان لەگەڵ یەکێتی هەیە کە لێی جیابونەتەوە، بەڵام ئایا هیچ کێشەیەکتان لەگەڵ پارتی هەیە، یان پارتی بەپێی حسابی یەکێتی مامەڵەتان لەگەڵ دەکات، ئایا هیچ دەستپێشخەرییەك هەیە بۆ دروستکردنی پەیوەندی کە ئێوە ئێستا بوونەتە واقیعێکی سیاسی لە کوردستان، هیچ پەیوەندیەکتان هەیە ئەگەر لە ئاستی خوارەوەشدا بێت؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە رۆژانە خەڵکمان یەکتری دەبینێ لە ناو بازاڕ و لەناو زانکۆ و شوێنە گشتییەکان، بەڵام تائێستا پەیوەندی بەشێوەی فەرمی لەنێوان ئێمە و پارتی نییە، جگە لەپەیوەندی ناو پەرلەمان، دەتوانن پرسیارەکەش لەوان بکەن.

رووداو: کاتی ئەوە نەهاتووە کە نەك هەر لەگەڵ پارتی، بەڵکو لەگەڵ یەکێتیش بکەنە گفتوگۆ وەك چۆن هەموو حیزبەکان لەگەڵ یەکتری دادەنیشن؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ، ئێمە لەلای خۆمانەوە ئامادەین بۆ ئەوە بەیەکێتیشەوە، ئەگەر لایەنەکانی تر ئامادەبن.

رووداو: عیماد ئەحمەد لە هەڤپەیڤینێکیدا لەگەڵ (رووداو) دا باسی ئەوەی کردبوو کە هاتوچۆ و گفتوگۆیەکی نافەرمی لەنێوان ئێوە و پارتیدا هەیە؟

نەوشیروان مستەفا: تائێستا شتێکی فەرمی نییە، جگە لەو کۆبونەوەیەی کە سەرۆکی هەرێم کردبووی لەگەڵ هەموو قەوارە سیاسییەکان، تائێستا بەشێوەیەکی فەرمی وەفدێکی بزوتنەوەی گۆڕان لەگەڵ پارتی، یان وەفدێکی گۆڕان لەگەڵ

نوەوە بۆ ئەو یەکتر بیبینە؟

نەوشیروان مستەفا: بەنیسبەت منەوە هەرکاتێك بیانەوێ من خەڵکی ئەم وڵاتەم و یەکێکم لەوانەی لەژیانی سیاسیدا بەشداری دەکەم، هەر کاتێك پێویست بە کۆبونەوە بکات لەلای منەوە هیچ ڕێگرییەك نییە و ئامادەم بۆ کۆبوونەوە.

ڕووداو: ئێستا لە بەغدا گفتوگۆیەکی گەرم هەیە لەسەر یاسای هەڵبژاردن، ئێوە پێشنیاری نوێنەری سکرتێری گشتی un لە عێراق بۆ چارەسەری ئەو کێشەیەچۆن دەبینن؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە لەم گرفتە سیاسیەی ئێستا هاتوەتە پێشەوە، ئاگاداری ئەو نوێنەرانەی بەغدامان کردووەتەوە کە هەر بڕیارێك ئەوان بیدەن ئێمە پشتیوانییان لێدەکەین، وەك چۆن لە پەرلەمانی کوردستانیش فراکسیۆنی ئێمە دەنگی خۆی خستەپاڵ ئەوانی دیکە، ئەوە مەسەلەیەکی نەتەوەییە، لەبەر ئەوە لەگەڵ ئەواندا دەبین.

ڕووداو: لەسەر مەسەلەی لیستی کراوە و داخراو گفتوگۆ زۆرە، لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستانیشدا داوای لیستی کراوەتان دەکرد، بۆ بەغداش هەمان ڕاتان هەیە؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ ئێمە بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراق لایەنگری لیستی کراوە و فرەبازنەیین، واتە هەر پارێزگایەك لە عێراق لیستی تایبەتی خۆی هەبێ.

ڕووداو: پێتوانییە لە فرەبازنەیدا کورد زەرەر دەکات؟

نەوشیروان مستەفا: نەخێر کورد زەرەر ناکات.

ڕووداو: خۆت بەنیازی بچیتە پەرلەمانی عێراق؟

نەوشیروان مستەفا: نەخێر بۆ پەرلەمانی عێراقیش ناچم، بەڵام پشتگیری کۆمەڵێك خەڵك دەکەم وەك فراکسیۆنێك بچنە پەرلەمانی عێراق، من بەنیاز نیم هیچ وەزیفەیەکی حکومەتی وەربگرم.

ڕووداو: لەبەشە عەرەبییەکەی عێراقدا ناوەندێك هەیە بۆ ئاراستەکردن، بۆ نموونە

کەسێکی وەك سیستانی کە ڕای خۆی لەسەر مەسەلەیەکی سیاسی هەستیار دەڵێ، پێی [illegible]ره دەبێتە ناوەندی هێز بۆ ئاڕاستەکردنی بڕیاری سیاسی، پێتوایە ئەوە خاڵێکی لاوازی بێت بۆ کورد، کە عەرەب ناوەندی وەهای هەیە و کورد نییەتی؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ وەك چۆن شیعە مەرجەعیەیێکی مەزهەبییان هەیە، سیستانی مەرجەعێکی مەزهەبییە نەك سیاسی و لە حاڵەتی پێویستدا باسی سیاسەت دەکا، پێویستە کوردیش لە هەرێمی کوردستان مەرجەعێکی سیاسیمان هەبێت کە سەرۆکایەتی هەرێم پەرلەمان و حکومەتە.

ڕووداو: ئێوە وەکو بزوتنەوەی گۆڕان کێشەیەکتان لەگەڵ یەکێتی هەیە کە لێی جیابونەتەوە، بەڵام ئایا هیچ کێشەیەکتان لەگەڵ پارتی هەیە، یان پارتی بەپێی حسابی یەکێتی مامەڵەتان لەگەڵ دەکات، ئایا هیچ دەستپێشخەرییەك هەیە بۆ دروستکردنی پەیوەندی کە ئێوە ئێستا بوونەتە واقیعێکی سیاسی لە کوردستان، هیچ پەیوەندیەکتان هەیە ئەگەر لە ئاستی خوارەوەشدا بێت؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە ڕۆژانە خەڵکمان یەکتری دەبینێ لە ناو بازاڕ و لەناو زانکۆ و شوێنە گشتییەکان، بەڵام تائێستا پەیوەندی بەشێوەی فەرمی لەنێوان ئێمە و پارتی نییە، جگە لەپەیوەندی ناو پەرلەمان، دەتوانن پرسیارەکەش لەوان بکەن.

ڕووداو: کاتی ئەوە نەهاتووە کە نەك هەر لەگەڵ پارتی، بەڵکو لەگەڵ یەکێتیش بکەنە گفتوگۆ وەك چۆن هەموو حیزبەکان لەگەڵ یەکتری دادەنیشن؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ، ئێمە لەلای خۆمانەوە ئامادەین بۆ ئەوە بەیەکێتیشەوە، ئەگەر لایەنەکانی تر ئامادەبن.

ڕووداو: عیماد ئەحمەد لە هەڤپەیڤینێکیدا لەگەڵ (ڕووداو) دا باسی ئەوەی کردبوو کە هاتوچۆ و گفتوگۆیەکی نافەرمی لەنێوان ئێوە و پارتیدا هەیە؟

نەوشیروان مستەفا: تائێستا شتێکی فەرمی نییە، جگە لەو کۆبونەوەیەی کە سەرۆکی هەرێم کردبووی لەگەڵ هەموو قەوارە سیاسییەکان، تائێستا بەشێوەیەکی فەرمی وەفدێکی بزوتنەوەی گۆڕان لەگەڵ پارتی، یان وەفدێکی گۆڕان لەگەڵ

ووە بۆ ئەو یەکتر بینینە؟

نەوشیروان مستەفا: بەنیسبەت منەوە هەرکاتێك بیانەوێ من خەڵکی ئەم وڵاتەم و یەکێکم لەوانەی لەژیانی سیاسیدا بەشداری دەکەم، هەر کاتێك پێویست بە کۆبونەوە بکات لەلای منەوە هیچ ڕێگرییەك نییە و ئامادەم بۆ کۆبوونەوە.

ڕووداو: ئێستا لە بەغدا گفتوگۆیەکی گەرم هەیە لەسەر یاسای هەڵبژاردن، ئێوە پێشنیاری نوێنەری سکرتێری گشتی un لە عێراق بۆ چارەسەری ئەو کێشەیەچۆن دەبینن؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە لەم گرفتە سیاسیەی ئێستا هاتوەتە پێشەوە، ئاگاداری ئەو نوێنەرانەی بەغدامان کردووەتەوە کە هەر بڕیارێك ئەوان بیدەن ئێمە پشتیوانییان لێدەکەین، وەك چۆن لە پەرلەمانی کوردستانیش فراکسیۆنی ئێمە دەنگی خۆی خستەپاڵ ئەوانی دیکە، ئەوە مەسەلەیەکی نەتەوەییە، لەبەر ئەوە لەگەڵ ئەواندا دەبین.

ڕووداو: لەسەر مەسەلەی لیستی کراوە و داخراو گفتوگۆ زۆرە، لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستانیشدا داوای لیستی کراوەتان دەکرد، بۆ بەغداش هەمان ڕاتان هەیە؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ ئێمە بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراق لایەنگری لیستی کراوە و فرەبازنەیین، واتە هەر پارێزگایەك لە عێراق لیستی تایبەتی خۆی هەبێ.

ڕووداو: پێتوانییە لە فرەبازنەیدا کورد زەرەر دەکات؟

نەوشیروان مستەفا: نەخێر کورد زەرەر ناکات.

ڕووداو: خۆت بەنیازی بچیتە پەرلەمانی عێراق؟

نەوشیروان مستەفا: نەخێر بۆ پەرلەمانی عێراقیش ناچم، بەڵام پشتگیری کۆمەڵێك خەڵك دەکەم وەك فراکسیۆنێك بچنە پەرلەمانی عێراق، من بەنیاز نیم هیچ وەزیفەیەکی حکومەتی وەربگرم.

ڕووداو: لەبەشە عەرەبییەکەی عێراقدا ناوەندێك هەیە بۆ ئاراستەکردن، بۆ نموونە

كەسێكی وەك سیستانی كە ڕای خۆی لەسەر مەسەلەیەكی سیاسی هەستیار دەڵێ، پێی [illegible]ره دەبێتە ناوەندی هێز بۆ ئاڕاستەكردنی بڕیاری سیاسی، پێتوایە ئەوە خاڵێكی لاوازی بێت بۆ كورد، كە عەرەب ناوەندی وەهای هەیە و كورد نییەتی؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ وەك چۆن شیعە مەرجەعیەێكی مەزهەبییان هەیە، سیستانی مەرجەعێكی مەزهەبییە نەك سیاسی و لە حاڵەتی پێویستدا باسی سیاسەت دەكا، پێویستە كوردیش لە هەرێمی كوردستان مەرجەعێكی سیاسیمان هەبێت كە سەرۆكایەتی هەرێم پەرلەمان و حكومەتە.

ڕووداو: ئێوە وەكو بزوتنەوەی گۆڕان كێشەیەكتان لەگەڵ یەكێتی هەیە كە لێی جیابونەتەوە، بەڵام ئایا هیچ كێشەیەكتان لەگەڵ پارتی هەیە، یان پارتی بەپێی حسابی یەكێتی مامەڵەتان لەگەڵ دەكات، ئایا هیچ دەستپێشخەرییەك هەیە بۆ دروستكردنی پەیوەندی كە ئێوە ئێستا بوونەتە واقیعێكی سیاسی لە كوردستان، هیچ پەیوەندیەكتان هەیە ئەگەر لە ئاستی خوارەوەشدا بێت؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە ڕۆژانە خەڵكمان یەكتری دەبینێ لە ناو بازاڕ و لەناو زانكۆ و شوێنە گشتییەكان، بەڵام تائێستا پەیوەندی بەشێوەی فەرمی لەنێوان ئێمە و پارتی نییە، جگە لەپەیوەندی ناو پەرلەمان، دەتوانن پرسیارەكەش لەوان بكەن.

ڕووداو: كاتی ئەوە نەهاتووە كە نەك هەر لەگەڵ پارتی، بەڵكو لەگەڵ یەكێتیش بكەنە گفتوگۆ وەك چۆن هەموو حیزبەكان لەگەڵ یەكتری دادەنیشن؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ، ئێمە لەلای خۆمانەوە ئامادەین بۆ ئەوە بەیەكێتیشەوە، ئەگەر لایەنەكانی تر ئامادەبن.

ڕووداو: عیماد ئەحمەد لە هەڤپەیڤینێكیدا لەگەڵ (ڕووداو) دا باسی ئەوەی كردبوو كە هاتوچۆ و گفتوگۆیەكی نافەرمی لەنێوان ئێوە و پارتیدا هەیە؟

نەوشیروان مستەفا: تائێستا شتێكی فەرمی نییە، جگە لەو كۆبونەوەیەی كە سەرۆكی هەرێم كردبووی لەگەڵ هەموو قەوارە سیاسییەكان، تائێستا بەشێوەیەكی فەرمی وەفدێكی بزوتنەوەی گۆڕان لەگەڵ پارتی، یان وەفدێكی گۆڕان لەگەڵ

عومەری سەید عەلی: ئەگەر تۆ پۆستێکی باڵای حیزبیت دابێت بە کەسێك و کار بۆ [illegible]دنی سیاسەتی حیزبەکەی نەکات، حەقی خۆیەتی لایبەرێ، بەڵام ئەم بۆچونەش قسەی خۆی لەسەرە ، چونکە ئەو کەسە دەڵێت من لەگەڵ بیروبۆچونەکانی تۆدا نیم و ئەم حیزبەش تەنها تۆ دروستت نەکردووە، منیش لە دامەزراندنیدا خەباتم کردووە و قوربانیم داوە، لەسەر چ بنەمایەك دەرمدەکەیت؟ پلە و موچەم ئەبڕی، جگە لەوە بۆچونەکانی ئێوە لەگەڵ بەرژەوەندی گشتی گەلەکەم یەکناگرێتەوە.

باشە منیش دەڵێم تۆ بە چ حەقێك ڕۆژانە ملیۆنێك دۆلار لە بودجەی پارێزگای سلێمانی و گەرمیان دەبەیت بۆ حیزبەکەت، لەکاتێکدا خەڵك لە گەرمیان و هەڵەبجە برسییە و بێکارە؟ لێرەش من لەسەر دەنگدان دەرئەکەی، ئەگەر موچە لەدارایی حیزب ئەدەن باشە، بەوەش من هەر شەریکم لەو بودجەیە، چونکە بەرهەمی خەباتی هەموو لایەکمانە کەم تا زۆر.

لڤین: جارجار دەنگێك لەناو لیستی (گۆڕان) و باڵی ریفۆرمەوە دەبیسترێت، کە دەڵێت ئێوە هێشتا خۆتان بە یەکێتی دەزانن. پرسیارەکە ئەوەیە: ئێوە وەك باڵی ریفۆرم دەتانەوێت دەستبەرداری یەکێتی بن؟

عومەری سەید عەلی: ئێمە ئێستا وەك باڵی ریفۆرم لە (ی.ن.ك) بەشێکین لە لیستی گۆڕان.

لڤین: وەکو ڕۆژنامەنوسان و چاودێرانی سیاسیی و بەرپرسە حیزبییەکان دەیلێن، یەکێتی لەقەیراندایە و ئەگەر زوو نەکەوێتە خۆی، ئایندەیەکی مەترسیدارتر و پڕ گرفتتر ڕووبەڕووی دەبێتەوە، تۆ لەمبارەیەوە چی دەڵێیت وئایندەی یەکێتی چۆن دەبینیت؟

عومەری سەید عەلی: من ئایندەیی یەکێتی بەباش نابینم و یەکێتی بەرەو داخراوبوون و بچوکبوونەوە دەچێت. هەموو پینە و پەڕۆیەکیش، دەیانگەیەنێتە ئەم ئاکامەی ئێستا. لەهەڵبژاردنەکانی (٢٠٠٦) ی مەڵبەندەکانی یەکێتیدا، پارەیان بەخشییەوە،

زەویان دابەشکرد، دەسەڵاتیان بەکارهێنا، سەیارە و دەمانچەیان بەخشییەوە و ئەمانە [illegible] بەڕێژەی جۆراوجۆر، جگە لەترس و تۆقاندن و هەڕەشەکردن، هەروەها ڕاگەیاندیان بەکارهێنا، بەڕێز سکرتێری گشتی لایەنگر بوو، کەدەبوو ئەو لەسەرووی ئەو ئاستە بووایە، بەمەش بەشێکی زۆری مەڵبەندەکانیان بردەوە. بۆیە کاك نەوشیروان و کاك محەمەد تۆفیق هاتنە دەرەوە، ئێمە وەك باڵی ریفۆرم ماینەوە و ململانێی خۆمان کرد لەپێناو چاکسازی و ریفۆرم. ئێمە هەموو کێشەکانمان دیاریکرد و لەرێگەی کەناڵەکانی حزبەوە. کۆبونەوەکانی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتیمان کرد بەو مەیدانە و داکۆکی لە بۆچون و راکانمان، هەتا هەندێ لە ئەندامان سەلماندیان، بەڵام ئەوانی تر نەیانویست بیسەلمێنن و دواتریش یاداشتێکمان دایە بەڕێز سکرتێری گشتی و دوای ئەوەش پرۆژەیەکمان پێدا. دواتر دەستمان لەبەرپرسیارێتی کێشایەوە و پاڵپشتی لیستی (گۆڕان) مان کرد.

ئەمجارەشیان ئەوان لە هەڵبژاردن ئەزمونی ٢٠٠٦ یان دووبارە کردەوە و بەهەمان رێچکە و شێواز رۆیشتن بە تەخشان و پەخشان کردن لە هەموو روو ئاست و بوارێکدا کە دادی نەدان، لەبەردەمی کۆمەڵانی خەڵك شکستیانخوارد. بۆیە دەبێت هەست بەو سزایەی کۆمەڵگە بکەن. لەکاتێکدا لیستی گۆڕان بەپشتیوانی خەڵك توانی ئەو سەرکەوتنە بەدەستبهێنێت.

ئێمە لەناو شاری سلێمانیدا (١٥٢) هەزار دەنگمان هێنا ئەوان، ئەوان (٩٤) هەزار دەنگیان هێنا، لەکاتێکدا خۆیان دەڵێن لەناو شاری سلێمانیدا (٧٠) هەزار ئەندامیان هەیە، ئەی رێکخراوە دیموکراتییەکان چی لێهات کە دەیانوت (٣٠٠) هەزار ئەندامی هەیە؟ هەروەها مەکتەبی کۆمەڵایەتی و مەکتەبەکانی بەڕێز مام جەلال و سەرجەم مەکتەبەکانی (ی.ن.ك)، ئەمە جگە لەوەی ئەوان لەگەڵ پارتیدا ئەوەندە دەنگیان هێناوە. ئێمە لەسەر ئاستی پارێزگای سلێمانی و ئیدارەی گەرمیان (٣٠٧) هەزار دەنگمان هێناوە و ئەوانیش (٢٦٦) هەزار دەنگیان هێناوە. لە (١٨٧) بنکەی ناو شاری سلێمانیدا ئەوان لە تەنها بنکەیەکدا لە ئێمەیان بردەوە، ئەویش

بەجیاوازی (١٧) دەنگ. سەرەڕای ئەوەی کە شاری کۆیەشمان لێ بردنەوە کە لەژێر دەسەڵاتی یەکێتی نیشتیمانیدایە.

لڤین: کە دەڵێیت کۆیە لەژێر دەسەڵاتی یەکێتیدایە، مەبەستت ئەوەیە کە ئێستاش کوردستان دوو ئیدارەیە؟

عومەری سەید عەلی: تا ئێستاش کوردستان دوو ناوچەیە، دوو ئیدارەیە و دوو داراییە و دوو هێزی چەکدارە. بەشێوەیەکی شکڵی پەرلەمان و حکومەتی هەرێم هەیە و یەکی نەگرتوەتەوە، تائێستا مودیر ناحیەیەکی پارتی لە ناوچەیەکی یەکێتیدا نییە و بەپێچەوانەشەوە. من تێناگەم ئەمانە بۆ لەخۆیان ناپرسن ئەگەر ئەو دوو ئیدارەیە یەکیبگرتایەتەوە، مێژوو بۆ کێی دەنوسی؟ بۆ بەڕێزان مام جەلال و کاك مەسعودی دەنوسی؟، یان بۆ ئەندامانی سەرکردایەتی و مەکتەب سیاسییەکانیان؟ بەڵام نازانم بۆچی نایکەن؟ ئەوە نزیکەی ١١ ساڵە گفتوگۆ لەسەر یەکخستنی ئەم دوو ئیدارەیە هەیە، کە لە ١٢-٢-١٩٩٨ وە یەکەم کۆبونەوەی ئاشتی دەستپێکرد لە شەقلاوە نەیتوانیوە ئەم دوو ئیدارەیە یەکبخات، ئەمە گوناهی کێیە؟ ئەمە سیراعی عەرەب ئیسرائیلە؟ ئێمە ئەم پرسیارەمان لەبەرچاوی خۆیان چەندین جار کردووە، وتومانە تا هەردوولا نەیەنە ناوچەی یەکتر و بەیەکدا نەچین، ئەم یەکگرتنەوەیە ئەسڵ و ئەساسی نییە، تا ئێستا دوو حکومەت و دوو داراییە و دوو ئیدارەیە و دوو هێزی چەکدارە، ئەوەش کە دەڵێن یەکیگرتووەتەوە، خۆڵکردنە چاوی خەڵکە، سەیر ئەوەیە لەملاشەوە بەئێمە ئەڵێن ئەیانەوێ ئەمارەتی بابان دروست بکەن.

لڤین: تۆ ماوەیەکی زۆر لەمەکتەبی سیاسیی بویت و سەروکارت لەگەڵ ژمارە و داتا هەبووە، لە لیستی گۆڕانیش بەهەمان شێوە. دوای بردنەوەی سلێمانی کە چەقی لایەنگرانی یەکێتی بوو، بەپێی زانیارییەکانی ئێوە ئێستا جێنفوزی یەکێتی کوێیە؟

عومەری سەید عەلی: ئەوە لەسەرکردایەتی (ی.ن.ك) بپرسە، بلێن ئەوە داتا و ژمارەکان، ژمارەکانی خۆتان کوان؟ ئێوە بپرسن کوا قاعیدەی یەکێتی و یەکێتی چی

نییە؟ ئەوان با ئەم پرسیارانە وەلاّم بدەنەوە، قاعیدەی یەکێتی بۆچی ئاوای لێهات و بۆچیش شکستی هێنا؟.

لڤین: ڕەنگە هەندێکیان بڵێن بەهۆی دروستبوونی لیستی گۆڕانەوە بوو، کەبەشێك بوون لەیەکێتی و جێدەستیان لەیەکێتیدا هەبووە، ئاسایشە بتوانن لە کاتێکی ئاوادا دەنگەکانی یەکێتی پەرت بکەن؟

عومەری سەید عەلی: گۆڕان و پێکهاتەکەی بیروباوەڕی جیاوازی هەبوو، کە وابوو، گۆڕان ڕاستی کرد کە ئەمان ووت دابڕاون لەجەماوەر گوێیان نەئەگرت، دەرکەوت کێ ڕاستە، بۆ ئەوان دان بەو ڕاستیەدا نانێن کە وەك ڕۆژ دیارە؟

لڤین: بەلاّم هەموو ئەو کەسانەی دەنگیان بەلیستی گۆڕان داوە یەکێتی نەبوون؟

عومەری سەید عەلی: من نالێم هەمووی یەکێتییە. پێکهاتەی گۆڕان بەشێکی باڵی ریفۆرمە کە زۆری لەخەتی گشتی، یەکێتی شۆڕشگێڕان، کۆمەڵە، ئالاّی شۆڕش، سۆسیالیستە، کەبەشێکن لە جولاّنەوەی گۆڕان، لەدەرەوەی یەکێتیش پاسۆك و زەحمەتکێشانی تێدایە، پێشمەرگەی دێرین و ڕێکخستنی پارتی تیایە کە دانیشتووە، شیوعی و پیاوی ئاینی تیایە، چەپ و دیموکراتیشی تیایە، هەروەها بەشی هەرە زۆری جەماوەری بێلایەن و پان و بەرین، بە تایبەتی گەنجان و ژنان. ئەمە جگە لەهەڵبژاردەی ڕۆشنبیران کە ڕۆڵی زۆر گرنگیان هەبووە لە ئاراستەی خەڵك بەنوسین و وتار و گفتوگۆی واقعی و بەپێز لەسەر ڕووبەری سەرجەم کەناڵەکانی ڕاگەیاندن.

لڤین: کە وابوو، تاچەند لەگەڵ ئەو قسەیەی عیماد ئەحمەد دایت دەڵێت (( گۆڕان مەنجەڵێکە و سەری زۆری تێدایە))؟

عومەری سەید عەلی: ئەو دەیەوێت بۆ مەبەستی تر ئەو قسەیە بکات، ئێمە بزوتنەوەیەکی جەماوەرین و توانیومانە خەڵك لە دەوری بەرنامەی سیاسی خۆمان کۆبکەینەوە، خاڵی بەهێزی بەرنامەکەمان لەوەدایە، کە هەموو لایەنەکانی لەخۆگرتووە، ئەو قسەیەش کە ئەو کاکەیە کردوویەتی، کێشە نییە و خۆمان

بانگەشەی ئەوەمان کردووە کە بیروباوەڕی جیاوازمان تێدایە. ئەی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان چییە؟ سۆسیالیستی تێدا نییە؟! ئاڵای شۆڕشی تێدا نییە؟! شۆڕشگێڕان و کۆمەڵەی تێدا نییە؟! عەشایەری تێدا نییە؟! ئەی ئەوە چ مەنجەڵێکە؟ سەرکردایەتی ئێستای یەکێتی واقیع نابینێت و لەچاوی ئەو راپۆرتانەوە کە ئەمان بۆیان دەنوسن، بارودۆخەکە دەخوێننەوە وسیاسەت نەخش ئەکەن. بۆیە توشی ئەو شکستە هاتن.

لڤین: عارف قوربانی کە کادیرێکی باڵای راگەیاندنی یەکێتییە، دەڵێت: ئەوانەی دەورو خولی تاڵەبانیان داوە، وایانکردووە کە سکرتێری گشتی بەچاوی خۆی بارودۆخەکە نەخوێنێتەوە و لێکدانەوەکانی بۆ دۆخی ناوخۆی یەکێتی دروست نەبن،ئەگەرنا چاوی ئەو لە هەمووان واقیعبینتر بووە، تۆ چی دەڵیت، یاخود کێ بەرپرسە لەو دۆخەی کە ئێستا یەکێتی تێکەوتووە؟

عومەری سەید عەلی: هەمووان بەرپرسن لەبەرێز مام جەلالەوە تا خوارەوە، چونکە ئەو شتانەمان پێوتوون، لە کۆبونەوەی کۆمیتەی سەرکردایەتی لە ئازاری ٢٠٠٧ جەستەی یەکێتیمان توێتوێ کرد، لەبەر رۆشنای راپۆرتی مەکتەبی چاودێری و پشکنین کاك دکتۆر فوئاد مەعسوم وتی ئەوە (٣٠) ساڵە کۆبونەوەی ئاوام نەکردووە، کە بەراشکانانە دەستخراوەتە سەر کێشەو برینەکان، بەرێز بەرپرسی مەکتەبی رێکخستنیش وتی راستە کادری ئۆرگانەکان لە ئاستی بەرپرسیارێتیدا نین و کارەکانیان بۆ نابرێت بەرێوە، بەلام چارەسەری بۆ نادۆزنەوە، هەر کەسێك بەرپرسیارێتی زیاتری هەبێت، زیاتر بەرپرسە، هەموو ئەوانەمان باس کرد و پێمان وتن رۆژێك دێت پەنجەی پەشیمانی دەگەزن، ئەمە ئەو رۆژەیە.

لڤین: زۆرێك لەبەرپرسە باڵاکانی یەکێتی دەڵێن، یەکێتی لەمساڵدا کۆنگرە دەبەستێت، ئێوە وەکو باڵی ریفۆرم بەشداری کۆنگرە دەکەن؟

عومەری سەید عەلی: بۆ ئەوە هێشتا زووە.

لڤین: پێدەچێت نەتانەوێت دەستبەرداری یەکێتی بن؟

عومەری سەید عەلی: ئەوە لەکاتی خۆیدا وەڵام دەدەینەوە، بەلام چارەنوسی تەنها

[illegible]ت ئەوان نییە و بەدەست هەموومانە، بە چ حەقێك ئەوان بانگەشەی یەكێتی [illegible]سەركردایەتی دەكەن، ئەوان یەكێتیان گەیاندە ئەو رۆژەی ئێستا، نەك باڵی ریفۆرم، ئێمە بەدوای ئیمتیازات و پلەوپایەدا نەگەڕاوین، وەك خەڵكی سلێمانی دەڵێت: ئێمە لەپاڵ حەجەكەدا بووین، هەرچیەكمان بویستایە، بۆیان دەكردین، بەڵام دەستبەرداریشی بووین، بۆ زانیاریتان رەنگە تائێستا من و دوو كەسی تر بزانن، من كە وەك كارگێڕ، مەكتەبی سیاسیم بەجێهێشتووە، (٥) ملیۆن دۆلارمان پاشەكەوت كردووە، تائیستاش رەنگە ژمارەیەك لە مەكتەبی سیاسی نەزانن. ئێستا رەنگە تێی بروكێن هەریەكە بڵێ بەشە نەسریەم ئەوێ، ئەممان لە نەسریەی مەكتەبی سیاسی گێڕاوەتەوە، ئێمە بەو شێوەیە كارمان بۆ یەكێتی كردووە.

بۆ لەمەودوا وەكو باڵی ریفۆرم دەتانەوێت دەستتان لەیەكێتیدا هەبێت و بە ئاراستەیەكدا بیجوڵێنن؟

عومەری سەید عەلی: ئێمە تەمەنێكی زۆرمان لە خەباتدا بەسەر بردووە، ئێمە خەباتمان بۆ گەل و نیشتیمان كردووە، حیزب وەسیلەیەك بووە بۆ گەیشتن بە ئامانجەكانی گەلەكەمان، بەڵام ئەگەر كۆمەڵێك كەس دەستی بەسەردا بگرن، لەبارودۆخێكی تایبەتدا بۆ پاوانكردنی دەسەڵات و بەرژەوەندی تایبەت ، تۆ دەسەڵاتت چییە؟! بەڵام ئەوا لەبەردەمی جەماوەر و ئەندامانی یەكێتی و واقیعەكەداین بزانین بەكوێ ئەگەین.

لقین: تۆ دەڵێت حیزب ئامرازە بۆ گەیشتن بە ئامانج، ئێوە كە لە یەكێتی هاتونەتە دەرەوە، بەپێی قسەی بەرپرسانی یەكێتی لە پەیڕەوی ناوخۆ لاتانداوە و ماف و ئەركتان نییە لەو حیزبەدا، ئەوەیان چۆن لێكدەدەیتەوە؟

عومەری سەید عەلی: ئەوان لەپەیڕەو لایانداوە و ئامادەنەبوون كۆنگرە بگرن، بۆیە پەیڕەو چەند شەرعیەتی بۆ ئەوان هەیە ئەوەندەش شەرعیەتی هەیە بۆ ئێمە، ئەگەر بابەتیانە سەیری مەسەلەكە بكەین، بە چ حەقێك ئەوان خاوەنی ئەو حیزبەن، ئەوان تائێستا دەسەڵاتیان زەوتكردووە لەرووی سیاسی و ئیداری و ماڵی و ماڵی و

ڕێکخراوەیی، بەو دەسەڵاتەی بەدەستیانەوەیە خەڵکی پێ دەردەکەن، ئەوان لە پەیڕەوی ناوخۆ لایانداوە و شکست لەدوای شکستیان بەسەر یەکێتیدا هێناوە و پێگەی جەماوەرییان نەماوە.

لڤین: با ڕاشکاوتر بم، ئێوە دەتانەوێت لێرە ململانێ لەسەر مێژوو و چارەنوسی یەکێتی دەستپێبکەن؟

عومەری سەید عەلی: ئێمە ئەم ململانێیە، بە زۆرانی بیروباوەڕی سیاسی دەزانین بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی هێمن و سەردەمیانە ئەنجامی بدەین، لەیەکێتیدا بیروباوەڕی جیاواز هەبووە، یەکەم گۆڕانی ئێمە بەر لە بەدەستهێنانی کورسییەکانی پەرلەمان دەست پێدەکات بۆ پاڵپشتی لیستی گۆڕان و بوون بەبەشێك لە لیستەکە، کە ئەو هۆشیارییە سیاسییەی لای کۆمەڵانی خەڵك لە کوردستان دروستکرد، ئەمە گۆڕانە، ئەوەبوو خەڵك لەسەر سندوقی دەنگدان بە دەسەڵاتی وت: (نا) کە (ی.ن.ك) بەشێکی گرنگی دەسەڵات بوو.

لڤین: دوای دەرکەوتنی ئەنجامی کۆتای هەڵبژاردنەکان، لیستی گۆڕان (٢٥) کورسی لە پەرلەمانی کوردستان گرت کە زۆرینەی دەنگەکانی لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتییەوە برد، بەبڕوای تۆ یەکێتی دەتوانێت وەکو جاران ڕکابەری سەرەکی بێت و بتوانێت ململانێ لەگەڵ پارتیدا بکات؟

عومەری سەید عەلی: ئەو پرسیارە لەسەرکردایەتی یەکێتی خۆی بکە، یەکێتی دێت خەڵکی قوڕبەسەر و فەرمانبەر و کادرەکانی خوارەوە دەردەکات، بۆ محاسەبەی سەرکردەکانی ناکات، کە چ جۆرە سیاسەتێکیان پەیڕەو کرد، کە گوێیان لەو ڕاپۆرت و ئامارە دوور لەڕاستیانە ئەگرت و سیاسەتیان لەسەر دائەڕشت کە دەرەنجامەکەی ئەو شکستەیان بەسەردا هێنا؟!

لڤین: هەندێك لەچاودێرانی سیاسی پێیانوایە گۆڕان لەڕووی قورسای و هێزەوە یەکێتی تێپەڕاند و دەیەوێت لەگەڵ پارتیدا ململانێکان دەستپێبکات، لێکدانەوەتان بۆ ئەم ڕایە چییە؟

عومەری سەید عەلی: ئێمە هاتووین لەسەرخۆ و بەهێمنی لەڕێی ململانێی سیاسی [illegible] بکەین بۆ گۆڕینی سیستەمی حوکم بەشێوەیەکی ئاشتیانە و دەستاودەستکردنی دەسەڵات بەهۆی سندوقی دەنگدانەوە، کە ئەمەش بەقازانجی کۆمەڵگا و خەڵکە بۆ گەیشتن بە مافە ڕەواکانی خۆیان کە لە ئازادی و دیموکراتی و دادپەروەری کۆمەڵایەتی و مافی مرۆڤ و وەکە یەکی لەبەردەم یاسادا و ...خۆی دەبینێتەوە، نەك بەو شەڕ و هەڕەشە.

لڤین: ئێوە وەك لیستی گۆڕان، سەنگ و قورسایی خۆتان لەو ئاستەدا دەبینن؟

عومەری سەید عەلی: بەڵێ، نزیکەی نیو ملیۆن دەنگمان هێناوە، پێکهاتەی لیستەکە و پشتیوانی چین و توێژەکان بۆی، بە تایبەتی گەنج سەنگ و قورسای زۆری پێداوە ، ئەگەر ئەو ساختەکاری و فێڵانەیان نەکردایە، ئێستا لە ریزی پێشەوە بووین، ئێوە خۆتان بینیتان لەماوەی مانگێکی هەڵمەتی هەڵبژاردندا، لەسلێمانی و گەرمیان و کۆیە چ حەشرێك بوو لەنێوان لیستە سیاسییەکاندا، لەهەولێر و سلێمانی باسی چی هەبوو لە چاو سلێمانیدا ، تا رۆژی هەڵبژاردن، ئەی خێرە لە دهۆك لە (٨٥٪) و لە هەولێر نزیکەی (٨٠٪) و لە سلێمانی (٧٤٪) دەنگە بدات، ئەمە بە چ مەنتقێك؟! تەنانەت لەرێژەی زیادکردنی دانیشتواندا غەدر لە سلێمانی کراوە و زیادەی رێژەی دانیشتووان لە دهۆك و هەولێر زیاترە تا سلێمانی. لەچەندساڵی رابردوودا ئەمەش بەهۆی نەبوونی سەرژمێری گشتی کە دە ساڵە داوا ئەکرێت.

لڤین: بەپێی زانیاری و داتاکانی ئێوە، رێژەی کورسییە (تەزویر) ەکانی لیستی کوردستانی چەندە؟

عومەری سەید عەلی: تا سەعات سێ، لەهەولێر و دهۆك (٤٠٪) ی خەڵك دەنگی داوە ئەوە زانیاری هەندێ سەرچاوەی کۆمسیۆنی باڵا خۆیەتی، چون بەو چوار سەعاتەی دوای گەیشتە ئەوەندە؟! ئێمە بە لانیکەمەوە (٨) تا (١٠) کورسی غەدرمان لێکراوە.

لڤین: ئێوە کاتێك لە لەناو یەکێتیدا بوون دەتانوت بەشێك لەکێشەکان ئەوەیە

یەکێتی سازشی زۆری بۆ پارتی کردووە و ئەمەتان بۆ هۆکاری بچوکبوونەوەی یەکێتی دەزانی، ئێستاش باس لەوەدەکرێت کە ئەمجارە یەکێتی پۆستی سەرۆکی حکومەت وەردەگرێتەوە و دەستبەرداری نابێت، تۆ پێتوایە یەکێتی بەو پۆستە هەژموونی سیاسی خۆی دروستبکاتەوە؟

عومەری سەید عەلی: بەڵێ ئێمە ئەوەمان وتووە، ئێستاش یەکێتی نەك پۆستی حکومەت، پەرلەمان و حکومەت بەیەکەوە وەرگرێ، تا ئەوە ئەدای شێوازی کارکردنی بێت، هیچ پێشکەوتنێك بەدەستناهێنێت، دەبێت یەکێتی سیستەمەکەی بگۆڕێت نەك دەموچاو کەسەکان. گەر وا نەکات هەژموونی سیاسی دروست ناکاتەوە و بۆی ناگەڕێتەوە، بەڵام بەداخەوە یەکێتی و پارتی حکومەتیان کردووە بە ملکی خۆیان نەك هی خەڵك، لە وەزیرێکەوە تا چایچییەکان لەبەینی خۆیان بەشکردووە، ئەمە سیستەمە دیموکراتی و عادلەکەیە کە باسی دەکەن.

لڤین: ئێوە وەکو باڵی ریفۆرم بەشێکتان دڵتان هەم لەلای گۆڕانە و هەم لەلای یەکێتیش، ئایا هیچ دانیشتنێك نەبووە بۆ ئاشتبوونەوەی گشتی لەناو یەکێتیدا، ئەو ئەگەرە بەدوور دەزانیت؟

عومەری سەید عەلی: تائێستا هیچ شتێك نەبووە لە هیچ لایەکمانەوە، ئەوانە برادەری ئێمەن و قسەمان پێکەوە هەیە و رەنگە لەبۆنە کۆمەڵایەتییەکانیشدا یەکتر ببینین و دانیشتنمان هەبێ، هەرچەندە ئێمە لێیان زویر و نیگەرانین بەرامبەر رەفتاریان، لەدەرکردن و لابردن و دوورخستنەوە و نانبڕینی برادەرەکانمان.

گۆڤاری لڤین – ژماره ٨٦ -١٥/٣/٢٠٠٩

**[illegible] جیاوازی نەوشیروان مستەفا لە قازانجی یەکێتی نییە و دەبێتە ئینشیقاق"**

**عیماد ئەحمەد کاندیدی یەکێتی بۆ جێگری سەرۆکی حکومەت لەدیدارێکی تایبەتی لڤیندا جەخت لەوە دەکاتەوە کە یەکێتی خەریکی چاکسازییە و لەم پرۆسەیەشدا سەرکەوتوو دەبێت.**

گفتوگۆی هیمداد حەمید و گۆران دوکانی

لڤین: ئێستا بڕیارە تۆ پۆستی جێگری سەرۆك وەزیران وەربگریت، دەتوانیت بەدیاریکراوی کارنامەی خۆت بۆ ئەم سێ مانگە باسبکەیت؟

عیماد ئەحمەد: لە یەکگرتنەوەی هەردوو ئیدارەدا بەڕێز کاك نێچیرڤان لەپەرلەمان بەرنامەیەکی دەستنیشانکرد، لەسەر هەمان بەرنامە دەڕۆین، بەڵام خۆتان دەزانن کە ئەوە هەمووی جێبەجێنەکراوە، ئەوەی ئێمە لەم ماوەیەدا جەختی لەسەر دەکەینەوە، زیادکردنی شەفافیەت و دادپەروەری لە ئیشکردندا، کەمکردنەوەی رۆتین، دانانی خەڵکی شیاو لەشوێنی شیاو ، شۆڕکردنەوەی یەکگرتنەوەی ئیدارەکان لەسەرەوە بۆ خوارەوە، لە زاخۆوە بۆ خانەقین، یەکگرتنەوەی ئەو سێ وەزارەتە بەزووترین کات کە ئێستا یەکیان نەگرتووەتەوە، گرنگیدان بەراوبۆچوونی رۆژنامەنوسان و راگەیاندنەکان و دروستکردنی کاناڵێکی تایبەت بەو مەبەستە، هەروەها بەشداریکردنی رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی لەبڕیاردا، خزمەتکردنی کۆمەڵانی خەڵك بە تایبەتی کەسوکاری شەهیدان و ئەنفال و کیمیاباران و کەمئەندامان و زیندانە سیاسییەکان و پێشمەرگە دێرینەکان و کادرە ماندووەکان.

لڤین: پێتوایە لە ماوەی ئەم سێ مانگەدا، بتوانیت نارەزایەتییەکانی خەڵك کەمبکەیتەوە، بەتایبەتی لەسنوری پارێزگای سلێمانی، وەك دەزانن نارەزایەتییەکی زۆر لەحکومەت و کەمیی خزمەتگوزاری هەیە؟

عیماد ئەحمەد: تا پێمبکرێت هەوڵی بۆ دەدەم، بەهاوکاری برا وەزیرەکان، پارێزگای

سلێمانی و شارەوانی سلێمانی و دامودەزگاکانی دیکەی سلێمانی، ئینشائەڵڵا [illegible]میدەکەینەوە، هەوڵ دەدەین خزمەتێکی باش بکەین، بۆ ئەوەی کۆمەڵانی خەڵك لێمان رازیبن.

لڤین: دەزانین لەم کاتەدا جەنابتان بوون بە جێگری سەرۆك وەزیران کە بەهۆی حاڵەتێکی ناکاو و گۆڕانێکی کتوپڕی دۆخی ناو یەکێتییەوە بوو، ئێستا خۆشحاڵیت کە لەو پۆستەدایت؟

عیماد ئەحمەد: بەقورسی دەزانم، بەڵام زۆرجاری دیکە ئەرکی قورسیان خستووەتە سەر شانم و نەشموتووە نا، لەناو یەکێتیدا لە زۆر بواردا ئیشمکردووە، لەزۆر کاتی ناخۆش و خۆشدا تەکلیفکراوم و رەدی پۆستم نەکردووەتەوە، ئەگەر پۆستەکە بەرزە رازیبووم، لەهەمانکاتدا پۆستی نزمیشم قبوڵکردووە، ئەگەر بەڕێوەبەری ناحیە بێت بۆ خزمەتکردنی خەڵك و کۆمەڵانی خەڵك، رەدیناکەمەوە.

لڤین: ئەندامێکی سەرکردایەتی دەڵێت دەبێت دان بەوەدا بنێین کە عومەر فەتاح بە گوشارێکی زۆر لابرا، ئێستا کە تۆ چوویتە جێگەی ئەو، ئاسودەی لەو جێگەیە؟

عیماد ئەحمەد: کاك عومەر خۆی ئیستیقالەی کردووە ئێمە هیچ گوشارێك بەدی ناکەین، دەتوانن ئەو پرسیارە لە بەڕێز کاك عومەر خۆی بکەن.

لڤین: لەم کاتەدا کە تۆ ئەو پۆستەت وەرگرتووە، نارەزایەتی سلێمانییەکان بۆ تۆ چاوەڕوانکراوە، بەتایبەتی کە تۆ دوا پۆستی سیادیت لە سلێمانییەکان وەرگرتەوە.

عیماد ئەحمەد: لە زۆر کاتدا لە سلێمانی ئیشمکردووە، (١٢) ساڵ لەمەوبەر بووم بە بەرپرسی مەڵبەندی سلێمانی، گەورەترین مەڵبەندی یەکێتی بووە، دووجاریش لێپرسراوێتی مەڵبەندی سلێمانیم کردووە، خەڵکی سلێمانی نەیانوتووە ئەمە خەڵکی سلێمانی نییە بۆ بەرپرسم بێت. لەوانەیە هەندێك خەڵك ئەو بۆچوونەی هەبێت، بەڵام نزیکەی (٥٤) ساڵ تەمەنمە، (٢٧) ساڵی دوایی لە سلێمانی و دەوروبەری ژیاوم و لەشارەکەی خۆم دوورکەوتوومەتەوە، ئەمە پێنجەمین پۆستی ناو حکومەتمە، لەسەردەمێکدا یەك پۆستی سیادیمان هەبوو، پۆستەکە کاك کۆسرەت وەریگرت، کە

خەڵکی سلێمانی نەبووە و (٤-٥) ساڵیش سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیرانی گۆڕاوە و کەسیش نەیوتووە نابێت، خەڵکی سلێمانی لەوە بەرزتر و بە ئاگاتر و مەسئولترن کە رۆحیەتی ناوچەگەرییان لەلا مەبەست بێت، ئەم شارە شاری هەڵمەت و قوربانی و پێشڕەوی خەباتی سیاسیی بووە لە زۆر سەردەمدا.

لڤین: بەڵام لەسەردەمی کابینەکەی کۆسرەت رەسوڵیشدا نارەزایی لەو رووەوە هەبووە؟

عیماد ئەحمەد: ئەوە دەکرێت، هەندێك خەڵك بیانەوێت ئەو ناوچەگەرییە بکرێت، حاڵەتێك کە زیان لەیەکێتی نەتەوەیی خۆمان بدات، ئەو حاڵەتە بەراست نازانم، بەڵام دەبێت هاوسەنگیی تێدا بێت، ئەوە نییە بڵێم لەناو خەڵکی سلێمانی من باشترین کەسم ئەو پۆستە وەربگرم، بگرە زۆر کەس لەمن شایستە تر بوون، بەڵام لەبارودۆخێکی وادا کە تەکلیفکراوم و ئەرکێکی قورس خراوەتە سەرشانم، خۆم داوای ئەو پۆستەم نەکردووە و بە ئامادەیی هەموو ئەندامانی مەکتەبی سیاسیی دانراوم، بەڵام داوامکردووە کە هەرکەسێك دەیەوێت ئەم پۆستەم لێوەربگرێتەوە، پیرۆزبایشی لێدەکەم و پشتیوانیشی لێدەکەم، مودیر ناحیەیی لەگەڵدا دەکەم.

لڤین: مەبەستم نارەزایی خەڵکی سلێمانییە، بۆ نموونە چاودێرانی سیاسیی پێیانوایە کە کۆمپانیای وشە لەبەشێکیدا، یاخیبوونی سلێمانییە لەیەکێتی؟

عیماد ئەحمەد: نەخێر زۆر خەڵکی غەیرە سلێمانی هەن لە وشەن و هاوکاری دەکەن، وەکو بزانم ئامانجی کۆمپانیای وشە سلێمانیچێتی نییە.

لڤین: بەڵام ئامانجی کۆمپانیای وشە وەك سیمبولێکی سلێمانی دەردەکەوێت؟

عیماد ئەحمەد: راستە لەناو سلێمانیدایە، بەڵام ئیشوکاری کاك نەوشیروان و کۆمپانیای وشە سەرتاسەرییە، کوردستانییە، ناوچەگەر نییە.

لڤین: لەبەرنامەکانی تەلەفزیۆنیدا وتت دەبێت دان بەوەدا بنێین یەکێتی کێشەی هەیە، دەتوانیت بەدیاریکراوی ئەو کێشانە باسبکەیت؟

عیماد ئەحمەد: کێشەکان ئەوانەن لەناو مەکتەبی سیاسیدا روویاندا، نەگونجان

لەراوبۆچووندا هەیە، نەگونجان لەهەڵسوکەوتی رۆژانەدا هەیە، شتەکانمان شاراوە نین و هەمووی لای میدیاکان و لەهەموو دنیا بڵاوبووەتەوە ونهێنیمان نییە.

لڤین: بەرهەم ساڵح لەدیدارێکی رۆژنامەی (شەرق ئەلئەوسەت) دا دەڵێت: ئەم گۆڕانکاریانەی لەناو یەکێتیدا کراون، لەبەرژەوەندی هەندێك کەس دەدەن، بەڵام لەبەرژەوەندی خەڵکدان و بەرژەوەندیی خەڵکیش ئەوە دەهێنێت لەبەرژەوەندی هەندێك کەس بدرێت، تۆش رات لەگەڵ ئەو جێگرەی سکرتێری یەکێتیدایە؟

عیماد ئەحمەد: هەر کەسێك تێگەشتنی خۆی بۆ شتەکان هەیە، هەموو گۆڕانکارییەك هەتا ئەگەر گۆڕانکارییەکیش لەگەڵ نوێبوونەوەشدا بێت، هەندێك کەس زەرەرمەند دەبن، جا ئەو زەرەرمەندە حەقە، یان حەقێکی لە ناحەقی وەرگرتووە، لێیدەسەنرێتەوە، بەڵام لەهەموو حاڵەتێکدا هەر زەرەرمەندە، بۆ نموونە کە ئێستا دەڵێین خەڵکی شیاو لەشوێنی شیاو، نەشیاوەکان زەرەرمەند دەبن.

لڤین: پێتوایە لەم گۆڕانانەدا کێ نەشیاو زەرەرمەندە؟

عیماد ئەحمەد: ئەوە لەپرۆسەکەدا بۆمان دەردەکەوێت، ناتوانین ئێستا فیشەك بەتاریکییەوە بنێین، ئەو کاتە دەتوانین ئەوە بکەین کە هەڵسەنگاندنێك هەبێت بۆماندەردەخات کێ شیاوە و کێ شیاو نییە.

لڤین: لەتێگەیشتنی قسەکانی تۆدا دەردەکەوێت یەکێتی بارودۆخێکی زۆر ئاسایی هەبێت، ئەمە لەکاتێکدایە زۆربەی بەرپرسەکانی ناو یەکێتی زۆر بەراشکاوانە باس لەکێشە گەورەکانی یەکێتی دەکەن؟

عیماد ئەحمەد: من ناڵێم وەزعی یەکێتی ئاساییە، ئەوانەی دەستیان لەکارکێشاوەتەوە، پێمان باشە بگەڕێنەوە و ئیشمان لەگەڵ بکەن، مام جەلال سکرتێرە، جارهەبووە ئیستیقالەی کردووە و قبوڵ نەکراوە، برادەران رازی نەبوون.

لڤین: کەی ئیستیقالەی داوە؟

عیماد ئەحمەد: زۆرجار ئەو کێشانە هەبوون، لەساڵی (١٩٩٤) مام جەلال دەستی لەکارکێشایەوە و سەفەری دەرەوەی کرد، لەکاتی تەزامونی مەکتەبی سیاسیی

لەبەر هەندێك شتی ئەو کاتە، دوای هاتنەوە لەگەڵ سەرکردایەتی بارودۆخەکە چاککرایەوە، زۆرجار کاك نەوشیروان عاجز بووە و رۆشتووەتە دەرەوە و هاتووەتەوە، لەناو شۆڕش دانیشتن هەبووە، ئەم حاڵەتە یەکەمجار نییە، بەڵام دەکرێت بڵێین یەکەمجارە رۆژنامەگەری چووەتە بنج و بنەوانییەوە و وایکردووە گیان و مێشك و دڵمان لەبەردەستی خەڵك بێت، جاران زۆرکەم دەزانرا، بەڵام ئێستا هەموو شتەکانمان ئاشکرا و زانراون.

لڤین: بەرپرسە باڵاکانی یەکێتی باس لەوە دەکەن کە یەکێتی گەیشتووەتە ئاستێك یان دەبێت چاکسازی بکات، یان دەبێت رێگەبدات بە ململانێی شەخسی و ململانێکانی گەیشتن بەدەسەڵات، تۆش رات وایە یەکێتی گەیشتووەتە ئەو ئاستە؟

عیماد ئەحمەد: یەکێتی پێویستییەکی حەتمی بەچاکسازی هەیە، یەکێتی خاوەن گۆڕانە لە ئسلوبی خەباتدا، واتە لەخەباتی شاخەوە هاتووەتە خەباتی شار، لەحیزبی موعارەزەوە بووەتە حیزبی دەسەڵاتدار، لەحیزبی نوخبە و تێکۆشانەوە بووەتە حیزبی جەماوەر، ئەمە هەندێکی باشە و هەندێکیشی خراپە، لەهەندێك حاڵەتدا ئاوساوە و دەبێت سوژنێکی پێدابکەیت، ئەو باو شتانەی لێدەربچێت و ببێتەوە بەحاڵەتێکی ئاسای خۆی لەشتەکان، زۆر تەپوتۆز لەگیانمان نیشتووە، دەبێت خۆمان بتەکێنین، هەموو دنیاش وایە، قسەیەکی لینین هەیە دەڵێت بژارکردن حیزب بەهێزدەکات، ئایا دەبێت خۆمان بژارنەکەین؟ ئایا دەبێت بێ کەموکوڕی بین و ئیجرائات نەکەین؟!

لڤین: مەبەستت ئەوەیە یەکێتی گەیشتووەتە ئەو ئاستەی بەدەربڕینی کۆسرەت رەسوڵ د. بەرهەم، گەیشتووەتە دووڕیانێك، یان چاکسازی یانە رێگەدان بەو ململانێ ناشەرعییە؟

عیماد ئەحمەد: چاکسازییەکە بێت باشترە، بەردەوامبوونی ململانێ بەو شێوەیەی کە ئێستا هەیە، بەخەتەر دەزانم بۆسەر یەکێتی.

لڤین: دوو جێگرەکە چوون بۆ بەغدا و باس لە گۆڕان کرا، دواتر لەراگەیاندنی یەکێتییەوە باس لەوە کرا مام جەلال سەلاحیەتی تەواوی پێیانداوە؟

عیماد ئەحمەد: پێشتر مام جەلال بەنوسین سەلاحیەتی خۆی داوە بە هەردوو جێگرەکە، لەمەکتەبی سیاسیش وتوویەتی ئەرك و ئیشوكاری ناو یەكێتی دەسپێرم بە هەردوو جێگرەكە و مەكتەبی سیاسیی، با من وەك موراقیب سەرپەرەشتی كارەكان بكەم.

لڤین: ئەمە لەكاتێكدا هەمووتان باس لە چاكسازی دەكەن، پێتان وانییە مام جەلال بەم هەنگاوەی بیانووی هەمووتانی بڕیوە؟

عیماد ئەحمەد: بەڵێ، مام جەلال بەشێكە لەیەكێتی، ناتوانین لەدەرەوەی یەكێتی داینێین، ئەو چوارەش كە موزەكەرەكەیان داوە، دەڵێن چاكسازیی بەڕابەرایەتی مام جەلال.

لڤین: ئەو شیعارەشیان هەیە كە چاكسازی بەبێ ئەوەی كە هەموو ئەو ئەندامانەی كە لەماڵەوەن نەگەڕێنەوە، چاكسازی ناكرێت، تۆ پێتوایە لەیەكتر تێگەیشتن نییە؟

عیماد ئەحمەد: نەخێر، باش لەیەكتر تێدەگەین، وازهێنانی ئەوان پەیوەندی بەهەڵوێستی خۆیانەوە هەیە، ئەوان لە مەنزوورێكەوە بۆی دەچن، برادەرانی مەكتەبی سیاسی و بەڕێز مام جەلال هۆكارەكە و كاتەكەشی دەزانن، پێمانباشنەبوو ئەوان ئەو هەڵوێستە وەربگرن، پێمانباشبوو ئەوان بەشێك بوونایە لە چارەسەر، نەك بەشێك بن لە كێشە.

لڤین: پێتوایە ئاڕاستەی یەكێتی بەرەو كوێ دەڕوات؟

عیماد ئەحمەد: ئەگەر هیمەتنەكەین، بەرەو باشی ناڕوات.

لڤین: ڕێگری و بەربەستەكانی بەردەم ریفۆرمێكی عەمەلی چین، یاخود پێتوایە بەربەست نییە؟

عیماد ئەحمەد: چۆن بەربەست نییە؟ بەربەست بەرژەوەندییە تایبەتەكانن، ڕای جیاوازە، بالآنسی ناو تەكەتولەكانی یەكێتییە، ئەمانە هەموو كۆسپن، چەند هەڵبژاردنمان لەناو یەكێتیدا كردووە بۆ دامودەزگاكان، بۆ ئەم هەڵبژاردنەی ئەخیر ئەمەی لێكەوتەوە؟ بۆ ئەوانی تر وایان لێنەهات؟

لڤین: ئەگەر نەوشیروان مستەفا نەگەڕێتەوە، چی دەبێت؟

عیماد ئەحمەد: پێمانخۆشە بگەڕێتەوە، بەڵام بەم هاوکێشەیەی ئێستا، زەحمەتە بگەڕێتەوە، بەموستەحیلی نازانم کە بگەڕێتەوە، تەسەورم وایە کە تێگەیشتن لەنێوان مام جەلال و کاک نەوشیروواندا هەبێت و پێشمباشە ئەو تێگەشتنە هەر هەبێت.

لڤین: ئەگەر نەگەڕێتەوە چی دەبێت؟

عیماد ئەحمەد: کاك نەوشیروان زۆر لەوە گەورەترە کە خەڵك بیر لە هەندێك شت دەکاتەوە، کاك نەوشیروان مستەفا مەسئولە و بڕیاری مەسئولانە دەدات.

لڤین: ئامادەکاریتان بۆ ئەوە کردووە کە ئەگەر لیستێك لەدەرەوەی یەکێتی دروست ببێت، هەڵوێستان چی دەبێت؟

عیماد ئەحمەد: پێمانباش نییە، لیستێك لەناو یەکێتی جیاببێتەوە و دروستببێت، لیستێك خاریجی بێت ئاساییە، بەڵام لیستێك لەیەکێتی جیاببێتەوە، پێمانباش نییە.

لڤین: هەڵوێستتان چی دەبێت؟

عیماد ئەحمەد: پێمانباش نییە و دەرەنجامەکەی لە قازانجی یەکێتی و خوێنی شەهیدان و ئەم میللەتە چەوساوەیە نییە، چونکە ئەوە دەبێتە ئینشیقاق، بەقازانجی نازانین.

لڤین: بەوپێیەی ئەندامی مەکتەبی سیاسیت، بەچوونە دەرەوەی باڵی ریفۆرم بارودۆخی یەکێتی چی لێدێت؟

عیماد ئەحمەد: دێنەوە و لەلایەن مام جەلال و زۆر کەسی تریشەوە هەوڵی بۆ دەدرێت کە بێنەوە، چونکە مام جەلال پێیخۆش نییە کە کاك نەوشیروان لەدەرەوەی موعادەلەکە بێت.

لڤین: ئێستا هەوڵەکانی ئەو گەڕانەوەیە گەیشتوونەتە کوێ؟

عیماد ئەحمەد: مام جەلال نامەیەکی لەڕێگەی کاك دلێری سەید مەجیدەوە ئاڕاستەی کاك نەوشیروان کردووە، ئیمکانە بەمنزیکانە یەکتری ببینن.

لڤین: باڵی ریفۆرم و چوار ئەندام مەکتەب سیاسییەکە و کۆسرەت ڕەسوڵیش باس لەوە دەکەن کە ناشەفافی لەناو یەکێتیدا هەیە؟

عیماد ئەحمەد: بەڵێ وایە، بەڵام بۆ دەڵێن باڵی ریفۆرم، باڵەکەی تر ناریفۆرمە؟ ناو دەبێت لەگەڵ ناوەڕۆکدا بگونجێت.

لڤین: ریفۆرم وەك ئەوەی دەوترێت کە ناسراوە بەباڵی ریفۆرم.

عیماد ئەحمەد: نا باڵی چی، کاك نەوشیروان تا ئێستا بەخۆی نەوتووە من باڵم، بڕۆ لەخۆشی بپرسە، بزانە بەخۆی دەڵێ چی و خۆی ئەو وەڵامەت دەداتەوە.

لڤین: گرووپی نەوشیروان مستەفا فیکرەی جیاوازیان هەیە و لەگەڵ چوار ئەندامەکە دەڵێن ناشەفافی لەناو یەکێتی هەیە؟ تۆش پێتوایە هەیە؟

عیماد ئەحمەد: منیش دەڵێم هەیە، بەڵێ منیش لەگەڵ رەئی ئەواندام، دەبێت هەوڵبدەین ئەو مەسەلەیە جێبەجێبکەین و لەخۆشمانەوە دەستپێبکەین و ئەوەی وەرمانگرتووە بۆ چالاکییەکانی چوار ساڵ لەمەوبەر، تەسفیەی حیساباتی خۆمان بکەین و بیخەینە بەردەم لایەنی پەیوەندیدار.

لڤین: سێ مانگی تر هەڵبژاردن دەکرێت، پێتوایە یەکێتی پۆستی سەرۆك وەزیران لە پارتی وەربگرێتەوە؟

عیماد ئەحمەد: بێگومان حەقی خۆیەتی، پارتیش نکولی لێنەکردووە.

...ن –ژماره ٧٨ -٢٠٠٨/١١/١



## د.عومەر شێخ موس: خەڵك حەقی خۆیەتی را پەڕین بكات، ئەگەر پارتی و یەكێتی نەگۆڕێن لێرەش را پەڕین دەستپێدەكات.

گفتوگۆی ئیراهیم عەلی و هەڵگور سەمەد

د.عومەر شێخموس لەدامەزرێنەرە سەرەكییەكانی یەكێتی نیشتیمانی كوردستانە، هەرچەندە (٢٢) ساڵە وازی لەكاری حیزبایەتی هێناوە، بەڵام زۆر نیگەرانە لەو بارودۆخەی كەئێستا یەكێتی پێیدا تێدەپەڕێت، هەربۆیە ئێستا هاتووەتەوە بۆ كوردستان و بەنیازە میانگیری بكات لەنێوان باڵی تاڵەبانی و نەوشیرواندا.

كاتێك لەبەرامبەری دادەنیشیت، بەو تەمەنەشەوە هەستدەكەیت لەبەرامبەر كەسێك دانیشتوویت كە زۆر بەدیقەتەوە قسەدەكات و حیساب بۆ یەكە بەیەكەی قسەكانی دەكات، سیاسەتمەدار عومەر شێخموس یەكێك لەدامەزرێنەرانی یەكێتییە، ئەو كەسێكی قاڵبووی نێو سیاسەتە وەك شارەزایەك لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و چاودێرێكی بارودۆخی سیاسی كوردستان، لەم دیمانەیەدا تیشك دەخاتە سەر زۆر شت، لەوانە: بارودۆخی ناوخۆئێستای یەكێتی نیشتیمانی و ئەو نارەزاییەی خەڵكی كوردستان لەبەرامبەر دوو حیزبەكە هەیانە، ئەمەش بەشی یەكەمی ئەو دیمانەیەیە كە (لڤین) لە دواین سەفەری عومەر شێخ موسدا بۆ كوردستان، لەگەڵ سازیداوە.

لڤین: بەڕێزت وەك یەكێك لەدامەزرێنەرانی یەكێتی، پێتوایە دوای تێپەڕبوونی (٣٣) ساڵ بەسەر دامەزراندنی یەكێتیدا، ئەم حیزبە پابەندە بەو ئامانجانەوە كە لەپێناویدا دروستبووە، یان پشتیكردووەتە ئامانجە راستەقینەكانی خۆی؟

عومەر شێخ موس: دەتوانم بڵێم لەو ئامانجانەی كە بۆ خۆمانمان دانابوو، ٨٠٪ ی بەدیهاتوون، لەوانەیە ٢٠٪ یان بەدەستنەهاتبێت، لە ٨٠٪ ی لەوەدا بەدەستهاتووە كە رژێمی سەدام روخا و كوردستان بووەتە هەرێمێكی فیدراڵی ، میللەتی كورد مەترسی راگواستن و ئەنفالی لەسەر نەماوە، ئێستا كوردستان یەكێكە لەهەرێمە

بزووتنەوەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست، لەو ئامانجانەشی کەیەکێتی نەیتوانیوە بەدەستیانبهێنێت، هەندێك ئامانجی کۆمەلآیەتیمان هەبوو، وەك مەسەلەی گۆڕینی کۆمەڵ و مافەکانی ژنان و دابەشکردنی زەوی و چەندانی دیکە، ئەمانە دواخراوە لەبەر ئەو رەوشەی که لەدوای (١٩٩١) وە هاتوونەتەپێش، لەدوای راپەڕینەوە تاوەکو ئێستا، چەندان ڕووداوی ناخۆش ڕوویانداوە، وەکو شەڕی ناوخۆ، بەلآم ئێستا وا خەریکە حکومەتی یەکگرتوو دروستدەبێت، بەلآم هەندێك دیاردە پەیدابوون لەنێو بەرپرسانی یەکێتی نیشتیمانی و حیزبەکانی تریش که بەدڵم نین، ئەو لێپرسراوانە خەریکە دەبن بەنوخبەیەك وەك بەرپرسانی زۆرێك لەولآتانی جیهانی سێیەم، لەکاتی خەباتی رزگاریخوازی شتێك بوون، کەچی کەهاتنە سەر دەسەلآت، بوونەتە شتێکی دیکە، من بەشبەحاڵی خۆم، ئێستا زۆرێك لەدۆستەکانی خۆم ناناسمەوە، ئەوە پەیوەندی بەدەسەلآتەوە هەیە، ناڵێم هەموویان، بەلآم زۆریان وایانلێهاتووە، دەبێت وریا بن.

لڤین: ئێستا لەهەموو کات زیاتر، یەکێتی بەدەست گرفتی ناوخۆیی خۆیەوە دەناڵێنیچت، بەبڕوای تۆ، لەسایەی ئەم بارودۆخەدا یەکێتی بەرەو کوێ دەچێت؟

عومەر شێخ موس: ئێمە کەیەکێتی نیشتیمانیمان دامەزراند، بیرمان لەرێکخراوێکی یەکگرتوو کردبووەوە، نەك لەسەر بنەمای تەیاراتی رێکخراو بێت، بەڵکو قبوڵمان بوو که فیکری جیاواز و بۆچوونی جیاواز لەناو یەکێتیدا هەبێت، بەلآم لەناو رێکخراوێکی یەکگرتوودا، ئێمە ئەوانەی لەدەرەوەی وڵات بووین، بەوشێوەیە بیرمان لێ کردبووەوە، بەلآم بەداخەوە ئەو برادەرانەی لەناو وڵات بوون، بەشێوەیەکی دیە جموجوڵیان کرد و ئێمەش ناچاربووین ئەوە قبوڵبکەین. ئەویش بوو بەتەیاراتی رێکخراو، کۆمەڵە و بزوتنەوە و خەتی گشتی بوون، ئەم حاڵەتە بەردەوام بوو تا ئەم ساڵانەی دوایی، تەیاراتی رێکخراو نەما و یەکێتی بوو بەیەك رێکخراو، بەلآم ئەو جیاوازییە فیکرییەی که هەبوو، ئێستا رەنگی تەکەتولی بەخۆیەوە گرتووە، ئەوە زەرەرێکی گەورەی لەیەکێتی داوە، لەجیاتی ئەوەی یەکێتی رێکخراوێکی

هەندێ گەورە بێت، ئەو تەکەتولاتە خەریکە کاریگەری دەبێت بۆ کەمبوونەوەی نفوز و توانای یەکێتی نیشتیمانی، ئەو سروشتەی یەکێتی، هۆی بەهێزی و هۆی لاوازیشییەتی. هۆی بەهێزییەکەی ئەوەیە کە ڕێکخراوێکی لیبراڵە و ڕێگەدەدات بە بۆچوون و دەربڕینی جیاواز، لەکاتی خۆی ڕێگە بەدروستبوونی ڕێکخراوی جیاوازیش دەدا، بەڵام هەر ئەو تەباراتانە خۆیان دەتوانن ببن بەهۆی لاوازبوونی یەکێتی، چونکە سەرەنجام ناکۆکی لەنێوان ئەم تەیاراتانە دروستدەبێت، نەك ململانێی ڕێکوپێکی دیموکراتیانە، بەداخەوە خەریکە وای بەسەربێت، بەڵام ئێستا بیریان لەوە کردووەتەوە کە ئەوە زەرەر لەیەکێتی دەدات و بیریان لەئالیەتێك کردووەتەوە بۆ کۆنگرەی داهاتوو، کە بەلایەنی زۆرییەوە لە بەهاری ئایندەدا دەبێت.

لڤین: ئەگەر مەسەلەی ئازادی یەکێك بێت لەئامانجەکانی یەکێتی، ئێستا دەبینین لەسەر بۆچوون و ڕای جیاواز خەڵك لەیەکێتی دەردەکرێت، ئەوە لە کوێی یەکێتیدا جێگەی دەبێتەوە؟

عومەر شێخ موس: من لەگەڵ ئەو بۆچوونە نیم کە لەسەر ڕای جیاواز خەڵك لە یەکێتی دەربکرێت، بۆیەش من لەوەختی خۆی لە ساڵی (١٩٨٦) ئیستیقالەم داوە، چونکە من بۆچوونێکی دیکەم هەیە، من پێمباشە یەکێتی وەکو حیزبێکی سۆسیالیستی فەرەنسا بێت، کە ڕێگە بەتەیاراتی جیاواز دەدات لەناو حیزبەکەدا، یەکێتی نیشتیمانی ئێستا بڕیاری داوە کە قبوڵی موعارەزەی ڕێکخراو ناکات لەنێو حیزبدا، ئەوانەی کە خۆیان ناودەنێن حیزب، یەکێتی دەڵێت ئێمە ڕێگەدەدەین بەبیروڕاو بۆچوونی جیاواز، بەڵام لەچوارچێوەی حیزبدا.

لڤین: پێتوایە ئەو ڕێگەنەدانە، ترسی لەدەستدانی کورسییەکانیانە لەلایەن سەرکردایەتی یەکێتییەوە؟

عومەر شێخ موس: دوور نییە، من لەوە دڵنیا نیم، چونکە من ماوەیەکی زۆر نییە کە هاتوومەتەوە، بەڵام ئێستا وا پێدەچێت کە مەترسی ئینشیقاقێك لەناو یەکێتیدا هەبێت.

لڤین: پێتوانییە دوورکەوتنەوەی نەوشیروان مستەفا ئەم ڕەوشەی ئێستای یەکێتی دروستکردووە؟

عومەر شێخ موس: ئەو ململانێیەی کە هەیە، ململانێی فیکری جیاوازە، ئەوە هێشتا ساغنەبووەتەوە کە بەکام لادا دەڕوات، کاك نەوشیروان خۆشی بڕیارەکەی نەداوە کە ئایا لەناو یەکێتیدا دەمێنێت یان لەدەرەوەی یەکێتی دەبێت، دەبێت لەنێوان خۆیان گفتوگۆ بکەن کە بەرەو کام لا دەڕۆن، من ئەوەیکە دەیبینم سێ چوار بۆچوونی جیاواز لەناو یەکێتیدا هەیە، بەڵام ئەوانەی کە بەزەقی بیروڕای خۆیان دەردەبڕن، کاك نەوشیروان و ئەو برادەرانەن کە لەگەڵیدان.

لڤین: چاودێرانی سیاسی پێیانوایە کە سەرهەڵدانی ئەو باڵانە لەناو یەکێتی و سەرقاڵبوونی یەکێتی بەناوخۆی خۆیەوە، دەبێتە هۆی ئەوەی کە پارتی بەهێز بێت و تەرازووی هێز لەکوردستانلاسەنگ بێت، بەبۆچوونی ئێوە، ئەو ململانێیەی ئەم دواییەی ناو یەکێتی تەرازووی هێز لە کوردستان تێکدەدات؟

عومەر شێخ موس: بێگومان هەرکەسێك لە ئەلف و بای سیاسەت تێبگات، دەزانێت کە ئەو ڕەوشەی ئێستای یەکێتی زەرەر لەیەکێتی نیشتیمانی دەدات. من بەشبەحاڵی خۆم ، زۆر بەزەرەری دەزانم کە تاکە حیزبێك لەکوردستاندا زاڵ ببێت بەسەر ڕەوشی سیاسی لەهەموو کوردستان، من زاڵبوونی هەردوو حیزبەکەش بەخراپ دەزانم بۆ ئایندەی سیاسی لە کوردستان، من پێمخۆشە بەدیلی سێیەم و چوارەمیش هەبێت، پێمباشە حیزبێکی سێیەمی بەهێز و حیزبێکی چوارەمی بەهێز هەبووایە، بۆ ئەوەی ئەو دوو جەمسەرییەی کە لەکوردستان هەیە، نەمێنێت. ئێمە لەسیستەمی جیهانی سیاسی دەزانین کە لەکاتی سۆڤیەت و ئەمریکا ململانێکە چەند سەخت و داخراو بوو. من ئەو دوو جەمسەریەم پێ خراپە بۆ پرۆسەی دیموکراسی کوردستان، بەڵام نەك ببێت بەناکۆکی و شەڕی ناوخۆ.

لڤین: پێتوانییە کەیەکێتی و پارتی خۆیان ڕێگرن لەدروستبوونی هێزی سێیەم و چوارەم لەکوردستاندا؟

عومەر شێخ موس: دوور نییە ئەوان پێیاننا خۆش بێت، بەڵام ئەگەرلا خەڵك خۆی کۆبکاتەوە و ڕێگە خۆشبکات و ڕێکخستن دروستبکات، ئەوان ناتوانن ڕێگری بکەن، بەڵام بێگومان کەس بەئاسانی دەسەڵات بەجێناهێڵێت، ئەمە لەهەموو دونیادا وایە، دوورنییە پارتی و یەکێتی دروستبوونی هێزێکی لەوجۆرەیان پێناخۆش بێت، دوور نییە ڕێگەشی لێبگرن.

لڤین: تۆ لەسەرەتا ئاماژەت بەوە کرد کە برادەرانی سەردەمی شۆڕش ئێستا ناناسیتەوە، زۆرجار دەوترێت ئەوانەی لەسەردەمی شۆڕش لەپێناو ئازادیدا خەباتیان کرد، هەمان ئەو کەسانەن کە ئێستا بوونەتە مەترسی بەسەر ئازادییەوە، ئێستا لە کوردستانیش هەمان شت دەبینرێت، ئێوە تێبینیتان لەسەر ئەمە چییە؟

عومەر شێخ موس: وەکو باسمکرد لە زۆر شوێنی دونیا هێزە ڕزگاریخوازەکان کە دەسەڵات دەگرنەدەست، جۆرە گۆڕانێکیان بەسەردێت کە لەگەڵ سروشتی پێشوویان ناگونجێت، پێموایە ئەمە سروشتی دەسەڵاتە، هەندێك لەو برادەرانە چ لەناو پارتی و چ لەناو یەکێتی، بەداخەوە دیارە دەسەڵات گێژی کردوون.

لڤین: پێتوایە یەکێتی پێویستی بەگۆڕانە لەسیستەم یان پێویستە سەرکردایەتی یەکێتی بگۆڕێت و کۆمەڵێك کەسی دیکە بێتەپێشەوە؟

عومەر شێخ موس: بەبۆچوونی من، پێویستە هەردوو گۆڕانکارییەکە بکرێت، یەکێتی پێویستی بەگۆڕانکاری لەڕێکخستنەکانی هەیە، پێویستی بەبەرنامە و پەیڕەوێکی ناوخۆی تازە هەیە، پێویستی بەگۆڕانکارییەکی گەورە هەیە لەسەرکردایەتی و لە ڕێکخستنەکانیدا، نەك تەنیا یەکێتی بەڵکو پارتی و تەواوی هێزەکانی دیکەش پێویستیان بەو گۆڕانکاریانە هەیە، ئەگەر خۆیان نەگۆڕن وەکو حیزبەکانی ئەورووپای ڕۆژهەڵات و سۆڤیەتیان بەسەردێت و لەشوێنی خۆیان دەمرن، ئەگەر سەیری سەرکردایەتی حیزبەکان بکەین، زۆربەیان لەجیلی یەکەمی ئەو حیزبەن، جیلی دووەم و جیلی سێیەم زۆر بەکەمی هاتوونەتە سەرکردایەتی، ئەو حیزبانە توشی جۆرێك لە چەقبەستن بوون، ئەو پێڕەوی ناوخۆییەی یەکێتی لە ساڵی

١٩٧٥) نوسراوه، لەساڵی (١٩٧٥) ەوە تاوەکو ئێستا دنیایەك گۆڕان روویداوە، ئەگەر لەیەکێتییەوە سەیر بکەین، یەکێتی لەحیزبێکی بچوکی رزگاریخوازی بووەتە یەکێك لەحیزبە گەورەکان، دەسەلاتی لە عێراق و کوردستاندا هەیە، ئێویستە پێڕەوێکی تازە و ئامانجی تازە بۆ خۆی دابنێت، دونیا بەشێوەیەك گۆڕاوە، ئەگەر خۆی تازەنەکاتەوە، ئلیندەی باش نابێت.

لڤین: ئەگەر سەیری یەکێتی و پارتی و تەواوی حیزبە کوردییەکان بکەین، دەبینین زۆر لەنوێبوونەوە و کۆنگرە ترسیان هەیە، لەتەواوی مێژووی یەکێتیدا تەنیا دوو کۆنگرەی بەستووە، هۆکاری ئەو ترسە لەکۆنگرە چییە؟

عومەر شێخ موس: من بەپلەی یەکەم بەرپرسیارێتی ئەمە دەخەمە ئەستۆی سەرکردایەتی ئەو دوو حیزبە، نەك لەبەرئەوەی کەدەترسن، بەڵکو ئەوان رازین بەو رەوشەی کەهەیە، بۆخۆیان باشە ئەگەر حیزبەکانیان نوێببنەوە، چونکە گروتینێکی تازە دەدرێتەوە بە حیزبەکان بەهۆی نوێبوونەوەیان. ئەمە بۆچوونێکی ناڕاستە کە وا دەبینن ئەگەر ئەم رەوشە وەها بمێنێتەوە، بەقازانجی ئەوانە، من ئەمە بەپێچەوانەوە دەبینم.

لڤین: لەکاتێکدا کە گۆڕان لەبەرژەوەندی رەوشەکە و حیزبەکە بێت، دەبینین کە هەر رەوتێك لەناو ئەو حیزبانە دروست ببێت بۆ چاکسازی و گۆڕان، هەوڵی بچوککردنەوە و لەناوبردنی دەدرێت، ئەمە هۆکارێك نییە بۆ مانەوە لەدەسەلات تا مردنی کەسەکان؟

عومەر شێخ موس: ئەوە سەرەتای ململانێکەیە، مەرج نییە هەتا هەتا وابێت، دوور نییە رێگاچارەیەکیدیکە بدۆزنەوە، ئەوە دیاردەیەکە پەیوەندی بەسەرهەڵدانی ململانێکانەوە هەیە، بەلام لەناوەوە دەبێت چارەسەرێکی بۆ بدۆزرێتەوە.

لڤین: خوێندنەوەت بۆ ئایندەی یەکێتی چییە؟ ئایا وەکو ئێستا بەو حاڵەتە بەردەوام دەبێت، یاخود لێکترازانی باڵەکان روودەدات و دەبنە چەند هێزێکی جودا، یان دەبێتە هێزێکی تۆکمەی بێ تەکەتول؟

عومەر شێخ موس: ناتوانم هیچ پێشبینییەك بكەم، بەڵام من لەگەڵ سەركردەكانی بەرەی نیشتیمانی قسەمكردووە، دەزانم كە كۆنگرەیان لەپێشە و بڕیاریانداوە بۆ هەندێك هەنگاوی ریفۆرم و نوێكردنەوە، بڕیاریشیان داوە لە كۆنگرەی ئایندەدا، بەرنامەیەكی تازە دابنێن.

لڤین: بەڵام زۆرجار بەرپرسانی یەكێتی گلەیی ئەوە دەكەنكە بڕیارە یەكلاكەرەوەكانی یەكێتی (بە كۆنگرەشەوە)، تەنیا تاڵەبانی بڕیاری لێدەدات، پێتوانییە یەكێتیش ببێتە حیزبێكی بنەماڵەیی؟

عومەر شێخ موس: من ناتوانم بڵێم یەكێتی دەبێتە حیزبێكی بنەماڵەیی، چونكە هێشتا نەگەیشتووەتە ئەو رادەیە، پارتیش خەریكە دەبێتە پارتێكی دامەزراوەیی، نەك تەنیا بنەماڵەیی بێت، بۆیە من ئەو بۆچوونە بەراست نازانم، جاران رەنگە ئەو بۆچوونە راست بوو بێت، بەڵام كە دەبینین كوردستان بەرەو دەوڵەتێكی موئەسەساتی دەچێت، ئەو دوو حیزبە ناچاردەكات كە بگۆڕێن.

لڤین: ئەمە رەنگە بڵێین تاڕادەیەك راستە، بەڵام دەبینین پارتی و یەكێتی ئەوەندەی لەپێناو بەدیهێنانی ئامانجە حیزبییەكانیانهەوڵدەدەن، ئەوەندە بۆ بەدیهێنانی ئامانجە نەتەوەییەكان هەوڵنادەن.

عومەر شێخ موس: ئەوە كارێكی خراپە، من لەوەدا لەگەڵتدام، كاتی ئەوە هاتووە كەیەكێتی و پارتی تەنیا بیر لە بەرژەوەندی حیزبیی خۆیان نەكەنەوە، دەبێت بیر لەبەرژەوەندی نەتەوەیی بكەنەوە، هەر حیزبێك مافی خۆیەتی كە هەوڵی ئەوە بدات، نفوزی خۆی زیاتر بكات، بەڵام كە تۆ دەوڵەتیكت دامەزراند و حكومەتێكت هەبێت و دەسەڵاتت بەسەر گەلێكدا هەبێت، دەبێت بیر لەو گەلە بكەیتەوە، زۆرجار دەبیچت واز لەبەرژەوەندی حیزبی بهێنرێت لەپێناو بەرژەوەندی میللەتدا، بۆیە بەو رەفتارە زەرەر لەخۆیان دەدەن، نابێت بیریان وا سنورداربێت، تەنیا بیر لەبەرژەوەندی حیزبی بكەنەوە، ئەوە دەبێتە هۆی نارازیبوونی خەڵك لەدەستیان، لەوەشدا چەند شتێك هەیە رەنگە ئەوە ببێتەهۆی نارازیبوون و تەقینەوە بەرووویاندا، یەكێك

هۆ کارەکان مەسەلەی گەندەڵییە، هەروەها شتێکی دیکەش دەسەڵاتی حیزبییە، خەڵك هەتا هەتایە ئەوە قبوڵناکات، دەبێت خۆیان بگۆڕن و بۆچوونەکانی خۆیان بگۆڕن، ئەگەرنا لێرەش ڕاپەڕین دەستپێدەکات.

لڤین: پێتوانییە بنەماکانی ئو ڕاپەڕینە بەدەرکەوتووە لە کوردستاندا، بۆ نموونە: باسی دوو خاڵت کرد کە گەیشتونەتە لوتکە، گەندەڵی و دەسەڵاتی ڕەهای حیزب؟

عومەر شێخ موس: من نازانم ئەو شتانە گەیشتوونەتە لەوتکە یان نا، بەلام خەڵك زۆر باسی دەکەن، پێموایە ئەوە زیادبوونی نارازیبوونە، بۆیە خوێندکار و خەڵك بۆ ئاو و کارەبا خۆپیشاندان دەکەن، چەندین خۆپیشاندان ڕوویداوە، من دەڵێم دەبێت زوو بەخۆ بکەون ریفۆرم و چاکسازی بکەن، من ئەوەشتەم بە بەرپرسانیش وتووە، بەکاك هۆشیار و کاك بەرهەم و بە مام جەلالم وتووە. مەسەلەی ڕاپەڕین حەقی خەڵکە، کە شتێك بوو داوای گۆڕین بکات و داوای مافی خۆی بکات، هەقی خۆیەتی، بەلاّم شتیکی دیکە کە زۆرلێی دەترسم، ئەویش ئەوەیە کەهێزی ئیسلامیی سیاسی لە دەرەنجامی ئەو ڕەوشە بەهێز ببن، وەکو فەلەستین و تورکیا، وەکو زۆرێك لە وڵاتانی ئاسیا و ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاست کە دەسەلاّت بگرنەدەست.

گۆڤاری لڤین -ژماره ٧٩ - ٢٠٠٨/١١/١٥



## د. عومەر شێخموس: سەرکردە کوردەکان لەبەغدا سیاسەت ناکەن، یان جوامێری دەکەن یان تەنازول

گفتوگۆی ئیبراهیم عەلی و هەڵگورد سەمەد

د. عومەر شێخموس لەدامەزرێنەرە سەرەکییەکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستانە، هەرچەندە (٢٢) ساڵە وازی لەکاری حیزبایەتی هێناوە، بەڵام زۆر نیگەرانە لەو بارودۆخەی کە ئێستا یەکێتی پیادا تێپەڕدەبێت، هەربۆیە ئێستا هاتووەتەوە بۆ کوردستان و بەنیازە میانگیری بکات لەنێوان باڵی تاڵەبانی و نەوشیرواندا.

بەشی دووەم و کۆتایی

لڤین: ئەوە نزیکەی حەڤدە ساڵە کە کورد لە کوردستان حوکمی خۆی دەکات، بەڵام دەبینین رۆژبەرۆژ کێشەکان زیاتر دەبن، بەتایبەت ئەو نادادیەی کەهەیە و مەسەلەی گەندەڵی و ئازادی رادەبڕین و دەیان شتی دیکە، کە ئەزموونی هەرێمی کوردستان دەخەنە ژێر پرسیارەوە، بیروڕای ئێوە لەوبارەیەوە چییە؟

عومەر شێخ موس: مرۆڤ کەحوکم لەسەر هەر شتێك بدات، دەبێت بەوپژدانەوە حوکمی لەسەر بدات، مێژووی حوکمڕانی کورد لە ساڵی (١٩٩٢) ەوە دەستپێدەکات، لەو کاتەی کە هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان ئەنجامدرا و حکومەتی هەرێم دامەزرا، ئەو کات کوردستان وێران بوو، حکومەتی هەرێم ئەو کات لەژێر ئابلۆقەی دوو لایەندا بوو، نەتەوە یەکگرتووەکان و حکومەتی عێراقی، ئەو حکومەتە یەکگرتووەی هەرێم تەنیا دوو ساڵ بەوشێوەیە مایەوە، دواتر شەڕی ناوخۆ هەڵگیرسا و بوو بەدوو حکومەت و ناکۆکییەکی توند لەنێوان هەردوولادا هەبوو، وڵاتانی دراوسێ لەیەکەم رۆژەوە شەڕی ئەم کیانەیان کردووە، دووەمجار کە حکومەتی یەکگرتوو دروستکرایەوە لە ساڵی (٢٠٠٦) بوو، کەواتە ئەو حکومەتە تەمەنی تەنیا دوو ساڵە، بەڵام بەگشتی ئەگەر تەماشابکەین لە ساڵی (١٩٩٢) ەوە تاوەکو ئێستا، بەکەمی ئیمکانیاتیشەوە، دەسکەوتەکانی حکومەتی هەرێم بە بەراورد

هەندێك وڵاتانی دونیا دەسکەوتی گەورەن. هەروەها گەمارۆدانی حکومەتی هەرێم لەلایەن وڵاتانی دراوسێوە، یەکێکی ترە لەفاکتەرەکانی پێشنەکەوتنی حکومەتی هەرێمی کوردستان، بەڵام سەرەڕای ئەوانەش، لەناوخۆ کەموکوڕی هەیە، هەردوو حیزبەکە خەڵکی لێوەشاوەیان لەشوێنی بەرپرسیارێتی دانەناوە، خەڵکی حیزبییان داناوە، کە لەوانەیە شارەزای لەو شوێنە نەبێت کە لێی دانراوە، ئەوە زیانێکی زۆر گەورەی لەکوردستان داوە، دەکرا زۆر لەوە زیاتر بکرایە کە ئێستا هەیە، ئەگەر خەڵکی لێوەشاوە لەبەرپرسیارێتی دانرابایە، ئەوا دەسکەوتمان زۆر زیاتر دەبوو و پێشکەوتووتر دەبووین.

لڤین: زۆرجار باسی دروستبوونی ئۆپۆزسیۆن دەکرێت، پێتوایە لەکوردستان بۆچی تاوەکو ئێستا ئۆپۆزسیۆن دروستنەبووە؟ ئایا زەمینەکە لەبارنییە، یاخود پارتی و یەکێتی ڕێگرن لە دروستبوونی ئۆپۆزسیۆن، چونکە لەکورسییەکانی خۆیان دەترسن؟

عومەر شێخ موس: ناتوانم بەتەواوی بڵێم کە هۆکارەکانی دروستنەبوونی ئۆپۆزسیۆن لەکوردستان، ئایا ڕێگریی یەکێتی و پارتییە یان نا، بەراستی من پێمخۆشە کە پارتی سێیەم و چوارەم هەبێت لە کوردستان، من ساڵی (١٩٩٣) کە سەردانی کوردستانم کرد لەگەڵ ژمارەیەك ڕۆشنبیری ئێرە دانیشتم و زۆر هانم دان کە پارتی سێیەم دروست بکەن، بەڵام بەداخەوە پێیان نەکرا، هۆی دروستنەبوونی پارتی سێیەم لەکوردستان، بەبۆچوونی من دوو سێ هۆکاری هەیە، یەکێکیان لەوانەیە ئەم دوو حیزبە پێیان ناخۆش بێت کە پارتی سێیەم دروست ببێت و لەکورسییەکانی خۆیان دەترسن، دووەم: حیزبێك دروست ببێت کە بتوانێت ململانێ لەگەڵ پارتی و یەکێتی بکات، دەبێت ئیمکاناتێکی زۆری هەبێت یان هێزێکی جەماوەری زۆری هەبێت.

سێیەم: ئەگەر دیموکراسییەت هەبێت، دەبێت ئەو هێزە دروست ببێت، لە دەرەوە لەسەر ئەم بابەتانە فشار دەخرێتە سەر سیستەمی سیاسیی کوردستان و ڕەخنەی لێدەگیرێت، بۆنموونە: ئەو ڕاپۆرتانەی ساڵانە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بڵاویاندەکاتەوە و باس لەو مەسەلانە دەکات، هەروەها بەرپرسانی یەکێتی ئەورووپا

بەردەوامی چاودێری رەوشی کوردستان دەکەن، هەروەها مەسەلەی پێشێلکارییەکانی مافەکانی مرۆڤ کە ساڵانە ئەمنستی و هیومان رایتس وۆچ باسی لێوە دەکەن، بۆیە پێویستە رایگشتی جیهانی بۆ خۆمان رابکێشین، رایگشتی کەئێستا لەگەڵ ئێمەیە، بەهۆی ئەو عەلمانیەتەی کە هەیە. پێویستە رێز لەمافەکانی مرۆڤ و بیروڕادەربڕین و رۆژنامەگەری و راگەیاندن بگرین، ئەگەر هاتوو رێ لەمانە نەگیرا، ئەوا کاریگەری لەسەر ناوبانگی کوردستان دەبێت.

لڤین: پێتوایە لەکوردستان زەمینەسازی بۆ دروستبوونی ئۆپۆزسیۆن هەیە؟

عومەر شێخ موس: بەڵێ رەوشی مەوزوعی لەبارە، ئەوە سروشتی هەر حکومەتێکە لەدونیادا کە خەڵکی لێی ناڕازییە، ئەگەر هەر حکومەتێك داخوازییەکانی خەڵك جێبەجێنەکات، ئەوا خەڵك لێی ناڕازییە. لەهەڵبژاردنی ئایندەدا بەدیاردەکەوێت کە ئایا خەڵك دەنگ بەمانە دەدات یان نا، بەبۆچوونی من ئێستا لەکوردستان زەمینەیەکی زۆر خۆش هەیە بۆ دروستبوونی ئۆپۆزسیۆن. ئەو حیزبانەی کەئێستا لەسەر ساحەکەن، هیچکامیان ناتوانن ئەو رۆڵە ببینن وْ ببن بە ئۆپۆزسیۆن، زەحمەتکێشان و حیزبی شیوعی و سۆسیالیست و ئیسلامییەکان، هەریەکێکیان هەوڵدەدات یان یەکێتی یان پارتی رازی بکات بۆ ئەوەی کە بەشداربێت لە دەسکەوتەکان، من بەئۆپۆزسیۆنی راستەقینەیان نازانم، بەڵام دوور نییە لەئێستاوە تاوەکو هەڵبژاردنی ئایندە ئۆپۆزسیۆن دروست ببێت.

لڤین: سەبارەت بە پەیوەندی نێوان بەغدا و هەولێر، ئایا پێتوایە کە دەسەڵاتدارانی هەولێر مامەڵەیەکی دروستیان لەگەڵ دەسەڵاتدارانی بەغدا کردووە، بەتایبەت کە دەبینین کۆمەڵێك کێشە هەیە، چەندین ساڵە نەتوانراوە لەگەڵ بەغدا یەکلاییکرێتەوە، وەك مادەی ١٤٠ و کێشەی گرێبەستەکانی نەوت و چەندانی دیکە؟

عومەر شێخ موس: یەکێك لەو هۆیانەی کە زۆر کێشە یەکلایی نەبووەتەوە، ئەوەیە کە سەرکردەکان زۆر پشوو کورتن و لەبەغدا نامێننەوە، گفتوگۆکان بەدووروودرێژی

[illegible] ئەلفبایەکی گفتوگۆ ئەوەیە کە دەبێت لە گفتوگۆدا تۆ بەرامبەرەکەت ئەوەندە ماندوو بکەیت، ئەوەندە لەسەرخۆ بیت و لەسەر داواکانت سووربیت، بۆئەوەی هەموو داخوازییەکانت قبولّ بکات، دەسەڵاتدارانی کورد زۆر پشوو کورتن. ئێمە وەکو کورد بەگشتی سیاسەتمەدارانمان وا مامەڵە دەکەن کە مامەڵەی تاکە کەسی بێت، بۆ نموونە: جوامێری دەکەین و تەنازولی زۆر دەکەین، بەڵام لەمەسەلە نەتەوەییەکان نابێت وا رەفتار بکەیت، سیاسەت بەرژەوەندییە، دەبێت شت وەربگریت و بیدەیت، چونکە مەسەلەکە بەرژەوەندییە. نابێت لەبەرژەوەندییە بنەڕەتییەکانی خۆت بێیتەخوارەوە، شتێکی دیکە هەیە کە رێککەوتنەکانمان بەنووسین نەبووە، بەشێکی زۆری رێککەوتنەکان تەنیا زارەکی بووە، بۆیە تەفسیری زۆر بۆ دەکرێت. لەرۆژی یەکەمەوە دەبوایە شتەکان یەکلایی بکرابانایەوە، دەشتوانرا وا بکرابا، ئێستاش ئێمە لەبەرامبەر عێراقدا لەبەهێزترین کاتین، چونکە هەموو لایەنەکانی دیکە لەلایەنی کوردی بێهێزترن، مەسەلەیەکی دیکە ئەوەیە کە نابێت کورد ئەوەندە فشار لەئەمریکا قبولّبکات، ئەمریکا فشاری خۆی دەکات، کەیفی خۆیەتی، بەڵام نابێت ١٠٠٪ فشارەکانی قبولّبکرێن. بەبۆچوونی من، سەرکردایەتیی کوردستان هەڵەیەکی گەورەیان کردووە، ئەویش ئەوەیە کەجەماوەری خۆیان نەخستووەتەگەڕ.

لڤین: بۆچوونێك هەیە کەهەندێك چاودێری سیاسی پێیانوایە بەهێزبوونی بەغدا، یەکسانە بەلاوازبوونی حکومەتی هەرێم، بۆچوونی ئێوە لەوبارەیەوە چییە؟

عومەر شێخ موس: نەخێر، مەرج نییە ئەوە وابێت، دوور نیە کە حکومەتی ناوەندی ئەو خواستەی هەبێت، وەك جەعفەری هەولّی دا، وەك مالیکی هەولّی بۆ دەدا، بەڵام دەستور خاوەن دەسەڵاتە، ئەگەر دەستور چوارچێوەیەکی رێکوپێك بێت بۆ حوکم، بەهێزبوونی حکومەتی فیدرالّ نابێت لەسەر حسابی حکومەتی هەرێم بێت، یان بەهێزبوونی حکومەتی هەرێم نابێت لەسەر بێهێزبوونی حکومەتی فیدرالّ بێت.

لڤین: پێتوانییە حیزبە کوردییەکان مامەڵەیەکی ناچوونیەك و ناجۆر لەگەلّ حیزبە

[illegible] و شیعەکانی عێراق دەکەن، جەوهەر نامیق پێیوایە حیزبە کوردییەکان [illegible]، ڕێککەوتننامەی دوو قۆڵی و سێ قۆڵی و چوارقۆڵی دەکەن لەعێراق، بۆچوونی ئێوە چییە لەوبارەوە؟

عومەر شێخ موس: بەڵێ ئەم بۆچوونە وایە، دەبینین یەکێتی و پارتی و هەندێك حیزبی تر هاوپەیمانێتی کوردستانیان هەیە. دەبێت لەسەر بەرنامەیەك ڕێکبکەون کە بەرنامەیەکی ڕوون و ئاشکرایان هەبێت و بەو بەرنامەیە بچنە ناو گفتوگۆکانەوە. ئەو حاڵەتەی کەئێستا هەیە، لەئەنجامی ئەوەیە کە هەڵوێستێکی یەکگرتوو و بەرنامەیەکی یەکگرتوویان نییە.

لڤین: نەبوونی ئەم هەڵوێستە یەکگرتووە، ڕەنگدانەوەی ئەو ململانێیە حیزبییە نییە کە لە کوردستان هەیە؟

عومەر شێخ موس: بەڵێ وایە، تا ڕادەیەك وایە، بەڵام هۆکارێکی دیکە ئەوەیە کە دەبینین عەرەبەکان بەشی هەرە زۆریان حیزبی ناسیۆنالیستی عەرەبین، بەشێکی کەمیان عەلمانی دیموکراتین، شیعەکان ئیسلامیی سیاسین و لەفیکریاندا نییە کە دان بە مافەکانی کورددا بنێن.

پرۆفایلی عومەر شێخ موس

لە ساڵی (١٩٤٢) لە شاری (عامودا) ی کوردستانی سوریا لەدایك بووە.

یەکێکە لەدامەزرێنەرانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان لە ساڵی (١٩٨٦) لە یەکێتی ئیستیقالەی داوە.

دەرچووی کۆلێژی زانستی سیاسی و پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانە لە زانکۆی لەندەن.

لە (١٩٧٣) تا (٢٠٠١) مامۆستا و لێکۆڵەری سیاسی بووە لە زانکۆی ستۆکهۆڵم.

بەرپرسی پێشووی بەشی کوردیی دەنگی ئەمریکا بووە و ئێستا لە وڵاتی سوید نیشتەجێیە.

**هەندێك لەسەركردەكانی یەكێتی لەسەر تەكەتول راهاتوون و ناتوانن دەستبەرداری بن، چونكە بەرژەوەندییان دەكەوێتە مەترسییەوە.**

**عومەر شێخ موس، ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری یەكێتی باس لە یەكێتی دوای پلینیۆم دەكات**

**عومەر شێخ موس ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری یەكێتی نیشتیمانی كوردستان رەخنە لە تاڵەبانی دەگرێت و دەڵێت "پێمخۆش نەبوو مام جەلال لە پلینیۆمدا باسی كاك نەوشیروانی كرد." هەروەها دەڵێت " نەدەبوو بەهیچ شێوەیەك مام جەلال ئەوەندە تەكیز بخاتە سەر كاك نەوشیروان."**

لڤین: گفتوگۆی ئیبراهیم عەلی–هەولێر

شێخ موس بڕوای خۆی دەخاتەڕوو سەبارەت بە نەمانی تەكەتول لەناو یەكێتیدا بەهۆی پەیمانی ئاكارەوە و ئاماژە بەوە دەكات هەندێك سەركردەكانی یەكێتی لەسەر تەكەتول راهاتوون و ئەستەمە بەئاسانی بتوانن وازی لێبهێنن، چونكە وەكو ئەو وتی "مانەوەیان بەندە بەتەكەتولەوە."

د.عومەر شێخ موس هەرچەندە بە فیعلی لەمەكتەبی سیاسیی یەكێتی نییە، بەڵام هەمیشە لەیەكێتیدا وەكو خاوەن ماڵ حسێبكراوە و وەكو ئەندامێكی مەكتەبی سیاسیی فەخری حسێبكراوە، شێخ موس بەوە دەناسرێت لە كێشە ناوخۆییەكانی ئەمدواییەی یەكێتیدا هەڵوێستی ماماوەندی گرت و هەوڵی میانگیریشی لەنێوان نەوشیروان مستەفا و مام جەلالدا، بەڵام سەركەوتوو نەبوو.

لڤین: لەماوەی رابردوودا یەكێتی نیشتیمانی كوردستان بەئامانجی چارەسەركردنی كێشە ناوخۆیەكانی پلینیۆمی بەست، بەبۆچوونی بەڕێزتان كێشەكان ئەوەندە ئاسانن كە بتوانرێت بەبەستنی پلینیۆم چارەسەر بن؟

عومەر شێخ موس: بێگومان نەخێر، پلینیۆم تەنیا هەنگاوێك بوو بە ئاڕاستەی چارەسەری كێشەكان، هەروەها پلینیۆم ئامادەكاری بوو بۆ كۆنگرە، چونكە بەشی

هەندێکی کێشەکان لە کۆنگرەدا دەتوانرێت چارەسەری ریشەییان بۆ بدۆزرێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا چەند بڕیارێکی باش لە پلینیۆمدا دران، یەکێکیان دامەزراندنی کۆمیسیۆنێکی نەزاهە لەلایەن پێنج پارێزەرەوە بۆ لێکۆڵینەوە لەسەروەت و سامانی بەرپرسانی یەکێتی، بڕیاری ئەوە وەرگیرا لە مانگی نیسان یان ئایاری ساڵی داهاتوو کۆنگرە ببەسرێت، ئەگەر لەو کاتەدا کۆنگرە نەبەسرێت ئەوە سەرکردایەتی شەرعیەتی نامێنێت، ئەوەی کە گرنگ بوو ئەوە بوو کە هەڵوێستێکی نەرمیان وەرگرت بەرامبەر بە جیابووەوەکان، دەرگاشیان دانەخست بەرامبەر ئەوانەی پەشیمان دەبنەوە، تەنیا ئەندامانی مەکتەبی سیاسیی و سەرکردایەتی نەبێت، چونکە گورزێکی کوشندەیان لەیەکێتی نیشتیمانی دا. بەبۆچوونی ئەندامانی مەکتەبی سیاسیی و سەرکردایەتی ئەوانە زیانێکی گەورەیان گەیاندووە بەدەسەڵات و هەیمەنەی یەکێتی لەناوچەی دەسەڵاتی خۆیدا، جیا لەوە بڕیاری دامەزراندنی ئەنجومەنێکی چاودێری درا ، کە ئەمەش دەتوانێ چاودێریکات بەسەر تەواوی کار و چالاکییەکانی یەکێتی لەهەر ئاستێکدا بێت. بەگشتی دەتوانین بڵێین پلینیۆم هەنگاوی باشی نا بۆ دۆزینەوەی چارەسەری باشتر لە کۆنگرەدا.

لڤین: پەیمانی ئاکار بۆ کۆتایهێنان بەکێشەی تەکەتول یەکێك بوو لە دەرەنجامەکانی پلینیۆم، بەڵام کۆسرەت رەسوڵ لەلێدوانێکی رۆژنامەوانیدا ئەوەی خستەڕوو کە تائێستا هەنگاونەنراوە بۆ کۆتایهێنان بە تەکەتول، پێتوانییە کە سەرکردەکانی یەکێتی توانای ئەوەیان نەماوە کە پابەندی ئەو بڕیارانە بن کە واژۆیان لەسەر دەکەن؟

عومەر شێخ موس: پەیمانی ئاکار کە راگەیەنراوە هەموو بەشدارانی پلینیۆم دڵیان پێیخۆش بوو، هەروەها بەئومێدی ئەوەبوون کە کۆتای بەکێشەی تەکەتول بێت لەریزکانی یەکێتیدا، سەرکردەکانی یەکێتی نابێ ئەوەیان بیرچێ کە ئەوان بەڵێنی ئەوەیان داوە کە کۆتایی بەتەکەتول بهێنن، بەڵام بەبۆچوونی من ئەو کارە پێویستی بەماوەیەکی زۆر هەیە، دوور نییە هەندێك سەرکردە لەوە راهاتبن کە کار بەتەکەتول بکەن، ئەگەرنا بەرژەوەندییەکانیان دەکەونە مەترسییەوە، بێگومان ئەوانە وا بەئاسانی

دەستەبرداری تەکەتول نابن، ئومێدەدەکەم بەیەکجاری کۆتای بەتەکەتول بێت. دەبێت سەرکردەکانی یەکێتی ئەوە بزانن کە ئەگەر پابەندی پەیمانی ئاکار نەبن، ئەوە رێکخستنەکانی یەکێتی لێیان قبولٚ ناکەن و دوور نییە وەك چۆن لەهەڵبژاردنی پەرلەمانیدا سەرکردەکانی یەکێتی توشی شکست بوون ئاواش لە کۆنگرەِ رووبەڕووی هەمان سیناریۆ ببنەوە، هەرکەسێك لەو پەیمانە لابدات لەلایەن ئەنجومەنی چاودێرییەوە سزادەدرێت بەوەی کەنابێت خۆی هەڵبژێرێت لە کۆنگرەدا.

لڤین: لەماوەی رابردوودا یەکێك لەو خاڵانەی کە یەکێتی جیادەکردەوە لەهەر هێزێکی دیکە، بوونی بۆچوونی جیاواز بوو، بەڵام لەئێستادا ئەو کادیرانەی کە بەگوێرِایەڵی کارنەکەن و خاوەن بڕیاری خۆیان بن، یان دووردەخرێنەوە لەپۆست، یان پەراوێزدەخرێن. ئەم حاڵەتە چەند لەبەرژەوەندیی یەکێتییە؟

عومەر شێخ موس: ئەوەی روون و ئاشکرایە لای من جیاوازییەکی زۆر هەیە لەنێوان یەکێتی و پارتی لەرووی لیبراڵیەت و ئازادی کارکردن و رێگەدان بەبۆچوونی جیاواز، بەڵام ئەوەی یەکێتی قبوڵی ناکات ئەوەیە کە ناکرێت رەوتی رێکخراو لەنێویدا دروستببێت، بەڵام پلاتفۆرمی جیاواز قبوڵدەکەن لەنێوان ریزەکانی خۆیاندا. بەشێوەیەکی گشتی یەکێتی خواستێکی بەهێزی هەیە کە ببێت بەحیزبێکی سۆسیال دیموکراتی راستەقینە، ئەگەر بیەوێ ببێت بەحیزبێکی سۆسیال دیموکراتی راستەقینە نابێ لەسەر شێوازی حیزبە ستالینییە تەقلیدییەکان حیزبایەتی بکات و رێگە لەبیروڕای جیاواز بگرێت، چونکە ئەو کات تووشی رەخنەی توند دەبێتەوە لەلایەن حیزبە سۆسیال دیموکراتەکانەوە و دوورنییە ئەندامێتی خۆی لەدەستبدات، دوورنییە هەندێك کادری سەرکردایەتی هەبن کە لەکەشێکی نادیموکراتیانە پەروەردەکراون و بۆچوونی لینینییان هەبێت بیانەوێ بیروڕای جیاواز نەبێت لەناو یەکێتیدا ، ئەوانە پێویستیان بەکات هەیە کە خۆیان رابهێنن لەگەڵ بارودۆخی نوێی یەکێتی.

لڤین: لەساڵانی رابوردوودا کادرانی یەکێتی رەخنەیان لەپارتی دەگرت و بەوەی

کە ڕێبەرەکەیان حیزبی بنەماڵەیە و لەپارتیدا جگە لەبنەماڵەی بارزانی کەسی تر دەسەڵاتی نییە، بەڵام لەئێستادا یەکێتیش لەژێر هەیمەنەی بنەماڵەی تاڵەبانی بەڕێوەدەچێت و تەواوی ئەندامانی خانەوادەی تاڵەبانی پۆستی گرنگیان لەبەردەستە و بڕیاربەدەستی یەکێتین، هەندێك دەڵێن لەم ڕووەوە ئەو جیاوازییە کۆتاییهات کە لەنێوان پارتی و یەکێتیدا هەبوو.

عومەر شێخ موس: یەکێتی هێشتا نەگەیشتووەتە پارتی لەرادەی نفوز و دەسەڵاتی بنەماڵەدا، واهەستدەکەم پارتیش دەیەوێ نفوز و دەسەڵاتی بنەماڵە کەمبکاتەوە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەش نکولی لەوە ناکرێت کەچەند کەسێك لەنێو بنەماڵەی تاڵەبانی هاتوونەتە نێو دەسەڵاتەوە، بەڵام هەندێکیان مافی خۆیانە، چونکە لەناو شۆڕش بوون و کاریان کردووە، تۆ ناتوانی مافی وەرگرتنی پۆست لەوانە وەربگریتەوە تەنیا لەبەرئەوەی ئەندامی خانەوادەی تاڵەبانین، بەڵام ئەگەر کەسێکیش لەبنەماڵەی تاڵەبانی هاتە ناو دەسەڵات کە کارەکانی دیار نەبن و بەمافی خۆی پۆستی حیزبی و حکومی وەرنەگرێت، ئەوە ئەو کات خەڵك مافی خۆیەتی گلەیی بکات، ئەگەر ئەو کەسانە شیاوی وەرگرتنی پۆست بن با وەریبگرن، چی تێدایە؟ مەترسییەکە لەوەدایە ئەگەر کەسێك پۆست وەربگرێت تەنیا لەبەرئەوەی ئەندامی بنەماڵەی تاڵەبانییە، نەك مافی خۆی بێت.

لڤین: ئەوەی باس دەکرێت لەپلینیۆمی یەکێتیدا جەلال تاڵەبانی ئۆباڵی تەواوی شکستە مێژوویەکانی یەکێتی خستە ئەستۆی نەوشیروان مستەفا، بەڕێزتان لەم بارەوە چی دەڵێیت؟

عومەر شێخ موس: بەراستی من پێمخۆش نەبوو کە مام جەلال لەپلینیۆم ئەم باسانەی کرد، ئەگەر زوش بهاتایەتەوە کوردستان ئەوە پێشنیاری ئەوە دەکرد کە تاڵەبانی ئەم باسانەی نەورووژاندایە لەسەر کاك نەوشیروان، بەڵام بەداخەوە پێرانەگەیشتم. نەدەبوو بەهیچ شێوەیەك مام جەلال ئەوەندە تەرکیز بخاتە سەر کاك نەوشیروان، چونکە پلینیۆم بۆ پێداچوونەوە بوو بە کارەکانی یەکێتی و هەروەها

خۆئامادەکردن بوو بۆ بەستنی کۆنگرە، نەك ئەو شتانە باس بکرێن. ڕەنگە ئەوە بەردانەوەی ڕەخنەی سەرکردەکانی گۆڕان بێت کە بەردەوام ئاڕاستەی سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسیی یەکێتی و مام جەلالی دەکەن. مام جەلالیش ڕەنگە ئازاری زۆری چەشتبێت و موعاناتی زۆری بینیبێ، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوانەش دەکرا لەشوێنێکی دیکە لەکاتێکی دیکە لە ئاستێکی دیکەدا باسی لێوەبکردایە، یان مام جەلال چی هەبووایە لەیاداشتەکانیدا باسی بکردنایە.

لڤین: هۆکاری چییە کە پێتباشنەبوو تاڵەبانی لەو کاتەدا ئەو قسانە بکات؟ لەبەر ئەوە بوو ئەم شتانەی باسیان لێوەدەکات حەقیقەتیان نییە، یان کێشەی سیاسیی نێوان گۆڕان و یەکێتی قوڵتر نەبنەوە؟

عومەر شێخ موس: من بەهۆی ئەوەی ئاگادرای تەواوی مێژووی یەکێتیم پێمباشنەبوو، هەروەها قەناعەتیشم بەو قسانە نەبوو. ڕەنگە هەندێك شتی ڕاست بێت و هەندێکیشی هەڵە ، بەڵام ناکرێت تۆ لەراپۆرتی حیزبێکی سیاسیدا باسی ئەو شتانە بکەی، چونکە ئەم شتانە پێویستیان بەسەلماندن هەیە، هەستدەکەم لەئەنجامی ئەو هێرشانەی کە کراونەتە سەری بەپێویستی زانیوە کە وەڵامبداتەوە، بەوردی ناتوانم ڕادەی ڕاستی و ناڕاستی ئەو شتانە باسبکەم.

لڤین: یەکێك لە ئەگەرەکان ئەوەبوو کە لەسەر ئاستێکی سیاسیی نزیکبوونەوە لەنێوان گۆڕان و یەکێتی بێتە ئاراوە، بەڵام لەئێستادا دەوترێ ئەم وتارەی تاڵەبانی کۆتایی بە ئەگەرێکی وا هێنا و بگرە ئەگەری ئەوە هەیە کێشەکان قوڵتربنەوە، پێتوانییە قسەکانی تاڵەبانی بۆ ئەوە بوون کە پێکەوژیانێکی سیاسیی لەنێوانیان نەیەتە ئاراوە؟

عومەر شێخ موس: ساڵی ڕابردوو من هەوڵێکی زۆرمدا کە نزیکبوونەوە لەنێوان کاك نەوشیروان و مام جەلال بێتەئاراوە، ئەو کات ئەنجامی باشیشی هەبوو، بەڵام دواتر بەهۆی هاتنەپێشی هەڵبژاردنەکانەوە دیارە کاك نەوشیروان ئەوەی بەهەل زانیوە کە هێزە سێیەم لەکوردستان دروستبکات و جیابوونەوە ڕوویدا، بۆیە وەکو

[illegible] هیچ هیوایەك نییە بۆ پێکەوە ژیانی سیاسیی، بەڵام ئەوەی جێگەی دڵخۆشییە ئەوەیە کەئێستا تەواوی حیزبە سیاسییەکان گەیشتوونەتە ئەو دەبێت دانیشتن و لێکنزیکبوونەوە هەبێت، ڕاستە ئێستا گۆڕان و بگرە چەند هێزێکی دیکەش بڕیاری ئەوەیانداوە کە بەلیستی جیاواز بڕۆنە هەڵبژاردن بۆ پەرلەمانی عێراق، بەڵام هەموویان بەڵێنی ئەوەیانداوە لە گرفتە نەتەوەییەکان یەك هەڵوێست بن و بتوانن بەهەموویانەوە باشتر مافەکانی کورد مسۆگەر بکەن، ناکرێت لەو جیابوونەوەیەی کە ئێستا هەیە بەچاوێکی دوژمنکارانە لەیەکتر بڕوانن، زۆریش ئاساییە کە کارەکتەری سیاسیی جیاواز لە گۆڕەپانەکەدا بوونی هەبێت، بەڵام گرنگ ئەوەیە لێکتێگەشتن لەنێوانیاندا هەبێت، پێموایە ئەو گرژییەی کەهەبوو لەنێوان هێزەکاندا لەکاتی هەڵمەتی هەڵبژاردن خەریکە کۆتاییپێدێت و ئاراستەیەکی سیاسیی دروست دێتە ئاراوە، من بەپێچەوانەی ئەو بۆچوونە بیر دەکەمەوە کە قسەکانی مام جەلال بۆ ئەوە بووبن کە پەیوەندی نێوان گۆڕان و یەکێتی دروست نەبێت، چونکە لەپلینیۆم من سەرۆکی ئەو لیژنەیە بووم کە بزانرێت هەڵوێستی پلینیۆم چی بێت بەرامبەر جیابووەوەکان، توانیم قەناعەت بەو لیژنەیە بێنم کە هەڵوێستی زۆر مەعقول بەرامبەر ئەو کەسانە وەربگرێت، ئەوەی جێگەی دڵخۆشی بوو کە کاك نەوشیروان هیچ کاردانەوەیەکی نیشان نەدا بەرانبەر ئەو قسانە ، هەرچەندە بڕواموایە کەڕۆژێك لەڕۆژان ئەویش قسەی خۆی بکات لەوبارەوە.

لڤین: کۆمەڵێك خەڵك کە لەیەکێتی جیابوونەوە، ئێستا دەبینن دەگەڕێنەوە بۆ ناو ئەو حیزبە، ڕاگەیاندنی یەکێتی بەردەوام جەخت لەوەدەکاتەوە کە ئەوانە پێشتر هەڵخەڵەتێنرابوون و ئێستا پەشیمانبوونەتەوە لەپشتگیری بزوتنەوەی گۆڕان، لەلایەکی ترەوە سەرکردەکانی بزوتنەوە گۆڕان لەڕێگەی پارەوە ئەو کەسانە ئیغراکراون، یان هیچ نەبێت ئەو کەسانە گرفتی ماددیان هەیە بۆیە دەگەڕێنەوە، پێتوایە دەکرێت حیزبێکی سۆسیال دیموکرات پارە بەکاربێنێ بۆ کڕینی خەڵك؟

عومەر شێخ موس: (بەپێکەنینەوە) من بەو حاڵەتە ناڵێم کڕین و بەو کەسانەش ناڵێم

لـحه‌ڵه‌تاو، ئه‌وانه ژماره‌یه‌ك كه‌سی دڵسۆزی نێو ریزه‌كانی یه‌كێتی بوون له‌سه‌رده‌می شاخ و شاریش، بۆیه ئه‌وانه هه‌ڵناخه‌ڵه‌تێن و بزوتنه‌وه‌ی گۆڕانیش كار له‌سه‌ر هه‌ڵخه‌ڵه‌تاندی خه‌ڵك ناكات، ئه‌وانه به‌شێوه‌یه‌كی ئازادانه و به‌خواستی خۆیان بڕیاری ئه‌وه‌یاندا كه بچنه ناو بزوتنه‌وه‌ی گۆڕان و چیتر ناتوانن له‌ریزه‌كانی یه‌كێتیدا كاربكه‌ن، باوه‌ڕ ناكه‌م ئه‌وانه له‌ژێر فشاری ماددیش بگه‌ڕێنه‌وه ناو یه‌كێتی، چونكه ئه‌و حاڵه‌ته‌ی ئێستا هه‌یه یه‌كه‌مجار نییه ئه‌و شته رووبدات له‌ناو یه‌كێتیدا.

لڤین: سه‌ركرده‌كانی گۆڕان به‌ڵگه‌ی راستی قسه‌كانیان به‌وه ده‌سه‌لمێنن كه ئه‌و هۆكاره‌ی كه ئه‌و كه‌سانه له‌پێناویدا ده‌ستبه‌رداری یه‌كێتی بوون تا ئێستا هیچیان چاره‌سه‌ر نه‌كراون، كه‌واته ئه‌وانه له‌به‌ر نه‌بوونی مووچه گه‌ڕاونه‌ته‌وه نێو یه‌كێتی، نه‌ك له‌سه‌ر بنه‌مای مه‌بده‌ئو قه‌ناعه‌ت.

عومه‌ر شێخ موس: مه‌سه‌له‌ی نانبڕین شتێكی خراپه ، به‌ڵام ده‌مه‌وێت ئه‌وه روون بكه‌مه‌وه‌كه بڕینی مووچه‌ی كارمه‌ندانی حكومه‌ت و ئه‌و كه‌سانه‌ی له‌كه‌رتی حكومه‌تدا كارده‌كه‌ن شتێكی خراپه و ئه‌وه ده‌سه‌لمێنێت كه حیزب و حكومه‌ت تێكه‌ڵه، به‌ڵام كادری حیزبی كه بچێت بۆ حیزبێكی دیكه كاربكات، ئه‌وه ئه‌و حیزبه مافی خۆیه‌تی مووچه‌كه‌ی ببڕێت، به‌ڵام له‌شه‌ڕی راگه‌یاندندا به‌رده‌وام ئه‌و فاكته‌رانه به‌كارده‌هێنرێن كه بۆچوونه‌كان به‌هێزبكات، ئه‌گه‌ر یه‌كێتیش فشاری مادی بۆ ئه‌و كه‌سانه به‌كاربهێنێت، ئه‌وه كارێكی هه‌ڵه‌ده‌كات و ده‌ره‌نجامه‌كه‌شی زۆر خراپتر ده‌بێت له‌وه‌ی هه‌یه، به‌ڵام به‌هۆی ئه‌وه‌ی كه تازه گۆڕان له‌یه‌كێتی جیابووه‌ته‌وه، بۆیه بڕینه‌كان جاریّ نوێن، ئه‌گه‌ر نا دڵنیام له‌داهاتوودا چوارچێوه‌یه‌كی زۆرباش ده‌دۆزرێته‌وه بۆ كاركردن.

لڤین: به‌شی هه‌ره زۆری ئه‌وانه‌ی له یه‌كێتی نانبڕاوكراون ئه‌وانه‌ن له‌هێزی پێشمه‌رگه‌دان. پێتوانییه به‌هۆی ئه‌وه‌ی كه یه‌كێتی ده‌سه‌ڵاتی ره‌های هه‌یه به‌سه‌ر پێشمه‌رگه و به‌هیی خۆی ده‌زانیّ، بۆیه وا مامه‌ڵه ده‌كات؟ بۆیه تا ئێستاش پێشمه‌رگه وه‌ك میلیشیا سه‌یر ده‌كرێت، نه‌ك وه‌ك هێزێكی نیزامی؟

عومەر شێخ موس: لیژنەیەك دروستبووە بۆ ئەوەی کە هێزی پێشمەرگە بکاتە هێزێکی نیزامی و حیزب دەسەڵاتی نەبێت بەسەر پێشمەرگە و بەڵکو پێشمەرگە دەبێت ئەرکەکانی دووربێت لە ئەرکی حیزبی و بەهەموو شێوەیەکیش ڕێکخستنی حیزبی لەناو پێشمەرگەدا دەبێت قەدەغە بێت، حیزبەکانیش دەبێت قەناعەتیان بەوە هەبێت کە نابێ چیتر کاری ڕێکخستن لەناو پێشمەرگەدا بکەن.

لڤین: لەدیمانەیەکی بەرێزتدا لەگەڵ (لڤین) کە ژمارە ٧٨ بلاوکراوەتەوە وتووتە ئەگەر یەکێتی و پارتی خۆیان نەگۆڕن، ئەوە دەبێت چاوەڕێی ڕاپەڕین بکەن، پێتوایە کە دەرەنجامی هەڵبژاردنەکانی ٢٥ تەمموز ڕاپەڕینێك بوو لەدژی یەکێتی و پارتی؟

عومەر شێخ موس: بەڵێ، دەرەنجامی هەڵبژاردنەکان ڕاپەڕینێکی دیموکراسیانە و سیاسییانە و شارستانیانەی خەڵك بوو دژ بەپارتی و یەکێتی، دڵم بەوە خۆشە کە ئەو ڕاپەڕینە دروستبوو، بەتایبەت کەبەشێوەیەکی مەدەنیانە کارەکان تەواو بوون، ئەوەی زۆر دڵی من خۆش دەکات ئەوە بوو کە دەنگە نارازییەکان بۆ هێزێکی عەلمانی بوون نەك ئیسلامی، چونکە ئەو دەنگانە کە بۆ گۆڕان ڕۆشتن بۆ داهاتووی کوردستان زۆر سودیان هەیە.

لڤین: زۆرجار بەرپرسانی پارتی دەرەنجامی هەڵبژاردنەکان بەشکست دەدەنە قەڵەم بۆ یەکێتی نەك پارتی، بەهۆی ئەوەی گۆڕان لەسنوری ئیدارەی سلێمانی توانی سەرکەوتنی گەورە بەدەستبهێنێت.

عومەر شێخ موس: ئەگەر بەرپرسانی پارتی وابیربکەنەوە، ئەوە خۆیان دەخەڵەتێنن، چونکە ئەو دەنگانەی کە گۆڕان هێناونی ئەوانەن کە بەسیستەمی حوکمڕانی پارتی و یەکێتی رازینین، تەنانەت لەدەرەنجامەکانی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتیش بینیمان کە دکتۆر کەمال میراودەلی دەنگێکی زۆر هێناو لەگەڵ کاندیدەکانی دیکە نزکەی لە ٣٠٪ ی دەنگەکانیان هێنا، ئەوەش ئەوە دەگەیەنێت کە خەڵکێکی زۆر هەیە بەسەرۆکایەتیکردنی مەسعود بارزانی رازینییە، بەلاّم بەبڕوای من پارتیش بۆچوونی گۆڕاوە، ئەوەنییە کە نێچیرڤانی بارزانی ناچارە لەگۆڤاری (لڤین) ەوە ڕایبگەیەنێت

...خۆی سەرپەرەشتی ریفۆرمی ناو پارتی دەکات؟ لەلایەکی دیکەوە مەسعود بارزانی لەبەردەم یەکێتی ئەوروپا وتی پێویستە یارمەتیمان بدەن بۆ بەدامەزراوەییکردنی دامودەزگاکانی حکومەتی هەرێم، کەواتە لەرابردوودا گرفت هەبووە و دامودەزگاکان دامەزراوەی نین و پێویستە گۆڕانی ریشەیی بێتە ئاراوە.

لڤین: چاودێران پێیانوایە سیستەمی حیزبی پارتی ریفۆرم قبوڵناکات، چونکە پارتی حیزبێکە زیاتر حیزبی بنەماڵەیە، پێتوایە پرۆژەی ریفۆرم لەناو پارتیدا سەرکەوتن بەدەستبهێنێت؟

عومەر شێخ موس: زۆرم پێخۆشە کە گۆڕان وایکرد یەکێتی بەخۆیدا بچێتەوە و رایبگەیەنێت بەرنامەی ریفۆرم جێبەجێدەکات، هەروەها لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە پارتیش هەمان بۆچوونی بۆ دروستبووە. نارازییەکانی کوردستان لەهەڵبژاردنەکان کارتی سیاسیی خۆیان بەکارهێنا لەدژی پارتی و یەکێتی و ناچاری ئەوەیان کردن کەچیتر بەو سیستەمەی جاران کارنەکەن، ئەگەرنا شکستی گەورەتریش چاوەڕێی پارتی و یەکێتی دەکات. هیوادارم کە پارتی و یەکێتی بەشێوەیەکی جدی کار لەسەر بەرنامەی ریفۆرم بکەن. لەناو ریزەکانی پارتیش خەڵکی رەخنەگر دروستبووە و پارتی تاهەتایە ناتوانێ حیزبی بنەماڵە بێت، بەتایبەت ئەگەر بیەویت لەگۆڕەپانی سیاسیدا بمێنێتەوە.

**سالار عەزیز ئەندامی ئەنجومەنی کۆمپانیای وشە " پارتی بڕوای بەدیموکراتیەت و دەستاودەستکردنی دەسەلات نییە، ئەوان پێیانوایە لەم وڵاتەدا هەتا هەتایە دەبێت خۆیان حاکم بن، ئیتر مەلیکی یان وەکو ئیمارەتەکانی خەلیج"**

لڤین: دیداری هێمن باقر– سلێمانی

لڤین: بڕیارە لەهەفتەی داهاتوودا هەڵمەتی هەڵبژاردن دەستپێبکات، چاوەڕێدەکەن ململانێی نێوان لایەنەکان لەهەڵمەتی هەڵبژاردندا بگاتە چ ئاستێك؟

سالار عەزیز: ئێمە دەمانەوێت ئەوەی کە لەبەرنامەکەماندا هەیە بڵاویبکەینەوە و ئیشی لەسەر بکەین، ئەوەی زیاتر لەبەرنامەی ئێمەدایە پەیوەندی بەسیستەمەوە هەیە، هەروەها پەیوەندی بەدەسەڵاتەکانی یاسادانان و جێبەجێکردن و دەستوور و تەنانەت خودی پەرلەمانەوە هەیە. شتی ئەساسی ئێمە مەسەلەی حکومەت و سیستەم و یاسایە، ئەمانەش خواستی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستانە.

ئەوەندەی کە سەرەنجدەدرێ برادەرانی تر شتەکان دەبەنەوە بۆ لایەنی شەخسی، لەجیاتی ئەوەی باسی ئەوە بکەن کە گۆڕان دەکەن و ژیانی خەڵك باشتر دەکەن، بیر لەوەدەکەنەوە کە کار لەسەر کەسەکان بکەن. لەماوەی رابردوودا کارەکانی ئەوان بەهەردوو لایەنەوە (یەکێتی و پارتی) لەسەر ئەوە بووە کە لەخودی کاك نەوشیروان بدەن، بەشێوەیەکی ئەساسی ئەوەش لەوەوە سەرچاوەیگرتووە کە ئەوان بڕوایان بەکۆمەڵانی خەڵك نییە، چونکە ئەوەندەی لەدەسەڵاتدابوون کارێکی وایان نەکردووە کە خەڵك لەگەڵیان بێت، پێیانوایە خەڵك ناهۆشیارە. لەوپەڕی غرورەوە سەیری خەڵکیان دەکرد، لەوەوە سەیریان دەکرد کە ئەوان بەرپرسن و خەڵك عاشقی ئەوانە، وایاندەزانی کەسی یەکەمی حیزبەکان هەرچی بڵێن خەڵك بەقسەیان دەکات، لەناو یەکێتیدا ئەو لایەنە هەر پشتیان بەسکرتێری گشتی قایم بوو، خۆیان هەرچی هاتن و هەرچی خەریك بوون و هەرچی وتیان کەس گوێی لێنەگرتن، ئەوان پشتیان بەوە قایم بوو کە سکرتێری یەکێتی دەتوانێت هەموو شتەکان راستبکاتەوە،

عومەری سەید عەلی: ئەگەر تۆ پۆستێکی باڵای حیزبیت دابێت بە کەسێك و کار بۆ [illegible]دنی سیاسەتی حیزبەکەی نەکات، حەقی خۆیەتی لایبەرێ، بەڵام ئەم بۆچونەش قسەی خۆی لەسەرە ، چونکە ئەو کەسە دەڵێت من لەگەڵ بیروبۆچونەکانی تۆدا نیم و ئەم حیزبەش تەنها تۆ دروستت نەکردووە، منیش لە دامەزراندنیدا خەباتم کردووە و قوربانیم داوە، لەسەر چ بنەمایەك دەرمدەکەیت؟ پلە و موچەم ئەبڕی، جگە لەوە بۆچونەکانی ئێوە لەگەڵ بەرژەوەندی گشتی گەلەکەم یەکناگرێتەوە.

باشە منیش دەڵێم تۆ بە چ حەقێك رۆژانە ملیۆنێك دۆلار لە بودجەی پارێزگای سلێمانی و گەرمیان دەبەیت بۆ حیزبەکەت، لەکاتێکدا خەڵك لە گەرمیان و هەڵەبجە برسییە و بێکارە؟ لێرەش من لەسەر دەنگدان دەرئەکەی، ئەگەر موچە لەدارایی حیزب ئەدەن باشە، بەوەش من هەر شەریکم لەو بودجەیە، چونکە بەرهەمی خەباتی هەموو لایەکمانە کەم تا زۆر.

لڤین: جارجار دەنگێك لەناو لیستی (گۆڕان) و باڵی ریفۆرمەوە دەبیسترێت، کە دەڵێت ئێوە هێشتا خۆتان بە یەکێتی دەزانن. پرسیارەکە ئەوەیە: ئێوە وەك باڵی ریفۆرم دەتانەوێت دەستبەرداری یەکێتی بن؟

عومەری سەید عەلی: ئێمە ئێستا وەك باڵی ریفۆرم لە (ی.ن.ك) بەشێکین لە لیستی گۆڕان.

لڤین: وەکو رۆژنامەنوسان و چاودێرانی سیاسیی و بەرپرسە حیزبییەکان دەیلێن، یەکێتی لەقەیراندایە و ئەگەر زوو نەکەوێتە خۆی، ئایندەیەکی مەترسیدارتر و پڕ گرفتتر رووبەڕووی دەبێتەوە، تۆ لەمبارەیەوە چی دەڵێیت وئایندەی یەکێتی چۆن دەبینیت؟

عومەری سەید عەلی: من ئایندەیی یەکێتی بەباش نابینم و یەکێتی بەرەو داخراوبوون و بچوکبوونەوە دەچێت. هەموو پینە و پەڕۆیەکیش، دەیانگەیەنێتە ئەم ئاکامەی ئێستا. لەهەڵبژاردنەکانی (٢٠٠٦) ی مەڵبەندەکانی یەکێتیدا، پارەیان بەخشییەوە،

زەویان دابەشکرد، دەسەلاٌتیان بەکارهێنا، سەیارە و دەمانچەیان بەخشییەوە و ئەمانە [illegible] بەڕێژەی جۆراوجۆر، جگە لەترس و تۆقاندن و هەڕەشەکردن، هەروەها راگەیاندیان بەکارهێنا، بەڕێز سکرتێری گشتی لایەنگر بوو، کەدەبوو ئەو لەسەرووی ئەو ئاستە بووایە، بەمەش بەشێکی زۆری مەڵبەندەکانیان بردەوە. بۆیە کاك نەوشیروان و کاك محەمەد تۆفیق هاتنە دەرەوە، ئێمە وەك باڵی ریفۆرمماینەوە و ململانێی خۆمان کرد لەپێناو چاکسازی و ریفۆرم. ئێمە هەموو کێشەکانمان دیاریکرد و لەرێگەی کەناڵەکانی حزبەوە. کۆبونەوەکانی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتیمان کرد بەو مەیدانە و داکۆکی لە بۆچون و راکانمان، هەتا هەندێ لە ئەندامان سەلماندیان، بەلاٌم ئەوانی تر نەیانویست بیسەلمێنن و دواتریش یاداشتێکمان دایە بەڕێز سکرتێری گشتی و دوای ئەوەش پرۆژەیەکمان پێدا. دواتر دەستمان لەبەرپرسیارێتی کێشایەوە و پاڵپشتی لیستی (گۆڕان) مان کرد.

ئەمجارەشیان ئەوان لە هەڵبژاردن ئەزمونی ٢٠٠٦ یان دووبارە کردەوە و بەهەمان رێچکە و شێواز رۆیشتن بە تەخشان و پەخشان کردن لە هەموو روو ئاست و بوارێکدا کە دادی نەدان، لەبەردەمی کۆمەلاٌنی خەڵك شکستیانخوارد. بۆیە دەبێت هەست بەو سزایەی کۆمەڵگە بکەن. لەکاتێکدا لیستی گۆڕان بەپشتیوانی خەڵك توانی ئەو سەرکەوتنە بەدەستبهێنێت.

ئێمە لەناو شاری سلێمانیدا (١٥٢) هەزار دەنگمان هێنا ئەوان، ئەوان (٩٤) هەزار دەنگیان هێنا، لەکاتێکدا خۆیان دەڵێن لەناو شاری سلێمانیدا (٧٠) هەزار ئەندامان هەیە، ئەی رێکخراوە دیموکراتییەکان چی لێهات کە دەیانوت (٣٠٠) هەزار ئەندامی هەیە؟ هەروەها مەکتەبی کۆمەلاٌیەتی و مەکتەبەکانی بەڕێز مام جەلال و سەرجەم مەکتەبەکانی (ی.ن.ك)، ئەمە جگە لەوەی ئەوان لەگەڵ پارتیدا ئەوەندە دەنگیان هێناوە. ئێمە لەسەر ئاستی پارێزگای سلێمانی و ئیدارەی گەرمیان (٣٠٧) هەزار دەنگمان هێناوە و ئەوانیش (٢٦٦) هەزار دەنگیان هێناوە. لە (١٨٧) بنکەی ناو شاری سلێمانیدا ئەوان لە تەنها بنکەیەکدا لە ئێمەیان بردەوە، ئەویش

بەجیاوازی (١٧) دەنگ. سەرەڕای ئەوەی کە شاری کۆیەشمان لێ بردنەوە کە لەژێر دەسەڵاتی یەکێتی نیشتیمانیدایە.

لڤین: کە دەڵێیت کۆیە لەژێر دەسەڵاتی یەکێتیدایە، مەبەستت ئەوەیە کە ئێستاش کوردستان دوو ئیدارەیە؟

عومەری سەید عەلی: تا ئێستاش کوردستان دوو ناوچەیە، دوو ئیدارەیە و دوو داراییە و دوو هێزی چەکدارە. بەشێوەیەکی شکڵی پەرلەمان و حکومەتی هەرێم هەیە و یەکی نەگرتوەتەوە، تائێستا مودیر ناحیەیەکی پارتی لە ناوچەیەکی یەکێتیدا نییە و بەپێچەوانەشەوە. من تێناگەم ئەمانە بۆ لەخۆیان ناپرسن ئەگەر ئەو دوو ئیدارەیە یەکیبگرتایەتەوە، مێژوو بۆ کێی دەنوسی؟ بۆ بەڕێزان مام جەلال و کاك مەسعودی دەنوسی؟، یان بۆ ئەندامانی سەرکردایەتی و مەکتەب سیاسییەکانیان؟ بەڵام نازانم بۆچی نایکەن؟ ئەوە نزیکەی ١١ ساڵە گفتوگۆ لەسەر یەکخستنی ئەم دوو ئیدارەیە هەیە، کە لە ١٢-٢-١٩٩٨ وە یەکەم کۆبونەوەی ئاشتی دەستپێکرد لە شەقلاوە نەیتوانیوە ئەم دوو ئیدارەیە یەکبخات، ئەمە گوناهی کێیە؟ ئەمە سیراعی عەرەب ئیسرائیلە؟ ئێمە ئەم پرسیارەمان لەبەرچاوی خۆیان چەندین جار کردووە، وتومانە تا هەردوولا نەیەنە ناوچەی یەکتر و بەیەکدا نەچین، ئەم یەکگرتنەوەیە ئەسڵ و ئەساسی نییە، تا ئێستا دوو حکومەت و دوو داراییە و دوو ئیدارەیە و دوو هێزی چەکدارە، ئەوەش کە دەڵێن یەکیگرتووەتەوە، خۆڵکردنە چاوی خەڵکە، سەیر ئەوەیە لەملاشەوە بەئێمە ئەڵێن ئەیانەوێ ئەمارەتی بابان دروست بکەن.

لڤین: تۆ ماوەیەکی زۆر لەمەکتەبی سیاسیی بویت و سەروکارت لەگەڵ ژمارە و داتا هەبووە، لە لیستی گۆڕانیش بەهەمان شێوە. دوای بردنەوەی سلێمانی کە چەقی لایەنگرانی یەکێتی بوو، بەپێی زانیارییەکانی ئێوە ئێستا جێنفوزی یەکێتی کوێیە؟

عومەری سەید عەلی: ئەوە لەسەرکردایەتی (ی.ن.ك) بپرسە، بڵێن ئەوە داتا و ژمارەکان، ژمارەکانی خۆتان کوان؟ ئێوە بپرسن کوا قاعیدەی یەکێتی و یەکێتی چی

نییەت؟ ئەوان با ئەم پرسیارانە وەڵام بدەنەوە، قاعیدەی یەکێتی بۆچی ئاوای لێهات و بۆچیش شکستی هێنا؟.

لڤین: ڕەنگە هەندێکیان بڵێن بەهۆی دروستبوونی لیستی گۆڕانەوە بوو، کەبەشێك بوون لەیەکێتی و جێدەستیان لەیەکێتیدا هەبووە، ئاسایشە بتوانن لە کاتێکی ئاوادا دەنگەکانی یەکێتی پەرت بکەن؟

عومەری سەید عەلی: گۆڕان و پێکهاتەکەی بیروباوەڕی جیاوازی هەبوو، کە وابوو، گۆڕان ڕاستی کرد کە ئەمان ووت دابڕاون لەجەماوەر گوێیان نەئەگرت، دەرکەوت کێ ڕاستە، بۆ ئەوان دان بەو ڕاستیەدا نانێن کە وەك ڕۆژ دیارە؟

لڤین: بەڵام هەموو ئەو کەسانەی دەنگیان بەلیستی گۆڕان داوە یەکێتی نەبوون؟

عومەری سەید عەلی: من ناڵێم هەمووی یەکێتییە. پێکهاتەی گۆڕان بەشێکی باڵی ریفۆرمە کە زۆری لەخەتی گشتی، یەکێتی شۆڕشگێڕان، کۆمەڵە، ئاڵای شۆڕش، سۆسیالیستە، کەبەشێکن لە جوڵانەوەی گۆڕان، لەدەرەوەی یەکێتیش پاسۆك و زەحمەتکێشانی تێدایە، پێشمەرگەی دێرین و ڕێکخستنی پارتی تیایە کە دانیشتووە، شیوعی و پیاوی ئاینی تیایە، چەپ و دیموکراتیشی تیایە، هەروەها بەشی هەرە زۆری جەماوەری بێلایەن و پان و بەرین، بە تایبەتی گەنجان و ژنان. ئەمە جگە لەهەڵبژاردەی ڕۆشنبیران کە ڕۆڵی زۆر گرنگیان هەبووە لە ئاراستەی خەڵك بەنوسین و وتار و گفتوگۆی واقعی و بەپێز لەسەر ڕووبەری سەرجەم کەناڵەکانی ڕاگەیاندن.

لڤین: کە وابوو، تاچەند لەگەڵ ئەو قسەیەی عیماد ئەحمەد دایت دەڵێت (( گۆڕان مەنجەڵێکە و سەری زۆری تێدایە))؟

عومەری سەید عەلی: ئەو دەیەوێت بۆ مەبەستی تر ئەو قسەیە بکات، ئێمە بزوتنەوەیەکی جەماوەرین و توانیومانە خەڵك لە دەوری بەرنامەی سیاسی خۆمان کۆبکەینەوە، خاڵی بەهێزی بەرنامەکەمان لەوەدایە، کە هەموو لایەنەکانی لەخۆگرتووە، ئەو قسەیەش کە ئەو کاکەیە کردوویەتی، کێشە نییە و خۆمان

بانگەشەی ئەوەمان کردووە کە بیروباوەڕی جیاوازمان تێدایە. ئەی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان چییە؟ سۆسیالیستی تێدا نییە؟! ئاڵای شۆڕشی تێدا نییە؟! شۆڕشگێڕان و کۆمەڵەی تێدا نییە؟! عەشایەری تێدا نییە؟! ئەی ئەوە چ مەنجەڵێکە؟ سەرکردایەتی ئێستای یەکێتی واقیع نابینێت و لەچاوی ئەو راپۆرتانەوە کە ئەمان بۆیان دەنوسن، بارودۆخەکە دەخوێننەوە وسیاسەت نەخش ئەکەن. بۆیە توشی ئەو شکستە هاتن.

لڤین: عارف قوربانی کە کادیرێکی باڵای راگەیاندنی یەکێتییە، دەڵێت: ئەوانەی دەورو خولی تاڵەبانیان داوە، وایانکردووە کە سکرتێری گشتی بەچاوی خۆی بارودۆخەکە نەخوێنێتەوە و لێکدانەوەکانی بۆ دۆخی ناوخۆی یەکێتی دروست نەبن،ئەگەرنا چاوی ئەو لە هەموان واقیعبینتر بووە، تۆ چی دەڵێت، یاخود کێ بەرپرسە لەو دۆخەی کە ئێستا یەکێتی تێکەوتووە؟

عومەری سەید عەلی: هەموان بەرپرسن لەبەرێز مام جەلالەوە تا خوارەوە، چونکە ئەو شتانەمان پێوتوون، لە کۆبونەوەی کۆمیتەی سەرکردایەتی لە ئازاری ٢٠٠٧ جەستەی یەکێتیمان توێتوێ کرد، لەبەر رۆشنای راپۆرتی مەکتەبی چاودێری و پشکنین کاك دکتۆر فوئاد مەعسوم وتی ئەوە (٣٠) ساڵە کۆبونەوەی ئاوام نەکردووە، کە بەراشکاانە دەستخراوەتە سەر کێشەو برینەکان، بەرێز بەرپرسی مەکتەبی رێکخستنیش وتی راستە کادری ئۆرگانەکان لە ئاستی بەرپرسیارێتیدا نین و کارەکانیان بۆ نابرێت بەرێوە، بەڵام چارەسەری بۆ نادۆزنەوە، هەر کەسێك بەرپرسیارێتی زیاتری هەبێت، زیاتر بەرپرسە، هەموو ئەوانەمان باس کرد و پێمان وتن رۆژێك دێت پەنجەی پەشیمانی دەگەزن، ئەمە ئەو رۆژەیە.

لڤین: زۆرێك لەبەرپرسە باڵاکانی یەکێتی دەڵێن، یەکێتی لەمساڵدا کۆنگرە دەبەستێت، ئێوە وەکو باڵی ریفۆرم بەشداری کۆنگرە دەکەن؟

عومەری سەید عەلی: بۆ ئەوە هێشتا زووە.

لڤین: پێدەچێت نەتانەوێت دەستبەرداری یەکێتی بن؟

عومەری سەید عەلی: ئەوە لەکاتی تردا وەڵام دەدەینەوە، بەڵام چارەنوسی تەنها

[illegible]ت ئەوان نییە و بەدەست هەموومانە، بە چ حەقێك ئەوان بانگەشەی یەکێتی [illegible]سەرکردایەتی دەکەن، ئەوان یەکێتیان گەیاندە ئەو رۆژەی ئێستا، نەك باڵی ریفۆرم، ئێمە بەدوای ئیمتیازات و پلەوپایەدا نەگەڕاوین، وەك خەڵکی سلێمانی دەڵێت: ئێمە لەپاڵ حەجەکەدا بووین، هەرچیەکمان بویستایە، بۆیان دەکردین، بەلاّم دەستبەرداریشی بووین، بۆ زانیاریتان رەنگە تائێستا من و دوو کەسی تر بزانن، من کە وەك کارگێڕ، مەکتەبی سیاسیم بەجێهێشتووە، (٥) ملیۆن دۆلارمان پاشەکەوت کردووە، تائیستاش رەنگە ژمارەیەك لە مەکتەبی سیاسی نەزانن. ئێستا رەنگە تێی بروکێن هەریەکە بڵێ بەشە نەسریەم ئەوێ، ئەمەمان لە نەسریەی مەکتەبی سیاسی گێڕاوەتەوە، ئێمە بەو شێوەیە کارمان بۆ یەکێتی کردووە.

بۆ لەمەودوا وەکو باڵی ریفۆرم دەتانەوێت دەستتان لەیەکێتیدا هەبێت و بە ئاراستەیەکدا بیجوڵێنن؟

عومەری سەید عەلی: ئێمە تەمەنێکی زۆرمان لە خەباتدا بەسەر بردووە، ئێمە خەباتمان بۆ گەل و نیشتیمان کردووە، حیزب وەسیلەیەك بووە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی گەلەکەمان، بەلاّم ئەگەر کۆمەڵێك کەس دەستی بەسەردا بگرن، لەبارودۆخێکی تایبەتدا بۆ پاوانکردنی دەسەلاّت و بەرژەوەندی تایبەت ، تۆ دەسەلاّتت چییە؟! بەلاّم ئەوا لەبەردەمی جەماوەر و ئەندامانی یەکێتی و واقیعەکەداین بزانین بەکوێ ئەگەین.

لقین: تۆ دەڵێت حیزب ئامرازە بۆ گەیشتن بە ئامانج، ئێوە کە لە یەکێتی هاتونەتە دەرەوە، بەپێی قسەی بەرپرسانی یەکێتی لە پەیڕەوی ناوخۆ لاتانداوە و ماف و ئەرکتان نییە لەو حیزبەدا، ئەوەیان چۆن لێکدەدەیتەوە؟

عومەری سەید عەلی: ئەوان لەپەیڕەو لایانداوە و ئامادەنەبوون کۆنگرە بگرن، بۆیە پەیڕەو چەند شەرعیەتی بۆ ئەوان هەیە ئەوەندەش شەرعیەتی هەیە بۆ ئێمە، ئەگەر بابەتیانە سەیری مەسەلەکە بکەین، بە چ حەقێك ئەوان خاوەنی ئەو حیزبەن، ئەوان تائێستا دەسەلاّتیان زەوتکردووە لەرووی سیاسی و ئیداری و ماڵی و ماڵی و

ڕێکخراوەیی، بەو دەسەڵاتەی بەدەستیانەوەیە خەڵکی پێ دەردەکەن، ئەوان لەڕەوی ناوخۆ لایانداوە و شکست لەدوای شکستیان بەسەر یەکێتیدا هێناوە و پێگەی جەماوەرییان نەماوە.

لڤین: با ڕاشکاوتر بم، ئێوە دەتانەوێت لێرە ململانێ لەسەر مێژوو و چارەنوسی یەکێتی دەستپێبکەن؟

عومەری سەید عەلی: ئێمە ئەم ململانێیە، بە زۆرانی بیروباوەڕی سیاسی دەزانین بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی هێمن و سەردەمیانە ئەنجامی بدەین، لەیەکێتیدا بیروباوەڕی جیاواز هەبووە، یەکەم گۆڕانی ئێمە بەر لە بەدەستهێنانی کورسییەکانی پەرلەمان دەست پێدەکات بۆ پاڵپشتی لیستی گۆڕان و بوون بەبەشێك لە لیستەکە، کە ئەو هۆشیارییە سیاسییەی لای کۆمەڵانی خەڵك لە کوردستان دروستکرد، ئەمە گۆڕانە، ئەوەبوو خەڵك لەسەر سندوقی دەنگدان بە دەسەڵاتی وت: (نا) کە (ی.ن.ك) بەشێکی گرنگی دەسەڵات بوو.

لڤین: دوای دەرکەوتنی ئەنجامی کۆتای هەڵبژاردنەکان، لیستی گۆڕان (٢٥) کورسی لە پەرلەمانی کوردستان گرت کە زۆرینەی دەنگەکانی لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتییەوە برد، بەبڕوای تۆ یەکێتی دەتوانێت وەکو جاران ڕکابەری سەرەکی بێت و بتوانێت ململانێ لەگەڵ پارتیدا بکات؟

عومەری سەید عەلی: ئەو پرسیارە لەسەرکردایەتی یەکێتی خۆی بکە، یەکێتی دێت خەڵکی قوڕبەسەر و فەرمانبەر و کادرەکانی خوارەوە دەردەکات، بۆ محاسەبەی سەرکردەکانی ناکات، کە چ جۆرە سیاسەتێکیان پەیڕەو کرد، کە گوێیان لەو ڕاپۆرت و ئامارە دوور لەڕاستیانە ئەگرت و سیاسەتیان لەسەر دائەڕشت کە دەرەنجامەکەی ئەو شکستەیان بەسەردا هێنا؟!

لڤین: هەندێك لەچاودێرانی سیاسی پێیانوایە گۆڕان لەرووی قورسای و هێزەوە یەکێتی تێپەڕاند و دەیەوێت لەگەڵ پارتیدا ململانێکان دەستپێبکات، لێکدانەوەتان بۆ ئەم ڕایە چییە؟

عومەری سەید عەلی: ئێمە هاتووین لەسەرخۆ و بەهێمنی لەرێی ململانێی سیاسی [illegible] بکەین بۆ گۆڕینی سیستەمی حوکم بەشێوەیەکی ئاشتیانە و دەستاودەستکردنی دەسەلات بەهۆی سندوقی دەنگدانەوە، کە ئەمەش بەقازانجی کۆمەلگا و خەلکە بۆ گەیشتن بە مافە رەواکانی خۆیان کە لە ئازادی و دیموکراتی و دادپەروەری کۆمەلایەتی و مافی مرۆڤ و وەکە یەکی لەبەردەم یاسادا و ...خۆی دەبینێتەوە، نەك بەو شەڕ و هەڕەشە.

لڤین: ئێوە وەك لیستی گۆڕان، سەنگ و قورسایی خۆتان لەو ئاستەدا دەبینن؟

عومەری سەید عەلی: بەلێ، نزیکەی نیو ملیۆن دەنگمان هێناوە، پێکهاتەی لیستەکە و پشتیوانی چین و توێژەکان بۆی، بە تایبەتی گەنج سەنگ و قورسای زۆری پێداوە ، ئەگەر ئەو ساختەکاری و فێلانەیان نەکردایە، ئێستا لە ریزی پێشەوە بووین، ئێوە خۆتان بینیتان لەماوەی مانگێکی هەلمەتی هەلبژاردندا، لەسلێمانی و گەرمیان و کۆیە چ حەشرێك بوو لەنێوان لیستە سیاسییەکاندا، لەهەولێر و سلێمانی باسی چی هەبوو لە چاو سلێمانیدا ، تا رۆژی هەلبژاردن، ئەی خێرە لە دهۆك لە (٨٥٪) و لە هەولێر نزیکەی (٨٠٪) و لە سلێمانی (٧٤٪) دەنگە بدات، ئەمە بە چ مەنتقێك؟! تەنانەت لەرێژەی زیادکردنی دانیشتواندا غەدر لە سلێمانی کراوە و زیادەی رێژەی دانیشتووان لە دهۆك و هەولێر زیاترە تا سلێمانی. لەچەند سالی رابردوودا ئەمەش بەهۆی نەبوونی سەرژمێری گشتی کە دە سالە داوا ئەکرێت.

لڤین: بەپێی زانیاری و داتاکانی ئێوە، رێژەی کورسییە (تەزویر) ەکانی لیستی کوردستانی چەندە؟

عومەری سەید عەلی: تا سەعات سێ، لەهەولێر و دهۆك (٤٠٪) ی خەلك دەنگی داوە ئەوە زانیاری هەندێ سەرچاوەی کۆمسیۆنی بالا خۆیەتی، چون بەو چوار سەعاتەی دوای گەیشتە ئەوەندە؟! ئێمە بە لانیکەمەوە (٨) تا (١٠) کورسی غەدرمان لێکراوە.

لڤین: ئێوە کاتێك لە لەناو یەکێتیدا بوون دەتانوت بەشێك لەکێشەکان ئەوەیە

یەکێتی سازشی زۆری بۆ پارتی کردووە و ئەمەتان بۆ هۆکاری بچوکبوونەوەی یەکێتی دەزانی، ئێستاش باس لەوەدەکرێت کە ئەمجارە یەکێتی پۆستی سەرۆکی حکومەت وەردەگرێتەوە و دەستبەرداری نابێت، تۆ پێتوایە یەکێتی بەو پۆستە هەژموونی سیاسی خۆی دروستبکاتەوە؟

عومەری سەید عەلی: بەڵێ ئێمە ئەوەمان وتووە، ئێستاش یەکێتی نەك پۆستی حکومەت، پەرلەمان و حکومەت بەیەکەوە وەرگرێ، تا ئەوە ئەدای شێوازی کارکردنی بێت، هیچ پێشکەوتنێك بەدەستناهێنێت، دەبێت یەکێتی سیستەمەکەی بگۆڕێت نەك دەموچاو کەسەکان. گەر وا نەکات هەژموونی سیاسی دروست ناکاتەوە و بۆی ناگەڕێتەوە، بەڵام بەداخەوە یەکێتی و پارتی حکومەتیان کردووە بە ملکی خۆیان نەك هی خەڵك، لە وەزیرێکەوە تا چایچییەکان لەبەینی خۆیان بەشکردووە، ئەمە سیستەمە دیموکراتی و عادلەکەیە کە باسی دەکەن.

لڤین: ئێوە وەکو باڵی ریفۆرم بەشێکتان دڵتان هەم لەلای گۆڕانە و هەم لەلای یەکێتیش، ئایا هیچ دانیشتنێك نەبووە بۆ ئاشتبوونەوەی گشتی لەناو یەکێتیدا، ئەو ئەگەرە بەدوور دەزانیت؟

عومەری سەید عەلی: تائێستا هیچ شتێك نەبووە لە هیچ لایەکمانەوە، ئەوانە برادەری ئێمەن و قسەمان پێکەوە هەیە و رەنگە لەبۆنە کۆمەڵایەتییەکانیشدا یەکتر ببینین و دانیشتنمان هەبێ، هەرچەندە ئێمە لێیان زویر و نیگەرانین بەرامبەر رەفتاریان، لەدەرکردن و لابردن و دوورخستنەوە و نانبڕینی برادەرەکانمان.

گۆڤاری لڤین – ژماره ٨٦ -٢٠٠٩/٣/١٥

## [illegible] جیاوازی نەوشیروان مستەفا لە قازانجی یەکێتی نییە و دەبێتە ئینشیقاق"

**عیماد ئەحمەد کاندیدی یەکێتی بۆ جێگری سەرۆکی حکومەت لەدیدارێکی تایبەتی لڤیندا جەخت لەوە دەکاتەوە کە یەکێتی خەریکی چاکسازییە و لەم پرۆسەیەشدا سەرکەوتوو دەبێت.**

گفتوگۆی هیمداد حەمید و گۆران دوکانی

لڤین: ئێستا بڕیارە تۆ پۆستی جێگری سەرۆك وەزیران وەربگریت، دەتوانیت بەدیاریکراوی کارنامەی خۆت بۆ ئەم سێ مانگە باسبکەیت؟

عیماد ئەحمەد: لە یەکگرتنەوەی هەردوو ئیدارەدا بەڕێز کاك نێچیرڤان لەپەرلەمان بەرنامەیەکی دەستنیشانکرد، لەسەر هەمان بەرنامە دەڕۆین، بەڵام خۆتان دەزانن کە ئەوە هەمووی جێبەجێنەکراوە، ئەوەی ئێمە لەم ماوەیەدا جەختی لەسەر دەکەینەوە، زیادکردنی شەفافیەت و دادپەروەری لە ئیشکردندا، کەمکردنەوەی ڕۆتین، دانانی خەڵکی شیاو لەشوێنی شیاو ، شۆڕکردنەوەی یەکگرتنەوەی ئیدارەکان لەسەرەوە بۆ خوارەوە، لە زاخۆوە بۆ خانەقین، یەکگرتنەوەی ئەو سێ وەزارەتە بەزووترین کات کە ئێستا یەکیان نەگرتووەتەوە، گرنگیدان بەراوبۆچوونی ڕۆژنامەنوسان و ڕاگەیاندنەکان و دروستکردنی کاناڵێکی تایبەت بەو مەبەستە، هەروەها بەشداریکردنی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی لەبڕیاردا، خزمەتکردنی کۆمەلانی خەڵك بە تایبەتی کەسوکاری شەهیدان و ئەنفال و کیمیاباران و کەمئەندامان و زیندانە سیاسییەکان و پێشمەرگە دێرینەکان و کادرە ماندووەکان.

لڤین: پێتوایە لە ماوەی ئەم سێ مانگەدا، بتوانیت نارەزایەتییەکانی خەڵك کەمبکەیتەوە، بەتایبەتی لەسنوری پارێزگای سلێمانی، وەك دەزانن نارەزایەتییەکی زۆر لەحکومەت و کەمیی خزمەتگوزاری هەیە؟

عیماد ئەحمەد: تا پێمبکرێت هەوڵی بۆ دەدەم، بەهاوکاری برا وەزیرەکان، پارێزگای

سلێمانی و شارەوانی سلێمانی و دامودەزگاکانی دیکەی سلێمانی، ئینشائەڵڵا [illegible]دەکەینەوە، هەوڵ دەدەین خزمەتێکی باش بکەین، بۆ ئەوەی کۆمەڵانی خەڵك لێمان رازیبن.

لڤین: دەزانین لەم کاتەدا جەنابتان بوون بە جێگری سەرۆك وەزیران کە بەهۆی حاڵەتێکی ناکاو و گۆڕانێکی کتوپڕی دۆخی ناو یەکێتییەوە بوو، ئێستا خۆشحاڵیت کە لەو پۆستەدایت؟

عیماد ئەحمەد: بەقورسی دەزانم، بەڵام زۆرجاری دیکە ئەرکی قورسیان خستووەتە سەر شانم و نەشموتووە نا، لەناو یەکێتیدا لە زۆر بواردا ئیشمکردووە، لەزۆر کاتی ناخۆش و خۆشدا تەکلیفکراوم و رەدی پۆستم نەکردووەتەوە، ئەگەر پۆستەکە بەرزە رازیبووم، لەهەمانکاتدا پۆستی نزمیشم قبوڵکردووە، ئەگەر بەڕێوەبەری ناحیە بێت بۆ خزمەتکردنی خەڵك و کۆمەڵانی خەڵك، رەدیناکەمەوە.

لڤین: ئەندامێکی سەرکردایەتی دەڵێت دەبێت دان بەوەدا بنێین کە عومەر فەتاح بە گوشارێکی زۆر لابرا، ئێستا کە تۆ چوویتە جێگەی ئەو، ئاسودەی لەو جێگەیە؟

عیماد ئەحمەد: کاك عومەر خۆی ئیستیقالەی کردووە ئێمە هیچ گوشارێك بەدی ناکەین، دەتوانن ئەو پرسیارە لە بەرێز کاك عومەر خۆی بکەن.

لڤین: لەم کاتەدا کە تۆ ئەو پۆستەت وەرگرتووە، نارەزایەتی سلێمانییەکان بۆ تۆ چاوەڕوانکراوە، بەتایبەتی کە تۆ دوا پۆستی سیادیت لە سلێمانییەکان وەرگرتەوە.

عیماد ئەحمەد: لە زۆر کاتدا لە سلێمانی ئیشمکردووە، (١٢) ساڵ لەمەوبەر بووم بە بەرپرسی مەڵبەندی سلێمانی، گەورەترین مەڵبەندی یەکێتی بووە، دووجاریش لێپرسراوێتی مەڵبەندی سلێمانیم کردووە، خەڵکی سلێمانی نەیانوتووە ئەمە خەڵکی سلێمانی نییە بۆ بەرپرسم بێت. لەوانەیە هەندێك خەڵك ئەو بۆچوونەی هەبێت، بەڵام نزیکەی (٥٤) ساڵ تەمەنمە، (٢٧) ساڵی دوایی لە سلێمانی و دەوروبەری ژیاوم و لەشارەکەی خۆم دوورکەوتوومەتەوە، ئەمە پێنجەمین پۆستی ناو حکومەتمە، لەسەردەمێکدا یەك پۆستی سیادیمان هەبوو، پۆستەکە کاك کۆسرەت وەریگرت، کە

خەڵکی سلێمانی نەبووە و (٤-٥) ساڵیش سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیرانی گرتووە و کەسیش نەیوتووە نابێت، خەڵکی سلێمانی لەوە بەرزتر و بە ئاگاتر و مەسئولترن کە رۆحیەتی ناوچەگەرییان لەلا مەبەست بێت، ئەم شارە شاری هەڵمەت و قوربانی و پێشڕەوی خەباتی سیاسیی بووە لە زۆر سەردەمدا.

لڤین: بەڵام لەسەردەمی کابینەکەی کۆسرەت رەسوڵیشدا نارەزایی لەو رووەوە هەبووە؟

عیماد ئەحمەد: ئەوە دەکرێت، هەندێك خەڵك بیانەوێت ئەو ناوچەگەرییە بکرێت، حاڵەتێك کە زیان لەیەکێتی نەتەوەیی خۆمان بدات، ئەو حاڵەتە بەراست نازانم، بەڵام دەبێت هاوسەنگیی تێدا بێت، ئەوە نییە بڵێم لەناو خەڵکی سلێمانی من باشترین کەسم ئەو پۆستە وەربگرم، بگرە زۆر کەس لەمن شایستە تر بوون، بەڵام لەباروودۆخێکی وادا کە تەکلیفکراوم و ئەرکێکی قورس خراوەتە سەرشانم، خۆم داوای ئەو پۆستەم نەکردووە و بە ئامادەیی هەموو ئەندامانی مەکتەبی سیاسیی دانراوم، بەڵام داوامکردووە کە هەرکەسێك دەیەوێت ئەم پۆستەم لێوەربگرێتەوە، پیرۆزبایشی لێدەکەم و پشتیوانیشی لێدەکەم، مودیر ناحیەیی لەگەڵدا دەکەم.

لڤین: مەبەستم نارەزایی خەڵکی سلێمانییە، بۆ نموونە چاودێرانی سیاسیی پێیانوایە کە کۆمپانیای وشە لەبەشێکیدا، یاخیبوونی سلێمانییە لەیەکێتی؟

عیماد ئەحمەد: نەخێر زۆر خەڵکی غەیرە سلێمانی هەن لە وشەن و هاوکاری دەکەن، وەکو بزانم ئامانجی کۆمپانیای وشە سلێمانیچێتی نییە.

لڤین: بەڵام ئامانجی کۆمپانیای وشە وەك سیمبولێکی سلێمانی دەردەکەوێت؟

عیماد ئەحمەد: راستە لەناو سلێمانیدایە، بەڵام ئیشوکاری کاك نەوشیروان و کۆمپانیای وشە سەرتاسەرییە، کوردستانییە، ناوچەگەر نییە.

لڤین: لەبەرنامەکانی تەلەفزیۆنیدا وتت دەبێت دان بەوەدا بنێین یەکێتی کێشەی هەیە، دەتوانیت بەدیاریکراوی ئەو کێشانە باسبکەیت؟

عیماد ئەحمەد: کێشەکان ئەوانەن لەناو مەکتەبی سیاسیدا روویاندا، نەگونجان

لەراوبۆچووندا هەیە، نەگونجان لەهەڵسوکەوتی رۆژانەدا هەیە، شتەکانمان شاراوە نین و هەمووی لای میدیاکانن و لەهەموو دنیا بلاوبووەتەوە ونهێنیمان نییە.

لڤین: بەرهەم سالح لەدیدارێکی رۆژنامەی (شەرق ئەلئەوسەت) دا دەڵێت: ئەم گۆڕانکاریانەی لەناو یەکێتیدا کراون، لەبەرژەوەندی هەندێك کەس دەدەن، بەلام لەبەرژەوەندی خەڵکدان و بەرژەوەندیی خەڵکیش ئەوە دەهێنێت لەبەرژەوەندی هەندێك کەس بدرێت، تۆش رات لەگەڵ ئەو جێگرەی سکرتێری یەکێتیدایە؟

عیماد ئەحمەد: هەر کەسێك تێگەشتنی خۆی بۆ شتەکان هەیە، هەموو گۆڕانکارییەك هەتا ئەگەر گۆڕانکارییەکیش لەگەڵ نوێبوونەوەشدا بێت، هەندێك کەس زەرەرمەند دەبن، جا ئەو زەرەرمەندە حەقە، یان حەقێکی لە ناحەقی وەرگرتووە، لێیدەسەنرێتەوە، بەلام لەهەموو حالەتێکدا هەر زەرەرمەندە، بۆ نموونە کە ئێستا دەڵێن خەڵکی شیاو لەشوێنی شیاو، نەشیاوەکان زەرەرمەند دەبن.

لڤین: پێتوایە لەم گۆڕانانەدا کێ نەشیاو زەرەرمەندە؟

عیماد ئەحمەد: ئەوە لەپرۆسەکەدا بۆمان دەردەکەوێت، ناتوانین ئێستا فیشەك بەتاریکییەوە بنێین، ئەو کاتە دەتوانین ئەوە بکەین کە هەڵسەنگاندنێك هەبێت بۆماندەردەخات کێ شیاوە و کێ شیاو نییە.

لڤین: لەتێگەیشتنی قسەکانی تۆدا دەردەکەوێت یەکێتی بارودۆخێکی زۆر ئاسایی هەبێت، ئەمە لەکاتێکدایە زۆربەی بەرپرسەکانی ناو یەکێتی زۆر بەڕاشکاوانە باس لەکێشە گەورەکانی یەکێتی دەکەن؟

عیماد ئەحمەد: من ناڵێم وەزعی یەکێتی ئاساییە، ئەوانەی دەستیان لەکارکێشاوەتەوە، پێمان باشە بگەڕێنەوە و ئیشمان لەگەڵ بکەن، مام جەلال سکرتێرە، جارهەبووە ئیستیقالەی کردووە و قبوڵ نەکراوە، برادەران رازی نەبوون.

لڤین: کەی ئیستیقالەی داوە؟

عیماد ئەحمەد: زۆرجار ئەو کێشانە هەبوون، لەساڵی (١٩٩٤) مام جەلال دەستی لەکارکێشایەوە و سەفەری دەرەوەی کرد، لەکاتی تەزامونی مەکتەبی سیاسیی

لەبەر هەندێك شتی ئەو کاتە، دوای هاتنەوە لەگەڵ سەرکردایەتی بارودۆخەکە چاککرایەوە، زۆرجار کاك نەوشیروان عاجز بووە و رۆشتووەتە دەرەوە و هاتووەتەوە، لەناو شۆرش دانیشتن هەبووە، ئەم حاڵەتە یەکەمجار نییە، بەڵام دەکرێت بڵێین یەکەمجارە رۆژنامەگەری چووەتە بنج و بنەوانییەوە و وایکردووە گیان و مێشك و دڵمان لەبەردەستی خەڵك بێت، جاران زۆرکەم دەزانرا، بەڵام ئێستا هەموو شتەکانمان ئاشکرا و زانراون.

لڤین: بەرپرسە باڵاکانی یەکێتی باس لەوە دەکەن کە یەکێتی گەیشتووەتە ئاستێك یان دەبێت چاکسازی بکات، یان دەبێت رێگەبدات بە ململانێی شەخسی و ململانێکانی گەیشتن بەدەسەڵات، تۆش رات وایە یەکێتی گەیشتووەتە ئەو ئاستە؟

عیماد ئەحمەد: یەکێتی پێویستییەکی حەتمی بەچاکسازی هەیە، یەکێتی خاوەن گۆڕانە لە ئسلوبی خەباتدا، واتە لەخەباتی شاخەوە هاتووەتە خەباتی شار، لەحیزبی موعارەزەوە بووەتە حیزبی دەسەڵاتدار، لەحیزبی نوخبە و تێکۆشانەوە بووەتە حیزبی جەماوەر، ئەمە هەندێکی باشە و هەندێکیشی خراپە، لەهەندێك حاڵەتدا ئاوساوە و دەبێت سوژنێکی پێدابکەیت، ئەو باو شتانەی لێدەربچێت و ببێتەوە بەحاڵەتێکی ئاسای خۆی لەشتەکان، زۆر تەپوتۆز لەگیانمان نیشتووە، دەبێت خۆمان بتەکێنین، هەموو دنیاش وایە، قسەیەکی لینین هەیە دەڵێت بژارکردن حیزب بەهێزدەکات، ئایا دەبێت خۆمان بژارنەکەین؟ ئایا دەبێت بێ کەموکوڕی بین و ئیجرائات نەکەین؟!

لڤین: مەبەستت ئەوەیە یەکێتی گەیشتووەتە ئەو ئاستەی بەدەربڕینی کۆسرەت رەسوڵ د. بەرهەم، گەیشتووەتە دووڕیانێك، یان چاکسازی یانە رێگەدان بەو ململانێ ناشەرعییە؟

عیماد ئەحمەد: چاکسازییەکە بێت باشترە، بەردەوامبوونی ململانێ بەو شێوەیەی کە ئێستا هەیە، بەخەتەر دەزانم بۆسەر یەکێتی.

لڤین: دوو جێگرەکە چوون بۆ بەغدا و باس لە گۆڕان کرا، دواتر لەراگەیاندنی یەکێتییەوە باس لەوە کرا مام جەلال سەلاحیەتی تەواوی پێیانداوە؟

عیماد ئەحمەد: پێشتر مام جەلال بەنوسین سەلاحیەتی خۆی داوە بە هەردوو جێگرەکە، لەمەکتەبی سیاسیش وتوویەتی ئەرك و ئیشوکاری ناو یەکێتی دەسپێرم بە هەردوو جێگرەکە و مەکتەبی سیاسیی، با من وەك موراقیب سەرپەرەشتی کارەکان بکەم.

لڤین: ئەمە لەکاتێکدا هەمووتان باس لە چاکسازی دەکەن، پێتان وانییە مام جەلال بەم هەنگاوەی بیانووی هەمووتانی بڕیوە؟

عیماد ئەحمەد: بەڵێ، مام جەلال بەشێکە لەیەکێتی، ناتوانین لەدەرەوەی یەکێتی دایبنێین، ئەو چوارەش کە موزەکەرەکەیان داوە، دەڵێن چاکسازیی بەڕابەرایەتی مام جەلال.

لڤین: ئەو شیعارەشیان هەیە کە چاکسازی بەبێ ئەوەی کە هەموو ئەو ئەندامانەی کە لەماڵەوەن نەگەڕێنەوە، چاکسازی ناکرێت، تۆ پێتوایە لەیەکتر تێگەیشتن نییە؟

عیماد ئەحمەد: نەخێر، باش لەیەکتر تێدەگەین، وازهێنانی ئەوان پەیوەندی بەهەڵوێستی خۆیانەوە هەیە، ئەوان لە مەنزوورێکەوە بۆی دەچن، برادەرانی مەکتەبی سیاسی و بەڕێز مام جەلال هۆکارەکە و کاتەکەشی دەزانن، پێمانباشنەبوو ئەوان ئەو هەڵوێستە وەربگرن، پێمانباشبوو ئەوان بەشێك بوونایە لە چارەسەر، نەك بەشێك بن لە کێشە.

لڤین: پێتوایە ئاڕاستەی یەکێتی بەرەو کوێ دەڕوات؟

عیماد ئەحمەد: ئەگەر هیمەتنەکەین، بەرەو باشی ناڕوات.

لڤین: ڕێگری و بەربەستەکانی بەردەم ریفۆرمێکی عەمەلی چین، یاخود پێتوایە بەربەست نییە؟

عیماد ئەحمەد: چۆن بەربەست نییە؟ بەربەست بەرژەوەندییە تایبەتەکانن، رای جیاوازە، بالانسی ناو تەکەتولەکانی یەکێتییە، ئەمانە هەموو کۆسپن، چەند هەڵبژاردنمان لەناو یەکێتیدا کردووە بۆ دامودەزگاکان، بۆ ئەم هەڵبژاردنەی ئەخیر ئەمەی لێکەوتەوە؟ بۆ ئەوانی تر وایان لێنەهات؟

لڤین: ئەگەر نەوشیروان مستەفا نەگەڕێتەوە، چی دەبێت؟

عیماد ئەحمەد: پێمانخۆشە بگەڕێتەوە، بەڵام بەم هاوکێشەیەی ئێستا، زەحمەتە بگەڕێتەوە، بەموستەحیلی نازانم کە بگەڕێتەوە، تەسەورم وایە کە تێگەیشتن لەنێوان مام جەلال و کاك نەوشیروواندا هەبێت و پێشمباشە ئەو تێگەشتنە هەر هەبێت.

لڤین: ئەگەر نەگەڕێتەوە چی دەبێت؟

عیماد ئەحمەد: کاك نەوشیروان زۆر لەوە گەورەترە کە خەڵك بیر لە هەندێك شت دەکاتەوە، کاك نەوشیروان مستەفا مەسئولە و بڕیاری مەسئولانە دەدات.

لڤین: ئامادەکاریتان بۆ ئەوە کردووە کە ئەگەر لیستێك لەدەرەوەی یەکێتی دروست ببێت، هەڵوێستان چی دەبێت؟

عیماد ئەحمەد: پێمانباش نییە، لیستێك لەناو یەکێتی جیاببێتەوە و دروستببێت، لیستێك خاریجی بێت ئاساییە، بەڵام لیستێك لەیەکێتی جیاببێتەوە، پێمانباش نییە.

لڤین: هەڵوێستتان چی دەبێت؟

عیماد ئەحمەد: پێمانباش نییە و دەرەنجامەکەی لە قازانجی یەکێتی و خوێنی شەهیدان و ئەم میللەتە چەوساوەیە نییە، چونکە ئەوە دەبێتە ئینشیقاق، بەقازانجی نازانین.

لڤین: بەوپێیەی ئەندامی مەکتەبی سیاسیت، بەچوونە دەرەوەی باڵی ریفۆرم بارودۆخی یەکێتی چی لێدێت؟

عیماد ئەحمەد: دێنەوە و لەلایەن مام جەلال و زۆر کەسی تریشەوە هەوڵی بۆ دەدرێت کە بێنەوە، چونکە مام جەلال پێیخۆش نییە کە کاك نەوشیروان لەدەرەوەی موعادەلەکە بێت.

لڤین: ئێستا هەوڵەکانی ئەو گەڕانەوەیە گەیشتوونەتە کوێ؟

عیماد ئەحمەد: مام جەلال نامەیەکی لەڕێگەی کاك دلێری سەید مەجیدەوە ئاڕاستەی کاك نەوشیروان کردووە، ئیمکانە بەمنزیکانە یەکتری ببینن.

لڤین: باڵی ریفۆرم و چوار ئەندام مەکتەب سیاسییەکە و کۆسرەت رەسوڵیش باس لەوە دەکەن کە ناشەفافی لەناو یەکێتیدا هەیە؟

عیماد ئەحمەد: بەڵێ وایە، بەڵام بۆ دەڵێن باڵی ریفۆرم، باڵەکەی تر ناریفۆرمە؟ ناو دەبێت لەگەڵ ناوەڕۆکدا بگونجێت.

لڤین: ریفۆرم وەك ئەوەی دەوترێت کە ناسراوە بەباڵی ریفۆرم.

عیماد ئەحمەد: نا باڵی چی، کاك نەوشیروان تا ئێستا بەخۆی نەوتووە من باڵم، بڕۆ لەخۆشی بپرسە، بزانە بەخۆی دەڵێ چی و خۆی ئەو وەڵامەت دەداتەوە.

لڤین: گرووپی نەوشیروان مستەفا فیکرەی جیاوازیان هەیە و لەگەڵ چوار ئەندامەکە دەڵێن ناشەفافی لەناو یەکێتی هەیە؟ تۆش پێتوایە هەیە؟

عیماد ئەحمەد: منیش دەڵێم هەیە، بەڵێ منیش لەگەڵ رەئی ئەواندام، دەبێت هەوڵبدەین ئەو مەسەلەیە جێبەجێبکەین و لەخۆشمانەوە دەستپێبکەین و ئەوەی وەرمانگرتووە بۆ چالاکییەکانی چوار ساڵ لەمەوبەر، تەسفیەی حیساباتی خۆمان بکەین و بیخەینە بەردەم لایەنی پەیوەندیدار.

لڤین: سێ مانگی تر هەڵبژاردن دەکرێت، پێتوایە یەکێتی پۆستی سەرۆك وەزیران لە پارتی وەربگرێتەوە؟

عیماد ئەحمەد: بێگومان حەقی خۆیەتی، پارتیش نکولی لێنەکردووە.

## د.عومەر شێخ موس: خەڵك حەقی خۆیەتی را پەڕین بكات، ئەگەر پارتی و یەكێتی نەگۆڕێن لێرەش را پەڕین دەستپێدەكات.

گفتوگۆی ئیراهیم عەلی و هەڵگور سەمەد

د.عومەر شێخموس لەدامەزرێنەرە سەرەكییەكانی یەكێتی نیشتیمانی كوردستانە، هەرچەندە (٢٢) ساڵە وازی لەكاری حیزبایەتی هێناوە، بەڵام زۆر نیگەرانە لەو بارودۆخەی كەئێستا یەكێتی پێیدا تێدەپەڕێت، هەربۆیە ئێستا هاتووەتەوە بۆ كوردستان و بەنیازە میانگیری بكات لەنێوان باڵی تاڵەبانی و نەوشیرواندا.

كاتێك لەبەرامبەری دادەنیشیت، بەو تەمەنەشەوە هەستدەكەیت لەبەرامبەر كەسێك دانیشتوویت كە زۆر بەدیقەتەوە قسەدەكات و حیساب بۆ یەكە بەیەكەی قسەكانی دەكات، سیاسەتمەدار عومەر شێخموس یەكێك لەدامەزرێنەرانی یەكێتییە، ئەو كەسێكی قاڵبووی نێو سیاسەتە وەك شارەزایەك لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و چاودێرێكی بارودۆخی سیاسی كوردستان، لەم دیمانەیەدا تیشك دەخاتە سەر زۆر شت، لەوانە: بارودۆخی ناوخۆئێستای یەكێتی نیشتیمانی و ئەو نارەزاییەی خەڵكی كوردستان لەبەرامبەر دوو حیزبەكە هەیانە، ئەمەش بەشی یەكەمی ئەو دیمانەیە كە (لڤین) لە دواین سەفەری عومەر شێخ موسدا بۆ كوردستان، لەگەڵ سازیداوە.

لڤین: بەڕێزت وەك یەكێك لەدامەزرێنەرانی یەكێتی، پێتوایە دوای تێپەڕبوونی (٣٣) ساڵ بەسەر دامەزراندنی یەكێتیدا، ئەم حیزبە پابەندە بەو ئامانجانەوە كە لەپێناویدا دروستبووە، یان پشتیكردووەتە ئامانجە راستەقینەكانی خۆی؟

عومەر شێخ موس: دەتوانم بڵێم لەو ئامانجانەی كە بۆ خۆمانمان دانابوو، ٨٠٪ ی بەدیهاتوون، لەوانەیە ٢٠٪ یان بەدەستنەهاتبێت، لە ٨٠٪ ی لەوەدا بەدەستهاتووە كە رژێمی سەدام روخا و كوردستان بووەتە هەرێمێكی فیدراڵی ، میللەتی كورد مەترسی راگواستن و ئەنفالی لەسەر نەماوە، ئیستا كوردستان یەكێكە لەهەرێمە

بزووتنەوەکانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست، لەو ئامانجانەشی کەیەکێتی نەیتوانیوە بەدەستیانبهێنێت، هەندێك ئامانجی کۆمەلایەتیمان هەبوو، وەك مەسەلەی گۆڕینی کۆمەڵ و مافەکانی ژنان و دابەشکردنی زەوی و چەندانی دیکە، ئەمانە دواخراوە لەبەر ئەو رەوشەی کە لەدوای (١٩٩١) وە هاتوونەتەپێش، لەدوای راپەڕینەوە تاوەکو ئێستا، چەندان رووداوی ناخۆش روویانداوە، وەکو شەڕی ناوخۆ، بەلام ئێستا وا خەریکە حکومەتی یەکگرتوو دروستدەبێت، بەلام هەندێك دیاردە پەیدابوون لەنێو بەرپرسانی یەکێتی نیشتیمانی و حیزبەکانی تریش کە بەدڵم نین، ئەو لێپرسراوانە خەریکە دەبن بەنوخبەیەك وەك بەرپرسانی زۆرێك لەولاتانی جیهانی سێیەم، لەکاتی خەباتی رزگاریخوازی شتێك بوون، کەچی کەهاتنە سەر دەسەلات، بوونەتە شتێکی دیکە، من بەشبەحاڵی خۆم، ئێستا زۆرێك لەدۆستەکانی خۆم ناناسمەوە، ئەوە پەیوەندی بەدەسەلاتەوە هەیە، ناڵێم هەموویان، بەلام زۆریان وایانلێهاتووە، دەبێت وریا بن.

لڤین: ئێستا لەهەموو کات زیاتر، یەکێتی بەدەست گرفتی ناوخۆیی خۆیەوە دەناڵێنیچت، بەبڕوای تۆ، لەسایەی ئەم بارودۆخەدا یەکێتی بەرەو کوێ دەچێت؟

عومەر شێخ موس: ئێمە کەیەکێتی نیشتیمانیمان دامەزراند، بیرمان لەرێکخراوێکی یەکگرتوو کردبووەوە، نەك لەسەر بنەمای تەیاراتی رێکخراو بێت، بەڵکو قبوڵمان بوو کە فیکری جیاواز و بۆچوونی جیاواز لەناو یەکێتیدا هەبێت، بەلام لەناو رێکخراوێکی یەکگرتوودا، ئێمە ئەوانەی لەدەرەوەی ولات بووین، بەوشێوەیە بیرمان لێ کردبووەوە، بەلام بەداخەوە ئەو برادەرانەی لەناو ولات بوون، بەشێوەیەکی دیە جموجوڵیان کرد و ئێمەش ناچاربووین ئەوە قبوڵبکەین. ئەویش بوو بەتەیاراتی رێکخراو، کۆمەڵە و بزوتنەوە و خەتی گشتی بوون، ئەم حاڵەتە بەردەوام بوو تا ئەم ساڵانەی دوایی، تەیاراتی رێکخراو نەما و یەکێتی بوو بەیەك رێکخراو، بەلام ئەو جیاوازییە فیکرییەی کە هەبوو، ئێستا رەنگی تەکەتولی بەخۆیەوە گرتووە، ئەوە زەرەرێکی گەورەی لەیەکێتی داوە، لەجیاتی ئەوەی یەکێتی رێکخراوێکی

هەندێ گەورە بێت، ئەو تەکەتولاتە خەریکە کاریگەری دەبێت بۆ کەمبوونەوەی نفوز و توانای یەکێتی نیشتیمانی، ئەو سروشتەی یەکێتی، هۆی بەهێزی و هۆی لاوازیشییەتی. هۆی بەهێزییەکەی ئەوەیە کە ڕێکخراوێکی لیبراڵە و ڕێگەدەدات بە بۆچوون و دەربڕینی جیاواز، لەکاتی خۆی ڕێگە بەدروستبوونی ڕێکخراوی جیاوازیش دەدا، بەڵام هەر ئەو تەباراتانە خۆیان دەتوانن ببن بەهۆی لاوازبوونی یەکێتی، چونکە سەرەنجام ناکۆکی لەنێوان ئەم تەیاراتانە دروستدەبێت، نەك ململانێی ڕێکوپێکی دیموکراتیانە، بەداخەوە خەریکە وای بەسەربێت، بەڵام ئێستا بیریان لەوە کردووەتەوە کە ئەوە زەرەر لەیەکێتی دەدات و بیریان لەئالیەتێك کردووەتەوە بۆ کۆنگرەی داهاتوو، کە بەلایەنی زۆرییەوە لە بەهاری ئایندەدا دەبێت.

لڤین: ئەگەر مەسەلەی ئازادی یەکێك بێت لەئامانجەکانی یەکێتی، ئێستا دەبینین لەسەر بۆچوون و ڕای جیاواز خەڵك لەیەکێتی دەردەکرێت، ئەوە لە کوێی یەکێتیدا جێگەی دەبێتەوە؟

عومەر شێخ موس: من لەگەڵ ئەو بۆچوونە نیم کە لەسەر ڕای جیاواز خەڵك لە یەکێتی دەربکرێت، بۆیەش من لەوەختی خۆی لە ساڵی (١٩٨٦) ئیستیقالەم داوە، چونکە من بۆچوونێکی دیکەم هەیە، من پێمباشە یەکێتی وەکو حیزبێکی سۆسیالیستی فەرەنسا بێت، کە ڕێگە بەتەیاراتی جیاواز دەدات لەناو حیزبەکەدا، یەکێتی نیشتیمانی ئێستا بڕیاری داوە کە قبوڵی موعارەزەی ڕێکخراو ناکات لەنێو حیزبدا، ئەوانەی کە خۆیان ناودەنێن حیزب، یەکێتی دەڵێت ئێمە ڕێگەدەدەین بەبیروڕاو بۆچوونی جیاواز، بەڵام لەچوارچێوەی حیزبدا.

لڤین: پێتوایە ئەو ڕێگەنەدانە، ترسی لەدەستدانی کورسییەکانیانە لەلایەن سەرکردایەتی یەکێتییەوە؟

عومەر شێخ موس: دوور نییە، من لەوە دڵنیا نیم، چونکە من ماوەیەکی زۆر نییە کە هاتوومەتەوە، بەڵام ئێستا وا پێدەچێت کە مەترسی ئینشیقاقێك لەناو یەکێتیدا هەبێت.

لڤین: پێتوانییە دوورکەوتنەوەی نەوشیروان مستەفا ئەم رەوشەی ئێستای یەکێتی دروستکردووە؟

عومەر شێخ موس: ئەو ململانێیەی کە هەیە، ململانێی فیکری جیاوازە، ئەوە هێشتا ساغنەبووەتەوە کە بەکام لادا دەڕوات، کاك نەوشیروان خۆشی بڕیارەکەی نەداوە کە ئایا لەناو یەکێتیدا دەمێنێت یان لەدەرەوەی یەکێتی دەبێت، دەبێت لەنێوان خۆیان گفتوگۆ بکەن کە بەرەو کام لا دەڕۆن، من ئەوەیکە دەیبینم سێ چوار بۆچوونی جیاواز لەناو یەکێتیدا هەیە، بەڵام ئەوانەی کە بەزەقی بیروڕای خۆیان دەردەبڕن، کاك نەوشیروان و ئەو برادەرانەن کە لەگەڵیدان.

لڤین: چاودێرانی سیاسیی پێیانوایە کە سەرهەڵدانی ئەو باڵانە لەناو یەکێتی و سەرقاڵبوونی یەکێتی بەناوخۆی خۆیەوە، دەبێتە هۆی ئەوەی کە پارتی بەهێز بێت و تەرازووی هێز لەکوردستانلاسەنگ بێت، بەبۆچوونی ئێوە، ئەو ململانێیەی ئەم دواییەی ناو یەکێتی تەرازووی هێز لە کوردستان تێکدەدات؟

عومەر شێخ موس: بێگومان هەرکەسێك لە ئەلف و بای سیاسەت تێبگات، دەزانێت کە ئەو رەوشەی ئێستای یەکێتی زەرەر لەیەکێتی نیشتیمانی دەدات. من بەشبەحاڵی خۆم ، زۆر بەزەرەری دەزانم کە تاکە حیزبێك لەکوردستاندا زاڵ ببێت بەسەر رەوشی سیاسی لەهەموو کوردستان، من زاڵبوونی هەردوو حیزبەکەش بەخراپ دەزانم بۆ ئایندەی سیاسی لە کوردستان، من پێمخۆشە بەدیلی سێیەم و چوارەمیش هەبێت، پێمباشە حیزبێکی سێیەمی بەهێز و حیزبێکی چوارەمی بەهێز هەبووایە، بۆ ئەوەی ئەو دوو جەمسەرییەی کە لەکوردستان هەیە، نەمێنێت. ئێمە لەسیستەمی جیهانی سیاسی دەزانین کە لەکاتی سۆڤیەت و ئەمریکا ململانێکە چەند سەخت و داخراو بوو. من ئەو دوو جەمسەریەم پێ خراپە بۆ پرۆسەی دیموکراسی کوردستان، بەڵام نەك ببێت بەناکۆکی و شەڕی ناوخۆ.

لڤین: پێتوانییە کەیەکێتی و پارتی خۆیان رێگرن لەدروستبوونی هێزی سێیەم و چوارەم لەکوردستاندا؟

عومەر شێخ موس: دوور نییە ئەوان پێیانناخۆش بێت، بەڵام ئەگەرلا خەڵك خۆی کۆبکاتەوە و ڕێگە خۆشبکات و ڕێکخستن دروستبکات، ئەوان ناتوانن ڕێگری بکەن، بەڵام بێگومان کەس بەئاسانی دەسەڵات بەجێناهێڵێت، ئەمە لەهەموو دونیادا وایە، دوورنییە پارتی و یەکێتی دروستبوونی هێزێکی لەوجۆرەیان پێناخۆش بێت، دوور نییە ڕێگەشی لێبگرن.

لڤین: تۆ لەسەرەتا ئاماژەت بەوە کرد کە برادەرانی سەردەمی شۆڕش ئێستا ناناسیتەوە، زۆرجار دەوترێت ئەوانەی لەسەردەمی شۆڕش لەپێناو ئازادیدا خەباتیان کرد، هەمان ئەو کەسانەن کە ئێستا بوونەتە مەترسی بەسەر ئازادییەوە، ئێستا لە کوردستانیش هەمان شت دەبینرێت، ئێوە تێبینیتان لەسەر ئەمە چییە؟

عومەر شێخ موس: وەکو باسمکرد لە زۆر شوێنی دونیا هێزە ڕزگاریخوازەکان کە دەسەڵات دەگرنەدەست، جۆرە گۆڕانێکیان بەسەردێت کە لەگەڵ سروشتی پێشوویان ناگونجێت، پێموایە ئەمە سروشتی دەسەڵاتە، هەندێك لەو برادەرانە چ لەناو پارتی و چ لەناو یەکێتی، بەداخەوە دیارە دەسەڵات گێژی کردوون.

لڤین: پێتوایە یەکێتی پێویستی بەگۆڕانە لەسیستەم یان پێویستە سەرکردایەتی یەکێتی بگۆڕێت و کۆمەڵێك کەسی دیکە بێتەپێشەوە؟

عومەر شێخ موس: بەبۆچوونی من، پێویستە هەردوو گۆڕانکارییەکە بکرێت، یەکێتی پێویستی بەگۆڕانکاری لەڕێکخستنەکانی هەیە، پێویستی بەبەرنامە و پەیڕەوێکی ناوخۆی تازە هەیە، پێویستی بەگۆڕانکارییەکی گەورە هەیە لەسەرکردایەتی و لە ڕێکخستنەکانیدا، نەك تەنیا یەکێتی بەڵکو پارتی و تەواوی هێزەکانی دیکەش پێویستیان بەو گۆڕانکاریانە هەیە، ئەگەر خۆیان نەگۆڕن وەکو حیزبەکانی ئەورووپای ڕۆژهەڵات و سۆڤیەتیان بەسەردێت و لەشوێنی خۆیان دەمرن، ئەگەر سەیری سەرکردایەتی حیزبەکان بکەین، زۆربەیان لەجیلی یەکەمی ئەو حیزبەن، جیلی دووەم و جیلی سێیەم زۆر بەکەمی هاتوونەتە سەرکردایەتی، ئەو حیزبانە توشی جۆرێك لە چەقبەستن بوون، ئەو پێڕەوی ناوخۆییەی یەکێتی لە ساڵی

١٩٧٥) نوسراوه، لەساڵی (١٩٧٥) ەوە تاوەکو ئێستا دنیایەك گۆڕان روویداوە، ئەگەر لەیەکێتییەوە سەیر بکەین، یەکێتی لەحیزبێکی بچوکی رزگاریخوازی بووەتە یەکێك لەحیزبە گەورەکان، دەسەلاتی لە عێراق و کوردستاندا هەیە، ئێویستە پێڕەوێکی تازە و ئامانجی تازە بۆ خۆی دابنێت، دونیا بەشێوەیەك گۆڕاوە، ئەگەر خۆی تازەنەکاتەوە، ئلیندەی باش نابێت.

لڤین: ئەگەر سەیری یەکێتی و پارتی و تەواوی حیزبە کوردییەکان بکەین، دەبینین زۆر لەنوێبوونەوە و کۆنگرە ترسیان هەیە، لەتەواوی مێژووی یەکێتیدا تەنیا دوو کۆنگرەی بەستووە، هۆکاری ئەو ترسە لەکۆنگرە چییە؟

عومەر شێخ موس: من بەپلەی یەکەم بەرپرسیارێتی ئەمە دەخەمە ئەستۆی سەرکردایەتی ئەو دوو حیزبە، نەك لەبەرئەوەی کەدەترسن، بەڵکو ئەوان رازین بەو رەوشەی کەهەیە، بۆخۆیان باشە ئەگەر حیزبەکانیان نوێببنەوە، چونکە گروتینێکی تازە دەدرێتەوە بە حیزبەکان بەهۆی نوێبوونەوەیان. ئەمە بۆچوونێکی ناڕاستە کە وا دەبینن ئەگەر ئەم رەوشە وەها بمێنێتەوە، بەقازانجی ئەوانە، من ئەمە بەپێچەوانەوە دەبینم.

لڤین: لەکاتێکدا کە گۆڕان لەبەرژەوەندی رەوشەکە و حیزبەکە بێت، دەبینین کە هەر رەوتێك لەناو ئەو حیزبانە دروست ببێت بۆ چاکسازی و گۆڕان، هەوڵی بچوککردنەوە و لەناوبردنی دەدرێت، ئەمە هۆکارێك نییە بۆ مانەوە لەدەسەلات تا مردنی کەسەکان؟

عومەر شێخ موس: ئەوە سەرەتای ململانێکەیە، مەرج نییە هەتا هەتا وابێت، دوور نییە رێگاچارەیەکیدیکە بدۆزنەوە، ئەوە دیاردەیەکە پەیوەندی بەسەرهەڵدانی ململانێکانەوە هەیە، بەلام لەناوەوە دەبێت چارەسەرێکی بۆ بدۆزرێتەوە.

لڤین: خوێندنەوەت بۆ ئایندەی یەکێتی چییە؟ ئایا وەکو ئێستا بەو حاڵەتە بەردەوام دەبێت، یاخود لێکترازانی باڵەکان روودەدات و دەبنە چەند هێزێکی جودا، یان دەبێتە هێزێکی تۆکمەی بێ تەکەتول؟

عومەر شێخ موس: ناتوانم هیچ پێشبینییەك بکەم، بەڵام من لەگەڵ سەرکردەکانی یەکێتی نیشتیمانی قسەمکردووە، دەزانم کە کۆنگرەیان لەپێشە و بڕیاریانداوە بۆ هەندێك هەنگاوی ریفۆرم و نوێکردنەوە، بڕیاریشیان داوە لە کۆنگرەی ئاییندەدا، بەرنامەیەکی تازە دابنێن.

لڤین: بەڵام زۆرجار بەرپرسانی یەکێتی گلەیی ئەوە دەکەنکە بڕیارە یەکلاکەرەوەکانی یەکێتی (بە کۆنگرەشەوە)، تەنیا تاڵەبانی بڕیاری لێدەدات، پێتوانییە یەکێتیش ببێتە حیزبێکی بنەماڵەیی؟

عومەر شێخ موس: من ناتوانم بڵێم یەکێتی دەبیچتە حیزبێکی بنەماڵەیی، چونکە هێشتا نەگەیشتووەتە ئەو رادەیە، پارتیش خەریکە دەبێتە پارتێکی دامەزراوەیی، نەك تەنیا بنەماڵەیی بێت، بۆیە من ئەو بۆچوونە بەراست نازانم، جاران رەنگە ئەو بۆچوونە راست بوو بێت، بەڵام کە دەبینین کوردستان بەرەو دەوڵەتێکی موئەسەساتی دەچێت، ئەو دوو حیزبە ناچاردەکات کە بگۆڕێن.

لڤین: ئەمە رەنگە بڵێین تارادەیەك راستە، بەڵام دەبینین پارتی و یەکێتی ئەوەندەی لەپێناو بەدیهێنانی ئامانجە حیزبییەکانیانهەوڵدەدەن، ئەوەندە بۆ بەدیهێنانی ئامانجە نەتەوەییەکان هەوڵنادەن.

عومەر شێخ موس: ئەوە کارێکی خراپە، من لەوەدا لەگەڵتدام، کاتی ئەوە هاتووە کەیەکێتی و پارتی تەنیا بیر لە بەرژەوەندی حیزبیی خۆیان نەکەنەوە، دەبێت بیر لەبەرژەوەندی نەتەوەیی بکەنەوە، هەر حیزبێك مافی خۆیەتی کە هەوڵی ئەوە بدات، نفوزی خۆی زیاتر بکات، بەڵام کە تۆ دەوڵەتیکت دامەزراند و حکومەتێکت هەبێت و دەسەڵاتت بەسەر گەلێکدا هەبێت، دەبێت بیر لەو گەلە بکەیتەوە، زۆرجار دەبیچت واز لەبەرژەوەندی حیزبی بهێنرێت لەپێناو بەرژەوەندی میللەتدا، بۆیە بەو رەفتارە زەرەر لەخۆیان دەدەن، نابێت بیریان وا سنورداربێت، تەنیا بیر لەبەرژەوەندی حیزبی بکەنەوە، ئەوە دەبێتە هۆی نارازیبوونی خەڵك لەدەستیان، لەوەشدا چەند شتێك هەیە رەنگە ئەوە ببێتەهۆی نارازیبوون و تەقینەوە بەڕوویاندا، یەکێك

هۆکارەکان مەسەلەی گەندەڵییە، هەروەها شتێکی دیکەش دەسەلاتی حیزبییە، خەڵك هەتا هەتایە ئەوە قبوڵناکات، دەبێت خۆیان بگۆڕن و بۆچوونەکانی خۆیان بگۆڕن، ئەگەرنا لێرەش ڕاپەڕین دەستپێدەکات.

لڤین: پێتوانییە بنەماکانی ئو ڕاپەڕینە بەدەرکەوتووە لە کوردستاندا، بۆ نموونە: باسی دوو خاڵت کرد کە گەیشتونەتە لوتکە، گەندەڵی و دەسەلاتی ڕەهای حیزب؟

عومەر شێخ موس: من نازانم ئەو شتانە گەیشتوونەتە لەوتکە یان نا، بەلام خەڵك زۆر باسی دەکەن، پێموایە ئەوە زیادبوونی نارِازیبوونە، بۆیە خوێندکار و خەڵك بۆ ئاو و کارەبا خۆپیشاندان دەکەن، چەندین خۆپیشاندان ڕوویداوە، من دەڵێم دەبێت زوو بەخۆ بکەون ریفۆرم و چاکسازی بکەن، من ئەوەشتەم بە بەرپرسانیش وتووە، بەکاك هۆشیار و کاك بەرهەم و بە مام جەلالم وتووە. مەسەلەی ڕاپەڕین حەقی خەڵکە، کە شتێك بوو داوای گۆڕین بکات و داوای مافی خۆی بکات، هەقی خۆیەتی، بەلاّم شتیکی دیکە کە زۆرلێی دەترسم، ئەویش ئەوەیە کەهێزی ئیسلامیی سیاسی لە دەرەنجامی ئەو ڕەوشە بەهێز بن، وەکو فەلەستین و تورکیا، وەکو زۆرێك لە وڵاتانی ئاسیا و ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست کە دەسەلات بگرنەدەست.

## د. عومەر شێخموس: سەرکردە کوردەکان لەبەغدا سیاسەت ناکەن، یان جوامێری دەکەن یان تەنازول

گفتوگۆی ئیبراهیم عەلی و هەڵگورد سەمەد

د. عومەر شێخموس لەدامەزرێنەرە سەرەکییەکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستانە، هەرچەندە (٢٢) ساڵە وازی لەکاری حیزبایەتی هێناوە، بەڵام زۆر نیگەرانە لەو بارودۆخەی کە ئێستا یەکێتی پیادا تێپەڕدەبێت، هەربۆیە ئێستا هاتووەتەوە بۆ کوردستان و بەنیازە میانگیری بکات لەنێوان باڵی تاڵەبانی و نەوشیرواندا.

بەشی دووەم و کۆتایی

لڤین: ئەوە نزیکەی حەڤدە ساڵە کە کورد لە کوردستان حوکمی خۆی دەکات، بەڵام دەبینین رۆژبەرۆژ کێشەکان زیاتر دەبن، بەتایبەت ئەو نادادیەی کەهەیە و مەسەلەی گەندەڵی و ئازادی رادەبڕین و دەیان شتی دیکە، کە ئەزموونی هەرێمی کوردستان دەخەنە ژێر پرسیارەوە، بیروڕای ئێوە لەوبارەیەوە چییە؟

عومەر شێخ موس: مرۆڤ کەحوکم لەسەر هەر شتێك بدات، دەبێت بەویژدانەوە حوکمی لەسەر بدات، مێژووی حوکمڕانی کورد لە ساڵی (١٩٩٢) ەوە دەستپێدەکات، لەو کاتەی کە هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان ئەنجامدرا و حکومەتی هەرێم دامەزرا، ئەو کات کوردستان وێران بوو، حکومەتی هەرێم ئەو کات لەژێر ئابلۆقەی دوو لایەندا بوو، نەتەوە یەکگرتووەکان و حکومەتی عێراقی، ئەو حکومەتە یەکگرتووەی هەرێم تەنیا دوو ساڵ بەوشێوەیە مایەوە، دواتر شەڕی ناوخۆ هەڵگیرسا و بوو بەدوو حکومەت و ناکۆکییەکی توند لەنێوان هەردوولادا هەبوو، وڵاتانی دراوسێ لەیەکەم رۆژەوە شەڕی ئەم کیانەیان کردووە، دووەمجار کە حکومەتی یەکگرتوو دروستکرایەوە لە ساڵی (٢٠٠٦) بوو، کەواتە ئەو حکومەتە تەمەنی تەنیا دوو ساڵە، بەڵام بەگشتی ئەگەر تەماشابکەین لە ساڵی (١٩٩٢) ەوە تاوەکو ئێستا، بەکەمی ئیمکانیاتیشەوە، دەسکەوتەکانی حکومەتی هەرێم بە بەراورد

هەندێك وڵاتانی دونیا دەسکەوتی گەورەن. هەروەها گەمارۆدانی حکومەتی هەرێم لەلایەن وڵاتانی دراوسێوە، یەکێکی ترە لەفاکتەرەکانی پێشنەکەوتنی حکومەتی هەرێمی کوردستان، بەڵام سەرەڕای ئەوانەش، لەناوخۆ کەموکوڕی هەیە، هەردوو حیزبەکە خەڵکی لێوەشاوەیان لەشوێنی بەرپرسیارێتی دانەناوە، خەڵکی حیزبییان داناوە، کە لەوانەیە شارەزای لەو شوێنە نەبێت کە لێی دانراوە، ئەوە زیانێکی زۆر گەورەی لەکوردستان داوە، دەکرا زۆر لەوە زیاتر بکرایە کە ئێستا هەیە، ئەگەر خەڵکی لێوەشاوە لەبەرپرسیارێتی دانرابایە، ئەوا دەسکەوتمان زۆر زیاتر دەبوو و پێشکەوتووتر دەبووین.

لڤین: زۆرجار باسی دروستبوونی ئۆپۆزسیۆن دەکرێت، پێتوایە لەکوردستان بۆچی تاوەکو ئێستا ئۆپۆزسیۆن دروستنەبووە؟ ئایا زەمینەکە لەبارنییە، یاخود پارتی و یەکێتی ڕێگرن لە دروستبوونی ئۆپۆزسیۆن، چونکە لەکورسییەکانی خۆیان دەترسن؟

عومەر شێخ موس: ناتوانم بەتەواوی بڵێم کە هۆکارەکانی دروستنەبوونی ئۆپۆزسیۆن لەکوردستان، ئایا ڕێگریی یەکێتی و پارتییە یان نا، بەراستی من پێمخۆشە کە پارتی سێیەم و چوارەم هەبێت لە کوردستان، من ساڵی (١٩٩٣) کە سەردانی کوردستانم کرد لەگەڵ ژمارەیێك ڕۆشنبیری ئێرە دانیشتم و زۆر هانم دان کە پارتی سێیەم دروست بکەن، بەڵام بەداخەوە پێیان نەکرا، هۆی دروستنەبوونی پارتی سێیەم لەکوردستان، بەبۆچوونی من دوو سێ هۆکاری هەیە، یەکێکیان لەوانەیە ئەم دوو حیزبە پێیان ناخۆش بێت کە پارتی سێیەم دروست ببێت و لەکورسییەکانی خۆیان دەترسن، دووەم: حیزبێك دروست ببێت کە بتوانێت ململانێ لەگەڵ پارتی و یەکێتی بکات، دەبێت ئیمکاناتێکی زۆری هەبێت یان هێزێکی جەماوەری زۆری هەبێت.

سێیەم: ئەگەر دیموکراسییەت هەبێت، دەبێت ئەو هێزە دروست ببێت، لە دەرەوە لەسەر ئەم بابەتانە فشار دەخرێتە سەر سیستەمی سیاسیی کوردستان و ڕەخنەی لێدەگیرێت، بۆنموونە: ئەو ڕاپۆرتانەی ساڵانە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بڵاویاندەکاتەوە و باس لەو مەسەلانە دەکات، هەروەها بەرپرسانی یەکێتی ئەوروپا

بەردەوامی چاودێری ڕەوشی کوردستان دەکەن، هەروەها مەسەلەی پێشێلکارییەکانی مافەکانی مرۆڤ کە ساڵانە ئەمنستی و هیومان رایتس وۆچ باسی لێوە دەکەن، بۆیە پێویستە رایگشتی جیهانی بۆ خۆمان رابکێشین، رایگشتی کەئێستا لەگەڵ ئێمەیە، بەهۆی ئەو عەلمانیەتەی کە هەیە. پێویستە ڕێز لەمافەکانی مرۆڤ و بیروڕادەربڕین و ڕۆژنامەگەری و ڕاگەیاندن بگرین، ئەگەر هاتوو ڕێ لەمانە نەگیرا، ئەوا کاریگەری لەسەر ناوبانگی کوردستان دەبێت.

لڤین: پێتوایە لەکوردستان زەمینەسازی بۆ دروستبوونی ئۆپۆزسیۆن هەیە؟

عومەر شێخ موس: بەڵێ ڕەوشی مەوزوعی لەبارە، ئەوە سروشتی هەر حکومەتێکە لەدونیادا کە خەڵکی لێی نارازییە، ئەگەر هەر حکومەتێك داخوازییەکانی خەڵك جێبەجێنەکات، ئەوا خەڵك لێی نارازییە. لەهەڵبژاردنی ئایندەدا بەدیاردەکەوێت کە ئایا خەڵك دەنگ بەمانە دەدات یان نا، بەبۆچوونی من ئێستا لەکوردستان زەمینەیەکی زۆر خۆش هەیە بۆ دروستبوونی ئۆپۆزسیۆن. ئەو حیزبانەی کەئێستا لەسەر ساحەکەن، هیچکامیان ناتوانن ئەو ڕۆڵە ببینن و ببن بە ئۆپۆزسیۆن، زەحمەتکێشان و حیزبی شیوعی و سۆسیالیست و ئیسلامییەکان، هەریەکێکیان هەوڵدەدات یان یەکێتی یان پارتی رازی بکات بۆ ئەوەی کە بەشداربێت لە دەسکەوتەکان، من بەئۆپۆزسیۆنی ڕاستەقینەیان نازانم، بەڵام دوور نییە لەئێستاوە تاوەکو هەڵبژاردنی ئایندە ئۆپۆزسیۆن دروست ببێت.

لڤین: سەبارەت بە پەیوەندی نێوان بەغدا و هەولێر، ئایا پێتوایە کە دەسەڵاتدارانی هەولێر مامەڵەیەکی دروستیان لەگەڵ دەسەڵاتدارانی بەغدا کردووە، بەتایبەت کە دەبینین کۆمەڵێك کێشە هەیە، چەندین ساڵە نەتوانراوە لەگەڵ بەغدا یەکلاییکرێتەوە، وەك مادەی ١٤٠ و کێشەی گرێبەستەکانی نەوت و چەندانی دیکە؟

عومەر شێخ موس: یەکێك لەو هۆیانەی کە زۆر کێشە یەکلایی نەبووەتەوە، ئەوەیە کە سەرکردەکان زۆر پشوو کورتن و لەبەغدا نامێننەوە، گفتوگۆکان بەدووروودرێژی

[illegible] ئەلفبایەکی گفتوگۆ ئەوەیە کە دەبێت لە گفتوگۆدا تۆ بەرامبەرەکەت ئەوەندە ماندوو بکەیت، ئەوەندە لەسەرخۆ بیت و لەسەر داواکانت سووربیت، بۆئەوەی هەموو داخوازییەکانت قبوڵ بکات، دەسەڵاتدارانی کورد زۆر پشوو کورتن. ئێمە وەکو کورد بەگشتی سیاسەتمەدارانمان وا مامەڵە دەکەن کە مامەڵەی تاکە کەسی بێت، بۆ نموونە: جوامێری دەکەین و تەنازولی زۆر دەکەین، بەڵام لەمەسەلە نەتەوەییەکان نابێت وا رەفتار بکەیت، سیاسەت بەرژەوەندییە، دەبێت شت وەربگریت و بیدەیت، چونکە مەسەلەکە بەرژەوەندییە. نابێت لەبەرژەوەندییە بنەڕەتییەکانی خۆت بێیتەخوارەوە، شتێکی دیکە هەیە کە رێککەوتنەکانمان بەنووسین نەبووە، بەشێکی زۆری رێککەوتنەکان تەنیا زارەکی بووە، بۆیە تەفسیری زۆر بۆ دەکرێت. لەرۆژی یەکەمەوە دەبوایە شتەکان یەکلایی بکرابانایەوە، دەشتوانرا وا بکرابا، ئێستاش ئێمە لەبەرامبەر عێراقدا لەبەهێزترین کاتین، چونکە هەموو لایەنەکانی دیکە لەلایەنی کوردی بێهێزترن، مەسەلەیەکی دیکە ئەوەیە کە نابێت کورد ئەوەندە فشار لەئەمریکا قبوڵبکات، ئەمریکا فشاری خۆی دەکات، کەیفی خۆیەتی، بەڵام نابێت ١٠٠٪ فشارەکانی قبوڵبکرێن. بەبۆچوونی من، سەرکردایەتیی کوردستان هەڵەیەکی گەورەیان کردووە، ئەویش ئەوەیە کەجەماوەری خۆیان نەخستووەتەگەڕ.

لڤین: بۆچوونێك هەیە کەهەندێك چاودێری سیاسی پێیانوایە بەهێزبوونی بەغدا، یەکسانە بەلاوازبوونی حکومەتی هەرێم، بۆچوونی ئێوە لەوبارەیەوە چییە؟

عومەر شێخ موس: نەخێر، مەرج نییە ئەوە وابێت، دوور نیە کە حکومەتی ناوەندی ئەو خواستەی هەبێت، وەك جەعفەری هەوڵی دا، وەك مالیکی هەوڵی بۆ دەدا، بەڵام دەستور خاوەن دەسەڵاتە، ئەگەر دەستور چوارچێوەیەکی رێکوپێك بێت بۆ حوکم، بەهێزبوونی حکومەتی فیدراڵ نابێت لەسەر حسابی حکومەتی هەرێم بێت، یان بەهێزبوونی حکومەتی هەرێم نابێت لەسەر بێهێزبوونی حکومەتی فیدراڵ بێت.

لڤین: پێتوانییە حیزبە کوردییەکان مامەڵەیەکی ناچوونیەك و ناجۆر لەگەڵ حیزبە

عەرەبی و شیعەکانی عێراق دەکەن، جەوهەر نامیق پێیوایە حیزبە کوردییەکان [illegible]، ڕێککەوتننامەی دوو قۆڵی و سێ قۆڵی و چوارقۆڵی دەکەن لەعێراق، بۆچوونی ئێوە چییە لەوبارەوە؟

عومەر شێخ موس: بەڵێ ئەم بۆچوونە وایە، دەبینین یەکێتی و پارتی و هەندێك حیزبی تر هاوپەیمانێتی کوردستانیان هەیە. دەبێت لەسەر بەرنامەیەك ڕێکبکەون کە بەرنامەیەکی ڕوون و ئاشکرایان هەبێت و بەو بەرنامەیە بچنە ناو گفتوگۆکانەوە. ئەو حاڵەتەی کەئێستا هەیە، لەئەنجامی ئەوەیە کە هەڵوێستێکی یەکگرتوو و بەرنامەیەکی یەکگرتوویان نییە.

لڤین: نەبوونی ئەم هەڵوێستە یەکگرتووە، ڕەنگدانەوەی ئەو ململانێیە حیزبییە نییە کە لە کوردستان هەیە؟

عومەر شێخ موس: بەڵێ وایە، تا ڕادەیەك وایە، بەڵام هۆکارێکی دیکە ئەوەیە کە دەبینین عەرەبەکان بەشی هەرە زۆریان حیزبی ناسیۆنالیستی عەرەبین، بەشێکی کەمیان عەلمانی دیموکراتین، شیعەکان ئیسلامیی سیاسین و لەفیکریاندا نییە کە دان بە مافەکانی کورددا بنێن.

پرۆفایلی عومەر شێخ موس

لە ساڵی (١٩٤٢) لە شاری (عامودا) ی کوردستانی سوریا لەدایك بووە.

یەکێکە لەدامەزرێنەرانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان لە ساڵی (١٩٨٦) لە یەکێتی ئیستیقالەی داوە.

دەرچووی کۆلێژی زانستی سیاسی و پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانە لە زانکۆی لەندەن.

لە (١٩٧٣) تا (٢٠٠١) مامۆستا و لێکۆڵەری سیاسی بووە لە زانکۆی ستۆکهۆڵم.

بەرپرسی پێشووی بەشی کوردیی دەنگی ئەمریکا بووە و ئێستا لە وڵاتی سوید نیشتەجێیە.

**هەندێك لەسەركردەكانی یەكێتی لەسەر تەكەتول راهاتوون و ناتوانن دەستبەرداری بن، چونكە بەرژەوەندییان دەكەوێتە مەترسییەوە.**

**عومەر شێخ موس، ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری یەكێتی باس لە یەكێتی دوای پلینیۆم دەكات**

**عومەر شێخ موس ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری یەكێتی نیشتیمانی كوردستان رەخنە لە تاڵەبانی دەگرێت و دەڵێت "پێمخۆش نەبوو مام جەلال لە پلینیۆمدا باسی كاك نەوشیروانی كرد." هەروەها دەڵێت " نەدەبوو بەهیچ شێوەیەك مام جەلال ئەوەندە تەكیز بخاتە سەر كاك نەوشیروان."**

لڤین: گفتوگۆی ئیبراهیم عەلی–هەولێر

شێخ موس بڕوای خۆی دەخاتەڕوو سەبارەت بە نەمانی تەكەتول لەناو یەكێتیدا بەهۆی پەیمانی ئاكارەوە و ئاماژە بەوە دەكات هەندێك سەركردەكانی یەكێتی لەسەر تەكەتول راهاتوون و ئەستەمە بەئاسانی بتوانن وازی لێبهێنن، چونكە وەكو ئەو وتی "مانەوەیان بەندە بەتەكەتولەوە."

د.عومەر شێخ موس هەرچەندە بە فیعلی لەمەكتەبی سیاسیی یەكێتی نییە، بەڵام هەمیشە لەیەكێتیدا وەكو خاوەن ماڵ حسێبكراوە و وەكو ئەندامێكی مەكتەبی سیاسیی فەخری حسێبكراوە، شێخ موس بەوە دەناسرێت لە كێشە ناوخۆییەكانی ئەمدواییەی یەكێتیدا هەڵوێستی مامناوەندی گرت و هەوڵی میانگیریشی لەنێوان نەوشیروان مستەفا و مام جەلالدا، بەڵام سەركەوتوو نەبوو.

لڤین: لەماوەی رابردوودا یەكێتی نیشتیمانی كوردستان بەئامانجی چارەسەركردنی كێشە ناوخۆیەكانی پلینیۆمی بەست، بەبۆچوونی بەڕێزتان كێشەكان ئەوەندە ئاسانن كە بتوانرێت بەبەستنی پلینیۆم چارەسەر بن؟

عومەر شێخ موس: بێگومان نەخێر، پلینیۆم تەنیا هەنگاوێك بوو بە ئاراستەی چارەسەری كێشەكان، هەروەها پلینیۆم ئامادەكاری بوو بۆ كۆنگرە، چونكە بەشی

هەمووی کێشەکان لە کۆنگرەدا دەتوانرێت چارەسەری ریشەییان بۆ بدۆزرێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا چەند بڕیارێکی باش لە پلینیۆمدا دران، یەکێکیان دامەزراندنی کۆمیسیۆنێکی نەزاهە لەلایەن پێنج پارێزەرەوە بۆ لێکۆڵینەوە لەسەروەت و سامانی بەرپرسانی یەکێتی، بڕیاری ئەوە وەرگیرا لە مانگی نیسان یان ئایاری ساڵی داهاتوو کۆنگرە ببەسرێت، ئەگەر لەو کاتەدا کۆنگرە نەبەسرێت ئەوە سەرکردایەتی شەرعیەتی نامێنێت، ئەوەی کە گرنگ بوو ئەوە بوو کە هەڵوێستێکی نەرمیان وەرگرت بەرامبەر بە جیابووەوەکان، دەرگاشیان دانەخست بەرامبەر ئەوانەی پەشیمان دەبنەوە، تەنیا ئەندامانی مەکتەبی سیاسیی و سەرکردایەتی نەبێت، چونکە گورزێکی کوشندەیان لەیەکێتی نیشتیمانی دا. بەبۆچوونی ئەندامانی مەکتەبی سیاسیی و سەرکردایەتی ئەوانە زیانێکی گەورەیان گەیاندووە بەدەسەڵات و هەیمەنەی یەکێتی لەناوچەی دەسەڵاتی خۆیدا، جیا لەوە بڕیاری دامەزراندنی ئەنجومەنێکی چاودێری درا ، کە ئەمەش دەتوانێ چاودێریکات بەسەر تەواوی کار و چالاکییەکانی یەکێتی لەهەر ئاستێکدا بێت. بەگشتی دەتوانین بڵێین پلینیۆم هەنگاوی باشی نا بۆ دۆزینەوەی چارەسەری باشتر لە کۆنگرەدا.

لڤین: پەیمانی ئاکار بۆ کۆتاییهێنان بەکێشەی تەکەتول یەکێك بوو لە دەرەنجامەکانی پلینیۆم، بەڵام کۆسرەت رەسول لەلێدوانێکی رۆژنامەوانیدا ئەوەی خستەڕوو کە تائێستا هەنگاونەنراوە بۆ کۆتاییهێنان بە تەکەتول، پێتوانییە کە سەرکردەکانی یەکێتی توانای ئەوەیان نەماوە کە پابەندی ئەو بڕیارانە بن کە واژۆیان لەسەر دەکەن؟

عومەر شێخ موس: پەیمانی ئاکار کە راگەیەنراوە هەموو بەشدارانی پلینیۆم دڵیان پێیخۆش بوو، هەروەها بەئومێدی ئەوەبوون کە کۆتای بەکێشەی تەکەتول بێت لەریزکانی یەکێتیدا، سەرکردەکانی یەکێتی نابێ ئەوەیان بیرچێ کە ئەوان بەڵێنی ئەوەیان داوە کە کۆتایی بەتەکەتول بهێنن، بەڵام بەبۆچوونی من ئەو کارە پێویستی بەماوەیەکی زۆر هەیە، دوور نییە هەندێك سەرکردە لەوە راهاتبن کە کار بەتەکەتول بکەن، ئەگەرنا بەرژەوەندییەکانیان دەکەونە مەترسییەوە، بێگومان ئەوانە وا بەئاسانی

دەستەبرداری تەکەتول نابن، ئومێددەکەم بەیەکجاری کۆتای بەتەکەتول بێت. دەبێت سەرکردەکانی یەکێتی ئەوە بزانن کە ئەگەر پابەندی پەیمانی ئاکار نەبن، ئەوە ڕێکخستنەکانی یەکێتی لێیان قبوڵ ناکەن و دوور نییە وەك چۆن لەهەڵبژاردنی پەرلەمانیدا سەرکردەکانی یەکێتی توشی شکست بوون ئاواش لە کۆنگرەدا ڕووبەڕووی هەمان سیناریۆ ببنەوە، هەرکەسێك لەو پەیمانە لابدات لەلایەن ئەنجومەنی چاودێرییەوە سزادەدرێت بەوەی کەنابێت خۆی هەڵبژێرێت لە کۆنگرەدا.

لڤین: لەماوەی ڕابردوودا یەکێك لەو خاڵانەی کە یەکێتی جیادەکردەوە لەهەر هێزێکی دیکە، بوونی بۆچوونی جیاواز بوو، بەڵام لەئێستادا ئەو کادیرانەی کە بەگوێڕایەڵی کارنەکەن و خاوەن بڕیاری خۆیان بن، یان دووردەخرێنەوە لەپۆست، یان پەراوێزدەخرێن. ئەم حاڵەتە چەند لەبەرژەوەندیی یەکێتییە؟

عومەر شێخ موس: ئەوەی ڕوون و ئاشکرایە لای من جیاوازییەکی زۆر هەیە لەنێوان یەکێتی و پارتی لەڕووی لیبراڵیەت و ئازادی کارکردن و ڕێگەدان بەبۆچوونی جیاواز، بەڵام ئەوەی یەکێتی قبوڵی ناکات ئەوەیە کە ناکرێت ڕەوتی ڕێکخراو لەنێویدا دروستببێت، بەڵام پلاتفۆرمی جیاواز قبوڵدەکەن لەنێوان ریزەکانی خۆیاندا. بەشێوەیەکی گشتی یەکێتی خواستێکی بەهێزی هەیە کە ببێت بەحیزبێکی سۆسیال دیموکراتی ڕاستەقینە، ئەگەر بیەوێ ببێت بەحیزبێکی سۆسیال دیموکراتی ڕاستەقینە نابێ لەسەر شێوازی حیزبە ستالینییە تەقلیدییەکان حیزبایەتی بکات و ڕێگە لەبیروڕای جیاواز بگرێت، چونکە ئەو کات تووشی ڕەخنەی توند دەبێتەوە لەلایەن حیزبە سۆسیال دیموکراتەکانەوە و دوورنییە ئەندامێتی خۆی لەدەستبدات، دوورنییە هەندێك کادری سەرکردایەتی هەبن کە لەکەشێکی نادیموکراتیانە پەروەردەکراون و بۆچوونی لینینییان هەبێت بیانەوێ بیروڕای جیاواز نەبێت لەناو یەکێتیدا ، ئەوانە پێویستیان بەکات هەیە کە خۆیان ڕابهێنن لەگەڵ بارودۆخی نوێی یەکێتی.

لڤین: لەساڵانی ڕابوردوودا کادرانی یەکێتی ڕەخنەیان لەپارتی دەگرت و بەوەی

کە هەریەکەیان حیزبی بنەماڵەیە و لەپارتیدا جگە لەبنەماڵەی بارزانی کەسی تر دەسەڵاتی نییە، بەڵام لەئێستادا یەکێتیش لەژێر هەیمەنەی بنەماڵەی تاڵەبانی بەڕێوەدەچێت و تەواوی ئەندامانی خانەوادەی تاڵەبانی پۆستی گرنگیان لەبەردەستە و بڕیاربەدەستی یەکێتین، هەندێك دەڵێن لەم ڕووەوە ئەو جیاوازییە کۆتاییهات کە لەنێوان پارتی و یەکێتیدا هەبوو.

عومەر شێخ موس: یەکێتی هێشتا نەگەیشتووەتە پارتی لەرادەی نفوز و دەسەڵاتی بنەماڵەدا، واهەستدەکەم پارتیش دەیەوێ نفوز و دەسەڵاتی بنەماڵە کەمبکاتەوە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەش نکولی لەوە ناکرێت کەچەند کەسێك لەنێو بنەماڵەی تاڵەبانی هاتوونەتە نێو دەسەڵاتەوە، بەڵام هەندێکیان مافی خۆیانە، چونکە لەناو شۆڕش بوون و کاریان کردووە، تۆ ناتوانی مافی وەرگرتنی پۆست لەوانە وەربگریتەوە تەنیا لەبەرئەوەی ئەندامی خانەوادەی تاڵەبانین، بەڵام ئەگەر کەسێکیش لەبنەماڵەی تاڵەبانی هاتە ناو دەسەڵات کە کارەکانی دیار نەبن و بەمافی خۆی پۆستی حیزبی و حکومی وەرنەگرێت، ئەوە ئەو کات خەڵك مافی خۆیەتی گلیەیی بکات، ئەگەر ئەو کەسانە شیاوی وەرگرتنی پۆست بن با وەریبگرن، چی تێدایە؟ مەترسییەکە لەوەدایە ئەگەر کەسێك پۆست وەربگرێت تەنیا لەبەرئەوەی ئەندامی بنەماڵەی تاڵەبانییە، نەك مافی خۆی بێت.

لڤین: ئەوەی باس دەکرێت لەپلینیۆمی یەکێتیدا جەلال تاڵەبانی ئۆباڵی تەواوی شکستە مێژوویەکانی یەکێتی خستە ئەستۆی نەوشیروان مستەفا، بەڕێزتان لەم بارەوە چی دەڵێیت؟

عومەر شێخ موس: بەراستی من پێمخۆش نەبوو کە مام جەلال لەپلینیۆم ئەم باسانەی کرد، ئەگەر زوش بهاتبایەتەوە کوردستان ئەوە پێشنیاری ئەوە دەکرد کە تاڵەبانی ئەم باسانەی نەورووژاندایە لەسەر کاك نەوشیروان، بەڵام بەداخەوە پێرانەگەیشتم. نەدەبوو بەهیچ شێوەیەك مام جەلال ئەوەندە تەرکیز بخاتە سەر کاك نەوشیروان، چونکە پلینیۆم بۆ پێداچوونەوە بوو بە کارەکانی یەکێتی و هەروەها

خۆئامادەکردن بوو بۆ بەستنی کۆنگرە، نەك ئەو شتانە باس بکرێن. ڕەنگە ئەوە بەرپەرچدانەوەی ڕەخنەی سەرکردەکانی گۆڕان بێت کە بەردەوام ئاڕاستەی سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسیی یەکێتی و مام جەلالی دەکەن. مام جەلالیش ڕەنگە ئازاری زۆری چەشتبێت و موعاناتی زۆری بینیبێ، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوانەش دەکرا لەشوێنێکی دیکە لەکاتێکی دیکە لە ئاستێکی دیکەدا باسی لێوەبکردایە، یان مام جەلال چی هەبووایە لەیاداشتەکانیدا باسی بکردنایە.

لڤین: هۆکاری چییە کە پێتباشنەبوو تاڵەبانی لەو کاتەدا ئەو قسانە بکات؟ لەبەر ئەوە بوو ئەم شتانەی باسیان لێوەدەکات حەقیقەتیان نییە، یان کێشەی سیاسیی نێوان گۆڕان و یەکێتی قوڵتر نەبنەوە؟

عومەر شێخ موس: من بەهۆی ئەوەی ئاگادرای تەواوی مێژووی یەکێتیم پێمباشنەبوو، هەروەها قەناعەتیشم بەو قسانە نەبوو. ڕەنگە هەندێك شتی ڕاست بێت و هەندێکیشی هەڵە ، بەڵام ناکرێت تۆ لەڕاپۆرتی حیزبێکی سیاسیدا باسی ئەو شتانە بکەی، چونکە ئەم شتانە پێویستیان بەسەلماندن هەیە، هەستدەکەم لەئەنجامی ئەو هێرشانەی کە کراونەتە سەری بەپێویستی زانیوە کە وەڵامبداتەوە، بەوردی ناتوانم ڕادەی ڕاستی و ناڕاستی ئەو شتانە باسبکەم.

لڤین: یەکێك لە ئەگەرەکان ئەوەبوو کە لەسەر ئاستێکی سیاسیی نزیکبوونەوە لەنێوان گۆڕان و یەکێتی بێتە ئاراوە، بەڵام لەئێستادا دەوترێ ئەم وتارەی تاڵەبانی کۆتایی بە ئەگەرێکی وا هێنا و بگرە ئەگەری ئەوە هەیە کێشەکان قوڵتربېنەوە، پێتوانییە قسەکانی تاڵەبانی بۆ ئەوە بوون کە پێکەوژیانێکی سیاسیی لەنێوانیان نەیەتە ئاراوە؟

عومەر شێخ موس: ساڵی ڕابردوو من هەوڵێکی زۆرمدا کە نزیکبوونەوە لەنێوان کاك نەوشیروان و مام جەلال بێتەئاراوە، ئەو کات ئەنجامی باشیشی هەبوو، بەڵام دواتر بەهۆی هاتنەپێشی هەڵبژاردنەکانەوە دیارە کاك نەوشیروان ئەوەی بەهەل زانیوە کە هێزە سێیەم لەکوردستان دروستبکات و جیابوونەوە ڕوویدا، بۆیە وەکو

[illegible]ستن هیچ هیوایەك نییە بۆ پێکەوە ژیانی سیاسیی، بەڵام ئەوەی جێگەی [illegible]ۆشییە ئەوەیە کەئێستا تەواوی حیزبە سیاسییەکان گەیشتوونەتە ئەو دەبێت دانیشتن و لێکنزیکبوونەوە هەبێت، ڕاستە ئێستا گۆڕان و بگرە چەند هێزێکی دیکەش بڕیاری ئەوەیانداوە کە بەلیستی جیاواز بڕۆنە هەڵبژاردن بۆ پەرلەمانی عێراق، بەڵام هەموویان بەڵێنی ئەوەیانداوە لە گرفتە نەتەوەییەکان یەك هەڵوێست بن و بتوانن بەهەموویانەوە باشتر مافەکانی کورد مسۆگەر بکەن، ناکرێت لەو جیابوونەوەیەی کە ئێستا هەیە بەچاوێکی دوژمنکارانە لەیەکتر بڕوانن، زۆریش ئاساییە کە کارەکتەری سیاسیی جیاواز لە گۆڕەپانەکەدا بوونی هەبێت، بەڵام گرنگ ئەوەیە لێکتێگەشتن لەنێوانیاندا هەبێت، پێموایە ئەو گرژییەی کەهەبوو لەنێوان هێزەکاندا لەکاتی هەڵمەتی هەڵبژاردن خەریکە کۆتاییپێدێت و ئاڕاستەیەکی سیاسیی دروست دێتە ئاراوە، من بەپێچەوانەی ئەو بۆچوونە بیر دەکەمەوە کە قسەکانی مام جەلال بۆ ئەوە بووبن کە پەیوەندی نێوان گۆڕان و یەکێتی دروست نەبێت، چونکە لەپلینیۆم من سەرۆکی ئەو لیژنەیە بووم کە بزانرێت هەڵوێستی پلینیۆم چی بێت بەرامبەر جیابووەوەکان، توانیم قەناعەت بەو لیژنەیە بێنم کە هەڵوێستی زۆر مەعقول بەرامبەر ئەو کەسانە وەربگرێت، ئەوەی جێگەی دڵخۆشی بوو کە کاك نەوشیروان هیچ کاردانەوەیەکی نیشان نەدا بەرانبەر ئەو قسانە ، هەرچەندە بڕواموایە کەڕۆژێك لەڕۆژان ئەویش قسەی خۆی بکات لەوبارەوە.

لڤین: کۆمەڵێك خەڵك کە لەیەکێتی جیابوونەوە، ئێستا دەبینن دەگەڕێنەوە بۆ ناو ئەو حیزبە، ڕاگەیاندنی یەکێتی بەردەوام جەخت لەوەدەکاتەوە کە ئەوانە پێشتر هەڵخەڵەتێنرابوون و ئیستا پەشیمانبوونەتەوە لەپشتگیری بزوتنەوەی گۆڕان، لەلایەکی ترەوە سەرکردەکانی بزوتنەوە گۆڕان لەڕێگەی پارەوە ئەو کەسانە ئیغراکراون، یان هیچ نەبێت ئەو کەسانە گرفتی ماددیان هەیە بۆیە دەگەڕێنەوە، پێتوایە دەکرێت حیزبێکی سۆسیال دیموکرات پارە بەکاربێنێ بۆ کڕینی خەڵك؟

عومەر شێخ موس: (بەپێکەنینەوە) من بەو حاڵەتە ناڵێم کڕین و بەو کەسانەش ناڵێم

لخەڵەتاو، ئەوانە ژمارەیەك كەسی دڵسۆزی نێو ریزەكانی یەكێتی بوون لەسەردەمی شاخ و شاریش، بۆیە ئەوانە هەڵناخەڵەتێن و بزوتنەوەی گۆڕانیش كار لەسەر هەڵخەڵەتاندی خەڵك ناكات، ئەوانە بەشێوەیەكی ئازادانە و بەخواستی خۆیان بڕیاری ئەوەیاندا كە بچنە ناو بزوتنەوەی گۆڕان و چیتر ناتوانن لەریزەكانی یەكێتیدا كاربكەن، باوەڕ ناكەم ئەوانە لەژێر فشاری ماددیش بگەڕێنەوە ناو یەكێتی، چونكە ئەو حاڵەتەی ئێستا هەیە یەكەمجار نییە ئەو شتە روودبدات لەناو یەكێتیدا.

لڤین: سەركردەكانی گۆڕان بەڵگەی راستی قسەكانیان بەوە دەسەلمێنن كە ئەو هۆكارەی كە ئەو كەسانە لەپێناویدا دەستبەرداری یەكێتی بوون تا ئێستا هیچیان چارەسەر نەكراون، كەواتە ئەوانە لەبەر نەبوونی مووچە گەڕاونەتەوە نێو یەكێتی، نەك لەسەر بنەمای مەبدەئو قەناعەت.

عومەر شێخ موس: مەسەلەی نانبڕین شتێكی خراپە ، بەڵام دەمەوێت ئەوە روون بكەمەوەكە بڕینی مووچەی كارمەندانی حكومەت و ئەو كەسانەی لەكەرتی حكومەتدا كاردەكەن شتێكی خراپە و ئەوە دەسەلمێنێت كە حیزب و حكومەت تێكەڵە، بەڵام كادری حیزبی كە بچێت بۆ حیزبێكی دیكە كاربكات، ئەوە ئەو حیزبە مافی خۆیەتی مووچەكەی ببڕێت، بەڵام لەشەڕی راگەیاندندا بەردەوام ئەو فاكتەرانە بەكاردەهێنرێن كە بۆچوونەكان بەهێزبكات، ئەگەر یەكێتیش فشاری مادی بۆ ئەو كەسانە بەكاربهێنێت، ئەوە كارێكی هەڵەدەكات و دەرەنجامەكەشی زۆر خراپتر دەبێت لەوەی هەیە، بەڵام بەهۆی ئەوەی كە تازە گۆڕان لەیەكێتی جیابووەتەوە، بۆیە برینەكان جارێ نوێن، ئەگەر نا دڵنیام لەداهاتوودا چوارچێوەیەكی زۆرباش دەدۆزرێتەوە بۆ كاركردن.

لڤین: بەشی هەرە زۆری ئەوانەی لە یەكێتی نانبڕاوكراون ئەوانەن لەهێزی پێشمەرگەدان. پێتوانییە بەهۆی ئەوەی كە یەكێتی دەسەڵاتی رەهای هەیە بەسەر پێشمەرگە و بەهیی خۆی دەزانێ، بۆیە وا مامەڵە دەكات؟ بۆیە تا ئێستاش پێشمەرگە وەك میلیشیا سەیر دەكرێت، نەك وەك هێزێكی نیزامی؟

عومەر شێخ موس: لیژنەیەك دروستبووە بۆ ئەوەی کە هێزی پێشمەرگە بکاتە هێزێکی نیزامی و حیزب دەسەڵاتی نەبێت بەسەر پێشمەرگە و بەڵکو پێشمەرگە دەبێت ئەرکەکانی دووربێت لە ئەرکی حیزبی و بەهەموو شێوەیەکیش ڕێکخستنی حیزبی لەناو پێشمەرگەدا دەبێت قەدەغە بێت، حیزبەکانیش دەبێت قەناعەتیان بەوە هەبێت کە نابێ چیتر کاری ڕێکخستن لەناو پێشمەرگەدا بکەن.

لڤین: لەدیمانەیەکی بەرێزتدا لەگەڵ (لڤین) کە ژمارە ٧٨ بڵاوکراوەتەوە وتووتە ئەگەر یەکێتی و پارتی خۆیان نەگۆڕن، ئەوە دەبێت چاوەڕێی ڕاپەڕین بکەن، پێتوایە کە دەرەنجامی هەڵبژاردنەکانی ٢٥ تەمموز ڕاپەڕینێك بوو لەدژی یەکێتی و پارتی؟

عومەر شێخ موس: بەڵێ، دەرەنجامی هەڵبژاردنەکان ڕاپەڕینێکی دیموکراسیانە و سیاسییانە و شارستانیانەی خەڵك بوو دژ بەپارتی و یەکێتی، دڵم بەوە خۆشە کە ئەو ڕاپەڕینە دروستبوو، بەتایبەت کەبەشێوەیەکی مەدەنیانە کارەکان تەواو بوون، ئەوەی زۆر دڵی من خۆش دەکات ئەوە بوو کە دەنگە نارازییەکان بۆ هێزێکی عەلمانی بوون نەك ئیسلامی، چونکە ئەو دەنگانە کە بۆ گۆڕان ڕۆشتن بۆ داهاتووی کوردستان زۆر سودیان هەیە.

لڤین: زۆرجار بەرپرسانی پارتی دەرەنجامی هەڵبژاردنەکان بەشکست دەدەنە قەڵەم بۆ یەکێتی نەك پارتی، بەهۆی ئەوەی گۆڕان لەسنوری ئیدارەی سلێمانی توانی سەرکەوتنی گەورە بەدەستبهێنێت.

عومەر شێخ موس: ئەگەر بەرپرسانی پارتی وابیربکەنەوە، ئەوە خۆیان دەخەڵەتێنن، چونکە ئەو دەنگانەی کە گۆڕان هێناونی ئەوانەن کە بەسیستەمی حوکمڕانی پارتی و یەکێتی ڕازینین، تەنانەت لەدەرەنجامەکانی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتیش بینیمان کە دکتۆر کەمال میراودەلی دەنگێکی زۆر هێناو لەگەڵ کاندیدەکانی دیکە نزکەی لە ٣٠٪ ی دەنگەکانیان هێنا، ئەوەش ئەوە دەگەیەنێت کە خەڵکێکی زۆر هەیە بەسەرۆکایەتیکردنی مەسعود بارزانی ڕازینییە، بەڵام بەبڕوای من پارتیش بۆچوونی گۆڕاوە، ئەوەنییە کە نێچیرڤانی بارزانی ناچارە لەگۆڤاری (لڤین) ەوە ڕایبگەیەنێت

بەخۆی سەرپەرەشتی ریفۆرمی ناو پارتی دەکات؟ لەلایەکی دیکەوە مەسعود بارزانی لەبەردەم یەکێتی ئەورۆپا وتی پێویستە یارمەتیمان بدەن بۆ بەدامەزراوەییکردنی دامودەزگاکانی حکومەتی هەرێم، کەواتە لەرابردوودا گرفت هەبووە و دامودەزگاکان دامەزراوەی نین و پێویستە گۆڕانی ریشەیی بێتە ئاراوە.

لڤین: چاودێران پێیانوایە سیستەمی حیزبی پارتی ریفۆرم قبوڵناکات، چونکە پارتی حیزبێکە زیاتر حیزبی بنەماڵەیە، پێتوایە پرۆژەی ریفۆرم لەناو پارتیدا سەرکەوتن بەدەستبهێنێت؟

عومەر شێخ موس: زۆرم پێخۆشە کە گۆڕان وایکرد یەکێتی بەخۆیدا بچێتەوە و رایبگەیەنێت بەرنامەی ریفۆرم جێبەجێدەکات، هەروەها لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە پارتیش هەمان بۆچوونی بۆ دروستبووە. نارازییەکانی کوردستان لەهەڵبژاردنەکان کارتی سیاسیی خۆیان بەکارهێنا لەدژی پارتی و یەکێتی و ناچاری ئەوەیان کردن کەچیتر بەو سیستەمەی جاران کارنەکەن، ئەگەرنا شکستی گەورەتریش چاوەڕێی پارتی و یەکێتی دەکات. هیوادارم کە پارتی و یەکێتی بەشێوەیەکی جدی کار لەسەر بەرنامەی ریفۆرم بکەن. لەناو ریزەکانی پارتیش خەڵکی رەخنەگر دروستبووە و پارتی تاهەتایە ناتوانێ حیزبی بنەماڵە بێت، بەتایبەت ئەگەر بیەویت لەگۆڕەپانی سیاسیدا بمێنێتەوە.

گۆڤاری لڤین – ژماره ۹۳- ۲۰۰۹/٦/۱۰

**سالار عەزیز ئەندامی ئەنجومەنی کۆمپانیای وشە " پارتی بڕوای بەدیموکراتیەت و دەستاودەستکردنی دەسەلات نییە، ئەوان پێیانوایە لەم وڵاتەدا هەتا هەتایە دەبێت خۆیان حاکم بن، ئیتر مەلیکی یان وەکو ئیمارەتەکانی خەلیج"**

لڤین: دیداری هێمن باقر– سلێمانی

لڤین: بڕیارە لەهەفتەی داهاتوودا هەڵمەتی هەڵبژاردن دەستپێبکات، چاوەڕێدەکەن ململانێی نێوان لایەنەکان لەهەڵمەتی هەڵبژاردندا بگاتە چ ئاستێك؟

سالار عەزیز: ئێمە دەمانەوێت ئەوەی کە لەبەرنامەکەماندا هەیە بلاویبکەینەوە و ئیشی لەسەر بکەین، ئەوەی زیاتر لەبەرنامەی ئێمەدایە پەیوەندی بەسیستەمەوە هەیە، هەروەها پەیوەندی بەدەسەلاتەکانی یاسادانان و جێبەجێکردن و دەستوور و تەنانەت خودی پەرلەمانەوە هەیە. شتی ئەساسی ئێمە مەسەلەی حکومەت و سیستەم و یاسایە، ئەمانەش خواستی کۆمەلانی خەلکی کوردستانە.

ئەوەندەی کە سەرەنجدەدرێ برادەرانی تر شتەکان دەبەنەوە بۆ لایەنی شەخسی، لەجیاتی ئەوەی باسی ئەوە بکەن کە گۆڕان دەکەن و ژیانی خەلك باشتر دەکەن، بیر لەوەدەکەنەوە کە کار لەسەر کەسەکان بکەن. لەماوەی رابردوودا کارەکانی ئەوان بەهەردوو لایەنەوە (یەکێتی و پارتی) لەسەر ئەوە بووە کە لەخودی کاك نەوشیروان بدەن، بەشێوەیەکی ئەساسی ئەوەش لەوەوە سەرچاوەیگرتووە کە ئەوان بڕوایان بەکۆمەلانی خەلك نییە، چونکە ئەوەندەی لەدەسەلاتدابوون کارێکی وایان نەکردووە کە خەلك لەگەلیان بێت، پێیانوایە خەلك ناهۆشیارە. لەوپەڕی غرورەوە سەیری خەلکیان دەکرد، لەوەوە سەیریان دەکرد کە ئەوان بەرپرسن و خەلك عاشقی ئەوانە، وایاندەزانی کەسی یەکەمی حیزبەکان هەرچی بلێن خەلك بەقسەیان دەکات، لەناو یەکێتیدا ئەو لایەنە هەر پشتیان بەسکرتێری گشتی قایم بوو، خۆیان هەرچی هاتن و هەرچی خەریك بوون و هەرچی وتیان کەس گوێی لێنەگرتن، ئەوان پشتیان بەوە قایم بوو کە سکرتێری یەکێتی دەتوانێت هەموو شتەکان راستبکاتەوە،

وادەزانن ئەو هەر قسەیەکی کرد خەڵك چەپڵەی بۆ لێدەدات و دەڵێن قوربان تۆ چی دەفەرمووی ئێمە وادەکەین، بەڵام وردەوردە دەرکەوت وانییە. بەپێچەوانەوە ئەمە بزوتنەوەیەکی گەورەیە، دەستیپێکردووە و ناڕەزاییەکی زۆری خەڵك هەیە، لەهەندێك شوێندا گەیشتووەتە رق لەو دەسەڵات و سیستەمە و حەزدەکات بیگۆڕێت و لەبەرچاوی نەمێنێت، لەوەشدا زۆر ناشارەزان و تێناگەن کە مەسەلەی ناڕەزای کۆمەڵانی خەڵکە و خەڵك گۆڕانی دەوێت. ئەوان شتەکان هەموو لە کاك نەوشیرواندا کورتدەکەنەوە، وادەزانن گەر هەندێك بوختان و قسەی ناڕەوایان دەرهەق کاك نەوشیروان کرد، ئیتر بزوتنەوەکە دەشکێت. ئەوانە زۆر بەهەڵەدا چوون، گریمان گەر کاك نەوشیروان هەڵەیەکی زۆر زۆر گەورەی کردبێت لەژیانی خۆیدا، من پێموایە بۆ ئەم کارە خەڵك هەر قبوڵیەتی. ئەوان تەنیا دەیانەوێت کاك نەوشیروان بشکێنن، بەهەر رێگایەك بێت، بەڵام پێموایە لەمەشدا شکستدەهێنن.

لڤین: لەماوەری رابردوودا لیستی گۆڕان رەخنەی راستەوخۆی لە حکومەت و پرۆژەکانی و لە سیستەمی سیاسی هەرێم گرتووە، بەڵام لەبەرانبەردا یەکێتی و پارتی کاریان لەسەر مێژووی کاك نەوشیروان کرد، بەڕای تۆ هۆکاری ئەوە چی بوو کە ئەوان کاریان لەسەر مێژوو کرد؟

سالار عەزیز: ئەوانە لەنەزانییەوە ئەو کارە دەکەن. مێژووی کاك نەوشیروان مێژووی یەکێتی نیشتیمانییە، مێژووە لەگەڵ سکرتێری گشتیدا، کەسمان بەبێ یەکتر بەجیا کارماننەکردووە، هەر کارێکمان کردبێت مام جەلال لێی بەرپرسە، ئەو کەسی یەکەم بووە و لەهەموو شتەکان ئاگادارە و بەبێ ئەو هیچ شتێك نەکراوە. لەبەرئەوە مەگەر بڕۆن درۆ بۆ کاك نەوشیروان هەڵببەسن و بوختانی بۆ بکەن. من پێموایە کاك نەوشیروان هەرچی کردبێت مام جەلال لەگەڵیدا هاوڕابووە، چونکە رۆژێك نەماندی مام جەلال لەسەر کارەکانی رەخنەی لێگرتبێت، یان گەشتبێتە حاڵەتی دابڕان. هەموومان پێکەوە لەمێژووی یەکێتیدا بەهەموو لایەنەکانییەوە بەرپرسین.

لڤین: راگەیاندنی پارتی و یەکێتی رەخنەی ئەوەدەگرن گەر سەرکردەیەك لەژیانی

خۆی [illegible]ندوتیژ بوو بێت، چۆن دەتوانێت ڕێبەرایەتی بزوتنەوەی گۆڕان بکات؟ بۆچی تو[illegible]ی لەمێژووی یەکێتیدا دەدرێتەپاڵ ئێوە و نەوشیروان مستەفا؟



سالار عەزیز:  ئەوەی توندوتیژی ڕوویدابێت کەمتر لای ئێمە ڕوویداوە، گەر بەراوردی بکەی بەلایەنەکەی تر کە پارتییە، گەر مێژووی ئەو حیزبە هەڵبدەینەوە لە کۆنەوە تاوەکو ئێستا هەر باسی نەکەین باشە.

سەبارەت بەمێژوو، ئێمە لەرابردوودا بڕوامان بە ئایدۆلۆژیا هەبووە، بڕوامان بەدیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا هەبووە، جا بیهێنە بەرچاوی خۆت ئەوانە لەیەکێتی سۆڤیەت و چین کران، گەر دەسەلاتمان هەبوایە هەر وامانده‌کرد، ئێمە کوشتەی دەستی ئایدۆلۆژیابووین و گەر کوشتەی توندوتیژیش بووین، ئایدۆلۆژیا فێریکردووین، هەر بەراستمان زانیوە لەو کاتەدا، ئێمە کە هاتین ئایدۆلۆژیای چەپمان تێکەڵکرد لەگەڵ مەسەلەی نەتەوایەتی کورد، ئامانجمان ئەوەبوو کە مەسەلەی کورد چارەسەربکرێت، بڕوامان بەوەهەبوو حیزبی پێشڕەو دابمەزرێنین، ئەمەش عەیبی ئێمە نەبووە وەکو تاك، ئایدۆلۆژیاکە وا فێریکردبووین.

لڤین:  کەواتە دەتەوێت بڵێیت ئەم ڕەوتەی ئێستا جیاوازە لەو ڕەوتە مێژووییە لەڕووی ئایدۆلۆژییەوە؟

سالار عەزیز:  ئەم ڕەوتە ئێستا جیاوازە لەوەی ڕابردوو، بەپێی ئەو گۆڕانکارییەی لەدنیادا ڕوویداوە، ئێمەش گۆڕاوین، یەکێتی سۆڤیەت دەسپێکی ئەم گۆڕانە بوو، بێگومان ئەو گۆڕانکاریانەی دنیا کاریگەرییان کردووەتەسەرمان، ئێمەی وا لێکردووە لەباتی ئەوەی حیزبێکی چەپ بین، ببین بە سۆسیال دیموکرات. یان هێزێکی لیبراڵ.

باشە لەوانەیە ئێستاش خەڵك هەبێت لەناو ئێمەدا سۆسیال دیموکراتیشی قبوڵ نەبێت، بۆیە ئێمە لەرابردوودا هەرچیمان کردبێت، ئێستا بڕوامان بەو شتانە نەماوە، ئێمە چاومان لە گۆڕانکارییە، چاومان لەوەیە ئەم دەسەلاتی دەسەلاتی خەڵك بێت.

ئێستا ئێمە باس لەدەستوور و دیموکراسییەت دەکەین، باس لەعەدالەت و

شەفافییەت دەکەین، ئەمە بەشێکە لەمەسەلە نەتەوایەتی و نیشتیمانییەکەی ئێمە کە سەنتراڵییەت، جاران ڕەنگە باوەڕمان بەدیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا هەبوبێت بۆ دروستکردنی کۆمەڵگای سۆسیالیزم، بەڵام ئێستا قەناعەتمان گۆڕاوە و باوەڕمان بەدیموکراسی هەیە، چونکە تێگەیشتین ئەوە بۆچوونێکی دروست نییە، ئەوە ئەزموونی دنیا دەریخست کە ڕێگایەکی ناڕاستە، ئێستا ئێمە بەم ڕێگە ڕاستەدا دەڕۆین، بۆ هێنانەدی دادپەروەری و یەکسانی و دیموکراتییەت لەوڵاتدا.

لڤین: لەم هەڵمەتی ڕاگەیاندنەدا کە قسەکردن بوو لەسەر مێژووی یەکێتی، هەست بەوەدەکرا کە ڕاگەیاندنی پارتی دەیەوێت بێتە ناو ئەم بابەتەوە لەڕێگەی قسەکردن لەسەر مێژووی یەکێتی و مێژووی نەوشیروان مستەفا، ئایا ئەم هاتنەناوەوەی ڕاگەیاندنی پارتی بۆ قسەکردن لەسەر کاك نەوشیروان پەیوەندی بەچییەوە هەیە؟

سالار عەزیز: من پێموایە ئەوان زۆر ساکارانە و نەزانانە داخڵی ئەم بابەتە بوون، ئەوان پێیانوایە ئەم بابەتە لەخودی کاك نەوشیرواندا کورتبووەتەوە، کە وا نییە. لەڕاستیدا ئەمە بزوتنەوەیەکی نارەزایی بەهێزە، کە دژی دەسەڵات دەستپێکردووە، ئەگەر هەر کەسێکی تر بهاتایە سەرکردایەتی ئەم جوڵانەوەی بکردایە، ئەوان بەردەوام دەبوون لەدژایەتیکردنی، بەڵام لایەنی بەهێزی کاك نەوشیروان ئەوەیە کەپیاوێکی پاکە، لایەنی بەهێزی ئەوەیە کە ئەم پیاوە ماندووە پیاوێکی ڕۆشنبیرە، لەناو بزوتنەوەی کوردایەتیدا بووە، بەردەوام یەکێك بووە لەسەرکردەکانی، پیاوێکە دەتوانێت سەرکردایەتی بکات، ئەمە لایەنە ئیجابییەکانییەتی، کەخەڵك دەتوانێت سودی لێوەربگرێت بۆ خۆی، بەڵام ئەو لایەنانەی تر پێیانوایە کاك نەوشیروان دروستکەری ئەم نارەزایەتییەیە کە لەخوارەوە دەستپێکردووە، نەخێر، ئەو نارەزاییە خۆی دروستبووە و خۆی هەیە، هەر ئەوەندەی دەوێت بیجوڵێنیت و ڕێکیبخەیت، ئەم شتانە خۆیان هەبوون، بەڵام ئێمە توانیومانە بزوتنەوەیەکی باشی لێدروستبکەین، بۆ ئەوەی خەڵك هەست بەوە بکات هێزێك لەپشتیەوەیەتی، تۆزێك ترس و لەرزی

[illegible]ێنە دەرەوە، ئێمە تەنیا ئەوەمان پێبڕاوە. پارتی پێیانوایە ئەگەر بێت و ئەوان [illegible] کاک نەوشیروان بکەن، بەتایبەتی بەرپرسی ڕاگەیاندنیان کە بەخراپی و ناشیرینی دەستیپێکرد. هەموو ئەندامێکی یەکێتی دەزانێت هەرکاتێك ئەندامێکی پارتی قسە لەسەر مێژووی یەکێتی دەکات، مانای ئەوەیە دەیەوێت لەیەکێتی بدات، چونکە پارتی دەیەوێت هەرچی حیزبێك هەیە لە کوردستان بیشکێنێت، هەموومان دەزانین کە پارتی بڕوای بەدیموکراتییەت و دەستاودەستکردنی دەسەڵات نییە، ئەوان پێیان وایە لەم وڵاتادا تاهەتایە دەبێت خۆیان حاکم بن و حوکمڕان بن، ئیتر مەلیکی بێت یان وەکو ئیمارەتەکانی خەلیج بێت، بەهەر شێوەیەك بێت دەبێت ئەوان حوکمڕان بن لەم وڵاتەدا. لەبەرئەوە ئەوان کەدێن لەمێژووی یەکێتی دەدەن و خەڵکی ناو یەکێتیش دێن لەمێژووی یەکێتی دەدەن، ئەمە پشتیوانییەکی گەورەیە لەپارتی، پارتی ئەوەی دەیەوێت مێژووی خۆی چاکبکات و بڵێت هەرچی من کردوومە بەرامبەر یەکێتی نیشتیمانی من ڕاستمکردووە، ئەوەنییە برادەرانی خۆشیان دەیڵێن و پشتیوانی ئێمە دەکەن.

لەم هەڵمەتەدا ئەوان دەیانەوێت مێژووی یەکێتی لەکاك نەوشیرواندا کۆبکەنەوە، لەکاتێکدا مێژووی یەکێتی لەکۆمەڵەوە دەستپێدەکات، بەکاك شەهاب و کاك ئارامیشەوە، بەهەموو ئەو برادەر و هەزاران شەهیدەوە، بەو هەموو خەڵکانەی تا دەگاتە کاك نەوشیروان و خودی سکرتێری یەکێتیش، ئەمانە هەموو مێژووی یەکێتین. لەبەرئەوە لێدان لەکاك نەوشیروان لێدانە لە مێژووی یەکێتی، بەپێچەوانەشەوە لێدان لەوان لەلایەن ئێمەوە و جیاکردنەوەی ئەو لەمێژووی یەکێتی دیسان لێدانە لەیەکێتی، پارتی بەمەبەست وادەکەن، وەکو بڵێی هەلێکیان بۆ هەڵکەوتووە کە مێژووی یەکێتی بشێوێنن بەهۆی هێرشکردنە سەر کەسەکانەوە.

لڤین: واتە تۆ وادەبینیت پارتی ئەم جیاوازی و ناکۆکییەی ناو یەکێتی قۆستووەتەوە بۆ هێرشکردنە سەر یەکێتی؟

سالار عەزیز: بەتەئکید پارتی قازانجێکی زۆر زۆری کردووە، ئەو برادەرانەی

لایەنەکانی دیکەی یەکێتی، بەبێئاگا و بەبێ ئەوەی تەسەوری داهاتوو بکەن، بەتایبەتی کەسی یەکەمی یەکێتی کە هەمیشە تەنیا حسێب بۆ ئەو ڕۆژە دەکات کەتێیدا دەژی، قەت حسێبی ئایندەی نەکردووە، ئێستا ئێمە دوژمنین لای ئەوان، نایانەوێت لەسبەینێ تێبگەن، بیر لەوە ناکەنەوە کە سبەینێ ڕێککەوتنەکەی نێوان یەکێتی و پارتی چیی بەسەردێت، ئەگەر خوانەخواستە لیستی کوردستانی سبەینێ بردیانەوە، پارتی دەبێتە هێزی یەکەم، بەڵام یەکێتی دەبێتە هێزی سێیەم و چوارەم، یەکێتی لەم هەڵبژاردنەدا بەشێوەیەکی زۆر خوار و خێچ ڕەفتار دەکات و هەمووشتێکی چڕکردووەتەوە لەو هاوپەیمانێتییەی لەگەڵ پارتی هەیەتی، ئێستاش کە قسەدەکەن لەپێشدا باسی پارتی دەکەن، پاشان باسی خۆیان دەکەن، ئەو کاتە بابزانین ئایندە چی دەبێت؟ هەرچەندە ئایندە زۆر زۆر ڕوونە.

لڤین: بەڵام هەندێك لەبەرپرسانی یەکێتی ئاماژە بەوەدەکەن کە پارتی هاوکاریکردوون لەوەی قبوڵی هاوپەیمانی لەگەڵ یەکێتی کردووە؟

سالار عەزیز: پارتی هیچ زیانێك ناکات. هاوپەیمانیەتییەکەیان کامەیە؟ وەرە سەیریبکە. سەرۆکی هەرێم پارتییە، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران پارتییە، ئەوەی دەڵێت وانییە ڕاستناکات.

لڤین: چ بەڵگەیەك هەیە کە سەرۆکی حکومەت دەدرێتەوە بەپارتی؟

سالار عەزیز: بەڕای من وایە، ئەوان هەتا ئێوار بڵێن وانییە، من دەڵێم وایە، هەموو وەزارەتە گرنگەکانیش لای پارتی دەبن، هەتا ئەگەر واش نەبێت پارتی هێزێکە ئیلتیزام بە هاوپەیمانیەتیەوە ناکات، پارتی چی لەبەرژەوەندی خۆی بێت ئەوە دەکات، پارتی لەپرۆسەیەکی زۆر قورسدایە، بیر لەوەدەکاتەوە سەردەکەوێت یان نا؟ بیر لەوەناکاتەوە سەردەکەون یان سەرناکەون؟

لڤین: بەبڕوای تۆ ئەنجام چۆن دەبێت؟ پارتی سەردەکەوێت و خەونەکانی دەچنێتەوە یان نا؟

سالار عەزیز: من پێموایە ئەگەر هەڵبژاردنێکی شەفاف هەبێت و ئەوانە مەجالی

[illegible] نەبێت، هیچیان نایەنەوە و زۆرینە نابن لەپەرلەمان، ئەوکات دەبێت ئەمری واقیع قبوڵبکەن، هەرچەندە هەندێك دەڵێن ئەمری واقیع قبوڵناکەن، واتە چی دەکەن؟ شەڕدەکەن؟ شەڕدەکەن بەرانبەر بەو هەموو خەڵکە دەنگیان نەداوە بەوان؟ شەڕدەکەن کە ئەوان بەشێکن لەعێراق و پارە لەعێراق وەردەگرن؟ شەڕدەکەن لەکاتێکدا ئەمەریکا لەسەر ساحەکەیە؟
ئەمڕۆ ئەو پێشمەرگەیەی کە هەیە وەکو جاران نییە کە ئەمریان پێکردن پەلاماری لیستی گۆڕان بدەن، پێشمەرگە شەڕی ئەوان ناکات، پێشمەرگە چاوی لەوەیە کێ مووچەی دەداتێ، سبەینێ حکومەتی عێراق و هەتا ئەمەریکا لەسەر زاری بەرپرسەکانیانەوە دەڵێن " ئێمە پشتگیری ئەو لایەنە دەکەین کە دەیباتەوە". خۆ قابیلە ئەمانە یاخی دەبن و دەچنە ئەو شاخ و کێوە؟
لڤین: ئەگەر لەبانگەشەی هەڵبژاردندا بەشێك لەشەڕەکان ببنە شەڕی مێژوو، ئێوە لەو شەڕەدا براوە دەبن یان دۆڕاو؟
سالار عەزیز: ئێمە خۆمان بەدۆڕاو نازانین، ئەو مێژووە چییە؟ لەکاتێکدا ئێمە کەسی یەکەمیش نەبووین لەو حیزبەدا، بۆ ئێمە بگرێتەوە؟ من پێموایە ئەو مێژووە بەپلەی یەکەم کەسی یەکەمی حیزب دەگرێتەوە، پاشان دەپەڕێتەوە بۆ ئەوانی تر.
لڤین: بۆ نموونە یەکێك لەو مەلەفانەی لەم چوارچێوەیەدا ئاماژەی پێدەکرێت ئەو کوشتنە ناوخۆی و ئیغتیالاتانەیە کە لەشارەکاندا روویانداوە لەسەر دەستی شۆڕش، بۆچی لەناو شۆڕشدا ئێوە بەم مەلەفانە تۆمەتبار دەکرێن و پەنجە بۆ ئێوە رادەکێشرێت؟
سالار عەزیز: من بەر لەهەموو شتێك دەڵێم گەر ئیغتیالات لەسلێمانی کرابێت، رەنگە خەڵکی بێتاوانیش کوژرابێت، جاری یەکەم من نەمبیستووە هیچی بەئیمزای کاك نەوشیروان بووبێت، هەرچییەکیش کرابێت سکرتێری گشتی لێی بەرپرسە، کەسیشمان نەمانبینی سکرتێری گشتی رۆژێك لەرۆژان بڵێت بۆچی وادەکەن؟
لڤین: پەیوەند لەگەڵ ئەم مەلەفە، باسی کوشتنی یەکێك لەکادیرەکانی ناو شار

[illegible]كرێت بەناوی (وریا) وە، كە لەكاتی خۆیدا دەنگۆیەكی زۆری نایەوە، دواتر [illegible]ی ساڵی ١٩٩٤ لەبەیاننامەی مەكتەبی سیاسی پەشیمانبوونەوە خۆی راگەیاند لە كوشتنی وریا؟

سالار عەزیز: باشە با وادابنێین، ئەمە هەڵەیەكی گەورەیە، ئایا ئەم هەڵەیە یەكێك دەكاتە تاوانبار لەكاتێكدا سكرتێری گشتی خۆی كەسی یەكەمی یەكێتی بووە؟ وەكو وتم لەبەرئەوەی سكرتێری گشتی خۆی كەسی یەكەمی حیزب بووە، مام جەلال خۆی بەدەرەجەی یەك لێپرسراوە.

ئەمە تاوانێكە لەناو هەموو ئەو تاوان و شەڕی ناوخۆ و كوشتن و برین و هێنانی دەوڵەتانەی كە كراوە، ئەمە دڵۆپێكە لەدەریایەك، من تێدەگەم لەهەوڵەكانی ئەوان، تێدەگەم لەوەی هەندێك خەڵك لەناو یەكێتیدا لەم وەتەرە دەدەن. من پێموایە ئەمانە هیچی برناكەن، ئەمانە دڵۆپێكن لەدەریایەك، ئێمە باسی ئێستا و ئایندە دەكەین، با ئەو برادەرانەی ناو یەكێتی یان هەركەسێكی دیكە بابێن باسی ئایندە بكەن.

لڤین: ئایا ئەوانەی كە ئەم بابەتە دەورووژێنن مێژووی خۆیان خاڵییە لەم كارانە؟

سالار عەزیز: نەخێر، ئەوەی كە باسی ئەوە دەكات و زیاتر ئەو شتانە بلاودەكاتەوە، ئەگەر ئێمە بێین باسیان بكەین شتی وایانكردووە كەس نەیكردووە، ئێستا خۆش نییە ئێمە باسی بكەین، بۆنموونە خەڵك بهێنیت و دەعوەتی بكەیت و بیكوژیت، كەپیاوی مەرد شتی واناكات.

لڤین: ئەگەر لەبانگەشەی هەڵبژاردندا ئەو شەڕە هاتەكایەوە، ئایا ئێوە وەڵامتان دەبێت؟

سالار عەزیز: نەخێر، ئێمە ناچینە ئەو شەڕانەوە، خەڵكیش خەیاڵیان لای ئەو شتانە نییە، ئەگەر ئەوان پێیانوابێت بەمە شەخسیەتی كاك نەوشیروان یان كەسێكی دیكە كەمدەكەنەوە، من پێموایە شتەكان لەوە تێپەڕیوە، میللەت بڕیاری خۆیداوە، میللەت خەیاڵی لای مێژوو نییە، میللەت حسێبی ئەوەناكات كێ چیی كردووە و كێ چیی نەكردووە، خەڵك چاوی لەوەیە كە بژی، چاوی لەئایندەیە كە لەم

ولاتیش ئازادی هەبێت.

لڤین: بەڵام ئەو یاداشتانەی کاك نەوشیروان بڵاویکردنەوە لەسەر شەڕی ناوخۆ کاریگەری زۆریان هەبوو لەسەر وەستاندنی هەڵمەتی یەکێتی و پارتی؟ هۆکاری چی بوو کە دوای بڵاوکردنەوەی بەشێك لەو یاداشتانە هێرشەکان روویان لە کەمبوونەوە کرد؟

سالار عەزیز: لەبەرئەوەی ئەوان دەیانویست باسی مێژوو بکەن، ئێمەش باسی مێژوو دەکەین، بەڵام ئەوان تێگەیشتن کە ئەمە زەنگێکی مەترسیدارە ، لەبەرئەوە داوایانکرد کە رابگیرێت لە بەرانبەر ئەوەی کە ئەمانیش بێدەنگبن و شتی بێمانا نەڵێن. بڕیارە ئیتر باسکردنی ئەو جۆرە شتانە کۆتایی پێبێت، بەڵام ئێستا ئەوان دەیانەوێت خەڵکی دیکە رابسپێرن ئەو کارەیان بۆ بکات. ئێمە دەزانین ئەوانە کێن، ئەوانە هەندێك کەسن لەناو مەکتەبی سیاسی یەکێتین.

لڤین: چاوەڕێدەکرێت لەدوای هەڵبژاردن کێشە لەنێوان یەکێتی و پارتی دروستببێت، بەتایبەت ئەگەر سەرۆکی حکومەت بدرێتەوە بەپارتی؟ بەبڕوای تۆ رێککەوتنی ئەم دوو هێزە تا کوێ بڕدەکات؟

سالار عەزیز: من پێموایە کێشە دروست دەبێت، بەڵام یەکێتی ئەوەندە بچوکبووەتەوە کە کاریگەری نابێت لەسەر پارتی، بەڵام کە دەرکەوت وانییە کێشە لەناو خۆیاندا دروستدەبێت.

لڤین: دەوترێت بەهۆی ئەم نابەرانبەرییەوە رەنگە بنکەی جەماوەریی یەکێتی دەنگ بە گۆڕان بدات؟

سالار عەزیز: ئێمە وای دەبینین کەخەڵك بەگشتی حەز بەگۆڕان دەکات و مەسەلەی حیزبایەتی زۆر کاڵبووەتەوە لەناو پارتی و یەکێتی و لەناو ئیسلامییەکانیش، بۆیە چاوەڕێدەکەین خەڵکی زۆر هەبێت پشتگیری بەرنامەی گۆڕان بکات.

لڤین: دواین پرسیارمان ئەوەیە، ئایا باڵی ریفۆرم سەبارەت بەئێوە وەك لیستی گۆڕان

...ن تەماشادە کرێت؟

...ڵار عەزیز: ئێمە لەوەتەی بەناوی کۆمپانیای وشەوە کاردەکەین، هەمیشە ویستومانە بەفیکر و بەکردەوەش بەرگی حیزبایەتی و ئینتیما بۆ باڵێك یان تەکەتولێکی ناو یەکێتی لەخۆمان دابماڵین.

هیچ خۆشمان بەدرێژکراوەی ئەوەی پێشوو نازانین.. ئەوەی بەلای ئێمەوە گرنگە ئایندەی ئەم وڵاتە و ئایندەی بەڕێوەبردنی هەرێم ئازادی و دیموکراسی و یەکسانی و خۆشگوزەرانیی خەڵك و دەوڵەتی یاسایە.. ئێستاش ئەم رەوتە ئەم بزوتنەوەیە مۆرکی هیچ لایەن و حیزبێکی پێوەنییە، هی هەموو ئەو کەسانەیە کە گۆڕانیان دەوێت.

رادەی باڵی ریفۆرم کە هاتوون پشتگیری لیستی گۆڕان دەکەن، بەشێکی بچوکی ئەم بزوتنەوە گەورەیەن و سەرتاسەر لەناو ئەم بزوتنەوەیەدا خەڵکانی پارتی و یەکێتی و ئیسلامی و پاسۆك و چەپ و راست هەیە و بەپلەی سەرەکی خەڵکانی بێلایەن و کەزاوەکەشی بەدەیان و سەدان و هەزاران گەنج و خاوەن قەڵەم و نیشتیمانپەروەر رازێنراوەتەوە.

گۆڤاری لڤین – ژماره ٥٨ – نۆڤیمبەری ٢٠٠٧



## سلێمانی شاری بێ حاکم و فەوزا و بەهەدەردانی پارەیە، چی خراپە دەتوانیت بلێیت سلێمانی شاری ئەوەیە

### بەشی یەکەم

دیداری ئەحمەد میرە و هێمن باقر

ئەو کەچووە ریزەکانی شۆڕشەوە زۆر زوو گەیشتە پلەی لێپرسراوێتی. ئەو کاتەش کۆمەڵەی رەنجدەران بووە هێزێکی گەورە، ئەو کەسی دووەم و بەهێزی ناو کۆمەڵە بوو، بەڵام هەرگیز رەوورەوەی مێژوو بەئارەزووی ئەو نەگەڕا و پیلانەکانی دژی و یاخیبوونەکانی خۆی سەرچاوەی ئەوەبوون. ساڵێکی رێك پێش ئێستا پێشنیازمان بۆ کرد لەرێی گۆڤاری (لڤین) ەوە لە مێژوو بدوێت کە تائێستاش گەلێك لەلایەنەکانی شاراوەن و ئەو پەی بەزۆریان دەبات، بەڵام رازی نەبوو، چونکە دەیووت زۆر قسە هەیە ئەگەر بکرێت بارودۆخەکە دەهەژێنێت، تادواجار لەژووری ژمارە ٥ ی بینای سەرەکی کۆمپانیای وشە بەرێز سالار عەزیز- مان دواند. ئەو پێشتر ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان و پارێزگاری سلێمانی بووە، لەکابینەی (کۆسرەت رەسوڵ) دا پۆستی وەزیری کشتوکاڵی وەرگرتووە و ئێستاش وەکو خۆی دەڵێت بەشێکە لە کۆمپانیای (وشە). سەردەمی ئەو (کاتێك پارێزگاری سلێمانی بوو) سەردەمی شەڕ بوو لەگەڵ عەرەبانە نەك لەگەڵ کۆمپانیا و پارەی مۆڵ لەگەڵ ئەوەشدا شانازی بەکارەکانییەوە دەکات لەو ساتەوەختەدا و لەهیچیان پەشیمان نییە، لەگەڵ وتنی یەکەم وشەدا بەدڵێکی پڕەوە قسەدەکات و حەسرەت هەڵدەکێشێت بۆ رابردوو، هەرچەندە باری تەندروستی باش نەبوو، بەڵام لەسەر شاری سلێمانی لەئێستا و رابردوودا بۆ ئێمە دوا. لێرەوە سەرەداوی گێڕانەوەی ژیانی سالار عەزیز دەدەینەدەست خۆی .. " من لەدایکبووی ١٩٤٩ م، لەیەکێ ناوەندییەوە کاری حیزبایەتیم کردووە و چوومەتە ناو پارتییەوە، ئەوکاتە تازە شۆڕش سەریهەڵدابوو، لەرێکخستنی نهێنیدا کارمکردووە، ساڵی ١٩٦٤ کاتێك جیاوازی

[illegible] نێوان باڵی مەکتەبی سیاسی و مەلا مستەفای بارزانییەوە، من لەگەڵ مەکتەبی [illegible] بووم، دواتر چوومە ناو یەکێتی قوتابیانی کوردستانەوە، بوومەتە لێپرسراوی سلێمانی یەکێتی قوتابیان. ساڵی ۱۹٦۷-۱۹٦۸ چوومەتە سکرتاریەتی یەکێتی قوتابیانی کوردستانەوە. ساڵی ۱۹۷۰ کاتێك ئەو دوو ئاراستەیەی ناو پارتی یەکیانگرتەوە من بوومە ئەندامی سکرتاریەتی یەکێتی قوتابیانی کوردستان. ساڵی ۱۹۷۰ ئێمە (کۆمەڵە) مان دروستکرد. من لەناو شانە یەکەمەکانی کۆمەڵەدا بووم. ئێمە پێش دەرکردنی بەیانی یانزەی ئازاری ساڵی ۱۹۷۰ کۆمەڵێك بووین هەڵگری بیروڕای چەپ بووین، ئەو باڵەش مام جەلال سەرکردایەتی دەکرد، ئێمە بەو ئاراستەیەدا بیرمان دەکردەوە کە کۆمەڵە دروستببێت، دروستبوونی کۆمەڵە لەوەوە هات کە ئێمە هەموو بڕوامان وابوو کە دەبێت کۆمەڵە دروستببێت و ڕێکخستنێکی سەربەخۆی هەبێت، ئەوەی کە دەستپێشخەر بوو بۆ ئەوەی برادەران کۆبکاتەوە و قسەیان لەگەڵدا بکات، کاك شەهاب بوو. هەربۆ نموونە کاك شەهاب لەگەڵ هەموو ئەوانەدا قسەی دەکرد کە بۆ ئەو کارە بەباشی دەزانین، هەتا هاتەسەر من، منیش ڕازی بووم و بۆ ئەم مەبەستەش قسەی لەگەڵ زۆر کەس تردا کردبوو، ئێمە کەسانێکی دیاربووین، فیکرمان ئاشکرابوو هیچ جیاوازییەك لەنێوانماندا نەبوو، هەربۆیە دانیشتین و لەوبارەیەوە قسەمانکرد، دامەزراندنی کۆمەڵە ئاوابوو، واتە دروستبوونی کۆمەڵە بەو شێوەیە نەبوو کە شانەیەکی نهێنی بووبێت و دواتر پەیوەندی بەخەڵکەوە کرابێت و ئینجا دروست بووبێت.

من هەم ئەندامی کۆمەڵەبووم و هەم ئەندامی سکرتاریەتی یەکێتی قوتابیان بووم، کۆمەڵە ئەوکات ڕێکخستنی نهێنی هەبوو، ئێمە لەناو قوتابیاندا کارمان بۆ ئەو ڕێکخستنە نهێنییە دەکرد و هەوڵماندەدا خەڵکی بهێنینە ناو ڕیزەکانی کۆمەڵەوە. تاساڵی ۱۹۷٤ هەر ئەندامی سکرتاریەتی یەکێتی قوتابیان بووم، ئیتر ئەوەبوو ئاشبەتاڵ ڕوویدا، من ئەوکات لەگەڵ ئەو ئاراستەیەی ناو کۆمەڵەدا بووم کە باوەڕیان بە بەرگریکردن هەبوو دژی ڕژێم، ئاراستەیەکی تریش دەیوت بابڕۆینە ناو

[illegible] بەسەر بەئاراستەی یەکەم بووم، بەڵام کە دوای خرایە دەنگدانەوە، ئاراستەی [illegible] دەنگی زۆرتری هێنا و گەڕاینەوە بۆ ناو شار.

کە گەڕاینەوە ناو شار دەستمانکردەوە بەکارکردن بۆ ڕێکخستنی کۆمەڵە، ئەوەبوو حکومەت یەکێك لەوبرادەرانەی ئێمەی گرت کەناوی (ئەنوەر زۆراب) بوو، کاتێك ئەنوەر گیرا، ئێمە خۆمان شاردەوە، هەندێك لەبرادەرانیش ڕۆیشتنە دەرەوە، ئەوانەمان کە ماینەوە دەستمانکرد بەئیشکردن، کۆمیتەی هەرێمەکانمان دروستکرد، دوای خۆمان ئامادەکرد بۆ شۆڕش، دواتر وردەوردە لەگەڵ برادەرانی دەرەوە قسەمانکرد و پەیوەندیمان لەگەڵدا دروستکردنەوە، هەرچەندە پەیوەندییەکە زۆر گران بوو، ئەو کاتە مام جەلال و برادەران لە سوریا بوون، بەڵام ئێمە بڕیاری خۆمان دابوو کە دەبێت شۆڕش بەرپا بکەینەوە.

ئیتر ئەوەبوو سەرلەنوێ هاتینەدەرەوە، ئەو کات من وەکو لێپرسراوی دەستە چەکدارەکان هاتمەدەرەوە، پەیڕەویشمان هەبوو کە ناوی ( پەیڕەوی ناوخۆی دەستە چەکدارەکان) بوو، ئەو کاتە وردە وردە مەفرەزەکانمان دەهاتنە دەرەوە، کاتێکیش مام جەلال و کاك نەوشیروان گەڕانەوە، مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان دروستبوو، من و کاك ئارام بووینە ئەندامی مەکتەبی سیاسی، بەڵام لەهەمانکاتدا ئەندامی ناوەندی کۆمەڵەیش بووین، ئیتر هەموو ئەو ماوەیە لەناو مەکتەبی سیاسدا مامەوە، تا کۆنفراسی لەساڵی ١٩٨٠ ئەو ساڵە بوو کە ناکۆکییەکانی ناو کۆمەڵە دەستیپێکرد و جیاوازی کەوتە نێوانمانەوە، بەڵام ئەوەی بەلای ئەو گرووپەی ئێمەوە گرنگ بوو ئەوە بوو دەبێت بەرگری لەمانەوە کۆمەڵە بکەین و کۆمەڵە بمێنێت، چونکە کۆمەڵە بۆ ئێمە وەکو هەڵگیرساندنەوەی شۆڕش وابوو، پارێزگاریمان لە کۆمەڵە بەپێویست دەزانی، ئیتر جیاوازی لەسەر ئەوە و هەندێك مەسەلەی تریش دروستبوو.

دوای ئەمانە کۆنفرانسی یەکەم کرا، لەکۆنفرانسی یەکەمدا هەندێك برادەر یەکیانگرتبوو لەدژی ئێمە (ئێمە کە دروستکەری شۆڕشەکەبووین)، بەڵام ئەو

برادەرانە پێیان دەوترا (برادەرانی سجن) لەگەڵ برادەرانی کاك نەوشیروان پێکەوە
یەکیانگرتبوو دژی ئێمە، ئەوان داوای کۆنفرانسیان کرد، دیارە پێشتر ئامادەکاری
زۆریان بۆ کۆنفرانسەکە کردبوو، بەڵام ئێمە هیچی وامان نەکردبوو، ئێمە تەسەوری
ئەوەمان نەدەکرد وامانەزانی پاش ئەو هەموو قارەمانێتییەی کردوومانە، مەدالیا
دەکەن بە یەخەمانەوە، ئەوان وەك وتم ئیشی زۆریان بۆ کۆنفرانسەکە کردبوو،
کەسانێکی زۆریان بانگکردبوو، ئیتر بەئێمەیان دەوت ئەوە ئەوانەش هاتوون وەستاون
با بانگیان بکەینەژوورەوە، ئیتر بەوشێوەیە لەپاڵ پاکێتی و دڵسۆزی ئێمەشدا توانییان
نفوزی خۆیان بەسەر کۆنفرانسەکەدا بسەپێنن. دوایی دەرکەوت کە ئەوانە دژایەتی
ئێمە دەکەن و دەیانەوێت (بەتایبەتی من و مامۆستا جەعفەر) شکست پێبهێنن و
بمانهێننەخوارەوە، ئیتر ئەوە هەنگاوی یەکەم بوو، ئەم هەنگاوە هەموویان رێکبوون
لەسەری، مام جەلال لەدوورەوە ئاگاداری بوو و کاك نەوشیروانیش لەگەڵیدا بوو.
بەداخەوە لێرەدا دەمەوێت شتێك بۆ مێژوو بڵێم، لەکاتێکدا کە کاك نەوشیروان
گیرابوو، ئەو گروپەی پێیاندەوترا (گروپی سجن) و بەپلەی یەکەمیش کاك
فەرەیدون عەبدولقادر، لەوکاتەدا من و مەلابەختیار لەشارباژێڕ بووین، مام جەلال
ئەو کاتە لەدەرەوە بوو، فەرەیدون کۆبوونەوەیەکی بە کادیرەکانی دەوروبەری
سەرکردایەتی رێکخستبوو، لەو کۆبونەوەیەدا رایگەیاندبوو گوایە مام جەلال
نایەتەوە، هەروەها وتبووی کاك نەوشیروان گیراوە، لەو کۆبونەوەیەدا دژایەتی کاك
نەوشیروانی کردبوو و قسەی زۆری کردبوو، تەنانەت دژایەتی مام جەلالیشی
کردبوو، ئێمە لەشارباژێڕەوە بەوەمانزانی، من بەگوڕ هاتمەوە، کۆبوونەوەکەم
پێهەڵوەشاندەوە، پێموتن ئێوە دەتانەوێت ریزەکانی کۆمەڵە تێکبدەن، ئەوانە برادەری
ئێمەن و ئیلتیزامێکی ئەخلاقییان هەیە لەبەرامبەر کاك نەوشیروان و ئەوانی تردا،
بەڵام کاتێك کۆنفرانس بەسترا ئەو برادەرانە خەریکی ئەمە بوون، چوون لەگەڵ کاك
نەوشیروان یەکیانگرت دژی ئێمە، ئەوان بەوشێوەیە لایەنگریان بۆ خۆیان زۆرکرد،
ئێمەش ئەو کۆمەڵە خەڵکە پاك و بێگەردەی ناو کۆمەڵە بووین کەبەشداری

کۆنفرانسمان کرد، لەو کۆنفرانسەدا هەندێك ڕەخنەی هەڵەق و مەڵەق لەئێمە گیرا، بڕیاردرا هەرکەسێك لەنیوە کەمتر بهێنێت، دەبێت هەڵبژاردنەوەی بۆ بکرێت، یان هەر بۆی نییە ببێتە ئەندامی سەرکردایەتی. دەبووایە سەرکردایەتی نۆ کەس بن، واتە دەبێت هەریەك لەو نۆ کەسە لەنیوە زیاتر دەنگ بهێنن، ئەگەر نیوەی دەنگیان نەهێنا، دەبووایە هەڵبژاردنی بۆ بکرێتەوە، هەڵبژاردنی یەکەم کرا چوار کەس دەرچوون، چوار کەسەکەش یەکێکیان کەمال خۆشناو بوو (بە ڕەحمەت بێت)، کاك نەوشیروان و فەرەیدون عەبدولقادر و مەلا بەختیاریش دەرچوون، حەزدەکەم بزانن کاك کەمال خۆشناو تا ئەو کاتە دیار نەبوو کە کۆمەڵەیە، کەچی لەهەمووان زیاتر دەنگی هێنا، بەهەر حاڵ ئێمە زۆر بەلامانەوە ئاسایی بوو، هەندێك لەبرادەرانی ئێمە هەستان قسەیانکرد، کاك ئازاد هەورامی هەستا زۆر بەتوندی قسەی کرد، مستەفا چاوڕەش زۆر بەتوندی قسەیکرد، کاك مولازم عومەر قسەیکرد، مەلابەختیار زۆر بەتوندی قسەیکرد، هەموو قسەکانیش لەسەر ئەوەبوون ئەم واقیعە چییە تێیکەوتووین، پرسیاردەکرا بۆچی کۆمەڵە ئاوای لێبێت، قسەکرا لەبارەی ئەوەوە بۆچی ئەوانەی کە ڕۆڵی سەروەرییان دیوە لە گرتنەوەی کۆمەڵە و لەدروستکردنەوەی شۆڕش و لەدروستکردنەوەی پێشمەرگە و خەڵکانێکی پاك و بێگەرد و ڕێکوپێکن وایانلێبکرێت و هەندێك کە تا ئەو کاتە هیچیان نەکردووە لەپرێکدا ببن بە شت، منیش هەستام قسەمکرد، زۆر بەنەرمی قسەمکرد، وتم: ئەوەی کە ڕوویدا هیچ گرنگ نییە و ئیلتیزام دەکەم بەوەوە کە ڕوویداوە، ئەوانە چاوەڕێیان نەدەکرد ئاوا قسەبکەم، کە ئێمە ڕۆشتین نزیکەی نیوەی بەشداربووانی کۆنفرانسەکە لەگەڵمان هاتنە دەرەوە، کۆنفرانسەکە لەخرِی ناوزەنگ بوو، ئێمە لە تۆژەڵە بووین، قسەیەك دەکەم هەقە خەڵك بۆ مێژوو بیزانن، چونکە بەهەڵە نوسراوەتەوە، کاك نەوشیروان هات بۆ لای ئێمە، خەڵکانێك دانیشتبوون، کاك ئاوات عەبدولغەفور بوو، کاك مولازم عومەر بوو، کاك (دارۆ) ی کۆچکردوو بوو، کاك ئازاد هەورامی بوو، وابزانم ئەبو شەهابیش بوو، ئەو هاتنەدەرەوەیەی ئێمە

کی ئەوەندە سادە نەبوو گوێی پێنەدرێت. لە ٨٠٪ ی پێشمەرگەکان لەگەڵ ئێمەدا هاتنە دەرەوە، بەرپرسی پێشمەرگەکانیش لەگەڵ ئێمەدا بوون، کادیرە باشەکان لەگەڵ ئێمەدا بوون، کاك نەوشیروان وتی: کاکە ئەوەی روویدا ناخۆشبوو، ئەوەی کە روویدا روویدا،بەڵام تکایە با بڕۆینەوە ناو کۆنفرانس، روویکردە من و وتی کاك سالار خۆت هەڵبژێرەوە، من خۆم لەوێ باس لەخەبات و تێکۆشانی ئێوە دەکەم، لەوێدا من بەکاك نەوشیروانم وت: بەداخەوە کاك نەوشیروان تۆ نەدەبوو وابکەیت، ئێمە زۆر هاوڕێی تۆ بووین، ئێمە بڕوامان وانەبوو ئەوەمان بەرامبەر بکرێت، پێموت ئەگەر ئێمە تەکەتولمان بکردایە زۆر بەهێزتر دەبووین، ئێمەش دەمانتوانی خەڵك لەئێوە زۆرتر بهێنین. من بڕیارمدا خۆم هەڵنەبژێرمەوە، چونکە توشی رەشبینی و نائومێدییەکی گەورە ببووم، هاوڕێی وام هەبێت لەبری ئەوەی رێزم لێبگرێت و مەدالیا و ئەستێرەی سەرشانم پێبدات، درۆم بۆ هەڵبەسێت و بلێ کاك سالار لەکەسێکی داوە لەسەر ئەوەی لەبەری هەڵنەستاوە، ئیتر چۆن بێئومێد نابم. کاك نەوشیروان وتی دە باشە با کاك عومەر خۆی هەڵبژێرێت، کاك عومەر وتی: منیش نایکەم. وتی باکاك ئازاد خۆی هەڵبژێرێت، کاك ئازاد وتی: منیش خۆم هەڵنابژێرم، کاك نەوشیروان وتی: من پێشنیارێکم هەیە، مادام وایە لەبەر خاتری کۆمەڵە سبەی وەرن بۆ کۆنفرانس، پێشنیاری من ئەوەیە ئەو چوار کەسە بمێننەوە تا پلینیۆم، ئێمەش وتمان ئەوا لەبەر خاتری کۆمەڵە قبوڵی دەکەین، هاتینە ناو پلینیۆم لەبەر داخوازییەکەی کاك نەوشیروان و لەبەر خاتری کۆمەڵە، هیچ قسەمان نەکرد، کاك نەوشیروان هەستا قسەیکرد و وتی بەداخەوە کار گەیشتە ئەمە، ئیتر زۆر ستایشی ئێمەی کرد و وتی: من پێشنیارێکم هەیە، تا پلینیۆم با ئەو چوار کەسە سەرکردایەتی بن. کاك عەلی بچکۆل هەستا و وتی کاك نەوشیروان تۆ لەژێر فشاری برادەراندا ئەم بڕیارەت داوە و ناهێڵێت پێنج ئەندامەکەی تر بۆ سەرکردایەتی هەڵبژێردرێن. من هەستام و وتم: کاکە گیان ئێمە فشارمان بۆ کەس نەهێناوە، هەر کەسێك هەڵبژاردن دەکات با بیکات، بەڵام کە من خۆم هەڵنەبژێرم ئارەزووی

[illegible] من دڵنیابووم کە لە ٨٠٪ ی دەنگەکان بەدەستدەهێنم، هەروەها مولازم [illegible] و ئازاد هەورامیش، بەڵام بەداخەوە لە هەندێك نوسیندا ئەو ڕووداوە وا نوسراوەتەوە کە گوایا ئێمە بۆیە لە کۆنفرانس چووینەتە دەرەوە لەبەر ئەوەی دەرنەچووین، حەیفە مێژوو ئاوا بنوسرێتەوە، ئەوەی باسمکرد ڕاستییەکەیە، شایەتەکانیش زۆریان ماون".

لڤین: دەوترێت لەسلێمانی فرەکوێخایی هەیە، بۆ نموونە، پارێزگاری سلێمانی کەسی یەکەم نییە لەبەڕێوەبردنی شاردا، ڕای تۆ لەمبارەیەوە چییە؟

سالار عەزیز: ڕای من ئەوەیە دەبێت لەهەموو شوێنێکدا یەك کەس بەرپرس بێت، نەیانوتووە دوو خوا هەیە، وتویانە یەك خوا هەیە، نەیانوتووە دوو سەر کۆمار هەیە، یەك سەر کۆمار هەیە، لە فەرمانگەیەکدا دەبێت یەك بەڕێوەبەر هەبێت. لەبەر ئەوە لەشارێکدا دەبێت یەك کەس بەرپرس بێت. پێموایە یەکێك بەرپرس بێت، ئەویش بەتەشکیلاتی ئیداری، دەبێت پارێزگار بێت، لای ئێمە پارێزگارە، لەشوێنێکی تر لەوانەیە سەرۆکی شارەوانی بێت. دەبێت بەرپرس بێت لەهەموو بەشە ئیدارییەکان کە لە شارەکەدا هەیە.

لڤین: لەسلێمانیدا ئەم حاڵەتە هەیە، واتە یەك کەس لەکاروباری شار بەرپرس بێت؟

سالار عەزیز: نەخێر، ئێستا چەندین جۆر لە حاکمی تێدایە، ئێستا لێرە حیزب دەسەڵاتدار، کاربەدەستێکی حیزب لەمەکتەبی سیاسیدا، چی بوێت لەم شارەدا دەیکات. سەرۆك وەزیران و جێگری سەرۆك وەزیران دەست دەخەنە ئیشی پارێزگارەوە، ڕاستە جێگری سەرۆك وەزیرانە، بەڵام ئەو لەبازنەی ئیشەکەی خۆیدا بەرپرسە لەهەندێك شت. پارێزگار بەرپرسە لەم شارەدا، پێویستە کەس تەداخول نەکات لە ئیشوکارەکانیدا، کاتێك کەموکوڕیەکی هەبوو و لەنیزام و یاسا لایدا، ئەو کاتە پێویستە لێی بپرسیتەوە.

لڤین: هۆکاری ئەمە بۆچی دەگێڕیتەوە؟

سالار عەزیز: هۆکارەکەی دەگێڕمەوە بۆ ئەوەی بە ئەنقەست وا لەم وڵاتە کراوە

دووربێت لە پشێوی وفەوزا و داری بەسەر بەردییەوە نەبێت، بۆ ئەوەی ئەو کەسانەی بەرژەوەندییان هەیە لەم دۆخەدا، بتوانن ئیشەکانی خۆیان بکەن.

لڤین: تەکەتولاتی ناو یەکێتی تا چەند کاریگەری هەیە لەسەر دروستکردنی ئەم حاڵەتە؟

سالار عەزیز: راستە تەکەتولات لەناو یەکێتیدا هەیە، بەلاّم شەخسی یەکەم بەرپرسە لەوەی نەهێڵێت وابێت.

لڤین: شەخسی یەکەم مەبەستت کێیە؟

سالار عەزیز: شەخسی یەکەم مەبەستم سکرتێری گشتی یەکێتییە، ئەو دەتوانێت نەهێڵێت، بەتایبەت لەکاروباری ئیداریدا، لەهەمانکاتدا کە خۆشی سەرۆك کۆمارە، نەهێڵێت کەس بتوانێت تەداخول بکات. من پارێزگار بووم، سکرتێری یەکێتی پشتیوانی لەمن کردووە، بەلاّم من یاسایەکیشم بەدەستەوە بوو کە یاسای پارێزگاکان بوو، لەسەر ئەو یاسایە رۆشتووم، لەبەرئەوە پشتیوانی لێکردووم، بەلاّم خۆشی ئەگەر رۆژێك داخوازییەکی هەبووبێت و هەستمکردبێت نایاساییە و ناکرێت، بۆمنەکردووە.

لڤین: بەقسەی کەست کردووە لەسەرووی خۆتەوە؟

سالار عەزیز: بەقسەی کەسم نەکردووە لەسەرووی خۆمەوە، مەگەر ئەوە نەبێت کەیاسا رێگای پێدەدات.

لڤین: کەواتە لەم حاڵەتەدا کەسایەتی پارێزگار رۆڵ دەبینێت لەوەی کە قبوڵی گەندەڵی نەکات لەسەروو خۆیەوە؟

سالار عەزیز: کەسایەتی پارێزگار زۆر زۆر گرنگە، ئێستا ئەگەر پارێزگاری سلێمانی بڵێیت کە خۆی کادیرێکی باشە و پیاوێکی دڵسۆزە و هەموومان دەیناسین، بەلاّم یاسایەکی نییە ئیشی پێبکات. باوەڕم وایە ئەگەر یاسایەك هەبێت کاك دانا کاری پێبکات بەقسەی کەس ناکات.

لڤین: هەمان حاڵەت لەهەولێر هەیە، ئەوەی کە یاسایەك نیە بۆ دیاریکردنی ئیشی

پارێزگاکان، بەڵام دەبینین ئیشەکان بەشێوەیەکی تر دەڕوات؟

سالار عەزیز:  لەبەرئەوەی لەهەولێر سەرۆك وەزیران خۆی کەسایەتی بەهێزە و لەناو حیزبەکەشدا هەر بەهێزە، نەیهێشتووە هیچ کەس لەسەروی خۆیەوە تەداخولبکات، چونکە ئەو خۆی شەخسێکی بەهێزە، ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی نەدەتوانێت و نەدەوێرێت تەداخولبکات، خۆی لەگەڵ پارێزگاردا تەنسیقیان هەیە و رێککەوتوون و بەهەردووکیان ئیشەکان دەکەن، لەبەرئەوە لەوێ سەرکەوتوو تر وەك لێرە.

لڤین:  لەسلێمانی ئەو حاڵەتە نییە؟

سالار عەزیز:  نەخێر، هەتا ئەگەر جێگری سەرۆك وەزیران کە کاك (عومەر فەتاح) ە لەگەڵ پارێزگاردا کە کاك (دانا) یە، رێکبکەون لەسەر ئەوەی بەیەکەوە کارەکان بکەن، یەکێکی تر لەمەکتەبی سیاسی تەداخولدەکات و ئیشەکە لەوانیش تێکدەداتەوە. جاری واهەیە رەنگە ئەندامی مەکتەبی سیاسییەك ئەمر بکات بەجێگری سەرۆك وەزیران، بۆ نموونە، کاغەزێك دەنوسێت و دەڵێت کاك فلان پارچە زەوییەك بدە بە کاك فلان، بەکەسەکەش دەڵێت ئەگەر بۆی نەکردیت وەرەوە بۆلام. لەبەرئەوەی جۆرەها حاکمی تێدایە. هەموو کەسێك تەداخول دەکات، لەکەسی یەکەمەوە بیگرە تا ئەندامانی مەکتەبی سیاسی، تا ئەوانەشی کە سەر بەوەزارەتەکانن، بۆ نموونە، وەزیری فلان تەداخول دەکات لەئیشی ناو سلێمانی، کەپێویستە بەبێ ئاگاداری پارێزگار تەداخول نەکات. راستە ئەو ئیشە پەیوەندی بەوەزارەتەوە هەیە، بەڵام ئەو کەسەی سەرپەرەشتی دەکات و ئاگاداریەتی، پارێزگارە. پارێزگار دەتوانێت پرۆژەکە بوەستێنێت، دەتوانێت جیاواز بێت لەپرۆژەکەیدا کە وەزارەت بڕیاری لەسەرداوە. پێویستە پارێزگار چاودێر بێت بەسەر کاروبارە داراییەکانی وەزارەتی داراییەوە، هەتا دەتوانێت تەداخول بکات لەبانقەکاندا، دەتوانێت ئەگەر شتێکی بەدڵ نەبوو، رایبگرێت، واتە پارێزگار بەرپرسی هەموو وەزارەتەکانە لەناو شارەکانی خۆیدا، بۆیە ئەم فەوزایەی ئێستا وێنەی لەهیچ شوێنێکی دنیادا نییە.

لڤین: کەواتە دەتوانین بڵێین شاری بێ حاکمە یان فرە حاکمە؟

سالار عەزیز: شاری بێ حاکمە، شاری فەوزایە، شاری بەهەدەردانی پارەیە، بەبڕوای من چی خراپە دەتوانیت بڵێی ئەوەیە.

لڤین: یەکێتی کە قورساییەکەی لەسلێمانییە، چ سودێك دەبینێت لەوەی ئەم فەوزایە هەبێت، بەرپرسەکانی یەکێتی چ سودێك دەبینن؟

سالار عەزیز: هەندێکیان لەدالغە و خەیاڵیکدان پێیانوایە دنیا زۆر باشە و ئەو قسانەی دەکرێت هەمووی درۆیە و خەڵك هەمووی ئاسودەیە و گوزەرانیان زۆر باشە. خەڵك پێڵاوەکانیان نەدڕاوە، گەنج کێشەی نییە، هەموو خەڵك تێرە.

لڤین: واتە لەخەیاڵدا دەژین؟

سالار عەزیز: هەندێك لەو بەرپرسانە بۆ رازیکردنی خەڵك و بۆ ئەوەی خۆیان بەهێز بکەن لەسەر حکومەت و پارەی حکومەت و یەکێتی نیشتیمانی. تەداخول دەکەن لەئیشی حکومەتدا، بۆ زەوی، بۆ قۆنتەرات، بۆ یارمەتیدان، بۆ زۆر شت حکومەت بەکاردەهێنن، دامودەزگاکانی حیزب بەکاردەهێنن بۆ بەرژەوەندی شەخسی خۆیان، بۆ تەکەتولاتیان بۆ بەرژەوەندی ئابوری خۆیان. ئەگەر لێرە پارێزگار یاسایەکی وای لەبەردەستدا بێت، هیچ ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی دەوێرێت لەژێرەوە لەقۆنتەراتێکدا شەریك بێت، هیچ کەسێك دەتوانێت تەندەرێك بدات بەکەسێك بەبێ کەمکردن و زیادکردن؟

لڤین: ئەمە بۆ ئەوە ناگەڕێتەوە کە زۆربەی بەرپرسەکان خەڵکی ئەمشاری نین، واتە کێشەیان نییە لەم شارە چی دەگوزەرێت؟

سالار عەزیز: ئەوەش گرنگە، پەیوەندیشی بەوەوە هەیە، من پێتدەڵێم شەخسی یەکەم لەهەمووی گرنگترە. چاك و خراپ دەگەڕێتەوە بۆ تۆ، لەناو فەرمانگەیەکیشدا هەروایە، ئەگەر فەرمانبەرەکان خراپ بن و فاشیل بن و ئیشی خەڵك جێبەجێنەکەن و فەوزای تێدا بێت، ئەوە پەیوەندی بە بەڕێوەبەرەکەوە هەیە. کە بەڕێوەبەرەکە خۆی لەکەس نەپرسێتەوە و ترسنۆك بێت و خۆی سود لەو

ببینێت، بەڕێوەبەرەکە خۆی پاك نەبێت، ئیدی چۆن دەتوانێت لەخەڵکی دیکە بپرسێتەوە؟! خۆی پیاوێکی نەزان بێت و پێنەزانێت، چۆن دەتوانێت ئاگادرای باروودۆخی فەرمانگەکەی بێت، بەنیسبەت وەزیرێکیشەوە هەروایە، خۆت دەزانیت وەزیر لەسەر بناغەی تەکەتولات دادەنرێت، وەزیرێك دەهێنێت لەبەرئەوەی سەر بەفلان تەکەتولە، بەبێ ئەوەی ئەو وەزیرە بەتوانا بێت، بەبێ ئەوەی دڵسۆز بێت، بەبێ ئەوەی ئەو وەزیرە جورئەتی تێدا بێت، بەبێ ئەوەی ئەو وەزیرە هەستی نیشتیمانیی بەهێز بێت، بەبێ ئەوەی بیر لەخەڵك بکاتەوە و بەزەیی بەفەقیردا بێتەوە. دێت دەیکات بەوەزیر، بۆ ئەوەی ئەگەر خۆی ئیشێکی هەبوو لەلای ئەو وەزیرە بۆی جێبەجێبکات. بۆ ئەوەی بەهێز بێت لەناو حکومەتدا. ئەگەر ئەو وەزیرە زەعیف بوو، لەئەندامی مەڵبەند دەترسێت، لەئەندامی مەکتەبی سیاسی دەترسێت، چونکە خۆی بەوشێوەیە هاتووە. کەسێکی بەتوانا نییە، واتە دەبوو سەرۆك وەزیران کاتێك تەکلیف لەیەکێك دەکات بۆ ئەوەی بیکات بەوەزیر. دەبێت مەمنونی بێت بەرامبەرەکەی رازی بێت، نەك وەکو ئێستا وەکو وتم لەسەر ئەساسی تەکەتولات دادەنرێت، کەبێگومان کەسی بێتواناى تێدەکەوێت. دەبێت وەزیر ئاگای لە وەزارەتەکەی خۆی بێت، لەهەر وەزارەتێکدا کێشە هەبوو، وەزیرەکە بەرپرسە.

## شەماڵ عەبدولوەفا: نازانم هێرۆخان وەکو چی دەسەڵاتی لەیەکێتیدا هەیە، لەکاتێکدا ئەندامی مەکتەبی سیاسیی و سەرکردایەتیش نییە

گفتوگۆی هەردی مەهدی و عەزیز رەئووف

شەماڵ عەبدولوەفا وەزیری پێشووی کشتوکاڵ بووە و ئێستاش لێپرسراوی مەکتەبی پەیوەندییەکانی دەرەوەی یەکێتی نیشتیمانی کوردستانە، بەڵام هاوکات ئەوەش ناشارێتەوە که لەگەڵ داواکانی باڵی ریفۆرمدایە و نەوشیروان مستەفاش بەسیمبولی ئەو باڵە ناوزەند دەکات، ئەو لەبەرپرسە هەرە دیارەکانی ئەو باڵەیە کە ئێستا کەم تا زۆر لەناو یەکێتیدا جێیان پێ لێژ دەکرێت. پێیوایە پێویستە یەکێتی لەناو دارستانە ئاڵۆزەکەیدا بەدوای رێگەی دەرچووندا بگەڕێت، پێشیوایە سەرکردایەتی سیاسی خۆی نەگۆڕێت، ئەوا زەمەن و قەدەر دەیگۆڕێت، ئەمە جگەلەوەی لەگەڵ ئەوەدایە کە یەکێتی ئەگەری ئەوەی تێدایە ببێتە چەند حیزبێك ئەگەر کێشەکان چارەسەرنەکات.

سەرەتای دیدار لەگەڵ شەماڵ عەبدولوەفادا بە باسکردن لەبالانسی هێز و رێککەوتنی ستراتیژی کرایەوە، ئەو پێیوایە لێڵی لەو رێککەوتنەدا هەیە و دەڵێت: "دەبێت لەمەفهومی رێککەوتنی ستراتیژی تێبگەین، ئایا لەسەر هێزە یان لاوازی، لەسەر بنەمای هێز کراوە یان لەسەر بنەمای ترس، ئایا دەزگا کردوویەتی یان حیزب، رێککەوتنی ستراتیژی جۆرە تارماییەکی لەسەرە، گەر بەراوردێکی بکەی لەگەڵ واقیعی ئێستا، رێککەوتنی ستراتیژی دەقەکەی گرنگ نییە، تەرجومەکەی گرنگە. ئەوە گرنگە ئیرادەی کورد چۆن تەرجومەی دەکات لەبەغدا، لەهەرێم، لەپەیوەندییەکانی دەرەوەدا" ئەو لەگەڵ ئەوەدا نییە کە لەرێککەوتنی ستراتیژیدا رێککەوتن لەسەر هەڵبژاردنەکان بکرێت، وەك دەڵێت: "بەڵام گەر یەکێتی و پارتی رێککەوتبن کە لە (٨) ساڵی داهاتوودا یەکێتی و پارتی لەهەڵبژاردندا بەیەك لیست

ئەوە لەگەڵ ئەرکەکانی ڕێککەوتنێکی ستراتیژیدا یەکناگرێتەوە."
بەرپرسی مەکتەبی پەیوەندییەکانی دەرەوە سورە لەسەر ئەوەی کە ناکرێت هێزێك خۆی زاڵبکات، " وەك ئەوەی هەندێك لەکادیرانی یەکێتی و خەڵکیش دەڵێت کە پارتی وا دەردەکەوێت خۆی باڵادەست دەکات و دەسەڵاتی بەدەستە، ئەوە ڕێککەوتنی ستراتیژی نییە، ڕێککەوتنی ستراتیژی سازشی تیانییە، گەر پارتی بیربکاتەوە کە یەگ سازشی بۆ بکات و بەپێچەوانەوە، ئەوە ڕێککەوتنی ستراتیژی نییە، ڕێککەوتن گونجان و هاوسەنگی تیایە، هاوسەنگی و هاوتاییەکە لەنێوان دوو هێزدا بۆ سەردەمێك بۆ قۆناغێك."
شەماڵ عەبدولوەفا کاتێك دێتەسەر باسی ئەدای سیاسی، دەڵێت: "دەپرسم ئایا یەکێتی و پارتی توانیویانە گوتارێکی یەکگرتوویان لەبەغدا هەبێت؟ ئەمە ڕێککەوتنی ستراتیژییە؟ تاچەند گوتارێکی یەکگرتوومان هەبووە لە کەرکوك ؟ بۆچی قەیرانی کەرکوك دروستبووە؟ ئایا لە کەرکوك یەکێتی و پارتی کێبڕکێی حیزبی لەسەر پۆستەکانی کەرکوك ناکەن؟
من بەشبەحاڵی خۆم وتوومە کە یەکێتی و پارتی وتارێکی یەکگرتوویان نەبووە لەبەغدا و لە کەرکوك، هەر بۆیە هێشتا کێشەی قەوڵمان لە بەغدا ماوە."
سەبارەت بە کاردانەوەی نەبوونی پلان وستراتیژ لەسەر حکومەت، ڕەخنەی ئەوە دەگرێت کە " گەر پلانێکی هەرێمایەتی و گرنگمان هەبووایە، بەو (٣٠) ملیار دۆلارەی ئەم چەند ساڵە و شتی تریش، دەمانتوانی حکومەتێکی باشمان هەبووایە و کارمان لەسەر چەمکی هاوڵاتیبوون و دەزگاکان بکردایە و هاوڵاتی بەرگری لێبکردینایە، بەلام ئەوەتا ئێستا هاوڵاتیان بەرگریمان لێناکەن، خەڵك تۆفانی ڕەخنەی لەسەرمانە، لەم هەرێمەدا پرۆسەی هاوڵاتیبوون بوونی نییە، ئەمرۆ پرۆسەی کوردبوون و هاوڵاتیبوون بوونەتە پرۆسەی حیزبیبوون."
لەئێستادا چاودێرانی سیاسی لەو باوەڕەدان کە یەکێتی بەقۆناغێکی ئاڵۆزی سیاسیدا تێپەڕدەبێت و لاوازە، بەرپرسی پەیوەندییەکانی دەرەوە هەرچەندە نکولی لەوە

دەکات، بەڵام دەڵێت : " یەکێتی وەك بنکەی جەماوەری لاوازی نییە، بەڵام لەوانەیە [illegible] سەرکردایەتیدا لاواز بێت، هەرچەندە ئەوەش لەوانەیە جۆرە فەلسەفەیەکی پەیوەندی تیابێت، لەوانەیە دیویکی ستراتیژی و تەکتیکیش بێت کە لەگەڵ پارتیدا وا مامەڵە دەکات." لەوا گەشەسەندنی ئالۆزییەکانی ناو یەکێتی و کێشە هەڵواسراوەکانی، دەرکردنی رەوتی دیموکراتی (رەگ) تازەرِگەیەنراو بوو، شەماڵ عەبدولوەفا نەیاری خۆی بۆ ئەو بریارە، ئەوەش روونەدەکاتەوە " سەبارەت بە دەرکردنی (رەگ)، لەناو مەکتەبی سیاسدا خیلاف هەبوو، ئایا دەرکردن چارەسەرە، یان ئەگەر کێشە هەیە، بێت دان بەکێشەکاندا بنێیت؟ کۆبونەوەکە بەسەرپەرەشتی مام جەلال بووە، دەرکردنیان بەتێکرای دەنگ نەبووە، بەزۆرینە بووە، جگەلەوەش ئەوانە کۆمەڵێك کادیری کۆنی یەکێتین، بایلێین لەخستەرِوودا هەڵەیان کردبێت، بەڵام خۆ ناوەرِۆکە ئەو بەیاننامە لەگەڵ واقیعی یەکێتیدا یەکدەگرێتەوە، ئەوانە خۆ دوژمنمان نین، من لەگەڵ گفتوگۆدام، خۆ ئەو برادەرانە هیچ مەترسییەکیان لەسەر یەکێتی و ئەمنی قەومی دروستنەکردووە، جەریمەیان نەکردووە، رەخنە شتێکی سروشتییە، باشە خۆ مام جەلال خۆی دەڵێت هەمووتان بن بەقاز، بەڵام ناتوانین هەموومان ببین بە قاز."

ئەو بەرپرسەی یەکێتی باس لەوەدەکات کەپێویستە یەکێتی سەردەمیانە هەڵسوکەوت بکات، وەك دەڵێت: " یەکێتی ئێستا گەورە بووە ، جاران لەشاخ بوو شەرعیەتی شۆرِشگێرِانەی هەبوو، بەڵام ئێستا لەشارە، دەبێت شەرعیەتی شار و دەستووری هەبێت."

لەمرِۆدا زۆرێك لەبەرپرسانی باڵی ریفۆرم، بەتوندی رەخنە لەوشێوە بەرِێوەبردنە دەگرن کە یەکێتی لەسەری دەروات، شەماڵ عەبدولوەفا وەك ئەوەی لە وتارەکانیدا رەخنەکانی دووپات دەکاتەوە، لێرەشدا دێتە سەر باسی دەسەلاتەکانی ناو حیزبەکەی و دەڵێت: " قسە و کردار زۆر جیاوازن، مەبەستم ئەوەیە لەناو یەکێتیدا دەسەلات دابەشناکرێت، من ئاگام لەبریاری سیاسی یەکێتی نییە، من کانسلکردنی

بەچارەسەر نازانم، شكاندنی پەنجەكانی یەكتر بەچارەسەر نازانم، ئەوە شایستەی یەكێتی و حیزبێكی دیموكراسی نییە."

ئەو ئەندامەی سەركردایەتی یەكێتی، ئەو تۆمەتانە ڕەتدەكاتەوە كە ململانێی باڵی ریفۆرم و خەتی گشتی لەسەر دەسەلات و پارە بێت، هەروەك بەرگری لەسیمبولی باڵەكەشیان دەكات و دەلێت: " ئەگەر كێشەی كاك نەوشیروان پارە و دەسەلات بێت (وەك هەندێك دەلێن) ، باشە كاك نەوشیروان كەسی دووەمی ناو یەكێتی بوو، دەسەلاتدار بوو، پارەداربوو، یەكێتی لە حكومەتی بەغدا و هەرێم شەریكە، بەرژەوەندی جۆراوجۆری هەیە، پارە لەناو یەكێتیدایە، لەسەر گردەكە نییە." لەسەر قبوڵكردنی ڕەخنەكانی ریفۆرم لەناو یەكێتی لەئێستادا، دەلێت: " تا ئەمرۆ لەناو یەكێتیدا ڕەخنەشمان گرتووە و دەرنەكراوین، بەلاّم نازانم سبەینێ كە دەچینە ناو كۆنگرە، باڵی ریفۆرم دەردەكرێت یان دەرناچێت، ئەوە شتێكی ترە. ئەمەش ئەگەرێكە لە ئەگەرەكان."

شەماڵ عەبدولوەفا نیگەرانە لەدابەشكردنی دەسەلات لەناو حیزبەكەیدا و دەلێت: " لەیەكێتیدا كۆمیتەی سەركردایەتی گەورەترین دەسەلاتە، بەلاّم لە تەرجەمەكردنی ئەو دەسەلاتەدا وانییە، مەكتەبی سیاسی دەسەلاتە، بەلاّم دیسان ئایا مەكتەبی سیاسی هەمووی بڕیار دەدات؟ دەبێت ئەو پرسیارە لەخۆیان بكەیت، بەلاّم لەكوردستاندا دەسەلاّت و بڕیاری سیاسی بەدەست مام جەلال و كاك مەسعودەوەیە، ڕەنگە نەتوانم بەروونی وەلاّمت بدەمەوە، بەلاّم مەكتەبی سیاسی لەهەموو بڕیارێكدا بەشدار نییە، لەیەكێتیدا بڕیاری كۆیی غائیبە، شەفافیەتی سیاسیش لێڵە."

بەشێكی كادیرەكانی ناو یەكێتی لە " دەسەلاّتی بێسنور" ی هێرۆخان نیگەرانن. سەبارەت بەپرسیاری شەرعیەتی ئەو دەسەلاتە بە چ سیفەتێكە؟ شەماڵ عەبدولوەفا دەلێت: " بەڵێ هێرۆخان دەسەلاّتی هەیە، بەلام نازانم وەكو چی دەسەلاّتی هەیە، لەكاتێكدا مەكتەبی سیاسی و سەركردایەتیش نییە، بەلاّم ژنێكی تێكۆشەرە."

لەپرسیاری دوا ئەگەرەكانی ڕێككەوتن و چارەسەر لەنێوان باڵەكاندا، بەرپرسی

پەیڕەوییەکانی دەرەوە جەخت لەوە دەکاتەوە کە " کاک نەوشیروان بەشێکە لە ڕەوی یەکێتی، یەکێتی بەشی ئەوەی تیاماوە بگەینە ڕێگەچارە، کاک نەوشیروانیش بەشێکی گرنگە لەچارەسەر، مام جەلال لەبەر کورد تەنازول بۆ پارتی و شیعە و سوننە دەکات، باشە بۆ لەبەر خاتری یەکێتیش تەنازول بۆ هاوڕێکانی ناکات؟! مام جەلال و کاک نەوشیروان (٤٧) ساڵە هاوڕێن." ئەو باس لەوە دەکات کە " تائێستا موبادەرەیەکی وا نابینم بۆ چارەسەر، بەڵام کاك نەوشیروان نیشانەی کارەکانی روونە و کێشەی شەخسی لەگەڵ کەسدا نییە لە یەکێتیدا، ئەو داوای ئەوە دەکات ئەم سیستەمە بگۆڕین و دەشبێت بیگۆڕین و یەکێتیش مقاوەمەتی ئەوەی تێدایە. ئەگەر نەیگۆڕین، ئەوا زەمەن لەسەر کەس ناوەستێت و ئەو دەمانگۆڕێت، یان دەبێت بیکەینە موئەسەسات، یان ئەوەتا قەدەر دەمانگۆڕێت." ئەوەش ناشارێتەوە کە گەر کێشەکان چارەسەرنەکرێن، " ئەگەری ئەوە هەیە یەکێتی بۆ چەند حیزبێك دابەش ببێت."

یەکێتی ئەندامێکی دیاری ڕێکخراوی (SI) یە، ساڵانە نزیکەی (٣٥) هەزار دۆلار ئابوونە دەدات، بەڵام هەمانکات وەك زۆرێك لەرۆشنبیران ئەم حیزبە دەڵێن، پێکهاتەکانی ئەو حیزبە لەگەڵ ڕێکخراوێکی سۆسیال دیموکراتدا ناگونجێت، لەوانەش زیندوکردنەوەی خێڵەکان، لەوبارەیەوە شەماڵ عەبدولوەفا کە ئەندامی وەفدی یەکێتی بوو لە کۆنگرەی ئەمساڵی ڕێکخراوەکە لە ئەسینا، دەڵێت: " زیندوکردنەوەی خێڵ و پارەدان بەدیوەخانەکان لەگەڵ یەکێتیدا ناگونجێت، ئەوە دیاردەیەکی تەندروست نییە، چونکە یەکێتی پێکهاتەی خێڵایەتی نییە، راستە خێڵەکان پێکهاتەی میللەتەکەمانن. بەڕاستی ئەوە مونافەسەی حیزبییە ئەو دیاردەی دروستکردووە، خێڵ هەیە لەهەردوو حیزب پارە وەردەگرێت، خێڵەکان دەورەکان دابەشدەکەن،یەکێك دەنێرن بۆ ناو یەکگرتوو، یەکێك بۆ ناو پارتی و ئەویتر بۆ یەکێتی، تەنانەت ئەو دیاردەی خێڵایەتییە و دابەشبوونیان لەناو قوتبەکانی یەکێتیشدا دەبینرێت، هەیە پشتگیری کاك نەوشیروان دەکات، هەیە پشتگیری مام جەلال

هەشە پشتگیریی کاك کۆسرەت دەکات، خۆشیان لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون."

لەدوا تەوەرەی دیدارەکە، شەماڵ عەبدولوەفای ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی سەرەنجی خۆی لەبارەی ڕێکخراوەکە بەمشێوەیە دەخاتەڕوو و دەڵێت: " ئینتەرناسیۆنال جاران حیزبە گەورەکانی ئەورووپای ڕۆژئاوا تیایدا ئەندام بوون، بەڵام ئێستا حیزبەکانی باشوری ئەفریقا و باشوری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا و ئەمریکای لاتینی و ڕێکخراوی نادیموکراتی و ناسیۆنالیستیی نامافی مرۆڤانەی تێکەوتووە، سیما و و خەسڵەتی ئێستای گۆڕاوە، وەك جاران نییە، تەنانەت حیزبە گەورەکانی ئەورووپای ڕۆژئاوای ڕەخنەیان لەسەرکردایەتی (IS) ی هەیە، یەکەم ڕۆژی کۆنگرەش ئەو ڕەخنانە دەرکەوتن، ئێستاش ئاراستەی وا هەیە کە دەیەوێت سەرکردایەتی (IS) بگۆڕدرێت."

سەبارەت بەجێگرەکانی سەرۆکی ڕێکخراوەکەش، دەڵێت: " ئەو ڕێکخراوە (٣٧) جێگری هەیە، مام جەلال یەکێکە لەو جێگرانە، جێگرەکانیش بەپێی پۆستی کەسەکان و ناوچەکان و موراعاتی قەومییەت و مەزهەب و پێکهاتە جیاجیاکان دانراون، ئێستا ئەو ڕێکخراوە وەك پێکهاتە ئەسڵییەکەیساڵی (٥١) ی نەماوە، تەنانەت ئینشیقاقی تێکەوتووە."

## ئاواتی شێخ جەناب: کاك بەختیار بەو هەموو ئیدیعای دیموکراسییەت و مۆدێرنە و پۆست مۆدێرنە بووایە، دەبوو کراوەتر بووایە

دیمانەی هەردی مەهدی و ئیسماعیل عوسمان

دۆخی یەکێتی لەهەر کات زیاتر پەرێشان و پربالترە، لێدوانە توندەکان و کۆبوونەوە و لێشاوی رەخنە لەیەکترگرتن لەجاران پەرەسەندووترە، راستە یەکێتی هەمیشە ئەوەندە بەرەیەکی سیاسی بووە، حیزبێکی پتەو نەبووە، بەڵام مەرج نییە هەموو کات ئەنجامی ململانێکان بەو ئاراستەیەدا برۆن کە ئەو حیزبە لەسەری راهاتووە، لەم دیدارەدا لەگەڵ ئاوات شێخ جەناب کە بەرپرسێکی دیاری باڵی ریفۆرمە، تاووتوێی دوایین ململانێی نێو باڵەکانی یەکێتی و گۆڕانکارییەکان دەکرێت، هاوکات وەڵامی هەندێك لەلێدوانەکانی بەرپرسانی خەتی گشتی دەداتەوە.

لڤین: تێڕوانینت بەرامبەر بارودۆخی ئێستای یەکێتی چییە؟

ئاوات شێخ جەناب: یەکێتی حیزبێکی ئاسایی نییە، رەنجی داوە و تەمەنێکی بڕیوە، ژمارەیەکی زۆر شەهیدی هەیە، هەندێك لەوانە سەرکردە و ئەستێرەی رۆشنبیری بوون، کاریگەرییان زۆر بووە، ئەگەر شەهیدبوونی ئەوان نەبووایە، رەنگە یەکێتی بەم رۆژە نەگەیشتایە، لەوانە: شەهید شەهاب و هاورێکانی، یەکێتی حیزبێکی مەحبووبی ناو میللەت بوو، بەڵام ئێستا بەقەیرانێکی فیکری و تەنزیمی و نەبوونی متمانەی نێو خەڵك و حیزبدا دەڕوات، ئەگەری ئەوە هەیە ئەوەی ئێستا هەیەتی، لە کیسی بداتچونکە پەیوەندی نێوان حیزب و چینەکانی کۆمەڵ، زەواجی کاسۆلیکی نییە تا هەتایە بەردەوام بێت، بەڵکو پەیمان یان گرێبەستێکە لەنێوان حیزب و کۆمەڵدا، ئەگەر حیزبەکە راستگۆ نەبێت لەگەڵ ئەو ئامانج و دروشمانەی بەرزیکردوونەتەوە کە لەپێناوی کۆمەڵدان، یان جێبەجێیان نەکات، یان لێیان پاشگەزبێتەوە، دەکرێت میللەت ئەو خۆشەویستییەی کەهەیەتی، بیگۆڕێت. لەو

ا ئەو حیزبە شكستدەهێنێت، تەجروبەی دنیاش وابووە، شۆڕشی جەزائیر شۆڕشێكی یەك ملیۆن شەهیدی بوو، كە میللەت پشتی تێكرد، ئەحمەد بن بیلای رابەری شۆڕشەكە رایكرد بۆ فەرەنسا و بوو بە پەنابەر. پێویستە ئەوەش بوترێ تەنها یەكێتی لەو ئەزمەیەدا ناژی، بەڵكو هەموو ئەو حیزبانەی ئێستا لەدەسەڵاتدان، لەو ئەزمەیەدان. ئەگەر یەكێتی بتوانێت بەدیراسە و بەمەنتیق چارەسەری حاڵەتی كشانەوە بكات، ئەوا دەتوانێت وەزعی حیزبەكە بگۆڕێت و ئەو خۆشەویستییەی كە جاران لەناو خەڵكدا هەیبوو، بۆی بگەڕێتەوە، ئەگەر وانەبێت دیارە مێژوو لەسەر كەس نەوەستاوە و ناشوەستێت.

لڤین: ئەوەی بەدیدەكرێت رۆژانە دیاردەی دەركردن و بێبەریكردن لەو حیزبەی كە هەمووتان دروستتان كردووە، زیاتر دەبێت، بەودۆخەوە پێتوایە لەناو یەكێتی هەنگاو بەرەو ئاشتەوایی و چاكسازی و لێكنزیكبوونەوە بنرێت؟

ئاوات شێخ جەناب: ئەو كارانەی كە كراون و هەن، پێموایە تەمسیلی ئەو ئیرادەیە دەكات كە وەك حیزبێكی نەیاری بەرهەڵستكار هەڵسوكەوت لەگەڵ ئێمە دەكات و من بە ئیرادەی شەڕ ناوی دەبەم و لەبرامبەریشدا ئیرادەی خێر (كە مەرج نییە تەنها لەناو رفرمخوازاندا بێت). ئەو ئیرادە خراپە، لەبری ئەوەی بەرەو ئاراستەی لێكنزیكبوونەوە و دیالۆگ و لێكتێگەشتنی بەرێت، بەرەو لێكدووركەوتنەوەی دەبات.

من بێئومێد نیم، سەرەنجام ئیرادەی خێر باڵادەست دەبێت و ئیرادەی گۆڕان و چاكسازی و دژایەتیی گەندەڵی و چارەنوسی هاوبەش و ئامانجی هاوبەش سەردەكەوێت، من بێئومێد نیم، لەناو یەكێتیدا ئیمكاناتی گەورەی فیكری و كادیر و مێژوو هەیە، ئەوەندە كەرەستە هەیە لەناو ئەم حیزبە و سەركردایەتییەكەیدا كە بتوانێت گۆڕان و چاكسازی بكات. دیارە ریفۆرمكردنیش بەلابردنی كەسێكی گەندەڵ و دانانی یەكێتی تر ئەنجامی پۆزەتیڤی لێناكەوێتەوە، بەڵكو پێویستە چاكسازی لەسیستەمی بەڕێوەبردنی حیزب و حكومەتدا بكرێت، لەم دونیادا ئەوە

[illegible] که چەند ئەستەم و قورسە، گەندەڵی بەرپرسێك ئاشکرابکرێت، لەوەش [illegible] ئەوەیە گومانەکەی لەسەر لابرێت، بۆیە باشترین رێگە بۆ ریفۆرمکردن، گۆڕینی سیستمی کارکردنە، بۆ ئەو گۆڕینەش ئەگەر توانای ناوخۆمان کەمبێت، ئێمە ئەندامین لە سۆسیال ئەنتەرناسیۆنال و دەتوانین داوا و سود لە شارەزایی ئەوان وەربگرین.

لڤین: باست لەناوەندی بڕیارکرد، لەناو یەکێتیدا یەکێ بڕیار بەدەستە؟ ئەوانەی کە خۆیان بەزۆرینە و خەتی گشتی دەزانن، یان ئەو چوارکەسەی (مستەفای سەید قادر، عوسمانی حاجی مەحمود، عومەری سەید عەلی و جەلال جەوهەر) بە مەبەستی چاکسازی یاداشتێکیان دایە سکرتێری گشتی لەم دوایەدا؟

ئاوات شێخ جەناب: موفرەداتی دەسەڵات ئێستا بە دەست کێیە؟ کێیە ئەو کەسەی کە دەتوانێت وەزیرێك دابێ یان لابدات؟ کێ دەتوانێت یەکێك بکات بەسەرکردایەتی، دەسەڵات لای ئەوە، ئەویش سکرتێری گشتییە کە مام جەلالە، ئەگینا نە ئەو چوارە دەسەڵاتی ئەوتۆیان هەیە نە ئەوانی تریش زۆر لەمان باشترن، رەنگە هەبێت بڵێ (م.س) بە واجباتی خۆی هەڵناسێت، هەرچەندە من لەگەڵ ئەم رایەدا نیم، بەڵام ئەگەر واش بێت، دەلالەتی نەبوونی دەسەڵاتە. ئەگینا باوەڕناکەم هەبێت و دەسەڵاتی هەبێت و بەکارینەهێنێت، لەکاتێکدا هەرکەسێك دەگریت، دەڵێت کێشە کێشەی دەسەڵاتە، دەسەڵات ئەوەندە خۆشەویست بێت، شەڕی لەسەر بکرێت، ئیتر یەکێك هەیبێت چۆن بەکارینەهێنێت.

لڤین: باست لەوە کرد کە دەسەلات لای سکرتێری گشتی یەکێتییە، بەڵام دوای بلاوبوونەوەی زنجیرە وتارێکی نەوشیروان مستەفا که رەخنەی لە ئەدای حیزب و حکومەت و نادادی کۆمەلایەتی کرد، مەلا بەختیار لە وتارێکیدا ئاماژەی بەوەکرد لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن لەگەڵ نەوشیروان مستەفا رووبەڕوو ببنەوە، پێتوانییە ئەمە تەحەدایەك بێت بۆ نەوشیروان مستەفا؟

ئاوات شێخ جەناب: پێشنیارەکەی کاك بەختیار بەشێوازێکی شارستانی نازانم،

دەسپێکی وتارەکەی، لام سەیربوو کاك بەختیار پێشنیاری وا بکات، ئەگەر لە ڕۆژنامەی (چاودێر) نەمبینیایە، دەمووت کاری ئەو نییە. بەکارهێنانی (کاك، بەڕێز، جەناب) ئیمتیازەکەی ئەوەندە بۆ بەکارهێنەرەکەیەت، ئەوەندە بۆ بەکارهێنراوەکە نییە تا لێیوەربگرێتەوە. ئەو لۆجیکەش، لۆجیکی سەدەکانی ناوەڕاستە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان، ئەوەی کە دەڵێت: " هل من مبارز) پێموانییە گرفت وا چارەسەر بکرێت، باشتروابوو وەڵامی هەموو رستەیەکی کاك نەوشیروان بداتەوە و پێچەوانەکەی بسەلماندایە، خۆ ئەو هیچی بەدزییەوە نەوتووە، لەنوسینەکەی کاك بەختیاردا، (٢٥) ساڵی دیاریکردووە، دیارە تەمەنی یەکێتی لەوە زیاترە. ڕەنگە مەبەستی ئەو سەردەمە بێت کە کێشەی (ئاش) تیایدا سەریهەڵدا و پاشان جیابوونەوەی لێکەوتەوە، ئەو کاتە من یەکێك بووم لەوانەی پریشکی (ئاش) م بەرکەوت، لە زۆر بۆچووندا لەگەڵ کاك بەختیاردا بووم و پشتگیریم کردووە، بەتایبەت لە کۆنفرانسی سێدا، بەڵام بڕوام بەجیابوونەوە نەبوو. ئەو کاتە لەگەڵ کاك بەختیاردا باوەڕمان وابوو کە ڕێکخستن دەوری نییە و عەسکەرتاریەت هەیە و دیموکراتییەت نییە و کەسی شیاو لەشوێنی شیاودا نییە و من بۆ خۆم دژی مفاوەزاتیش بووم. ئەو کات لەسەر ئەوانە کاك بەختیار تا جیابوونەوە ڕۆشت، ئەو کاتە یەکێتی و کۆمەڵە لە لوتکەی خۆشەویستی وم سەرکەوتندا بوون، ئێمە لەگەڵ کاك بەختیار ڕەخنەمان هەبوو، کەچی ئێستا پێچەوانەیە و کاك بەختیار پێی ئەستەمە خەڵکی باسی ئەو شتانە بکات، ئەو خۆشی چەندجار و لەچەند مناسەبەتێکدا باسی چاکسازیی کردووە، پێموابێت مەبەستی لە چاکسازیکردن بووبێت لە چاکدا، بەڵکو چاکسازی لەگەندەڵیدا دەکرێت.

واباوە کاك بەختیار پیاوێکی هێمنە، بەڵام ئەم ماوەیە زۆر تووڕە دەبێت و جارێك دەتکا بە تابووری پێنج و جارێکی بە ئینقیلابی و جارێکی تر بە حیزب لەناو حیزب و خواش دەزانێ چیتری بەدوادا دێت.

ئێمە شانسێکی گەورەمان هەیە لەسەروەوەی یەکێتی، شارەزای و حیکمەتی مام

...لال هەیە، ئەگینا ئەو دەربڕینانە بەم رستە ئاگریناویانەی برادەران، کە زوو زوو ...ری دەبڕن و بلاویاندەکەنەوە وەك دەڵێن خوێنی لێهەڵدەستا.

لڤین: پێتوانییە چەند کەسێك لەناو یەکێتیدا دەیانەوێت ئەو کێشەیە گەرمتر بکەن، هۆکاری ئەوەیە کە دەسەلاتێکیان بەدەستهێناوە، نایانەوێت لەدەستیبدەن؟

ئاواتت شێخ جەناب: رەنگە تارادەیەك وابێت، من بۆخۆم ماوەیەك شتی ئەوتۆم لەسەر کاك ئەرسەلان نەبیستووە و بێدەنگترە، بەلام کاك بەختیار و کاك ئازاد کێچێك دەکەن بە گایەك، رەنگە پەتای هەڵبژاردن و پێش کۆنگرەی بێت بۆ دیعایەکردن بێت، یان زیاد لەپێویست حەساس بوون بەرامبەر بە ریفۆرم و هەکامێکیان بێت، پێموانییە ئەو جۆرە کردەوە و گوفتارانە سودبەخش بن، کاك بەختیار بەو هەموو ئیدیعای دیموکراسیەت و مۆدێرنە و پۆستمۆدیرنیتەوە، دەبوو کراوەتر بووایە.

راستییەك هەیە دەبێت هەموومان لەبیری نەکەین، مەدرەسەکەی یەکێتی هەموومانی فێری جۆرێك لە لامەرکەزیەت کردووە، ئەو مەدرەسەییە هەر هیچ نەبێت، سێ لەسەر چواری تەمەنی یەکێتی درێژەی کێشاوە، هەموومانی فێری جۆرێك لە ئیستیقلالییەت کردووە لەبۆچوون و دەربڕیندا، لەناوخۆی یەکێتیدا جۆرێك لە رادیکالّییەت هەبووە و کەس شەرمینەکردووە رای خۆی دەرببڕێت. بۆ نموونە: کاتی خۆی محەمەد موکری رۆمانێکی نوسی بەناوی (سەگوەڕ)، هەمووی تانە و تەشەر و رەخنە بوو لەپێشمەرگە، پاش بلاوبوونەوەی پێشمەرگە هەمووی توڕەبوون و وتیان: چۆن دەبێت بەپارە و چاپخانەی یەکێتی ئەمە بنوسرێت؟ دواتر چوونە لای مام جەلال و کاك نەوشیروان و شکاتیان کردبوو، کاك نەوشیروان پێیوتبوون بڕۆن ئێوەش بەنوسین وەلامیبدەنەوە، وتبوویان ئاخر بلّێین چی؟ وتبووی بنوسن: : سەگوەڕەکەی حەمە موکری بەڕاستی سەگوەڕە." بۆ لەناو یەکێتیدا و لەسەردەمی ئازادیدا، بارودۆخێکی وا دروستنەکرێت بۆ گفتوگۆ، بۆ لەجیاتی ئەو توندەتەبیعەتانە، سکرتێی گشتی لەگەڵ ئەوانەدا دابنیشێت و قسەبکات. خۆ هەموویان پێشمەرگە و هاوڕێی

[illegible]ون، ئەگەر تائێستا بەبیانووی کێشەی عێراق و بارودۆخی کوردەوە نەیکردبێت، پێویستە لەمەودوا گرنگیی زیاتر بدات بەئیشوکارەکان و کێشەکانی ناوخۆ، چونکە بەدەست هەندێك برادەربێت، داری بەسەر بەردەوە ناهێڵێت.

تەبیعەت و مێژووی ئەم حیزبە، وایە ئەوەی لەپلەیەکی خوارەوە پێشمەرگایەتی کردووە و تاسەرەوە و لەکادیرێکی خوارەوە تا سەرەوە، مەساحەیەکی هەیە لەدروستکردنی ئەم حیزبەدا، بەوپێیەی خۆی بەخاوەنی حەق دەزانێت لەسەر یەکێتی. ئەم مافە بەبڕیار لەکەس ناسەنرێتەوە و واپێویستە ئەمانە بەشێوەیەك لەشێوەکان سەرلەنوێ لەنوسینەوەی مێژوو و بیناکردنەوەی یەکێتیدا لەرێگەی دیالۆگەوە بەشدارییان پێبکرێت، بەشداریکردن لە راستکردنەوەی هەندێك چەمکی گرنگدا، بۆ نموونە: ئێمە سۆسیال دیموکراتین، کوا عەدالەتی کۆمەڵایەتی سۆسیال دیموکرات؟ ئێمە دیموکراتین کوا شەفافیەت و ئازادی رادەبڕین و کوا بەشداری ژنان؟ سەروەری یاسا لای کۆمەڵگای مەدەنی پیرۆزە، ئێمە چیمانکردووە بۆ سەروەری یاسا، دەیاها پرسیار و چەمکی تر هەیەکە پێویستیان بەریفۆرم هەیە.
لڤین: دوای ئەوەی کە باڵی رەگ لەناو یەکێتی خۆی راگەیاند، دوو قسە لەئارادان، یەکێکیان ئەوەیە ئەمە بۆمبێکی باڵی ریفۆرم بێت، دووەمیان پەیوەندی بەو ململانێیەوە هەیە کە لەگەڵ شانازی ئیبراهیم ئەحمەددا لەبەریتانیا هەیانە، تۆ رات چییە لەوبارەیەوە؟
ئاواتی شێخ جەناب: نە بۆمبە و نە میزەڵدان، ئەوە کاك ئازاد خۆی پێیخۆشە وا ناویبهێنێت، لەم سێ چوار ساڵەی پێشوودا، ئێمە بە یاداشت و نوسراو و وتار و پرۆژە و چەندین شێوە، بیروبۆچوون و داخوازی و شتەکانی خۆمان وتووە و نوسیوە و پێشکەشکردووە، شەرمان نەکردووە و نایکەین، پێویستمان بەرێزێکی زۆرە و پێویستمان بەوەکیل نییە.
ئەو برادەرانە ئەوەی ویستویانە لەبەیانەکەی خۆیاندا بڵاویانکردووەتەوە، من

شارەزایم لەوردەکاری ڕێکخستنەکانی دەرەوە نییە، ناتوانم بڵێم شاناز چی کردووە یان نەیکردووە، بەڵام دەزانم کێشە هەبووە، پێشموایە هەڵەی یەکێتی لەوەدایە لەبری ئەوەی کێشەکان لەنێوانیاندا چارەسەر بکات، مەڵبەندەکەی هەڵوەشاندەوە، بەوەش بێت ئومێدی لای کۆمەڵێك دروستکرد کەچارەسەر بەدینایەت، دەبووایە مەکتەبی ڕێکخستن هەردوو لایەنی ڕێکبخستایە، ئەگەر لایەك گوناهبار دەرچوو، موحاسەبەی بکات.

لەو ڕەخنانەشی کە گرتوویانە، پێموانییە شتێکی نوێی تیا بێت و لای هەمووان ئاشنا و دووبارەن و بەشی زۆری ڕاستن، بەڵام پێموایە ئوسلوبەکەیان زۆر ڕاست یان سیاسییانە نەبێت و بڕواناکەم کەس لە دونیا بەرجا و تکا و داواکاری، وازی لەسەرکردایەتی و دەسەڵاتی هێنابێت و کورسی بەجێهێشتبێت، دەرکردنەکەشانم لەلا کارێکی زۆر حیزبیانە نییە و بەپێی پێڕەو نەبووە.

لڤین: ڕات چییە لەسەر ئەو دابەشبوونەی کە لەناو هەیکەلی ئەم حیزبەدا هەیە؟

ئاوات شێخ جەناب: ئێستا لەناو یەکێتیدا دابەشبوون لەسەر حسابی عەشایەری هەیە، لەسەر بنەمای پێشمەرگەی دابڕاو و دانەبڕاو هەیە، لەسەر بنەچینەی پێشمەرگەی دێرین و تێکۆشەر هەیە، خەتی گشتی هەیە، ڕیفۆرم هەیە، وەك کاك ئازاد دەڵێت باڵیمام جەلال و باڵی کاك نەوشیروان هەیە. تاچەند ڕۆژێکیش لەمەوپێش ئاراستەی یەکبوون هەبوو، هەموو ئەمانە لەسەر مەفهومی شتی هاوبەش لەناو خۆیاندا ڕێککەوتوون و هەمووشیان هەن و یەکێتین و هیچیشیان حیزب نین لەناو حیزبدا، یەکێتیش هەروا بووە لەموحیدەوە بۆ ئیماندار، لەئاغا و دەرەبەگەوە بۆ جوتیار و سەرمایەدار و کرێکار، هەمووی هەبوون و هەن و بەهیچ هێزێکیش یەك بۆیاخیان لێنادرێت.

لڤن: ئەو پارە زۆرەی لەناو یەکێتیدا هەیە، بەرژەوەندی بازرگانی هاوبەش و ئەو کەسایەتیانەی کە ڕۆڵ دەبیننلە سەرفکردنی پارەکەدا، ڕۆڵێکی خراپیان نەگێڕاوە لەناو یەکێتیدا؟

ئاوات شێخ جەناب:  پارەو دەسەلآت لەهەموو شوێن و کاتێکدا شتی گۆڕیوە و دەیگۆڕێت و لەناو یەکێتیشدا هەر وابووە و لەهەڵبژاردنی یەکێتیشدا ڕۆڵی یەکلاکەرەوەی بینی. بەبڕوای من لەناو کۆمەڵی کوردەواریشدا دوو چینی نوێی دروستکرد، کە ئەوانیش (پیاو ماقوڵی شەڕ) و (بازرگانی شەڕ) ن، دیارە بازرگانی شەڕ لەسەر دەستی دوژمنانی شۆڕش دروستبوون، پیاوماقوڵانی شەڕیش بەهۆی دەسەلآت و پارەوە توتنیویانە نفوزی سیاسیی و کۆمەلآیەتی (عەشایەری) بەدەستبهێنن.

لڤین:  ئەو کێشانەی کەباست لێوەکردن، یەکێتی بەرەو چ ئاقارێك دەبەن؟ کۆنگرە هەموو ئەو کێشانە یەکلایدەکاتەوە؟ یاخود کۆنگرە، کۆنگرەی خەتی گشتی دەبێت؟

ئاوات شێخ جەناب:  کۆنگرە ئەگەر وەك کۆنگرە بێت، نەبوونی باشترە، ئەگەر کێشە هەڵپەسێردراوەکان چارەسەر نەکات، نەکرێت چاکترە، ئەگەر جارێکی تر هەڵبژاردنی سەرکردایەتی پێش پەسەندکردنی پێرەو و پرۆگرام بێت، نەبوونی باشترە، بەلآم ئەگەر کۆنگرە بۆ ریفۆرم و چاکسازی بێتبەڵێ. بۆ سارێژکردنەوەی برینەکان بێت، بەڵێ. بۆ عەدالەتی کۆمەلآیەتی و دیموکراسییەت و سەروەری یاسا و دژایەتیکردنی گەندەڵی بێت، بەڵێ، کۆنگرە ئەگەر کۆنگرەی ئازادی رادەربڕین و هەموو رەنگەکان بێت، بەڵێ. چەپکە گوڵ بێت، بەڵێ، بۆ ئەوەی یەکێتی ببێتەوە بە یەکێتییە مەحبووبەکەی جاران. پێویستە ئەوەش بوترێت کۆنگرە ئەوەندەی مەسئولیەتی سەرکەوتنی لەئەستۆی سکرتێری گشتییە، لەلای کەسی تر نییە، ئەگەر ئەو لۆجیکە راست بێت، دەبێت مام جەلال نموونەی ئەو سلوکەی کە لە بەغدا پەیرەوەی دەکات، لەناو کۆنگرە و لەناو یەکێتیش نیشانبیدات، دەنا حەقە ڕووبەڕووی رەخنەی گەورە ببێتەوە.

لڤین:  هەندێك لەوانەی کە پێشتر بەرپرسیارێتی دیاریان هەبوو لەناو یەکێتیدا، ئێستا دانیشتوون (دابڕاوەکان) کە تۆ یەکێکیت لەوان، ئەو دابڕاوانە نایانەوێت بگەڕێنەوە بۆ ناو یەکێتی و بچنە ناو ئەو یارییەی ئێستا؟

ئاوات شێخ جەناب: راستتر وایە بڵێین بەزۆر دانیشانراوەکان یان بەزۆر دابڕاوەکان، بەزۆر دەرنەچووەکان. ئێمە کەسمان وازمان لەیەکێتی نەهێناوە و بەخۆشیش واز لەیەکێتی ناهێنین، ئەو مێژووەی کە ئێمە هەمانە لەگەڵ ئەم حیزبەدا هی ئەوە نییە لەسەر بڕیاری کەس وازی لێبهێنین و بۆ کەسی بەجێبهێڵین، یەکێتی هی ئێمەیە و ئێمەش هی یەکێتین، هەموو ئەوانەی کە بەزۆر دابڕاون، ئامادەی کار و تێکۆشانیان تێدایە، هەڵبەتە لەچوارچێوەی عەدالەت و کەسی شیاو لەشوێنی شیاودا، لەچوارچێوەی هاوتایی و هاوسەنگیدا نەك لەسەر بنەمای پاکانە و درۆزە و سواڵکردن.

لڤین: لەمدواییانەدا ئازاد جوندیانی باسی لەوەکرد کە بۆ رێککەوتن و ئاشتەوایی لەگەڵ دابڕاو و ئەوانەی کە کشاونەتەوە، دەبێت پێشمەرج بۆ رێککەوتن و گەڕانەوە دابنرێت، ئەمەتان پێ قبوڵە؟

ئاوات شێخ جەناب: من نەمبیستووە یەکێتی پێشمەرجی هەبێت لەسەر حیزبە نەیارەکاننە لەسەر ئاستی کوردستان و نە لەسەر ئاستی عێراق، نەك نەیار بگرە لەگەڵ دوژمنەکانیشدا، ئەم پێشمەرجە بیدعەی کاك ئازادە، ئەگەر کاك ئازادە مەرجی هەبێت، نەك یەکێتی، ئەوە دەبێت ئێمە لەسەر دەستی لایەنێکی بێلایەنی وەك حیزبێکی سۆسیال دیموکرات بەڵێن وەربگرین، تاجارێکی تر لەهەڵبژاردنی یەکێتیدا، دەسەڵاتی گشتی، پارەی گشتی، ئاسایش و هەواڵگری و زانیاری و فەرماندەی عەشایەر و شتی تر بۆ بەرژەوەندی دەستەگەری بەکارنەهێنرێت.

– ئاوات جەناب نوری، ساڵی ١٩٥٨ لەدایکبووە، لەساڵی ١٩٧٤ بووەتە کۆمەڵە.

– لەدروستکردنی شانە سەرەتاییەکانی یەکێتی و مەفرەزە سەرەتاییەکان و خوێندکاراندا بەشداربووە، ساڵی ١٩٧٨ بووەتە پێشمەرگە.

– ساڵی ١٩٧٩ دەستگیرکراوە و بەلەسێدارەدان حوکمدراوە، دواتر لەبڕیاری لێبوردنی ١٩٧٩/٨/١٦ دا ئازادکراوە.

– چەندین پلەی پێشمەرگایەتی بڕیوە، لەوانە: ئامر هێزی قەرەداخ و ئەندامی لەشکری سلێمانی و بەرپرسی لیوای تایبەتی سلێمانی.

– لەکاروباری حکومی و ئیداریشدا، پۆستی جۆراوجۆری وەرگرتووە، دووجار بووەتە قایمقامی سلێمانی، ماوەیەك بریکاری وەزیری گەیاندن بووە، بۆ ماوەی دوو ساڵیش، بەڕێوەبەری ئیدراەی مەکتەبی سیاسیی بووە.

– کۆلێژی یاسای زانکۆی سلێمانی تەواوکردووە.

– دوا کاری حیزبی، بەرپرسی مەڵبەندی گەرمیانی یەکێتی بووە، لەهەڵبژاردنەکانی یەکێتی، نوێنەری باڵی ریفۆرم بووە، بەڵام دوای دەرنەچوونی لەکاری رێکخستن و حیزبی دابڕاوە.

## محەمەدی حاجی مەحمود: نەوشیروان مستەفا بۆ شەڕ هاتبوو، کەچی کە گرتمان ووتی هاتووم دایکم ژنم بۆ بهێنێت

گفتوگۆی دلێر عەبدوڵڵا

لەم چاوپێکەوتنەدا، محەمەدی حاجی مەحمود سکرتێری حیزبی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان، وەڵامی چەند پرسیارێك دەداتەوە لەسەر لەسەر کتێبەکەی (رۆژژمێری پێشمەرگەیەك)، لەوێشەوە وەڵامی چەند پرسیارێك دەداتەوە سەبارەت بەهەندێك زانیاری کە لەکتێبەکەیدا ئاماژەی پێنەداون، باسی ئەو سەردەمە دەکات کە هێشتا ئەندامێکی یەکێتی بووە، دواتر باسی وازهێنانی خۆی لە یەکێتی دەکات، کە زۆرتریش وەك دەرکردن وابووە، لەمیانەی وەڵامدانەوەی پرسیارەکانیشدا، باسی ئەوە دەکات کە ئەو یەکەم فیشەکی شۆڕشی نوێی تەقاندووە، محەمەدی حاجی مەحمود ئاماژە بەوە دەکات کە سەرقاڵی بەرگی چوارەم و پێنجەم وشەشەمی یاداشتەکانیەتی و لەماوەیەکی نزیکیشدا، یەك بەدوای یەك بڵاویاندەکاتەوە.

لڤین: بیرۆکەی نوسینی کتێبی (رۆژژمێری پێشمەرگەیەك) چۆن سەریهەڵدا؟

محەمەدی حاجی مەحمود: لەدوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلول و دروستبوونەوەی هێزی پێشمەرگە و شۆڕشی نوێوە، کاتێك چوومە دەرەوە بۆ پێشمەرگایەتی، ئەوسا بیرم لەوە دەکردەوە کە چواردە ساڵ شۆڕش کراوە، بۆچی شتێك لەبارەیەوە نەنوسراوە، لەبارەی شۆڕشەوە لەهەر کەسێکت دەپرسی، هیچی نەدەزانی، ئەوە یەکێك بوو لەو هۆیانەی کە بووە پاڵنەر بۆ نوسینی یاداشتەکە، هۆیەکی تر ئەوە بوو کاتێك شۆڕشمان دەستپێکردەوە، خەڵك وایدەزانی ئاسنی سارد دەکوتین، وایاندەزانی پاش هەرەسی شۆڕش ئیتر کەس هیچ شتێکی پێناکرێت، خەڵك هەبوو وایاندەزانی ئێمە کە چوینەتە دەرەوە، لەبەر قاچاخچێتی یان لەبەرئەوەی لە خزمەتی سەربازی هەڵاتووین، یان خاوەن موڵك بووین و لێمان داگیرکراوە، لەوانەیە ئێستاش خەڵك هەبێت وا

بیرکاتەوە، لەبەرئەوە من کەهاتم بۆ شاخ، هەوڵمدا هەموو شتەکانی خۆم بنوسمەوە بخەمە بەردەستی خەڵك تا بزانن چی روویداوە و چی روونەداوە، لەیەکەم رۆژەوە کە من چوومە شاخ موفەکەرە و کاغەز و شتی لەو جۆرەم ئامادەکردبوو، دەستمکرد بەنوسینەوەی شتەکانی خۆم، بڕیارمدا چی روودەدات و چی دەکرێت، وەك خۆی بینوسمەوە، کاتی خۆشی من رۆمانەکانی (عەزیز نەسین و یەشار کەمال و مەکسیم گۆرکی) یم خوێندبووەوە، دەمبینی عەزیز نەسین دەڵێت: لە فلان شوێن وەستام، سووتووی جگەرەکەم تەکاند و فڕێمدا، ئیتر لێرەوە بیرم لەوە کردەوە کە جاری وا هەیە زەلامێك (١٠) کەس دەکوژێت، بۆچی نەینووسم، گوندێك دەسوتێت، بۆچی رووداوی سوتانەکەی نەنوسمەوە؟ خوێندنەوەی ئەوانە هانیدام بیر لەوە بکەمەوە منیش شتێك بنووسم و راستی و دروستیی ژیانی خۆم و شۆڕشەکەم بخەمە پێش چاو.

لڤین: چۆن یاداشتەکانت دەنوسیەوە، چۆنیشت دەپاراستن، چونکە پاراستنی ئەو شتانە لەو سەردەمەدا زۆر دژوار بوو؟

محەمەدی حاجی مەحمود: رۆژانە یاداشتەکانی خۆمم دەنوسیەوە، یاداشتی یەك ساڵم دەهێنا و لەناو نایلۆنێکدا دەمشاردەوە، لەژێر یان پەنای بەردێکدا دامدەنا، بە پێشمەرگەکانم دەوت: ئەگەر من کوژرام شتەکانم لێرەدایە، کۆیبکەنەوە و بیدەنە فلانە نووسەر، ئەوەش بۆ ئەوە بوو نەفەوتێت و بلاوبکرێتەوە، ئەو کات لەنوسەرەکانیش مامۆستا عەلادین سەجادی لەژیاندا مابوو، هەروەها کەمال مەزهەر و دکتۆر عیزەدین مستەفا رەسوڵ، بە پێشمەرگەکانم وت: بیدەنە ئەو نوسەرانە، بۆ ئەوەی سبەینێ کە من نەمام یان کوژرام، خەڵك بزانێت شۆڕش چۆن بووە و چۆن کراوە و چی روویداوە؟ چونکە لەوانەیە نەوەی ئێستا باوەڕ بەهەندێك رووداو نەکات کە لەشۆڕشدا روویداوە، هەندێك شت هەیە کە لەشاخ روویداوە، ئەگەر ئەو کەسانەی ئەوکات لە شاخ لەگەڵم بوون، ئێستا نەمانایە، رەنگە نەمتوانیایە لەئێستادا بیانگێڕمەوە، چونکە کەس بڕوام پێناکات، شتێکی گرنگ کە من بڕیارمدا

[خ]ۆی بکەمەوە و لەدوا رۆژدا سودی لێببینم، کۆکردنەوەی ئەو نامانە بووکە بۆم [د]ەهات، هەرچەندە زەحمەتیش بوو، بەڵام من گوێم پێنەدەدا و دەمزانی لەپاشەڕۆژدا سوودی هەیە، ئەو نامە گرنگانەی کە خۆشم دەمنووسین بۆ کەسانی تر، نوسخەی کۆپییەکم لە هەموویان لەلای خۆم گلدەدایەوە، هەموو ئەو نامانەی کە بۆم هاتوون و ئەوانەشی کە دەمناردن، کۆمکردونەتەوە، لەم بن بەرد بۆ ئەو بن بەرد، لەولا بۆ ئەولا لەگەڵ خۆم بردوومن، ئەوەندە زۆر بوون، کاتێ وا هەبوو باری دوو ئێستر دەبوون، دەمخستنە ناو شەش حەوت فەردە و دەمخستنە سەر ئێسترەکان، خەڵك وایدەزانی پارەیە، بۆ نموونە دەیانوت ئەوە سەری مانگە و موچە وەردەگرین، وایاندەزانی موچە دەدەین، بەڵام لەڕاستیدا هەمووی کاغەز بوو نەك پارە، هەرچەندە بەلای منەوە لەپارە گرنگتربوون، لەساڵی (١٩٧٧) حکومەت هێرشێکی گەورەی بۆ سەر سورێن ئەنجامدا، هەموو نامەکان کەوتنە ژێر داروپەردووی رەبایەکانەوە، بەڵام من ئەویێم بەجێنەهێشت تا هەموو نامە و کاغەزەکانم دەرهێنایەوە و بەشێکی تریشم هەر لەوێ دانابوو، ئەوانیشم کۆکردەوە و هێنامنەوە.

لڤین: لە (رۆژژمێری پێشمەرگەیەك) دا چەندین رووداو و بەسەرهاتی ناخۆشت گێڕاوەتەوە کە دواتر بوون بەهۆی سەرهەڵدانی چەندین کێشە و شەڕ و ناخۆشی، ئایا لە کاتی نوسینی ئەو کتێبەدا بیرت لەوە نەکردبووەوە؟

محەمەدی حاجی مەحمود: من پێموایە دەبێت مرۆڤ هەمیشە واقیعی بێت، واتە راستگۆ بێت، دەبێت شتەکان لەراستی لانەدەین و وەك خۆی باسی بکەین، من کاتی خۆی زۆرم هەوڵداوە کە کەسێك شیاوی کوشتن نەبێت، نەکوژرێت، بەڵام دوای بەبێ ئاگاداری من کوژراوە، بۆچی دەبێت من ئەمە باس نەکەم؟ لەوانەیە کەسێکی تر تاوانبار بکرێت، ئینجا بۆ ئەوەی خەڵك بزانێت کێ کوشتوویەتی، چەندین جاریش هەبووە کە کوشتنەکە بەهۆی لەدەستدەرچوونەوە بووە، بۆ نموونە: جارێك شتێکی لەوجۆرە روویدا، بەو پێشمەرگەیەی کە گوللەکەی لەدەست دەرچوو بوو، وتم: بڕۆ خوێنەکەی بدە، بەڵام بەقسەی نەکردم و فەرامۆشی کرد، ئیتر بۆچی من ئەوە

[illegible] نەکەم، چونکە لەوانەیە دوای بڵێن فلان یان فیسار کەس کوشتوویەتی، هەروەها بۆ ئەوەی بکوژەکان بەگێلم نەزانن و وانەزانن من بێئاگام، من ژمارەیەکی زۆر لە پێشمەرگەم لەگەڵدا بووە، ڕەنگە کەسوکاری کوژراوەکە وابزانن من کوشتوومە، ئیتر بۆ ئەوەی من تاوانبار نەکرێم، ناوی تەواوی بکوژەکانم نوسیوە.

لڤین: ئێوە پێشتر بەشێك بوون لەیەکێتی نیشتیمانی کوردستان و پاشتر جیابوونەوە، بەڵام تۆ لەکتێبەکەتدا ئاماژەت بەو جیابوونەوەیە نەکردووە، ئەگەر پێتباشە دەمانەوێت لێرەدا باسی بکەن؟

محەمەدی حاجی مەحمود: من وەك بیروباوەڕ، هەڵگری فیکری دیموکراتیم، ئێمە لەسەرەتادا زیاتر لەگەڵ کۆمەڵەدا پەیوەندیمان هەبوو، بەڵام وەك فیکر، من زیاتر قەناعەتم بە بزوتنەوە هەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا من بیروباوەڕێکی تایبەتیی خۆمم هەبوو و بۆچوونی تایبەتیم هەبوو لەسەر ئەوانە، ئێمە لەسەرەتاوە تا ساڵی (١٩٧٩-١٩٨٠) لەگەڵ یەکێتی نیشتیمانی کوردستان ئیشمانکرد، دوای ئەوە هەندێك گیروگرفت ڕوویدا، ئێمە لە هەموو شوێنەکانی کوردستاندا هەبووین، لە شارەزوور، هەورامان، شلێر و شارباژێڕ، هەرێمێکمان هەبوو تا ناوچەی چوارتا، هەر ناوچەیەك هێزی پێویست بووایە، ئێمە بەهانایەوە دەچووین، یەکێتی هیچ پاساوێکی نەبوو لەبەرامبەر ئێمە، تەنها ئەوە نەبێت کە دەیانوت خەڵك وا هەست دەکەن یەکێتی لەگەڵ ئێوەدایە، نەك ئێوە لەگەڵ یەکێتی،ئەوان بەوشێوەیە بیریان دەکردەوە، ئینجا لەو کاتەشدا یەکێتی یەکگرتوو نەبوو، مامە جەلال لێرە نەبوو، لەوکاتەدا بوو هەواڵم بیست کە یەکێتی بەیاننامەیەکی لەسەر دەرکردوین و تیایدا دەڵێن ئەوانە پەیوەندیان بەئێمەوە نەماوە، هەروەها لەبەیاننامەکەدا نوسرابوو ئەوانە دز و جەردە و ڕێگر و پیاوخراپن، ئێمە ڕۆژی پێشتر قارەمان و نەبەرد بووین، بەڵام دواتر بوینە دز و جەردە و ڕێگر، ئیتر بەو شێوەیە لە حیزب دوریانخستینەوە.

لڤین: ئێوە هێزێکی گەورەو بەهێزی یەکێتی بوون، هۆکاری چی بوو دوورخرانەوە و دەرکران؟

محەمەدی حاجی مەحمود: ویستیان لەو ڕێگەیەوە لاوازمان بکەن و میللەت لێمان هەستێت، هەر بۆیە ئیعلانی شەڕیان لە دژی ئێمە کرد، بەڵام ئێمە خۆمان لەناوچەکەدا بووین، خۆمان هێزمان دروست کردبوو، میللەتیش لەگەڵ ئێمە بوو، ئەندامی سەرکردایەتی وا هەبوو (١٠) کەسی بۆ کۆنەدەکرایەوە، من (٣٥٠) کەسم لەگەڵ بوو، بەوپێیەی لە ناوچەکەدا ناسرابووم، هەروەها زوو زوو دەستمان لە حکومەت دەوەشاند، ڕۆژی وابوو سێ جار شەڕمان لەدژی حکومەت دەکرد، خەڵکیش ئەوکاتە کەسێکی خۆشدەویست کە لەدژی حکومەت شەڕ بکات.

لقین: پاش بەیاننامەکەی یەکێتی، ئێوە چیتان کرد؟ مانەوە یان جیابوونەوە؟

محەمەدی حاجی مەحمود: تا ماوەیەکیش هەر بەناوی یەکێتییەوە قسەمان دەکرد، بەڵام لەو ماوەیەدا، کۆمەڵێك کادرمان لەلایەن یەکێتییەوە دەستگیرکران، پاش ئەوەی لای یەکێتی دەربازبوون، ڕایانکردە لای حیزبی سۆسیالیستی کوردستان (حسك)، ئێمە بەتەنیا ماینەوە، لەگەڵ ئێران نێوانمان باش نەبوو، دژی حکومەتی عێراق دەجەنگاین و یەکێتیش ئیعلانی شەڕی لەدژمان کردبوو، تا نزیکەی سێ مانگ بەو حاڵەوە ماینەوە، ئەو برادەرانەی کە لەزیندانی یەکێتی هەڵاتبوون و بۆلای حیزبی سۆسیالیس چووبوون، لەگەڵ کۆمەڵێك برادەری (حسك)، کە پێکهاتبوون لە: تایەری عەلی والی و شیروان شیروەندی و قادر جەباری و کاك ڕەسوڵ مامەند، نامەیان بۆناردین وتیان ئێمە ناڵێین ببە بە (حسك)، بەڵام پێمانخۆشە پەیوەندیمان هەبێت و ئەگەر پێشتخۆشە هێزێك دەنێرین بۆ لات، منیش دوای مانگێك وەڵامم دانەوە و وتم: با هێزێك بێتە لام، پاشان هێزێکیان نارد کە پێکهاتبوون لە هێزێکی (١٧٠) کەسی و ئەوانەی پێشتر ناومهێنان، سەرپەرەشتیان دەکرد لەگەڵ کاك عوسمانی قالە منەوەر، ماوەیەك هەروا پێکەوەبووین، پاشان کۆبونەوەیان لەگەڵ کردم و وتیان تۆ ببە بە بەرپرسی هێزەکەی ئێمەش، تا ئەو کاتە هەر سەربەخۆ بووم، تەنها هاوکاری ئەوانم دەکرد، کاتێك یەکێتی بەمەیزانی، زۆر تەنگیان پێهەڵچنین، دواتر شەڕیان لەگەڵ کردین و وازیان لێنەدەهێناین، هەرئەوەش وای لێکرد بیر لەوە

بکەمەوە پەیوەندی لەگەڵ (حسك) ببەستم، ئەوان وتیان: تۆ چی دەڵێیت ئێمە [illegible]اين و ئامادەین بیکەین. من وتم: ئێمە هیچمان ناوێت، مەسئولیەتمان ناوێت. ئەوەبوو (حسك) بەیانێکی دەرکرد و وتیان بۆ یەکەمجارە لەبەمۆ و شارەزوور و هەورامانەوە تا دەگاتە دەشتی هەولێر و خۆشناوەتی لەژێر دەسەڵاتیدا بێت، ئەوەبوو بوومە ئەندامی (حسك) و لە کۆنگرەدا وەك ئەندامی یەدەك هەڵبژێردرام، لەگەڵ ئەوەی لە کۆی (١١٢) دەنگ، (٧١) دەنگم بەدەستهێنا، کەچی ئەندامی وا هەبوو (٥٣-٥٤) دەنگی هەبوو، کرا بەئەندامی سەرکردایەتی، دوای شەهیدبوونی سەیدا ساڵح ویسف-یش، کرامە ئەندامی سەرکردایەتی، دواتریش بوومە ئەندامی مەکتەبی سیاسی و بەرپرسی مەکتەبی عەسکەری.

لڤین: بەشێکی زۆری یاداشتەکانت بریتییە لە باسکردنی کێشە و ململانێکانی ناو شۆڕش، بەتایبەت کێشە و ململانێکانی نێوان خۆت و سەرکردەکانی ئەو کاتەی یەکێتی، ئەم کێشانە چۆن سەریانهەڵدا؟

محەمەدی حاجی مەحمود: بێگومان لەناو شۆڕشدا شەڕ روویداوە، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی هەموو خەڵکی لە ناو شۆڕشدا خەباتیان کردووە و تێکۆشەر بوون، بەڵام سەبارەت بە من، ئەوا رەنگە من گیرخواردبێت بەدەستی ئەوانەوە نەك بەپێچەوانەوە، لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕناکەم رۆژێك لەرۆژان من کەسیانم ئازاردابێت، من بەشبەحاڵی خۆم زیاتر تەرکیزم کردووەتە سەر دوژمن، بەڵام ئەگەر کەسێك ویستبێتی رێگر بێت لەو خەباتەم، زۆر ئاسان بووە بەلامەوە کە پاکسازییان بکەم و لەناویانبەرم، یەکێتی لەرادیۆ ئیعلانی شەڕی لەدژمان کرد و وتی ئەوانە یاخیبوون، کاك مەلا بەختیار نامەیەکی نارد، بەمن دەڵێت: تۆ هیچ مەجالێکت نییە، یان دەبێت تەسلیمی ئێران بیت، یان دەبێت تەسلیمی عێراق بیت، یان دەبێت تەسلیمی ئێمە بیت، منیش وتم: تۆ ناڵێیت هیچ مەجالێکت نییە و دەبێت تەسلیم بیتەوە؟ ئەوا من دێم بۆلای ئێوە، ئەگەر راستدەکەن مەڕۆن و رامەکەن، کاك نەوشیروانیش نامەیەکی نارد بۆ کاك تایەر، وتبووی چەند کەسێکی ئێمە لای ئێوە دەستگیرکراون، ئەگەر بەرینەدەن

ری سەرتاسەری لەدژتان رادەگەیەنین، من سەیری نامەکەم کرد کە کاک کەمال شاکر هێنابووی، شەڕەکان لەوەێوە دەستیانپێکرد، ئەوان هەڕەشەیان لێدەکردین و سەرەنجام هاتنەسەریشمان، لەگەڵ ئەوەی چەندان گوندمان چۆڵکرد لەپێناوی ئەوەی نەیەنە سەرمان، بەڵام هەر هاتن، کۆڵیان نەئەدا و هاتنە سەرمان، شەڕمان دەستپێکرد و ئەوان شکان، هەندێکیان خۆیان شاردەوە و هەندێکیشیان گیران، کە کاک نەوشیروان مستەفا یەکێك بوو لەوانە، هەرچەندە ئەو بیانوی دەهێنایەوە و دەیوت: من بۆشەڕ نەهاتووم بۆلای دایکم هاتووم ژنم بۆ بهێنێت. بەڵام ئێمە گوێمان بەقسەکانی نەدا و گرتمان، ئەو بۆشەڕ هاتبوو، بەڵام ئەوە بەهانەیەك بوو کە لەو کاتەدا بەکاریدەهێنا.

لڤین: هەڵوێستتان لەگەڵ گیراوەکاندا چۆن بوو؟

محەمەدی حاجی مەحمود: هیچ جۆرە ئازارێکمان نەدابوون، هەتا حکومەت کاغەزێکی بۆ ناردین لەسەر شەڕی ناوخۆ، من بەکاك نەوشیروانم وت وەڵامیبدەرەوە.

لڤین: لەیاداشتەکەتدا ئاماژە بەوە دەکەیت کە مامەڵەتان توندبووە لەگەڵیاندا؟

محەمەدی حاجی مەحمود: کاك قادر جەباری و کاك تاهیر توندبوون لەگەڵێدا، چونکە ئەوان لەسلێمانی بە (ئارپی جی) لە ماڵی کاك تاهیریان دا، بۆیە توندبوون، بەڵام من وانەبووم.

لڤین: ئەگەر بەپێچەوانەوە ئێوە بکەوتنایە دەستی ئەوان، چارەنوستان چی دەبوو؟

محەمەدی حاجی مەحمود: بەدڵنیاییەوە ئیعدامیان دەکردین، مەگەر لەرۆژی جەژندا عەبدوڵڵا سوور و مام ئاراس- یان لەگەڵ نۆ کەسی تردا ئیعدام نەکرد؟!

لڤین: نەوشیروان مستەفا چەند رۆژ لاتان مایەوە؟

محەمەدی حاجی مەحمود: مانگێك و دوو رۆژ لامان سجن بوو، تەعامولیشمان پێکەوە باش بوو.

لڤین: چۆن ئازادتان کرد؟

محەمەدی حاجی مەحمود: کاک شێخ کاوەی شێخ لەتیف و برادەرانی حیزبی شیوعی رزیانکرد و ئێمەش تەسلیم بە واتمان کردەوە.



لڤین: یەکێتی تەنها لەدژی ئێوە ئەو هەڵمەتەیان ئەنجامدا؟

محەمەدی حاجی مەحمود: جگە لە پارتی، لەشکری ئیسلامییش بەدەست یەکێتییەوە تەفروتونابوون، ئەوان کۆتاییان بەلەشکری ئیسلامی هێنا و زۆریان لێکوشتن.

لڤین: لەبەشی بەڵگەنامەکانی یاداشتەکەتدا نامەیەکی کاک نەوشیروان مستەفا دەبینرێت، لەبڕگەیەکدا دەڵێت: گوێ بەقسەی ناحەز مەدە، ئەمە پێش گیرانەکە یان پاش ئەوەیە؟

محەمەدی حاجی مەحمود: نا، ئەوە دوای گیرانەکەیە، کاتێ ئاشتبوونەوەی گشتی نێوان ئێمە و یەکێتی نیشتیمانی بوو، پێشتر مام جەلال نامەی بۆ ناردم، کاک شەوکەتیش بەهەمان شێوە، ئەوەی کاک نەوشیروانیش بەهەمان شێوە لەوجۆرە نامانە بوو، ئەو کاتە ئاڵای شۆڕش لە یەکێتی جیابووەوە، یەکێتی نامەی نارد و داوایانکرد رێکبکەوین و یارمەتی ئاڵای شۆڕش نەدەین، کاک نەوشیروانیش نامەی ناردو و وتی: گوێ لەقسەی کەس مەگرە، ئێمە هاوڕێ و هاوخەباتی کۆنین و دەبێت کێشەکان وەلاوە بنێین، ئێمەش بەدەم داواکەی ئەوانەوە چووین و رێککەوتنێکی سەرتاسەریمان ئەنجامدا، کەپاشتر بووە بەردی بناغەی ئاشتبوونەوەی نێوان لایەنەکانی تر.

لڤین: بەپێی یاداشتەکانت بێت ئێوەش لەو هەڵمەتە، دژی لەشکری ئیسلامیی بوونەتەوە؟

محەمەدی حاجی مەحمود: ئێمە لەسەرەتاوە پەیوەندی و هاوکاریمان لەگەڵ لەشکری ئیسلامی هەبوو، بەڵام دەچوون لەگەڵ لایەنی تر پەیوەندیان دروستدەکرد و دژی ئێمە قسەیان دەکرد، بۆیە ئێمەش کۆمەڵێك چەکدارمان بەدیل گرت کە ژمارەیان نزیکەی (١٥٠) کەسێك دەبوو، ئێمە کەسمان لێنەکوشتن، تەنها ئەوە نەبێت چەکمان کردن.

لڤین: لە یاداشتەکانتدا چەندین نامەی شەوکەتی حاجی موشیر دەبینرێت، ئەوەش

[illegible]دەخات پەیوەندیتان توندوتۆڵ بووە، لەناو خەڵکیشدا دەوترێت محەمەدی حاجی [illegible] و شەوکەتی حاجی موشیر لەسەر یەکەمین تەقەی شۆڕش بەشەڕ هاتوون؟ ئەم باسە چۆنە؟

محەمەدی حاجی مەحمود: هەموو کەس دەزانێت یەکەم تەقەی شۆڕشی نوێ لەشەوی (٢٦-٢٧/ ١٩٧٦/٧) لەلایەن منەوە کرا، ئەوکات حامیدی حاجی غالی و تۆفیق رەحیم و کاك رۆستەم و شەهید رەئووف لەگەڵم بوون، بۆ زانیاریشتان ئێمە لە (١٩٧٦/٦/٢٦) چووینە شاخ، ئەوکات مەفرەزەیەکی حکومەت بە ناوچەکەدا تێپەڕی و من تەقەم لێکرد، کاك شەوکەت لەماڵەوە بوو، ئیجازەی وەرگرتبوو، بەشایەتی ئەوانەی سەرەوە من یەکەم تەقەم کردووە لەدژی حکومەت.

لڤین: وەك ئاگادارین لەئێستادا سەرقاڵی ئامادەکردنی بەرگی چوارەمی یاداشتەکانتیت، بەنیازیت بەم زووانە بڵاویبکەیتەوە؟

محەمەدی حاجی مەحمود: بەڵێ، ئێستا سەرقاڵی بەرگی چوارەمم و نزیکەی سێ سەد لاپەڕەیەکیم لێ تەواو کردووە، جگە لەوەش بەرگی پێنجەم و شەشەمیشم ئامادەیە و چەندین بەڵگەنامەی گرنگ و نهێنی لەخۆگرتووە.

**سەعیدی ئەحمەد پیرە بۆ لڤین" لەگەڵ بڵاوکردنەوە یاداشتەکانی نەوشیروان مستەفادا نیم، نابێت مێژووی یەکێتی هەڕاجبکرێت"**

**سەعدی ئەحمەد پیرە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان لەچاوپیپچکەوتنێکی لڤیندا نیگەرانی خۆی لەبڵاوکردنەوەی یاداشتەکانی شەڕی ناوخۆ لەلایەن نەوشیروان مستەفاوە دەردەبڕێت و ئاماژە بەوەش دەکات کە ئەگەر کار بگاتە ئاشکراکردنی دیکۆمێنتەکانی شەڕی ناوخۆ، ئەوا بێگومان دیکۆمێنتی تریش هەیە.**

گفتوگۆی: مەحمود یاسین کوردی

سەعدی ئەحمەد پیرە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی یەکێتی کە ڕێککەوتنی ستراتیژی نێوان ئەوان و پارتی هیچ گۆڕانکارییەکی تێدا کرابێت، وتی "بەگوێرەی ڕێککەوتنی ستراتیژی کە لە ١/١٢/٢٠٠٧ دا مۆرکرا، پۆستی سەرۆك کۆمار بۆ یەکێتی دەبێت و پۆستی سەرۆکی هەرێم بۆ پارتی دەبێت، هەروەها ڕێژەی کورسییەکانی پەرلەمان وەك یەك دابەشدەکرێن و یەکێتیش تەنیا یەك لیست دەبێت لەگەڵ پارتی، هەرکەسێکیش لەدەرەوەی یەکێتی لیستی هەبێت یەکێتی نییە."

دەربارەی ئەگەری سازشکردنی یەکێتی بۆ پارتی لەسەرۆکایەتی هەرێم و حکومەتبەهۆی جیابوونەوەی نەوشیروان مستەفاوە و ترسی پارتی لەبردنی دەنگەکانی یەکێتی بۆ لیستی گۆڕان لە سەر حسابی پارتی، سەعدی ئەحمەد پیرە وتی" ئێمە دۆست و لایەنگری خۆمان دڵنیادەکەینەوە کە سەرۆکی خولی داهاتووی حکومەت بەدڵنیاییەوە یەکێتی دەبێت، بەگوێرەی ڕێککەوتنی ستراتیژی بەتێکڕای دەنگی هەردوولامان، تەنیا یەکێتیش مافی وەرگرتنی پۆستی سەرۆکی حکومەتی دەبێت."

پیرە جەختیشی لەسەر ئەوە کردەوە وەکو ئیستحقاقی ئینتیخابی یەکێتی مافی

وەرگرتنی ئەو پۆستەی هەبوو، بەڵام بەهۆی تەواونەکردنی پرۆژەکانەوە یەکێتی بە باشی زانی کاك نێچیرڤان بەردەوام بێت لەپۆستەکەی.

لەبەشێکی تری دیمانەکەدا سەعدی پیرە سەبارەت بەجیابوونەوەی نەوشیروان مستەفا و چوار سەرکردەی باڵی ریفۆرم و چارەنوسی ئەو ئەندامانەی سەرکردایەتی وتی "ئەوان دۆست و برادەری ئێمەن و حورمەتیان دەگرین، ئەوان ئازادن لەوەی ناتوانن بیروبۆچوونەکانیان لەناو یەکێتی دەربڕن، دەتوانن بچن حیزب دابمەزرێنن، بۆیە مانەوەی ئەوان بەدەستی خۆیانە، چونکە لەپلینیۆم بڕیاری کۆتایی لەسەر بەشداریکردنی ئەو هەڤاڵانە دەدرێت."

سەعدی پیرە ددانی بەوەدا نا کە لیستەکەی نەوشیروان دەنگی یەکێتی بۆخۆی دەبات و وتی "نەك ئەو لیستە، بەڵکو زۆربەی لیستەکانی تر دەنگی یەکێتی و پارتی دەبەن، بەڵام بەتەنیا دەنگی یەکێتی نابەن، چونکە خەڵك هەیە توڕەیە، دەنگ بەیەکێتی و پارتی نادا و دەچێت دەنگ بەوان دەدات، گرنگ نییە ئەم یان ئەو کورسییە زیاتر دەهێنن، گرنگ ئەوەیە پرۆسەی هەڵبژاردن سەربکەوێت ورووی گەشی دیموکراسی بۆ دەرەوە دەربکەوێ."

ئەو ئەندامەی مەکتەبی سیاسیی یەکێتی گەندەڵی و رۆتین و بردنی سامانی دەوڵەتی لەلایەن ئەو دوو حیزبەوە رەتکردەوە وسەبارەت بەوتەی عومەری سەید عەلی کە باسی لەوە کردبوو یەکێتی و پارتی مانگانە هەریەکە و ٣٥ ملیۆن دۆلار لەبودجەی حکومەت \دەبەن، سەعدی پیرە دەڵێ "ئەو قسەیەی کاك عومەر دیارە مەبەستی چییە. ئێستا پێگەی ئەویش یەکلابووەتەوە، بۆیە ئەو قسانە بەشێکە لەهەڵمەتی هەڵبژاردن."

پیرە لەکاتێکدا بەبێ دوودڵی ئەوە رەتدەکاتەوە کە مانگانە ئەو برە پارەیەی لە حکومەت وەربگرن، کەچی مەلا بەختیاری وتەبێژی مەکتەبی سیاسیی یەکێتی لەدیمانەیەکی رۆژنامەی ئاوێنەدا دەڵێت: ئەو پارەیەی کە مانگانە یەکێتی و پارتی لەحکومەتی وەردەگرن لە ٣٠ ملیۆن دۆلار کەمتر نییە.

سەعدی پیرە ئاماژە بەوە دەکات "حکومەتی هەرێم بەتایبەتی یەکێتی و [illegible] ناوچەیەکی بەرفراوانی کوردی خزمەت دەکەن کەپێی دەوترێت ناوچە جێناکۆکەکان، ئەمانەش خزمەتگوزاری و پرۆژەیان پێشکەشکراوە، ڕەنگە لەدەمی ئەم سێ پارێزگایەمان گرتبێتەوە بۆ ئەو ناوچانە، ئەمەش پێی نالێن گەندەڵی، ئەم قسانەش تەنها بۆ دروستکردنی نارەزای خەڵکە، قەناعەتیشم بەوە نییە لەسەر چەند کورسییەك دامودەزگاکانی دەوڵەت زەربی سفر بکرێن."

سەبارەت بەلێدوانەکانی مەلا بەختیاریش کە وتبووی "یەکێتی توشی موفاجەئە بوو کاتێك نەوشیروان مستەفا بڕیاریدا بەلیستی جیا بەشداری هەڵبژاردنەکان بکات"، سەعدی پیرە دەڵێت"نەوەڵا هیچ توشی موفاجەئە نەبووم، چونکە هەموو ئەو بلاوکراوانەی لە کۆمپانیای وشەوە دەردەچوونبە ئاڕاستەی ڕەخنەگرتن بوو لەکارەکانی حکومەت، بەتایبەتی یەکێتی، زۆربەی کارەکانیشیان بەوە دەستپێدەکرد کە خەڵك هان بدەن لەچەشنی ٣٥ ملیۆنەکەی کاك عومەری سەید عەلی، بۆیە ئێمە پەشیمان نین لە هاوکاری کۆمپانیای وشە وەکو دەزگایەکی ڕاگەیاندن، بەلام ئەگەر بێتە لایەنێکی سیاسی، ئەوا یارمەتی دەدەینە دەزگا ڕاگەیاندنەکانی خۆمان."

لەم چەند هەفتەی ڕابردوودا ئازاد جوندیانیی بەرپرسی ڕاگەیاندنی یەکێتی بەزنجیرە وتارێك زۆربەی گرفتەکانی ناو یەکێتیی خستە ئەستۆی نەوشیروان مستەفا و بەو دێڕە کۆتایی پێهینا " بۆچی نەوشیروان ئەم هەموو غەدرەی لەیەکێتی کرد؟"، سەعدی پیرە لەوەڵامدا دەڵێ " کاك نەوشیروان غەدر لە یەکێتی ناکات ئەگەر لەدەرەوەی یەکێتی ئیشی خۆی بکات و لیستی هەبێت، بەلام لەناو یەکێتیدا بێت و لیستی جیاوازیشی هەبێت، ئەمە غەدرە، چونکە ئەمە پێچەوانەی هەموو پەیڕە و پرۆگرامێکی سیاسییە، چۆن دەبێت لەناو حیزبدا دوو لیست هەبن."

لەبەرامبەر بلاوکردنەوە یاداشتەکانی شەڕی ناوخۆدا لەلایەن نەوشیروانەوە و کاردانەوەی کتێبی (خەون یان مۆتەکە)، لەناو یەکێتی و شەقامی کوردیدائەگەری ئاڕاستەبوونی باردودۆخی هەرێم بەرەو توندوتیژی، بەتایبەتی کە نەوشیروان لە

یاداشتەکانیدا بەڵگەی زۆر نهێنی دەخاتەڕوو، ئەو ئەندامەی مەکتەبی سیاسیی یەکێتی ری" هەمووومان بەرپرسیاررین لەمێژووی خۆمان و بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد، زرۆ ئاساییە هەڵەی گەورە و شەڕی ناوخۆ و تاوان و کوشتنیش کرابێت، لەگەڵ ولاتانی دراوسێ گفتوگۆمان کردبێت، بەلام ناکرێت ئەمڕۆ خۆت لەژێر بەرپرسیارێتی دەربهێنی و بلێی من بێتاوانم، بۆیە هەریەکە و بەگوێرەی پێگەی خۆی بەرپرسیارێتی مێژوویی هەڵدەگرێت، بۆیە پێم باش نییە بەبلاوکردنەوەی ئەو یاداشتە لەلایەن کاك نەوشیروانەوە، مێژووی یەکێتی هەڕاجبکەین."

ئەو ئەندامەی مەکتەبی سیاسیی یەکێتی دەڵێت " کاك نەوشیروان پیاوێکی خوێندەوارە و مێژووی یەکێتی باش دەزانێت، بەلام هیچ کەس بەبێ بەرپرسیارێتی نەبووە لەناو یەکێتیدا، نەوشیروان فەرماندەی پێشمەرگە بووە لە ناوچەیەك یان لەشوێنێك، چۆن دەکرێت ئەمڕۆ بلێی فلانەکەس بڕیارەکەی لەمن وەرنەگرتووە! سەعدی وتیشی "هەر گۆڕێکیش هەڵبدەیەوە جێ پەنجەی هەمووانی پێوە دیارە، کەس نییە بلێ من بێتاوانم و پشکی هەیە، بۆیە مام جەلال داوای لە راگەیاندنەکانی یەکێتی کردووە زمانی زبر بەکارنەهێنن."

ئەو ئەندامەی مەکتەبی سیاسیی یەکێتی راشکاوانە باسی لەوە کرد ئەگەر کاربگاتە ئاشکراکردنی دیکۆمێنتی شەڕی ناوخۆ، دیکۆمێنتی تریش هەیە، بەلام ئەمە بەشێکە لە قۆناغێکی دیاریکراوی خەباتی گەلێك، هیچ دیکۆمێنتێکیش شەخسی نییە، ئێمە و هەموو هەڤالانی مەکتەبی سیاسیی نیگەران بووین بەبلاوکردنەوەی ئەو دیکۆمێنتانە لەلایەن کاك نەوشیروانەوە بە تایبەتی خودی مام جەلال، ئەو دەستپێشخەرییەی کاك نەوشیروانیش باش بوو، کاتێك بابەتەکانی راگرت، سەعدی پیرە ئەوەی بۆ لڤین روونکردەوە کە مامە جەلال داوای لە نەوشیروان کردووە کتێبەکەی رابگرێت.

لەوەلامی پرسیارێکی لڤیندا کەتوندکردنی هەڵمەتی راگەیاندن لەلایەن یەکێتی و بەتایبەت مەلا بەختیار و هاتنە ناوەیهەندێك کۆنە شیوعییەکانی ناو پارتی بۆ گەرمکردنی ئەو شەڕە، کە ئەمەش وای لە نەوشیروان کرد کاردانەوەی هەبێت،

سەعدی ئەحمەد پیرە دەڵێت "هیچ گروپێك ناڵێت من خراپم، هەمیشە بەرامبەرەکەی [illegible]ردەکات، کاتێکیش بەرامبەرەکەی وەڵامیدەداتەوە ئینجا بارودۆخەکە بەرەو گرژی دەچێت، رۆژنامە و گۆڤارە حیزبییەکان زۆر لە بەناو ئەهلییەکان نەرمترن، بەڵام سەبارەت بەو کەسانەی لەدەرەوەی یەکێتین، ئەمڕۆ هاتونەتە ناو باسەکە و هەڵێکیان بۆ رەخساوە، نوسینی توند لەدژی کاك نەوشیروان دەنوسن و هەموو بەزیانی یەکێتییە، یەکێتی خۆی دەزانێت چۆن سیاسەتی راگەیاندن دەکات و پێویستی بەکەس نییە، یەکێتی داوای هاوکاری لەهیچ کەسێك نەکردووە بەنوسین بارودۆخەکە ئاڵۆزتر بکات؟"

لە دوایین چاوپێکەوتنی نەوشیروان مستەفادا لەگەڵ گۆڤاری لڤین، باسی لەنەبوونی دەسەڵاتی جێگرەکانی تاڵەبانی کردبوو لەناو یەکێتی، سەعدی پیرە دەڵێ "کاك نەوشیروان یەکێك بوو لەو کەسانەی زۆرترین دەسەلاتی هەبووە، زۆرجارانیش وەکو هاورێ مامەڵەی کردووە بەهۆی ئەوەی لەمام جەلالەوە نزیك بووە، بۆیە من لەگەڵ ئەو قسانەی کاك نەوشیروان نیم."

سەعدی پیرە بەتوندی ئەو قسانەی رەتکردەوە کە باس لە تەحویلکردنی یەکێتی دەکەن بۆ حیزبێکی بنەماڵەیی، بەتایبەتی دەسەڵاتی هێرۆخان و کورەکانی وئەو وتی"ئێمە چەندین سەنتەری رۆشنبیری و کۆمەڵایەتیمان هەیە، یەکێك لەو سەنتەرانە هێرۆخان بەرێوەی دەبات، خۆ ئەمەش کفر نییە، لەهەمانکاتدا هێرۆخان پێشمەرگەیەکی دێرین و کچی پیاوێکی رۆشنبیر و سیاسیی گەورەی کوردە. لەکۆی ئەم هەموو نوێنەرایەتییەی یەکێتی و حکومەت تەنیا یەك نوێنەر ناوی قوباد تاڵەبانییە، ئەویش بەهەوڵ و توانای خۆی گەیشتووەتە ئەو شوێنە، تائێستاش لەناو هیچ کێشەیەکی یەکێتیدا نەپشکی هەبووە و نەتێکەڵیش دەبێت، تەنانەت پەیوەندی زۆر باشی لەگەڵ ئەو کەسانەدا هەیە کە کێشەیان لەگەڵ یەکێتیدا هەیە، خوداش دەتانگرێ ئەگەر قوباد تێکەڵی ئەو کێشەیە بکەن."

پیرە رەتیکردەوە کە کورەکانی تاڵەبانی و کۆسرەت رەسوڵ لە کۆنگرەی داهاتوودا

نشێرنه سەرکردایەتییەوە و وتی"هیچ شتێکی لەم بابەتە لەئارادا نییە، بەلام ئەمە مانای ئەوە نییە کە ژنەکانی ئێمە نەزۆك بن و منلەکانمان سزابدرێن، لەبەرئەوە باوکیان پۆستی سیاسیی هەیە، ئەگەر لەکۆنگرە خەلك دەنگییێدان ئەوا ئاساییە بێنە سەرکردایەتی، بەلام هیچ بەرنامەیەك نییە بۆ تەعینکردنی کوڕی هیچ بەرپرسێك."

سەبارەت بەداهاتی یەکێتی و شەفافیەت، سەعدی پیرە ئاماژەی بەوەکرد زەقکردنەوەی ئەم بابەتە بەشێکە لەهەلمەتی هەلبژاردن وتی " ئێمە بودجە لەحکومەت وەردەگرین، بەگوێرەی ئیستحقاقی ئینتیخابی و کورسییەکانمان لەپەرلەمان، لەگەلّ ئەو کۆمپانیایانەی سەر بە یەکێتین، ئەمەش مافێکی خۆمانە، بۆنموونە کۆمپانیای نۆکان، حیزب دەتوانێ بازرگانی بکات، بەلام دوور لە قۆرخکاری و نایاسایی، دەرگاش لەبەردەم چاودێری دارایی یان هەر ئەندامێکی یەکێتی کراوەیە دەتوانێ لەکۆنگرە لێکۆلّینەوە لەبارەی چۆنیەتی پەیداکردن و سەرفکردنی ئەو پارانە بکات."

لەدواین بەشی دیمانەکەیدا سەعدی ئەحمەد پیرە لەسەر هەردوو دەزگای زانیاری و پاراستن قسە دەکات، دەلّێت" هیچ دەزگایەك شەرعیەتی نییە ئەگەر سەر بەحکومەت نەبێت بەهەردوو دەزگای زانیاری و پاراستنیشەوە، یاساش بۆ هیچ لەم دوو دەزگایە لەپەرلەمان دەرنەچووە، ئێستا ئەو دوو دەزگایە هاوکاری حکومەت دەکەن بۆ پێشکەشکردنی زانیاری، بەلام لە ئلایندەیەکی نزیکدا ئەو دوو دەزگایە یەکدەگرنەوە بۆ پێکهێنانی دەزگایەکی هەوالگریی نیشتیمانی لەژێر دەسەلاتی حکومەتی هەرێمدا."

**لڤین- ژمارە ٧٢ -٢٠٠٨/٨/١**

**شاڵاوی عەلی عەسکەری: ئێمە کاك نەوشیروان بە کوێخای خۆمان دەزانین**

**گەرچی زۆرینەی بەرپرسە باڵاکانی یەکێتی نکولی لەبوونی تەکەتولات و شێواوی دۆخی یەکێتی ناکەن، بەڵام شاڵاوی عەلی عەسکەری ئەم دۆخەی یەکێتی بەئیجابی وەسفدەکات و ئەوەش رەتدەکاتەوە کە ململانێی سەرکردەکان لەسەر فیکر بێت، بەڵکو تەنها بەمەسەلەیەکی شەخسی لێکیدەداتەوە، ئەو پێیوایە ئێستاشی لەگەڵ بێت یەکێتی لە پارتی پێشکەووترە.**

گفتوگۆی هەردی مەهدی و عەزیز رەئوف

شاڵاوی عەلی عەسکەری وەزیری پێشووی کشتوکاڵی حکومەتی هەرێم (ئیدارەی سلێمانی) و ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستانە، کوڕی سەرکردەی دیاری دەستە یەکەمینەکانی پارتی دیموکرات و دامەزرێنەری یەکێتییە، کە لەکارەساتی شەڕی براکوژی هەکاریدا لەلایەن پارتییەوە لەگەڵ دەستەیەك لە سەرکردە کاراکانی یەکێتیدا کوژرا.

شاڵاو عەلی گەرچی ئیستا لە پۆستێکی دیاریکراوا نییە تەنها سەرکردایەتی یەکێتی نەبێت، وەك خۆشی دەڵێت سەر بەهیچ باڵ و تەکەتولێکی ناو یەکێتی نییە، وەك دەڵێت " لەهیچ باڵێکی ناو یەکێتیدا نەبووم چونکە ئیمانم بەهیچیان نەبوو، ئیمانم بە دیالۆگی راستەوخۆیە، لەهەموو باڵەکانیشەوە نزیکم، مام جەلالم خۆشدەوێت رەنگە لەجێی باوکم بێت، کاك نەوشیروانیش لەجێگەی مامە، هاتوچۆی زۆربەشیان دەکەم."

ئەو ئەندامەی سەرکردایەتی، پێچەوانەی بەرپرسەکانی تر و تەنانەت سکرتێر و جێگرەکانی یەکێتیش، پێیوایە " گەرچی زۆرکەس بە رەشبینی دۆخی یەکێتی دەبینن، بەڵام من بەپێچەوانەوە شتەکان دەبینم، چونکە یەکێتی رێکخستنێك نەبووە قوڵای مێژوویی هەبوبێت."

ناوبراو وای بۆ دەچێت کە یەکێتی بەردەوام جێگیر نەبووە، تەنانەت ڕێکخستنێکی جەماوەریشی نەبووە، لەوبارەیەوە باس لەسەردەمی یەکێتی شاخ دەکات و دەڵێت: "لەناو یەکێتیدا تەنزیمان هەبوو، خۆیانیان کردبوو بە مارکسی، کە من ڕۆژێك لەڕۆژان مارکسی نەبووم و باوەڕم پێینەبووە، بەڵام دەبینیت ئێمە لەحیزبێکی مارکسی – ماوی بووین بەلینینی، بووین بەشتی تر، یانی یەکێتی لەگەڵ دۆخەکە و ڕەوڕەوەی دنیادا هاتووە."

شاڵاو عەسکەری پێیوایە کە دۆخەکە بەوشێوەیە نییە کە خەڵك باسی دەکات کە شێواو بێت و یەکێتی شپرزە کردبێت، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو نایشارێتەوە کە دەبێت یەکێتی گۆڕانی بەسەردا بێت، " یەکێتی ئێستا لەو قۆناغەدایە کە دەبێت بگۆڕێت و بەقەناعەتی من ئێستا ئەو گۆڕانەی بەسەردا دێت، چونکە بەرنامە ئایدۆلۆجی نەما، بەرنامەکەت دەبێت بەرنامەی خزمەتگوزاری بێت." لەبارەی دژەکانی ئەو گۆڕانەشەوە کە لەناو یەکێتیدا دەنگی جیاواز بەرامبەر ئالوگۆڕەکانی یەکێتی دەبینرێت، ناوبراو وتی: " لەم قۆناغی گۆڕانەی یەکێتیدا کە ڕوودەدات، یەکێتی خەڵکی تیایە دژە، خەڵکی تیایە سەری سوڕماوە کە لە چ حاڵەتێکدا بێت، ئایا دژ بێت یان لەگەڵ بێت؟ هەروەها خەڵکیش هەیە لەبەرژەوەندییەکانی دەدرێت، لەبەرئەوە دژ دەبێت."

ئەو ئەندامەی سەرکردایەتی یەکێتی کە دێتە سەر باسی جیاوازی یەکێتی و پارتی، هێما بۆ ئەوە دەکات کە جیاوازییەکی ئەوتۆ نەماوە لەڕووی بیری سیاسییانەوە، وەك دەڵێت: " من کە ئەندامی سەرکردایەتیم، هیچ جیاوازییەکی وا لەنێوان خۆمان و پارتی نابینم لەڕووی ئایدۆلۆژییەوە، ئێستا ململانێکە بووەتە خزمەتکردنی خەڵك، کێمان ئیدارەی دۆخی خەڵك باشتر دەکەین؟" بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێیوایە کە یەکێتی هەمان هێزی جارانە و ئێستاش لە پارتی بەبەهێزتری دەزانێت، گەر واش نەبووایە بەوتەی خۆی ڕیزەکانی یەکێتی جێدەهێشت، "یەکێتی پێشکەوتووترە لەپارتی بۆیە هەڵمبژاردووە، بەشبەحاڵی خۆم ئەم قۆناغەی یەکێتی و دۆخەکەی

ـم بەدڵە، چونکە بەرەو باشییە."

شالاو عەسکەری پێشتر ئاماژەی بەوەدا کە ڕەوڕەوەی گۆڕان و ڕەوتی مێژوو ئەم جیاوازییەی ناو یەکێتی دروستکردووە، بۆیە شتێکی ئاساییە، بەڵام وەك دەبینرێت پارتی تووشی ئەم کێشەیە نەهاتووە، لەکاتێکدا حیزبێکی کۆنترە، لەبارەی ئەوەی گەر مەسەلەی گۆڕانی پرۆسەی سیاسیی کوردستان ئەوەی پێویست کردبێت کە یەکێتی بشلەقێت، ئەی بۆچی پارتی ڕیکخراوتر دەردەکەوێت؟ شالاو ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە " من بۆچوونم وانییە کە پارتیش بەو جۆرە بێت، مەرج نییە بەڵام ڕەنگە مەرکەزیەتی زیاتری تێدابێت."

ناوبراو گومان دەکات لەوەی پارتی تووشی پەشێوی نەهاتبێت و دەپرسێت: کێ دەڵێ پارتی باڵباڵێنی تیا نییە؟ سەیری جەوهەر نامیق بکە لە وتارەکانیدا چی دەنوسێت، سەیری هەڵسوکەوتی نێچیرڤان بارزانی بکە، ئایا ئەمانە هەموو نیشانەی بەرەو ریفۆرم و گۆڕان نییە؟ بەڵام ئەو شڵەقانەی لەناو یەکێتیدا زوتر دەستیپێکرد، لەناو پارتی درەنگتر دەستپێدەکات."

ئەو ئەندامەی سەرکردایەتی کەدێتە سەر باسی باڵی ریفۆرم لەناو یەکێتیدا، رایەکی جیاوازی لێدەبینرێت، ئەو پێیوانییە شتێك بەناوی ریفۆرمەوە لەئارادا بێت، چونکە گەروابوایە کاك نەوشیروانیان جێنەدەهێشت، وەك دەڵێت: " باشە گەر مەسەلەکە ریفۆرمە، زۆربەی ئەو کەسانە لەگەڵ نەوشیروان مستەفا نەبوون؟ لەگەڵ کاك نەوشیرواندا ئیمزایان نەکرد؟ ئەی بۆچی جیابوونەوە؟."

سەبارەت بەو تۆمەتانەی کە سەرکردەکانی یەکێتی لە ڕاگەیاندنەکاندا ئاراستەی یەکتری دەکەن، ناوبراو دەڵێت: "من ئەو قسانەی بەرپرسەکانی یەکێتیم پێناخۆشە، ئەوان ڕووبەڕوو گفتوگۆ ناکەن و دێن لەگۆڤارەکەی ئێوە قسە بەرامبەر بەیەك دەکەن، من پێش ئەوەی بێمە گۆڤارەکەی تۆ ڕووبەڕوو گفتوگۆ لەگەڵ بەرامبەرەکەمدا دەکەم نەك ناڕاستەوخۆ، ئەو ئسلوبانەم پێ ناخۆشە." بەڵام لەهەموو ئەو حاڵەتانەشدا شالاوی عەلی عەسکەری دێتەوە سەر قسەکەی پێشووی و پێیوایە

هەموو شتەکان دیوی سلبی و ئیجابییان هەیە و بۆ یەکێتیش هەروا، لەمەشدا نموونە لە شۆڕشی ئەیلول و ڕۆڵی پارتی دەهێنێتەوە و دەڵێت" شۆڕشی ئەیلول کە هەموومان شانازی پێوە دەکەین و باوکی من یەکێك بوو لە دروستکەرانی، ئەو شۆڕشە هیچ پەیوەندی بەشۆڕشەوە نەبووە، ئاغا و دەرەبەگەکانِ هاتن دەربەندی بازیانیان گرت دژی ئیسلاحی زەراعی و پارتی قۆستییەوە، گەرچی ئەو ئیسلاحە زیانی مادیی لەئێمە داو زۆرێك لە زەوییەکانمان لێسەندرا، بەڵام خۆ ئیسلاحی زەراعی تەنها زیانی نەبووە، قازانجیشی تیابووە."

شالاو عەسکەری لەبارەی، گفتوگۆکانی ناوخۆی یەکێتی و پەیوەندییەکانی نێوان دوو باڵە سەرەکییەکە، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە هەمیشە پەیوەندیی نێوان مام جەلال و نەوشیروان مستەفا بەهێزبووە و بەبێ یەك نەیانکراوە، وەك دەڵێت: " لە گەرمەی ناخۆشییەکاندا باوەڕم وابووە نەوشیروان مستەفا هەرگیز لەژیانیدا شتێك لەخەیاڵیدا نەبووە کە مام جەلال لابدات و خۆی بچێتە شوێنەکەی، هەرگیز لەخەیاڵیشیدا نابێت." هەمانکات ئەوەش دەڵێت : "گەر مەسەلە ریفۆرم بێت کەس بەهێندەی مام جەلال لەگەڵ ریفۆرمدا نییە، بەڵام بۆچوونەکان جیاوازن." سەبارەت بە ئەگەری گەڕانەوەی نەوشیروان مستەفاش بۆ ناو یەکێتی و دوا گفتوگۆکان، دەڵێت: " نەوشیروان مستەفا خۆی خۆی بەجێگری سکرتێری یەکێتی نازانێت، بەڵام مانای وانییە من بەلێپرسراوی خۆمی نازانم، زۆربەی برادەران نەوشیروان مستەفا بەلێپرسراوی خۆیان دەزانن." هەروەها زیاتر لەسەر ئەو بابەتە دەڕوات و سورە لەسەر ئەوەی کە نەوشیروان مستەفا لەدڵیاندا هەروەك جارانە، بۆیە دەڵێت: " کاك نەوشیروان گەر خۆشی بەکوێخا نەزانێت، بەڵام دەیان و سەدانی وەك ئێمە لەناو یەکێتیدا بەکوێخای خۆمانی دەزانین، ئەمەش تەنها قسەی من نییە قسەی زۆربەیانە."

لەوەش زیاتر ئەو ڕاگەیاندنە توندەکانی باڵەکانی یەکێتی بەرامبەر یەکتر و ململانێکانیان بەشتێکی شەخسی بەرپرسەکان دەزانێت و دەڵێت: " قسە و ڕاگەیاندنەکانی کاك نەوشیروان و مەلا بەختیار و ئەو برادەرانە مەسەلەیەکی

سیه، مەلا بەختیار وەك شەخس قسەی كردووە نەك وەك وتەبێژی مەكتەبی ی." ئەمەشی بۆ نەبوونی ستراتیژێك گەڕاندەوە، كە یەكێتی پێویستێتی، "هەركەسە و لە مەوقیعی خۆی و بەپێی رەئی خۆی قسەدەكات، بەڕاشكاوی پێتبڵێم ئێمە (یەكێتی) ی ستراتیژمام نییە." لەگەڵ ئەو مەسەلانەشدا پێیوایە "دەبێت یەكێتی لەم شێوە كلاسیكییەی كە تێیدایەتی و تێیدا بووە، نەمێنێت."

سەبارەت بە بیری سیاسی حیزبەكەی و مەسەلەی سۆسیال دیموكرات بوونی یەكێتی ، ناوبراو رەخنە لەهەندێك بەرپرسی ناو یەكێتی دەگرێت و پێیوایە لەسەردەمی نەمانی كۆمەڵەوە یەكێتی فیكری تیا نەماوە، ئەو دەڵێت: "سۆسیال دیموكرات چییە؟ ئێستاش برادەرانی ئێمە وادەزانن ئیشتیراكیی دیموكراتییە، كاكە سۆسیال دیموكرات بەشێكە لە ئیشتراكی دیموكراتی، بەڵام ئیشتراكیی دیموكراتی نییە، سۆسیال و سۆسیالیزم دوو شتی جیاوازن، ئەویان كۆمەڵایەتییە ئەویان ئیشتراكییە، یەكێتی لەدوای نەمانی كۆمەڵەوە ئەو فیكرەی نەما تا خەڵك بۆی روون بێت چیمان هەیە."

شالاو عەلی سەبارەت بەنیگەرانبوونی جەماوەری یەكێتی و وازهێنانیان، نیگەران نییە و دەڵێت: " ئێمە خەڵكمان هەیە، گەرچی ململانێشمان هەیە، بەڵام ئێستاش وەك جاران، گەر بەیانی وەكو پێشمەرگە كۆنەكان كە تڕۆ كرابوون، بەڵام كاتێك دەبوو بەشەڕ، یەكسەر خۆیان دەبەست و بەخۆیان و مەخزەن وكلاشنۆفەكەیانەوە دەهاتنەوە پێش مەڵبەند."

سەبارەت بە ئەگەری بەستنی كۆنگرەش، پێیوایە ئێستا كاتی كۆنگرە نییە، چونكە دۆخی یەكێتی لەبار نییە و كێشەی زۆرە، ئەگەر زۆربەی بۆچوونەكان لەیەك نزیك نەبن نابێت بكرێت، چونكە كۆنگرە بۆ چییە؟ بۆ سەركەوتن دەكرێت، دەبێت لە كۆنگرەدا بەرەو داهاتوو ئیش بكەین نەك رابردوو، پرۆژەیەكمان كردووە و فاشیلە ئەوە رۆیشت، تازە بیری لێ مەكەرەوە."

شالاو عەسكەری كە دێتە سەر باسی رێككەوتنی ستراتیژی و پەیوەندییەكانی یەكێتی و پارتی، دەڵێت: "رێككەوتنی ستراتیژی گەر بۆ نەهێشتنی ئۆپۆزسیۆنی ئەم دوو

خێرە بێت بە رای من شتێکی خراپە." بەڵام گەر بۆ ئەوە نەبێت ئەوا شتێکی پێویستە، تا کوردستان دۆخی ئاڵۆز و راگوزەری تێپەڕێنێت، چونکە "مێژووی پارتی و یەکێتی مێژوویەکی تاڵ و شیرینە، جاری وا هەبووە لە پارتی و یەکێتی نەك گۆشتی یەکمان خواردووە، بەڵکو ئێسقانی یەکیشمان خوارد."

لەبارەی ئەدای حکومەتی هەرێم و نیگەرانی هاولاتیانیشەوە. ئاماژە بەوە دەکات حکومەت تەنها دیوی سلبی نییە، ئیجابیاتیشی هەیە،" بۆ نموونە لە ئەنفال سلبیتر هەبووە بۆ کورد، بەڵام لەدوای ئەنفال دارستان و ئاسك و بزنە کێوی و ژیانی وشکانیمان بۆ گەڕایەوە، چونکە لەو ناوچەیە هەموویان لەنێوان ئێمە و حکومەت حەسر ببوون، بۆیە ئیجابیاتیشی هەبووە، بەڵام کە پرۆسەی ئازادی هاتە ئاراوە هەموویانمان کوشت، کەواتە ئەو شوێنە موحەرەمەیە شتێکی ئیجابی بوو بۆ توێژێکی تر." بەڵام بۆ نیگەرانی هاولاتیان و کەموکوڕیی حکومەت و چارەسەری تورەیی هاولاتیان، پێیوایە "دەبێت حکومەت شەفافیەتی هەبێت، حکومەتەکەمان شەفاف نییە، دەبێت حکومەت بودجە و وردەکاری بلاوبکاتەوە و رای خەڵکیش وەربگرێت."

سەبارەت بە بودجەی حیزبەکان و بودجەی یەکێتی، ئەو ئەندامەی سەرکردایەتی بێئاگایی نیشاندا و وتی: "بەراستی منیش بودجەی حیزب نازانم، چونکە بەلامەوە پارە شتێکی تافیهە."

شالاو عەلی عەسکەری گەرچی کەرکوکییە و هاوکات ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتیشە و سیاسییەکانی حیزبەکەی (١٤٠) یان ئیمزاکردووە، سەبارەت بە کەرکوك رایەکی تری هەیە و دەڵێت: "من بۆخۆم لەگەڵ جێبەجێکردنی مادەی (١٤٠) دا نیم، گەر مسۆگەر نەبێت کەرکوك دێتەوە سەر هەرێمی کوردستان، چونکە کەلار و کفری و خانەقین و مەندەلی و سەعدیە و ئاکرێ و شێخان و مەخموور، ئەمانە کەنەیەنەوە سەر کوردستان، کەواتە زەرەرمانە، کە کەرکوك نەیەتەوە بۆ ئەمانەش بدۆڕێنین." بۆیە دەڵێت: " گەر کەلار بچێتە سەر کەرکوك،

پێویست ناکات ئێمه بیری حازر لـه کەلار لـێبدەین و ئەویش نەیەتەوە سەر کوردستان."

لـەدوا تەوەری قسەکانیدا، شاڵاو عەلی عەسکەری سەبارەت بەپرسیاری پەیوەندییەکانی ئێستای بنەماڵـەکەیان لـەگەڵ پارتیدا و قسەکردنیان لـەبارەی کوژرانی عەلی عەسکەری باوکیانەوە لـە هەکاری دەڵێت: "ئێمە حەقی عەلی عەسکەری بە پارە نازانین، بەڵام ساڵی (١٩٩٣) کاك مەسعود هاتە ماڵی باوکم و لـەوێ دانیشتین و عومەری سەید عەلی و مولازم عومەر و ئەوانیش وەك یەکێتی لـەوێ بوون، کاك مەسعود داوای لـێبوردنی کرد، سێ جاریش وتی خوا وەکیل من وەك مەسعود بارزانی ئاگام لـێنییە. منیش هەمیشە وتوومە ئێمە عەبایەکمان بەسەر ئەو مەسەلـەیەدا داوەتەوە و هەڵـینادەینەوە، چونکە وا من توانیم مەسعود بارزانی بکوژمەوە، دەی بۆ کوێ و دوای ئەوە چی؟ بەکوشتن ناگەینە ئەنجام."

**ڕۆژنامەی هاوڵاتی ژمارە ٥٨٠ ی ڕۆژی چوارشەممە ٢٠٠٩/١١/٢٥**

## ئەودیو ئەو مێژووەی کە مام جەلال باسی دەکات

هەڤاڵ کوێستانی

دوای چاوەڕوانیەکی دوورودرێژ بۆ بەستنی کۆنگرە، چەند ڕۆژێك لەمەوبەر یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، پلینیۆمێکی دیکەشی بەست، ڕەنگە لەدەرفەتێکی تردا لەسەر زۆر لایەنی ئەو پلینیۆمە بنوسم، بەڵام ئەوەی لەم نوسینە کورتەدا مەبەستمە قسەی لەسەر بکەم، هێرش و تۆمەتەکانی مام جەلالە بۆسەر کاك نەوشیروان. ئەوەش تەنیا لەبەرئەوەیە ئەگەر مێژووی ئەو قۆناغە نوسرایەوە، با دیوەکەی تریشی لەبەرچاو بێ.

لە ئاکامی ئەو شکستە گەورەیەی لە هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی کوردستاندا بەسەر یەکێتی هات، لۆژیك ئەوە بوو، هەرچەندە جێی چاوەڕوانیش نەبوو، کە مام جەلال و زۆرێك لە ئەندامە باڵادەستەکانی ناو یەکێتی خۆیان بە بەرپرسی ئەو شکستە زانیبا و دەستلەکارکێشانەوەی خۆیان ڕاگەیاندبا، کلتووری ژیانی ناو پارتە دیموکرات و سۆسیال دیموکراتەکان وایە، ئەو کارەکتەرانەی، لەپێش هەمووشیانەوە سەرۆکی حیزب، لەوێستگەیەکدا کە حیزبەکەیان توشی نوچدان و شکست دەبێ، ئەوان لەباتی ئەوەی پاکانە بۆ ڕۆڵی خۆیان بکەن و ئۆباڵی بخەنە ئەستۆی ئەوانی دی، بەجورئەتەوە بەرپرسیارێتی شکستەکە دەخەنە ئەستۆی خۆیان و بەحورمەتیشەوە دەست لەبەرپرسیارێتی و پۆستەکانیان دەکێشنەوە، لەوێوە ڕێگا بۆ ئەو کارەکتەرانە خۆش دەکەن بێنە پێشەوە کە ئومێدێکیان بۆ هەستانەوەی پارتەکەیان تێدا بەدی دەکرێ، ئەو کارەکتەرانەی کە بەرپرسیارێتی ڕاستەوخۆی شکستەکەیان لە ئەستۆدایە و لەژێر ڕابەرایەتی ئەواندا حیزب گەیشتووەتە ئەو داچوونە، ناکرێ ببنەوە بە فاکتەری هەستانەوەی حیزبەکەیان، ئاخر لەکوێ، بەدارو پەردووی خانوویەکی داڕوخاو، بینای باڵەخانەیەکی تازە هەڵدەچندرێ ! ئاخر یەکێتی چۆن دەتوانێ بەرنامەی هەستانەوە دابڕێژێ، لەکاتێکدا ئەوانەی بانگەشەی هەستانەوەکە دەکەن، هەر خۆیان سەرقافڵەی شکستەکە بوون و هەر خۆشیان ماکی زۆربەی دەردەکانی

نەکێنە ! ئەوانەی کە ئێستا لەناو حیزبدا جڵەو بەدەستن، نەك ئەوانەی لێی دەرچوون، سەرچاوەی کێشە قوڵەکانی یەکێتین ! کەچی مام جەلال دێ و لە پلینیۆمی یەکێتیدا، لەنیوەی زیاتری راپۆرتە سی وپێنج دەقیقەییەکەی ، بۆ تۆمەتدانە پاڵ کاك نەوشیروان و هێرشکردنە سەر بزوتنەوەی گۆڕان تەرخان دەکات.

مام جەلال و کاك نەوشیروان بۆ چل ساڵ هاوڕێ و هاوخەبات بوون. حەتمەن خەڵك کە ئەو هەموو ساڵە دووروودرێژانە پێکەوە کاربکەن، هەزاران شتی وردو درشت، ئاشکراو نهێنی ، دەبنە مێژووی پێکەوە گرێدانیان، خۆ ئەگەر لەشوێنێکدا یان لە دووڕیانێکدا ئەو خەڵکانە لێکدابڕان، دەبێ ئاکاری سیاسییان رێگەیان پێنەدا، چاکەکان بۆ خۆیان بنوسن و خراپەکانیش لە ملی هاوڕێکانی دوێنێیان بئاڵێنن. ئەگەر وا نەکەن رچەیەکی خراپ بۆ نەهێشتنی متمانەی نێوان هاوخەباتان، دەشکێنن و دەبێتە سەرەتایەکی ترسناکیش بۆ هەڵتەکاندنی متمانە و کارێکی وا دەکات هەر کەسە بەچاوی ترس و گوومان سەیری هاوسەنگەرەکەی بکات.

ئەو تۆمەتانەی مام جەلال سەبارەت بە قۆناغێکن کە بەدرێژای ئەو قۆناغە و تائێستاش هەر خۆی سکرتێری گشتی یەکێتی نیشتیمانی بووە و بڕیاردان لەهەر مەسەلەیەکی گرنگدا، یان زۆرجار ناگرنگیشدا هەر بۆ مام جەلال گەڕاوەتەوە.

جا بڕیارەکە پەیوەندی بەشەڕەوە هەبوبێ یان بە مفاوەزە و ئاشتییەوە، جا ئەوەی کە جێی نیگەرانیە لەو وتارەی مام جەلالدا، ئەوەیە هەر بۆ دزێوکردنی وێنەی کاك نەوشیروان و بۆ داپۆشینی هەقیقەت و سۆنگەی شکستەکانی یەکێتی، هاتووە و خەتێکی راست و چەپێ بەسەر بەشێکی زۆر لە خەباتی یەکێتیدا هێناوە، مام جەلال کە دێت شەڕە ناوخۆییەکانی نیوەی دووەمی حەفتاکان و نیوەی یەکەمی هەشتاکان لەشەڕی پشت ئاشان کۆدەکاتەوە و لەوەش زیاتر کە بەرپرسیاریەتیەکەی دەخاتە ئەستۆی کاك نەوشیراوان، ئەوە لەکاتێکدا شەڕە ناوخۆییەکانی ئەو دە ساڵەی یەکێتی دژ بە هێزەکانی تر، میراتی و درێژبوونەوەی ناکۆکی و شەڕەکانی شەستەکانی نێوان جەلالی و- مەلایی بوو، بەشکڵێکی وا شەڕی ناوخۆ ببوە

بەتایبەکی قۆناغەکە و هەموو یاریکەرەکانی سەر گۆڕەپانی سیاسی کوردستانی ڕابردووەوە، دەکرێ لایەنێکی شەڕی ناوخۆ لەلایەنێکی تری بەرپرسیاریتی زیاتری هەبوبێ لە هەریەك لەو شەڕە ناوخۆیانەدا، بەلام لایەنێك بە تەنیا بەرپرسیار نییە و هەموو لایەنەکان هەریەکە و بەگوێرە خۆیان، پشکی بەرپرسیارێتیان لەو شەڕانەدا هەبووە، من پێموایە وەك چۆن مام جەلال لەو کۆبونەوانەیدا کە هێزی پێشمەرگەی ڕەوانەی بەرەی جەنگی پشت ئاشان دەکرد، هەولی دەدا ڕەوایی هەلوێستی یەکێتی و ناڕەوایی هەلوێستی ئەوانی دی بۆ پێشمەرگەکان ڕوونکاتەوە و جۆش و خرۆشی دەدانەبەر و داوای لێدەکردن کە دەستیان نەپارێزن و ڕەحم بەو... نەکەن.

بەلێ من پێموایە وەك چۆن مام جەلال ئەوەی کردووە، بەدووری نازانم کە سەرکردەی حیزب و هێزەکانی بەرامبەریش بەهەمان دەستور و شێواز حەماسەتی هێزەکانی خۆیان بۆ شەڕی یەکێتی جولاندوە، پێشموایە ئەوەندەش بەرپرسیارێتیەکە بەر یەکێتی دەکەوێ، مام جەلال هەم بەحوکمی ئەوەی سکرتێری گشتی یەکێتی و فەرماندەی گشتی هێزی پێشمەرگەی کوردستانیش بووە و دوا بڕیاریش هەر بۆ ئەو گەڕاوەتەوە، هەم بەحوکمی ئەوەش پەتای ناکۆکییەکانی شەستەکان لەڕێی ئەوەوە بۆ ناو یەکێتی گوازراوەتەوە، بۆیە مام جەلال لەبەرپرسیارێتیەکەی یەکێتیدا، پشکی شێری بەردەکەوێ.

وێڕای ئەوەش، ئەو هەولەی مام جەلال بۆ تۆمەتبارکردنی کاك نەوشیروان لەو کێشەیەدا، لەدەرەنجامدا ئیدانەکردن و تۆمەتبارکردنی یەکێتی نیشتیمانی کوردستانە و پاکانەکردنێکی ئاشکراشە بۆ لایەنەکانی تری شەڕی ناوخۆ و پاککردنەوەیانە لەهەموو گوناهێکی شەڕی ناوخۆ، کە ئەمەش بۆ خۆی پیشاندانی دیوێکی نادروستی ئەو قۆناغەی مێژووە.

هەر لەو بەرنامەی تۆمەتبارکردنەی کاك نەوشیرواندا کە باس دێتە سەر کارەساتی هەلەبجە، هەر بەتۆمەتبارکردنی یەکێتییەوە ناوەستێ و بەلکو یەکێتی و هێزەکانی دی و هەموو کوردیش لە کیمیابارانی هەلەبجەدا خەتابار دەکات و لەبەرامبەریشدا

[illegible] و رژێمەکەی بێگوناح، بەوتەی مام جەلال بێ ، سەدام گوناهی نییە، چونکە [illegible] هۆشداری داوەتە هێزە کوردییەکان و پێیوتوون (لەهەر چالاکییەکدا پاسدارتان لەگەڵدا بێ، بەچەکی کیمیای لەو جێیە دەدەین)، بە قەولی عەرەبیش (بەخشراوە ئەوەی هۆشداریت دەداتێ).

باش بوو ئەو راپۆرتەی مام جەلال زۆر دوای دەستپێکردنی دادگایکردنی سەرانی بەعس هات لە کێشەی هەڵەبجەدا، دەنا دوور نەدەبوو کە پارێزەرانی تاوانبارانی کەیسی هەڵەبجە، ئەم راپۆرتەی مام جەلالیان، وەك بەڵگەیەکی گرنگ بۆ بێگوناحی تۆمەتباران بەکارهێنابا.

مام جەلال لە هەموان باشتر پەیوەندییەکانی نێوان یەکێتی و هێزەکانی تری ناو بەرەی کوردستانی لەگەڵ پاسداراندا دەزانێ، دەشزانێ زۆر پێش هەڵەبجە، پەیمانی ستراتیژی لە نێوانی یەکێتی و سوپای پاسدارانی ئێراندا ئیمزا کرابوو، دەشزانێ هەر لەدوای ئاشتبونەوەی گشتییەوە بەرنامەی کاری هاوبەشی بەرەی کوردستانی لەگەڵ سوپای پاسدارانی ئێراندا دەستپێکردووە، هەر لە ئەنجامی ئەوەشدا بوو کە زۆر بەر لە کارەساتی هەڵەبجە، مەفرەزەی پاسداران لە زۆر ناوچەی ژێردەستی پێشمەرگەدا دەبینران و پلانی هێرشی هاوبەشیان لەگەڵ پێشمەرگەدا بۆسەر بنکەکانی حکومەتی عێراقی دادەڕشت، دەشزانێ زۆر پێش هەڵەبجەش، حکومەتی عێراقی بەچەکی کیمیاوی لە هاولاتیانی چەندین ناوچەی داوە، وەك ناوچەکانی دۆڵی جافایەتی و کانی توو، شێخ وەسانان و زۆری تریش، خۆ ئەگەر لە ئاکامی ئەنفالەکاندا، هێزی پێشمەرگە لە ناوچە ئازادکراوەکان دەرنەپەڕێندرایە و دواتریش سەدام خۆی گیرۆدەی شەڕی کوێت نەکردایە، ئەوا بەدڵنیاییەوە زۆر ناوچە و شاری تریش بەر هێرشی کیمیایی دەکەوتن.

سەیرەکە لەوەدایە ئەوانەی ئێستا کە دەیانەوێ لایەنە کارەساتاویەکەی هەڵەبجە بدەنە پاڵ کاك نەوشیروان، هەر ئەوان بوون کە دوای دەنگدانەوەی جیهانی کارەساتی هەڵەبجە و راکێشانی سۆزی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی بەلای کورددا، هەر

ئەوان بوون لەچەندین بۆنە و شوێنی جیاجیا دەیانوت (ئەگەر چەند هەڵەبجەیەکی ترمان هەبا، ئەوا قەزیەی کورد لە دونیا باشتر دەناسرا)، تا هەڵەبجە لە مەیدانی سیاسەتدا کەرەسەیەکی بازرگانی گرنگ بوو، ئەوان خاوەنی هەڵەبجە بوون و خەڵکی تر نا.

هەر لە هەمان وتاردا لەشوێنێکی دیکەدا، مام جەلال کاك نەوشیروان بەوە تۆمەتباردەکات کە گوایا نامەی بۆ سەدام نوسیوە و بەسەرکردەی پێویست بۆ میللەتەمەی ناوی هێناوە، ئەگەر بەهەڵەدا نەچووبم مام جەلال مەبەستی لەو نامەیە کە لەوەڵامی نامەیەکی موکەڕەم تاڵەبانی نوسراوە، نامەکەی موکەڕەم تاڵەبانی بۆ هەر چوار حیزبەکەی بەرەی کوردستانی هاتبوو، لەوێدا بانگهێشتیان دەکا بۆ ئەوەی لەگەڵ حکومەتی عێراقیدا بکەونەوە دانوسانەوە، ئەوەندەی من ئاگام لێیێ یان بیستبێتم کاك نەوشیروان لەهیچ بۆنەیەکدا نە سەدامی بە (ناوبژیکار) ناوبردووە نە لەجەولەکانی دانوسانیشدا بەرانبەر بە وەفدی حکومەت دایشکاندووە، ئەوەتا تەنانەت کەسێکی وەك وەفیق سامەرائی لەکتێبێکدا کە دێتەسەر باسی گفتوگۆکانی حکومەتی عێراقی لەگەڵ وەفدی کوردیدا، باس لەوە دەکات کە نەوشیروان مستەفا لە هەموو ئەندامانی وەفدە کوردییەکە، زیاتر گفتوگۆی لەسەر بابەتەکان دەکرد و بەتوندیش داکۆکی لەداخوازییەکانی خۆیان دەکرد.

لەهێرشێکی دیکەدا، سەبارەت بەوانەی کە لەسەرەتای هەشتاکاندا لەناو شاری سلێمانی و هەندێ شوێنی تردا کوژراون، مام جەلال هەوڵیداوە بەرپرسیارێتی ئەوەش بخاتە ئەستۆی کاك نەوشیروان، ئەمە لەکاتێکدا کە لەساڵی ١٩٨٠دا دادگای شۆڕش دامەزراو مام جەلالیش سەرۆکی ئەو دادگایە بوو، ئیدی لەوێ بەدواوە، ئەگەر کەسێ بڕیاری کوشتنی درابێ بەبێ ئیمزا و بەبێ ڕەزامەندی مام جەلال نەبووە، خۆ ئەگەر ڕووداوی کوشتنێکیش لەپشتی دادگاوە ئەنجام درابێ، هەر ئەرك و بەرپرسیارێتی ئەو دادگا باڵایەی شۆڕش بووە کە لەبەدواداچوون و لێکۆڵینەوە لەو ڕووداوانە بکات و ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانیش ڕابگەیەنێ، بەڵام لەهەموو ئەو

[illegible]ی تەمەنی دادگادا شتێکی لەوجۆرەمان لەو دادگایە نەدی و نەبیست.
لە [illegible]ەیێکی دیکەشدا بەرامبەر بەکاك نەوشیروان، مام جەلال وای دەردەخا کە گوایە ئەمەریکییەکان لەسەردەمی شەڕی کوێتدا داوای هاوکاری چەکدارییان لەیەکێتی و پارتی کردووە، بەرامبەر بەدانی فیدراڵی بەکورد، بەڵام گوایە نەوشیروان مستەفا بەوە رازی نەبووە، ئەگەر ستراتیژی شەڕی ئەمەریکا لەشەڕی کوێتدا تەنیا دەرپەڕاندنی سوپای عێراقی بوبێت لە کوێت، هاوکاری هێزی پێشمەرگەی بۆچی بوو، ئەمە لەکاتێکدا هێزی پێشمەرگە هێزێکی لاواز و پەرش و بڵاوی ناو ئێران و سەرسنورەکانی ئێران بوو، لەوەش زیاتر جورج بووشی باوك لە دوای تەواوبوونی شەڕی کوێت لە شاشەی تەلەفزیۆنەکانەوە رایگەیاند (رووخانی حکومەتی عێراقی لەستراتیژیەتی ئەمەریکادا نەبووە).
سەبارەت بەو تۆمەتەش کە گوایە لەدوای وەستانی شەڕی چەند ساڵەی نێوان عێراق و ئێران، کاك نەوشیروان بڕوای بەشۆڕش نەماوە و ویستویەتی هێزی پێشمەرگە هەڵبوەشێنێتەوە، دیارە بەر لەدەستپێکردنی ئەنفالەکان مام جەلال لەو وڵاتە نەمابوو زۆریش دوای ئەنفالەکان گەڕایەوە، دەتوانم بڵێم لەماوەی ئەو دوو ساڵەدا، کاك نەوشیروان لەجیاتی مام جەلال سەرپەرەشتی رێکخستن و هێزی پێشمەرگەی دەکرد. لەو ماوەیەدا ئەنفال روویدا، هەڵەبجە و زۆر شوێنی تریش کیمیاباران کران، دەیان هەزار خەڵك بێسەروشوێن و سەدان هەزاریش ئاوارەی ئەم دیو و ئەو دیوی سنور بوون، من وەکو شایەتحاڵێکی ئەو سەردەمە، پێموایە ئەوە سەردەمی هەرە سەخت و دژواربوو کە یەکێتی پیا رەت دەبوو.
ئەو خەڵکانەی لەناو ئەنفال و لە کیمیابارن دەرباز ببون لەناوچە سنوریەکان و لە ئۆردوگاکانی پەنابەریدا گیرسابوونەوە، هێزی پێشمەرگە و بەرگری میللیش، تا ئەودیوی سنور پاشەکشەیان کردبوو، تەنانەت ژمارەیەکی ئێجگار زۆری پێشمەرگەش کە خێزاندارببوون، بەدێهاتە سنوریەکانی دیوی ئێران و بەناو ئۆردوگاکانی پەنابەراندا بلاوببونەوە، رۆژگارێکی ئێجگار سەختیان لەو شوێنانەدا

دەگوزەراند.

خەڵکی نیشتیمانی کوردستان، لەو رۆژگارەدا، لەبەردەم تاقیکردنەوەیەکی دژوار و نوێدا بوو، ئەو شێوازە چەکدارییەی کە لە حەفتا و شەشەوە پیادە دەکرا، درێژەپێدانی بەهەمان شێواز مەحاڵ بوو، دابڕانێکی قوڵ لەنێوان رێکخستنەکانی ناوەوە و دەرەوەدا روویدا، بەخۆداچوونەوە و داهێنان و دۆزینەوەی شێوازی نوێی درێژەپێدانی خەبات، بەرپرسیاریەتێکی گەورەی ئەو کاتەی سەرکردایەتی یەکێتی بوو، بەتایبەتیش ئێمەی پێشمەرگەی تازە ئاوارە، پێشمەرگە و خێزانە ئاوارەکانی دوای ئاشبەتاڵمان دەبینی، بەچاوی خۆمان دەمان دین کە لە چ کولەمەرگیەك و چ رەزالەتێکدا دەژیان، بینینی ژیانی ئەوان، بۆ ئێمە ئەزمونێکی ترسناك و کارەساتاوی بوو، وێڕای ئەوەش، بەحوکمی ئەوەی کە سێنزە ساڵیش زیاتر بوو لەوێ بوون خۆیان و مناڵیشیان بەو ژیانە جیاوازەی ئەوێوە بەسترابونەوە و پەیوەندیەکی وایان بەکوردستانەوە نەمابوو، تا بیر لەگەڕانەوە بکەنەوە، بۆیە کەس لەئێمە ئارەزووی ئەوەی نەدەکرد، ئەوەی بەسەر ئەوان هاتبوو، رووبەرووی ئێمەش ببێتەوە، بۆیە بۆ زۆربەی ئەوانەی کە چارەنوسیان دەیگەیاندنە ناو ئۆردوگاکانی پەنابەریەوە، گەڕانەوەیان بۆ ناو وڵات باشتر بوو، لەو روانگەیەوە گەر هیچ نەبێ، لەکاتی پێویستدا دەبنە زەخیرەیەکی بەهێزی خەبات.

دروستی ئەم بۆچوونەش بەروونی لەسەردەمی راپەڕیندا دەرکەوت، کاك نەوشیروان نەهات ئاشبەتاڵ بەشۆڕش بکات، وەکو مام جەلال دەڵێ، بەڵکو هات و رێکخستنەکانی یەکێتی و هێزی پێشمەرگەی لەسەر شێوازێکی نوێ رێکخستەوە و ستراتیژێکی تازەشی بۆ کاری ئاینده دانا، ئەو هات لەو پێشمەرگانەی کە بەسەر سنورەکاندا بەدیوی ئێراندا بڵاوببونەوە، دوانزە بەتالیۆنی لێ دروستکردن و بەشێوازێکی رێکخراویش بەدرێژای سنورەکاندا بڵاوکرانەوە، لەناو ئەو دوانزە بەتالیۆنەشدا، ٥٥٠ پارتیزان هەڵبژێردران و رەوانەی ناوچە جیاجیاکانی کوردستان کرانەوە، لەو پێشمەرگە خێزاندارانە و هێزە پشگیریانەی ناو ئۆردوگاکانیش،

هێزی نوێی بەرگری میللی دامەزرێنرا، هاوشانی ئەوەش، هێزێکی دیکەی نهێنی، بەناوی سوپای رزگاری کوردستانەوە (سرك) لە ناو رێکخستنە نهێنییەکانی یەکێتیدا دروستکرا و بەشێوەی مەفرەزەی بچوك بچوکی ژێرزەمینی، لەناو شارو شارۆچکە و ئۆردوگا زۆرەملێکاندا کەوتنە چالاکی نواندن، لەهەمانکاتیشدا و بە تایبەتیش بەر لە راپەرین، شانە چەکدارەکانی ناو شار و شارۆچکەکان دروستکران کە ژمارەیەکی بەرچاوی لەو چەکدارانە گرتبوەخۆ کە دۆستی شۆڕش بوون لە ناو ریزەکانی جاش و فەوجە سوکەکاندا بوون، دواتریش لەکاتی راپەریندا دەوری دیاریان هەبوو.

بۆیە دەکرێ بڵێین ئەوەی کاك نەوشیروان لەدوای ئەنفالەکاندا کردی، ئاشبەتاڵ و بڵاوەپێکردنی هێزی پێشمەرگە نەبوو، بەڵکو ئەو هات و سەرلەنوێ و بەشێوازێکی تازە و گونجاو لەگەڵ بارودۆخی ئەو رۆژگارەدا رێکخستن و هێزی پێشمەرگەی رێکخستەوە.

بۆ ئەو تۆمەتەش کە گوایا گۆڕان دژی فیدرالیە و لەگەڵ ئەوەدایە کەرکوك بکرێتە هەرێمێکی سەربەخۆ و سلێمانیش جیابکاتەوە، هەر ئەوەندە دەڵێم هەموو ئەوانەش کە بەشداری پلینیۆم بوون، دەزانن کە هەر مام جەلال بوو یاسای پارێزگاکانی ئیمزاکرد و هەر ئەوەیش بوو کەدواتر لەمیدیای تورکیدا رایگەیاند کەپشتیوانی لە سەبەخۆبوونی هەرێمی کەرکوك دەکا، هەر ئەویش بوو بیرۆکەی ٣٢ بە٣٢بە٣٢ ی بۆ کەرکوك پەسەندکرد.

خۆ ئەگەر هەڵوێست و گوشاری کاك نەوشیروان نەبا سەبارەت بەم هەڵوێستەی، ئەوا مام جەلال پاشەکشێی لەو هەڵوێستەی نەدەکرد و دواتریش نەدەهات رایگەیەنێ کە (سوێندی یاسای خواردووە کە لەدەستور لانەدا و مادەی ١٤٠ یش مادەیەکی دەستوریيە و نابێ لێی لادا).

هەڵبەتە دەبێ ئەوەش بوترێ بەحوکمی ئەوەی کاك نەوشیروان جێگری سکرتێری گشتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بووە، وەك خۆشی پێشتر رایگەیاندووە (لەهەموو چاکە و خراپەکانی یەکێتیدا بەشداربووە).

جارێکی دیکەش دەیلێمەوە کە ئەوەی مام جەلال دەربارەی کاك نەوشیروان وتوویەتی، ئاوڕشتنێکی خراپ و سەرەتایەکی ترسناکیشە لە زیان گەیاندن بە متمانە و بەپەیوەندی نێوان هاوڕێ و هاوخەبات و هاوسەنگەران، ئەگەرچی دەمێکە ئەم حاڵەتی بێ متمانەیی و دوردونگیە، بەزەقی لەناو ریزەکانی یەکێتی نیشتیمانیدا، بەتایبەتیش لەناو سەرکردایەتیەکەیدا، رەنگیداوەتەوە، تەنانەت ئەو ئاکارنامەیەش کە لەپلینیۆمدا بەبەرچاوی ئامادەبوانەوە ئیمزایان کرد، نیشانەیەکی ئاشکرای ئەو نەبوونی متمانە و بڕوایەن لەناو یەکێتیدا بەگشتی و لەناو ئیمزاکەرانی ئاکارنامەکەشدا بەتایبەتی، دەنا لەکوێی دونیادا ئەندامانی یەك حیزب، حیزبیش خۆی بەسۆسیال دیموکرات بزانێ، بۆ متمانە بەیەککردن، پێویستیان بە گرێبەست و ئاکارنامە دەبێ ! هەڵبەتە لەنێوان هاوخەبات و هاوسەنگەراندا، ئاکارنامەیەك و پەیمانی مۆراڵی هەیە، بەڵام پەیمانێکی نەوتراوی نەنوسراو، پەیمانی لەو بابەتەی پلینیۆم، تەنیا لەنێوان ئەو لایەن و هێزانەدا وجودی دەبێ کە لەدوای شەڕ لەگەڵ یەکترکردندا دەگەنە گفتوگۆ و ئاشتی، یان لەبەینی ئەو هێزانەدا کە بەگومان و بێ متمانەییەوە مامەڵە لەگەڵ یەکتردا دەکەن. رەنگە لەدونیای بازرگانیشدا ئەم ئاکارە، شتێکی غەریب نەبێ.

ئەگەر یەك لەنیازە ئاشکراکانی ئیمزاکردنی ئەم ئاکارنامەیە لەپێناوی نەهێشتنی کوتلەبازیدا بوبێ، ئامانجەکەی نەپێکاوە و بەپێچەوانەشەوە، بۆخۆی جەختکردنەوەیە لەسەر هەبوونی تەکەتول و قوڵی رەگەکانی لەناو یەکێتیدا، لەهەمان کاتیشدا جەختکردنەوەیە لەسەر ئەوەی، کە ئەوەی لەناو یەکێتیدا تەکەتولە نەبێ، یان لەناو تەکەتولێکدا نەبێ، پێگەی لاوازە و ئایندەشی ناڕوون.

ئەگەر نەشڵێم ئەم ئاکارنامەیەی ناو پلینیۆم کۆپیەکی دەقاودەقی (وسیقەی عەهد) ەکەی ساڵی ١٩٧٩ ی سەدام حسێنە، دەتوانم بڵێم لاسایکردنەوە و وێکچونێکی یەکجار زۆر لەنێوانیاندا هەیە، سەدام لەدوای ئەوەی توانی حیزبەکەی خۆی لە رکابەر و بەرهەڵستکارەکانی پاك بکاتەوە، ئەو بەرهەڵستکارانەی کە رێگربوون

لەبەردەم بەدیکتاتۆربوونی سەدام و لەبەردەم بە سەدامکردنی حیزبی بەعسدا، سەدامیات و لەنمایشێکی سۆزداردا، لەیاریگای گەل (لەبەغدا) حەشامەتێکی زۆری لە بەرپرس و کادیر و ئەندامە گوێڕایەڵەکانی خۆی کۆکردەوە و وەسیقە عەهدە هەشت خاڵیەکەی بۆ حەشاماتەکە دەخوێندەوە و هەر هەموو خاڵەکانیشی لەسەر یەکێتی ناو حیزب و لەسەر نەهێشتنی تەکەتول و سەبارەت بەپیرۆزی سەدام و دەستەلاتی رەهای ئەو بوون، لەگەڵ خوێندنەوەی هەر خاڵێکیشدا رووی دەکردە حەشامات و (ئایا ئێوە بەمە رازین) ، حەشاماتی چاو بەفرمێسکیش بەیەك دەنگە لەوەلامی سەدامدا دەکرد (بەڵێ، بەڵێ سەرۆك رازین).

ناوەڕۆك و شێوازی خستنەڕوو، وەرگرتنی رەزامەندی بەشداربوانیش، لەهەردووکیاندا تا ئەندازەی لەیەکچوونی جمکەیەك لەیەکدەچوون.

لێرەدا بەزمی رۆژگار لەوەدایە کە جار هەیە حیزبێك یان هێزێك، سالانێکی دوورودرێژ دژ بەهێزێکی لەخۆی بەهێزتر و لەخۆی تۆکمەتر دەکەوێتە جەنگەوە، کەچی لەوشوێنەدا کە خۆی دەبێتە دەسەلات، دەبێتە میراتگری ئەو ئاکار و رەفتار و شێوازانەی کە سەردەمێك شێلگیرانە دژیان جەنگاوە.

گۆڤاری هاوبیر-ژمارە ٣٢- رەزبەری ٢٧٠٩

## توێژینەوەیەکی ئیسرائیلی

## نێچیروان بەدەستپاك و پلاندانەرێکی ستراتیژی و لێهاتوو وەسفدەکات

ئا/ هاوژین

میخائیل ئەبل پسپۆڕی ئیسرائیلی لەبواری عێراق و کورد هەروەها مامۆستا لەبەشی مێژووی رۆژهەلاتی ناوەڕاست لە زانکۆی بار ئایلان، توێژینەوەیەکی گرنگی پێشکەش بەزنجیرەی نامەی (مبات عال) کرد کە پەیمانگای توێژینەوەی ئاسایشی نەوتەوەیی سەربە زانکۆی تەلئەبیبی ئیسرائیلی دەریدەکات، ناونیشانی توێژینەوەکەی ئەبل بریتی بوو لە (هەڵبژاردنەکانی ئەم دواییەی هەرێمی کوردستان عێراق و ئاماژە و ئەنجامەکانی).

ئەبل لە لێکۆڵینەوەکەیدا هەڵبژاردنی ٧/٢٥ ی کوردستان بەجیاواز وەسفدەکات و بەخاڵی وەرچەرخانی دادەنێت لەمێژووی کورد و مێژووی دیموکراتی کورددا، پێشی وایە کە هەڵبژاردنەکە تەنیا هەلومەرجی سیاسی کوردستان دەرناخات، بەڵکو روودانی گۆڕانکاریەکی گەورەیە لە کۆمەڵگای کوردیدا، هەروەها ئەو سەرکەوتنە رێژەییەی کە ئۆپۆزسیۆن بەدەستیهێنا تەنیا بریتی نیە لە ئەزموونی دژی گەندەڵی و لەکەڵك کەوتنی هەندێ دامودەزگای سەر بە دوو حزبە گەورەکەی کوردستان، بەڵکو رەنگدانەوەی گۆڕانکاریەکی قوڵە کە لەسەرەتای نەوەدەکانەوە خەریکە سەرهەڵدەدات، وەك فراوان بوونی بەشداری سیاسی و فراوانبوونی رۆشنبیری کوردی و هەروەها پشتگیری کردن لەچینی ناوەڕاست و سەرهەڵدانی تۆوی کۆمەڵگای مەدەنی کە لەسەر بنەمای دیالۆگی دیموکراتی راوەستاوە.

ئەبل لەلێکۆڵینەوەکەیدا ئاماژە بە پەرلەمانی کوردستان دەکات و دەڵێت لە ١١١ کورسی پێکدێت، کەمینەکانی تورکومان و مەسیحی و ئەرمەن و سریانی تیایە، لەکۆی ٤ ملیۆن دانیشتوان ٢,٥ ملیۆن بەشداریان تیاکرد و ٢٤ لیست کێبڕکێیان کرد کە ٥ لیستیان ئیئتیلافی بوون و رێژەی بەشداربوانیش گەیشتە نزیکەی ٨٠٪ .

ئەو پسپۆڕە ئیسرائیلییە لە لێکۆڵینەوەکەیدا باسی ئەنجامەکانی هەڵبژاردن دەکات

پێ وایە سەرکەوتنی لیستی کوردستانی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە هێشتا جەماوەری کورد ڕۆڵی ئەوانیان لەبەدەستهێنانی دەسکەوتەکان لەدژی سەدام حسێن لەبیرنەچووەتەوە، هەروەها لەرووی گەشەسەندنی وڵاتەکە و برەودان بەخوێندن و پاراستن و گەشەکردنی بەردەوامی ئاسایش و دروستکردنی هەلی کار بۆ هەزاران کەس، هەروەها ئەبل ئاماژە بەوە دەکات کە سەرکەوتنی مەسعود بارزانی چاوەڕوانکراو بوو، نەك تەنیا لەبەرئەوەی سەرکردەیەکی دیارە، بەڵکو لەبەرئەوەی کوڕی سەرکردەی هەڵکەوتوو مەلا مستەفای بارزانیشە، بەڵام ئاماژە بەوەش دەدات کە بەدەستهێنانی دەنگێکی زۆر لەلایەن کەمال میراودەلی پاڵێوراوی سەربەخۆ، بەهێزترین بەڵگەیە بۆ گۆڕان کە کۆمەڵگای کوردی بەخۆیەوە بینیویەتی، کە بریتی یە لە تێکشکاندنی قۆرخکردنی دەسەڵات لەلایەن سەرکردە مێژوویەکانی بزوتنەوەی نیشتیمانی بەتایبەتی لەلایەن پارتی دیموکراتی کوردستانەوە.

سەبارەت بەسەرهەڵدانی دیاردەی کۆمەڵگای مەدەنی و گەشەکردنی نەوەیەکی نوێ لە گەنجانی هۆشیار و رۆشنبیر و هێزی ئۆپۆزسیۆن و زیادبوونی رەخنەی خەڵك، ئەبل پێی وایە ئەم دیاردەیە وای لەدوو حزبە سەرەکییەکە کرد ریزەکانیان ڕێکبخەن و ببە هاوپەیمانی ستراتیژی ئەویش لەپێناوی ئەوەی رووبەڕوی هەلومەرجی نوێ ببنەوە کە لەکۆمەڵگای نوێی کوردستانی سەریهەڵداوە.

بەشێکی گەورەی راپۆرتەکە بۆ نەوشیروان مستەفا تەرخانکراوە، ئەبل بەبراوەی گەورە وەسفی دەکات دەڵێت لەدایکبووی ساڵی ١٩٤٤ و سەرۆکی لیستی گۆڕانە، جێگری سکرتێری یەکێتی بووە و لەساڵی ٢٠٠٦ دا دەستی لەپۆستەکەی هەڵگرتووە دوای ئەوەی نەیتوانی ریفۆرم لەحزبدا بکات، هەمیشە هەوڵی بۆ دادی کۆمەڵایەتی داوە و ویستویەتی متمانەی گەنجان بۆ حزبەکەی بگێڕێتەوە، بەڵام هەوڵەکانی بەفیڕۆ چوون، بۆیە جیابووەوە و کۆمپانیایەکی راگەیاندنی بەناوی (وشە) راگەیاند و بزوتنەوەی گۆڕانیشی دروستکرد و لەهەڵبژاردنەکان بەشداربوو، سەرەکیترین شەڕی دژبە گەندەڵی و جیاکردنەوەی حزب لە حکومەت بوو،

نەدیژەی وەسفەکانی ئەبل نەوشیروان بەسەرکردەیەکی جیاواز و دەستپاك وەسفدەکات و بەپلاندانەرێکی ستراتیژی ناوی دەبات، ئەو کاتەی لەگەڵ حکومەتی عێراقی لە جەنگدابوون، بەمەش جەماوەرەکەی رووی لەزیادی کرد، لەسەر و ئەمانەشەوە رۆشنبیر و مێژوونوسێکی لێهاتووە و نزیکەی ٢٠ کتێبی نوسیوە کە پێگەی جەماوەری بەهێزتر کردووە.

میخائیل ئەبل پسپۆڕ لەبواری عێراق و کورد باسی ئەوەدەکات کە هەردوو حزبەکە گورزێکی توندیان بەهۆی لیستی گۆڕانەوە بەرکەوت، نەك لەناوچەکانی یەکێتی تەنانەت پارتیش کە لەیەکێتی موحافیزکارترە و هەستی خێڵەکی توندە، گۆڕان توانی دەستکەوتی بەرچاو بەدەستبهێنێت کە ئەمەش لێدانێکی ترە لەپارتە حوکمڕانەکانی کوردستان.

**رۆژنامەی هەواڵ. ژمارە ٢٨٢، ٧ ی حوزەیرانی ٢٠٠٨**

**هیچ کات وەکو ئێستا پەیوەندی نێوان مام جەلال و نەوشیروان مستەفا توندوتۆڵ نەبووە؟!**

کامەران ئیسحاق پەری

لەکاتێکدا ئەمڕۆ یەکێتی نیشتیمانی کوردستان یادی ٣٣ ساڵی دامەزراندنی دەکات بۆیەکەمینجار لە مێژووی دروستبوونەیەوە ئەو یادە بێ ئەندامێتی مەکتەبی سیاسی نەوشیروان مستەفا و قوڵبونەوەی کێشەکانی نێوان نەوشیروان و هەندێك لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و بەئەگەری مەرگی ئێستای یەکێتی لەسەردەستی سبەی نەوشیروان دەخەملێنرێت.

ئێستای سەرۆکی کۆمپانیای وشە و دوێنێی دامەزرێنەری یەکێتی نیشتیمانی کوردستان و جێگری پێشووی سکرتێری گشتی نەوشیروان مستەفا لە بەرواری ٢٠ ی ئاياری ٢٠٠٨ واتە لەپاش نزیکەی ساڵ و نیوێك لە دامەزراندنی کۆمپانیای وشە بۆ یەکەمینجار لە روونکردنەوەیەکیدا بۆ (مەلا بەختیار و ئەرسەلان بایز) هاتە وەڵام، روونکردنەوەکەی نەوشیروان لە کات و شوێن و بەجۆرێکە پێدەچێت هێندەی بەهەڵەداچوونی هێنابێتە ئاراوە هێندە لێکتێگەشتنی نەخولقاندبێت، لەپاش رێگرتن لە کۆمێنتار نوسین لە ماڵپەڕی سبەی لەسەر روونکردنەوەکەی نەوشیروان بەرەو شوێنێنێکی تر دەبات، لێرەدا هەوڵدەدەین بەشێکی ئەو قسەکردنەی نەوشیروان مستەفا بابەتیانە بخوێنینەوە.

سەرۆکی کۆمپانیای وشە کەبەشێك لە کاری دەزگایەکی رووناکبیرکردنی کۆمەڵگایە و لەچەندین بۆنەدا لەپێش و لەپاش دامەزراندنی کۆمپانیاکەش بانگەشەی بۆ دەکات، بەشێکی کارکردنە لەگەڵ وشەی کوردی کەچی لەسەرەداوی دەستپێکردن بەنوسین و روونکردنەوەکەی بەچەند دەستەواژەیەك دەستپێدەکات کە رەنگە زۆر مۆرکی کوردی بوونیان پێوە دیار نەبێت، نموونەی ئەو

نیشانەش (موناسەبەتێك، نوقتە) كە دەكرا لەجیاتی موناسەبە و نوقتە وشەی (بزنەیەك، خاڵێك) بەكاربهێنێت، بەڵام بۆچی بەكاری نەهێناوە، هەڵبەت بۆ شیكردنەوەی ئەوەی كە لەبەرچی سەرۆكی كۆمپانیای وشە لەگرنگی نەدان بە وشەی كوردی لەو ڕوونكردنەوەیەدا ئەوەیە كە (ویستبێتی هەڵوێستێكی سیاسی ڕوون بكاتەوە، نەك تێكستێكی ئەرگۆمێنت هەڵگری نوسیبێت) بەمەش تاڕادەیەك كاری ڕووناكبیری كۆمپانیای وشە كاڵ دەكاتەوە و زیاتر بەگوتاری سیاسییەك دەبێت مامەڵەی لەگەڵدا بكرێت.

(ڕەنگە هەر ئەم جۆرە قسەكردن و مامەڵەكردنەی نەوشیروان بەچەمكی وشەكان هانی ئەرسەلان بایز و مەلا بەختیار بدات كە بوێرن ئەوە بدركێنن، كە كۆمپانیای وشە خەریكی نوسین نییە، خەریكی شتی ترە)، لەوەش بترازێت لە كۆبەندی ڕوونكردنەوەكە هێندە قسەكردن بەدی دەكرێت هێندە نوسین (تێكست) ی سەرۆكی دەزگایەكی ڕووناكبیری وەك وشە بەدی ناكرێت...نەوشیروان مستەفا ئەو مرۆڤەی كە لە زۆربەی تەمەن و خەباتی سیاسی خۆیدا كەمترین قسەی كردووە، ئەمڕۆكە لەگەورەترین و زۆرپارەترین دەزگای نوسین زۆرترین قسە بەرهەم دەهێنێت... ڕەنگبێت لەپەلەكردن لە داڕشتنی وەڵامێكی گورجدا، هێندە ئەو مەسەلەیەی بەهەند وەرنەگرتبێت.

لەدەسپێكی ڕوونكردنەوەكەی نەوشیروان مستەفادا ئەوە بەدی دەكەین كە كادیرەكانی یەكێتی لە خانەی یەكەمی پۆلێنكردنی گوتار و كەس و لایەنی ئاڕاستەكراوی قسەكردنەكەیەتی، ئەم جارێكی تر ئەو گومانە دەهێنێتە ئاراوە كە نەوشیروان مستەفا لایەنی كەم ئەگەر لەبەر چاوی شەقامی كوردی خۆی بەئەندامی یەكێتی نازانێت، ئەوا لە ناخی خۆی و هەندێك لەئەندامانی یەكێتی و كادیرەكانی بەجێگری سكرتێر و ڕەنگە بە تاكە سەركردەی پاش تاڵەبانی بزانێت؟ دەنا دەكرا كادیرانی یەكێتی لە تەواوی ڕوونكردنەوەكەی نەوشیروان مستەفا لێ هەڵماڵرایەوە ئاڕاستەی قسە و وەڵامەكەی لە مەقامی یەكەمدا بۆ ڕایگشتی و جەماوەری خەڵكی

کوردستان بێت.

کۆمپانیای وشە مەڵبەندی ڕێکخستن نییە؟!

یەکەم: کۆمپانیای وشە نە"مەڵبەندی ڕێکخستن" ە تا سەر بە مەکتەبی ڕێکخستن ئەرسەلان بایز بێت نە "ڕێکخراوە دیموکراتی جەماوەری" یە تا سەر بە ڕێکخراوە دیموکراتییەکانی مەلا بەختیار بێت، تاوەکو موچە و میزانیە لەوان وەربگرێت. نە من و نە هاوکارەکانم بۆ دامەزراندنی کۆمپانیای وشە و دامودەزگاکانی موچە و پارە و ئەرزمان لەم دوو زاتە وەرنەگرتووە، دامەزراوەکانی ئێمە دەسندەخۆری ئەوان نین، بۆیە ئیدیعاکانیان بێ بناغە و ناڕاستە و هەرچیەك ئەڵێن قسەی خۆیانە.

- خۆشوبهاندن بە مەکتەبی ڕێکخستن و مەکتەبی ڕێکخراوە دیموکراتییەکان، خۆی لەخۆیدا واتایەکی بارگاوی هەڵدەگرێت کە ڕەتگە پێویستی بەشیکردنەوە هەبێت، بۆچی ئەو هەستە لای نەوشیروان مستەفا دروست بووە، کە مەلا بەختیار و ئەرسەلان بایز کۆمپانیای وشە بەبەشێك لە دامەزراوە و ئۆرگانە حیزبییەکانی خۆیان بزانن، ڕوونتر بۆچی نەوشیروان مستەفا دەیەوێت وا لە کادیرەکانی یەکێتی بگەیەنێت، کە کارکردن لەناو کۆمپانیای وشە واتایەکی ڕێکخراوەی نییە، کار هەڵسوڕاندن لەناو کۆمپانیای وشە هاوشێوەی کارکردن نییە لەناو مەکتەبی ڕێکخستن و مەکتەبی ڕێکخراوە دیموکراتییەکان، ئایا دەکرێت ئەم لێدوانە بەپەیامێك بزانین بۆ باڵی ریفۆرم لەناو یەکێتیدا کە خەون و ئومێدی گەورە لەسەر داهاتووی ریفۆرمخوازی نەوشیروان و هاوکارانی لە وشەدا نەبەستن یان ئەم جۆرە لێدوانە تەکنیکێکی تری نەوشیروان مستەفایە بۆ هێورکردنەوەی شەڕی نێوان خۆی و مەلا بەختیار و ئەرسەلان بایز لە دوا کۆبونەوەی مەکتەبی سیاسیدا داوایان لەهەڵوێستی ڕوونی مام جەلال کردبوو سەبارەت

به چارەنوسی ئەندامێتی نەوشیروان مستەفا لە یەکێتیدا، (هەڵبەت داواکارییەکەی مەلا بەختیار و ئەرسەلان بایز پشتبەستوو بە کۆمەڵێك زانیاری بوو، کە نەوشیروان مستەفا لە ناو کۆمپانیای وشە خەریکی جۆرێك لەجموجوڵی خۆرێکخستنە کە ناکرێت یەکێتی لێی بێدەنگ بێت !؟)

هاوکاتیش لە ناو خودی کۆمپانیای وشە لە کۆبونەوە نادیار و پشت پەردەکانیاندا سالار عەزیز بۆ ماوەیەکی کورت بەتورەیی چووە ماڵەوە بەهۆی نائاشکرایی هەڵوێستی نەوشیروان مستەفا بۆ ئایندەی یەکێتی و چارەنوسی پەیوەندی نەوشیروان و مام جەلال بەکۆمپانیای وشەوە هۆیەکن، ئەمە بەدیوێك گەر بەدیوێکی تریش تەماشای کۆمپانیای وشە بکەین زۆر کات هەریەك لە (ملازم عومەر، قادری حاجی عەلی) هەردوو ئەندامی دەستلەکارکێشاوەی کۆنگرەی دووەمی یەکێتی و سالار عەزیز ئەندامی دەرنەچووی سەرکردایەتی یەکێتی و سەلاح رەشید خاوەنی وێنەی لەپێشمەرگایەتییەوە بۆ سەرۆك کۆمار، لەناو کۆمپانیای وشە دەبینرێن و جێ و رێو بەرپرسیاریەتی تایبەتی خۆشیان هەیە.

ئایا لە هەبوونی ئەم هەموو قوتبە سلێمانییە مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتییەی یەکێتی ناکرێت بلێین سەرکردایەتیەکی تری یەکێتی لەناو کۆمپانیای وشە بەدی دەکرێت، دەنا ئەم تۆپەڵە لە قوتبی سیاسی و خەڵکی شاری سلێمانی چ کاریان بە سایتی سبەی و رۆژنامەی رۆژنامە و تەلەفزیۆنی تۆڕی هەواڵی کوردی و چاپخانەی زەرگەتە هەیە.!؟

من یەکێك بووم لە دامەزرێنەرە سەرەکییەکانی یەکێتی!

خاڵی دووەم:

دووەم: من یەکێك بووم لە دامەزرێنە سەرەکییەکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان

[illegible]ری پێشمەرگە و هەموو دامودەزگا دارایی و و ڕێکخراوەیی و راگەیاندنەکانی، بەشدارێکی سەرەکی بووم لە رابردووی یەکێتی و لە دروستکردنی ئێستای یەکێتی دا، بە هەموو لایەنە سلبی و ئیجابییەکانی، من هەروەکو شەریکم لە هەڵگرتنی ئۆباڵی مێژوویی هەموو سەرکەوتن و دەسکەوت و شکستەکانی یەکێتیدا، هەروەها شەریکم لە هەموو سەروەت و سامان و دارایی یەکێتیدا، کەس بۆی نییە منەت بەسەر.......

- نەوشیروان مستەفا لەدرێژەی قسەکانیدا لە خاڵی دووەمدا ئاڕاستەی قسەکانی جارێکی تر بەرەو لای یەکیتی بوون دەبات، نەك بەرەو جیابوونەوە، بەمانایەکی تر کە ئەمڕۆ پاش دەستلەکارکێشانەوەی لە مەکتەبی سیاسی لەسەر جیاوازی بیروڕا لەسەر گەندەڵی ناکۆکی خۆی و سکرتێری گشتی بێت، چاوەڕێی ئەوەی لێ ناکرێت خۆی بکاتە شەریکە بەش لە سەروەت و سامانێك کە لەبنەڕەتدا خۆی لەدژی شێوازی ئەو جۆرە پارە مۆڵدانە و ئەو شێوازە لە خەباتگێڕانە بوو بێت.

پارەم لە مام جەلال وەرگرتووە:

هاوکاری مام جەلال بۆ ئێمە ١٠ ملیۆن دۆلار و بینایەکی حکومەت و گردێکی کۆمپانیای نۆکان بووە، ئەوەش یەکەم هاوکاری و دوا هاوکاری مام جەلال بووە بۆ ئێمە و هەموو ئەوانەش بە ناوی کۆمپانیای وشەوە تۆمارکراون کە شەخسیەتێکی مەعنەوی و قانونیە.ئەمەشمان ئەوەنە وتوەتەوە کە خەریکە نرخی سیاسی و مەعنەوی هاوکارییەکە نامێنێ.

ئەگەر لەو بڕگەیە رابمێنین کە تیایدا نەوشیروان مستەفا وەك خۆی باسی دەکات چەندبارە ئەوەی راگەیاندووە کە سەرچاوەی داهاتی دامەزراندنی کۆمپانیاکەی لەکوێوە دێت تێبینی کۆمەڵێك خاڵ دەکەین کە هەندێکی پەیوەندی بە هەڵسوکەوتی مام جەلال و پەیوەندی توندوتۆڵی بە نەوشیروان مستەفاوە هەیە.

بەڵام با سەرەتا لەو خاڵەی کە پەیوەندی بە مام جەلالەوە هەیە بپرسین: ئایا سکرتێری گشتی پارتی سۆسیال دیموکرات و سەرۆك کۆماری عێراقی فیدراڵ بێ گەڕانەوە بۆ ئەندامانی مەکتەبی سیاسی بتوانێت لە بودجەی حیزب یان هەر سەرچاوەیەکی تری داهاتی دەستکەوتوی یەکێتی کە پارتێکی دەسەڵاتداری ناو عێراق و کوردستانە چیکێکی ١٠ ملیۆن دۆلاری لە پاداشتی ماندووبوون و شەونخونی هاورێبازەکەی هاوبیرەکەی هاوخەباتەکەی سەرف بکات، دەبێت چاوەڕوانی سەرفکردنی چەند بلیۆن دۆلار بین بۆ بنەماڵە و کەسوکار و دڵسۆزەکانی چواردەوری خۆی لە ئێستایەکدا کە تەمەن روو لە خەزانە!؟

ئەمە لەکاتێکدا کەخودی نەوشیروان مستەفا لە یەکەمین یاداشتنامە کە بەئیمزای هەریەك لە عومەر سەید عەلی و کۆسرەت رەسوڵ عەلی بەر لەسێ ساڵ لەمەوبەر ٢٠٠٥ پێشکەش بە مام جەلال کرا لە خاڵێکدا داوا لە مام جەلال دەکرێت کە سەرچاوەی داهات و سەرفی پارە بۆ مەکتەبی سیاسی یەکێتی ئاشکرا بکات، ئایا ئەمە جارێکی دی سەرگوشتە و گومان لەپەیوەندی نێوان تاڵەبانی و نەوشیروان ناکات کە پەیوەندی ئەم دوو زاتە هیچ کات وەك ئەو کاتەی کە ئێستا نەوشیروان لە مام جەلال جیابووەتەوە توندوتۆڵ نەبووە.

لەخاڵێکی کە ناکرێت خۆمانی لێخافڵ بکەین ئەوەیە نەوشیروان مستەفا بەم ئاشکراکردنی سەرچاوەی تێچوونی دامەزراندنی "وشە" بەم پارەوەرگرتنە و بێ مننەت کردنی، لە ناواخنی روونکردنەوەکەدا خستنەوەی تۆپی بلیاردەکانە بۆ سەر مێزی مەکتەبی سیاسی رونتر نەوشیروان مستەفا دەیەوێت بڵێت (من پارەم لە سەرۆکەکەتان وەرگرتووە پارەم لەئێوە وەرنەگرتووە، ئەگەر نارازین ئەوا دەتوانن نارەزایەتییەکەتان لەحزوری مام جەلال و کۆبونەوەی مەکتەبی سیاسی خۆتاندا بورووژێنن)، بەڵام وەنەبێت ئەمانیش نەیان ویستبێت ئەم باسە لەگەڵ مام جەلالدا بکەنەوە، خۆ کە ئێستا ئێخەی نەوشیروانی پێدەگرنەوە هەڵبەت بەجۆرێك بۆیان روون بۆتەوە کە بەشەڕدان و بەگژداچوونی مام جەلال لەگەڵ نەوشیرواندا لانی کەم

[illegible]ادا زەحمەتە، پاشان ئەوەمان لەبیر نەچێت کە نەوشیروان لە شوێن هەڵکێشاندا [illegible] مام جەلال چۆن دواتر بەوە ناوی دەرکرد کە (نانی شوان دەخوات) هەرچی لەبارەی مەلا بەختیارە بەهۆی خوازبێنی پاڤێلی کوڕی مام جەلال بۆ کچی مەلا بەختیار جۆرێك لەسنور و هەمان کات تموحی پەیدا کردووە، کە ناکرێت مەلا ئەمڕۆ زۆر پێی لەسەر دابگرێت ، چونکێکم خزمایەتی و هاوسەرگیرییەکە هێشتا لە قۆناغی سەرەتایدایە و تا ئاستێکیش پەیوەندی بە گوێڕایەڵی وەلائی مەلا بەختیارەوە بۆ مام جەلال، مەلا بەختیارێك کە جگە لە مام جەلال لەپاش هاتنەوەی بۆ ناو یەکێتی کەسی تر و لایەنی تری وەك (جەبار فەرمان، نەوشیروان مستەفا، کۆسرەت رەسول) لە پێشوازیدا نەبوون، روونتر کەسایەتییەکی (مورەحەب) نەبووە.

بەحەقی خۆمانی دەزانین لە پارەی حکومەت و داری گشتی پشکمان هەبێت

چوارەم: "کۆمپانیای وشە بۆ راگەیاندن " وەکو لەسەرەتاوە "گرێبەستی دامەزراندنی" دا نوسیومانە، راگەیاندنێکی "بینرا و بیستراو و نوسراو" ئەبێ، بۆیە بەهەقی خۆمانی ئەزانین چۆن دەزگای راگەیاندنی حیزبەکان بە پارەی حکومەت و لە دارای گشتی و لەسەر بودجەی میللەت ئەژین، یان بودجەی ئەوانیش ببڕن و بۆ ژیانی دەزگاکانیان با پشت بەخۆیان ببەستن بۆ ئەوەی ئێمەش هەمان رێگە بگرین، یان ئەبێت حکومەت لە دارای گشتی بودجەی ئێمەش دابین بکات، ئەگینا (بانێك و دوو هەوا) قبوڵ ناکرێ.

پرسیارەکە ئا لێرەدایە ئایا هەڵە بە هەڵە چاکدەکرێتەوە، ئایا گەندەڵی بە روویەك و دیوێکی تری گەندەڵی شەرعیەتی بۆ دەهێنرێتەوە...پاشان بۆچی ئەوە بەهەق، بەگونجاو نەزانرێت کە ئەمان رەچەشکێن بن و نموونەی مۆدێلێکی تری راگەیاندنی ئازاد بن بەوەی کە بەبێ هیچ یارمەتییەکی دارایی حیزبی لە گۆڕەپانەکەدا تەپاوەتلیان بێت...بێ بگرن و ئێستای خراپی رەوشی میدیا بگۆڕن، ئایا نەوشیروان مستەفا ناکرێت ئەڵتەرناتیڤی داوانەکردن لەپارەی حکومەت رادیۆ و تەلەفیزیۆن و رۆژنامە و...هتد بۆ بەڕێوەبردن هەڵبژێرێت!؟، پاشای ئەوەی وەك سەرۆکی

کۆمپانیای وشە لە زۆرکەسی تر باشتر بزانێت کە سەرچاوەی داهاتی (التمویل) رۆڵ ستراتیژ و رەوشی کارکردنیش دیاری دەکات، تەنانەت بە یەکێك لە فلتەرە سەرەکییەکانی کاری ئەو دامەزراوەیە دەژمێردرێت.

ئەی کەواتە چی کۆمپانیای وشە لە مەکتەبی راگەیاندنی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان جیابکاتەوە، ئەگەر سەرچاوەی (تمویل) ەکەی هەمان سەرچاوە و شوێنی سەرف بوبێت؟!

هیچ رێککەوتنێکم لەگەڵیاندا مۆرنەکردووە، هەروەها چەند جارێکە باسی ئەوە دەکەن کە من بەپێی ئەو رێککەوتنەی لەگەڵ ئەواندا کردومە بۆم نییە رۆژنامە دەربکەم و تەلەفزیۆن دابمەزرێنم، بەڵکو بۆم هەیە سەنتەرێکی لێکۆڵینەوەی زانستی دابمەزرێنم، ئەم قسانەش وەکو ئەوانەی پێشوو بێ بناغە و ناراستن.

یەکەم: هیچ گرێبەستێك یان ریککەوتنێکی نوسراو یان زارەکی لەبەینی من و ئەو دوو برادەرادا و لە بەینی من و هیچ ئەندامێکی تری مەکتەبی سیاسیدا نییە تا من پابەندی بم یان مەرجەکانیم پەیڕەو نەکردبێ.

دووەم: من کە دەستم لە کارە کێشاوەتەوە و خواحافیزیم لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی کردووە لەبەر ئەوە نەبووە کە منە تۆراوم یان تورە بووم، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو، من لەسەر چەند مەسەلەیەکی چارەنوسساز ناکۆکی سیاسیم لەگەڵیاندا هەبووە، بەتایبەت لە شێوەی بەرێوەبردنی یەکێتی نیشتیمانی و حکومەتەکەیدا.

نەوشیروان مستەفا لەم خاڵەدا باس لە خواحافیزیکردن لە مەکتەبی سیاسی دەکات، نەك لە تەواوی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، کە ئەمەش ئەگەر و ترسی گەڕاندنەوەی نەوشیروان بۆ ناو یەکێتی نیشتیمانی ئێستا لەپێشەکانی زیاتر لەئارادایە، جگە لەوەش ئۆباڵی دەستلەکارکێشانەوەکەی خستوەتە پاڵ ئەو برادەرانەی کە ئەمڕۆ لەسەنگەردان بۆی نەوەك ئەوەی کە راگەیەندراوە گوایە بەهۆی نەگونجانی مام جەلال، نەوشیروان وازی لەیەکێتی هێنابێت، لێرەدا بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ بەگوێی مەکتەبی سیاسی هەڵیدەخات کە ئەگەر کۆنتارکتێکی تایبەت و نهێنی بوونی

هە[illegible] لە ئارادابێت و کاری پێدەکرێت، ئەوا لەنێوان نەوشیروان و مام جەلالدایە و دەستتان بۆتان نییە لە وردەکاری ئەو رێککەوتن و کەین و بەینە ئاگاداربن کە سالانێکە منی بە مام جەلالەوە گرێداوە.

رەخنە بەزمانی گوڵی نەوشیروان مستەفا

خالی پێنجەم:

پێنجەم، لەچوارچێوەی ئەو بەرنامەیەی بۆ کارەکانی خۆمان دامانناوە تائێستا توانیومانە سایتی سبەی، رۆژنامەی رۆژنامە، سەنتەری راپرسی، چاپخانەی زەرگەتە دابمەزرێنین، بەم نزیکانە تەلەفیزیۆنی سەتەلایت ئەکەوێتە کار و بەهیواین تا کۆتای سال دەزگای لێکۆلینەوەش دابمەزرێنین.

ئەگەر بێت و باس لە هەلسەنگاندنی کارەکانی کۆمپانیای وشە بکەین، ئەوانەی کە لەپەیامی دامەزراندن دواتریش چۆنیەتی گونجاندن و جێبەجێکردنی ئەو پەیامە لەگەل دامەزراوەکانی وشە خۆی وتەنی کە لەئێستادا کردویانە، لەراستیدا شتێکی ئەوتۆیان پێ نیشان نەداوین بۆ نموونە لەرووی نوسەران کەمترین رێژەی نوسەر لە سایتی مالپەری سبەیدا دەبینرێت، بەتایبەت نوسەری نایەکێتی غەیرە سلێمانی یان بی بنەما و حسابکردن بۆ رابردوو و خەباتی سیاسی ...لە مالپەری سبەیدا کە یەکەمین کاری کۆمپانیای وشەیە هەتاوەکو ئێستا وتارێك بەزمانی بادینی نوسەرێکی هەولێری، رەخنەیەك لە مام جەلال نەبینراوە، پاشان لەبارەی دامەزراندنی چاپخانەی "زەرگەتە" کارێکی هێندە قورس نییە بۆ کۆمپانیایەك کە بری ١٠ ملیۆن دۆلاری لەبەردەستدا بێت هەق بوو ئاراستەی باس لە چاپخانەیەك بە لەچاپگەیاندنی جۆر و رێژەی ئەو کتێبانەی بکردایە کە چاپکراون یان بەنیازن لەداهاتوودا چاپی بکەن، هەرچی لەبارەی مۆدێلی تەلەفزیۆنە سەتەلایتەکەشە لەگەل دەستبەکاربوونی بەپێی ئەم لێدوانە بێت، پێناچێت جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەل کەنالی کوردسات و بەم زوانەی گەلی کوردستانی سەتەلایتی هەبێت.

نەوشیروانی بوون: لێرەدا مەبەستم لەو نەوشیروانی بوونە نییە کە بە (تەبیعەت

ناسراوه)، بەڵكو زۆرتر مەبەستم لەخودی نەوشیروان مستەفایەكە تاچەند دەتوانێت رێ نەوشیروانی بێت!؟

بۆ نەوشیروانی بوون پێویستە ئەو رێگرانەی كە لەبەردەم نەوشیروان مستەفادان بۆ راگەیاندنی جیابونەوەی هەتا هەتایی لە یەكێتی نیشتیمانی كوردستان بەدەر بخەین.

- مێژووی سیاسی نەوشیروان مستەفا بەبەراوردپێكردنی بەمێژووی سیاسی مام جەلال لە خاڵی پەیوەست بەجیابوونەوەی لەگەڵ پارتی دیموكراتی كوردستاندا جیاوازە، ئەمەش لە كۆمەڵێك گۆشە نیگای جیاوازەوە لە گرنگترینیان.

- لە راگەیاندنی جیابونەوەی مام جەلال لەپارتی دیموكراتی كوردستان چەند فاكتەر و هاندەرێك هەبوون كە پاڵپشتی پرۆسەی بیركردنی مام جەلال لەجیابونەوە لە پارتی دەكرد، لەنێوانیاندا پاڵپشتی و دۆستایەتی سیاسی نێودەوڵەتی و ناوچەیی بۆ مام جەلال بەپێچەوانەشەوە نەوشیروان مستەفا زۆركات (پاڵپشتی نێودەوڵەتی و ناوچەی) لەگەڵیدا نەبووە، ئەمەش بەهۆی ئەو كەسێتی و ئەو مامەڵە توندڕەویەی كە نەوشیروان پێی ناسراوە لەلای ئەو دۆستانەی كەدەشێت نەتوانن وەك پێویست پشتگیری و پاڵپشتی خۆیان بەیان بكەن، تەنانەت لەدوا هەلی زێڕین لەبەردەم نەوشیروان بۆ نیشاندانی وێنەیەكی باشتر لای عەرەب دوای رژێمی بەعس تا ئاستێك شكستی خوارد و بەغدادی بەجێهێشت بۆ دكتۆر بەرهەم شاڵح، بەرهەم سالح كە لەبنەڕەتدا لەناو دیبلۆمات و كەسایەتییە سیاسییەكانی عێراق و ئەمریكا میانەڕەوتر دێتە بەرچاو و ئومێدی زیاتری لێدەكرێت، بوونیشی بەجێگری مام جەلال لەپاش

دەستلەکارکێشانەوەی نەوشیروان مستەفا جێگری سکرتێری گشتی دکتۆر بەرهەم دەباتە خانەیەکی تر لـەچوونەپێشەوە.



- باڵی مەکتەبی سیاسی و هەڵوێستی لـەگەڵ مام جەلال پاڵپشتێکی تربوون بۆ جیابوونەوەی مام جەلال لـە پارتی دیموکراتی کوردستان، بەپێچەوانەی نەوشیروان مستەفا...لانی کە ئەو ئەندام مەکتەب سیاسی و سەرکردایەتییەی کە لـەگەڵ نەوشیرواندان یاخود پشتگیری خۆیان بۆ راگەیاندووە لـەدەرەوەی مەکتەبی سیاسین نموونەی (ملازم عومەر، قادری حاجی عەلی) ئەوانەی کە لـەناو یەکێتیشدا ماونەتەوە هێندێکیان پەراوێز و هێندێکی تریشیان لـە چاوەڕوانی و هەڵوێست گۆڕینن بەپێی بەریەککەوتنی بەرژەوەندییەکان نموونەی (عومەری سەید عەلی، شەماڵ عەبدولوەفا، حەمە تۆفیق رەحیم، کۆسرەت رەسوڵ عەلی، عوسمان حاجی مەحمود، کوردۆ قاسم...هتد) ، بەڵام لـەجیابوونەوەی مام جەلال لـە پارتی لانی کەم ئەگەر تەواوی مەکتەبی سیاسی پاڵپشتی نەبوبێت (ئیبراهیم ئەحمەد، عومەر دەبابە، رەسوڵ مامەند...هتد) ی لـەگەڵدا بووە.
- سلێمانی بوونی نەوشیروان: مێژووی کۆن ونوێی پارتایەتی لـە سلێمانیدا چەند تایبەتمەندییەکی لـەگەڵ خۆدا هەڵگرتووە، زۆر کات جەماوەری سلێمانی سەنگی مەحەك و تەرازووی هاوسەنگی ململانێکان بۆ خولقاندنی گۆڕان یان ریفۆرم لـە ناو پارتە کوردییەکان بۆ خۆ هەڵگرتووە... بەمدواییانەش نەوشیروان مستەفا ئەمین کە خۆی خەڵکی شاری سلێمانی و جەماوەریەتییەکی لـە رادەبەردەر لـەناو

ڕێکخستنەکانی یەکێتی سلێمانیدا هەیە، لەدوای هەڵبژاردنی مەڵبەندەکان، لەناوجەرگەی مەڵبەندی سلێمانی دۆڕا، ئەم دۆڕاندنە بەشێوەیەکی خراپ کاردانەوەی هەبوو لەسەر ئاراستەی بیرکردنەوەی نەوشیروان و (موراهەنە) کردن لەسەر ڕێکخستنەکانی سلێمانی، هۆکەی هەرچییەك بێت، دەرەنجام نەوشیروان خۆی بەشکستخواردوو دەبینێت لەناو ئەو مەڵبەندەی کە هەمیشە بەمەڵبەندەکەی نەوشیروان ناسراوە بەتایبەت لەڕووی کادیر و کارگێڕانی مەڵبەندەکە، کە لەبنەڕەتدا لەسەر ناوی نەوشیروان ماڵن.

ئەم شکستخواردنە بەجۆرێك لەجۆرەکان وا لەنەوشیروان مستەفا دەکات کە زیاتر لەجارێك بیر لە ڕاگەیاندنی جیابوونەوە بکات، بۆیەکا لەدامەزراندنی کۆمپانیای وشە، هەڵبژاردنی هەڵسوڕاوەکانی، کارمەندەکانیدا ئەوە بەدی دەکەین کەمترین سود یان هانا بۆ کادیری یەکێتی براوە، بەپێچەوانەی پێشینەکانی تری نەوشیروان کە هەمیشە بەپشت ئەستوری هێزی ڕێکخستنەکانی سلێمانی بانگەشەی بۆ گۆڕن دەکرد.

سەرنج:

ئەم باسە بۆیە هاتە ورووژان چونکە تەداعیاتی شەڕی نێوان نەوشیروان مستەفا و ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و گەیشتنی بەو ئاستەی کەئێستا لە ئارادایە، شەڕێکی هەروا بێ ئامانج بێ مەرام بێ باجدان تەواو نابێت، بۆیە پێویستە لەسەر ئەم هەڵوێستەی کە ئەمڕۆ لەلایەن نەوشیروان مستەفاوە دەکرێت بوەستین...

گرنگترین خاڵ کە پێویستە لەیاد نەکرێت ئەوەیە ئەم شەڕە بەقازانجی کێ تەواو دەبێت؟! ئەمە جگەلەوەی کە زۆرێك لە رایگشتی کوردستان لای وایە نەوشیروان مستەفا وەڵامێکی توندی مەلا بەختیار و ئەرسەلان بایزی دابێت، کە بەپێچەوانەوە، بەبڕوای من نەوشیروان مستەفا هێندەی لەئێستادا پێویستی بەدوورخستنەوەی ئاشوبە لەخۆی هیچ کات وەك ئێستای پێویستی پێ نەبووە.

ئەوەی کە لای وابێت نەوشیروان مستەفا بەیەکجاری و هەتا هەتایە لە یەکێتی نیشتیمانی کوردستان و لە مام جەلال جیابۆتەوە بۆچونێکە پێدەچێت هێندە راست نەبێت، هاوکات ئەوە راستتر بێت کە جیابونەوەی نەوشیروان یاخود مانەوەی بەندە بەکۆمەڵێك فاکتەری تری وەك لەسەر ژیانی مام جەلال، پەیوەندی بە یەکێتی و پارتی، کۆنگرەی سێهەم...

**گۆڤاری نڤار ژماره ( ٧ ) ی پایزی ١٩٩٩..**

**چاوپێکەوتن لەگەڵ ( نەوشیروان مستەفا )**

**سیاسەتمەدار و روناکبیری گەورەی گەلەکەمان ( نەوشیروان مستەفا ئەمین ) خاوەنی چەندین کتێبی بەنرخی وەکو ( پەنجەکان یەکتری دەشکێنن، لە کەناری دانووبەوە بۆ خڕی ناو زەنگ، خولانەوە لە بازنەدا، سەردەمی قەڵەم و موراجەعات و...تاد )، کەسێکە لە ناوە مەزنەکانی جیهانی سیاسەت و روناکبیریی بۆیە ناچینە بەراییەوە و لێمان پرسی:**

نڤار: بە بۆچوونی بەشێك لە بیریارانی خۆرئاوا لە هەزارەی سێهەمدا ناسنامەی نەتەوەکان بەرەو پوکانەوە دەچێت، ئەم بۆچوونەش لەچوارچێوەی ئەوەدا پێشبینی دەکرێ، کە فەلسەفە و ئایدۆلۆژیا بەهۆی تەکنەلۆژیاوە توشی قەیران دەبێت، بەبۆچوونی بەڕێزتان ئەم بۆچوونە تا چ رادەیەك راستی دەپێکێ، لە کاتێکدا ئێستاش بەشێکی بەرینی نەتەوە بچوکەکان هەوڵی بوونی نەتەوەیی خۆیان دەدەن، بەدوای دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەییەوەن؟

نەوشیروان مستەفا: بەڕای من ناسنامەی نەتەوەیی لە هەزارەی سێهەمدا بەرەو پوکانەوە ناچێت، بەڵکو لەوانەیە وەکو خۆتان ئاماژەتان بۆ کردووە، دەوڵەتی نوێ پێ بگات، ناسنامەی نەتەوەیی هەر تەنها ئەوە نییە خەڵك پاسپۆرتی هەبێ و ناسنامەی ئەو وڵاتەی هەبێ بەوەوە شانازی بکا، رەنگە بۆ نموونە لەنێوان وڵاتانی ئەورووپیدا سنورەکان تارِادەیەك ئاوەڵەن، بەڵام سنورەکان هەرماون، جگە لەوەش ئێستا ناسنامەی نەتەوەیی لە لەشکر و سوپای بەهێزدا خۆی نانوێنێ، بەڵکو خۆی لەبوارەکانی تری فەرهەنگ و رۆشنبیری و وەرزش و ..هتد دەنوێنێ، بۆ نموونە جاران نەتەوەکان شانازییان بەوەوە کردووە سەرکردەیەکی جەنگی زۆر بەناوبانگیان تیا هەڵکەوتووە یان قارەمانی گەورەیان لە شەڕەکاندا تیا هەڵکەوتووە، بەڵام ئێستا شانازی دەکەن بە وەرزش و کارەکانیانەوە، شانازی بە گۆرانیبێژ و مۆسیقاژەن و

[illegible]کانی بواری کیمیا و فیزیا و زانستەکانی ترەوە ئەکەن، ئەوانەی خەلاّتەکانی نۆبلّ [illegible]بەتەکانی خەلاّت وەردەگرن، ئەوانە بە قارەمانی نەتەوەیی دەژمێردرێن، ئەو میللەتانە تا ئێستا ناسنامەی خۆیان پاراستووە، پێشم وایە لە پاشەرۆژدا دوو شت لە بیری مرۆڤ ناچێتەوە، یەکێکیان مەسەلەی دینە و ئەوی تریشیان نەتەوەیە.

نڤار: کەواتە بەبۆچوونی بەڕێزتان ئەو پێشبینییە ڕەتدەکەیتەوە کە دەلّێ: ئەو زاراوە گرنگانەی کە بۆ ماوەیەکی زۆر مەیدانی فیکر و کاری داگیر کردبوو وەکو جیهانی سێهەم، ئازادی و دیالۆگی باکور و باشور، گەشەکردنی ئابووری لەسەردەمی بەجیهانی بووندا هیچ واتایەکی نامێنێت، بە تایبەت کە ولاّتانی پێشکەوتوو، ولاّتانی دواکەواکەوتوو پشت گوێ دەخەن و گرنگییان پێ نادەن؟

نەوشیروان مستەفا: بەلّێ ڕەتیدەکەمەوە.

نڤار: ئەوەندەی قسەی لەسەر دەکرێ بەجیهانی بوون قۆناغی پاش دەولّەتە، دروست بوونی دەولّەتی کوردی پاش قۆناغی دەولّەت چ سودێکی هەیە؟

نەوشیروان مستەفا: من پێم وانییە قۆناغێك هەبێ پێی بوترێ قۆناغی پاش دەولّەت، پێم وایە دەولّەتەکان هەر ئەمێننەوە لەبەر ئەوە ئەگەر کوردیش ببێ بە خاوەنی دەولّەت دەچێتە ریزی دەولّەتەکانەوە.

نڤار: چۆن دەولّەت ڕۆلّی خۆی دەبێ؟ کە زۆربەی ئەوانەی باسیان لە بەجیهانی بوون کردووە ئەلّێن ئەو ڕۆلّەی جاران نامێنێت و هەندێکیشیان وشەی چاودێر یان پۆلیسیان بۆ داناوە، هەندێ لە کۆمپانیا زلهێزەکانیش دەلّێن ئێمە وەکو چاودێریش پێویستمان بە دەولّەت نییە، چونکە بەلّێننامەکانمان لەرێگەی کۆمپیوتەرەوە لەگەلّ کۆمپانیاکانی تردا دەبەستین، هەروەها لەرێگەی کۆمپیوتەرەوە دەتوانین خەلّك بۆ کارکردن وەربگرین و دەریشیان بکەین.

نەوشیروان مستەفا: ئەوە ڕاست نییە، لەوانەیە ئەو کۆمپانیایانە بتوانن لەرێگەی کۆمپیوتەرەوە یان ئینتەرنێتەوە (عقد) ببەستن، بەلاّم هەموو پەیوەستنامەیەك لەنێوان دوو کۆمپانیادا یاخود دوو جێگادا بێت، ئەو دەولّەتانە دەتوانن هەلّیبوەشێننەوە،

ئەگەر بەگوێرەی یاسای ئەوان ناپاسایی بێت، ئەتوانن زۆر شتی لەوبابەتە بکەن بەرج نییە کۆمپیوتەر بەسەر هەموو شتێکدا زاڵ ببێ ، واتە لای من نە لە ئاسۆی نزیکدا نە لە ئاسۆی دووردا شتێك نییە ناوی قۆناغی پاش دەوڵەت بێت.

نڤار: هەر لەسایەی ئەو بۆچونەدا دەوترێ بەجیهانی بوون ئیرادەی سیاسی زەوت دەکات و دیموکراسیەتیش مەفهومی پێشتری خۆی لەدەست دەدات؟

نەوشیروان مشتەفا: ئەگەر مەبەستت لەو پرۆژەیە (عولمە) بێت، من پێم وایە ژیانی مرۆڤ وەکو تاك هەتا بەجیهانی بوون زیاتر جێگیر ببێت ژیانی مرۆڤ و تاك ئازادتر و خۆشتر دەبێت، بەپێچەوانەی ئەوە من پێم وانییە بەجیهانی بوون ئیرادەی سیاسی زەوت بکا، بۆ نموونە ئەگەر بەجیهانی بوون سەربگرێت یەکێك لەو شتانەی کە جێبەجێ دەکرێ ئەو جاڕی گەردوونی مافی مرۆڤەیە کە هەموو کەسێك سودی لێ وەردەگرێ و کەڵکی دەبێ بۆی وەکو گوتمان من پێچەوانەی ئەوەم.

نڤار: باشە چوونە ژێر رکێفی بازاڕەکانی سەرمایەدارییەوە لەدەستدانی شەرعیەتی دیموکراسیەت نییە لەکاتێکدا پێویست بوو کە...

نەوشیروان مستەفا: بازاڕی سەرمایەداری مەبەستت چییە؟

نڤار: ئەو کاتەی سەرمایەداری دەبێتە نموونەی باڵای مرۆڤەکان وە کۆنترۆڵیان دەکات و ، دیموکراتیەتیش دەبێتە دیموکراتیەتی سەرمایەداری و ئەوکات چەمکی دیموکراتی دەگۆڕێت و وەکو ئێستا نابێت.

نەوشیروان مستەفا: ژیانی دیموکراسی سەرمایەداری هێناویەتییە پێشەوە، ژیانی سیاسیش دیسان لەسەر بناغەی منافەسە گەشە دەکات، ئەگەر منافەسەش نەمێنێت ژیانی سەرمایەداری و ژیانی دیموکراسیش نامێنێ، دیموکراسیەت تارادەیەکی زۆر بەستراوە بە سەرمایەدارییەوە.

نڤار: بەڵام هەمیشە سیاسەت ئابوری بەڕێوەبردووە، نەك سەرمایەداری سیاسەت بەڕێوەبەرێ، ئەو کات بەجیهانی بوون دەبێت بە راوکەری دیموکراسیەت، چونکە لە بەجیهانی بوونەوە دەڕوانێتە شتەکان، بەو شێوە لۆژیکی ئابووری سیاسەت بەڕێوە

[illegible]، بێگومان ئەو واقیعەش رووت کردنەوەی دەوڵەت یان دەسەڵاتە، بۆ ئەم [illegible]ەش پێویستە چاکسازی لە دەسەڵاتدا بکرێ و رۆڵی بگێڕێتەوە بۆ دەوڵەت.

نەوشیروان مستەفا: وتەیەکی بەناوبانگ هەیە دەڵێ سیاسەت ئابوریەکی خەستە، سیاسەت و ئابوری لەیەك جیا ناکرێنەوە، دوو شتن یەکتری تەواو دەکەن و یەکتری بەڕێوە دەبەن، واتە هەم سیاسەت کاریگەری لەسەر ئابوری هەیە، هەم ئابوری کاریگەری لەسەر سیاسەت هەیە.

نڤار: ئێمە باسمان لە دیموکراتیەت بوو، وتمان ئەو کاتەی ئابوری سیاسەت بەڕێوە دەبات، مەبەستمانە بڵێین دیموکراتیەت ئەو چەمکەی خۆی لەدەست دەدات، چونکە دیموکراسیەت واتە خزمەتکردنی مرۆڤ لە هەموو رووەکانەوە نەوەك (فائچ) کردنی، بەڵام کاتێك سەرمایەداری باڵادەست بێت دەست بەسەر توانای مرۆڤدا دەکێشێ و بۆ نموونە باس لەوە کراوە کە ئێستا رێژەی ٢٠٪ ی مرۆڤ بێ کارە، بەڵام ئەوکات بازاری سەرمایەداری و پێشکەوتنی تەکنەلۆژی جێگە بە مرۆڤ لێژ دەکا و ٨٠٪ ی بێ کار دەبێت، ئەمەش مانای (فائچ) کردنی مرۆڤە.

نەوشیروان مستەفا: من پێم وایە ئەوە جۆرێك لە شیکردنەوەی سەردەمی شەڕی سارد و دابەش بوونی دنیایە بەسەر دوو بلۆکدا، بەکردەوە دەرکەوت ئەو بلۆکەی کە کۆمۆنیزم تێیدا دەسەڵاتدار بوو هەم مافی مرۆڤی پێشێل کردبوو، هەم ئابوریشیان خراپ بوو، ئەوەکەی تر کە بەحساب بلۆکی سەرمایەداری بوو، لەوێ هەم ژیانی خەڵك خۆشتر بوو ، هەم ئازادی تاك و مرۆڤ زیاتر بوو، لەبەرئەوە یەکەمیان روخا، دووەمیشیان ئەوەندەی من بزانم لەوێ مرۆڤ (فائچ) نەبوو، بەپێچەوانەوە لەوێ بەنرخترین سەرمایەی هەیە، ئەویش ئەوەیە کە هەموو مافێکی هەیە.

نڤار: فەرمووت ئەوە شیکردنەوەی سەردەمی جەنگی ساردە، بەو دواییە لێکۆڵینەوەیەکم لەسەر بەجیهانیبوون خوێندەوە، کە تێیدا هاتبوو پاش ١١٣ ساڵ بەسەر مردنی (کارل مارکس) دا، سەرمایە بەوشێوەی لێدێت کە ئەو باسی کردووە، ئەڵێ بەرهەمی سەرمایەداری بەلای بەرزبوونەوەی کرێدا ناڕوات، بەڵکو

...گەری دەبێت بۆ نزم کردنەوەی کرێی کار و گەیاندنی نرخی کار بۆ نزمترین ئاست، هەروەها دەڵێت کاتێك مارکس ئەم چەمکەی لەساڵی ١٨٦٥ لەبەردەم حوکمڕانی جیهانی دەولیدا لە لەندەن گوت، نەیدەزانی سەرمایەداری ڕۆژێك لە ڕۆژان بەرۆحی دیموکراسی ئاو دەدرێت واتە مەبەستمانی ئەوەیە کە ئەو بارە ئابووریەی پێشبینی دەکرێ گەڕانەوەیە بۆ دواوە.

نەوشیروان مستەفا: من باوەڕم بەو قسەیە نییە و خراپیان تەفسیر کردووە، ئەوە لە قسەی بەر ئاگردان دەچێت.

نڤار: پاش هەڵوەشانەوەی دەوڵەتی بلۆکی سۆسیالیزم مشتومڕێك لەنێوان بیریاراندا سەریهەڵدا لەسەر ئەوەی ئاخۆ دنیا بەو شێوەیە دەمێنێت کە ناونرا دنیای تاك جەمسەری یان گۆڕانی بەسەردا دێت؟

نەوشیروان مستەفا: پێم وانییە دنیای تاك جەمسەری هەتا سەر بمێنێتەوە، چونکە لەم سەدەیەدا چەندەها جار گۆڕاوە، ئەو جەمسەر و ئەم جەمسەری کردووە، بۆیە من پێم وانییە ئەم حاڵەتەی کەئێستا لە دوای ڕووخانی بلۆکی ڕۆژهەڵات یەك دنیای تاك جەمسەری دروست بووە هەروا بمێنێتەوە، واتە ئاڵوگۆڕ دەبێت، بەڵام لەڕاستیدا من ناتوانم پێشبینی ئەوە بکەم بزانم ئاڵوگۆڕەکان چۆن دەبێت.

نڤار: تافلەر لە کتێبی بەرەو شارستانێتی نوێ و شەپۆلی سێهەم، ئاماژە بۆ ڕۆڵی تەکنەلۆژیای نوێ دەکات لە ئایندەدا و پێی وایە ئەوەی بۆ هەتا هەتایە حوکمڕانی دنیا ئەکات تەکنەلۆژیایە و هەر لەڕێگەی ئەویشەوە پاساو بۆ حوکمڕانی ئەمریکا دەهێنێتەوە، کە بۆ هەتا هەتایە حوکمڕانی بکات، تاچەند ئەم بۆچوونە جێگەی خۆی دەگرێ و وەکو هەوڵەکانی بازاڕی هاوبەشی ئەورووپی و ژاپۆنیش کە بوونی باشیان هەیە لە بەرهەمهێنانی تەکنەلۆژیای نوێ، دەکرێ ئەو دوو هێزە گەورە ببنە لەمپەری گەورە و هەرەسهێنان بە تاك جەمسەری؟

نەوشیروان مستەفا: لەڕاستیدا ناتوانم پێشبینی ئەوە بکەم، بەڵام باوەڕناکەم تەکنەلۆژیا بتوانێ حوکمڕانی دنیا بکات، چونکە هەمیشە مرۆڤ حوکمڕانی

تەکنەلۆژیا دەکات و تەکنەلۆژیا ناتوانێ حوکمڕانی مرۆڤ و دنیا بکات، بەڵام مرۆڤ دەتوانێ تەکنەلۆژیا بەکاربهێنێ بۆ حوکمڕانی کردنی دنیا، پاشان ئێمە بۆ لە پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا بترسین، خۆ ئەو کات ژیانی مرۆڤ و ژیانی نەتەوە خۆشتر دەبێت، ئێمە وەکو کورد شیعرەکەی (ئەحمەد موختار جاف) ت بۆ دەهێنمەوە کە دەڵێ:

بەسەر ئەرزا ئەگەر نازیش بکەن، هەقتانە کوردینە

هەموو تاریخی عالەم شاهیدی فەزڵ و هونەرتانە

ئێمە نە (پەنسلین) مان دۆزیوەتەوە و نە (سەتەلایت و کۆمپیوتەر و ئینتەرنێت) مان دۆزیوەتەوە، داوامان لێ دەکا بەسەر ئەرزا ناز بکەین، بەڵام کابرای ئەمریکی ئەو هەموو پێشکەوتنەی تۆ لەم سەدەیەدا دەیبینی لە بواری پزیشکی و کیمیا و تەکنەلۆژیا و زانستەکاندا، بەشی هەرە زۆری لە ئەمریکاوە سەرچاوەی گرتووە و بڵاوبووەتەوە بەسەرتاسەری جیهاندا، هەمووشی ئێمە وەکو مرۆڤ سودمان لێوەرگرتووە، چ لە کوردستان و چ لە شوێنەکانی تری جیهان، لەبەرئەوە ئێمە بۆچی لەپێشکەوتنی تەکنەلۆژیا بترسین.

نثار: گوێمان لەوە دەترسین لە لە کارکردندا (فائچ) بن واتە تەکنەلۆژیا جێگەی هێزی کار بگرێتەوە و ئەوکات مرۆڤ لەرووی ئابوورییەوە بروخێت و توانای ژیانی نەمێنێت.

نەوشیروان مستەفا: ئاخر ئەوە پێچەوانەی یەکتری نین لەوەوپێش تەکنەلۆژیا ئەوەندە بەکار نەبووە لەگەڵ ئەوەشدا هەموو جاری قات و قڕی و برسێتی بڵاوبووەتەوە، تاعون بڵاوبووەتەوە، بەڵام ئێستای لەسایەی تەکنەلۆژیاوە ئەو نەخۆشیانە بوونە بە ئەفسانەی ناو مێژوو... بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا نەبووە بەهۆی ئەوەی لەبرسا بمریت، لە هەموو وڵاتە پێشکەوتووەکانی دنیا کە تەکنەلۆژیای پێشکەوتووی تێدایە کەس لە برسا نەمردووە، ئەوەی لەبرسانا مردووە وڵاتانی دواکەوتووی وەکو سۆماڵ و پاکستان و هیندستان و سودان و

[illegible]یە کە تەکنەلۆژیای پێشکەوتووی تێدا نییە.

نقار: کەواتە پێتان وایە تەکنەلۆژیا چەکێکی دوو سەرە و ڕووی باش و خراپی هەیە، هەر دەبێ مامەڵ لەگەڵ هەردوو ڕووەکەی بکرێت؟

نەوشیروان مستەفا: لەوانەیە ڕووی خراپی هەبێ، بەڵام ڕووە باشەکەی زۆر زیاترە، بۆ نموونە کە تۆ ئێستا باسی تەکنەلۆژیا ئەکەیت جاران کۆمەڵێك نەخۆشی وەکو سیل و ئاوڵە و مەلاریا و شتی لەو بابەتە هەموو ساڵێ بەسەدەها مرۆڤی توش دەبوون، تەکنەلۆژیا ئەوانەی نەهێشتووە، تەکنەلۆژیا ئۆتۆمبیلی هێناوەتە ئاراوە ئێمە سودی لی دەبینین، تەلەفیزیۆن و ڕادیۆ دروست بووە ئێمە سودی لی دەبینین.

نقار: هەتا ئێستا هیچ سیستمێك نییە بۆ ڕێکخستنی ئێمە و جیهان، ئێمە چین و جیهان چییە؟ ئایا سەرکردایەتییە کوردییەکان هەتا ئێستا هەنگاوی بەنێودەوڵەتیکردنی دۆزی کوردیان داوە؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ لەوەتەی بزوتنەوەی کورد لەسەر شێوەی نوێ لەسەر دەستی شێخ عوبێدوڵای نەهری ساڵی ١٨٨٠، سەرکردایەتی کورد لە هەموو قۆناغەکاندا هەوڵی زۆریان داوە، بۆ ئەوەی مەسەلەی کورد تدویل بکرێ و لەلایەن دەوڵەتە گەورەکانی جیهان ڕەوایی مەسەلەی کورد بسەلمێنن و هەوڵبدەن زەمینەی دروستکردنی دەوڵەتی کوردی خۆش بکەن، بەڵام باری دەولی تا شەڕی (کوەیت) یش لەبارنەبوو، بۆ ئەوەی مەسەلەی کورد وەکو مەسەلەی نەتەوەیەك بێتەکایەوە، لە دوای شەڕی (کوەیت) واتە شەڕی دووەمی خلیج هەلێك هاتەپێشەوە بۆ ئەوەی پردێکی پەیوەندی لەنێوان سەرکردایەتی کوردی عێراق و لەنێوان جیهاندا دروست بێ، ئێستا بەرهەمەکەی دەبینین کە سەرکردەکانی کورد دەڕۆن بەملاو ئەولادا لەپایەی زۆر بەرزی وڵاتانی ئەمریکا و بەریتانیا و فەرەنسا و تورکیا و ئێران و سوریا قسەیان لەگەڵ دەکەین، خۆ ئەگەر لەهەندێ قۆناغدا سەرکەوتوو نەبوبێت، ئەوە هەلومەرجەکە لەبارنەبووە، بەڵام لەم قۆناغەی ئێستادا هەلومەرجەکە لەبارە تاڕادەیەکی زۆر براوەتە سەر شانۆی نێودەوڵەتی.

نقار: باشە ئەگەر ئەو دەروازەیە بۆ سەرکردایەتییە کوردییەکان کراوەتەوە، بۆچی بەجارە لایەنەکانی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی لە واشنتۆن کۆدەبنەوە، وادەی کۆبونەوەکەشیان هاوکات بوو لەگەڵ ئەو مەراسیمە گەورە نێودەوڵەتییەی کە لەنیۆرك بۆ دەستپێکردنەوەی کاروبارەکانی خولی (٥٤) مین کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان بەڕێوەدەچێت، بۆچی داوای نوێنەر و نمایندەی کورد نەکراوە لە نەتەوە یەکگرتووەکان؟

نەوشیروان مستەفا: داواش بکرێت گوێت لێ ناگرن، داواش دەکرێ و پێشتریش داوا کراوە، لێرەش بەدواوە بەردەوام دەبن لەسەر داواکردن، بەڵام لەبەر ئەوەی کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان، کۆمەڵەی نەتەوەی یەکگرتوو نییە کۆمەڵەی دەوڵەتانی یەکگرتووە، واتە ئەو نەتەوەیەی دەوڵەت نەبێ و سیادەی نەبێ لەلایەن دەوڵەتانی دنیاوە دانی پێدا نەنرابێت، ناتوانی بڕوا لەوێ ببێتە ئەندام، ئەو یانەیە تەنها ئەوانە ئەتوانن ببنە ئەندام تیایدا کە دەوڵەتن، دەوڵەتێکی دانپێدانراو لەلایەن دەوڵەتانی ترەوە، بەڵام ئێمە تائێستا دەوڵەت نین.

نقار: هەر لە هەزارەی سێهەمدا هانتگتۆن پێشبینی شەڕی نێوان ئیسلام و مەسیحییەت دەکات؟

نەوشیروان مستەفا: من لەو باوەڕەدا نیم لەنێوان ئیسلام و مەسیحیەتدا شەڕ ببێت، پێم وایە دایەلۆگ و گفتوگۆ و ئاڵوگۆڕ ئەبێ، ڕەنگە لە هەندێ بواردا لەیەکگەیشتن ببێ، بەڵام بەهیچ جۆرێك پێشبینی ئەوە ناکەم شەڕ لەنێوان ئیسلام و مەسیحیەتدا ببێ.

نقار: ئەگەر بەجیهانی بوون تصدیر کردنی ئایدۆلۆژیای ڕۆژئاوا بێت و ئیسلامیش باوەڕی بەیەکتاپەرەستی هەبێ، چۆن شەڕ نابێت، ئەوەتا ئێمە نموونەی ئەفغانستان و جەزائیر و ..هتد مان هەیە، کە توندڕەوەکان لەناو خۆشیاندا و لەگەڵ میللەتەکەشدا لەسەر دەسەڵات بەشەڕ هاتوون.

نەوشیروان مستەفا: بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە، بۆ نموونە لەوانەیە لە جەزائیر بڕۆن

[illegible] مەسیحی بکوژن یان لە ئەفغانستان سەد مەسیحی یان سەد جولەکە بکوژن، بەڵام شەڕ لەنێوان ئەو دوو دیانەتەدا نابێت، شەڕ لەنێوان ئەو دەوڵەتانەدا نابێت کە بەسەر ئەو دوو دیانەتانەدا دابەش بوون، بۆنموونە ئێران لەرووی ئاینییەوە یەکێکە لەو دەوڵەتانەی بە تەواوی دینییە، بەڵام بڕواناکەم رۆژێك لە رۆژان لەگەڵ دەوڵەتانی مەسیحیدا لەسەر دین جەنگ رابگەیەنێ.

نڤار: ماوەیەکی زۆرە ئیسلامیی سیاسی وەکو بزوتنەوەیەکی توندڕەو سەری هەڵدا و هاتە ململانێی سیاسییەوە و لەناو کایە سیاسییەکاندا حسابی لەسەر دەکرێ، بەبڕوای بەڕێزتان لەکۆتایی ئەم سەدەیەدا و هەنگاونان بەرەو هەزارەی سێهەم، ئیسلامی سیاسی ئەو هەڕەشە گەورەیە دەبێ لەسەر کۆمەڵگای مرۆڤایەتی؟

نەوشیروان مستەفا: بەڕای من نەخێر نابێت.

نڤار: چۆن نابێت، ئەوەتا ئیسلامی سیاسی لەناو بزوتنەوە کوردییەکاندا داوای شوێن و دەستەڵات دەکا و هێشتا دەستەڵاتیشی بەدەستنەهێناوە تیرۆر دەکات، ئەگەر ئەو هەلەی بۆ بڕەخسێت ئەو شەڕە دەکات لەسەر دەستەڵات یان نایکات؟

نەوشیروان مستەفا: خۆی ئیسلامی سیاسی لەجیهاندا دوو جۆری هەیە، جۆرێکیان بەڕێگەی ئاشتی خوازانە و هێمنانە کاردەکەن و دەیانەوێ لەرێگەی هەڵبژاردن و پەرلەمانەوە بچنە ناو ژیانی سیاسیەوە، جۆرێکی تریشیان هەیە بەچەك و کوشتن و تیرۆر دەیەوێ بچێتە ناو ژیانی سیاسییەوە، جا بەشی یەکەمیان من بەش بەحاڵی خۆم پێم وایە شتێکی ئاساییە وەکو هەموو حزب و لایەنەکانی تر ، مافی ئەوەیان هەیە بەڕێگەی دیموکراسی و مافی راکێشانی دەنگ چەند جێگە لە حکومەت و پەرلەماندا وەرگرن، ئەوە ئاساییە پێم وانییە هەڕەشەیان هەبێت بۆ مرۆڤ، جۆری دووەمیان کە دەیانەوی بەچەك دەستی خۆیان بەسەر کۆمەڵدا زاڵ بکەن و بەڕێگەی کوشتن و برین دێنە پێشەوە، پێم وایە ئەمانە گروپێکی ترسناکن پێویستە چارەسەر بکرێن و رێگە نەدرێت کە گەشە بکەن و پەرەبسێنن.

نڤار: ئەی بۆ نابێ گروپی یەکەمیش ئەوەی ئێستا بەکاری دەهێنێت دیبلۆماسیەت

بەو لەکاتی هەل بۆ رەخساندا هەمان پرۆگرامی ئەوانی دیکەیان هەبێ؟

نەوشیروان مستەفا: ئێ باشە با حزبە سیاسییەکانی تر پرۆگرامێکی ئەوەندە باشیان هەبێت خەڵك کۆبێتەوە لێیان و نەك لێیان بتەکێنەوە و ببن بەئیسلامی سیاسی لە قاڵبی حزبە سیاسیەکەدا، من دڵنیام خەڵك لە پرۆگرامی باش کۆدەبێتەوە، پێم وایە کەموکوڕی لە حزبە سیاسییەکاندا هەیە، بۆیە خەڵك دەچن لەوان کۆدەبنەوە.

نڤار: کەواتە ئێوە دەستەڵاتی عەلمانین یان ئیسلامیی؟ ئەگەر عەلمانین وەکو ئەوەی بانگەشەی دیموکراسیەت دەکەن، بۆچی مەسەلە دنیاییەکان لە ئایینییەکان جیا ناکەنەوە؟

نەوشیروان مستەفا: من خۆم لەدەستەڵاتدا نیم تا بەناوی دەستەڵاتەوە قسە بکەم، بەڵام ئەو حزبەی منی تێدام حزبێکی عەلمانییە، بەمانای ئەوەی لەسەر بنچینەی دین دانەمەزراوە، لەناو یەکێتیدا موسوڵمانی سوننی و شیعی، یەزیدی، کاکەیی، مەسیحی تێدایە، ئێمە شتێك نین کە لەسەر بیروباوەڕی دینی دامەزرابێتین، بە مانایەك ئێمە عەلمانین، بە مانایەکی دیش هەریەکە لە ئێمە دین و مەزهەبێکی هەیە ناتوانین لە خۆمانی دابڕین یان خۆمانی لێ بهێنینە دەرەوە لەو ڕووەوە ئێمە ڕێزمان هەیە بۆ هەموو مەزهەبەکان بەتایبەت دینی ئیسلام کە دینی زۆربەیە لە ناوچەکەماندا، ئێمە ئەگەر بمانەوێ ڕێز لە ئیرادەی میللەتەمان بگرین، پێویستە ڕێز لە دینیشیان بگرین، هەندی شت هەیە ئێمە ناتوانین ئاڵوگۆڕی تێدا بکەین، چونکە دین ڕێگا نادات بۆ گۆڕینیان.

نڤار: وتمان بۆچی مەسەلە دنیاییەکان لە ئیسلامییەکان جیاناکرێنەوە، بۆ نموونە ئەو بەندانەی لە یاساکاندا هەیە خۆ لە هەموو دنیاشدا هەر وابووە، خەڵك ئایینی خۆی هەبووە پەرەستویەتی و ڕێزیشی لێگیراوە، بەڵام یاسایەکی جێگیر هەبووە بۆ هەموو مرۆڤەکان بەبێ جیاوازی و یاسای ئایینی نەبووە؟

نەوشیروان مستەفا: وایە ڕاستە، ئێمە بەداخەوە لە دوای دامەزراندنی پەرلەمان؟ بە ماوەیەکی کەم شەڕی ناوخۆ بوو، ئیتر ئەو پەرلەمانەمان پەکی کەوت، ئەگینا

[illegible]امەی پەرلەمانەکەماندا هەبوو دەسکارییەکی زۆری ئەو یاسایانە بکرێت بە فازاجی ژن بە جۆرێکی پێشکەوتوانە، وابێ هەم لەگەڵ دیندا بگونجێ و هەم لەگەڵ ئەو پێشکەوتنەی ئێستا بگونجێ، شەڕی ناوخۆ پەکی ئەوەی خست، بەڵام ئێستا ئەو مەسەلانە لەلایەن حکومەتەوە خەریکی هەندێ گۆڕانن تێیدا.

نڤار: باسی شەڕی ناوخۆتان کرد کاتی جیهان باسی شەڕی شارستانیەت دەکات ئێمە باسی شەڕی ناوخۆ دەکەین، ئەو شەڕەی زۆرجار بە عەشایەرگەری ناوزەند دەکرێت نەك سیاسی.

نەوشیروان مستەفا: لەراستیدا شەڕی ئێمە شەڕی عەشایەرگەرێتی نییە، لەبەرئەوەی هەندێك لە نوسەرانی دەرەوەی دەیانەوێت بیخەنە ئەو قاڵبەوە، نەڵێن شەڕی نێوان عەشیرەتی تاڵەبانی و عەشیرەتی بارزانی، یان شەڕ لەنێوان تەریقەتی قادری و تەریقەتی نەقشبەندی، پێم وایە ئەو لێکدانەوەیەکی زۆر سادە و ساکارانەی مەسەلەکانە، شەڕی نێوان یەکێتی و پارتی لەسەر دەستەڵاتی سیاسییە، بەڵام لەبەرئەوەی هەردوو حزبەکە میلیشیای چەکداری خۆیان هەیە، ناتوانن ململانێکە بەشێوەیەکی سیاسی بکەن، لایەك بیباتەوە یاخود لایەك ببی بە حزبی یەکەم و لایەك ببی بەحزبی دووەم، ئەم ململانێیە بووە هۆی ئەوەی میلیشیای هەردوولا بدات بەیەکدا و کۆمەڵێ پێشینەی مێژووی ئەم شەڕە لەنێوان ئەم دوو حزبەدا هەبووە، دەستێوەردانی ولاتانی ئیقلیمی ئەمسەر و ئەوسەر بووە بەهۆی ئەوەی درێژە بکێشێ لەراستیشدا پەیوەندی بە عەشایەرگەرییەوە نییە، دوو بۆچوونی جیاواز بۆ حوکمڕانی، بۆ جۆری دامەزراندنی دەوڵەت لە کوردستاندا دوو بۆچوونی جیاوازە لە ئیدارەکردنی ناوچەکەدا.

نڤار: کەواتە هەقە لێرە بپرسین عەقڵیەتی سیاسی کورد توانیویەتی لەبەرامبەرەکەی بگات و مامەڵەی لەگەڵدا بکات؟

نەوشیروان مستەفا: من رەنگە ئەوە جێبهێڵم بۆ مێژوونوس ئەو حوکمە ساغ بکاتەوە، بەلام لە روانگەی خۆمەوە بەڵێ، چونکە ئێمە لە سی ساڵی رابردوو

لەگەڵ یەکێك لە بەهێزترین دەوڵەتەکانی جیهاندا کرد، کە خۆی پێی وابوو هێزی پێنجەمی دنیایە، جگەلەوەی لە چەك و جبەخانە و سەرووەت و ساماندا یەکێك بووە لە دەوڵەتە هەرە دەوڵەمەندەکانی جیهان، لەمەسەلەی دڕندایەتی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی و چەکی بایلۆژی و ئاگریشدا هیچ دەوڵەتێك لەجیهاندا هێندەی دەوڵەتەکەی ئێمە دڕندە نەبووە، چونکە هیچ دەوڵەتێك دژی میللەتەکەی خۆی ئەو چەکانەی بەکارنەهێناوە ، سەرەڕای ئەو هەمحوو جینۆسایدە و بەکارهێنانی چەکی گران بەها و نابەرانبەری تەرازووی هێز لەنێوان جوڵانەوەی کورد و حکومەتی عێراقدا لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە توانیمان بمێنین و لە هەل و فرسەتدا هاتینە مەیدان و رابەرایەتی راپەڕینمان کرد و ئێستاش لە جیاتی حکومەتێك دوو حکومەتمان هەیە.

نڤار: خۆی هەر هەبوونی ئەو دوو حکومەتە پێشتریش هەبوونی هەندی کەموکوڕی لە حوکمڕانییەکەی شێخ مەحمودی نەمردا جۆرێکە لە نەزانینی مامەڵەکردن، راستە راپەڕین جۆرێك بوو لە تێگەشتن و مامەڵکردن لەگەڵ بەرامبەردا، بەڵام گەڕانەوە بۆ خاڵی سفر و گەڕانەوەی بەرامبەر بۆ نێو خود و عەقڵیەتی کوردی جۆرێکی تر نییە لە نەزانینی مامەڵەکردن؟

نەوشیروان مستەفا: رەنگە بتوانین وا تەفسیری بکەین، لەوانەشە تەفسیری تریشی بۆ بدۆزینەوە.

نڤار: باشە هەڵە گەورەکانی عەقڵیەتی سیاسی کورد، تەنها سیاسییەکان لێی بەرپرسیارن یان خەڵکیش لێیان بەرپرسیارە؟

نەوشیروان مستەفا: بەڕای من هەرچی هەڵەیەك هەبێ بەرادەی یەکەم سیاسییەکانی کورد خۆیان بەرپرسیارن، بەڵام لە هەمان کاتدا هەندێ جار گوێ پێنەدانی خەڵکیش دەبینین دەڵێین خەڵکیش لێیان بەرپرسیارە بۆچی خەڵك قبوڵیانە؟

نڤار: کەواتە پێویستە رۆڵی خەڵك چۆن بێت، بە تایبەت کە خەڵك هەڵەیەکی سیاسی و راستێکیش دەبینێ، ئەویش لەگەڵ هەڵەکە و راستیەکەشدایە؟

[نەوشیـ]ـروان مستەفا: پێویستەخەڵك بەرامبەر هەموو هەڵەیەك بە چالاكی رابوەستێت، من لایەنگری ئەوەنیم خەڵك شۆڕش بكات دژی ئەم حكومەتە یان حكومەتی هەولێر یان هەر حكومەتێكی كوردی كە هەیە، بەڵام پێم خۆشە خەڵك ئەو شێوە شارستانییە بەكاربهێنێ بۆ زەخت كردن و هێنانی گوشار بۆ ئەوەی ئەگەر هەڵەیەكیان بینی لە سەركردایەتی یەكێك لەم حزبانە یان سەركردایەتی یەكێك لەم حكومەتانە ناچاریان بكەن بۆ ئەوەی راستی بكەنەوە، بەڵام نەك پشێوی و روخان و پەلاماردان ، بەڵكو دەتوانرێگەی تر بگرن، گرووپی زەخت كۆبكەنەوە.

نڤار: باشە پێتان وایە خەڵك ئەو كاریگەرییەی هەبێ، كۆمەڵێ خەڵكی زۆربوین دژی ٣١ ی ئاب مانمان گرتبوو دیسان كۆمەڵێكی دی دژی شەڕ ویستیان لە هەولێر خۆیان بسوتێنن كەس نرخی بۆ دانان؟

نەوشیروان مستەفا: چەند سەد كەس بوون كە مانتان گرتبوو؟

نڤار: دەكرێ لە هەموو مانگرتوان لە نوسەران و هونەرمەندان و ژنان و خەڵكانی ئاسایی لەسەرو سەد و پەنجاوە بوبێت بە تەواوی نازانم.

نەوشیروان مستەفا: من ئێستا نموونەیەكت بیردەخەمەوە كۆمەڵی ئەلبانیا، ئەو خۆپیشاندانانەی بوو بەهۆی ئاڵوگۆڕ لە ئەلبانیادا، خۆپیشاندانەكانیان، بەنموونە یۆغسلافیا دەهێنمەوە ئەو مانگرتنانەی درێژەی كێشا تا بوو بەهۆی ئەوەی كۆمەڵێ ئاڵوگۆڕ پەسەند بكرێت، من مانگرتنی لەوجۆرە دەڵێم ئەگینا سەد كەس یان سەد و پەنجا كەس بڕوات لەجێگەیەكدا مان بگرێت و نان نەخوات، بە خەیاڵیاندا نایەت ئەگەر لەبرسا بمرن.

نڤار: باشە ئەگەر رێزی سەد كەس نەگیرێ رێزی خەڵكی تریش ناگیرێت، یاخود لەوانەیە ئیتر خەڵكی تریش جورئەت نەكا شتێكی لەوجۆرە بكا؟

نەوشیروان مستەفا: كەواتە خەڵك ئەوە بەهەڵە نازانێت بۆیە نایكات، تۆ ٣١ ی ئابت پێ هەڵە بوو ، بەڵام دەیان هەزار پێیان راست بوو، هاتن شەرپشیان بۆ كرد.

نڤار: لێرەشدا حاڵێكی دی دێتە پێشەوە، ئایا ئەو حسابە بۆ خەڵك دەكرێت بۆ

شەڕی ناوخۆ کرا و کە ئاشتیش دەکرێت پرس بەخەڵك دەکرێت؟

نەوشیروان مستەفا: لەم دەڤەری ئێرەدا بەڵێ پرس بەخەڵك کراوە، چونکە ئەم حزبانە بەچی دەژین، بەخەڵك دەژین، حزب ئەگەر جەماوەری نەبێت چۆن دەتوانی حوکمڕانی بکات، وەختێ کە شەڕ دەکات بەخەڵك شەڕ دەکات، شەڕی سیاسی، شەڕی چەکداری، شەڕی پڕوپاگەندە، لەبەرئەوە من پێم وایە پرس کردنیش جۆری هەیە، تۆ ئەگەر بتەوێت لە هەموو ڕووداوێکدا ڕاپرسێك بکرێت و ڕای سەرجەم خەڵك وەرگیرێت، شتی وا ناکرێت، بەڵام بۆ زۆرێك لەو مەسەلە گرنگانەی لەم بەشەی ئەم وڵاتەی ئێمەدا هەبووە بەڵێ پرس کراوە، زۆرجاری وا هەبووە کەرتەکانی خەڵك بە جیا کۆکراونەتەوە پزیشك بەجیا، ئەندازیار و مامۆستا و ژن و خوێندکار و هتد بەجیا پرسیان پێکراوە.

نقار: ئەی کەواتە بی دەنگی خەڵك بەامبەر دیاردە دزێوەکان، لەنگی نییە لە سایکۆلۆژیەتی تاکی کورددا؟

نەوشیروان مستەفا: نازانم ناوی نانێم لەنگی لە سایکۆلۆژیەتی تاکی کورددا، بەر لەراپەڕین مرۆڤی کورد هێندە چەوسانەوە و نارەحەتی بینیوە لەدەست دەستەڵاتی بەعس بۆیە خەڵك ئەم دەستەڵاتە کوردیانەی بە هەموو کەموکوڕیەکانەوە پی باشترە، نەك بەعسییەکان، لەبەرئەوە دەترسێ شتی بکات و بەعسییەکان بگەڕێنەوە، لەبەرئەوە بەهەموو کەموکوڕیەکانەوە خەڵك ئەم دەستەڵاتانە بەهی خۆی دەزانێت.

نقار: کەواتە بۆچی کۆچ دەکەن یەکێك لەو دیاردانەی ڕۆژهەڵات پێوەی دەناڵێنی کۆچ کردنە، وەکو (سەمیر ئەمین) باسی کردووە ئەڵێ کۆچ کردن بەمەبەستی کەنار بەجێهێشتن و چوونە سەنتەر دەکرێت، کەنار بەمانای سڕان و دیارنەبوون و سەنتەریش بەواتای بالأبوون گەشەکردن بەم پێیەش کەنار بۆشایی روناکبیری و و زانستی و فەرهەنگی تێدا دروست دەبێت، هەر ئێستا بەتایبەتی کۆچکردنی عەقڵ بەشێوەیەك پەرەی سەندووە، هەموو جیهان بیر لە چارەسەرکردنی دەکاتەوە، بەڵام ئەوەندەی تێبگەین کۆچی کورد لە سەنتەرەوە بۆ کەنارە، ئێمە چۆن ئەم دیاردەیە

هەڵسەنگێنین؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ، ڕەنگە ئەو قسەیە بۆ سەمیر ئەمین خۆی ڕاست بێت، سەمیر ئەمین خەڵکی میسرە، ئەگەر لەوێ بمایەتەوە لەوانە بوو هەر لە کەناردا بمایەتەوە، بەڵام وەختێ کۆچی کرد، توانی جێگای خۆی بکاتەوە لەناو ئەو سەنتەرەدا کە باسی کردووە، چەندەها بابەتی نوسیوە لەسەر ئابوری و شتی لەوبابەتەی بە زمانە ئەورووپییەکان بەتایبەتی زمانی ئینگلیزی وەرگێڕاوەتە سەر زمانەکانی فەرەنسی و ئەڵمانی و زمانی تر، ڕەنگە بەسەر خۆیدا بسەپێت، ئەگەر لە کەناردا بمابایەتەوە ئەکوژایەوە و بەناساراوی نەدەمایەوە، بەڵام کەچووە ئەوێ لەوێ بە دەرکەوتویی درەوشایەوە، ئەوانەی ئێمە بەپێچەوانەوە زۆرجار لە کوردستاندا مامۆستایەکی زانکۆ پیاوێکی درەوشاوە و دەرکەوتووە، جێگای کۆمەڵایەتی بەنرخی هەیە، ئەوەندەی من تێبینیم کردووە لەم ١٠-١٥ ساڵەی ڕابردوودا ئەو عەقڵەی ئێمە لێرە کۆچ دەکا و دەچێت بۆ ئەورووپا و ئەمریکا جێگای خۆی پێ ناکرێتەوە، لەوی نەك هەر ناتوانێ کەسێکی دەرکەوتووی وەکو سەمیر ئەمین بێت، بەڵکو بەکەسێکی پەراوێزکەوتوو و نادیار و تەنانەت هەندێك جار پیشەکەی خۆشی لەدەست دەدات، دواجار سەمیر ئەمین پێی وایە دنیای دابەشکردووە بەسەر شار و لادێدا، پێی وایە ئەورووپا و ئەمریکا شاری دنیایە و باقی وڵاتانی تر لادێی دنیان.

نڤار: هونەرمەندێکی گەورە کۆچ دەکات و خۆشی دەزانێت دەچێتە کەنارەوە، لەگەڵ ئەوەشدا دەڕوات و کەناری قبوڵە، ئەو فاکتەرە سایکۆلۆژیانە چین و چارەسەری ئەو دیاردەیە چییە؟

نەوشیروان مستەفا: لام وایە باشترە ئەوە لە خۆیان بپرسین، بەڵام ئەوەندەی من ببینم کۆچکردن یەك هۆی نییە، چەندین هۆی هەیە لەسەرووی هەموشیانەوە، نادیاری پاشەڕۆژی ناوچەکەیە، یەکێکی تریان جێگیر نەبوونی دامودەزگای ئیداری و ئەو جۆرە شتانەیە، هەروەها شەڕی ناوخۆ کوردستانی دابەشکردووە بەسەر دوو ناوچەی جیاوازدا، هۆیەکی تر دەگەڕێتەوە بۆ لاوازی باری ئابووری، گەنجان لێرە

[illegible] بنیاتی ژیانی خۆی دابین بکات، خوێندنی باڵای تەواوکردووە ناتوانیٚ بەو [illegible] وەزیفەیەك وەربگریٚ پێی بژی ژنی پیٚ بهێنیٚ، خانووی پیٚ بکات و ئۆتۆمبیلی پیٚ بکرِیٚت، ئەو ئاواتەی نایەتەدی لەبەرئەوە هەوڵ ئەدات لە شوێنێکی دی بیهێنێتەدی، رەنگە هۆیەکی تر چاو لەیەك کردن بێت فلاٚن دەرِوا من بۆ نەرِۆم ئەو کۆچە بێگومان پێویستە لێکۆڵینەوەی لەسەر بکریٚ بەباشی هەوڵی چارەسەرکردنی بدرێت، بێگومان هەموو جالیەیەکی کورد لە ئەورووپا یان ئەمریکا بۆ ئێمە هێزێکی گەورەیە لە پاشەرِۆژدا، چونکە دەوڵەت نیین تا لەویٚ سەفارەتمان هەبیٚ، ئەوانە ئێمە دەتوانین لەچەند روویەکەوە سودیان لیٚ وەربگرین، بەلاٚم لەهەمان کاتیشدا لایەنی خراپی ئەوەیە کە ئێمە ژمارەیەکی زۆر خەڵکمان لەدەست دەچیٚ و دەچێتە ناو کۆمەڵگایەکی تر، جگە لەو هەموو خێزان و خەڵکە پەرتەوازەی وڵاتان بوون شیرازەی خێزانیان تێکچووە و لێکترازاوە و کێشەی کۆمەلاٚیەتی زۆر گەورەیان بۆ دروست بووە، بەهۆی ئەو دوو جیهانەوە، جیهانی کوردستان و جیهانی ئەورووپا.

نڤار: بابچینە سەر ژن بپرسین نەخشی ژن لە پرۆگرامەکان (ی.ن.ك) چییە لە هەزارەی سێهەمدا، یاساکانی ئەحوال شەخسی کاری مەحاڵ دەبێت یان پرۆژەیەك بۆ پراکتیك کردن، گەر زیاتر تیشکی بخەیتە سەر؟

نەوشیروان مستەفا: وەکو بەر لەئێستا ئاماژەم بۆ کرد، کاتی خۆی بەرنامەیەك هەبوو بۆ پەرلەمان دەسکاری ئەمانە بکات، بەهۆی شەرِی ناوخۆوە پەرلەمان پەکی کەوت، لەدوایدا سەرقاڵ بوو بەشەرِی ناوخۆوە، وای کرد ئەو شتانە بیر بچێتەوە، بەلاٚم ئەوەندەی ئاگاداربم ئێستا ی.ن.ك و حکومەت خەریکی لێکۆڵینەوەیە لەسەر هەندێك لەو یاسایانەی جۆرێك لە زۆرداری تێدایە و بەعسییەکان کاتی خۆی دایان رشتووە، بۆ ئەو مادانە خەڵکی شارەزا و پسیۆریان راسپاردووە کە دیاری بکات و بەدیلی بۆ بدۆزێتەوە، ئەوەی پێویستی بەهەڵوەشاندنەوە و لابردن هەبیٚ لابېرێت و ئەوەشی پێویستی بەگۆرِین هەبیٚ دەسکاری بکەن و بیگۆرِن، ئەوندەی من ئاگام لیٚ

بێت به قازانجی ژن دەبێت، لەوانەیە هەندێ شت لەم قۆناغەدا نەکرێت، بۆنموونە هاوسەرێتی مەدەنی بەوشێوەیەی لە وڵاتانی تر و لە دنیادا هەیە بۆ ئێمە ناشێت ژنێکی موسوڵمان بچێت شوو بە پیاوێکی جولەکە یان مەسیحی بکات، بەڵام هەندێ مەسەلەی تەڵاق و مارەیی و شیربایی دەتوانرێت گۆڕانکاری پێشکەوتنخوازانەی تێدا بکرێت.

نڤار: بەڕێزتان تا چەند لە بزوتنەوەی ژنانی کورد رازین، پێتان وایە کاری فیعلییان کردووە بۆ بەرەوپێشچوون و بەدەستهێنانی مافەکانیان و بەرەوپێشبردنی بزوتنەوەکەیان؟

نەوشیروان مستەفا: لە راستیدا من ناتوانم وەڵامی ئەم پرسیارەت بدەمەوە، چونکە لەچەند ساڵی رابردوودا لێرە نەبووم و بەباشی ئاگام لەو بزوتنەوانە نەبووە.

نڤار: ئەی پێشنیاری ئەوە دەکەیت لە کۆتای ئەم هەزارەیە رێکخراوەکانی ژنان ببن بەیەك و وەکو بزوتنەوەیەکی سەرتاپاگیری تەنها لە خزمەت کێشەی ژندا بن، نەك کۆمیتەی حزبی و پاشکۆیەتی حزب؟

نەوشیروان مستەفا: ئەگەر ژنەکان، ئافرەتەکان گەیشتن بەو قۆناغەی کە مەسەلەی کێشەی ژن بەشتی یەکەمیان و هەموویان لەدەوری ئەوە کۆببنەوە، بەبێ ئەوەی گوێ بدەن بە جیاوازی حزبی و تەنها بۆ کێشەی خۆیان کار بکەن، بەڵێ ئەو پرۆژەیەم بەدڵە و زۆریشم پێ باشە.

نڤار: دواجار دەپرسین ، تێکەڵاوبوون و بەشداربوونی کاری حزب و حکومەت، تەنانەت هەندێ جار دەچنە پەراوێزی یەکتریشەوە، ئەمە نەبوونی نەخشەی پێویست دەکات لە کارەکاندا یاخود رایەکی دیتان هەیە لەسەری؟

نەوشیروان مستەفا: تێکەڵاوکردنی حزب و حکومەت یەکێ بووە لە نیشانەکانی سیستەمە تۆتالیتارییەکانی دنیا وەکو سیستەمی نازی، فاشیی، بەعسی و وڵاتانی یەکێتی سۆڤێتی جاران، بەکردەوە ئەم سیستەمانە شکستیان خواردووە و ناهێنێ چاویان لێ بکرێ، لە وڵاتانی دیموکراتیدا دەستەڵاتی حزب لە دەستەڵاتی حکومەت

[illegible]ەوە، ژیانی سیاسی باشی ئەمەیانی سەلماندووە، من خۆم هەر لەسەرەتاوە ڕەئیم وابووە کە ئەم دوو دەستەڵاتە لەیەکتری جیا بکرێنەوە.

دیمانە/ کازیوە ساڵح

## تاڵەبانی: نەوشیروان موستەفا نەیاری یەکێتیو حکومەتە

جەلال تاڵەبانی سکرتێری گشتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان ڕایگەیاند نەوشیروان موستەفا نەیاری یەکێتی نیشتمانی کوردستانو حکومەتی هەرێمی کوردستانەو بڕوای بە هاوپەیمانی نییەو دەیەوێت سلێمانی سەربەخۆ بێتو دهۆك سەربەخۆ بێتو هەولێریش سەربەخۆ بێتو پەیوەندی لامەرکەزییان بە بە بەغداوە هەبێت.

لە چاوپێکەوتنێکدا کە ئەمڕۆ پێنج شەممە لە ڕۆژنامەی ئەلشەرقولئەوسەتی چاپی لەندن بڵاوکراوەتەوە، جەلال تالەبانی سکرتێری گشتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە وەڵامی پرسیاری، ڕۆژنامەنوس (معەد فەیاز ) کە ئاخۆ نەوشیروان موستەفا بە ئۆپۆزسیۆن یان بە نەیار ناوزەند دەکات ؟

جەلال تالەبانی دەڵێت " نەوشیروان موستەفا نەیاری یەکێتی نیشتمانی کوردستانو حکومەتی هەرێمی کوردستانەو بڕوای بە هاوپەیمانی نییەو دەیەوێت سلێمانی سەربەخۆ بێتو دهۆك سەربەخۆ بێتو هەولێریش سەربەخۆ بێتو پەیوەندی لامەرکەزییان بە بەغداوە هەبێت".

سەبارەت بە کاندیدکردنی هیرۆ ئیبراهیم ئەحمەد بۆ پۆستی بەرپرسی مەڵبەندی سلێمانی، جەلال تالەبانی سکرتێری گشتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان ئاماژە بۆ ئەوەدەکات کە ئەو بە هیچ شێوەیەك نەچۆتە ناو بابەتی دانانی ئەو لەو پۆستە، لەگەڵیشیدا باسی نەکردوە دەڵێت " هەڤاڵانم لە مەکتەبی سیاسی بە تایبەتیش برایان مەلابەختیار، دلێری سەید مەجید و ئەوانی تر قسەیان لەگەڵ کردووەو پاش

رونکردنەوەی، قەناعەتیان پێکردووە"
تاڵەبانی لەو چاوپێکەوتنەدا ئاماژەی بۆئەوەکردووە کە ئارەزووی ئەوەی نییە جارێکی تر بۆ پۆستی سەرۆك کۆماری عێراق خۆی کاندید بکاتەوە.
ناوبراو دەڵێت"دەمەوێت خۆم تەرخانبکەم بۆ کارەکانی سکرتێری گشتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستانو نوسینەوەی یاداشتەکانم".
بەڵام لەهەمانکاتدا تاڵەبانی ئەوەشی رونکردۆتەوە کەئەگەر هاتوو داوای لێکرا ئەوە لەو ئارەزووەی خۆی دەبورێتو خۆی کاندید دەکاتەوە بۆ پۆستی سەرۆك کۆماری عێراق.

دریژەی چاوپێکەوتنەکەی مام جەلال

سەرۆك مام جەلال بۆ (الشرق الاوسط): ئارەزووی تایبەتیم ئەوەیە خۆم بۆ جاری دووەم کاندیدنەکەم، مەگەر کوتلە سیاسییەکان ئەو داوایەم لێ بکەن و: بەشی هەواڵ و سیاسەت ٢٠٠٩/١٢/٣١
*بەدرێژایی ژیانم لەریزەکانی شۆڕشی کورددا لەپێناوی عیراقێکی دیموکراتدا خەباتم کردووەو لەوێوە داکۆکییم لەمافەکانی کورد کردووە
*نەوشیروان مستەفا پێی وتم نامەوێت حزب پێکبهێنم، بەڵکو دەمەوێت ریفۆرم بکەم و هەر تۆش دەتوانیت ریفۆرم بکەیت و منیش پشتیوانیتان دەکەم!
* ئێستا نەوشیروان دژی یەکێتییەو و بەرهەڵستکارەو دژی حکومەتی هەرێمیشە

سەرۆك مام جەلال سەرۆك کۆماری عیراق لەچاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ رۆژنامەی (الشرق الاوسگ)ی لەندەنی رۆشنایی خستە سەر ماوەی یەکەمی سەرۆکایەتیی کۆمارو پرسە هەنووکەییەکانی سەر گۆڕەپانی عیراق وهەروەها لەچاوپێکەوتنەکەدا کە لەژمارەی دوێنێی رۆژنامەکەدا بلاوکراوەتەوەو لەلایەن رۆژنامەنووس (مەعد فەیاز)ەوە ساز کراوە، سەرۆك تاڵەبانی لەبارەی چەند پرسێکی ئەمڕۆی کوردستانیش

...ریت که ئەمە دەقی چاوپێکەوتنەکەیە:

...ڕێکخەرمان هەبووە

*ماوەی سەرۆکایەتییەکەتان کە لەسەروبەندی کۆتاییهاتندایە، چۆن هەڵدەسەنگێنن؟

-پێموایە سەرکەوتوو بووە، تێیدا ڕۆڵی ڕێکخەر (منسق)و سەرخەرمان لەپرۆسەی سیاسی عیراقدا گێڕاوەو توانیومانە کۆمەڵێك پەیوەندیی دەرەکی باش بەدی بهێنین. لەم ڕووەوە پەیوەندییەکانمان لەگەڵ براکانمان لەجیهانی عەرەبدا بەهێز کردووە، بەتایبەتی لەگەڵ میسری برا گەورەمان، و لەگەڵ برامان جەنابی سەرۆك محەمەد حوسنی موبارەك، توانیومانە پەیوەندییەکی ستراتیژی بێنینەکایەوە، هەروەها لەگەڵ سعودیە-ی براو ئوردن و دەوڵەتی ئیمارات و لەگەڵ تورکیای دراوسێماندا بەجۆرێك بناغەی هاوپەیمانیی ستراتیژیمان لەنێوان هەردوو وڵاتەکەدا داڕشتووە، جگە لەوەش پەیوەندییەکانمان لەگەڵ ئەو دەوڵەتە گرنگانەی کە سەردانمان کردوون پەرەپێداوە وەکو چین و فەرەنساو بەریتانیاو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، وێڕای ئەوەش گوڕوتینێکمان بەبەردەوامبوونی ئەو پەیوەندییانە بەخشیووە ئەویش لەڕێگەی دیدارە مانگانەکانماندا کە خۆم لەگەڵ باڵیۆزانی عەرەب و بیانی لەعیراقدا کردوومن، هەروەها کارمان بۆ ڕاییکردنی کاروباری دەوڵەت کردووە کە بەڕێز نوری مالکی سەرۆکایەتیی حکومەتەکەی دەکات.

دەسەلاتەکەمان تەشریفی نییە

*پێتان وایە ڕۆڵتان کاریگەرتر دەبوو ئەگەر دەسەلاتێکی فراوانترتان هەبووایە؟

-بوارم پێبدە مەسەلەیەکی گرنگت بۆ ڕاست بکەمەوە، ئەویش ئەوەیە دەسەلاتەکانی سەرۆك کۆمار لەبنەڕەتدا وەکو ئەوەی دەستووری عیراق دیاری کردوون، کۆمەڵێك دەسەلاتی فراوانن و دەسەلاتی کاریگەرو گرنگیشن، پێ دەچێت خراپ تێگەیشتنێك یاخود ئاگادارنەبوونێکی قووڵتر سەبارەت بەو دەسەلاتانە هەبێت، یان خەڵك گوێیان لەچەند لێدوانێکی ئیعلامی بوویبێت کە هەندێك کەس دووبارەی دەکەنەوە بەوەی دەسەلاتەکانی سەرۆك کۆمار دەسەلاتی تەشریفیین، ئەمەش ڕاست

نییە.

*بەپشت بەستن بەوەی باستان کرد، ئایا ئەو دەسەلاتانەی خۆتان بە تەواویی بەکارهێناوە کە دەستوور پێی داون؟

-بەڵێ بەکارمان هێناون سەبارەت بەگشت شتێك کە پەیوەندیی بەپارێزگاریکردن لەبەرژەوەندییە بالاکانی عیراق و عیراقییەکانەوە هەبوویێت و سەبارەت بەگشت شتێك کە پەیوەست بوویێت. بەسیاسەتی بالاو سیاسەتی دەرەوە، بڕیارێکی لێبڕاوانەشمان هەبووە بەوەی ئێشککگری سەلامەتیی دەستوورو جێبەجێکردنەکەی بین، ڕەنگە حکومەت ڕۆڵی سەرۆکایەتیی کۆماری بەهەند وەرنەگرتبێت و هەندێك ناکۆکیش بەم هۆیەوە ڕوویان داوە. لەگەڵ ئەوەشدا نکۆڵی لەوە ناکەین کە سەرۆك وەزیران لەزۆر مەسەلەدا پرسی بە سەرۆك کۆمار کردووەو هەوڵی داوە هاو ئاهەنگییمان لەگەڵدا بکات، بەلام کاتێك ناکۆکییەك لەنێوان سەرۆکایەتیی وەزیران و ئەنجومەنی سەرۆکایەتیی کۆماردا دەبێت ئەوا هەر لایەکییان بەرێچکەکەی خۆیدا دەڕوات.

سەرکەوتوو و شکستخواردوو

*پێتان وابووە ئەزموونی ئەنجومەنی سەرۆکایەتیی سەرکەوتووبووە؟

-با لەگەڵ ئێوەشدا ڕاشکاوانەبم، ئەزموونی ئەنجومەنی سەرۆکایەتیی سەرکەوتوو و شکستخواردووش بوو وەك هەر لایەنێکی ژیان کە کۆمەڵێك خاڵی سلبی و ئیجابیشی تێدایە، خاڵە ئیجابییەکان ئەوەیە بەرجەستەیە ئارەزووی گشت ئەو کیانە سەرەکییانە دەکات کە کۆمەڵگەی عیراقیان لێ پێکدێن، کە بریتیین لەعەرەبی سوننەو عەرەبی شیعەو کورد. ئەمەش شتێکی گرنگە لەو قۆناغەی کە پێیدا تێپەڕ دەبن تاوەکو دیموکراسییەکەمان و دامەزراوە دەستوورییەکان دەچەسپێن و تا بارودۆخەکان لەعیراقدا جێگیر دەبن تاوەکو دەگەینە قۆناغێك کە زۆرینەی پەرلەمانیی حوکمڕانیی ولات بکەن.

لەم قۆناغەدا با ناوی بنێین قۆناغی ئینتیقالی-پێمانوایە ئەزموونەکە سەرکەوتووە.

بەڵام یەکێك لەخاڵە سلبییەکانی ئەوەیە لاریی نیشاندانی یەك ئەندامی ئەنجومەنی سەرۆکایەتی دەتوانێت کۆسپ بخاتە ڕێگەی مەسەلەکان و یاساکان و پێشنیازە پێویستەکانەوە، ئەم کۆسپەش لەلایەن ئەندامێکی ئەنجومەنەکەوە ڕەنگە ببێتە مایەی تەگەرە خستنە ڕێی کاروباری دەوڵەتەوە.

*ئایا لەقۆناغی داهاتوو پاش هەڵبژاردنی پەرلەمان، ئەزموونی ئەنجومەنی سەرۆکایەتی دووبارە دەبێتەوە؟

-من ئەوە نازانم، چونکە ئەوە لە دەسەڵاتی پەرلەمانە. بە گوێرەی دەستوور، ئەنجومەنی سەرۆکایەتی ئەرکەکەی تەواو بووە. ئەمەش بۆ یەکجار ڕوویداوە. پاشکۆی دەستووریش دەڵێت: ئەنجومەنی سەرۆکایەتیی بۆ یەك خولی پەرلەمانە. ئەم خولەش کۆتایی هاتووە، دەڵێت (دەستەواژەی ئەنجومەنی سەرۆکایەتی شوێنی سەرۆك کۆمار دەگرێتەوە لەهەر کوێیەکی ئەم دەستوورەدا هاتبێت، پاش تێپەڕبوونی یەك خولیش کار بەحوکمەکانی سەرۆك کۆمار دەکرێت)، ئەمەش بەو مانایەیە کە لەخولی داهاتووی پەرلەماندا پێویستە سەرۆك کۆمار هەبێت و ڕۆڵی ئەنجومەنی سەرۆکایەتی کۆتایی پێبێت.

*لەبەر ڕۆشنایی ئەزموونی خۆتان، ئایا خۆت بۆ سەرۆکایەتی کۆمار لەخولی داهاتوودا کاندید دەکەیت؟

-بوارم پێبدە لەگەڵ ئێوەدا ڕاشکاوانەبم، ئەگەر مەسەلەکە بۆ ئارەزووی شەخسی خۆم بگەڕێتەوە، ئەوا نەخێر، جارێکی دیکە خۆم بۆ سەرۆکایەتی کۆمار کاندید ناکەم، چونکە پێویستیم بەوە هەیە تەفەروغ بکەم و زیاتر کار لەناو یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندا بکەم و تەفەروغ بۆ خێزانەکەم بکەم و بحەسێمەوە تاوەکو یادداشتەکانم بنووسمەوە. بەڵام ئەگەر کوتلە پەرلەمانی و سیاسییە سەرەکییەکانی لەعێراقدا تەکلیفم لێبکەن ئەوا نائومێدیان ناکەم و ئەم تەکلیفە ڕەت ناکەمەوە.

هەمیشە دەستبەرداری ئارەزووەکانم بووم

*ئایا دەستبەرداری ئارەزووی تایبەتی خۆتان دەبن؟

بۆوەللا، وەك بە درێژایی تەواوی سالانی ژیانم دەستبەرداری ئارەزووە تایبەتەکانی خۆم بوو لەپێناوی بەرژەوەندی گشتی و عیراق و عیراقییەکاندا.

* ئایا پێتان وایە هاوکێشەی سیاسی دەگۆڕێت ئەگەر سەرۆك کۆمار لەعەرەبی شیعە یاخود سوننە هەڵبژێردرێت؟

–نا، ناگۆڕێت، چونکە دەستوور هەیەو هیچ گۆڕانێك روونادات.

*پێتان وایە بۆ کورد سەرۆکایەتی پەرلەمان لەسەرۆکایەتی کۆمار چاکتر بێت؟

–ئەمە بەندە بەهەلومەرجی ئێستاوە، بۆ کورد سەرۆکایەتی کۆمار لەسەرۆکایەتی پەرلەمان چاکترە، بەلام لەهەلومەرجی ئاساییدا سەرۆکایەتی پەرلەمان بۆ کورد چاکترە. لەبیریشت نەچێت لەهەلومەرجی ئاساییدا بەشەپۆست (محاصّە) نامێنێت بەجۆرێك ئەم پۆستە بەشی کوردو ئەو پۆستە بەشی عەرەبی شیعە یاخود سوننە بێت، چونکە دەستوور هیچ ئیمتیازێکی بەهەر پێکهاتەیەك لەپێکهاتەکانی گەلی عیراق نەداوە.

یەکەم سەرکردەی کوردبووم

کە سەفەری سوریام کردووە

*ئایا هەستتان بەپشتیوانیکردنی عیراقییەکان لەجەلال تالەبانی وەك سەرۆکی عیراق کردووە لەبەر کەسی خۆی یاخود لەبەرئەوەی کوردە؟

–من بە درێژایی ژیانم لەریزەکانی شۆڕشی کوردو مەسەلەی عیراقدا خەباتم کردووە لەپێناوی عیراقێکی دیموکراتداو لەچوارچێوەی ئەم عیراقەشدا داکۆکییم لەمافەکانی کورد کردووە. شانازیش بەوەوەدەکەم کەهەمیشە پەیوەندییم لەگەڵ هێزە پێشکەوتنخوازەکانی عیراق و عەرەبدا باش بووە، هەر لەو دەمەوە کەخوێندکار بووم لەکۆلیجی ماف لەزانکۆی بەغدا هەوڵی باشمداوە بۆ ئەوەی پەیوەندییمان باش بێت، لەنێوان پارتی دیموکراتی کوردستان کەمن لەسەرکردایەتیدا بووم لەگەڵ گشت حزبە نیشتمانییەکانی عیراقدا، وەکو حزبی شیوعی و حزبی نیشتمانیی دیموکرات و حزبی ئیستیقلال و حزبی بەعس و ئەوانی دیکە، لەسەر ئاستی

ا، بەهەمان شێوە شانازیی بەوەوە دەکەم کە من یەکەم کوردی سەرکردە بووم لەپارتی دیموکراتی کوردستاندا کە بۆ سوریا سەفەری کردبێت و پەیوەندیی لەگەڵ حزبەکانی ئەوسای سوریادا دروست کردبێت لەم رووەشەوە چاوم بەئەکرەم حۆرانی و میشێل عەفلەق و کەسانی دیکە کەوتووە. وەك یەکەم کوردیش بووم پەیوەندیم بەسەرۆك جەمال عەبدولناسرەوە کردووەو چەندینجار چاوم پێی کەوتووەو پەیوەندیی باشم لەگەڵ ناسرییەکاندا دروستکردووە. ئەمەش وام لێدەکات کە عیراقییەکی باش بم. کاتێك بەسەرۆکایەتیی کۆمار رایانسپاردم پێشتر چاوم بەگشت کوتلە سیاسییە سەرەکییەکان لەعیراقدا کەوتبوو کە لەسەر ئەم راسپاردانە هاو هەڵوێست بوون و بەبرایانی مەکتەبی سیاسیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان-م وت: من کاتێك وەکو سەرۆك کۆمار دەچمە بەغدا ئەوا جلە کوردییەکەم دادەکەنم و عەبای عیراقی دەپۆشم تاوەکو وەك عیراقییەك و سەرۆکی گشت عیراقییەکان هەڵسوکەوت بکەم.

*بەلام عیراقییەکان گلەییان لەسەرۆکی خۆیان هەیە-رەنگە گلەیی خۆشەویستانە بێت-بەوەی سەرۆك تاڵەبانی لەپارێزگاکانی باشوورياندا وەکو بەسرە یان عەمارە یاخود ناسریە سەردانی نەکردوون، ئایا ئەمە لەبەر هۆکاری تەندروستی بووە یاخود ئەمنیی؟

-لەگەڵ خۆشەویستیم بۆ گشت عیراقییەکان بەلام ئەوە نیوەی راستییەکەیە، چونکە من سەردانی کەربەلاو نەجەف پیرۆزو حللەو سەردانی سەماوەم کردووە، بەلام سەردانی شارەکانی دیکەم نەکردووە ئەویش لەبەر چەندین هۆکار لەوانە ناوچە عەرەبییە سوننەکان شڵەژاو و لەرووی ئاسایشەوە جێگیر نەبوون و قابیلی سەردان نەبوون، دەشبووایە گونجانێك لەنێوان سەردانم بۆ ناوچەکانی عەرەبی سوننەو شیعەدا دروست بکەم ئەگینا سەردانەکانمان بەشێوەیەکی دیکەو ناراست لێکدەدرایەوە. هۆکارێکی دیکەش کاتێك بارودۆخی ئاسایش لەباشووری عیراقدا باشبوو بۆ نموونە لەبەسرە ئەوا بارودۆخی ئاسایش لەشاری موسڵدا باش نەبوو، ئەگەر سەردانی

بەسرە بکەم لەبەرئەوەی هەردوو شارەکە دوو جەمسەری گرنگ لەعیراقدا پێکدەهێنن. بۆیە ئەم گلەییە نیوەی راستەو من قەبوولمە.

شانەی تیرۆریستی

لەزۆربەی ولاتاندا هەن

*لەسایەی تەقینەوەکانی ئەم دواییەی بەغداو ناوچەکانی دیکەدا، چۆن باروودۆخی ئاسایش و کاری دەزگا ئەمنییەکان هەڵدەسەنگێنن؟

-پێموایە ئەم حکومەتەی ئێستا توانیویەتی رۆڵێکی گرنگ بۆ سەپاندنی ئاسایش و ئارامی و بۆ رزگارکردنی ناوچە نائارامەکان لەدەست تیرۆریستەکان و میلیشیاکان بگێرێت.

ماوەیەك لەمەوبەر کە هێندە لەمێژنییە پارێزگای ئەنبار لەژێر کۆنترۆڵی تیرۆریستەکان و بەسرە لەژێر کۆنترۆڵی میلیشیاکاندابوو، رێگا بنەڕەتییەکانی نێوان ناوچەکانی عیراق لەمەترسییدا بوون و نەدەتوانرا بەکار بهێندرێن، بەلام ئەمڕۆ ئەنبار لەدەست تیرۆریستەکان و بەسرە لەدەسەت میلیشیاکان رزگارکراون و رێگاکانی نێوان بەغداو تێکرای شارەکانی عیراق زامن کراون و ئاسایش لەچەندین ناوچەدا، لەبەغداو کەربەلاو نەجەف و حللەو سامەڕاو تکریت بەرقەرار کراون. بەڵێ هەندێك شانەی تیرۆریستی هەن، بەلام ئەو شانانە لەپاکستان و جەزائیریشدا هەن، جیاوازیی هەیە لەنێوان بوونی چەند شانەیەکی تیرۆریستیی نهێنی کەتەقینەوە ئەنجام دەدەن لەگەڵ بوونی چەندین ناوچە کە بەتەواویی لەژێر کۆنترۆڵی تیرۆریستەکاندا بێت بەوێنەی ئەفغانستان، کەواتە حکومەتی یەکبوونی نیشتمانیی سەرکەوتنی لەم بوارەدا بەدیهێناوە، بەلام نەیتوانیوە بە یەکجاریی تیرۆریستەکان لەناو ببات، ئەمەش هۆکاریی خۆی هەیە، دەزگا ئەمنییەکان رۆڵێکی گرنگییان گێڕاوەو سەدان شەهیدییان پێشکەش کردووەو دەبێت رۆڵ و قوربانیدانییان بەرز هەڵسەنگێنین، بەلام ئایا ئەو دەزگایانە کەموکورتییان تێدایە؟ بەڵێ کەموکورتیی لەدەزگا ئەمنییەکاندا هەیە، دەنگۆی ئەوەش هەیە تیرۆریستەکان و بەعسییەکان دزەیان کردووەتە ناو ئەو

[illegible] بەجۆرێك کـاری تیرۆریـستەکان سـانا بکـات، بۆیـە ناکرێـت نکـۆڵی لەدەستکەوتەکان بکەین و لـەهەمانکاتدا نکۆڵی لەبوونی شتە سلبییەکانیش ناکـەین وەکو بوونی کەموکورتی لەپلانی ئەمنی و لەو کەسانەی جێبەجێکردنی ئەم پلانـەیان لەئەستۆدایە، بەلام چەندین دەستکەوتی گەورەش لەم بوارەدا بەدیهێنراوان.

باری ئابووری باش بووە

*بەلام پاش چوار ساڵ لەتەمەنی ئـەم حکومەتـە، تێکـچوونێك لەرەوشـی ئاسایـشدا هەیەو بارودۆخی ئابووری خراپە، خزمەتگوزارییە بنچینەییەکانی وەك کارەباو ئـاو و خزمەتگوزارییە شارەوانییەکان نیین؟

–بوارم پێبدە لەمەدا لـەگەڵت ناکۆك بم، بۆچی تێکچوون؟ تەماشای نەخشەی عیراق بکە دەبینین بارودۆخی ئاسایش لـەباشـوور ئارامـە لـەهـەرێمی کوردسـتانیش ئارامـە، لەزۆربەی ناوچەکانی ولاتدا وایە، جموجۆڵێکی تیرۆریستەکان لـەپارێزگای نەینـەواو بەغدا هەیە، کەچی جاران چالاکی و کۆنترۆڵییان بەسەر زۆربەی ناوچەکانی عیراقدا هەبوو، کەواتە تێکچوونێکی ئـەمنی نییـە، بـەڵکو بەئـەنجام نەگەیانـدنێکی تـەواوەتی سەپاندنی ئاسایش هەیە. ئەو جـۆرە کـردەوە تیرۆریـستیانەش لەجـەزائیرو شانـشینی عەرەبی سعودیەو ولاتـانی دیکەشـدا روودەدەن. بۆیـە پێویـستە مەسـەلەکان وەکـو خۆیان هەڵسەنگێنن. سەبارەت بـەبارودۆخی ئـابووریش، باشـبوونێك لـەم بـوارەدا هەیـە، ئاسـتی گـوزەران بەبـەراورد لەگـەڵ سـەردەمی سـەدامدا زۆر بەرزبۆتـەوە. بارودۆخی ئابووری باش بووە بەلام نەگەیشتوونەتە ئەوەی لەم بوارەدا ئاواتـەخوازین ئەویش لەبەر چەندین هۆکار، لەوانە لەناو نەبردنی تیرۆریـزم و جێبـەجێ نـەکردنی پلانێکی پێنج ساڵی یاخود چوار ساڵی، و نەگەیشتن بەئاستی پێویـستی بەرهـەمهێنانی نەوت. تاوەکو ئەوپرۆژانە جێبەجێ بکرێن کە پلانیان بۆ دانراوە.

*ئایا ئەمە بەو مانایەیە کە ئێوە بەرامبەر ئەدائی حکومەت رازیین؟

–نا. من بەرامبەر هەندێك بواری دیکەی ئـەدائی حکومـەتیش تێبینـیم هەیـە، بـەلام بەگشتی وەك عیراقییەکان دەڵێن بە گشتی، بـەڵێ مـن رازیـیم، بـەلام کـەموکورتیی

...لانی پێنج ساڵی و لەسیاسەتی نەوتدا هەیە کە بەم دواییە خەریکە باش بێت و راست و دروست و باش بێت و لەخزمەتی عیراقدا بێت، پیرۆزبایی لەهەڵسوڕێنەرانی ئەم هەنگاوەش دەکەین، ئەوەی لەبابەتی مۆرکردنی گرێبەست لەگەڵ کۆمپانیاکانی نەوتدا روویداوە دەبووایە سێ ساڵ یان دوو ساڵ لەمەوبەر روویدابایە، بەڵێ کۆمەڵێك دەستکەوت هەن و کۆمەڵێك کەموکورتیش هەن، پێویستە باسی هەموویان بکەین، لەهیچ کارێکیشدا کاملی نییە، تەنها خودای گەورەو پەروەردگار کاملە.

*بەلام هەندێك ناکۆکی لەنێوان ئێوەو سەرۆکی حکومەتدا هەیە وەکو ئەوەی لەنوێنەرایەتیکردنی عیراق لەو کۆنگرەیەی لووتکەی عەرەبیەدا روویدا کە لەقەتەر بەرێوەچوو و مالکی سووربوو لەجیاتی ئێوە ئامادەی کۆنگرەکە بێت..

-ئەمە بە رەزامەندیی من بووەو من بەبەرێز میری قەتەرم راگەیاند کە سەرۆکی حکومەت نوێنەرایەتیی عیراق دەکات لەلووتکە عەرەبییەکەدا نەك بە پێداگیریی خۆی بووبێت، بەڵکو ئارەزووی هەبوو لەمەداو سەبارەت بە بابەتەکە پرسی پێکردین و خۆی نەسەپاند، بەڵکو ئێمە رازی بووین ئەو نوێنەرایەتیی عیراق بکات لەلووتکەی عەرەبییدا.

چارەسەری

دیپلۆماسییەتی شارراوە

*هەروەها بۆچوونی ناکۆکتان لەگەڵ مالکی سەبارەت بەتۆمەتبارکردنی سوریا بەوەی دەستی لەتەقینەوەکانی ئەم دواییەی بەغدا هەبووە؟

-لێرەدا خاڵێکی گرنگ هەیە بوارم پێبدە روونی بکەمەوە، من دۆخێکی تایبەتم لەگەڵ سوریاو برا سوورییەکاندا هەیە. زۆر جار وتوومە من لەرووی نیشتمانیی و شەخسی و ئەخلاقییەوە قەرزارباری بنەماڵەی جوامێری ئەسەدم، من ئەو پشتگیریی و یارمەتیانەم لەبیر ناچێت کە سەرۆك حافز ئەسەد لەهەلومەرجێکی زۆر سەختدا پێشکەشی کردووین، لەهەلومەرجێکدا کە زۆر دەوڵەتی عەرەبی ڤیزای هاتنە

ئامادەمان بـۆ سـەردانیان نـەدەداینێ، ئـەم پەیوەندییـە مـن شـانازیی پێـوە دەكـەم و لەپـەرەكانی تێدەگەم، بۆیە بەردەوام وتومە سوریا ولاتی یەكەمی دووبارەمە، پاشان فەلسـەفەی من لـەكارو چارەسەركردنی كێشەكاندا پـشت بەدیپلۆماسـییەتی شـاراوە دەبەستێت، من پێم باش نییە كێشەكان بەلێدوانی توندو گرژكردنی ئیعلامی و قسەو قسەلۆكی ناشیرین چارەسەر بكرێـت، مـن هەمیـشە پـێم باشـە كێـشەكان لـەنێوان دەوڵەتە عەرەبییە براكان و دەوڵەتە دروایسێكاندا بەشێوازێكی دۆستانەو دیپلۆماسـی و نهێنی دوور لـەورووژاندنی كێشە چارەسـەر بكرێـت، بۆیـە مـن پێموابـووە، بـەبێ گوێدانە ئەو ئیدیعایانەی لـەبارەی سـوریاوە دەوترێـت، چارەسـەركردنی كێـشەكان دەبووایە بەكۆمەڵێك دیداری عێراق-سوریا بێت، چ لـەرێگەی لیژنەیەكی هاوبەشـی ئەمنییەوە یاخود لـەرێگەی ئەو ناوبژیوانانەوە كە لـەلایەن ئێمە راسپێردرابوون.

*ئـەمڕۆ قـسەو بـاس لـەبارەی هەڵبـژاردنی داهـاتووی پەرلـەمان دەكرێـت، كـە هەڵبژاردنێكی یەكلاكەرەوەو گرنگە، ئایا پێتانوایە وابێت؟

-بەڵێ پێموایە هەڵبژاردنێكی یەكلاكەرەوەو چارەنووسسازەو دەبێتە مایەی شكـستی پرۆسەی سیاسی یاخود بەردەوامبوونی.

*خوێندنەوەی ئایندەییتان بۆ ئەنجامی ئەم هەڵبژاردنە چییە؟

-خوێندنـەوەمان دووپـاتی دەكاتـەوە كەسـەركەوتوو دەبێـت و پـشتگیریی بەردەوامبوونی كاروانی دیموكراتی و پەرەپێدانی دەكات.

گرنگ كەس نییە، گرنگ دڵنیاییە

*ئایا پێتان وایە گۆڕانێك لەپرۆسەی سیاسییدا دەبێت؟

-رەنگە لەكەسەكاندا گۆڕان ببێت، بۆ نموونە رەنگە سەرۆك كۆمارێكی دیكـە نـەك جەلال تاڵەبانی هەڵبژێردرێت. یان كەسێكی دیكـە بـۆ سـەرۆكایەتی كابینـە یـاخود سەرۆكایەتی پەرلـەمان هەڵبژێردرێت. ئێمە پێویستە دڵنیابین كە كـاروانی دیمـوكراتی هەر بەردەوام دەبێـت و كـاریش دەكـەین بـۆ پێكهێنـانی بەرەیـەكی نیـشتمانی كـە بنەماكەی پێكهاتـە سیاسـییە سـەرەكییە براوەكـان لـەهەڵبژاردنـدا بێـت بـۆ ئـەوەی

بەکبوونێکی نیشتمانی بەهێزو توندوتۆڵ و پێکبهێندرێت و کوتلەیەکی پەرلەمانی توندوتۆڵ و تەبای ئەوتۆ پێکبهێندرێت کەبتوانێت یارمەتیی حکومەت بدات لەکارەکەی و راییکردنی یاساکاندا.

*لەسەر ئەم بنەمایە، ئایا هاوپەیمانییەکان وەکو (فراکسیۆنی کوردستانی)، هەمان ئەو هاوپەیمانیانە دەبێت کە لەخولی پێشوودا کراون، ئایا لەگەڵ هەمان ئەو رەوتەدا هاوپەیمانیی دەکەن کە پێشتر هاوپەیمانیتان لەگەڵدا کردووە؟

سیاسەتی ئێمە هەمیشە ئەوەبوو هاوپەیمانیی لەگەڵ هەمووان‌دا بکەین. لەچوار ساڵی رابردوودا هاوپەیمانییمان لەگەڵ ئیئتلافی یەکگرتووی ناسراو بەشیعەو لەگەڵ حزبی ئیسلامییدا کردووە. هاوپەیمانییەکی باشمان هەبووە کە بۆ ماوەیەك بەردەوام بووە لەگەڵ بەرێز ئەیاد عەلـلاوی و ویفاقی نیشتمانییدا، ئەمرۆش پەیوەندیی باشمان لەگەڵ ئیئتلاف و لەگەڵ دەوڵەتی یاساو لەگەڵ بەرێز جەواد بولانی و لەگەڵ لیستی ئەلعیراقییەو لەگەڵ حزبی ئیسلامی و لەگەڵ حزبی شیوعیدا هەیە، ئێمە پەیوەندیی و هاوپەیمانەکانمان لەگەڵ یەك لایەن قەتیس نەکردووەو لەیەك لایەندا قەتیسی ناکەین، سیاسەتی ئێمە هاوپەیمانیی کردنە لەگەڵ هەمووان‌دا.

*قسە هەبوو لەهەڵبژاردندا بەلیستێکی نیشتمانی بەشداریی بکەن، تا چەند ئەمە راستە؟

–هەلو مەرجی ئێستا لەبارنییە بۆ ئەوەی لە لیستێکی نیشتمانی عیراقی بەشداریی بکەین، ئینشالـلا لەهەڵبژاردنەکانی داهاتوودا بەمجۆرە لیستە بەشداریی دەکەین.

بارزانی پشتیوانی د. بەرهەمە

*با بێینە سەر یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان کە ئێوە سکرتێری گشتیین، چۆن دەڕواننە ئەزموونی سەرۆکایەتیی کردنی حکومەتی هەرێمی کوردستان لەلایەن دکتۆر بەرهەم ساڵحەوە؟

–پێم وایە ئەمە شتێکی سروشتییە، ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ مێژووی فیدرالیەتی کوردستان تەماشا دەکەیت لەسەرەتاوە لەنێوان ئێمەو پارتی دیموکراتی کوردستاندا

[illegible] بەسەرۆکایەتیی حکومەت و سەرۆکایەتیی پەرلـەمان دەسـتاو دەسـتکردن هەبووە.

یەکەم کابینە پێکهێندرا بەسەرۆکایەتی دکتـۆر فوئـاد مەعـسوم بـوو، سـەرۆکایەتیی پەرلـەمانیش لـەپارتی دیمـوکراتی کوردسـتان بـوو، دواتـر کابینـەی دووەم بـە سەرۆکایەتیی بەڕێز نێچیرڤان بارزانی پێکهات و سـەرۆکایەتی پەرلـەمان لـەیـەکێتیی نیشتمانی کوردستان بوو، سەرۆکایەتیی حکومەتی ئێستاش بە دکتۆر بەرهـەم سـاڵح سـپێردراوە لـەکاتێکـدا سـەرۆکایەتی پەرلـەمان بـە پـارتی سـپێردراوە، ئەمـە بەردەوامبوونی هاوپەیمانیی نێوان هەردوو حزبە کوردییەکە سەرەکییەکەیە.

*ئایا هەسـت بـە رازی نـەبوونی هەنـدێ سـەرکردەی پـارتی دەکـەن بەرامبـەر سەرۆکایەتی ساڵح بۆ حکومەت؟

–نا هەستمان بەوە نەکردووە، ئەمڕۆ من چاوم بەبـەڕێز مەسـعود بـارزانی سـەرۆکی هەرێم کەوت و پشتگیریی تەواو و ڕەزامەندیی تەواوی خۆی لەدکتۆر بەرهەم ساڵح دەربڕی.

د. بەرهەم کاراو چالاکە

*ئایا ئێوە بەرامبەر سەرۆکایەتی ساڵح بۆ حکومەت گەشبینن؟

–بەڵێ ئێمە بەم حکومەتە گەشبینن، چونکە دکتۆر بەرهەم زیرەك و کاراو چـالاکەو عەقڵی فراوانەو کۆمەڵێك توانای زۆر باشی هەیە، پێشم وایە ئـەو تواناییانـەی خـۆی لەسەر خستنی ئەو ئەرکەدا دەخاتە گەڕ کە ئێستا پێسپێردراوە.

*لەئەنجامی هەڵبژاردنەکـەی ئـەم دواییـەی پەرلـەمانی کوردسـتاندا ئۆپۆزسـیۆنێکی هەسـتپێکراو سـەریهەڵدا ئـەویش خـۆی لەفراکـسیۆنی گۆڕانـدا دەبینێتـەوە کـە نەوشیروان مستەفا سەرۆکایەتیی دەکات، چۆن ئەم ئۆپۆزسیۆنە هەڵدەسەنگێنن؟

–ئەمە لەراستییدا لـەئەنجامی جیابوونەوەیەك بوو لـەیەکێتیی نیـشتمانیی کوردسـتاندا، ئەم ناکۆکییە چەندین ساڵ بوو لـەیەکێتییدا هەبوو، جیاوازیی بۆچوون لـەسیاسـەت و هەڵوێستەکاندا، بەلام توانیبوومان پارێزگاریی لـەیـەکێتیی نـاوخۆی حزبەکـە بکـەین

لەڕێگەی پێشکەشکردنی ئیمتیازو تەنازول و ئاشتبوونەوەوە، بەلام گەیشتینە شوێنێك کە ئیدی نەدەکرا درێژەی پێ بدەین، ئەوەبوو چەند سەرکردەیەکی یەکێتی جیابوونەوە، ئەمەش بووە مایەی پێکهێنانی رەوتێك بەناوی گۆڕان، سەرەتا جۆرێك لەسەر لێشێواندن تێکەڵکردنی کارتەکان روویدا، ئەوانەی جیابوونەوە نەیاندەوت ئێمە لەدەرەوەی یەکێتییدا ین، بەڵکو ئیدیعایان دەکرد ئەوان باڵی ریفۆرمخوازن لەناو یەکێتیی نیشتمانییداو خۆیان بەم شێوەیە دەخستە روو تەنانەت دەیانویست بمدەنە دادگا چونکە ئەوان لەلێپرسراوێتیی سەرکردایەتیی لەحزبدا دوورخرابوونەوەو بەیاننامەیەکیان لەدژی من بەناوی سەرکردایەتی ریفۆرم لەیەکێتییدا دەرکردبوو. بۆیە جۆرێك لەسەر لێشێواندنی لەزەینی ئەو خەڵکدا دروست ببوو کە ریفۆرمیان دەوێت، کە ئەگەر لەیەکێتییەوە بێت ئەوە باشترە، ئەم سەرلێشواندنە وای کرد چەندین ئەندامی یەکێتیی دەنگیان بدەنێ، بەلام پاش ئەوەی ناڕاستیی ئیدیعایەکانیان دەرکەوت، سەدان کادری پێشکەوتوو هەزاران ئەندام بگرە چەندین ناوچە بەتەواوەتی گەڕانەوە ناو یەکێتیی. جگەلەوەش، دروشمی گۆڕان سەرنجراکێش و داواکراوە، ئێمە نکوڵیمان لەبایەخی گۆڕان نەکردووە بەلام کێ دەتوانێت گۆڕان بکات؟ ئێمە پێمانوایە گۆڕانی بنەڕەتیی پێویستە دوو حزبە بنەڕەتییەکە (یەکێتی و پارتی) بیکەن، لەو دووە بترازێت ناتوانیت گۆڕان بکات، بەڵکو دەتوانێت هاوار بکات، ئەمەش رۆژگار رۆژ بەرۆژ دەیسەلمێنێت، بەگشتی ئەمە یەکەم جیابوونەوە نییە لەیەکێتی نیشتمانیی کوردستاندا، ئەمە دۆخێکی سروشتییەو ئەوەی جیابۆتەوە گەڕاوەتەوە ناو حزبەکە.

ویستم کۆتاییەکەی میسك بێت

*ئایا پێش هەڵبژاردن چاوتان بە نەوشیروان مستەفا کەوتووەو قسەتان لەگەڵدا کردووە؟

-بەڵێ چاوم پێی کەوت و لەدیداری پێش کۆتاییدا پێیم وت: ئەگەر دەتەوێت حزب یان رەوتێك پێك بهێنیت ئەوا ئێمە ئامادەین پشتگیریت بکەین و یارمەتیت بدەین ئەمە

[illegible]خۆته. من ویستم کۆتاییەکەی میسك بێت (بە خۆشی بێت)، چونکە ئێمە سالانێکی دوورودرێژ پێکەوە کارمان کردووە، ویستم جیابوونەوەکە بەشێوەیەکی دۆستانە بێت بەوەی جیاببنەوەو ڕێکخستنی خۆیان پێکبهێنن. ئەوەبوو وتی: نا، من نامەوێت حزبێك پێکبهێنین، بەڵکو دەمەوێت ریفۆرم بکەم و هەر تۆش (تاڵەبانی) دەتوانیت ریفۆرم بکەیت. وتم: کەواتە دەست بە ریفۆرم دەکەم و پشتیوانیی تۆم بۆ ئەم پرۆسەیە دەوێت، وتی: بەڵێ من پشتیوانیتان دەکەم.

ئەوەبوو یەکەم پرۆژەی ریفۆرممان بۆ نارد ئەویش هەندێك ئیزافەی تێداکردو هەندێك دەستکاری کردو بۆی ناردینەوە دوای ئەوەی ڕەزامەندیی لەسەر نیشاندا، ئێمە خستمانە بەردەم مەکتەبی سیاسی لەچاوەڕوانی بەستنی کۆنگرەی سیاسییدا، ئەویش پشتگیری ئەم هەنگاوانەی کرد، بەداخەوە لەکۆتاییدا بەشێوەیەکی دوژمنکارانە جیابوونەوەو قورسایی پەلاماریان خستەسەر یەکێتی نیشتمانیی و بەحساباتی هەڵەی خۆیان هەوڵیاندا یەکێتی تێك و پێك بدەن، بەلام حزبەکەمان تێك وپێك نەچوو، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئێمە وەکو مەسەلەیەکی سروشتی سەیری ئەم جیابوونەوەیە دەکەین کە لەڕێکخراوە سیاسییەکاندا روو دەدات.

*بەو پێیەی سکرتێری گشتیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانن، ئایا پێتانوایە نەوشیروان مستەفا بەرهەڵستکارە یاخود دژە؟

–ئەو دژی یەکێتی و بەرهەڵستکارو دژی حکومەتی هەرێمە. نەوشیروان مستەفا لەبیری خۆیدا باوەڕی بەهاوپەیمانیبوون نییە، دەیەوێت پارێزگای سلێمانی سەربەخۆ بێت، پارێزگای دهۆك سەربەخۆ بێت، بەهەمان شێوە هەولێر پارێزگایەکی سەربەخۆ بێت و بەجۆرێك لەلامەرکەزییەت لەگەڵ بەغدا ببەسترێنەوە.

*باسی ئەوەتان کرد چەند سەرکردەیەك لەیەکێتی جیابوونەتەوەو گەڕاونەتەوە، ئایا پێتان وایە مستەفا بۆ حزبەکە دەگەڕێتەوە؟

–ئێمە لەپلنیۆمی ئەم دواییەدا بڕیارماندا نەگەڕێنەوەو پەیوەندییمان لەگەڵدا بچڕێنین، چونکە سالانێکی دوورودرێژ مەینەتی زۆرمان بەدەست خۆیان و

اكۆكییەكانیانەوە هەبووە.

هەرگیز شتی وام لەگەڵدا باس نەكردووە

*واباوە كە خاتوو هێرۆ خان-ی هاوسەرتان وەكو سەركردەیەك دەرناكەوێت و پێی باشە لەپشت پەردەدا لەرێكخراوە خێرخوازییەكانی خۆی بۆ منداڵان و ژنان كار بكات ئەگەرچی بەدرێژایی سالانی شۆڕش لەگەڵ ئێوەدا لەشاخ و خەباتی كردووە، چۆن وەكو لێپرسراوی رێكخستنەكانی حزب لەسلێمانی دەستنیشانكرا؟

-من هەرگیز نەهاتوومەتە ناو ئەم مەسەلەیەوەو ئەم بابەتەم لەگەڵیدا باس نەكردووە، بەلام هەڤالان لەمەكتەبی سیاسی حزب بەتایبەتی برایان مەلا بەختیارو دلێری سەید مەجیدو كەسانی دیكە لەسەركردایەتییدا قسەیان لەگەڵدا كردبووەو قەناعەتییان پێهێنابوو ئەم ئەركە قەبووڵ بكات، ئەگەرچی لاری هەبوو بەلام بەقسە لەگەڵ كردنی قەناعەتی هات، بەجۆرێك لەبەر ئەو هەلومەرجەی كە یەكێتیی پێیدا دەڕوات پێی باشی بوو ئەم ئەركە قبووڵ بكات. حزبەكەشمان جاران و ئێستاشی لەگەڵدابێت چەندین سەركردەی ژنی پێشكەشكردووە، ئێمە لەپێشەوەی حزبەكاندایین لەدانانی وەزیری ژنداو وەزیرێكی ژنمان لەبەغدا هەیە كە نەرمین خانی وەزیری ژینگەیە.

*پەیوەندییەكانتان لەگەڵ پارتی دیموكراتی كوردستاندا چۆن هەڵدەسەنگێنن؟

-پەیوەندییەكانمان لەگەڵ پارتی دیموكراتی كوردستاندا لەباش باشترەو پەیوەندییم لەگەڵ كاك مەسعود بارزانی لەباش باشترە، ئێمە هەوڵ دەدین ئەم پەیوەندییە بەهێزتربكەین و لەسەركردایەتییەوە بۆ بنكەكانی هەردوو حزبەكەی بگوازینەوە، لەگەڵ كاك مەسعود بارزانی-یش بڕیارمانداوە لیژنەیەك پێكبهێندرێت بۆ ئەوەی بەم نزیكانە ئەم ئەركە جێبەجێ بكات.

## نەوشیروان مستەفا، کۆسرەت رەسوڵی یەکلایی کردەوە

## ژیانی سیاسی کۆسرەت رەسوڵ کۆتایی هات



رِاپۆرتی: دلێر عەبدوڵڵا

کۆسرەت رەسوڵ وەك یەکێك لەسەرکردەو کەسایەتییە دیارەکانی نێو ریزەکانی یەکێتی و رێبەری یەکێك لەباڵە جیاوازەکانی ئەو حزبە، بەشێوەیەکی کت و پڕو چاوەڕواننەکراو کەوتە داوێکی سیاسی پڕ کێشەو تەنگەتاوی کەمەترسی کۆتاییهێنانی ژیانی سیاسی و ئاوابوونی خۆری ململانێکانی لێدەکرێت، بەجۆرێك پێشبینی ئەوە دەکرێت وەك دۆڕاوترین سەرکردە گۆڕەپانی سیاسی ململانێکان و ریزەکانی حزبەکەی جێبهێڵێت و بۆ هەتایە بەپەراوێزی بمێنێتەوە.

کۆسرەت رەسوڵ کەبەکوڕە ئازاکەی یەکێتی و شۆڕە سوارەکەی نێو مەیدانی خەباتی چەکداری ئەو حزبە دادەنراو هەمیشە وەك پاڵەوان ناوی دەهێنرا، ئێستا مەترسییەکی گەورە روویکردۆتە ژیانی و کەوتۆتە چاڵێکەوە کەهاتنە دەرەوەو رزگاربوون لێی زۆر ئەستەم و زەحمەتە، بۆیە ئەگەری ئەوە هەیە لێرەوە گەمەکە بەشکستی ئەو کەسایەتییە کۆتایی بێت کەساڵانێکی درێژە تاڵەبانی و باڵەکەی هەوڵی خستن و کەوتنی دەدەن.

ئەگەرچی کۆسرەت رەسوڵ لەململانێی نێو باڵە جیاوازەکانی یەکێتی هەمیشە پشتی تاڵەبانی گرتووەو وەك دۆستی ئەو کەسایەتییە خۆی نیشانداوەو لەپرسە چارەنووسازو هەستیارەکانی نێو یەکێتیدا دژی نەوشیروان مستەفاو باڵەکەی رەفتاری کردووە، بەمدواییە نەوشیروان مستەفاو لیستەکەی وەك کارتێکی فشار دژی تاڵەبانی و مەکتەبی سیاسی حزبەکەی بەکاردەهێناو بۆ مانەوەو بەهێزبوونی باڵ و پێگەی خۆی لەیەکێتیدا رکابەرە مێژینەییەکەی کە نەوشیروانە کردبووە کارتێکی فشار بەسەر تاڵەبانییەوە، ئەمەش لەو نامەیەدا بەڕوونی دەرکەوت کە لەگەڵ چوار سەرکردەکەی باڵی ریفۆرم پێشکەشی مەکتەبی سیاسی و خودی تاڵەبانی کردو هەڕەشەی ئەوەی دەکرد کە لەریزەکانی یەکێتی جیا دەبێتەوەو دەچێتە پاڵ

نەوشیروان گەربێتو داواکارییەکانی جێبەجێ نەکرێت.

کۆسرەت رەسوڵ کە لەسەرەتای ململانێکانی نێوان تاڵەبانی و نەوشیروان مستەفا، لایەنگری تاڵەبانی بووەو هەمیشە لەدژی نەوشیروان مستەفا کاری کردووە، دژایەتییە بەردەوامەکانی تاڵەبانی و سەرانی باڵی سکرتێر ناچاریکرد خۆی لەنەوشیروان مستەفا نزیك بکاتەوەو لەدژی هەوڵە بەردەوامەکانی تاڵەبانی و باڵەکەی پاڵبداتە نەوشیروان مستەفاو وەك کارتێکی فشار بۆ قوتاربوون لەنەخشەو پلانەکانی تاڵەبانی بەکاریبهێنێت، بەڵام ئەم هەوڵەی کۆسرەت رەسوڵ درێژەی نەکێشاو بەدەستی نەوشیروان مستەفا لەبەینبرا، بەتایبەت بەمدواییەو لەگەڵ بڵاوکردنەوەی بەڵگەنامە مێژووییەکانی نەوشیروان مستەفا کە لەگەڵ ئەوەی ئامانج لێی دژایەتیکردنی تاڵەبانی بوو، بەڵام لەناوەڕۆکدا کۆسرەت رەسوڵ کراوەتە ئامانج و خراوەتە داوێکەوە کەدەرچوون لێی زۆر ئەستەمە.

چاودێرانی سیاسی پێیان وایە نەوشیروان مستەفا وەك تۆڵەکردنەوە لەکۆسرەت رەسوڵ ئەو بەڵگەنامانەی بڵاوکردۆتەوەو کورد ووتەنی ویستویەتی بە بەردێك دوو نیشانە بپیکێت، لەلایەك نهێنییەکان بۆ هەمووان ئاشکرابکات و رای گشتی بورووژێنێت، لەلایەکی ترەوە لەنەیارەکانی بدات و بێ بەری بوونی خۆی لەکێشەو گەندەڵییەکانی چەند ساڵەی حوکمڕانی یەکێتی لەسلێمانی بۆ رای گشتی بسەلمێنێت، بەتایبەت لەئێستادا کەهێرشێکی توندی راگەیاندن لەسەر نەوشیروان مستەفاو لیستەکەی لەئارادایەو راگەیاندنەکانی یەکێتی بەهەموو شێوەیەك کەوتوونەتە دژایەتیکردنی ئەو سەرکردەیە تا بۆ هەڵبژاردنە پەرلەمانییەکەی عیراق رێگری سەرکەوتنی لێبکرێت و تۆڵەی ئەو شکستەی لێبکرێتەوە کە لەسەر دەستی ئەو بەسەریاندا هات، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەدا زەرەرمەندی یەکەم کۆسرەت رەسوڵەو ئەم هەنگاوەی نەوشیروان مستەفا گورزێکی کوشندەو کاریگەربوو کەبەر ئەو سەرکردەیە کەوت.

ئەگەرچی بڵاوکردنەوەو ئاشکراکردنی نهێنییەکانی یەکێتی لەلایەن نەوشیروان

[illegible]فاوە کاریگەرییەکی زۆری لەنێو ریزەکانی ئەو حزبە بەجێهێشت و بووە هۆی [illegible]رابوونی کۆسرەت رەسوڵ و باڵەکەی، لەگەڵ ئەوەشدا کاردانەوەیەکی گەورەی لەنێو بزووتنەوەی گۆڕان دروستکردو چەند بۆچوونێکی جیا لەوبارەوە سەریهەڵدا کەزۆرینەیان پێویست نەبوونی ورووژاندنی ئەو بابەتانەیان لەئێستادا دوپاتدەکردەوە، بەتایبەت کەبابەتەکەی نەوشیروان مستەفا هێندەی لەکۆسرەت رەسوڵ و باڵەکەی دەدات نیو هێندە بەگژ تاڵەبانی و مەکتەبی سیاسیدا نەچووەتەوە کەسەرجەمی ئەندامانی ئەو بزووتنەوەیە ئەوەیان لەو هەنگاوەی نەوشیروان مستەفای رێبەریان چاوەڕێ دەکرد.

بەڕای چاودێرانی سیاسی نەوشیروان مستەفا بەبڵاوکردنەوەی یاداشتەکانی ئەمدواییەی کەوتە هەڵەیەکی مێژووییەوەو بێ ئەوەی بەخۆی بزانێت زیانێکی گەورەی لەخۆیداو گەورەترین خزمەت و سوودی بە جەلال تاڵەبانی رکابەری کرد کەهەر ئەمەش بووە هۆی ئەوەی شەپۆلێکی توندی نارەزایی لەنێو کادرانی بزووتنەوەی گۆڕان دروستببێت و زۆرێك لەئەندامان دژی ئەو هەوڵەی نەوشیروان مستەفا بووەستنەوە کەگرژی لەنێوان پەیوەندییەکانی گۆڕان و باڵی کۆسرەت رەسوڵ دروستکرد.

ئەگەرچی نەوشیروان مستەفا ویستی لەرێی بڵاوکردنەوەی یاداشتەکانی ریزەکانی یەکێتی هێندەی تر لەبەریەك هەڵبوەشێنێت و رکابەری باڵەکانی نێو ئەو حزبە توندتر بکاتەوە، بەڵام بەپێچەوانەوە مەرامەکەی نەوشیروان مستەفا نەهاتەدی و پێچەوانەی ئەوە بەدیهات، چونکە پاش ئەم هەوڵەی نەوشیروان مستەفا، تاڵەبانی و باڵەکەی بەتەواوی یەکلابوونەوەو ئەو کارتەی کۆسرەت رەسوڵ لەدژیان بەکاریدەهێنا لەلایەن پوچەڵ بووەوە، بەمەش نەوشیروان مستەفا گورزێکی کاریگەری لەکۆسرەت رەسوڵ و باڵەکەی وەشاندو گەورەترین خزمەتیشی بەجەلال تاڵەبانی و باڵەکەی کرد.

جەلال تاڵەبانی وەك گەمەرێکی سەرەکی نێو ئەم رکابەری و ململانێ سیاسییە، لەم

بڕسەدا بێ دەنگی هەڵبژاردو لەو ڕێیەشەوە پەیامێکی ئاڕاستەی نەوشیروان مستەفای ڕابەری کردو ئەوەی پێ ڕاگەیاند کەهێشتا توانای ڕکابەریکردنی تاڵەبانی نییەو هەرگیز خۆی بەهاوشانیشی نازانێت تا بکەوێتە وەڵامدانەوەو ڕەتکردنەوەی قسەو وتەکانی کەئەمەش پێچەوانەی ئەو پێشبینییەی نەوشیروان مستەفا دەرچوو کەچاوەڕێی شڵەقانی ریزەکانی یەکێتی و سەرهەڵدانەوەی ناکۆکییەکانی نێوان هەردوو باڵی تاڵەبانی و کۆسرەت ڕەسوڵی دەکرد.

کۆسرەت ڕەسوڵ کەبووە قوربانی یەکەمی بڵاوکردنەوەی یاداشتەکانی نەوشیروان مستەفا، بەشێوەیەکی لاوازو وەك خۆ دزینەوەیەك لەبابەتەکە وەڵامی نەوشیروان مستەفای داوەتەوەو جۆرە نیگەرانی و ئیحراجییەك بەوەڵامدانەوەکەی دەردەکەوێت کەبەڕای چاودێرانی سیاسی ئەمەش بەپلان و نەخشەی جەلال تاڵەبانی بووە، بەو پێیەی تاڵەبانی لەڕێی وەڵامەکەی کۆسرەت ڕەسوڵەوە ویستویەتی لەبایەخی نەوشیروان مستەفا کەمبکاتەوەو کێشەو ناکۆکییەکانی لەو چوارچێوەیە دەربکات کەخۆی و نەوشیروان مستەفا تێی کەوتوون و لەنێوخۆی مەکتەبی سیاسی حزبەکەی و هەندێك لەسەرکردەکان لەسەرو هەموشیانەوە کۆسرەت ڕەسوڵ بچوکی بکاتەوە. ئەگەرچی پێش ئاشکراکردنی نهێنییەکان لەلایەن نەوشیروان مستەفاوە، کۆسرەت ڕەسوڵ و باڵەکەی لەلایەن تاڵەبانییەوە هەوڵی پەراوێزخستن و توانەوەیان دەدراو بەهەمیشەیی نەخشەو پلانیان لەدژ جێبەجێ دەکرا، بەڵام پاش ئەو هەنگاوەی نەوشیروان مستەفا هەوڵەکانی تاڵەبانی و باڵەکەی چڕتر دەکرێتەوەو پێشبینی ئەوە دەکرێت کۆسرەت ڕەسوڵ و باڵەکەی بەتەواوی لەنێو یەکێتیدا بتوێننەوە ئەویش پاش ئەوەی کارتەکەی کۆسرەت ڕەسوڵ سوتاو ئاوە لێڵەکە بۆ تاڵەبانی و بنەماڵەکەی روونبووەوە.

کۆسرەت ڕەسوڵ کە لەپاش هەڕەشەکەی لەبنەماڵەی تاڵەبانی و هۆشداریدانی لەبارەی جیابوونەوەی لەئەگەری جێبەجێنەکردنی داواکارییەکانی، کەوتوتە ژێر فشارو هەڕەشەی تاڵەبانی و باڵەکەیی و بەهەمیشەیی هەوڵی توانەوەو پەراوێزخستنی

دەبێت. ئێستا بەتەواوی مەترسی لەسەر ژیانی سیاسی دروست بووەو کورد وتەنی ئەستێرەکەی نەما کە پارێزگاری لێبکات و لە ململانێ سەختەکانی نێو سەرکردایەتی حزبەکەی سەریبخات، بۆیە پێشبینی ئاوابوونی خۆری ئەو کەسایەتییە سیاسییەی یەکێتی دەکرێت کەتەمەنی لەخزمەتکردنی ئەو حزبەدا بەسەربردووەو قوربانییەکی زۆریشی لەپێناویدا بەخشیوە، هەروەك ئەوەی ئێستا بەڕوونی دەردەکەوێت کە جگەلەوەی لەنێوخۆی یەکێتیدا پەراوێزخراوە، پۆستی جێگری سەرۆکی هەرێمی لێوەرگیراوەتەوەو نەیەکێتی و نەپارتیش ئامادەی ئەوە نین ئەو پۆستەی پێ ببەخشنەوە لەگەڵ ئەوەی ماوەی (٣) مانگ بەسەر هەڵبژاردنەوەی سەرۆکی هەرێمدا تێپەڕیووەو بەپێی یاسای سەرۆکایەتی هەرێمیش پێویستە پاش دیاریکردنی سەرۆك پۆستی جێگری سەرۆکیش دیاریبکرێت.

دەکرێت ئەوە بوترێت لەگەڵ ئەوەی کێشمەکێشم و ململانێی نێوان سەرکردەکانی یەکێتی بەتایبەت نەوشیروان مستەفاو تاڵەبانی بەزیانی کورد کۆتایی دێت و لەم نێوەندەدا هاوڵاتیانی کوردستان بەتایبەت دانیشتوانی شاری سلێمانی بوونەتە قوربانی ئەو ململانێ سیاسییە نارەوایەو مەترسی ئەوەش دەکرێت دۆخی کوردستان بەئاقارێکی خراپدا بەرێت، بەڵام دەکرێت ئەوەش بڵێین کە گەیشتنی ململانێکان بەم رادەیەی ئێستا شتێکی باشە بۆ گەلی کورد بەوەی کارە نهێنی و ژێربەژێرییەکان ئاشکرا دەکرێن و راستییەکان هەڵدەماڵرێن و تەواوی کارە نهێنییەکان ڕووندەبێتەوە کە تا هەنوکە بەشاراوەیی ماوەتەوە

## ڕەفتاری خۆی و یاداشتەکانی پێچەوانەی یەکترن یاداشتەکانی نەوشیروان کەسوکاری شەهیدانی کیمیاباران تووڕە دەکات

**ژیار خەلیل ٢٠٠٩/١٢/١٦**

نووسینەوەی یاداشتەکانی خۆی و بلاوکردنەوەی لەڕێگەی سایتی فەرمی کۆمپانیای وشەوە، مستداقیەتی یاداشتەکانی پێشووتریشی کەمکردەوە، نەوشیروان مستەفا کەئەندازیاری شێواندنی راستییە مێژوییەکان و نووسنەوەیانە بەبەرژەوەندی خۆی و دۆست و لایەنگرەکانی، ئەمجارەشیان لەڕێگەی چەواشەکردنی راستییەکانەوە پەلاماری یەکێك لەدیارترین خەباتگێڕەکانی بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلەکەمان دەدات و چەندین تۆمەتی بێبنەما روبەرووی هەڤاڵ کۆسرەت رەسوڵ عەلی دەکاتەوە کە لەهەموو قۆناغە سەخت و دژوارەکانی گەلەکەماندا لەگۆڕەپانی روبەڕوبوونەوەی دوژمنانی گەلەکەماندا ئامادەبونێکی پێشمەرگانەی هەبووە، خەڵکی کوردستان بەگشتیی و ئەو ناوچانەی بەهۆی نەوشیروان مستەفاوە پەراوێزخرابوون بەتوندی دژی ئەو یاداشتە چەواشەکاریانە دەوەستنەوەو داواشدەکەن کۆدەنگییەکی جەماوەریی لەدژی هەرکەسێك بەرپابکرێت کەبیەوێت جوانییەکانی مێژووی سەرکردەکانی گەلەکەمان بۆ مەبەستی سیاسی و کەسێتی و تایبەتی خۆی بشێوێنێت.

کەس ناتوانێت راستییەکان چەواشە بکات

محەمەد عوسمان خاوەنی پێنج شەهیدی کیمیاباران لەدوای بلاوبوونەوەی یاداشتەکانی نەوشیروان مستەفا، لەڕێگەی پەیوەندی تەلەفۆنیەوە کوردستانی نوێ-ی ئاگادارکردەوە کەدەیەوێت وتارێك لەسەر ئەو ناحەقییە گەورەیە بنووسێت کە نەوشیروان مستەفا بەرامبەر هەڤاڵ مام جەلال و کاك کۆسرەت کردوویەتی، وتارەکەی لەسەر لاپەڕەیەکی ئەیفۆرو بەسەلیقەی خۆی نوسیبوو کە هەتا پۆلی ٢ی

[illegible] خوێندووەو پیشتریش نەرۆژنامەنووس بووەو نەکاری لەمجۆرەیشی کـردووە، [illegible] وەك خۆی وتی: ناحەقییەکانی کاك نەوشیروان هێندە گەورەو نارەوایـە هـەموو خەڵکێکی بێ دەنگیش دەهێنێتە قسە، وتیشی: ئەگەر وتارەکەم بۆ بلاوناکەنەوە ئـەوا من بەناوی بەشێکی زۆر لـەکەسوکاری شەهیدانەوە قسە دەکەم و داواتان لێدەکـەم چەند کەسێکی وەك منی وارسی شـەهید بـدوێنن و راوسـەرنجەکانیان لەکوردستانی نوێ-دا وەك خۆی تۆماربکەن، بەڵێنی دووەمی ئەو باوکە شەهیدەمان جێبـەجێکردو سەرەتای کارەکەشمان لـەخودی خۆیـەوە دەسـت پێکـردو ئـەو بـەمجۆرە قـسەی بـۆ کوردستانی نـوێ کـرد: لـەدوای راپەرینـەوە هـەتا ئـەمرۆ هـەڤاڵ مام جـەلال وەك براگەورەیەکی هـەموو لایـەکمان زۆرجـار لـەپێناو یـەکڕیزی و رێگـەگرتن لـەهـەر روداوێکی ناخۆشی ناوخۆیی، هەموو ناحەقییەکی لەنەوشیروان مستەفا قبوڵکردووە، من بەلامەوە سەیرە نەوشیروان ئێستا لەنووسینەوەی یاداشتەکانیدا باس لـەوە دەکات بەهۆی حکومەتەکەی کاك کۆسرەتەوە یەکێتی لایەنگری کەمبووەتەوە، چونکە ئەوە خودی نەوشیروان بوو کەتەواوی هەنگاوەکانی بۆ نەهێشتنی خـەڵك بـوو لـەدەوری یەکێتی، بۆ نموونە لەناو کەسوکاری شەهیدانی کیمیاباراندا هـەزاران کـەس بـەهۆی نەوشیروانەوە لـەیەکێتی تۆراون، ئەگـەر بپرسـیت بۆچـی، ئـەوا مـن لـەناو چـەندین نموونەدا یەکێك لەزەقترین نموونەکانتان بۆ بـاس دەکـەم کـەبووە هـۆی بێزاربـوونی کەسـوکاری شـەهیدان، لەسـالانی رابـردوودا جارێـك لـەسـاڵیادی کیمیابـارانی هەڵەبجەدا نەوشیروان بەهەرجۆرێك بوو رێگەی کەوتە هەڵەبجەو هاتە سـەر مـەزاری شەهیدان، نەوشیروان بەتایبەت نەهاتبوو، چونکە لـەگەڵ وەفدێکی گەورەی حزبـی و حکومیدا هاتبوو، ئێمەش ژمارەیەك لەکەسوکاری شەهیدان داوامان لـەحیمایـە زۆرو زەوەندەکەی نەوشیروان کرد کەرێگـەمان بـدەن بـۆ ئـەوەی لەماڵەکـەی خۆمانـدا چاومان بەنەوشیروان بکەوێت، کاتێـك داواکـەی ئێمـەی ئاراسـتەکرا، دەسـتبەجێ رەتیکردەوەو وتی: ئێستا کاتی چەلـەحانێ و خستنەرووی داواکاری نییە، سبەینێ بێن بۆ سلێمانی ئەگەر مەجالم هەبوو دەتانبینم! ئێمەش ئەوکاتـە بارودۆخمـان زۆر خـراپ

بوو، کەسوکاری شەهیدان بۆدینارێك موحتاج بوون، زۆربەمان توانای بـەخێوکردنی ژیان نەبوو، دەگـەڕاین بـۆ ئـەوەی تروسـکاییەکمان دەسـت بکـەوێت، کاتێـك ڕۆشتینەماڵەکە لـەگردەکەی عەلی ناجی لـەوەلامی هەموو داواکارییەکانمانـدا، پێـی وتین: (من هاوکاری ئێوە ناکەم، خۆ من کەسوکارەکانتانم نەکوشـتووە، بـەعس وای لـێکردوون، بڕۆن داوای قەرەبوو لـەئەو بکەن! من توانای تێرکردنی وارسی شەهیدی ئەملاو ئەولام نییە!) ئەو وارسی شەهیدە بەردەوام بوو لـەسەر قسەکانی و وتی: ئێمە نەڕۆشتین بۆ ئەوەی نەوشیروان قەرەبومان بکاتەوە، چونکە ئێمە دەمێکبوو دەمـانزانی نەوشیروان پارەو بودجەی یەکێتی تـەنها بـۆ دوو حاڵـەت بـەکاردەهێنێت، یـان بـۆ تەکەتول و دروستکردنی دەستەبەند، یاخود هاوکاریکردنی ئەو کەسانەی کەبەشێکن لەبەڕێوەبەرانی پیلانە شەخسییەکانی، بەلام ئێمە لـەبەرئەوەی پێویستمان بـەهاوکاری هەبوو، هیوامان بەهەموو شتێك هەبوو، وەك پیرەمێردی شاعیر دەڵێ (شـەوێ پیـاوێ لـەبەفرا ما ، نەمرد، ئاگرێکی دووری دی) (نەوشیروانیش ئـەم شـیعرەی لـەیاداشـتە هەڵبەسـتراوەکانیدا بـەکارهێناوە)، بەتـەنها ئـەو وەلامـەی نەوشـیروان کەنموونـەی چەندین وەلامی دیکەی ئەون، هەزاران کەسی لـەیەکێتی تۆراند، ئیتر نازانم ئەی خۆی چ منەتێکمان بەسەردا دەکات، ئەوە هەڵوێـستی نەوشـیروان بـوو بەرامبـەر بەئێمـە، ئەوەش پرۆژەکانی کاك کۆسرەت کەبۆ خەڵکی شارەکەی کردووە، ئێمە سـوودمان لـەدەیان پرۆژە وەرگرتـووە کـە کـاك کۆسـرەت وەك سـەرۆکی حکومـەت و وەك جێگری سکرتێری گشتیی بۆشارەکەمانی کـردووە، لـەبەرئـەوە حەقوایـە هـەموومان دژی چەواشەکارییەکانی نەوشیروان مستەفا بوەسـتینەوە، هەرچـەندە هـیچ کەسـێك ناتوانێت ڕاستییەکان چەواشە بکات.

سەفەرەکانی مام جەلال و
خۆدزینەوەکانی نەوشیروان

نەوشیروان مستەفا لـەبەشێکی دیکەی چەواشەکارییەکانیدا تەواوی سەفەرە سیاسی و دیبلۆماسییەکانی هەڤاڵ مام جەلال بێ بایەخ پیـشاندەدات، لـەبەرامبەریـشدا تـەواوی

خۆدزینەوەکانی خۆی لەقۆناغە سەخت و دژوارەکانی یەکێتیدا دەکات بەمنەت بەسەر خەڵکەوەو وای پیشان دەدات خۆدزینەوەکانیشی بۆ بەرژەوەندی گشتی بووە، (سۆران) ئەندامی ڕێکخستنەکانی (ی.ن.ك)و برای سێ شەهیدی کیمیاباران وتی: یاداشتەکانی کاك نەوشیروان و شاردنەوە یاخود شێواندنی ڕاستییەکان ناتوانێت تۆزقاڵێك لەخۆشەویستی ئێمە بۆ هەڤاڵی بەڕێز مام جەلال کەمبکاتەوە، چونکە هەڤاڵ مام جەلال لەساتەوەختێکدا سەفەری دەرەوەی ولاتی دەکردو پشتگیری بۆ یەکێتی و حکومەت پەیدادەکرد هەندێك لەو دەوڵەتانە هەتا ئەوکاتەیش کوردیان بەدڕندەو مەترسی دەزانی بۆ سەر ئاسایشی ناوچەکە، هەربۆیە هەمیشە یەکێتی و حکومەتەکەمان لەژێر مەترسی پیلانگێڕانی ناوخۆو دەرەوەدا بووەو ئەگەر سەفەرە دیپلۆماسییەکانی هەڤاڵ مام جەلال نەبوایە، ئەوا دورنەبوو خەباتی میللەتەکەمان سەدان هەنگاو پاشەکشەی نەکردایە، ئالەو کاتانەدا کە مام جەلال هەموو تەمەنی خۆی بۆ ڕازیکردنی دەوروبەر و پشتیوانی بۆ گەلی کورد ڕازیدەکرد، کاك نەوشیروان خەریکی گەرمکردنەوەی شەڕو کۆنەقینەکانی بوو لەگەڵ دۆست و هەڤاڵە نزیکەکانی خۆیداو هەرکاتێکیش شکستی دەهێنا بارگەو بنەی خۆی دەپێچایەوەو بەرەو دەرەوەی ولات خۆی دەدزییەوە، ئێستا خەڵکی کوردستان بەگشتیی و ئەو یەکێتیانەی کە لەدەوری گۆڕان کۆبوونەتەوە خەریکە تەواوی ڕاستییە مێژووییەکانیان بۆ دەردەکەوێت هەربۆیە ڕۆژبەڕۆژ گومانی زیاتر لەهەنگاوەکانی کاك نەوشیروان دەکەن و ڕۆژانە چەندین کەسیان دێنەوە بۆ ناو یەکێتی، ئالەم کاتەدا کاك نەوشیروان دەیەوێت لەڕێگەی شێواندنی ڕاستییەکانەوە جارێکی دیکە بەر لە لێشاوی گەڕانەوەی گەڕاوەکان بگرێت، هاوکات شەڕی ناوچەگەرێتی دروست بکات و جارێکی دیکە لەم ڕێگەیەوە سۆزی سلێمانی بۆ خۆی ڕابکێشێتەوە، ئەگینا ئێمەو خودی کاك نەوشیروانیش باش دەزانین ئەگەر سەفەرە دیبلۆماسییەکانی هەڤاڵ مام جەلال بەژمارە زیاتریش بن لەڕۆژەکانی تەمەنی کاك نەوشیروان لەناو یەکێتیدا، هێشتا هەر کەمە بۆ ئەوەی دڵی هەندێك لەو

دەوڵەتانە بدەینەوە کەبەهۆی هەنگاو و لێدوانەکانی نەوشیروانەوە لە کورد دەخاون، سەرباری ئەوەش ئەگەر چاوێك بەئەرشیفی سەردانەکانی هەڤاڵ مام جەلالدا بخشێنین ئەوا دەردەکەوێت بەشێکی زۆریان بۆ چارەسەرکردنی کێشە ناوخۆییەکانی نێوان حزبە کوردییەکان بووە لەسەر دەستی ئەو دەوڵەتانەی کەمام جەلال سەردانی کردوون، کێشەکانیش ئەوانەبوون کە نەوشیروان مستەفا دەستی سەرەکی هەبووە لەدروستکردنیاندا. وتیشی: من لەنەوشیروان و خەڵکی کوردستان دەپرسم سەفەرەکانی مام جەلال بەبایەخن کەبوونە هۆی دروستکردنی دۆست گەلێك بۆ یەکێتی و خەڵکی کوردستان و کوژانەوەی شەڕو ناکۆکییەکان، یاخود خۆدزینەوەکانی نەوشیروان و بەجێهێشتنی گۆڕەپانەکەو جێهێشتنی ئەرکەکان بۆ ئەو هەڤالانەی کەئێستا هەر نەوشیروان خۆیەتی دەیەوێت سوکایەتیان پێبکات؟ ئایا سەرفەرەکانی مام جەلال پربایەخن کەئەنجامەکانی کاریگەریی گەورەیان لەسەر دۆزی رەوای کورد لەئێستاو ئاییندەشدا دەبێت، یاخود خۆدزینەوەکانی نەوشیروان لەواقیعی ئەو کاتەی کوردستان، یاخود بەجێهێنانی ئەرکە تایبەتییەکانی خۆی لەئەورووپا لەسەر بودجەی یەکێتی و داهاتی خەلکی کوردستان؟

ئەحمەد محەمەد هاووڵاتییەکی دانیشتووی شارۆچکەی سەیدسادقەو خزمایەتی و دۆستایەتییەکی دێرینی لەگەڵ کاك نەوشیرواندا هەیە، ئەو ئەوەی لەسەر داوای ئێمە لەکورتترین پێناسەدا نەوشیروان بەهەموو لایەك دەناسێنێت و دەڵێت: نەوشیروان لەگوندەکەی ئێمەدا لەدایکبوو، هەرلەوێش بۆ ماوەی چەندین ساڵ ژیاوە، ئێستا عەیبی لێدێت بڵێت من خەڵکی گوندێکی ناوچەی سەیدسادقم، ئیتر دەبێ خەڵکی کوردستان چاوەڕوانی چی لێبکەن، ئەو لەنوسینەوەی یاداشتەکانیدا خۆی کردووە بەمامۆستای مەولانا خالیدو دەیان و سەدان رۆشنبیرو زاناو بلیمەتەکانی کوردستان، ئاوەهاش لەنووسینەوەی یاداشتەکانی ئەمرۆ کەوتوەتە چەواشەکردنی راستییەکان و هەڵگێرانەوەی تەواوی ئەو راستییە مێژووییانەی کە کەهیچیان لەیاداشتەکانی نەوشیرواندا تۆمارنەکراون، من نامەوێت هیچ بڵێم، ئێوە بڕۆن پرسیار لەخەڵکی

کوردستان بکەن بزانن کێ خزمەتی خەڵکی کردووە، من لەو بڕوایەشدام ئەگەر یادداشتەکانی نەوشیروان راستیش بن هێشتا ناتوانێت وەکو ئەوانەی بۆ میللەتەکەمان پێبکرێت کەناویان لەیاداشتەکەیدا هاتووە.



## بەشی یەکەم

## دەقی راپۆرتی هەڤاڵ سکرتێری گشتیی ی.ن.ك لە پلینۆمی چوارەم (٢٩-٢٠٠٩/١٠/٣١) ٢٠٠٩/١٢/٢٤

## هەڤالان و دۆستان!

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان رۆژانی (٢٩-٣٠-٢٠٠٩/١٠/٣١) لەهۆڵی تەلاری هونەری شاری سلێمانیدا، بەئامادەبوونی زیاتر لە(١٦٠٠) هەڤاڵ چوارەمین پلنیۆمی بەست. ئەگەر:

- یەکەمین پلینۆم(١٩٨٩- زەڵێ)، سەرەڕای یەکخستنی باڵەکانی ناو یەکێتی (کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانو یەکێتی شۆڕشگێران) لەهەلومەرجی سەختی ئەنفالەکاندا، لایەنی گەشو خامۆشی هەبووبێ.

- دووەمین پلینۆم(١٩٩٢ -شەقلاوە)، لەدوای راپەڕین بۆ کردنەوەی دەرگا لەرووی رەوتە چەپو دیموکراتەکاندا بۆ یەکگرتنەوەیان لەناو ی.ن.ك-دا، وێڕای لایەنە گرنگەکانی لەو هەلومەرجەدا، بۆ بەهێزکردنی یەکێتی و پاراستنی ئەزموونە دیموکراتییەکەی کوردستان لەبەرامبەر دژە دیموکراتەکاندا، پاشماوەی کێشەو ململانێکانی ناو رەوتی چەپو دیموکراتەکانی بۆ بونیادنانی ئەزمونێکی دیموکراتی

تازە بونیاتنراوی بنەبڕنەکردبێ.

-سێیەمین پلنیۆم (٢٠٠٧ - قەلاچوالان) بۆ دارشتنەوەی سیاسەتو چارەسەرکردنی کێشە پەنگخواردوەکانی سەردەمی شاخو شاری هەناوی یەکێتی، تارادەیەك کاریگەریی هەبووبێت، بەلام نەشی توانیبێ سەرجەم گرفتەکان، بەتایبەت لەناو پەیکەرەی رێکخراوەیی و سەرکردایەتیدا، چارەسەر بکات، ئەوا..

-چوارەمین پلینۆم (٢٠٠٩ - سلێمانی) بەستنی لەهەلومەرجێکی رێکخراوەیی دژوارتر لەهەلومەرجی هەرسێ پلینۆمەکەی پێشترو تەنانەت یەکەمین کۆنگرە(١٩٩١)و دووەمین کۆنگرەش (٢٠٠١)، هەلومەرجێك، جگەلەوەی بۆ هەمووان دەرکەوت، ئەوانەی لەناو یەکێتیدا، لەدوای تێکچوونی مفاوەزاتەکەی (١٩٨٣-١٩٨٥- نەك لەسێ چوار سالی رابوردودا گوایە دژایەتی گەندەلیو تاد..)دەکەن، لەهەر قۆناغێکدا بەجۆرێ خەریکی قوولکردنی گیروگرفتو ململانێ تایبەتیو گشتییەکان بوون، بۆ داپۆشینی شکستە سیاسییەکانیانو بۆ هەلرشتنی رقو کینەی لەمێژینەیان هیچ جۆرە چارەسەرێکیشیان نەدەسەلماند، ئەمانە دەرکەوتن لەپێناوی چ جۆرە کودەتایەکی رێکخراوەیی خۆیان مەلاسدابوو، ئەم راستییە مێژووییانە، کەچیتر تەمومژی سیاسی، فکریو رێکخراوەیی ناو هەڤالانو خەلکی رەواندەوەو بواری پروپاگەندەی نابەجێی بۆ چەواشەکردنی رای گشتی نەهێشتەوە. بەلێ..

کۆی کێشە پەنگ خواردوەکانی ناو یەکێتی لەناوەراستی هەشتاکانەوە کە بەپشوویەکی بێوێنە لەمێژووی حیزبایەتیدا سیاسەتی گێرەشێوێنی و پیلانگێرییان تەحەمول دەکرا، سەرەرای ئەوەش گەیاندیانە دوابریاری جیابوونەوەو سەرەنجامی چاوەروان نەکراوی هەلبژاردنی پارلەمانی کوردستان، ئەمە جگە لەگیروگرفتە پاشماوەی کێشەو بێشەی هێشتا چارەسەرنەکراوی ناو یەکێتیش کە ئەمیش بەگوێرەی خۆی دابراو نەبوو لەو هەولانەی جیابۆوەکان لەناو یەکێتیدا دەیاننا، کۆی ئەم کێشەو ململانێ و ناکۆکییانە، روبەرووی سەرکردایەتی یەکێتی لەچوارەمین

[illegible] بوونەوەو دەبوایە لەم بارودۆخەی جیهان، ناوچەکە، عیراق، کوردستان و یەکێتیدا، بەرنامەیەکی ئەوتۆ بۆ پلینیۆم دابڕێژرێ، بەشێکی زۆری ئەو کێشانە چارەسەر بکات، نەك بەپێنەو پەڕۆی کاتیی ڕۆژانی پلینیۆم بەڕێ بکرێ. ئەمەش کارێکی سەخت بوو. بەتایبەتی، لەم پلینۆمەدا،(جیابووەوەکان) سەرەڕای ڕاگەیاندنی ئاشکرایان، کەناڵە ژێربەژێرەکان، هەروەها، دەستکێشە پیلان گێڕەکانیشیان، بەردەوام خەریکی پڕوپاگەندەی سایکۆلۆژی و دروستکردنی نائومێدی بوون، هەتا وەکو نەخشەیان بۆ کێشابوو چوارەمین پلینۆمیش، بەدەردی پلینۆمەکانی دیکە بەرن، بەڵکو دەیانویست یەکێتی لەناو پلینۆمدا بگەیەننە بنبەست و نائومێدی لەناو هەڤاڵ و ئۆرگانەکانیدا، بەیەکجارەکی تەشەنە بسێنێت.

کورتیەکەی، ڕەنگە کەم حزب لەخۆرهەلاتی ناوەڕاستدا، وەکو یەکێتی، کەوتبێتە بەر قەدەرێکی چارەنوسساز، لەم پلینۆمەدا، کەچارەیەك لەبەردەمیدا نەمابوو، تەنیا سەرخستنی پلینۆم نەبێ، ئەمەش مەحاڵ بوو، ئەگەر بەرێوشوێنێکی گونجاو و بەشێوەیەکی فراوان، گوێ لەئۆرگان و کادرو ئەندامانی پلینۆم نەگیرێ، ڕەخنەکانیان بەسنگێکی فراوان قبوڵ نەکرێ و پێشنیازەکانیان نەخرێنە ناو ڕاپۆرتی هەڤاڵ سکرتێری گشتی و کۆمیتە پێکهێنراوەکانی پلنیۆم کە زیاتر لە (٥٠٠) هەڤاڵ بەشدارییان تیا کرد. یان بەشێوەیەکی دیکە بڵێین: دەبوو پلنیۆم بدرێتەوە دەست بنکەو بنەماکانی یەکێتی، هەتا بە پەرۆشیی خۆیان، ڕێوشوێنی چارەسەرکردنی گرفتەکانی دیاری بکەن و نەخشە ڕێگای دوای پلینۆمیش بنەخشێنێت.

لەم ڕێڕەوەشدا، ڕاپۆرتی هەڤاڵ سکرتێری گشتی، بۆ یەکەمین جار لەمێژووی یەکێتیدا، ئەوەی لەبنی بەڕەبوو، خستیەسەر بەڕە، نەك ئێستا، بەڵکو مێژووی یەکێتیشی لەگەڵێ بڕیاری نابەجێ، چەواشەکاری، دووڕوویی، ڕاڕایی، تاوانو هەلپەرستی ڕزگارکردو بەرچاو ڕۆشنیەکی زۆری بەخشییە هەڤاڵان، بەمەش دەروازەی گفتوگۆیەکی ئازادو هەمەلایەنەی کردەوە، کە ئیتر دوودڵی لەباسکردنی ڕاستییەکان و ڕاستکردنەوەی هەڵەکان لەلوتکەی یەکێتییەوە بۆ دامێنی نەمێنێ. کە

پێمانوایە ئەم ڕاستییەش، نەك نهێنی، بەڵكو فەلسەفەی سەركەوتنی چوارەمین پلینۆمی پێ بوو. گەرچی دركاندنی ئەم ڕاستیانە دواخران و لەم دواخستنەی ڕاستیەكانیشدا، (جیابۆوەكان) سوودێكی زۆریان لەچەواشەكردنی ڕێكخستن و ئۆرگانەكان و ڕای گشتی دا وەرگرت، بەلام لەناو پلینۆمدا هەڵدانەوەی لاپەڕەی بەشێكی بەرچاوی ڕاستییەكان، كاریگەریی فراوانی هەبوو. باس نەكردنی راستیگەلێكی دیكەش، بێگومان لەناو نانێكی گەرمدا، بابمێنێ.

بۆ مێژوو دەبێ بڵێین: ئەندامانی پلینۆمیش، بەڕاستی جۆشی پەرۆشی یەكێتیان خواردبوو. بەدڵ و بەگیان، بەهەست و هەڵوێستی جوامێرانەیان، دوای پێشكەشكردنی ڕاپۆرتەكەی هەڤاڵ سكرتێری گشتیو دركاندنی زۆربەی ڕاستییەكان، هەر وەكو مۆتەكەیەكی لەمێژینەی سەر ویژدانیان لەكۆڵ بوویێتەوە، بێ دوودڵی، یەك ئاراستەو یەك هەڵوێست، كەوتبوونە مشتومالّی ناو مالّی یەكێتی و بەگیانێكی یەكێتیانە، ئەو گیانەی دەمێك بوو بەپیلان، لەناو ئۆرگانەكاندا سارد دەكرایەوە، بوژایەوەو هەڤالان ئەركەكانیان ڕادەپەڕاندو ڕۆژانی پلینۆم و كۆمیتەكانی پلینۆم و گفتوگۆی هەڤالانەی ناو پلینۆمەكەیان، چەشنی شانە هەنگ لێكردبوو، شیلەی دڵسۆزی هزریان، لەناو هەنگستانی پلینۆمدا، چۆڕ چۆڕ لەناو هۆڵەكەدا، داچۆڕاند، هەتا پلینۆم بەرهەمێكی ئەوتۆی هەبێ، لەئاستی لێپرسراوێتی مێژوویی دا بێ، هەرواش دەرچوو.

كاتێك، ڕاپۆرتەكان دەخوێندرانەوەو پێشنیاز، ڕەخنە، بیربۆچوون و گفتوگۆكان پێشكەش دەكران، هەموو ئەندامێكی پلینۆم هەستی دەكرد، چ وزەیەكی شاردراوە لەناو هەڤالاندا تەقیوەتەوەو چ ئایندەیەكیش، پێچەوانەی پڕوپاگەندەی دژەكانو دوژمنان، چاوەڕێی یەكێتییە. سەرباری ئەو سەركەوتنانە:

خوێندنەوەی ((پەیمانی ئاكار))و یەكە یەكە مۆركردنی لەلایەن هەڤالانی مەكتەبی سیاسییەوە، فرمێسكو شادی ناو هەڤالانی، كردە تابلۆیەكی دۆخێكی ڕاچەنینی یەكێتی و یەكێتییە شۆڕشگێڕەكەی جۆشدایەوەو خستەوە سەر ڕەوتە مێژووییەكەی،

ئەوەی قۆناغی نالەباری کێشمەکێشەکان جێ بهێڵێت و بەدڵنیاییەوە ئەرکەکانی لەمەودواش ڕاپەڕێنێ.



پەیمانی ئاکار، ڕەنگە لەڕوویەکەوە، مایەی پەسەندی گەلێ لەهەڤالان و دۆستان نەبێ، لەبەرئەوەی پێیانوایە پەیڕەوی ناوخۆ، خۆی لەخۆیدا پەیمانی حزبایەتییە، ئەمە ڕاستە. بەلام ئەم ڕاستییە، ئەو ڕاستییە ناخاتە پەراوێزەوە، کە یەکێتی لە هەلومەرجی دوای جیابۆوەکان، ئیتر دەبوو بەرەسمی پەیمانێکی نوێ ڕابگەیەنێ هەتا بتوانێ تەواوی ڕێکخستن بخاتەوە سەر هەست و هەڵوێستی هەڤالانەو ئاراستەی پابەندبوون بەپەیڕەوو پرۆگرام، جوانتر بەرجەستەی بکات.

پەیمانێك، ئەویش لەناو پلینۆمێکی وادا، بۆچی دەستوبرد نەخرێتە خزمەتی پەیڕەوو پرۆگرامی یەکێتی؟ ئەی بۆچی بروسکە ئاسا (پەیمانی ئاکار) نەمان هێنێتەوە سەر ڕەوتی ڕاستەقینەی یەکێتی؟ بینیشمان پەیمانەکە چ هەژانێکی خولقاند. دەمێنێتەوە چۆن جێبەجێی دەکەین.

هەڤالان و دۆستان!

واپلینۆم بەدڵی هەمووان تەواوبوو، هەمووشمان پەیمانمانداوە بڕیارە پەسەندکراوەکانی جێبەجێ بکەین، کەوابێ:

لەدوای پلینۆمەوە، سەرجەم هەڤاڵ و ئۆرگانەکانی یەکێتی ئۆباڵیان کەوتۆتە ئەستۆ، پێویستە سەرکردایەتی، بنکەکانی ڕێکخستن و ئۆرگانەکانی دیکە، پێکڕا شان بدەینە بەر ڕاپەڕاندنی ئەرکەکان، هەتا بتوانین هەم دۆخی ڕێکخراوەیی یەکێتی چاك و چالاك بکەین. هەم زەمینەیەکی لەباریش بۆ بەستنی سێهەمین کۆنگرە بڕەخسێنین و یەکێتی لەهەموو نیگەرانی و دڵەڕاوکێیەك دەربازبکەین.

تەنیا بەمەش، گیانی شەهیدان و دەروونی کەسوکاریان ئاسوودە دەکەین، یەکێتیش لەهەموو پیلان و مەترسییەکی گەورەو گچکەی ئێستاو ئاینده بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکە دیموکراسی و مەدەنی و عەلمانییەکان، هەروا بۆ جێبەجێ کردنی وردە وردەی عەدالەتی کۆمەلایەتی، ڕزگار دەکرێ.

بەهیوای سەرکەوتنی زیاترو پێشکەوتنی زۆرتر..

بۆ پێشەوە بەرەو جێبەجێ کردنی بڕیارەکانی چوارەمین پلینۆم

مەکتەبی سیاسی ی.ن.ك ١٥/١١/٢٠٠٩

هەڤالانی تێکۆشەر

بە سلاوێکی شۆڕشگێڕانەی گەرمەوە، بۆ کۆبوونەوەی ئەم پلینۆمەمان بەخێرهاتنتان دەکەم، هیوادارم هەموومان پێکەوە بەوردی لە هەلومەرجە بابەتیو تایبەتییەکانو دۆخی عێراق بەکوردستانیشەوە، دۆخی ی.ن.ك و حکومەتی هەرێمو هاوپەیمانیەکانمان بکۆڵینەوە، جگە لە دەرسو پەندی پێویست، ڕێبازی دروستمانو هەڵوێستە راستو ڕەواکانمان دیاری بکەینو بویرانەش چاو بە خەباتی خۆماندا بخشێنینەوەو لایەنە گەشو سەروەریەکانو لایەنی هەڵەو خامۆشیەکانیش بەکردەوە، دوور لەلادانو بادان، دەست نیشان بکەینو ڕێگەی نوێبوونەوەو چاکسازیو گەشەپێدان لەهەموو بوارەکانی ژیانی حزبایەتی، سیاسی، حکومی، هاوپەیمانی، فیکریو.. هتد بەپێی گیانی سەردەمەکە بگرینەبەر، نە لەرابردودا بخولێینەوەو نەبازیش بدەین بەسەر گەشەکردنی سروشتی قۆناغی گوزەراندنی دیموکراسی لە کوردستانی تازە رزگارو ئازادکراودا.

هەڤاڵینە:

پلینیۆمەکەمان، لەکاتو ساتێکی دژوارو پڕ لە مەترسی، بەلام لەبارو پڕ لە ئومێدی ئایندەیەکی سەرکەوتوتر دەبەستین. لەم ساتو کاتە سامناکەدا دەبەسترێت کە عێراقی پێدا دەڕوات، کەلەچەندین لاوە چاوچنۆکی ناحەزانو دوژمنانی لێ زەق بۆتەوە ·رەکیانە ئەو کۆرپە ساوایەی دیموکراسیو فیدراڵیو سەربەخۆیی بەجۆرەها پیلانی ئابوری، سیاسی، تیرۆریستیو تێكوپێکدانی ژێرخان، لەناوبەرنو عێراق بەرەو رۆژگاری رەشی دیکتاتۆریەت بگەڕێننەوە دواوە، یان هیچ نەبێت بیخەنە ناو گێژاوی تیرۆر، پشێوی، سەرلێشێوان، تەنگو چەڵەمەی ئابووری، سیاسیو کۆمەلایەتیەوە، ئەم راستیەمان دەبێت لەبەرچاوبێت کە هەر لە ئێستاوە

ژمنان خۆیان بۆ سازدەدەن، تا بەتایبەتی دوای کشانەوەی ئەمریکا لە عێراق هەڵکوتنە سەر ڕەوتە دیموکرات و پێشکەوتنخوازەکەی عێراق، بەنیازی لەناوبردنی.
لەئاستی ئەم مەترسیانەدا، دەوری جولانەوەی خەڵکی کوردستان، (ی.ن.ك)، پارتی دیموکراتی کوردستان و حزبە نیشتمان پەروەرەکانی تر، دەبێ بەچاکی و دووربینانە لەم پلینیۆمەدا دیاری بکەین. بۆیە پلینیۆمەکەمان لەم ئاستەشدا گرنگییەکی تایبەتی هەیە. هەروەك بۆ دیاریکردنی هەلومەرجەکانی ڕێو شوێن دانان بۆ ئەو مەترسیانەو سەرکەوتن بەسەر پیلانی دوژمناناو، پاراستنی عێراقی دیموکرات و فیدرالا، دەبێ ژیرانە بڕیاری پێویست بدەین. لە ئان و کاتی خۆیشیدا، شۆڕشگێڕانە بەرپەرچیان بدەینەوە.
بێگومان، گەشەپێدانی (ی.ن.ك) و خۆنوێکردنەوەو چاکسازی پێویست، لە هەموو بوارەکاندا، زۆر گرنگ و بایەخدار دەبن. بەتایبەتی چونکە (ی.ن.ك) لە هەموو بوارە گرنگەکانی خەباتی کوردایەتی، هاوپەیمانی کوردستانی، هاوپەیمانی عێراقی، دارشتنی دەستووری عێراق، چەسپاندنی دیموکراسی و فیدرالاو گەشەپێدانی ڕەوتی دیموکراتی، ڕۆڵێکی کاریگەری دیاری بەجۆرێك هەبووە کە زۆرجار بۆتە هەوێنی ئەو هاوپەیمانیانەی لەعێراق بە کوردستانیشەوە پێویست و چارەنووساز بوون.
جا لێرەشدا بەهاو گرنگی پلینیۆمەکەمان و کاریگەری گەشەپێدانی (ی.ن.ك) بۆ دوارۆژی عێراق و کوردستان، ساغ دەبێتەوە.
بۆیە، لەراستیدا بەهێزکردنی (ی.ن.ك) و گەشەپێدانی بۆ پاراستنی ڕەوتی دیموکراتی عێراق و فیدرالا، سەربەخۆیی عێراق، پاراستنی حکومەتی هەرێم و گەشەپێدانی ژیانی سیاسی، کۆمەلایەتی، ئابووری و خوێندەواری کوردستانیش، زۆر گرنگ و پێویستە.
پێچەوانەکەشی لاوازکردنی (ی.ن.ك) و چەواشەکردنی خەڵك دەربارەی و درۆو بوختان هەڵبەستن بۆی، ڕاستەوخۆ خزمەتی دوژمنانی کوردو کوردستان، داگیرکەرانی کوردستان و دوژمنانی دیموکراسی دەکات. ڕاستەوخۆ خزمەتی پیلانی کۆنەپەرست، بەعسییە سەددامیەکان، شۆڤێنیەکان و تیرۆریستان دەکات. هەربۆیەش

دەبینین کە ئەوانە، بە کۆنەجاشەکانی سەر بە بێگانەو جاسووسەکانی بەعسی سەددامی هەموویان دژی (ی.ن.ك)و پارتیو حکومەتی هەرێمی کوردستانن.. ئەگینا چ شتێك لەگەلا ئەوانەی ئەم دژایەتیە دەکەن، لە بەگژداچوونی پارێزەرانی کوردایەتیو حکومەتی هەرێمو فیدرالادا کۆیان دەکاتەوە؟

ئەو بەرەیەی کۆنەپەرست، کۆنەبەعسی سەدامی، شۆڤێنیەکان، دوژمنانی دیموکراسیو فیدرالا، بەهەندێ لە سەرۆك جاشە نیشتمان فرۆشەکانی کوردیشەوە کلکیان لێك گرێداوە، دژی گەڕاندنەوەی ناوچە دابڕاوەکانی کوردستان بۆ هەرێمی کوردستان لەڕێی دوژمنایەتیکردنی ی.ن.ك و پارتی و حزبە کوردپەروەرەکانی ترەوە. ئەم سیاسەتەش، چ بە فرتو فێلو پیلانی تایەتی راستەوخۆ بێ، چ لە ڕووی بابەتیەوە بێ، ئەم سیاسەتە هاوپیلانییەو هاوپێناوییە، وردە وردە دلنیاین بەپێی هەلومەرجو بۆلوانیان، مەترسیەکانو نەخشەکانی زەقتر دەردەکەون.

جا ئەوانەی داوای پچڕپچڕ کردنی ئیقلیمی کوردستانی رزگار دەکەنو بیباکن، بگرە ناشیانەوێت ناوچە دابڕاوەکان بە کەرکوکیشەوە بگەڕێتەوە سەر هەرێم، بە هەر ناو و بیانوویەك بێت، راستەوخۆ خزمەتی ئەو بەرەیەی دوژمنانی دیموکراسیو کوردایەتی دەکەن. لەم ڕێڕەوەشدایە لە کۆبوونەوەکانیاندا دەڵێن: بەڕێوەبەرێکی گشتی لە بەغداد قبولا دەکەین، بەلام وەزارەت لەکوردستاندا وەرناگرین!!

بۆیە هەڤاڵینە، زۆر گرنگە ئەم پلینیۆمەمان ببێتە خاڵی وەرچەرخانو ئاڕاستەی نوێی وریابوونەوە لەسەر تەواوی ئاڕاستەو ئاستەکانو بیکەینە پلینیۆمی گەشەپێدانی (ی.ن.ك) بە چاکسازی ناو ریزەکانی خۆمانو بنبڕ کردنی یەکجارەکی دەستەگەری، بەچەسپاندنی یەکێتیی ریزەکانی (ی.ن.ك) لەسەر بنەمای سەرەتاکانی سیاسیو رێکخراوەییو ئایدیۆلۆژی دیموکراتی سەردەمانە. هەر تەنها بە راپەڕاندنی ئەم ئەرکە بابەتیو تایبەتیانەش دەتوانین یەکێتیی لەناو ئەو گێژاوە سیاسیو رێکخراوەییە دەرباز بکەین، کە ساڵەهایە بە نەخشەو مەرامو رقو کینە، یەکێتیی خراوەتە ناوی.

## ئەرکەکامان

### بەرەو گەشەپێدانی ی.ن.ك

ئەم گەشەپێدانەی (ی.ن.ك) تەنها بۆ خۆی، بۆ پتەوکردنی نێوانی لەگەلا کۆمەلانی خەلك، هێزەکانی هاوپەیمانی کوردستانیو عێراقی پێویستو گرنگ نیە، بەلکو ئەرکێکی نیشتمانی (عێراقیو کوردەواری)شە، لەهەمان کاتیشدا شەرتێکی گرنگیشە لە پەکخستنی ئەو هەولاو کۆششانەی دژی رەوتی دیموکراتی عێراقو دژی دەستوورو فیدرالاو ناوچە دابڕاوەکانی کوردستان دەدرێن. بۆ ئەم گەشەپێدانەش، پێویستیمان بەم ئەرکانەی خوارەوە هەیە:

١-پتەوکردنی یەکێتیی ریزەکامان بۆ بنبڕکردنی دەستەگەری.

٢-پەرەپێدانی ئاستی هۆشیاریو فیکری لەناو ئەندامانو لایەنگرانو کۆمەلانی خەلکیشدا: گەشەپێدانی بیرو هۆشیاریو فیکری زۆر گرنگە. ئەمەش بە پاك کردنەوەی هەمەلایەنەی ئەو ژینگە سیاسیو فکرییە دێتەدی، کە سالەهایە لە کوردستاندا بە هەلە، بە تێنەگەیشتنی بابەتیانە، بە مەرامو نەخشە، ئاوێتەی بیرو بۆچونی ناڕاستو هەلدێراوی کراوە.

٣-دیاریکردنی کەموکوڕیەکان، دەستنیشانکردنی هۆکارەکانیانو ژیاندنەوەی گیانی رەخنەلەخۆگرتن لەناو ریزەکانی (ی.ن.ك)دا.

٤-ئەم پلینیۆمە بەردەبازی کۆنگرێس بێت. لەمەودواش بەستنی پلینیۆمو کۆنگرێس لەکاتی خۆیدا بێ دواخستنیان.

٥-سەرخستنی هەڤالانی ژنانو کچانو لاوانی بەتواناو لێوەشاوە بۆ هەموو دەزگاکانی سەرکردایەتیو مەکتەبە جیاجیاکان.

٦-جۆشدانەوەی گیانی پێشمەرگانەو بیروباوەڕی دیموکراتیو کوردایەتی لەناو (ی.ن.ك)و لەناو کۆمەلانی خەلکدا.

٧-هۆشیاربوونەوەمانو، هۆشیارکردنەوەی کۆمەلانی خەلك لە مەترسیەکانی سەر رەوتی دیموکراتی عێراق، فیدرالا، دەستوور، سەربەخۆیی عێراق، بوژاندنەوەی گیانی

هەست كردن بە بەرپرسیاریێتی نیشتمانی، كوردایەتی لەناوخۆمانو خەڵكدا.
[illegible]اركردنی ریزەكانمان بە لێكۆڵینەوەی ورد لە هەموو ئەوانەی گەندەلا بوون، ژیاندنەوەی گیانی حیزبایەتیو فیداكاری لەپێناوی خەڵكدا.

٩-چونەوە ناو كۆمەلانی خەڵك: رێكخستنەكان نابێ هەر خەریكی خۆیان بن، بەڵكو دەبێت شانبەشانی گەشەپێدانی خۆیان، بچنە ناو خەڵك، گوێیان لێ رابگرن، لە رازو نیازیان بگەنو بیگەیەنن بە سەرەوە، پێویستە بەردەوام سەردانی كەسوكاری شەهیدان، لێقەوماوان بكەن، لە شینو شایی خەڵكدا بەشداری بكەن.

١٠-جێبەجێكردنی پەیڕەوی ناوخۆو خستنەگەڕی ئەنجوومەنی ناوەندیو رێكخستنەوەی مەكتەبەكان.

١١-زیاتر بایەخدان بە ژنان و لاوان لە هەموو بارێكەوە، سیاسیو كۆمەلایەتی و هوشیاری و دانانی بەرنامەی تایبەت بۆیان. هەروا زۆرتر بایەخ بە رێكخراوە دیموكراتیەكان و باشتر گونجاندنیان بە گیان و ئەركە دیموكراسیەكانی سەردەمەكە.

١٢-جارێكی تر دروشمی (بەرەو خانووە قوڕەكان) بەرزبكەنەوەو رووبكەنە گەڕەكە هەژارو كەمدەرامەتو دێهاتی كوردستان. هەتا وردە وردە یەكێتیی سیاسەت و بەرنامەی عەدالەتی كۆمەلایەتیش، هاوشانی ئەركە دیموكراتیەكانی، وەكو هێزێكی سۆسیال-دیموكرات جێبەجێ بكات.

بەڵێ هەڤاڵینە گەشەپێدانی (ی.ن.ك) گرنگ و پێویستە، بەلام هەر ئەوەندە بەسو باش نییە، بەڵكو دەبێت:

دووەم

پاراستنی هاوپەیمانی كوردستان

لەگەلا هەموو حیزبو رێكخراوەكانی كوردستان دۆستایەتیو هاوخەباتی بكەین. نابێ بەكەمیان بگرین، هەرچەندە بچووكیش بن. یان هەموویان حاشایەكی ئەوان بەهیچو بچوكو خوێڕی وسف بكەینو پاشانیش كە ئیشمان پێیان بوو دەستو دامێنیان بین، هەروەك جیابۆوەكانی ناو خۆمان دەیانگوت. پاشانیش كەوتنە هەڵپە بۆ

ڕێکەوتن لەگەڵیاندا.



هاوپەیمانیەداو بۆ بەهێزکردنی هاوپەیمانیەکەش، پێویستە بەتایبەتی هاوپەیمانی پارتی‌و یەکێتیی زۆر بەگرنگ‌و بایەخدار بزانین. دیارە پێویستیەکانی ئەم هاوپەیمانیە لای هەموو دڵسۆزو هۆشیارێك ئاشکرایە، پێم وایە دەرس‌و پەندەکانی تاڵاو تفتی شەڕی نەگریسی ناوخۆ، بەهەموو کوردێك‌و دڵسۆزێکی گەلەکەمان دەسەلمێنێ بۆ هەوڵدانی بێوچان بۆ پاراستن‌و گەشەپێدانی ئەو هاوپەیمانیە. هەروەها بۆ بەگژداچوونی هەوڵاو تەقەللای دوژمنانی کوردایەتی‌و دیموکراتی بۆ تێکدانی ئەو هاوپەیمانیە. چ هەوڵی ڕاستەوخۆ، چ هەوڵی ناڕاستەوخۆش.

سێیەم دۆستایەتی هێزەکانی عێراق

هاوپەیمانی لەگەلا هێزە دۆستەکانی عێراق، شەرتێکی گرنگی یەکخستنی هێزەکانی بەربەرەکانی دیکتاتۆریەت بوو، هەروەکو هۆیەکی گرنگی داڕشتنی دەستووری عێراق بەم شێوە دیموکراتیەی کە تێیدا مافەکانی خەڵکی کوردستان تۆمارکراون بوو، بێ‌ئەو هاوپەیمانیە لەتوانادا نەبوو مافە ڕەواکانی خەڵکی کوردستان لەدەستووردا بسەلمێندرێن‌و بچەسپێندرێن. بەردی بناغەی ئەم هاوپەیمانیەش، هاوپەیمانی هێزەکانی کوردستان بوو (بەپارتی‌و یەکێتیشەوە) لەگەلا هێزەکانی شیعەی عێراق، بەتایبەتی ئەوانەی لەناو (المجلس الاعلی للپورە الإسلامیە)دا بەسەرۆکایەتی خوالێخۆش بوو (أیە الله محمد باقر الحکیم) کۆببوونەوە. کە بەڕاستی ئەم زاتە، هەم شەخسیەتێکی زاناو گەورە، دووربین‌و نیشتمان پەروەر بوو، هەم دۆستێکی گەورەی خەڵکی کوردستانیش بوو" لێرەدا پێویستە ئەو ڕاستیە مێژووییەش بخەینەوە یاد کە باوکی (سماحە ایە الله العظمی محسن الحکیم) کە ڕێبەری شیعەی دونیا بوو، لەسەرەتای بەرپابونی شۆڕشی ئەیلولدا، شەڕی دژی کوردی بەناشەرعی‌و گوناهـ دانابوو. کە ئەمەش خۆی لەخۆیدا چاکەیەکی گەورە بوو بەسەر کوردایەتی. دیارە هاوپەیمانی لەگەلا هێزەکانی شیعە، ڕێگری هاوپەیمانی کوردایەتی نەبوو لەگەلا حزبی شیوعی عیراقی، الحرکە الإشتراکیە العربیە، حیزبی بەعسی قیادەی قگری عیراق‌و

[illegible]کانی تری علمـانی عـیراق، بـەلام ئـەو دوو هێـزە سـەرەکییە بـەردی بناغـەی هاوکاری دژی دیکتاتۆریەت بـوون‌و پـاش رووخـانی دیکتاتۆریـەت بوونـە بـەردی بناغەی هاوکاری‌و هەماهەنگی لەدارِشتنی دەستووری عێراق‌و چەسپاندنی مافەکانی خەڵکی کوردستان تێیدا.

لەگەلا ئەو هەموو گرنگیەی ئەم هاوپەیمانیە، ئێمە هەمیشـە هەوڵمانـداوە کـە هێـزە نیشتمانی‌و دڵسۆزەکانی عەرەبی سوننەش بهێنینە ناو کـۆڕی موعـارەزەوە، ئـەوەبوو توانیمان لـەگەلا حیزبی ئیسلامی عێراقیش پێش‌و پاش رووخانی دیکتاتۆریەت پێکبێن، لـە دانانی دەستوورەوە تا ئەمرۆ، هەموو دڵسۆزێك شایەدە کـە ی.ن.ك چ رۆڵێکـی گرنگی گێڕاوە لە بەهێزکردنی ئەو هاوپەیمانیەو پێکهێنانی حکومەتی ئیئتیلافی یەکێتیی نیشتمانیی عێراق. بەتایبەتی دوای گەڕانەوەی نەوشیروان مستەفا لـە بەغـداد، کـە وەخت بوو برایەتی‌و هاوپەیمانی کوردو شیعە بە هێرشـکردنە سـەر (ایـە اللە العظمـی سید سیستانی) هەڵوەشێنێتەوە. کە ئەوسا ئەو دەسـتوورەشمان بـەم شـێوەیەی ئێـستا دەسـت نەدەکـەوت‌و رەوتـی روداوەکـانیش لـە عێـراق‌و کوردسـتاندا، ئاقـارێکی مەترسیداریان دەگرتەبەر.

لەوماوەی چوار ساڵی رابردوو ی.ن.ك هەمیشە ناو بژیکەر و پێکهێنـەری تـەبایی و یەکخستنی هەوڵی تێکدەران بووە، مایەی شانازیمانە کە هەموو دڵسۆزان ئەم راسـتیە دەسەلمێنن‌و ستایشی دەکەن. تەنها بێ نمەك‌و بێ‌ئەمەکەکانی ناوخۆمان‌و دژو دوژمنان نەبێ!!

ئێستەش پێویستە ئەو دەورە پڕ لـە سەروەریە زۆر بەکەڵکە، درێژەپێبـدەین و بـەهۆی دۆستایەتی لـەگەلا هەموو لایەك، هەوڵی پێکهێنـانی گونجـاوی هێـزە کاریگـەرەکانی عێراق لـەسەر بنەمای سیاسەتی بابەتی‌و ئەقلانی‌و تەوافقی بدەین بەر لـە هەڵبـژاردنی داهاتوو، هەروا دوای هەڵبژاردنیش بـۆ پاراسـتنی عێراقـی دیمـوکراتی فیـدرالاو بـۆ یەکخستنی پیلانگێڕی‌و دوژمنایەتی بەعـسیەکانی سـەددامی‌و تیرۆریـستەکان، پێـشم وایە ژیاندنـەوەی رێکەوتننامـە چـوارقۆڵیـەکەی مـەجلس، دەعـوە، پـارتی، ی.ن.ك

هەوڵدانیش بۆ بەشداریکردنی حیزبی ئیسلامی، ویفاقی وەتەنیو هەندێ هێزی وەك [illegible]، دەبێتە هۆی پێکهێنانی بەرەیەکی نیشتمانیی فراوان دژی پیلانگێڕیو تیرۆریزم، بەبێ وەلاوەنانی ئەو رێککەوتنەی لیستەکانی جیاجیا کردوویانە لەگەلا هێزەکانی دۆستیان. واتا: ئەو رێککەوتنە چوارقۆڵیە ببێتە داینەمۆی هەوڵی پێکهێنانی بەرەی نیشتمانیی.

چوارەم دۆستایەتی هێزە کوردستانیەکان

دۆستایەتیکردن لەگەلا هێزە کوردستانیەکان، لەسەر بنەمای رێزگرتنو پاراستنی سەربەخۆیی هەریەکەو، پاراستنو رەچاوکردنی دەستکەوتی بەشە رزگارو دیموکراتەکەی کوردستان لەعێراقدا، هاوکات پارمەتیدانی حکومەتی هەرێم نەك گێچەلاو تەشقەڵە بۆ دروستکردنی. شایەنی باسە کە هێزە کوردستانییە سەرەکیەکانی کوردستانی ئێران تاڕادەیەکی، باش بەسوپاسەوە، ئەم سەرەتایە رەچاودەکەن. هیوادارین کە پەکەکەو هەوادارانیشی هەمان هەڵوێستی ئەو برایانەمان وەربگرنو چیتر کۆسپ نەبن لەپێش ئاوەدانکردنەوەی دێهاتی سەر سنوورو راکێشانی ئۆردووی تورك بۆ سەر کوردستانی عێراق.

ئێمە پێمان وایە کە زەمانی شەڕی چەکداری وەك ستراتیژو هۆی سەرەکی خەبات دەمێکە تێپەڕیوە. ئەم سەردەمە، سەردەمی جیهانگیری، سەردەمی خەباتی سیاسی، جەماهیری، پەرلەمانی، دیبلۆماسیو میدیاکانە. ئەوەی لەسەردەمی پێشوودا، زۆرجار بە خەباتی چەکداریش نەهاتنەدی، لەم سەردەمەدا، بەئەقڵی سیاسی کراوەو تێگەیشتنی ورد لە فەلسەفەی سیاسیو دیموکراسی جیهانگیری، بەرە بەرە دێتەدی. گۆڕانکاریەکانی ناو کۆماری تورکیا لەم سالانەدا، بە مافە سیاسیەکانی کوردو کرانەوەی زیاتر دیموکراسی و ئاوەدانی، باشترین بەڵگەی ئەو راستیانەی سەرەوەن سەبارەت بە گۆڕانکاریەکانی جیهانگیریو سەردەمەکە. بۆیە داوامان لە پەکەکە ئەوە بوو کە ئەم راستیە رەچاو بکەن و، کەڵك لەو هەلە وەربگرن کە لە جیهانو تورکیادا هاتۆتەپێش، بۆ چارەی دیموکراتی و سیاسی کێشەی گەلەکەمان لەو

بەشەی کوردستاندا.

پێویستە ئەو راستیەش دووپات بکەینەوە، کە ئەو سیاسەتەمان بۆ راکردن نییە لە بەرپرسیاری نەتەوەیی، بەڵکو سەبارەت بە پێویستیەکانی سەردەمەکەمانە. ئەگینا کێ هەیە بتوانێت نکولی لەو هەموو فیداکاری و هاوکاری و یارمەتیدانەی ی.ن.ك بکات لەگەڵ هەموو هێزە زیندووەکانی سەرتاسەری کوردستاندا.

بۆ هێز هەیە ی.ن.ك یارمەتی نەدابێت؟ پارچە هەیە لە کوردستان بۆ پاراستن و گەشەپێدانی کوردایەتی و هاودەردی خەڵکی کوردستان، خوێنی پێشمەرگەی ی.ن.ك-ی لەسەر نەرژابێت؟

پێنجەم هاوخەباتی لەگەڵ سۆشیالیست ئینتەرناسیۆنال

بۆمان هەیە شانازی بەوە بکەین کە یەکێتییەکەمان، لە ناساندنی کێشەی رەوای کورد بە دونیاو پەیداکردنی دۆست و هاوپەیمان بۆی، رۆڵێکی دیاری هەبووە. چ لە ئاستی حیزبەکانی دونیاو چ لەسەر ئاستی حکومەتەکانیش.

(ی.ن.ك) بوو، توانی بەهیممەت و دووربینی سەرۆکی نەمر (حافظ الاسد) بۆ یەکەمین جار لەمێژوودا دەرگای سوریاو حزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی لە سوریا، بۆ کوردایەتی و ی.ن.ك و هێزەکانی تری کوردیش بکاتەوە، ی.ن.ك توانی نێوان لەگەلا زۆربەی زۆری هێزەکانی شۆرشی فەلەستین دروست بکات، لەسەر ئاستی ئەورووپاش ی.ن.ك توانی لەپێشەوە لەگەلا حزبی دۆست و یاریدەدەری کورد، حزبی سۆشیالیستی فەرەنسی و ئینجا حزبی کارگەرانی بەریتانیاو ئینجا حزبی سۆشیال دیموکراتی تری ئەورووپا دۆستایەتی دروست بکات. تا وای لێهات گەیشتینە ئاستی بانگهێشتکردن و بەشداری پێکردنمان لە کۆبوونەوە

فراوانەکانی ئەو حیزبانەو سۆسیالیست ئەنتەرناسیۆنالیش. تەنانەت گەیاندمانە رادەیەك بووین بە ئەندام لە SIو پاشان سکرتێری گشتی ی.ن.ك بە جێگرێکی سەرۆك لەو رێکخراوە ئینتەرناسیۆنالیزمەدا لەکۆنگرەی (ئەسینا-٢٠٠٧) هاوشانی سەرکردە ناودارەکانی جیهانی رێکخراوەکە هەڵبژێردرا .

بەم جۆرە چیتر هەر تەنها شاخەکانی کوردستان پشت و پەنامان نەما، بەڵکو دەیان و چەندین ولاتیش بوونە دۆست و پشتیوانمان. هەڵبەتە بایەخی ئەو دەورەی ی.ن.ك لەناو (SI) دا روون و ئاشکرایە، هەرچەندە دوژمنانی کوردایەتی زۆریان پێناخۆش بوو" هەرچەندە هەر لە تاقمەکەی کۆمپانیای وشەوە، تا سەر شۆڤێنیەکانی عەرەب و تورانی هەولا دەدەن ئەو دەورە کەم بکەنەوە، بەلام بەپێچەوانەوە ی.ن.ك رۆژ بە رۆژ لەناو (SI) پایەو پلەی چەسپاو و رووەو بەهێزتر دەبێت، هەروەکو بایەخی (SI)ش، بەهەموو مەسەلەی کورد لە رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا زۆرتر دەبێت. باشترین بەڵگەش، بڕیارەکانی دوا کۆنگرەی حزبی دەستەخوشکی سۆسیالیست دیموکراتی سویدە، کە سەبارەت بە کێشەی گەلەکەمان و مەرگەساتی ئەنفال بڕیاری زۆر گرنگیان داوە.

شەشەم: دۆستایەتی نێونەتەوەیی و ناوچەیی

ی.ن.ك بۆی هەیە شانازی بەوەوە بکات، کە بە پاراستنی سەربەخۆیی خۆشییەوە، توانیویەتی دۆستایەتی لەگەلا چەندین دەوڵەتی ناوچەکە: عەرەبی، ئاسیایی، ئەوروپی و ئەمریکی پێکبهێنێت" هەر لەچینی گەورەو بەهێزەوە، تا سەر ئێران، تورکیا، سوریا، ئوردن، میسر، هەموو ولاتانی عەرەبی، ی.ن.ك رێزو تەقدیرێکی زۆری هەیەو بەهۆی پەیوەندی دۆستەکانیشیەوە، توانیویەتی رووی گەشی کوردایەتی بەو ولاتانە بگەیەنێت.

هەروەها لەرۆژهەلاتیشەوە هەتا سەر یۆنان، ئیتالیا، فەرەنسا، ئیسپانیا، پۆلەندا، رۆمانیا، نەمسا، ئەڵمانیا، سوید، نەرویج، بەلژیکا، دانیمارك، سویسرا، هۆڵەندا، بەریتانیا، ئینجا ئەمریکاو بەرازیل، ی.ن.ك دۆستایەتی باشی هەیە لەگەڵیان. لەرێی ئەو دۆستایەتیەشەوە رووی گەشی کوردایەتیان بۆ روون بۆتەوەو پشتیوانی مافە دیموکراتییە رەواکانیشی دەکەن.

دەوری ی.ن.ك-یش لە عیراق، بەرێوەبردنی عیراق، چارەی گیروگرفتەکان لەلایەن هەموانەوە تەقدیر دەکرێت. تەنانەت راپۆرتی سکرتێری گشتی کۆمکاری عەرەبی

ولاتانی عەرەب لەسەر عێراق دەڵێ: کورد ئێستا هۆکاری چارەسەری کێشەکانە، نەك بەشێك لە کێشەکان.

بۆیە بەهێزکردنی ئەم دۆستایەتییە ئەرکێکی گرنگمانە. چونکە دەبێتە هۆی خێرو چاکەی عیراق‌و ناوچەکەو کوردستانیش.

سیاسەتی راست‌و رەوای ئەمجارەمان لەگەلا هاوپەیمانان، هۆیەکی گرنگی دەستکەوتەکانمان بوو لەعیراقدا، ئەگەر سیاسەت‌و هەڵوێستی ناڕاست‌و نارەوای نەوشیروان مستەفا نەبا، لەکاتی جێگری سکرتێری گشتیدا، ئەو دەستکەوتانەمان لەدوای رزگاری کوەیت زیاترو زووتریش دەست دەکەوت. وەك لەشوێنی خۆیدا روونی دەکەینەوە.

حەوتەم: دۆستایەتی هێزەکانی جیهانی عەرەب

ی.ن.ك دۆستایەتی دێرینی لەگەلا هێزەکانی دیموکرات‌و پێشکەوتنخوازی دنیای عەرەب هەیە، هەر لەهێزەکانی شۆڕشی فەلەستین (منظمە التحریر الفلسگینیە)وە بگرە، تا سەر حزبی تەقەدومی سۆشیالست لە لوبنان و حزبی شیوعی لەزۆر لەولاتانی عەرەب، بەعسی سوریا، هێزە دیموکراتیەکانی میسرو یەمەن. ئەم دۆستایەتیە دێرینەش لەم دواییەدا گەشەی پێدراو چاکتر رووی گەشی ی.ن.ك و کوردایەتیان بۆ روون بۆتەوە، بۆیە زۆر پێویستە ئەو دۆستایەتییە بپارێزین‌و پەرەشی پێبدەین. پێویستە خۆمان نەك هەر دوور لەدروشمە شۆڤێنییەکان بگرین، بەڵکو دژیشیان بوەستین. بێگومان ئەو دۆستایەتیەش لەقازانجی عیراقە بەکوردستانیشەوە. بەتایبەتی لەم هەلومەرجە جیهانی و دیموکراسیەدا، ئایندەی رووداوەکان هەتا دێت، باشترو شیاوتر دەبێ، هێدی هێدیش، کێشەو گرفتە مێژووییەکان، چارەسەر دەکرێن و تێگەیشتنی شارستانی نێوان گەلان، رووی لە پێشکەوتنە.

گەشەپێدانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان

یەکێك لەئەرکە سەرەکییەکانی ی.ن.ك لەم سەردەمەدا گەشەپێدانی هێزی پێشمەرگەی کوردستانە. چونکە هێشتا گەلەکەمان پێویستی زۆری بەهێزی

پێشمەرگە هەیە. نەك هەر بۆ پاراستنی مافەكانی خۆی، بەڵكو بۆ پاراستنی رەوتی دیموكراتی لە عێراق و كوردستانیشدا، بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجانەی هێشتا نەهاتونەتەدی.



جا بۆیە (ه.پ.ك) بۆئەوەی بتوانێت ئەو ئەركانەی سەرشانی راپەڕێنێت، دەبێت لەڕووی چۆنایەتیو مەشقو چەكەوە گەشەی پێبدرێت. بۆئەوەش پێویستیمان بە پلانێكی رێك‌وپێك هەیە، بەتایبەتی دوای یەكخستنەوەی هێزی پێشمەرگەی كوردستان، كە پێویستە بەزوویی جێبەجێ بكرێت. چونكە ئەم یەكخستنە شەرتێكی بنەڕەتی گەشەكردنیەتی.

دیارە گەشەپێدانی چۆنایەتیەكەی، ئینجا مەشقی نوێ و مۆدرین، ئینجا پەیداكردنی چەكی بەرگری پێویست بۆ (ه.پ.ك) زۆر پێویستە، بۆ پێویستە؟ ئایا ئێمە بەتەمای شەڕین؟ یان بەتەمای شەڕبوونەوەین؟

بەسەربەستی دەڵێم:

نەخێر ئێمە تالاوی شەڕو جەنگمان چەشتووە، بەتەمای شەڕیش نین و نامانەوێت تووشی شەڕ بینەوە، بەلام دەمێكە گوتراوە خۆسازدان بۆ شەڕ، شەڕ دووردەخاتەوە.

١)تیرۆریست و دوژمنانی گەلەكەمان، پیلانگێرەكان رەنگە جۆرێك شەڕمان بەسەردا بسەپێننەوە كە (ه.پ.ك) شان بەشانی هێزە چەكدارەكانی عێراق بەرهەڵستی هێرش و پەلاماریان بكات.

٢)(ه.پ.ك) چونكە بەشێكە لەهێزەكانی چەكداری عیراقی فیدراڵ ناتوانێت دوورەپەرێز بوەستێت لەشەڕی دژە تیرۆرو پیلانگێران. بۆیە رەنگە عیراقی فیدراڵ زیاتر لەئێستاش پێویستی بە (ه.پ.ك) لە پەكخستنی پیلانی دوژمناندا هەبێت.

٣)بۆ پاراستنی هەرێمی كوردستان لەپەلامارو چالاكی تیرۆریستەكان، كە رەنگە بیانەوێت جارێكی تریش دزە بكەنەوە ناو كوردستان و تاوان ئەنجام بدەن.

٤)بۆ پەكخستنی هەو تەقەللای ناحەزانی فیدراڵ و حكومەتی هەرێم لەكاتی پێویستدا.

گەشەپێدانی حکومەت و پەرلەمانی هەرێم

بار لەگەشەپێدانی حکومەتی هەرێم، دوای پێکهێنانی لەو هێزانەی هاوپێناون لەم قۆناغەدا، دانان و پەیڕەوکردنی بەرنامەکەیەتی، کە دەبێت لەم سەردەمەدا، لەبواری خزمەتگوزاریدا زیاتر چالاك بێت و بایەخێکی تایبەتی بە لادێ و خانووە قوڕەکانی ناو شاریش بدات. هەروەك پێویستە پلانێکی دووروودرێژ دابنرێت بۆ گەشەپێدانی پیشەسازیو کشتوکاڵ لە کوردستاندا. پلانێکی ستراتیژی ئەوتۆ کوردستان لە ولاتێکی بەرخۆرەوە (استهلاکی) بگۆڕی بەولاتێکی بەرهەمهێن (المنتج). ئەمەش تەنها بەوە دەکرێ کە بەپێی پێویستیو پێداویستیەکانی سەردەم ژێرخانی ئابوری هەمەلایەنەی پیشەسازیو کشتوکاڵی دروست بکرێ. هەر ئەمەش لەگەلا پەرەسەندنی کۆمەلایەتی و چینایەتی کوردستانی ئێستا دەگونجێ، بەتایبەتی تازە بۆ یەکەمین جارە ئەوەتەی کوردستان داگیرو دابەشکراوە، لەکوردستاندا، چینی بۆرژوای نیشتمانیی سەرهەڵدەداو نەشونماش دەکات، لەم ڕێڕەوەدا، بایەخدان بە نەوتو گاز، بەدەرهێنانی کانزا گرانبەهاکانی کوردستان، بە کارگەی چەشناوچەشنی گەورە، بەسیاسەتی ئابوری هاوچەرخ، بە پاشکەوتی نەختینەو دراو، بە هاوسەنگی بازاڕو توانای کڕینی هاوولاتی، ئەرکێکی چارەنووسسازی ئابوری کوردستانە کە زۆر زۆر گرنگە پلانو پرۆژەی ستراتیژیان بۆ پەسەند بکرێ و بودجەی پێویستیشی بۆ تەرخان بکرێ. دیارە هەمووشی بە هاوکاری لەگەلا دەوڵەتە دۆستەکانو کۆمپانیاکانی جیهان. پێویستە سەرمایەداری خۆماڵیو کەرتی تایبەتیش یارمەتیو هان بدرێن بۆ بەشداری چالاکانە لە بازرگانیو ئەو جۆرە پیشەسازییانەی پێیان دەکرێت. بەتایبەتی ئەزمونی زۆرێك لە ولاتانی جیهان سەلماندویانە کە: پیشەسازی گەورەو گچکە، تەواوکەری ئابوری نیشتمانیی، نەتەوەییو بازاڕی ئازادن.

بۆ کشتوکالا، دەبێت پلانێکی تایبەتی بۆ بوژاندنەوەی لادێو بوژاندنەوە ی کستوکالاو چارەی کێشەی کەمئاویی دابنرێت. ژینگەی کوردستان لە هەر چوار

[illegible]دا، بۆ ئابوری فرەچەشن لەبارە. ئەم لەبارییەی ژینگە، دەبێ بە پرۆژەی [illegible] کشتوکاڵی هەمەلایەنە سودی لێوەربگیرێ‌و سودی پێ‌ببەخشرێ.

هەروەها پێویستە حکومەت بیرێکی جددی لە چارەکردنی ژمارەی زۆری کارمەندانی بێ‌ئیش، واتا ئەوانەی بۆ موچەوەرگرتن دانراون بێ‌ئەوەی پێویست بن، یان بەشداری لە کارکردن بکەن. دیارە دەبێ بیر لە دۆزینەوەی کاریش بۆ ئەوانەی زیاد دەبن بکرێتەوە.

نیاز لە گەشەپێدانی پەرلەمانیش، خستنەگەڕیەتی، رەخساندنی هەلومەرجی گفتوگۆی ئازاد، رادەربڕین، لێکۆڵینەوەو پێشنیازکردنە. ئێمە پێویستمان بە پەرلەمانێکی زیندووی هۆشیار هەیە، کە ئەرکەکانی نیشتمانی دەخاتە سەرووی داخوازییەکانی حزبی و شەخسی و تایبەتی.

حکومەت‌و پەرلەمانەکەمان پێویستە ئەم راستیانە بخەنە بەرچاوی خۆیان، کە هێشتا رژێمی دیموکراتی فیدراڵی عیراق، بەکوردستانیشەوە، نەچەسپاوە" هێشتا پیلانەکانی دوژمنان بۆ لەناوبردنی بەردەوامە" هێشتا چالاکی تیرۆریستی بۆ کوشت‌و کوشتارو کاولکردنی ولات هەر بەردەوامە. بۆیە ئەمڕۆ ئەرکی سەرەکی حکومەت‌و پەرلەمانیش لەگەڵا هەموو هێزە سیاسیە دڵسۆزەکان، کە پەرۆشی دیموکراسی‌و فیدراڵن، هەر پاراستنی رەوتی دیموکراتی‌و سیستەمی عێراقی دیموکراتی فیدراڵە. هێشتا هەر پەکخستنی پیلانگێڕی دوژمنەکانی ئەم رەوت‌و سیستەمەیە. دیارە چارەیەکی راست‌و رەوا گیروگرفتەکانی نێوان حکومەتی مەرکەزی‌و حکومەتی هەرێم یەکێکە لەئەرکە گرنگەکانی حکومەت‌و پەرلەمانی کوردستان.

چاکسازی‌و پاکسازیش لە دامودەزگاکانی حکومەتدا ئەرکێکی گرنگ‌و پێویستە، بۆ ئەمەش پێویستە بەرنامەیەکی هەمەلایەنە دابنرێت‌و زوو دەست بە چالاکی ژیرانەی جێبەجێکردنیشی بکرێت.

کەمکردنەوەی مووچەی وەزیر، ئەندامانی پەرلەمان، فەرمانبەرە گەورەکان، زیادکردنی مووچەی فەرمانبەرە کەم مووچەو کەمدەرامەتەکانیش، زۆر پێویستە.

جگە لەوە هەقە چاو بە مووچەی خانەنشینەکان بخشێندرێتەوە تاکو بەپێی یاسا بێت، [illegible]کی بێت، نەك لە گۆترەو لەبەر خاتری خاتران‌و مەحسوبیەت، تاکو هەر خانەنشینێك بەپێی یاسا چەندی هەق دەبێ، چەندی بەر دەکەوێ بیدرێتێ، هەتا بەری ڕەنجی دەیان ساڵەی خزمەت‌و ماندووبونیشیان بەیاسا لەژیاندا دەستەبەر بکرێ.

ڕەگ و ریشەی فیکری‌و سیاسی هەڵگەڕاوەکان لەڕێبازو قەوارەی ی.ن.ك

هەڤاڵینە:

پێم وایە وەختی ئەوە هاتووە کەئێمەش بیروڕای خۆمان بەڕاشکاوی دەربارەی ڕەگ‌و ریشەی فیکری، سیاسیی‌و ڕەوشی هەڵگەڕاوەکان دەربڕین. ڕاستییەکان بخەینەڕوو، با تالاو تفتیش بن.

دەستپێك لەناکۆکی سیاسیی‌و ڕەوشت‌و کردەوەکان لەناو شۆڕشدا سەریهەڵداوە، پاشان بەقۆناغی جۆراوجۆر پەناو پێچی جیادا هاتووە، تا گەیشتۆتە ئەمەی لەم ساڵەدا دیمان.

دیارە ناکۆکی سیاسیی، فیکری، کارو کردەوەش، هەر لەسەرەتای دامەزراندنی ی.ن.ك-ەوە هەبووە. سەبارەت بە پێکهاتەی ی.ن.ك لە سێ هێڵی فیکری جیاوازو سێ ڕێکخستنی تایبەتی کە هەموویان لەناو ی.ن.ك-دا بەشێوەی نیمچە بەرەیی کۆبووبوونەوە. ئەمە تایبەتمەندی یەکێتیی بووەو لە هێزەکانی تریشی جیاکردۆتەوە.

ئەم جیاوازییانە، هەر لەنێوان پێکهاتەکانی ی.ن.ك-دا نەبوو بەتەنها، بگرە لەهەریەك لەو پێکهاتانەشدا هەبوو. هەڵچوون و داچونیشی بەخۆیەوە دەبینی!

بۆ پێکەوە هێشتنەوەی باڵەکانی ناو ی.ن.ك و پاراستنی یەکێتیی کارو کردەوەی پێویست لە شۆڕشی نوێدا، دوو هێلاو دوو بۆچونی لەیەکتر جیا هاتبوونە کایەوە. یەکێکیان هێڵی پاراستنی یەکێتیی‌و تەبایی لەناو باڵەکانیدا، هەرچەندە نرخی لە پاشەکشەو سازش ویستبێت، هەرچەندە پشوودرێژی شۆڕشگێڕانەی گەرەك بوبێت. ئەمەیان هێڵ‌و بۆچوونی ئێمەمانان بوو، لەسەرەتاوە هەتا ئیمرۆ.

هێڵی دووەم (بۆچوونی دووەم) بێباکی بوو لە پاراستنی یەکێتیی‌و یەکێتیی



ڕیزەکانی‌و ڕەچاوکردنی دەستکەوتی تایبەتی‌و حزبی‌و جارجار شەخسیش.

ە لەبیرمە، کـە هاتینـە سـێ سـنوورەکە (لـەدۆڵی گۆسـتێ- مـانگی حـەوتی ١٩٧٧)، ئەم جیاوازییانە دەستبەجێ دەرکەوتن، بەتایبـەتی لـەنێوان شـەهیدی نـەمر عـەلی عەسـکەری و نەوشـیروان مـستەفا، سـەرەڕای نـاکۆکی نێـوان کۆمەڵـەو شۆسیالیست، سەرەڕای.ناکۆکی ناو خودی شۆسیالیست و ناو خـودی کۆمەڵـەش. جارێکیان کار گەیشتە لێکترازان! هەتا بە هەڕەشەی گەڕانەوەمان پێکمان هێنانـەوە. لەوساوە بەندەی موخلیستان ئەرکی پێکهێنانەوەو چارەی ناکۆکییـەکان، بـەگفتوگۆ پێکەوە سازان و پاراستنی یەکێتیی شۆڕش‌و ی.ن.ك ی گرتە ئەستۆ.

بەلام دوای کارەساتی هەکاری نـاکۆکی نێـوان کۆمەڵـەو شۆسیالیـست، بەتایبـەتی نەوشیروان‌و سالار لـەیەك‌و خوالێخۆشـبوو هـەڤاڵی نـەمرمان کـاك ڕەسـول مامەنـد گەیـشتە ڕادەی لـێکترازان‌و جیابوونـەوەی شۆسیالیـست بـەخۆیان‌و ڕێکخـستن‌و پێشمەرگەکانیانەوە لە ی.ن.ك، جگە لەهەڤاڵی نەمر عومەر دەبابەو هەڤاڵێکی زۆر. پاشان ناکۆکی نێـو کۆمەڵـەی ڕەنجـدەرانی کوردسـتان تـا دەهـات تونـدتر دەبـوو، بەتایبەتی لەنێوان نەوشیروان مستەفا لەلایەك‌و سـالار و مـەلا بـەختیار لەلایەکـەوە، توندوتیژی نەوشیروان‌و پیلان سەپاندن بۆ دەرپەڕاندنی نەیارە فکری و سیاسییەکانی لە کۆنفرانسەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەراندا، بە سەپاندنی لیستی تایبەتی لەهەڵبژاردنی سـەرکردایەتی کۆمەڵــەدا، لەبەرامبەریــشدا، لاســاری و ســووربوون لەســەر جیابوونەوەی سالار عەزیز لەلایەکی تـر، کارەکـەی گەیانـدە جیابوونـەوەی ئـالای شـۆڕش لـە ی.ن.ك. ئەمـە لەکاتێکـدا ئـەو کێـشانە بـە تێپـەڕینی ڕۆژگـار قـابیلی چارەسەرکردن بوون.

ئەوەی ڕاستە من و برایانی شۆسیالیـست (شۆڕشگێڕان پاشان) کە مابوونـەوە، لـەناو ی.ن.ك دا هـەوڵمان دا پـەکی ئـەو سیاسـەتە توندوتیژییـە بخـەین، بـەلام مـەخابن گەیەندرایـە حـوکمی ئیعـدام و چـارەی ناکۆکییەکـە بەشـەڕو پێکـدادان. کەچـی سکرتێری کۆمەڵە ئەو هێڵەی قیادە دەکرد کە بە کوشتن و گرتن و تـەفروتوناکردن

کێشەکان ببڕێتەوە.

لەناو خۆشماندا" بێ ئاگاداری سکرتێری گشتی و نیوەی (م.س)و ناوەندی کۆمەڵەش، بڕیاری کوشتنی خەڵکی لەشارو لەلادێ دەردەکرد. ئەمەش بوو بەهۆیەکی گەورەی ناکۆکی ئێمەمانان لەگەل هێڵی نەوشیروان لەساڵی (١٩٨١)ەوە لەناو کۆمەڵەدا. تا کار گەیشتە ئەو رادەیەی هەڕەشەمان کرد بەبەجێهێشتنی ولات ئەگەر کوشتار لەشارو لەلادێ رانەوەستێت، هەرچەندە، سەرەتا ئەنجامدانی ئەو تاوانانەو گەلێ بڕیاری ترمان لێ دەشاردرایەوە، بەلام سەرەنجام، دوای ماوەیەکی کەم، لەرێگەی بەرپرسانی گەورەی ناو شارەوە، راستیەکانمان هەموو زانی و چیکە فڕوفێل دادی نەدەدا. ئەم راستیانەش وای لێکردین بتوانین دوا سنوور بۆ پاکتاوی جەستەیی ناڕەوا دابنێین! ئەمە یەکەمین ناکۆکی و دووبەرەکی ناراستەوخۆی گرنگی نێومان بوو، لەگەلا پەیڕەوانی توندوتیژی.

پاشان، هەر لەو زەمانو زەمینەیەدا، مەخابن، شەڕی ناوخۆ قولتر کراو بەسەری ی.ن.ك دا سەپێنرا کە بەرگریی لەخۆی و شۆڕش بکات، ئەوە بوو، لە هەولێرو سلێمانیو هەندێ ناوچەی تریش، شەڕ، پێچەوانەی بەرنامەو سیاسەتی یەکێتی، روویداو، لەرەوتی گشتی روداوەکانی ناوخۆ تێنەپەڕین. بەلام روداوەکان لە شەڕی قرناقاو پشت ئاشان-دا بەهۆی گرتنەبەری سیاسەتێکی عەسکەری بڕیارلێنەدراوەوە، خراپو نامرۆڤانە شکانەوەو رووداوی زۆر نالەبارییان لێکەوتەوە. کە ئەم روداوانە لەمەڵبەندی یەکی سلێمانییدا روویان نەدا.

لەڕووی فیکرییشەوە، بەئاشکرا دەیگوت: کە مارکسیزم گەڕوگول بووەو سۆشیالیزم باوی نەماوە، کەچی خۆشی سکرتێری کۆمەڵەی مارکسی لینینی بوو! هەر ئەو باوەڕەی ئەویش بنەمای فیکری هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵە بوو لەدواییدا.

لەشەڕیشمان لەگەلا عیراقدا، سەرەڕای ئەوەی ئاشکرا رژێمی عیراق فاشستی بوو، تاوانی جینۆسایدی ئەنجام دەدا، بەلام سکرتێری کۆمەڵە جارجارە بەتەنیا ئەمری وای

[illegible]کرد، کە جێبەجێکردنیان بەڕواڵەتیش شەڕەکەی دەکردە شەڕی کوردو [illegible]ەك شەڕی کوردایەتی لەدژی دیکتاتۆریەت، ئەمەش پاساوی دەدایە شۆڤێنیەکان بۆ زیاتر ئەنجامدانی تاوان. هەروەك گاڵەو گاڵتەشی بەدروشمەکانی برایەتی کوردو عەرەب‌و هاوخەباتی هێزەکانی کوردو عەرەب دەهات، لێرەشدا جیاوازییەکی تر لەنێوانمان دروست بوو، چونکە ئێمەمانان باوەڕمان بەو برایەتی‌و هاوخەباتییە هەمیشە هەبوو، هەوڵی پێکهێنانی جەبهەی عێراق دژی دیکتاتۆریەتیشمان بەردەوام دابوو.

ناچار بۆ مانەوەی شۆڕش‌و یەکگرتویی ریزەکانی یەکێتیی، سەرەڕای کێشەو بێشەو دوبەرەکییە شاردراوەکەش، بەهیوای چاك کردن‌و راستکردنەوەی هەڵەو بۆچوونە ناڕاستەکان، گوزەراندمان. بەپێی ئەو سەرەتایەی کە پەسەندمان کردبوو، سەرەتای پاراستنی یەکێتی و یەکێتیی ریزەکانی ناو ی.ن.ك بەتایبەتی کە سکرتێری کۆمەڵە بوو، هەرچەندە لەگەل زۆربەی کادرەکانی کۆمەڵەش تێکی دابوو، بەتایبەتی نەمران جەبار فەرمان و د.خەسرەو و د.ئەرسەلان و هەڤالا عومەر فەتاح و عەلی بچکۆل و دەیان هەڤاڵی تریش.

لەناو ئەو کێشمەکێشە سیاسی و فکرییەدا، سەرەڕای ئەوەی تاقیکردنەوەی زۆرمان لەگەل سەدامییەکاندا هەبوو، بەتایبەتی سیاسەتی سەدام لەجەنگی عێراق-ئێراندا، سروشتی فاشیانەی رژێم ئاشکرا دەرکەوتبوو، دەریش کەوتبوو کە ئەم فاشیستانە لەهیچ تاوانێك نەدەسڵەمینەوە، مفاوەزاتەکەشمان لەگەلا رژێم ساڵێك بوو بەهۆی شۆڤێنیەتی بەعسی سەدامی و تەکنەلۆژیای جەنگی و فشارە ئیقلیمیەکە، شکستی خواردبوو، ئەو هەموو راستیانەمان دەزانی، بۆیە دەبوو ژیرانەتر هەڵبسورێین‌و کەمترین پاساو بدەینە دەست فاشیەکان.

کەچی لەوکاتەدا، نەك نەمانتوانی جیاوازیەکان‌و هەڵەکان سەبارەت بە سکرتێری کۆمەڵە کەم بکرێنەوە، بەڵکو ناوبراو ناکۆکیەکانی لە مەیدانی سیاسەت‌و فکرەوە، گەیاندە ئاستێکی ترسناك، ئەویش بواری عەسکەرییە، بڕیاری هەرە مەترسیداریش

ـوكاتەدا، ئەوە بوو بەبێ ڕەزامەندی سكرتێری گشتی، كە فەرماندەی گشتی هێـزی (پ.م)ش بوو، بەڵكو بەبێ ڕەزامەندی زۆربـەی مەكتـەبی سیاسـیو سـەركردایەتی یەكێتیش، فەرمانی عەسكەری دابوو بە فەرماندەو هـەڤالانی دەڤـەری هەڵەبجـە، كـە وەكـو بەشـێك لــە هاوكێـشە عەسـكەرییەكانی جـەنگی عێـراق –ئێـران هـەوڵی رزگـاركردنی هەڵەبجـە بـدەن. گوایـە بـۆ كەمكردنـەوەی گوشـار بـوو بـۆ سـەر سەركردایەتی كە ڕژێم پەلاماری دەدا. ئەم بڕیارەش بەوشـێوەیە، بـەبێ لـێكدانـەوەی هەلومەرجی جەنگەكەو سروشـتی فاشـیانەی سـەدامیەكان لـە دوو سـاڵی كۆتـایی جەنگەكەدا، پاساوی دایە دەست سەدام كە سروشتە فاشـیەكەی بـە ڕۆژی ڕونـاك، بەبێ دوودڵیی لە شاری هەڵەبجەدا جێبەجێ بكات. كە ئەگەر هاتباو ئـەم نەخـشەیە لە مەكتـەبی سیاسـیو لـەگـەلا سـكرتێرو فەرمانـدەی گـشتی (پ.م)دا، باسـكراباو تاوتوێ بكرایە، بێگومان ڕێگەنەدەدرا ڕێگـەی وا بگیرێتەبـەر. بـەڵكو هـەولا دەدرا نەخشەو تاكتیكی عەسـكەری گونجـاوتر لـەو هەلومەرجـەدا بگیرێتەبـەر. بەتایبـەتی حكومەت پێشتر هەڕەشەی بۆ ناردبوین كە هەر پەلامارێك لەگەلا پاسداران بۆ سـەر هەر شوێنێك، بە بەكارهێنانی چەكی كیمیاوی جوابی دەبێت، تەنانـەت گـەر شـاری سلێمانیش بێـت. سـەرەڕای هـەموو ئـەم ڕاسـتیانەش، ئۆبـاڵی تـاوانی كیمیابـارانی هەڵەبجەو سەرانسەری كوردستان، لەئەستۆی بەعسی سەدامدایە.

كە كارەساتەكە ڕوویداو حوكمی دیكتاتۆری هەڵەبجەی دایە بەر چـەكی كیمیـاوی، نـاڕەزایی لەسـەر سـەپاندنی بڕیارەكـە، كـە بـەبێ ڕەزامەنـدی مەكتـەبی سیاسـی دەركرابوو، لەلایەن چەندین هەڤاڵەوە بەرزبۆوە. بەلام تازە كار لەكار ترازابوو.

ناكۆكیەكی تری سەرەكی لەنێوانماندا، لەسەروبەری ڕاوەستانی شەڕی ئێران– عیراق بوو، لەوساتەدا سـكرتێری كۆمەڵـە بـاوەڕی بەشـۆڕش نـەمابوو، لـەدوای شـەڕی سەركردایەتی ورەی بەردابوو، بەپەلەپرۆزە ناوچەكەی بەجێهێشت بەسـەر هـەڤالانی سەركردایەتیدا بێ ئەوەی پرسو ڕاوێژیان پێبكات. بەتایبەتی لـەدوای ئەنفالـەكان. كە سـەدان خێـزان و هـەزاران كـەس لەگـەلا یـەكێتی لەپاشەكشەدا كـەوتبوونو

پێشتیان بەهاوکاریو ڕێنوێنی هەبوو، بەلام سکرتێری کۆمەڵـە بـەئارەزووی خـۆی ڕۆڵی دەداو سەرەنجام سەربەخۆ کەوتە بلاوەپێکردنی شۆڕشو دەستی کرد بەناردنە دەرەوەی کادیرەکانی نزیك لەخۆی و هاندانی پێشمەرگەش بۆ چـونە مـاڵی خۆیـان یان بۆ ئێـرا٘ن. بەکـەڵکوەرگرتن لەدەسـەلاتی جێگـری سـکرتێری گـشتی لـەغیابی سکرتێری گشتیدا، خـەریك بـوو شۆڕشـەکە بـلاوە پێبکـات. ئەگـەر بەرهەڵـستی هەڤالان کاك کۆسرەتو هەڤالا جەبار فەرمانو چەند هەڤاڵێکی شۆڕشگێڕیان نـەبا، بەرەسمی بڕیاری بلاوەپێکردنی شۆڕشی دەدا. سەرەنجامی ئەم سیاسەتەو ئەم بـاوەڕەی کەوتە هەڵگرتنی دروشمی گفتوگۆ لەگـەلا یـەدامو پرووپاگەنـدە بـۆ نـەمانی توانـای درێژەدان بە شۆڕش. بۆ ڕازیکردنی سکرتێری گشتیش، کـە لـەسـوریە بـوو، هـەڤالا عومەر عەبدوڵلا یان ناردە لای. بـەلام سـکرتێری گـشتی ئـەو سیاسـەتەی پەسـەند نەکردو بەقسە بەناوبانگەکەی وەلامی دانەوە" کە خەبات درێژە پێدەدەین تا سـەدام هەر دەڕوخێنین.

لێرەوە ناکۆکی نێوان سکرتێری گشتیو جێگرەکەی زۆر توندو قولا بوو. هەر بـەوە خاوکرایەوە کە پاشان (م.س) بڕیاری دا شۆڕش بەشێوەی شەڕی پـارتیزانی درێـژەی هەبێتو خەبات شـان بەشـانی موعـارەزەی عێراقـیش دژی دیکتاتۆریـەت درێـژەی هەبێت، خۆشمان دەست بکـەین بـە دروسـتکردنی دەسـتەی چـەکدار لەشـارەکانو ئۆردوگاکان بۆ ڕۆژی خۆی. چونکە ئێمە پێمان وابوو، کە سەدام کـەتێك لـەگـەلا کوێت، هەر دەکات، ئەمریکاو ئەورووپاش هەر لێی دەدەن. لـەسـەر ئـەوەش لەگـەلا نەوشیروان ناکۆك بووین، چونکە ئەو پێی وابوو کە لەسەدام نادرێت، تەنانەت دوای پەلاماردانی کوێتیش پێی وابو سـەدام دەکـشێتەوە، بۆیـە داوای گفتوگـۆی لەگـەلا سەدام دەکرد. ئەوەبوو، بێ پرسی هەڤالانیش، بەتایبـەتی سـکرتێری گـشتی، کەوتـە نامەناردن بۆ سەدامو هەوڵدانی لاواز بۆ ڕێکەوتنێکی لاواز بەهیوای ئەوەی سیاسەتی خۆی بباتەسەر. کەچی نەك سەدام ئامادەنەبوو چارەسەرێکی لاوازیـش بـۆ کێـشەکە بسەلمێنێ، بەڵکو شەخسی خۆی ئامادە نەبوو وەلامی یەك نامەی جێگـری سـکرتێری

بەکێتیی بداتەوە، تەنیا داوای زارەکی ئەوەبوو کە (یاخیبووەکان بگەڕێنەوە ریزی [illegible]مانی) ئەمەش هەر بیروبۆچونەکانی هێڵی روخاندنی سەدامی سەلماندەوە، کە رژێم شۆڤێنیو فاشییەو مافی دیموکراتی هەرگیز نادات.



لەناو هەڤالانو پێشمەرگەو بارەگاکانیشدا، هەوڵی دەدا بیروراکانی هەڤالا کۆسرەتو برایانی تر، کە دەیانگوت سەدام لێی دەدرێت و دەشڵەژێ، کەمبایەخ بکات، هەتا بتوانێ هێڵی سیاسیی خۆی زیاتر برەو پێبدات. لەم رێڕەوە سیاسییەداو لەو بارودۆخەدا، نەوشیروان دوو هەڵەی گەورەی کرد: یەکەمیان ئەو لێکدانەوە هەڵەیە بوو، دەربارەی لێدانو لێنەدانی سەدامو دەرکردنی لە کوێت. لەسەر بنەمای ئەو لێکدانەوە چەوتەش ی.ن.ك-ی توشی هەڵەیەکی مێژوویی کرد، کە دەرفەتو هەلێکی مێژوویی لەدەستداین، ئەویش ئەمەی خوارەوە بوو:

ئەمریکیەکان بە سکرتێری گشتی ی.ن.ك یان راگەیاند، کە ئەگەر بێتو هاوکاری هێزی هاوپەیمانان بۆ رزگارکردنی کوێت بکەن، ئەوا هەم یارمەتییەکی باشی چەكو ماددی دەدەن بەکوردو هەم پاشان فیدرالیەتیشی لەعیراقدا بۆ دەسەلمێننو دەسەپێنن. سکرتێری گشتیش، داوای لەنەوشیروان کرد، کە لەگەلا هەڤالانی سەرکردایەتیو پارتیش دراسەی بکەنو وەلامی بدەنەوە. ئەویش وا وەلامی سکرتێری گشتی دایەوە: کە ئەوە پەسەند نییە، چونکە سەدام هەر بەخۆشی لەکوێت دەکشێتەوەو شەڕەکەش تووشی ئێمە دەبێت. بەم هەڵوێستە هەڵەیە هەلێکی مێژوویی لەکیس کورد دا، ئەگینا دوای رزگاری کوێت، بەتایبەتی کەزۆربەی زۆری کوردستانمان رزگارکردبوو، فیدرالمان بۆ دەچەسپا.

لەدوای ئەو دوو هەڵەیە، نەوشیروان دووچاری هەڵەیەکی تریش هات، ئەویش کە راپەڕین بەهاتنەوەی لەشکری عیراق بۆ شارە گەورەکان تووشی شکان هات، لەجیاتی ئەوەی سەرکردایەتی بەربەرەکانێی بکات، وەك جێگری (س.گ)و (ف.ه.پ.ك) ئەمجارەش بەبێ بڕیاری مەکتەبی سیاسیو بەرنامەیەکی سیاسی بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئەو دۆخە نالەبارە، گوتبوی من دەمزانی وامان بەسەردێ، بەلام

مام جەلال ئەم سیاسەتەی سەپاندو تووشی کارەساتی کردین. گوایە لەترسی ئەوەی [illegible]ۆڵەی کوژراوی خۆیانمان لێ‌دەکەنەوە!

بەجۆرە دەبینین کە لە ئانو کاتە هەستیارە مێژووییەکاندا نەوشیروان هەڵەی گەورەی توشی ی.ن.ك کردووە. هەربۆیەش دوای خۆگرتنەوە لەراپەڕینەکە، لەکاتێکدا هەڤالا کۆسرەت لەناوچەکانی هەولێرو هەڤالا جەبار فەرمانی نەمر لەناوچەکانی سلێمانیو گەرمیان خەریکی پاراستنی ناوچە رزگارکراوەکانو دەرپەڕاندنی هێزی میری بوون، نەوشیروان لەناوزەنگ خۆی شاردبووەوو پەیتاپەیتاش رەخنەی روخێنەری دەگرت.

لەدوای ئەوەی ئیتر ولاتی بۆ لەندەن بەجێهێشت. تا سەروبەری یەکەمین کۆنگرێس نەهاتەوە. کە هاتەوەش، بۆ بەگژاچوونی سکرتێری گشتی و تێکدانی ی.ن.ك کاری دەکرد، بەجۆرێك کە بەئاشکرا دەیگووت با ی.ن.ك تێك چێت، شتێکی نوێ دروست دەکەینەوە. سەرەنجامی ئەم کێشانە، کۆنگرە لەباتی ئەوەی لەراپەڕیندا رێو شوێنی سیاسی بۆ سەرکەوتنو ئیدارەی حکومەت دابنێ، هەر گیرۆدەی کێشەو بێشەی کۆنو هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی رابردوو بوو. گوایە درێژترین کۆنگرە بوو، بەلام کەمترین چارەسەری دۆزییەوە.

بەم جۆرە لەمێژ ساڵە، لەسەرەتای هەشتاکانەوە (نەك لە دوو هەزارەوە)، دوو هێڵی ناو ی.ن.ك هاتەکایەوە، هێڵی پاراستنی ی.ن.ك و پەرۆشیو دڵسۆزی بۆ یەکێتی ریزەکانیو هێڵی بێ‌باکی لەیەکێتیو بەخشکەیی کارکردن بۆ لەبەریەك ترازاندنی.

هەڤاڵینە!

لە دووەمین کۆنگرەشەوە، کەزانیی زۆربەی زۆری کادری ناو ی.ن.ك-ی لەگەلا نییە، کەوتە پیلاندانان بۆ دەستگەری، هەرجارە بەبیانوویەكو بەشێوەیەك. هەموو هەوڵێکی چارەسەرکردنی کێشەکان لەگەڵیا سودیان نەبوو. لەدوا سەرەنجامدا، هەلی قۆزتەوە بۆ هەڵڕشتنی سیاسەتی کۆنەقینو پیلانە کۆنەکانی.

دەستەگەریی نەوشیروان لەلایەن باڵی یەکێتیی خوازو دڵسۆز هەستی پێ‌کرابوو،

تەنانەت ناو بەناو بلاوکراوەی ناوخۆشیان دەگەیشتە دەستمان، بەلام بەهیوا [illegible]کەی خۆمان، هیوای پاراستنی یەکێتیی و یەکێتیی ناو یەکێتیی چاوپۆشی لێدەکراو هەوڵی دڵراگرتنی دەدرا. دەریش کەوت کە ئەم سیاسەتە، بەرامبەر بە سیاسەتی تێك و پێکدانی یەکێتیی ناو یەکێتیی، ئەنجامی خوازراوی نەبوو بۆ ڕێگرتن لەجیابونەوە. بڕیارێك بوو دابویان و بردیانەسەر. بەلام هێڵی یەکێتیی پارێز، لەناو یەکێتیدا، بالادەست مایەوەو یەکێتیش سەلماندییەوە کە بەوان هەرگیز تێك ناچێ. بەڵکو زۆر ناخایەنێ یەکێتیی دەبزێتەوە سەر ڕێبازە مێژووییەکەی بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکە دیموکراسیی و مەدەنیی و کوردایەتیەکەی. بە چاکسازیی و گۆڕانکاریی و بەدیهێنانی سیستەمێکی مۆدێرنیشەوە.

ئاشکرابوونی دژایەتی (ی.ن.ك)

دوای ئەوەی نەوشیروان توانیبوی چوار ئەندامی (م.س) لەگەلا چەند ئەندامێکی سەرکردایەتی بەلای خۆیدا رابکێشێت، دەستی بە پیلان دانان بۆ جێبەجێکردنی نەخشەی دژایەتی ی.ن.ك و لاوازکردنو لەبەریەك هەڵتەکاندنی، کرد.

خۆی بەبیانوی ئەوەی تاقەتی حزبایەتی نەماوە لەگەلا ئەم سەرکردایەتییە دەستی لەیەکێتی هەڵگرت. بەپێی نەخشەیەکیش، کە پاشان ئاشکرابوو، داوای کرد کە بۆ دانانی (پەیمانگایەکی ستراتیژی بۆ توێژینەوە) بۆ ی.ن.ك و حکومەتی هەرێمو کوردایەتی یارمەتی بدرێ.

سکرتێری گشتی سەرەڕای بۆچوونی جیاواز لەناو مەکتەبی سیاسیی و سەرکردایەتی، باوەڕی پێکردو پارەی کە داوای کرد (دە ملیۆن دۆلار) و گردەکەو هەندێ شتی تری بۆ دابین کرد. ئەویش لەجیاتی توێژینەوەی ستراتیژی، کۆمپانیای وشەی پێ دانا، تەلەفزیۆنو ڕۆژنامەو رادیۆی پێ داناو کەوتە دژایەتی ی.ن.ك.

سکرتێری گشتی لەژێر گوشاری ئەندامانی سەرکردایەتیی و (م.س) بەتایبەتی ئەوانەی سەربەخۆی بوون، لەگەڵیدا کەوتەوە گفتوگۆ، لەئەنجامدا بەڵێنیدا پشتیوانی لەپڕۆژەی چاکسازی هەڤالا سکرتێری گشتی بکات، بۆ جیاکردنەوەی

دەسەلاتەکانی حیزب و حکومەت. تەنانەت بەشداریشی لە داڕشتنی پرۆژەکەی ... ی گشتی کرد کە پاشان بلاوکرایەوە.

... کەچی لەبنەوە هەر خەریکی پیلانگێڕی بوو.. دەستەو دایەرەکەشی بەکەڵکوەرگرتن لەپۆستەکانیان لەناو ی.ن.ك هەرچی توانیان بۆیان ئەنجام دا. لەهەموو خراپترو بێ ئەمەکتر، بلاوکردنەوەی نهێنییەکانی یەکێتی بوو لەمیدیاکاندا. کە ئەمە ناپاکی بوو بەرامبەر ئەمانەتی مەسئولیەت. ئەوەبوو کە زانی لەناو خەڵك نارەزایی هەیە، لیستی گۆڕانی هێنایە کایەوە بۆ دژایەتی ی.ن.ك. پێشتریش خۆی و دەستەو دایەرەکەی، کەوتبونە هێرش بۆ سەر ی.ن.ك و بەدرۆی سلێمانچێتی کردن، یەکێکە لەو پروپاگەندە ناڕاستانەی بلاویان کردەوە، گوایە ی.ن.ك مانگانە پارەیەکی زۆر وەردەگرێت و خەڵکی سلێمانی لێبێبەش کردووە! ئەوەی راست بێت، راستیەکان ئەمەی خوارەوەیە:

١-ی.ن.ك ئەو پارەیەی وەری دەگرێ بۆ (ه.پ.ك)، شەهیدان، کەمئەندامان، چەك و تفاقی (ه.پ.ك) و ئینجا ی.ن.ك-ە.

٢-ئەوەی زیانی دارایی گەورەشی لە سلێمانی دا، هەر نەوشیروان و دەستەو دایەرەکەی بوون، کە بونە هۆی بێبەشکردنی سلێمانی لە نزیکەی سێ هەزار ملیۆن دۆلار. چۆن؟

کۆریەکان لەگەل (س.گ) پێکهاتبوون کە هێزێکیان بهێننە معسکر سلام کە بۆ پاراستنی ئاسایش لە عێراق بەبڕیاری نەتەوە یەکگرتوەکان هاتبوون. بەڵێنیشیان دا کە نزیکەی (٣) هەزار ملیۆن دۆلار لەچەند ساڵێکدا لەو ناوچەیە سەرف بکەن، رێگەی کارگەیەکی کۆری بدەن کە کارگەیەکی ئاسن لە پێنجوێن دابنێت.

کە داوای کۆریەکان گەیشتە (م.س) نەوشیروان و دەستەو دایەرەکەی رەتیان کردەوەو گوتیان: نابێت بێنە ناوچەی سلێمانی.

ئەوەبوو چونە هەولێرو پارەیەکی زۆریان لە هەولێر سەرف کرد.؟ دیارە دەستیان خۆش بێ. هەولێریش شاری خۆشەویست و پایتەختی خۆمانە، خەڵکەکەشی خەڵکی

دڵسۆزو خۆشەویستی خۆمانن. ئەم راستییەم بۆیە باسکرد کە نیشانی بدەین ی.ن.ك هەمیشە دڵسۆزی سلێمانیو خەڵکە دلێرەکەی بووە، بەلام نەوشیروانو دەستەکەی رێگری ئەوەبوو کە ئەو خێرو بێرە بەخەڵکی دەڤەری سلێمانی و پێنجوێن بگات!

سیاسەتی راستەقینەی گۆڕانی گردەکە

گۆڕانی گردەکە، کە دەکاتە گۆڕانی نەوشیروان، لەدەستپێکیەوە دژی ی.ن.ك کاردەکات.

بەلام سیاسەتی شاردراوە، یان نیمچە شاردراوەیان دژی کوردایەتی، دژی فیدرالە، دژی یەکێتی خاکی کوردستانە، دژی گەڕاندنەوەی کەرکوکە بۆ باوەشی هەرێم، دژی (ه.پ.ك)و یەکێتیی خەڵکی کوردستانە. چۆن؟

١-دژایەتیکردنی (ی.ن.ك) بۆ هەموو خەڵك و خۆمان ئاشکراو روونە، بۆیە پێویستی بەباسکردن نییە.

٢-دژی فیدرالی کوردستانن: گەر بۆیان بکرێ سلێمانی لە هەرێم جیادەکەنەوەو هەرێم پارچە پارچە دەکەن، هەر پارێزگایەك بۆ خۆی لامەرکەزیەتێکی هەبێت.

٣-دژایەتی کوردایەتین: بەنەهێشتنی ئەو کیانە سیاسیەی کوردستان دژی هەرێمو فیدرالیەتی کوردستانن.

٤-دژی هاتنەوەی کەرکوکن بۆ سەر کوردستان: هەردەم بەگوتەیەك جارێکیان دەڵێ وا چەمچەماڵ و کفری و کەلار هاتۆتە سەر سلێمانی و زۆربەی نەوت و غاز لەوێیە: ئیتر ئێمە بۆ لەسەر کەرکوك هەرا بکەین؟ جارێکی تریان دەڵێ: با کەرکوك پارێزگایەکی سەربەخۆ بێت! لەهەردوو جاردا کەرکوك نەگەڕێتەوە سەر هەرێم!

٥-لای هەندێ دەوڵەت و هەندێ لایەنی سیاسی عێراقی دەڵێ (ه.پ.ك) زیادەیەو پێویستمان پێی نەماوە.

٦-هەندێ جاریان نەوشیروان بەئاشکرا دەڵێ بادینی کورد نین، کەرکوکی کەس نازانێ چین؟ هەولێریش (قسەی قێزەون دەکات)، بۆیە هەر سلێمانیمان بەسە:

جا هەڤاڵینە: ئێمە پێویستە کە لەسەر گۆڕانی نەوشیروان دەنووسین، ئەم راستیانە بۆ

خەڵك روون کەینەوە. نەك شتی شەخسیەکانیان. پێویستە خەتەری ئەو سیاسەت خەتەکانیان ریسوا بکەین.

هەروەك پێویستە ئەم راستیەش بۆ خەڵك روون کەینەوە، کە ئەو گۆڕانە پێویستە بە نەوشیروان ناکرێت، بەڵکو بە ی.ن.ك و پارتی و حکومەتی هەرێمی کوردستان دەکرێت، کە ئەوان دژایەتیان دەکەن.

پێویستە ئەم راستیە بۆ خەڵك روون کەینەوە کە بۆچی: لە سەرۆك جاشە بابەلباب خائینەکانەوە، تا سەر مەلا کرێکار، تا سەر جاشە هارەکانی خۆماڵی، تا سەر کۆنە جاسوس و کۆنە بەعسی، هەروەها باڵی تۆرانی جەبهەی تورکمانی، بەگەرمی دەنگیان بۆ دان؟ ئایا لەدژی پارتی و ی.ن.ك و حکومەتی هەرێم و کوردایەتی نەبوو؟

بەرەو نوێکردنەوەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و هێزی پێشمەرگەی کوردستان و رێکخراوە دیموکراتییەکان پێویستە ئەم پلینۆمە بکەینە سەرەتای خەبات بۆ بەستنی کۆنگرێسێکی تێروتەسەل لەماوەی چەند مانگێکدا بۆ خۆنوێکردنەوە، نوێکردنەوەی ی.ن.ك و هـ.پ.ك و رێکخراوە دیموکراتییەکان. بۆ بنبڕکردنی دەستەگەری و بۆ بەهێزکردنی یەکێتیی ریزەکانی یەکێتی، کە ئەو تاقمە سڕیان کردبوو، بەکردەوەش یەکی ئیرادەی سیاسی ی.ن.ك-ی خستبوو. بۆ جێبەجێکردنی چاکسازیو ئەو پرۆژەیەی کە سکرتێری گشتی پێشکەشی کرد، بۆ هەڵبژاردنی ئەنجومەنی یەکێتیی" هەر لەم پلینۆمەدا پێویستە پلینیۆم بڕیاری سەرژمێریی ئەندامان بدات، تاکو ژمارەی راستەقینەمان بۆ ساغ ببێتەوەو بەرنامەو پرۆژەو ئەرکو فەرمانەکانیش بەوپێیە دیاری بکرێ.

هەڤاڵینە هەموو هەلومەرجو کەرەستەی سەرکەوتنمان لەبەدیهێنانی ئەو ئەرکانە لەبەردەستە. بەمەش ی.ن.ك بەرووی گەشی مێژوویی خۆی، دوای داتەکاندنی تەپوتۆز بەسەرییەوە، دێتەوە کایەی خەبات، وەك میراتگری ئەو هەموو سەروەرییانەو ئەو هەزاران شەهیدانە، وەك پارێزەری دەسکەوتە بێوێنەکانی مێژوویی کەبرێتین

لەسەرخستنی شۆڕشی کوردستان، دابینکردنی دیموکراسی بۆ عیراق‌و فیدرالا بۆ کوردستان، هێنانەکایەی حکومەتی هەرێم و ئەو هەموو ئاوەدانی و پێشکەوتنی رووناکبیری‌و ئاوەدانییە، وەك تێکۆشەری رێگەی رزگاری‌و دیموکراتی شان بەشانی برایانی پارتی و حزبە دڵسۆزەکانی تری کوردستان.

هەڤاڵینە ئاسۆ رووناکە سەرکەوتن لەبەردەستە دەسا بۆ پێشەوە بۆ جێبەجێکردنی ئەرکەکانمان.

## راپۆرتەکانی پلینۆم پەیمانی ئاکار

کوردستانی نوێ ٢٦/١٢/٢٠٠٩

### بەشی دووەم و کۆتایی

### هەڤالانی پلینیۆم و یەکێتیی!

### کەسوکاری شەهیدان!

### پێشمەرگە نەبەزەکان!

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، ئەمجارەش، لەهەلومەرجێکی مەترسیداری سیاسیدا، بەخۆڕاگری ئەندام و ئۆرگان و پێشمەرگە، دۆست و دڵسۆزانی، بەسەر پیلانێکی تێکدانی ریزەکانیدا سەرکەوت و دوای بردنەوەی هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان و پێکهێنانی کابینەی شەشەم، وا پلینۆمێکی فراوانیشی سەرخست.

دڵنیابن، چۆن هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان دەرسێکی گەورە بوو، بۆ بەرچاورۆشنی زیاتر کە چ پیلانێك بۆ تێکدانی یەکێتیی و حکومەتی کوردستان لەئارادابوو، پێکهێنانی کابینەی شەشەمیش، بۆ بەرپەچدانەوەی مەترسییە دەرەکی و ناوخۆییەکان، سەرکەوتنێکی گەورەی ترە لەم قۆناغەدا، هاوکاتیش، پلینیۆم بۆ یەکێتیی، رێکخستنەوەو ئاراستەکردن و وەلامدانەوەیەکی مێژوویی بوو، بۆ سەرجەم پروپاگەندەو کێشمەکێشەکان.

هەڤالان!

ئێستا کە پلینیۆم، بەهۆشیاری و دڵسۆزی ئەندامانی یەکێتیی، سیاسەت و پرەنسیپی (چاکسازیو یەکریزیو جێبەجێکردنی بەرنامەی لیستی کوردستانی) دارشتەوە، ماوەتەوە، مەکتەبی سیاسی، سەرکردایەتیو ئۆرگانەکانی یەکێتیی، لەناو پلینیۆمدا، پەیمانی ئاکاری یەکێتیی بەتەواوی ئەندامانی یەکێتیی، کەسوکاری شەهیدان، پێشمەرگە قارەمانەکان، دڵسۆزان و پشتیوانانی یەکێتیی بدەن کە:

یەکەم: لەدوای ئەم پلینیۆمەوە، مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی یەکێتیی تێکرا: دوور لە هەموو چەشنە کێشەو بێشەیەك، دوور لە گیانی دەستەگەری، لەمەودوا،

یەکهەڵوێستو یەك ئاراستە، یەکێتیی ناو یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، دەپارێزن و پەرەپێدەدەن.



دووەم: تەواوی هەڤالان و کادرو ئۆرگانەکانی یەکێتیی، بەیەك چاو، بەیەك سۆزو خۆشەویستی هاوچارەنووسسازی هەڤالانە تەماشا دەکرێن.

سێهەم: مەکتەبی سیاسیو سەرکردایەتی، کوتومت پابەندی پەیڕەو و پرۆگرامی پەسەندکراوی دووەمین کۆنگرەی (ی.ن.ك) دەبن‌و جێبەجێشی دەکەن.

چوارەم: مەرجەعیەتی بەرپرسان، کادران، ئۆرگان و داوودەزگاکان، ڕێزی لێدەگیرێ‌و لەژێر هیچ پەردەو پاساوێك، پێشێل ناکرێ.

پێنجەم: پابەندبوون بەم پەیامی ئاکاری یەکێتییە کە پلینیۆم پەسەندی کردووە، بۆ سەراپای ئەندامانی مەکتەبی سیاسیو سەرکردایەتیو ئۆرگانەکان، مەحەکی دڵسۆزی ڕاستەقینەیە بۆ یەکێتیی، پێچەوانەکەشی، دژایەتیکردنی ئیرادەی دیموکراسی، هەڵوێستی پلینیۆم، چاکسازی و یەکڕیزیی یەکێتییە.

هەڤالان:

بەم پەیمانی ئاکارە: پەیمان دەدەین کە لەدوای پلینیۆمەوە، وەرچەرخانێك لە هەست و هەڵوێستو هەڵسوکەوت و سیاسەتمان بۆ درێژەپێدانی خەبات لە ڕیزەکانی یەکێتیدا، بێنینەدی و بۆ گەلەکەشمانی دەسەلمێنین کە یەکێتییەکەیان، یەکێتییەکەی کاروانی شەهیدان و سەدان دەستکەوتی گەورەو گچکەی ڕۆژگاری بەرەنگاری و دوای ڕاپەڕین، یەکێتیی ئالاهەڵگری دیموکراسی و ئازادی و مەدەنیەت و درێژەپێدەری ڕێڕەوی بونیادنانی حکومەت و خزمەتەکانی، هەر ئەو یەکێتییە نیشتمانییە کوردستانەیە، کە لەدوای هەموو نوچدانێك‌و پلانێك، قاڵ و قووڵتر لە بۆتەی خەبات، هاتۆتەدەرو باشتریش درێژەی بە کاروانی رزگاری و دیموکراسی و ئاوەدانی داوە.

داواشمان وایە، لە سالانی ڕابردوودا، هەر هەڵەو کەموکوڕییەك ڕویدابێت، هەموو بکەینە دەرس‌و پەند بۆ ئێستاو دوارۆژێکی باشتری نوێبوونەوەو ئاوەدانیو

سەرخستنی ئەزموونە دیموکراسیەکەی عێراق و کوردستان.

بژی یەکێتیی ناو یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان.

هەر شەکاوە بێت ئالای دیموکراسی.

نەمریی بۆ شەهیدان.

د.بەرهەم سالّح — مام جەلال — کۆسرەت رەسول عەلی

د.فوئاد مەعێوم — مەلا بەختیار — د. کەمال فوئاد

د. ئەرسەلان بایز — عومەر فەتاح — عیماد ئەحمەد

عادل موراد — سەعدی ئەحمەد پیرە — عەدنان موفتی

٣١/١٠/٢٠٠٩

کوردستان - سلێمانی

## راپۆرتی لیژنەکان



**لیژنەکانی پلینۆم کە (١٣) لیژنە بوون، هەریەکەیان کەلەژمارەیەك لەئەندامانی پلینۆم پێکهاتبوون، دوابەدوای کۆبوونەوەکانیان، بەجیا راسپاردەو پێشنیازو سەرنجەکانی خۆیان بۆ پلینۆم خستەڕوو، ئەمەی خوارەوە پوختەیەکی ئەو پێشنیازو راسپاردانەیە:**

-١ راپۆرتی لیژنەی راگەیاندن:

لیژنەی راگەیاندن کەلەژمارەیەك کادیرانی راگەیاندن پێکهاتبوو، لەراپۆرتەکەیاندا چەند خاڵێکی جێ سەرنجیان خستبووەڕوو گرنگترینیان نەبوونی یەك پەیام لەراگەیاندنی یەکێتی و هەروەها نەبوونی پەیوەندیی لەنێوان مەکتەبی ناوەندیی راگەیاندن و راگەیاندنی مەڵبەندەکان و نەبوونی پلانی درێژخایەن و کورتخایەنی گەشەپێدان، لێپرسراوی مەکتەبی ناوەندیی راگەیاندنیش روونکردنەوەی پێویستیی لەسەر ئەم خاڵانە پێشکەش بەئەندامانی لیژنەکە کرد، گرنگترینیان ئەمانەبوون:

-١ سەبارەت بە نەبوونی یەك پەیامیی لە راگەیاندنی یەکێتیی، رونیکردەوە کە کەناڵەکانی سەر بە مەکتەب یەك پەیامیی تیایدا بەرجەستەیە، بەلام بە رەچاوکردنی تایبەتمەندی جۆری راگەیاندنەکە. لەمبارەیەوە هەر بۆ نموونە لە دە مانگی رابردوودا، جگە لە کۆبوونەوەی مەکتەب و کۆبوونەوەی بچووك لەگەلا بەرپرسی کەناڵەکاندا، سەرجەم (١٤٧) رێنوێنی بۆ کەناڵەکان چووە، کە مەبەست لێیان دروستکردنی یەك پەیامیی بووە.

-٢ خاڵێکی تر کە بۆتە هۆی نەبوونی یەك پەیامی لە رابردوودا، بۆ نەبوونی یەك پەیامی سیاسی دەگەڕێتەوە لە مەکتەبی سیاسی.

-٣ هۆیەکی تری نەبوونی پەیامی لە سەرجەم راگەیاندنەکانی یەکێتیدا بۆ پەرش‌وبلاوی ناوەندەکانی راگەیاندنی یەکێتیی دەگەڕێتەوە، کە مەرجەعی زۆربەیان مەکتەبی راگەیاندن نیە، بەلام لەگەلا هەندێکیاندا هاوئاهەنگی ئاست جیاواز هەیە.

لیژنەی راگەیاندن لەسەرەنجامی کۆبوونەوەکانیاندا، کۆمەڵێك راسپاردەیان

خستەڕوو کەئەمانەبوون:

-١یەك پەیامیی مەکتەبی سیاسی یەکێتیی، دەبێتە هۆی یەك پەیامیی ڕاگەیاندنی یەکێتیی.

-٢بەستنی کۆنفرانسێکی تری ڕاگەیاندن لەبەر ڕۆشنایی ئەو بڕیارو ڕاسپاردانەی کە لە پلینیۆم یان لە کۆنگرەی داهاتوو پەسەند دەکرێن.

-٣چارەسەرکردن‌و دۆزینەوەی میکانیزمێك بۆ دروستکردنی تەنسیق لەنێوان کەناڵەکانی سەر بە مەکتەبی ڕاگەیاندن‌و ڕاگەیاندنەکانی دیکەی یەکێتیی بۆ دروستکردنی یەك پەیامیی.

-٢ ڕاپۆرتی لیژنەی تایبەت بەباروودۆخی ئێمەو ئەوان

ئەم لیژنەیەش لەکۆبوونەوەی خۆیدا، بۆ هەڵسەنگاندن و تێڕوانینی ئایندەیی بۆ پەیوەندییەکانی لەسەر ئاستی ی.ن.ك و هەرێم لەگەڵا بەغدا، کۆمەڵێك خاڵی خستەڕوو، گرنگترینیان ئەمانەبوون:

-١دانانی بەرنامەو ستراتیژیەتی پێشوەخت بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵا هەر پێشهات‌و مەسەلە هەمیشەیی‌و هەنوکەییەکان، کە لە پەیوەندییەکانی کوردو بەغداد دێنەپێش، نەك بەپەلەو سەرپێی‌و هەڕەمەکی کارەکانمان ئەنجام بدەین.

-٢وەلانانی خیتابی ئیزداوجی‌و تەمومژاویی لە پەیوەندییەکانی کوردو بەغدا، لەڕێگای قوڵکردنەوەی بەعێراقیبوونمان لەچوارچێوەی سیستەمی فیدرالی‌و تەرجەمەکردنەوەی مافەکانی گەلی کوردستان لە دەستوورو تێکەڵاوبوونی هەمەلایەنە لە مەسەلەکانی عێراقەوە بۆ بەرگریکردن لە سیستمی دیموکراتی فرەییدا.

-٣زیادکردن‌و پتەوکردن‌و بەهێزکردنی بوونی کورد لە بەغدا لەڕێگای.

-٤پێداچوونەوە بە پەیوەندییەکانی کوردو لایەنە سیاسییەکانی عێراق لەڕێگای هەڵسەنگاندنی هەڵوێست‌و سیاسەتەکانی ئەوان‌و خۆمان، بۆ داڕشتنەوەیەکی نوێ بەو پەیوەندییانە کە لەگەڵا گۆڕانکارییەکان‌و بەرژەوندییە هاوبەشەکان گونجاو بێت.

-٣ ڕاپۆرتی کۆبوونەوەی لیژنەی پڕکردنەوەی سەرکردایەتی‌و ئەنجومەنی ناوەند

لەم لیژنەیەدا، گشت ئامادەبووان جگە لە (٣) هەڤالا رایان وابوو کە لە (٣٥) ئەندامی سەرکردایەتی (٢٨) یان لەسەرکردایەتیدا ماوونو پێویست ناکات ئیتر سەرکردایەتی پڕبکرێتەوە ، سەبارەت بەم بابەتە هەڤالان ئەم رایانەیان هەبوو:

-١ئەوەی گرنگە بۆ ئێستا، چاککردنی دۆخی یەکێتییو خۆئامادەکردنە بۆ کۆنگرە، نەك پڕکردنەوەی سەرکردایەتی.

-٢یەکێتیی پێویستە وەك داوودەزگا کارەکانی خۆی جێبەجێ بکات.

-٣پێویستە (م.س)و سەرکردایەتی رای کادرانو ئەندامانی خوارەوە باشتر وەرگرنو رەچاوی بکەن.

هەروەها هەڤالانی لیژنەکە رایان وابوو کە دەبێ کۆنگرە تا مانگی مایسی (٢٠١٠) بگیرێت، بەپێچەوانەوە لە (٢٠١٠/٦/١)وە ئەم سەرکردایەتیە، شەرعیەتی نامێنێت.

سەبارەت بەئەنجومەنی ناوەندیش، لیژنەکە ئەم خالانەی خستەڕوو:

زۆرینەی هەڤالان رایان وابوو کە پێویستە ئەم ئەنجومەنە ئێستا دابمەزرێتو لە کۆنگرەی داهاتوودا گەشەی پێبدرێت، بەلام بە رەچاوکردنی هەندێك پێوەر.

-٤ راپۆرتی لیژنەی هەڵسەنگاندنی مەکتەبەکان

ئەم لیژنەیەش، کۆمەڵێك پێشنیازی گشتیی بۆ سەرجەم مەکتەبەکان خستەڕوو، وەك:

-١ چارەسەرکردنی کێشەی دانانی ئەندامانی ئەنجومەنی مەکتەبەکان کە بەبێ پێوەر دادەنرێنو رێژەیان دیاریکراو نییە.. داوایەکی زۆر لەسەر راگرتنی ئەو پلەیەو چارەسەرکردنی ئاسەوارەکانی هەیە.

-٢چاکردنی موچەی ئەندامو کادرانی مەکتەبەکانو باشترکردنی گوزەرانیان.

-٣ پێویستە هەر مەکتەبێك کارنامەی تایبەتی خۆی هەبێتو لەلایەن (م.س)ی بەرێزەوە پەسەند بکرێت.

-٤ بریار لە بوونو نەبوونی جێگری مەکتەبەکان بدرێت.

-٥سالانە کۆنفرانسی هەریەك لە مەکتەبەکان ئەنجام بدرێت

[illegible]ونەوەی ڕاستەقینەی (ی.ن.ك) پێویستە بە بڕیاری پلینیۆم میکانیزمێك بۆ بەگژداچوونەوەی دەستەگەری دروستببێت.

-٥ ڕاپۆرتی لیژنەی کۆنگرە بۆ پلینیۆم

لیژنەکە پیشنیازەکانی خۆی لەم چەند خاڵەدا چڕکردەوە

-١ سەرلەنوێ دانانی لیژنەیەکی باڵای ئامادەکار بۆ کۆنگرەو ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی سەرپەرشتی بکاتو سوود لە ئەزموونی کادیرانی ناوخۆو دەرەوە، دەزگای هەڵبژاردن، تەکنەلۆژیای مۆدێرنو حزبە سۆسیال دیموکراتەکان وەربگرێت، ڕاستەوخۆ دوای پلینۆم دەستبەکاربێت.

-٢ بایەخدانی ڕاگەیاندنی (ی.ن.ك) کە هەماهەنگ بێت لەگەڵا کاروبارەکانی لیژنەکەو دانانی پلانی دیاریکراو بۆ ئەو مەبەستە.

-٣لیژنەی باڵای ئامادەکار، پێویستە سێ مانگ بەر لە بەستنی کۆنگرە ڕۆژو شوێنی کۆنگرەکە دیاری بکات.

-٥پێویستە بەستنی کۆنگرەی داهاتوو بکرێتە ڕوداوێکی مێژوویيو گرنگ کە شایستەی پێگەی سیاسیو ڕێکخراوەیی (ی.ن.ك) بێت لەناوچەکەو جیهاندا.

-٦ لیژنەی ناوچە دابڕاوەکان

ئەم لیژنەیەش لەکۆبوونەوەی خۆیدا، کۆمەڵێك پێشنیارانی خستەڕوو، کەگوڕوتینی نەتەوەيیو نیشتمانیی دەبەخشێتە دانیشتوانی ناوچە دابڕاوەکان و گرنگترینیان ئەمانەن:

-١ داکۆکیکردنو سووربون لەسەر جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ کە مادەیەکی دەستوورییە.

-٢گرنگیدانی زیاتر بە پلانی ئەمنی ناوچە دابڕاوەکان بەتایبەتی پێشتنیارەکەی هێزی هاوپەیمانان کە تازە دارێژراوە.

-٣زیادکردنی ئەندامانی نوێنەرایەتی ناوچە دابڕاوەکان لە حکومەتی ناوەندو هەرێمو حزبدا.

٤- نوێنەرایەتیکردنی ناوچە دابڕاوەکان لەو دەزگایەی کە لەجێگای وەزارەتی ناوچە [illegible]کانی هەرێم لە خەڵکانی ناوچە دابڕاوەکان بێت.

٥- سەردانو گرنگیدانی زیاتر بۆ ناوچە دابڕاوەکان لەلایەن سەرکردایەتی سیاسیو لایەنە پەیوەندیدارەکان بۆ پتەوکردنی متمانەی هاولاتیانی ئەم سنورانەو ئاگادارکردنەوەی ئەندامانی پەرلەمانی ناوچە دابڕاوەکانو بونیان لەو ناوچانە.

٧- راپۆرتی لیژنەی هێزی پێشمەرگەی کوردستان

گرنگترین پێشنیازەکانی ئەم لیژنەیەش بریتیبوون لە:

١- رێکخستنو یەکخستنی میلاکی فەرماندەیی و میزانیەی یەکەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان وەك هێزێکی یەکگرتووی نیشتمانیی لەژێر سایەی وەزارەتی پیشمەرگەی حکومەتی هەرێمی کوردستان.

٢- جێبەجێکردنی ئەو یاسایانەی کە پەیوەندییان هەیە بە هێزی پێشمەرگەی کوردستان کە لە پەرلەمانی کوردستان پەسەند کراوە.

٣- چارەسەرکردنی کێشەی نیشتەجێبوونی پێشمەرگە بە دابینکردنی شوێنی نیشتەجێبوونی بنکەو بارەگای پێشمەرگەو فەرماندەکان.

٤- دابینکردنی بنکەو بارەگاو کۆلێژی سەربازی تایبەت بە هێزی پێشمەرگەی کوردستان، بەمەبەستی مەشقکردن بە یەکەکانو پێگەیاندنی ئەفسەرو فەرماندەکانی.

٥- دابینکردنی هەموو پێویستییە سەربازییەکان لە (جلوبەرگ، ئالیات، چەكو تەقەمەنی، هۆکارەکانی گواستنەوە، هۆکانی پەیوەندیکردن، پێویستیەکانی مەشق پێکردن).

٦- گرنگی دان بە ژنانی شاخ کە هەموو ئیمتیازاتێکی پێشمەرگەی شاخ بیانگرێتەوە بەتایبەت ئەوانەی لە ریزەکانی شۆڕش بوون پێش ساڵی (١٩٩١).

٨- راپۆرتی لیژنەی رێکخستن

ئەم لیژنەیەش لەکۆبوونەوەکانیدا، وێرای هەڵسەنگاندنی رێکخستنەکان لەچەند خاڵێکدا، کۆمەڵێك پێشنیازیشی خستەڕوو کەگرنگترینیان ئەمانە بوون:

–١٠ کاراترکردنی مەکتەبی ڕێکخستن.

–٢ کاراترکردنی دەزگـای هەڵبـژاردنو مەکتـەبی بـیرو هۆشـیاری بەشـی ئامـارو پەیمانگای کادران، بۆ قوڵکردنەوەی فکر لە ریزەکانی ڕێکخستندا.

–٣ بەستنی کۆنفرانسێك تایبەت بە ڕێکخستن.

–٤ ڕێکخستنەوەی ڕێکخستنەکان لەسەر بنەمای جوگرافیو پیشەیی.

–٥ بایەخدان بە ناوچە کێشە لەسـەرەکانو ڕێکخـستنەکانی نەتـەوە جیاجیاکـانی ناوچەکە، وەك: تورکمانو عەرەب.. هتد.

هەروەها سەبارەت بە ڕێکخستنی پێشمەرگە، لیژنەکە ئەم پێشنیازانەی کردبوو:

–١ جیاکردنـــەوەی تـــەواوی ڕێکخـــستنەکانی پێـــشمەرگە لـــە مەڵبەنـــدە جەماوەرییەکاندا.

–٢ ڕەچـــاوکردنی ژمـــارەی زۆری ئەنـــدامانی ڕێکخـــستنەکانی پێـــشمەرگەو دابەشکردنیان بەپێی پاریزگاکان بۆ چوار میحوەر.

–٩ ڕاپۆرتی لیژنەی سکالا

لەگەلا ڕوونکردنەوەی جۆری ئەو سکالایانەی کەبە دەسـت لیژنەکـە گەیـشتوون، لیژنەکە ئەم پێشنیازانەی خستەڕوو:

–١ مەکتەبی پشکنینو چاودێری بایەخی زیاتری پێبدرێت.

–٢ کەسێك کە دەپالێورێت بۆ ئەرکێکی دیاریکراو و دادەنرێـت، پێویـستە دەسـت نەخرێتە کاروبارییەوە لەهەمان کاتیشدا چاودێری بکرێت.

–٣ دەکرێ ڕابردووی کادران ڕوون بێتو وەك ئامارێك زانیارییـەکان لای یـەکێتیی کۆبکرێنەوە.

–٤ لە مەسەلە گرنگو چارەنوسسازەکاندا پێویـستە گـوێ لـە کـادرانی خـوارەوە بگیرێت.

–٥ داواکاری هەیە کە نوسینگەیەکی تایبەتی مەکتەبی سیاسی هەبێت بـۆ کاروبـاری کوردەکانی ناوەڕاستو باشوری عێراق.

بۆچی ئیجرائات نەکراوە لەگەلا دەرئەنجامی هەلبژاردنەکانی (٧/٢٥)،و پێویستە ئەم پرسە بخرێتە بەردەم بەشداربووانی پلینیۆم و روونبکرێتەوە.

-٦ خزم خزمێنەو مەحسوبیەت نەمێنێت و پێوەرو مەرج دابنرێت لەگەلا لێهاتوویی و تواناکان.

-١٠ کۆمسیۆنی رەوشی جیابۆوەکان لە (ی.ن.ك)

لیژنەکە کۆمەلێك پێشنیازی سەبارەت بە رەوشی جیابۆوەکان خستەروو، گرنگترینیان ئەمانەبوون:

-١ بەکارهێنانی وشەی (جیابۆوەکان) بۆ ئەو کەسانەی کە وازیان هێناوە لە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لەجیاتی بەکارهێنانی وشەی (لادەر) یا (هەلگەڕاوە) یا (دەرکراو)ەکان.

-٢چەسپاندنی ئەو پرنسیپە کە (جیابۆوەکان) هیچ پەیوەندیو مافیان بەسەر یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان نەماوە، لە هەموو رویەکەوە، لەبەرئەوەی بەئازادییەکی تەواوی خۆیان ئەو بڕیارەیان داوە، لەگەلا ئەوەی کە هەولێکی زۆریش لەگەلیان دراوە بۆئەوەی ئەو هەنگاوە نەخشەبۆدارێژراوە نەنێن.

-٣ دامەزراندنی لیژنەی وەرگرتنەوە لە هەموو مەلبەندو دەزگاکانی تری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بۆ گفتوگۆو دیالۆگ و زەمینەخۆشکردن بۆ گەڕانەوەی ئەو جۆرە کەسانە لەناو (جیابۆوەکان).

-٤یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بەردەوام بێت لەسەر بەرنامەی خۆی بۆ گۆڕانکاری و نوێکردنەوە.

-١١ راپۆرتی لیژنەی شەهیدان و کەمئەندامی سەنگەرو زیندانیانی سیاسی

ئەم لیژنەیەش چەندین پێشنیازی خستبووەڕوو، گرنگترینیان ئەمانە بوون:

-١ گرنگیدان بە تاوانی جینۆسایدی گەلی کوردستان لەناوەوەو دەرەوەی هەرێم، و دروستکردنی مۆزەخانەو مۆنۆمێنت و دەزگای لێکۆلینەوە بۆ ئەو بوارە، لەگەلا زانکۆکانی کوردستاندا.

گرنگیدان بە گۆڕە بەکۆمەڵەکانو هەوڵی بێوچان بۆ هێنانەوەی روفاتە پیرۆزەکانیان بۆ خاکی نیشتمان.



-٣هەوڵدانی جدی بۆ قەرەبووکردنەوەی کەسوکاری ئەنفالکراوەکان لەلایەن حکومەتی فیدرالی عێراقەوە.

-٤گرنگیدانو بەتاوانی کردنی جینۆساید لەبەرنامەکانی پەروەردەو فێرکردندا.

-١٢ لیژنەی پەیوەندییەکانی دەرەوە

لیژنەی پەیوەندییەکانی دەرەوە، کۆمەڵێك پێشنیازی خستەڕوو کەئەمانەی خوارەوە بەشێکی ئەم پێشنیازانەن:

-١ مەکتەبی پەیوەندیەکانی دەرەوە لەناوەوەی کوردستان شێوەی دەزگایی (موئەسەسات) لەخۆبگرێو بەرپرسیار بێت لە رێکخستنی پەیوەندیەکانو دابەشکردنیان بەسەر بەشی ناوچەیی‌و عەرەبی‌و نێودەوڵەتیداو هەریەك لەم بەشانە ئەندامێکی مەکتەب لێپرسراویەتی بکات. بارەگای مەکتەبی پەیوەندیەکانیش لەهەولێر بێت.

-٢کۆنفرانسێك بەئامادەبی سەرجەم ئەندامانی مەکتەبو نوێنەرایەتیەکانی (ی.ن.ك) لەدەرەوەو کادیرانی شارەزا لە بواری دپلۆماسیەتو جیهانی دەرەوە پێش وادەی سێهەمین کۆنگرە سازبکرێ بۆئەوەی تیایدا خوێندنەوەو پێناسە بۆ پەیوەندیەکانی دەرەوەی (ی.ن.ك) لەم قۆناغەی ئێستادا بکرێتو رێوشوێنو میکانیزمی پێویست بدۆزرێتەوە بۆ گەشەپێدانی ئەم پەیوەندیانەو چۆنیەتی کارکردنی نوێنەرایەتیەکانی (ی.ن.ك) لەگەلا رێکخستنەکانی دەرەوەدا.

ئۆفیسێکی بەهێزمان هەبێت لە بەغداد، بۆ سوودوەرگرتن لە پەیوەندیو کەناڵی دپلۆماسی‌و سەردانی سیاسی.

-٣بۆ بەرەوپێش بردنی پەیوەندیەکانمان سوود لە سەفیرو دپلۆماتو نوێنەرایەتیەکانی حکومەتی هەرێم وەربگیرێت.

-٤ئەرکی سەرەکی نوێنەرایەتیەکانی (ی.ن.ك) لەدەرەوە بریتی بێت لە

پتەوکردنەوەی پەیوەندیەکان لەگەلا پارتو لایەنە سیاسیەکانو ڕێکخراوە[illegible]کانو دەزگاکانی لێتوێژینەوەو کۆمەڵەو ڕێکخراوەکانی کلتوریو هونەریو کەسایەتیە ناسراو و بەناوبانگەکانو لۆبیەکانو هتد.

-٥ کاروبارە حکومیەکان بۆ نوێنەرایەتی حکومەتی هەرێمو باڵیۆزخانەکانی عێراق جێبهێڵدرێت، و بۆ زیاتر گەشەسەندنی پەیوەندیەکانمان پێویستە سوود لە ڕەوەند (جالیە)ی کوردیو تواناکانیان وەربگیرێت، لە کەسانی شارەزاو ڕۆشنبیرانو هونەرمەندانو لاوانی کورد لە هەندەرانو زیاتر هانی لاوانو نەوەی نوێی ڕەوەندی کوردی بدرێت بۆ چوونە نێو ڕێکخراو و پارتە سیاسیو دەزگاو کۆمەڵە گرنگەکانی ولاتانی ئەوروپیو ئەو ولاتانەی دی کە ئەم بوارانەی تیایدا ڕەخساوە.

-١٣ لیژنەی هەڵسەنگاندنی تەوەری بارودۆخی کوردستانو سیاسەتی کوردستانی لە ڕاپۆرتی سیاسی سکرتێری گشتی (ی.ن.ك)

ئەندامانی لیژنەکە، ئەم تێبینیانەیان پێشنیاز کرد:

-١ دەربارەی هەڵسەنگاندنی پەیوەندیەکانی نێوان (ی.ن.ك)و (پ.د.ك) لیژنەکە پێشنیاز دەکات ئەم پەرەگرافە بخرێتە ڕاپۆرتەکەوە: جەختکردن لەسەر پاراستنو پەرەپێدانی پەیوەندی ستراتیژی نێوان (ی.ن.ك)و (پ.د.ك)و پێویستی بەردەوامبوونی ڕێکەوتننامەی نێوانیان کە لەسایەیدا تەباییو ئارامی لە هەرێمی کوردستان دەستەبەرکراو گوتارێکی یەکگرتووی بەهێز چ لە کوردستان چ لە تەواوی عێراقو گرووتینێکی زۆری بەخشی بە هەوڵەکانی پاراستنی دەستکەوتە نەتەوەییەکانی کورد لەعێراق، پێویستە لە هەلومەرجی ئێستادا ئەم ڕێککەوتننامەیە زیاد بکرێت. بۆ هەمان مەبەست پێویستە بەردەوام بین لە هەنگاوەکانی ئاساییکردنەوەی پەیوەندیەکان لەپێناوی سڕینەوەی تەواوی ئاسەواری شەڕی ناوخۆ، بە چارەسەرکردنی کێشەو گرفتەکانو یەکلاییکردنەوەی دۆسیەی بێسەروشوێنکراوەکانو قەرەبوکردنەوەی زیانلێکەوتوان.

٢- دەربارەی گرنگی پەرەپێدانی پەیوەندییە کوردستانیەکان لیژنەکە زیادکردنی ئەم پ[illegible]فەی بەگرنگ زانی:

گەشەپێدان‌و پتەوکردنی پەیوەندیەکانی (ی.ن.ك) لەگەلا پارت‌و هێزو گروپە سیاسیەکانی کوردستان رۆڵی ئیجابی خۆی هەبووەو هەیە لە پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی‌و هاوکاری‌و هاوخەباتی‌و هاوپەیمانی پارتەکان.

د.فوئاد مەعسوم: رەزامەندبوونی کاك نەوشیروان لەسەر یاسای هەڵبژاردن و دواتر موزایەدەکردن جێگەی سەرسوڕمانە دیداری، ژینۆ عەبدوڵلا ٢٠٠٩/١٢/٢٩

بەشێکی زۆری لایەنە عیراقییەکان داوا لەمام جەلال دەکەن خۆی بپاڵێوێتەوە بۆ پۆستی سەرۆك کۆمار

د.فوئاد مەعسوم سەرۆکی لیستی هاوپەیمانیی کوردستانی لەئەنجومەنی نوێنەرانی عیراق لەدیدارێکدا لەگەڵ کوردستانی نوێ تیشکی خستە سەر ئامادەکارییەکان بۆ هەڵبژاردنی چاوەڕوانکراوی پەرلەمانی عیراق و ئەو هاوکێشە سیاسییەی دێتە ئاراوەو سەنگ و قورسایی کورد لەپێگەی سیاسیی عیراقدا و جەختیشی لەوەکردەوە کەکورد سەنگ و قورسایی خۆی دەبێت لەپەرلەمانی داهاتووی عیراقدا و بەبێ بەشداربوونی هاوپەیمانی مەحاڵە حکومەتی عیراق پێکبهێنرێت، هەروەك باوەڕی خۆشی نیشاندا کەئەمجارەش پۆستی سەرۆك کۆمار بۆ کورد مسۆگەرە، د.فوئاد مەعسوم سەرسوڕمانی خۆی نیشاندا بەرامبەر موزایەدەی دەزگاکانی راگەیاندنی کۆمپانیای وشە لەسەر یاسای هەڵبژاردن و رایگەیاند: لەیاسای هەڵبژاردنی عیراقدا کەکورسییەکان گەیشتنە ٤٣ کورسی، د.مەحمود عوسمان رۆژانە بەردەوام پەیوەندیی بەکاك نەوشیروانەوە دەکرد، کاك نەوشیروان هیچ رەتکردنەوەیەکی نیشان نەدا، بەڵکو د.مەحمود شاهیدە کەکاك نەوشیروان

...رامەندی نیشانداوەو پشتگیریی کردووە، هەربۆیە ئێستا سەیرم لێدێت کەدواتر ...دەکرێت و موزایەدە دەکرێت و ئەوەش جێگەی سەرسوڕمانە.

## ئامادەکارییەکان بۆ هەڵبژاردن

دەربارەی ئامادەکارییەکان بۆ هەڵبژاردنی چاوەڕوانکراوی پەرلەمانی عیراق کەبڕیارە لە ٢٠١٠/٣/٧ بەڕێوەبچێت، د.فوئاد مەعسوم رایگەیاند: سالانی رابردوو لیستەکە داخراوبوو، بەلام لەهەڵبژاردنی ئەمجارەدا لیستەکە کراوەیە، واتا دەبێت حسابی تایبەت بۆ کاندیدو پالێوراوەکان بکرێت و نابێت تەنیا بیر لەوە بکرێتەوە کەدەنگ بهێنن، بەڵکو دەبێت بیرلەوەش بکرێتەوە کەئەو کاندیدانە دەتوانن چ رۆڵێکی بەهێزو کاریگەر ببینن، چونکە مەسەلەیەکی باوی هەڵە هەیە، وادەزانرێت ئەندامی پەرلەمان تەنیا لەناو هۆڵی پەرلەماندا دەبێت دەست بەرزبکاتەوەو دەست دابنێت، پەرلەمانتار بەتەنیا ئەوەندە نییە، پەرلەمان بریتییە لەچەندین لیژنەی تایبەت و کاری پەرلەمانتار ئەوەیە کەدەبێت بەشداری بکات لەو لیژنانە، ئەگەر شارەزایی و پسپۆڕی و ئاشنایەتی نەبێت لەیەکێك لەو لیژنانە، مانای وایە کەدەچێت و دادەنیشێت لەکۆبوونەوەی لیژنەکاندا هیچ بەشدارییەکی نابێت و هیچ تێناگات، هەربۆیە دەبێت رەچاوی ئەوە بکرێت ، لەلایەکی تریشەوە بتوانن بەئەرکی خۆیان هەستن لەکاری لیژنەکاندا، پاشان دواترو لەقۆناغی چوونە ناو هۆڵی پەرلەمان دەستدەکرێت بەگفتوگۆو وتوێژو دەست بەرزکردنەوەو قسەکردنیش لەناو پەرلەماندا زیاتر چەند کەسێك دەیکەن و ماوەنییەو رێگانادرێت هەموو ئەندامێك قسەبکات، دەبێت چەند کەسێکی وای تیابێت شارەزاییان هەبێت لەکاری سیاسی و پەیوەندیی نێودەوڵەتی، هەربۆیە بەندە بەشێوەیەکی گشتی هیچ گلەییەکم نییە لەکاندیدەکانی پێشوو، چونکە کەسانی دڵسۆزو پابەندبوون و هەریەکەو بەگوێرەی توانای خۆی بەشداری لیژنەکانیان کردووە، بەلام دیارە ئەمجارەش بەحسابێکی تر کاندیدەکان دانراونەتەوە، بۆئەوەی ناوەکانیش زۆر دووبارە نەبنەوە، لەبارەی هاوپەیمانی کوردستانییەوە، چەند کەسێکی تیا ماوەتەوەو ئەوەش پێویستە،

ئەوەندەی ئەزموونی پەرلەمانییەکەی هەبێت، نەك ئەوەی کەهەمووویان کاندیدی حزب و ماوەیەکی دەوێت تائاشنای کارەکانی پەرلەمان بن، بەڵکو ئەزموونێکی دەوڵەمەندیان هەیە، ئەم هاوکێشەیە بۆ هەموو فراکسیۆنەکانیشە کەئەم سیستمە پەیڕەودەکەن، چونکە بوونی پەیوەندیی و چۆنییەتی ئاگاداربوون لەبەڕێوەچوونی کاروبارەکانی پەرلەمان کاریگەریی خۆی هەیە، هیواداریشم لەپەرلەمانی داهاتوو کارووبارەکان بەرەو پێشتر بڕوات ئەگەرچی هەندێك ئاستەنگ دەبینم بەهۆی ئەوەی نەخشەی سیاسی گۆڕاوە، جاران کەدەوترا ئیئتلاف ١٣٠ کورسی هەبوو و لەگەڵ یەك دوو کەس رێکدەکەوتیت و مامەڵەت دەکردو ئەو هەموو دەنگەت بەدەستدەهێنا، بەلام ئێستا ئەوە گۆڕاوە، بۆنموونە ئیئتلاف بوونەتە دوو بەشی سەرەکی و هەندێك لایەنی تریشی لێبۆتەوە، ئایا لەناو پەرلەماندا هەروەك خۆیان دەمێننەوە لەناو خۆیاندا، یاخود جیادەبنەوە، هەروەها کوردیش جیاوازی هەیە بۆنموونە چەندین لیستی تر هەیە بەجیا بەشداربوون و هاتوونەتە ناو پرۆسەکەوەو خۆیان هەڵدەبژێرن، سەرۆکی لیستی هاوپەیمانیی کوردستانی وتیشی: لەلایەکەوە گەشبینم بەپەرلەمانی داهاتوو لەوەدا کەخەڵکانی خاوەن ئەزموون و شارەزای زیاتر دێنە ناو پەرلەمانەوە، رەنگە بابەتیانەتر مەسەلەکان باسبکرێن و گەشبینییەکانیشم لەوەدایە ئێمە کەبەراوردی خۆمان لەگەڵ هەر فراکسیۆنێك بکەین جیاوازییەکە ئەوەندە نییە، بۆنموونە ئەگەر ژمارەی کورسییەکان ١٣٠ بێت، ئەوە ئێمە ٥٣ کورسیمان هەیە کەبەشێوەیەکی گشتی هەموو فراکسیۆنەکان لەیەکتری نزیکن و هەریەکە ٨ بۆ ٩ کورسییەکی جیاوازە لەگەڵ لایەنەکانی تر، بۆنموونە ئیئتلافی یاساو ئیئتلافی نیشتمانی لەگەڵ هاوپەیمانی جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە، هەربۆیە لەلایەك مامەڵە خۆشتر دەبێت و لەلایەکی ترەوە لەجیاتی ئەوەی لەگەڵ یەك لایەندا مامەڵە بکەیت، دەبێت لەگەڵ چەند لایەنێك مامەڵە بکەیت و واشی دەبینم سەنگی کوردستانی لەپەرلەمانی داهاتوودا سەنگێکی قورس دەبێت بەمەرجێك ئەو سیاسەتەی کەهەیبووە بەهەمان سیاسەت بڕوات، توندوتیژیی خراپەو نابێت

بەندوتیژی مامەڵە لەگەڵ مەسەلەکان بکەیت و دەبێت هەوڵی ئەوە بدەیت کانی تر بەلای خۆتدا راکێشیت، راکێشانەکەش بەئاڵوگۆڕی بەرژەوەندیی دەکرێت، بۆنموونە ئێمە کارێکمان دەوێت دەبێت لایەنی بەرامبەر پشتگیریمان بکات بۆئەوەی ئێمەش لەیاساو مەسەلەیەکی تردا پشتگیریی بکەین، هەربۆیە فراکسیۆنی هاوپەیمانی سەنگ و قورسایی دەبێت لەپەرلەمانی داهاتوودا، چونکە هیچ هێزو فراکسیۆنێکی تر ناتوانێت بیر لەوە بکاتەوە کەبەتەنیا حکومەت پێکبهێنێت، بێگومان پێویستی بەلایەنی تر هەیە، فراکسیۆنی کوردستانی ئەوە شتێکی حەتمییە کەپێویستییان پێیەتی و دەبێت حکومەتی داهاتوو لەگەڵیان رێك بکەوێت، هەروەها کوتلەی تریش بەتایبەتی سوننە دەبێت رێککەوتن بکرێت لەگەڵیاندا.

همموو لایەنەکان پێویستیان بەکورد هەیە

لەبارەی پەرتبوونی لیستی کوردستانی لەم هەڵبژاردنەدا، د.فوئاد مەعسوم روونیکردەوە کەپەرشوبلاوی کورد زۆر نییەو ئاشکراشیکرد جیاوازییەکی زۆر دەبێت لەنێوان فراکسیۆنی کوردستانی و ئەو لایەنانەی کورد کەبەجیا بەشداردەبن، مەسەلەکە ئەوە نییە کە لەئەنجامدا زۆر لەیەکەوە نزیکبن، بەڵکو جیاوازییەکی زۆر دەبێت لەنێوانیانداو سەنگی کورد لەچەند خاڵێکدایە کەپێکهاتەیەکی سەرەکی عیراقەو خاڵێکی تریش ئەوەیە کەکورد ئەزموونێکی سیاسی زۆر باشی هەیە لەمامەڵەکردن لەگەڵ لایەنی عیراقی، ئەمە حسابێکی زۆر گرنگە، هەروەها کورد هیوای ئەوەی نییە کەحوکمی بەغدا بکات، ململانێکەمان لەگەڵ هەر پێکهاتەیەکی دیکە لەسەر ئەوە نییە کەکێ حوکمی بەغدا بکات، بەڵکو پێکهاتەکانی تر ئەو ململانێیە هەیە لەنێوانیاندا، هەربۆیە ململانێکان لەنێوان ئەو لایەنانەدا زۆر بەهێزە، همموو لایەنەکانیش پێویستیان بەکورد هەیە، چونکە مەسەلەکە حوکمی تەواوی عیراق و بەغدایەو کورد چاوی لەوە نییە کەحکومەتی عیراقی پێکبهێنێت، بەڵکو فراکسیۆنی هاوپەیمانی دەیەوێت بەشداربێت لەحکومەت و لەپێگەی بەهێزی حکومەت بەشداربن، نەك پێگەیەکی پەراوێزخراوو چەند وەزارەتێکی بچوکمان

بدرێت بەشێوەیەکی رووکەش، بەڵکو یەکێك لەپۆستە سیادییەکانیش بۆ کورد بێت، بەتایبەتی پۆستی سەرۆکی کۆمار ئەمجارەش مسۆگەرە بۆ کورد.

کارکردن لەبازنەیەکی فراوانتردا

دەربارەی ئەو رەخنەیەش کەگوایە دەبوو وەك لوبنان پۆستە سیادییەکانی (سەرۆك کۆمارو ئەنجومەنی وەزیران و پەرلەمان) بۆ سێ پێکهاتەی سەرەکییەکەی عێراق (کوردو شیعەو سوننە) دیاریبکرایە، سەرۆکی هاوپەیمانیی کوردستانی وتی: لەگەڵ ئەو نەریتەی لوبنان نیم بەو شێوەیە، چونکە ئەوەی لوبنان سروشتێکی تایفی وەرگرتووەو لەناوخۆدا کەمن بەباشی نازانم و رایەکی خۆشم هەیەو واشی بیردەکەمەوە نەك ئەم خولەی لەرێگەماندایە، بەڵکو لەخولی داهاتوودا وایدەبینم کەکورد چیتر خۆی گەمارۆ نەدات لەکوردستان، بەڵکو لەبازنەیەکی فراوانتر کاربکات و ئەوکاتە پێگەی بەهێزتر دەبێت لەوەی ئێستا هەیەتی، چونکە ئێستا ئێمە هەر لەچوارچێوەیەکی کوردستانیدا دەخولێینەوە، بەلام ئەگەر چوارچێوەکە فراوانتر بێت و بەگوێرەی رێککەوتن بێت لەگەڵ هێزەکانی تر، ئەگەری ئەوە هەیە لەداهاتوودا پۆستی سەرۆك کۆمار بدرێتەوە بەکورد، بەلام ئەگەر ئێمە وەك لوبنانی لێبکەین، ئەوە هەرگیز پۆستی سەرۆك کۆماریشت بەرناکەوێت، بەتایبەت بەگوێرەی دەستوور پۆستی سەرۆك کۆمار دەسەلاتەکانی زۆر نییە، ئەوەش کەئێستا دەبینرێت ئەوە کەسایەتی مام جەلال-ە کەقورسایی خستۆتە سەر پۆستەکەو جوڵەی پێدەکات، ئەگەرنا پێش ئەو شێخ غازی یاوەر سەرۆك کۆمار بوو، هیچ جوڵەیەکی تیا نەبوو، بەردەوام شێخ غازی بۆیدەگێرامەوە کەئەوە بۆ ماوەی هەفتەیەکە ویستوویەتی ئەیاد عەلاوی کەئەوکات سەرۆك وەزیران بووە ببینێت، هەر وەلامی نەداوەتەوەو بەردەوام گلەیی دەکرد، هەر بۆیە ئەگەر جەنابی مام جەلال نەبێت رەنگە ئەوکاتە قورس بێت ئەو پۆستە بگاتە دەستی کوردو بەشێکی زۆری لایەنە عێراقییەکانیش داوا لەمام جەلال دەکەن خۆی بپالێوێتەوە بۆ پۆستی سەرۆك کۆمار.

هێرشەکان نایاساین

لەوەڵامی پرسیارێکیشدا کەهۆکاری ئەوە چییە بەردەوام نووسەران و ڕۆژنامەنووسانی عیراق و عەرەب ستایشی کارەکانی مام جەلال دەکەن و باسی سەنگ و قورسایی دەکەن، بەلام گرووپی کۆمپانیای وشەو ئەو ڕۆژنامانەی سەر بەوانن، بەردەوام هێرشی ناڕەوا دەکەنە سەر سەرۆك مام جەلال، سەرۆکی لیستی هاوپەیمانیی کوردستانی ڕایگەیاند: ئەوە حسابێکی ترە دەیکەن و خۆیان داناوە بەئۆپۆزسیۆن و ڕۆژانە بەردەوام خەریکی هێرشکردن و سووکایەتی پێکردنن و بەدیدی من لەولاتێکی دیموکراتیدا دادگا لەڕووی یاساییەوە پارێزگاریی لە کەسانی وەك مام جەلال دەکات کە بەناهەق و ناڕەوا هێرش دەکەنە سەریان، بەلام لای ئێمە هێشتا نەگەیشتۆتە ئەو دیموکراتییەو لەقۆناغی فەوزادایە، چونکە ئەم هێرش و پەلامارە ناڕەوایە کارێکی نایاسایی و نائوسوڵییەو هیچ شتێکی بابەتی تیانییە، هۆکارەکەی ئەوفەوزاییەیە.

ڕەزامەند بوون و دواتر موزایەدە دەکەن

دەربارەی موزایەدەی گرووپی گردەکەش لەتێپەڕاندنی یاسای هەڵبژاردنی عیراق، د.فوئاد مەعسوم باسی لەوەکرد لەیاسای هەڵبژاردنی عیراقدا کەکورسییەکان گەیشتنە ٤٣ کورسی، د.مەحمود عوسمان ڕۆژانە بەردەوام پەیوەندیی بەکاك نەوشیروانەوە دەکرد، کاك نەوشیروان هیچ ڕەتکردنەوەیەکی پیشان نەدا، بەڵکو د.مەحمود شاهیدە کەکاك نەوشیروان ڕەزامەندی پیشانداوەو پشتگیریی کردووە، هەربۆیە ئێستا سەیرم لێدێت کەدواتر قسەدەکرێت و موزایەدە دەکرێت، ئەمەش جێگای سەرسوڕمانە.

گەڕانەوەی بەعس

دەربارەی مەسەلەی گەڕاندنەوەی حزبی بەعسیش کەلەچەند ڕۆژی ڕابردوودا کوردستانی نوێ دۆسیەیەکیشی بۆکردەوە، د.فوئاد مەعسوم ئاشکرایکرد مەسەلەی گەڕاندنەوەی حزبی بەعس پیلانێکە کەهەندێك لەولاتانی دراوسێ و ئیقلیمی دەستیان تێیدا هەیە، هەندێك لەڕوانگەی تایفییەوەو هەندێکیشیان لەوە دەترسن ئەو

[illegible] عیراق بگاتە ئەوانیش، هەربۆیە دژی دەوەستنەوە، بۆنموونـە حزبـی بـەعس دوژمنایەتی لـەگەڵ هەموو ولاتانی عەرەبیدا هەبووەو بەنیسبەت ولاتانی عەرەبیـشەوە ئەزموونێکی شکستخواردوو بوو، بەلام ئێستا ترسـی ئـەوەیان هەیـە ئـەو حاڵـەتـەی لـەعیراقدا روویدا بگاتە ئـەوانیش، چـونکە بێگومـان ئـەو گۆڕانکارییـەی لـەعیراق روویداوە، کاریگەریی زۆری دەبێت لەسەر ولاتانی تر لـەکاتێکدا ئەگـەر لـەدژیـشی قسەبکەن، هەربۆیە کاریگەریی خۆی هەیە لەسەریان، هەروەها لەلایەك ترسی ئـەوە هەیە کەئەو ئەزموونە بچێتە ناو ولاتەکانی ئـەوانیش، لەلایـەکی تریـشەوە هەنـدێك ولات لـەڕوانگەی تایفییەوەیە کە دەیانەوێت بەعس بگەڕێتـەوەو عـیراق لـەمێـژووی خۆیدا بەردەوام کێشەی زۆری هەبووە، بۆنموونە عیراق نزیکەی ١٠ ساڵ بـوو ببـوو بەدەوڵەت، ئێران دانـی پێـدا نـەدەنا، دواتـر ئـیعترافی پێکـرد، ئـەو تورکیایـەی کـە دروستبوو چـاوی لـەوەبوو ویلایـەتی موسـڵ بگەڕێتـەوە سـەر تورکیـا، وەك چـۆن لـەسەردەمی عوسمانییەکاندا ویلایەتی موسڵ سەربەو بووە ، ئەمە جگەلەوەی هەندێك لەولاتانی عەرەبی نایانـەوێت شیعە حـوکم بکـات لـەعیراقـدا، چـونکە دەترسـن و شیعەش بەتەنیا لـەعیراقدا نییە، ئەوەتا لەیەمەن حوسـییەکان و لـەلوبنان و سـعودیەو کوەیتیش شیعە هەیە و لـەبەحرەین زۆرینەن، هەربۆیە شـیعە بگاتـە سـەر حـوکم بـۆ هەندێك دەوڵەتی عەرەبی مەترسی هەیە، جگەلـەوە کوردیش بۆ هەنـدێك لـەولاتان مەترسییە، هەربۆیە ئەم بۆچوونانە هەیە، هەر لەبەرئەوەیە هەنـدێك وەك ئاماژەپێـدان لـەڕوانگەی تایفی و نەتەوایەتی ترسیان هەیـە، هەنـدێکیان وابیردەکەنـەوە کـەکورد لـەپێگەی پۆستە سیادییەکانەوە نـەبێت ئەگـەری ئـەوە هەیـە عـیراق بـەجۆرێکی تـر سیاسەتی ناسرییەکان و بەعسییەکان بگرێتەبەر، هەربۆیە حەزدەکەن پرۆسەی سیاسی کە لـەعیراقدا هەیە سەرکەوتوو نەبێت و شکست بخوات، ئاشکراشـە بەعـسییەکان داردەسـتێکی باشـن بۆئـەوان و دەزانـن کـەحزبی بـەعس ئـەزموونی باشـی هەیـە، دەیانەوێت حزبی بەعس بگەڕێتەوە، نەك بۆئەوەی کەعیراقی ژێر دەستی حزبی بەعس عیراقێکی دیموکرات و پێشکەوتوو بێت، بەڵکو عیراقێك بێـت هەمیـشە لـەقـەیران و

فەزاو پاشاگەردانیدا بێت، چونکە ئەگەر بەعسییەکان هاتنەوە دەبێتە شەڕێکی بەردەوام لەگەڵ شیعەو کوردو عیراق بەردەوام لەئاژاوەو فەوزادا دەبێت و بێگومان مەترسی گەڕانەوەی بەعسییەکان بۆتە غەمێکی عیراقییەکان، چونکە لەمێژووی عیراقدا بەعس گورزێکی کوشندەو گورچکبڕی لەکورد داوەو ئەمجارە بەعس بێتەوە خراپتر دەکات بەرامبەر بەکورد، بەواتا دوژمنێکی سەرسەختی کوردو شیعەیە، هەربۆیە دەبێت مەترسی گەڕانەوەی بەعس بەجددی وەربگیرێت و دیاریشە یەکەم کاری بەعسییەکان فیدراڵی هەرێم ڕەتدەکەنەوەو دارو دەستەو پیاوەکانی خۆی زیندوو دەکاتەوە لەناوچەکەو ئەوکات ڕەوش و بارودۆخی کورد دەچێتەوە بارودۆخی جاران و تەنانەت لەو بەیانانەی دەریدەکەن هەتا ئێستا ئیدانەی سەدام و هەڵەبجەو ئەنفالیان نەکردووەو وەکو کەسێکی پیرۆزو موقەدەس سەیری سەدام دەکەن، کەواتە بەگەڕانەوەی بەعس سیاسەتی سەدام دەگەڕێتەوە، کاتێك لەکۆتایی ساڵی ۱۹۹۱و سەرەتای ۱۹۹۲ەوە دەستمانکرد بەدانوستان و گفتوگۆ لەگەڵ بەعس، وەك بەرەی کوردستانی بەو ئومێدەبووین سەدام بەهۆی ئەو شکستە گەورەیەی تووشی هات لەئەنجامدا داگیرکردنی کوەیت، وتمان هۆشی هاتۆتەوە سەرخۆی و ڕەنگە بیر لەوە بکاتەوە عیراقێکی نوێ دروستبکات و بنەمایەکی دیموکراتی هەبێت، بەلام لەدوای ئەو هەموو گفتوگۆو دانوستانە درێژە، سەیرمانکرد سەدام هەر سەدامەکەی جارانەو سیاسەتەکەشی هەمان سیاسەتی ڕابردووە، ئەمەش مەسەلەیەك نییە تەنیا بۆ مەسەلەی هەڵبژاردن، بەڵکو گەڕانەوەی بەعس واقعەو هەندێك لەولاتانی دەوروبەر پشتگیریی لێدەکەن.

راگرتنی بالانس لەنێوان هێزەکاندا

دەربارەی مەسەلەی هاوپەیمانی کوردو مەرجەکانی لەگەڵ لایەنە عیراقییەکاندا، د.فوئاد مەعسوم ڕوونیکردەوە ڕاستە زۆر مەسەلەی هاوبەش کۆماندەکاتەوە لەگەڵ لایەنی شیعەدا، بەلام ئەگەر خۆمان تەنیا لەو بەرەیەدا گەمارۆ بدەین ئەوە زیان دەکەین، ئەوە کارێکی باش نییە، چونکە شیعەو سوننە جیاوازیی مەزهەبییان هەیەو

جیاوازییەکەش مێژوویی و قووڵە، ئەوان بەشێوەیەکی گشتی عـەرەبن، بـەلام کـورد ئەگەرچی زۆرینەی سوننەیەو لـەناو کـورد شـیعەش هەیـە، هەربۆیـە نابێـت بەتـەنیا خۆمان ببەستینەوە بەشیعەوە، بـەڵکو پێکهاتەیـەکی تـر هەیـە کەسـوننەیە، ناکرێـت فەرامۆشبکرێت یاخود پشتگوێ بخرێت، ئەمە مەترسی هەیـە، چـونکە سـنوورەکانمان لەگەڵ سونی نشینەو هەم لـەعیراق و ولاتـانی دراوسـێ، کـورد خۆشـی سـوننەیەو ناکرێت دژی سوننەبێت، بەلام ئـەوەی کـورد جیادەکاتـەوە لەگـەڵ سـوننە، فکـرو بیروبۆچوونی شۆڤێنی و نەتەوەییە، چونکە هەندێك بیروبۆچـوون و فکـرەی شـۆڤێنی توندڕەویان هەیە، لـەبەرامبەریشدا کورد هەنـدێك فکـرەو بیروبۆچـوونی تونـدڕەویی هەیە کەباوی نەماوەو دەبێت ئێمە سەرقاڵی ئەوەبین لەگەڵ یـەکتری بـژین و ئەگـەر هاتوو کورد پەیوەندییەکی بەهێزی هەبێت لەگـەڵ شـیعەو لەگـەڵ هەنـدێك لایـەنی سوننەش پەیوەندیی بەهێزمان هەبێت، هاوکێشـەیەك دروست دەکـەین و کـورد لـەو هاوکێشەیەدا دەتوانێـت ڕۆڵـی خـۆی ببینێـت، بـەلام ئەگـەر خۆمـان سـاغکردەوە بەلایەکدا ئەوە دەبینە لایەنگری لایەك و ڕۆڵی هاوکێشەکە نابینین و هەربۆیە کـورد ناسراوە بەڕاگرتنی بالانس لەنێوان هێزەکاندا.

## کۆسرەت رەسول وەڵامی نەوشیروان مستەفا دەداتەوە



جێگری سکرتێری گشتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، کۆسرەت رەسول وەڵامی نوسینەکانی نەوشیروان مستەفا سەرۆکی بزوتنەوەی گۆران دەداتەوە کەلەماوەی هەفتەی رابردوودا لەژێر ناوی "لەنێوان مام جەلالو مندا نوسیویەتی".

لەمبارەیەوە کوردستانی نوێ لەژمارەی ئەمرۆیدا بلاّویکردەوە کە کۆسرەت رەسول بەوتارێك وەلاّمی نەوشیروان مستەفا دەداتەوەو تیشکی خستۆتە سەر مەسەلەی دەستوەردانی حزب لەکاروباری حکومەت لەسەردەمی حوکمرانی کابینەکەیدا." لەو چوارچێوەیەشدا نەوشیروان مستەفا بەئەندازیاری یەکەمی دەستوەردانی حزب لەکاروباری حکومەت وەسفکردووە".

وابریارە وتارەکەی کۆسرەت رەسول جێگری سکرتێری گشتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان لەهەردوو رۆژنامەی ئاسۆو کوردستانی نوێ لەیەك کاتدا لەژمارەکانی داهاتوودا دابەزێت.

هەروەها کوردستانی نوێ ئاماژەی بۆ ئەوەکردووە کە کۆسرەت رەسول "چەندین نموونەی هێناوەتەوە کە نەوشیروان وەك کەسی دووەمی ناو یەکێتی هەولّیداوە هەموو کاروبارەکانی حکومەت بەدامەزراندنی مەئمورێکەوە لەبارەگای حزب بڕیاری لێبدرێت. جگە لەوەش باس لەچەندین بڕیاری فەردی نەوشیروان مستەفا دەکات کە لەسەردەمی خەباتی شاخ و دوای راپەڕینیش کێشەی بۆ یەکێتی و کوردیش دروستکردووە".

## نەوشیروان لە٢٠٠١ەوە بڕوای بەتاڵەبانی نەماوە



■ ئا: ئاوێنە

سەرۆکی بزوتنەوەی گۆڕان لە بەشێك لەیاداشتە نوێکەیدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ئەو لەساڵی ٢٠٠١ەوە باوەڕی بە تاڵەبانی‌و بە بە حیزبەکەی‌و بە سەرکردایەتیی یەکێتی نەماوە، هاوکات کۆسرەت ڕەسوڵیش بەهۆکاری سەرەکی گەندەڵی ئەو دەمەی حکومەتی هەرێم ناوزەد دەکات.

سەرۆکی بزوتنەوەی گۆڕان، نەوشیروان مستەفا بەشێکی نوێی یاداشتەکانی بڵاودەکاتەوەو پەردە لەسەر پەیوەندییە نهێنیەکانی خۆی‌و سکرتێری گشتی، تاڵەبانی هەڵدەماڵێت‌و، تیشکدەخاتە سەر ململانێکانی ناو یەکێتی لەنێوان ساڵانی ١٩٩٩ تا کۆتایی دووەمین کۆنگرەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان، واتە تا شوباتی ٢٠٠١.

ئەم یاداشتە کە لەناوەڕاستی هەفتەی رابردووە لەسایتی کۆمپانیای وشە(سبەی)دا بڵاوبۆتەوە، لە حەوت بەش پێکهاتووە: گەڕانەوە بۆ کوردستان، هەوڵی ریفۆرم، دەزگاکانی راگەیاندنی یەکێتی، گەشتە سیاسی‌و دیبلۆماسییەکانی مام جەلال داهێنانی سەرۆکایەتی هەرێم، بابەتی جۆراوجۆر، دووەمین کۆنگرەی گشتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان.

ئەم حەوت بەشە لە یاداشتەکانی نەوشیروان مستەفا پێکهاتووە لەبیرەوەری‌و دۆکۆمێنت‌و لێدوانو، پێشکەشی کردووە بەوانەی گلەیی لێدەکەن.

گەڕانەوە بۆ کوردستان

سەرۆکی بزوتنەوەی گۆڕان ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە لە دوای راپەڕینەوە، سێ جار، هەر جارەی بۆ ماوەیەك، لە سێ قۆناغی ناسکدا کوردستانی بە جێهێشتووەو دەڵێت "جاری یەکەم، لە رۆژانی گفتوگۆی بەرەی کوردستانی بەعسدا. خولی یەکەمی گفتوگۆ (٢٠ - ١٩٩١/٤/٢٨) مام جەلال رابەریی کرد منی لە گەڵ نەبووم. خولی دووەمی گفتوگۆ (٥/٧ - ١٩٩١/٦/١٧) کاك مەسعود رابەریی

کرد منی لە گەڵ بووم. زیاتر لە مانگێ لە بەغدا ماینەوە دوای گەڕانەوەمان بـ
کوردستان من بڕیارمدا کوردستان بە جێبهێڵم".



نەوشیروان جێهێشتنی کوردستان دەگەڕێنێتەوە بۆ سێ هۆی سەرەکی "لـە گـەڵ مـ
جەلالو هەندێ لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی (لێرە بـە دواوە م. س) نـاکۆك بـوو
یەکەم: جۆری بەڕێوەبردنی یەکێتیو گۆڕینی لە چەند ڕێکخراوێکی بێ سـەروبەرەو
بۆ حیزبی دەزگاو دامەزراو، ئەمەیان ئەگەڕایەوە بۆ ڕۆژانی شەڕی یەکەمی خـەلیج
دووەم: جۆری بەڕێوەبردنی پێوەندی لە گـەڵ پـارتی. سـێیەم: جـۆری بـەڕێوەبردنی
گفتوگۆ لە گەڵ بەعسدا".

ناوبراو جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە نەیویست کێشەی نـاوخۆ، کـە شـەڕی
خۆبەخۆی چەکداری لێدروست ئەبوو، بۆ یەکێتی دروست بکـات بـە تایبـەتی لـە
کاتـەدا لـە لایەکـەوە گەڕانـەوەی بـەعسو لـە لایـەکی تـرەوە زاڵبـوونی پـارتی
بزوتنەوەی ئیسلامی هەڕەشـەیان لـێ ئـەکرد. بڕیاریـداوە سـەرکردایەتی یـەکێتی
کوردستانیان بـۆ بـە جێبهێڵێـت بـۆ خۆیـانو بـە بێدەنگی لـە دەروازەی ئیبراهیم
خەلیلەوە چووە بۆ تورکیاو لەوێوە بۆ لەندەن.

بۆ جاری دووەم گەڕانەوەی بۆ کوردستانو دواتر جێهێـشتنی، وادەگێڕێتـەوە "دوای
ئەنجامدانی هەڵبژاردنی گشتیی (١٩٩٢/٥/١٩)، بەر لە بەستنی یەکەمین کـۆنگرەی
گشتیی یەکێتی (١/٢٧ — ١٩٩٢/٢/١٤) بە چەند ڕۆژێ گەڕامەوە کوردستان بـە
هیوای ئەوەی کێشە سیاسییەکانی ناو یەکێتی لە ناو کۆنگرەدا بە لادا بخەین. هەندێ
لە هاوڕێکانم، بۆ دابینکردنی دەسەڵاتو پلەو پایەی تایبەتی خۆیـان، لـە کـۆنگرەدا
فێڵیان لێکردمو دەستیان بڕیم. کێشەکان بە چارەسەرنەکراوی مانەوە، بەڵکو قـوڵتر
بوون".

هەروەها لەم بەشەدا دەڵێت "هەڵبژاردنی گشتیی بۆ یەکەمین پارلـەمانی کوردسـتان
لە بەردەمدا بوو، پارتیو یەکێتی لە ململانێیەکی سەختدا بوون. ئەمجارەش نەمویست
کێشەی ناوخۆ دروست بکەم، هـەمان مەترسـییە نـاوەکیو دەرەکییـەکان مـابوونو

گەورەتر بوون. ئەوەی لە توانامدا بوو، لە پرۆپاگەندەو کۆبوونەوەی جەماوەریی‌و نوسینی شیعارو پشتیوانی لە کاندیدەکان، تەنانەت ئامادەکردنی بەرنامەی هەڵبژاردن بۆ ئەنجامدانی هەڵبژاردن‌و پێکهێنانی یەکەم حکومەتی کوردستان کردم. ئەنجومەنی نیشتمانی کۆبووەوە (٤/٦/١٩٩٢)و پۆستی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران بەیەکێتی سپێردرا (٤/٧/١٩٩٢)و د.فوئاد مەعسوم بوو بە سەرۆك وەزیر. قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی یەکێتی لە زاخۆوە تا کفری درێژ ئەبووەوە. ئەمجارەش بە هەمانشێوە چوومەوە بۆ لەندەن".

نەوشیروان مستەفا کە جاری سێهەم گەڕاوەتەوە بۆ کوردستان شەڕی ناوخۆ بووەو دەڵێت "شەڕی یەکێتی‌و بزوتنەوەی ئیسلامی هەڵگیرساو، دوای ئەوەش شەڕی یەکێتی‌و پارتی دەستپێکرد، زیادتر لە ١٦ مانگ بوو من لە لەندەن دانیشتبووم‌و دوور بووم لە دەزگای بڕیاردانی ناو یەکێتییەوە. خۆم دوور ڕاگرتبوو لە کاروباری یەکێتی. مام جەلال بۆ گەشتی سیاسی هات بۆ ئەورووپاو پێکەوە لە گەڵی چووم بۆ ئیسپانیاو ئیتالیا گەلێ کەس‌و حیزب‌و کاربەدەستمان بینی خۆمان ئامادە کردبوو بچین بۆ ژاپۆن بۆ کۆبوونەوەی سۆسیالیست ئینتەرناسیۆنال، بەڵام شەڕی یەکێتی‌و پارتی لە قەڵادزێوە دەستپێکرد(١/٥/١٩٩٤)و بە خێرایی تەنیەوە بۆ ڕانیەو بادینان‌و سلێمانی. مام جەلال ئەبو بگەڕێتەوە بۆ کوردستان، منیش وەك مەسەلەیەکی ئەخلاقی، نەمئەتوانی خۆم لەم گەڕانەوەیە بدزمەوە ناچار لە ڕۆماوە لەگەڵی چوومە سووریاو لەوێوە بۆ تورکیاو بە کۆپتەری تورکی ڕاستەوخۆ بۆ هەولێر (٢/٦/١٩٩٤). یەکێتی لە بادینان‌و پارتی لە سلێمانی دەرکرا بوون، بەڵام هێشتا هەولێر پایتەختی حکومەتی هەرێم بە تێکەڵاوی بە دەست هێزەکانی یەکێتی‌و پارتیەوە بوو".

نەوشیروان باس لەوە دەکات لەو ماوەیەدا زۆر خەریکی گفتوگۆ بووە لە گەڵ نوێنەرانی پارتی. بۆ ئەو مەبەستە سەفەری ئێران‌و تورکیاو فەرەنساو ئیرلەندای کردووە دەڵێت "لە ئاسۆی نزیکدا هەلی ئاشتبوونەوەی یەکێتی‌و پارتیم نەئەبینی.

هەلومەرجی ناو یەکێتیش "هەمان تاس‌و هەمان حەمام"ی جارەکانی تر بوو".

نەوشیروان دەڵێت نەیویستووە کێشەی ناوخۆ بۆ یەکێتی دروست بکات دیسان بە بێدەنگی بۆی بەجێیهێشتوونەتەوە.

سەرۆکی بزوتنەوەی گۆڕان دەربارەی گەڕانەوەی یەکجاری بۆ کوردستان دەڵێت "لە دوای راپەڕینەوە بڕیارمدا بوو، هەر کات لە گەڵ سەرکردایەتی یەکێتی توشی ناکۆکی قوڵو کێشەی ئاڵۆزی سیاسی ببم، لە باتی ئەوەی ململانێیان لە گەڵ بکەم، کە لەوانە بوو ببێتە هۆی پێکادانی چەکدار، لە بەردەمیاندا بە هێمنی‌و بێدەنگی بکشێمەوە. لە بەر ئەوە هەمیشە چاوەڕێ بووم لە هەلومەرجێکی گونجاودا بگەڕێمەوە کوردستان. سەرەنجام بڕیاری گەڕانەوەمدا. ئەمجارەیان کە بڕیاری گەڕانەوەمدا، یەکێتی لە هەولێر، پایتەختی هەرێم، دەرکرابوو. حکومەتەکەی‌و مەکتەبی سیاسیەکەی‌و سەرکردایەتیەکەی‌و فەرماندەکانی بە ئاوارەیی لە سلێمانی بوون".

نەوشیروان لەم بەشەی یاداشتەکەیدا باس لەوە دەکات کە چۆن لەگەڵ کادیری پێشکەوتووی یەکێتی، دلێری سەید مەجیددا گەڕاوەتە بۆ کوردستان‌و ئەو بایەخەی زۆرەی تاڵەبانی‌و دەزگاکانی راگەیاندنی یەکێتی بە بڕیاری تاڵەبانی پێیداوە.

ململانێی ناو یەکێتی

نەوشیروان مستەفا باس لە ململانێکانی ناو یەکێتی دەکات‌و دەڵێت "مەکتەبی سیاسی لەو دەمەدا پێکهاتبوو لە: کۆسرەت رەسوڵ، جەبار فەرمان، عومەری سەید عەلی، قادری حاجی عەلی، ئەرسەلان بایز، عومەر فەتاح، محەمەد تۆفیق رەحیم. جگە لەمانە: فەرەیدون عەبدولقادرو عومەری حاجی عەبدوڵا، کە لە کۆنگرەی یەکەمدا وازیانهێنابوو، مام جەلال هاوردنییەوە بۆ ناو م. س. هەروەها شێخ محەمەدی شاکەلی، رەسوڵ مامەند، لە دوای کۆنگرەی یەکەم مام جەلال لە ئەنجامی رێکەوتنێکی سیاسیدا لە گەڵ بەشێکی حیزبی سۆشیالیست هەردووکیانی هێناوەتە ناو م. س. کاک رەسوڵ کۆچی دوایی کرد. شێخ محەمەد ماوەتەوە. مەلا بەختیار،

عیماد ئەحمەد، لە دوای کۆنگرەی یەکەم مام جەلال لە ئەنجامی ڕێکەوتنێکی سیاسیدا لە کۆتایی بەشێکی حیزبی زەحمەتکێشان هەردووکیانی هێناوەتە ناو م. س. بەندەش، کە لە کۆنگرەی یەکەمدا لە سەر داوای مام جەلال، لە گەڵ د. فوئاد مەعسومو د. کەمال فوئاددا بێ ئەوەی بە فیلتەری هەڵبژاردن تێپەڕین، بە بیانوی ئەوەی لە دەستەی دامەزرێنەر بووین، بۆ ئەندامەتی سەرکردایەتی بە چەپڵەڕێزان هەڵبژێردراین". سەرۆکی بزووتنەوەی گۆڕان جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە مام جەلال زیرەکانە مەکتەبی سیاسی داناوە. ئەوانە چەند دەستەبەندنو بە دەگمەن لە سەر کێشەیەك پێکدێن. هەمیشە پێویستیان بە مام جەلال خۆی ئەبێ بۆ ئەوەی هاوسەنگی لە نێواندا رابگرێ. ئەگەر ئەو نەبێ رەنگە نەتوانن ئێوارەیەك، لە هیچ بۆنەیەکدا شایی بێ یا شیوەن، پێکەوە کۆببنەوە".

جێگرە پێشوەکەی تاڵەبانی، وا باس لە ململانێکان دەکات "کۆسرەتو جەبار ناکۆکن. کۆسرەت کار ئەکا بۆ ئەوەی هەروەك کەسی یەکەمی حکومەتە، ئاوەهاش ببێتە کەسی یەکەمی یەکێتی. کەمال فوئادو فوئاد مەعسومو عومەر فەتاحو ئەرسەلان بایز، محەمەدی شاکەلیو مەلا بەختیارو عیماد ئەحمەد، لە ناو ڕێکخراوو کادرەکانی یەکێتیدا پێکەو لایەنگریان کەمە. مام جەلال دەستی گرتونو ئەوانیش دەستیان بە مام جەلالەوە گرتوە".

نەوشیروان وا باس لەگەڕانەوەی خۆیو ململانێکانی ناو یەکێتی دەکات "کۆسرەتو جەبار پێیانوایە من لە سەر داوای مام جەلالو بۆ پشتیوانی لەو لە بەرامبەر ئەواندا هاتومەتەوە، ئەو چەند ڕۆژەی میوانی ئەو بووم لە قەڵاچوالان خەریکی دانانی نەخشەو پیلان بووین دژی ئەوان. زۆر بە توندی کەوتنە دژایەتی من. ڕاستییەکەی ئەوان خۆیان بەدگومان بوون ئەگینا ئەو چەند ڕۆژە هیچ باسێکی سیاسیمان نەکردبوو".

نەوشیروان دەڵێت "مام جەلال ئامادە نەبوو دژی ئەوان کار بکا یا لە هیچ هەلومەرجێکدا دەستیان لێهەڵبگرێ یان تەنانەت ئەو شتانەیان بە ڕوودا بداتەوە. لە

یەکەمین کۆنگرەی گشتیی یەکێتیدا ئەوان دژی من پشتیوانییان لە مام جەلال کرد. ئەویش بۆ ئەوەی من لە ناو یەکێتیدا لاواز بکا خۆی هەردووکیانی گەورە کردبوو. دەسەڵاتو پارەی خستبووە بەردەستیان. ئازادو ئازای کردبوون چی ئەکەن بیکەن. بۆ راگرتنی هاوسەنگیی ناو یەکێتی پێویستی بە هەردووکیانو هەردوو دەستەبەندییەکەیانە".

ئەوەی گومانی لە لا دروست کردبوون ئەوەبوو گەڕانەوەی من هاوزەمان بوو لە گەڵ زنجیرەیەك کۆبوونەوە کە مام جەلال لە رۆژانی ٢٢ تا ٢٨ی مانگی شوبات، دەربارەی "گەشەپێدانو بژارکردن"ی یەکێتی، بە مەکتەبی سیاسی کردبوو. ئەوی راستی بێ من هیچ ئاگایەکم لەم کۆبوونەوانە نەبوو. گەڕانەوەی منیش هیچ پێوەندییەکی بە گەشەپێدانو بژارەوە نەبوو.

نەوشیروان لەم بڕگەیەدا ئاماژە بەهەندێك هەواڵی رۆژنامەی کوردستانی نوێ دەکات دەربارەی "گەشەپێدانو بژارکردن" کە ئەو دروشمانە بوون مام جەلال بەرزی کردبوونەوە.

هەوڵی ریفۆرم

نەوشیروان سەرەتای گەڕانەوە بۆ کوردستانو بینینی خەڵكو گوێگرتن لەناڕەزاییەکانیان بەو کارانەی کە پێویستە بکرێت لەحیزبو حکومەتدا بەسەرەتای هەوڵی ریفۆرم دادەنێتو دەڵێت "ناڕەزایی خەڵك لەوانە ئەندامو کادرو پێشمەرگەکانی یەکێتی لە سەر چیە؟ ئەگەر چەوتییو خوارو خێچییەك هەبێ لە کوێدایە؟ ئەبێ لە کوێوە دەس بەڕاستکردنەوە بکرێ؟

کەوتمە دووی دۆزینەوەی وەڵامی ئەم پرسیارانەو میکانیزمی جێبەجێکردنیان. لە گەڵ شارەزایانی وەزارەتو پسپۆڕی بواری جیاوازی کارگێڕیو بەڕێوەبەرایەتی گفتوگۆم کرد. هەوڵمدا زۆرترین زانیاریی کۆبکەمەوە، خەلەلەکان دیاریبکەم، هەوڵی دۆزینەوەی چارەسەر بدەم".

## مام جەلال سەردانی نەوشیروان دەکات

وەك نەوشیروان باسی دەکات "۹ی ٤ی ۱۹۹۹ ئێوارەکەی هات بۆ ماڵمانو بە دوو قۆڵی لە ماڵەکەی خۆمان دانیشتین. لە دوای گەڕانەوەم بۆ کوردستان ئەمە یەکەمین جار بوو پێکەوە بۆ باسی سیاسی کۆببینەوە. وتی: ئەوە چەند رۆژێکە گەڕاویتەوە سلێمانی، حەساویتەوە، خەڵکی زۆرت بینوە، ئێستا ئەڵێی چی؟ وتم: ئەو ماوەیەی هاتومەوە زۆر کەس هاتوون بۆ لام، بواری کەسم نەداوە ماڵەکەم بکا بە دیوەخانی هێرش بۆ سەر یەکێتیو سەرکردەکانی، بەڵام هەندێ شتم لە قسەکانیان دەرهێناوە. شوێنی تۆ لە ناو خەڵکدا بەهێزەو چاوەڕوانی ئەوەن ئەو بژارەی دەستت پێکردوە بە ئەنجامی بگەیەنی. ئەوەی من بۆم ساخبۆتەوە خەڵك لە دوو شت زۆر ناڕازین: یەکەمیان، ئەو جیاوازییە گەورەیەی لە نێوان ژیانی کاربەدەستانی یەکێتیو خەڵکدا هەیە. دوەمیان، ئەو فەسادە زۆرەی لەم حکومەتەدا دروست بووە، هیچ ئیشێ بێ واسیتەو مەحسوبیەت ناڕوا. فەساد لە سەرکردایەتی یەکێتی دایە، ئەگەر هەموو کادرەکانی ناوەڕاستو خوارەوەش لاببرێ ئەگەر دەسکاری سەرەوە نەکرێ هیچ سودێکی نیە. خەڵك ئەپرسن: مام جەلال خۆی دز نیە، ئەی بۆچی دزیی لەمانە قبوڵ ئەکا؟ مام جەلال خۆی داوێنپیس نیە، ئەی بۆچی داوێنپیسی لەمانە قبوڵ ئەکا؟ مام جەلال خۆی پیاوێکی قانونییە، بۆچی بێقانونی لەمانە قبوڵ ئەکا".

نەوشیروان دەڵێت لەو کۆبوونەوە دووقۆڵییەدا بەمام جەلالم وت "تۆ کەسی یەکەمی، ئۆباڵی مێژویی لە ئەستۆی تۆدایە، ئەگەر حوکمڕانی یەکێتی باشو سەرکەوتوو بێ پاشەڕۆژ ستایشی تۆ ئەکەنو ئەگەر خراپو شکستخواردوو بێ قسە بە تۆ ئەڵێن".

جێگری پێشووی سکرتێری گشتی باس لەوە دەکات "پێشتر چەند جارێ بەر لەوەی کوردستان بە جێبهێڵمو دوای ئەوەش چەند جارێ لە ئەورووپا بە راشکاوی ئەم بابەتانەم لە گەڵ باس کردبوو، هەموو جار بەڵێنی چاککردنی ئەدا، بەڵام هیچ جارێ

بە جێی نەئەهێنا".

نەوشیروان لەسەر هەڵوێستو قسەی تاڵەبانی لەم کۆبوونەوەیەدا دەڵێت "قسەکانی منی بە دڵ نەبوو، حەزی نەئەکرد باسی لایەنە رەشەکانی دەسەڵاتی یەکێتی ببیستێ، لە گەڵ ئەوەشدا قسەکانی سەلماند. وتی: هەقیانە، تۆش یارمەتیم بدە وەرە بۆ کۆبوونەوەکانی م. س، چاکیان ئەکەم. وتم: ئەگەر تۆ چاکی بکەی من سەرباز ئەبم لە لەشکرەکەدا. وتی: تۆ سەرباز نابی جەنەراڵ ئەبی".

داهاتی هەرێمو دابەشکردنی

سەرۆکی بزوتنەوەی گۆڕان دەڵێت "دەمویست بزانم داهاتی کوردستان چەندە؟ سەرچاوەکانی چین؟ چۆن سەرف ئەکرێن؟ حکومەتی هەرێمی کوردستان بودجەی ساڵانە یا مانگانەی نیە. پشت بە داهاتی رۆژانە ئەبەستێو بەو پێیە موچەی فەرمانبەران ئەداو پارەی یارمەتی بۆ ئەمو ئەو سەرف ئەکەن. هیچ کەسو هیچ دەزگایەك نیە لە سەرو سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانەوە بە حساباتدا بچێتەوە بزانێ چۆن سەرف ئەکرێ. سەرۆکی ئەنجومەن سەقفێکی دیاریکراوی نیە بۆ سەرفی پارەی رۆژانەو مانگانە، خۆی ئازادە. لە هەموو بازگە سەرەکییەکانی گومرگدا لە سەر سنورەکان دوای کۆکردنەوەی داهاتی گومرگ بەر لەوەی پارەکە بگوێزرێتەوە بۆ بانك شتێکی داهێناوە بە ناوی (صرف خاص) بە پسوڵەی تایبەتی پارەکەی بۆ سەرف ئەکرێ بێ ئەوەی بچێتە حسابی بانك یان حکومەتەوە".

دەربارەی دابەشکردنی داهاتی کوردستان، کۆسرەت رەسوڵ سەرۆکی حکومەتی ئەو دەمەی ئیدارەی سلێمانی وا باسی دابەشکردنی داهات بۆ نەوشیروان دەکات "٣٠٪ بۆ ئیدارەی گشتی واتە بۆ یەکێتی، ٣٥٪ بۆ پێشمەرگە، ٣٥٪ بۆ حکومەت.

یارمەتی حیزبەکان: ٤ ملیۆنو ٨٨ هەزار دیناری سویسری بوو کە بەمجۆرەیە:

یارمەتی حیزبەکان (حکومەت ئەیدا):

٢ ملیۆن بزوتنەوەی ئیسلامی، ٧٠٠ هەزار سۆسیالیست، ٦٠٠ هەزار زەحمەتکێشان، ٢٠٥ هەزار پارێزگاران، ١٠٠ هەزار دیمۆکراتیخوازان، ١٢٨ هەزار

[illegible] ۲۰۰ هەزار حیزبی شیوعی، ٦۰ هەزار الحزب الوگنی العراقی، ٥۰ هەزار کۆمۆنیستی کرێکاری، ۳٦ ملیۆن موچەی فەرمانبەران.

یارمەتی شەهیدان:

۲ ملیۆن‌و ۲٥۰ هەزار دیناری سویسری بۆ شەهیدانی شەڕی ناوخۆ (فەرماندەیی ئەیدا)، ۲ ملیۆن دەزگای شەهیدان ئەیدا. ٥٤۳ هەزار حکومەت ئەیدا".

گەشتە سیاسی‌و دیپلۆماسیەکانی

مام جەلال

نەوشیروان لەسەر سەفەرەکانی تاڵەبانی دەڵێت "مام جەلال سەفەر زۆر ئەکا. درۆی تێدا نیە ئەگەر بڵێم سەفەر بەشێکی گرنگی ژیانی مام جەلال پێکئەهێنێ. ئەمەش خوی ئێستای نیە، بەڵکو لە هەمو ژیانیدا وەها بووە. لە سەردەمی شاخدا، ئەو ماوەیەی لێدەربچێ، بە هۆی گەمارۆدانی شۆڕشەوە لە لایەن ئێران‌و تورکیاوە، ڕێگەی لێبەسترابوو نەیئەتوانی سەفەر بکا هەرچەند هەلێکی بۆ هەڵکەوتیێ سەفەری کردوە. مانگی ۱۱ی ساڵی ۱۹۸۷، بەر لە عەمەلیاتی ئەنفال لە چەند سەرچاوەی جیاوازەوە هەواڵمان بۆ ئەهات کە جەیشی عێراق لە خۆئامادەکردن‌و نەخشەداناندایە بۆ گەورەترین لەشکرکێشی بۆ سەر کوردستان، ئەو بە بیانوی ئەوەی ئێران دەعوەتی کردوە سەفەری کرد بۆ تاران، لەوێوە بۆ دیمەشق، ئینجا بۆ ئەوروپا تاسەرەتای ساڵی ۱۹۸۹ مایەوە. سەردانێکی کورتی ئێرانی کرد. بە سەردا ئیمام خومەینی مرد. لە ناو ئێراندا هەندێ کۆبوونەوەی بە ئەندامانی سەرکردایەتی‌و کادرەکان کردو دوای ئەوەی لە مەراسیمی ناشتنی خومەینیدا بەشدار بوو گەڕایەوە ئەوروپا تا دوای سەرکەوتنی ڕاپەڕین لە ئازاری ۱۹۹۱دا، هەر لە دەرەوە مایەوە. دوای ڕاپەڕین ڕێگەی ئێران‌و تورکیای بۆ کرایەوە ئیتر لە سەفەری بەردەوامدا بوو".

هەرچەندە دەڵێت "مام جەلال هەمیشە ڕەنگی سیاسی ئەدا بە سەفەرەکانی، بەڵام لە ڕاستیدا ئامانجی سەرەکی زۆر لە سەفەرەکانی خۆدورخستنەوەیە لە ڕوداوەکانی کوردستان‌و خۆناساندنە بە گەورەپیاوانی دنیاو، گرتنی وێنەی یادگاریە لەگەڵیان".



نەوشیروان لەسەر کاریگەری خراپی ئەم سەفەرانەی تاڵەبانی لەسەر وەزعی ناوخ
دەڵێت "بەراوردکردنی ژمارەی ئەو چەند حەفتەیەی ساڵی ١٩٩٩ کە بە گەشتی
سیاسیو دیپلۆماسییەوە، وەکو خۆی ناوی لێناوە، کوشتونی، لە گەڵ ژمارەی ئە
چەند حەفتەیەی تەرخانی کردوە بۆ کاروباری ناوەوەی کوردستان، وەکو سکرتێری
گشتیو فەرماندەی گشتیو بەرپرسی هەموو مەکتەبەکانی یەکێتیو بەرپرسی
حکومەت، دەریئەخەن بۆچی پاشاگەردانی هەموو جومگەکانی دەزگا حیزبیو
پێشمەرگەییو حکومەتییەکانی هەرێمی گرتۆتەوە". نەوشیروان بۆ ئەژمارکردنی ئەو
سەفەرانەی تاڵەبانی هەواڵەکانی کوردستانی نوێی کردۆتە بەڵگە.

## پەنجەکانی نەوشیروان خەباتی هاوڕێکانی دەشێوێنێت

**کۆسرەت ڕەسوڵ عەلی ٢٠٠٩/١٢/٣**

چەند ڕۆژێك لەمەوبەر بەڕێز نەوشیروان مستەفا، زنجیرە وتارێکی لەژێر ناوی لەنێوان مام جەلال و مندا لەسایتی سبەی بلاوکردۆتەوە، گەرچی نوسینەکەی بەقەولی خۆی باس لەپەیوەندی و کێشەکانی لەگەڵ مام جەلال دەکات، بەلام لەبەشێکی زۆری گێڕانەوەکانیدا کۆمەڵێك تۆمەت و قسەی ناڕەوای لەسەر ئێمەو مێژوویی تێکۆشانمان لەناو یەکێتی و سەردەمی بەرپرسیارێتیم لەسەرۆکایەتی حکومەتی هەرێمی کوردستاندا، هەڵبەستووە.

ئەگەر لەبەر هاوخەباتەکانم و پێشمەرگە قارەمانەکانی کوردستان و کەسوکاری سەربەرزی شەهیدان نەبوایە، بەپێویستم نەدەزانی وەلامی ئەو تۆمەت و ناهەقیانە بدەمەوە، چونکە خەڵکی کوردستان لەوە هوشیارترن کە بە پەلاماری ناڕەوا چەواشەبکرێن و خەڵك دەزانن کێ خزمەتی ئەم میللەتەی کردووەو کێش لەقۆناغە هەستیارو چارەنووسسازەکاندا پشتی تێکردوون و جێی هێشتوون، بەلام هەندێ ناهەقی لەو نوسینەی کاك نەوشیرواندا کراوە کە وەلامنەدانەوەی دواجار بۆ مێژوو دەبێتە چەواشەکاری و ڕەنگە نەوەی نوێی میللەتەکەمان، بەحوکمی تەمەن لەمرۆدا، ئاگاداری وردەکاریی ئەو ڕووداوانە نەبن، بۆیە بەگرنگم زانی هەندێ لەو هەڵەو کەموکورتی و ناڕەوایەتییانەی باسیکردوون، ڕاستیانبکەمەوە.

سەردەمی شەڕی ناوخۆ

پێموایە کاك نەوشیروان و هەموو ئەو هەڤالانەی ڕۆژێك لەڕۆژان پێکەوە خەباتمان کردبێ ئەو شایەتییەم بۆ دەدەن کە هیچ کات خۆم لەبەرپرسیارێتی نەدزیوەتەوە، ئەوەی لەمێژووی یەکێتیدا ڕوویداوە بەو قۆناغانەشەوە کە من ڕاستەوخۆ تیایدا بەشدارنەبووم، لەدامەزراندنی یەکێتیەوە تا ئەوکاتەی من چوومە شاخ، یەکێتی بەچەندین قۆناغدا تێپەڕیوەو تووشی شەڕی ناوخۆو لێکترازان و شکست و

هەستانەوە هاتووە. هیچ کەس گوێی لێنەبووە ڕۆژێك لەڕۆژان باسی ئەوەم کردبێ بڕیارو هەڵانەی کە ئەگەر بڕیاری فەردی کاك نەوشیروانیش بووبێت وتبێتم ئەوە بڕیاری ئێمە نەبووە، (وەك ئەوەی ئێستا ئەو دەیکات). مێژووی یەکێتی شانازییەکانی بۆ هەموومانەو هەڵەو کەموکورتییەکانیشی دەبێ هەموو لێی بەرپرسیاربین. ئەمەم بۆ ئەوەیە کە بڵێم خۆم نادزمەوە لەبەرپرسیارێتی شەڕی ناوخۆ کە نەوشیروان نوسیویەتی (لەسەردەمی حکومەتەکەی ئەم برادەرەدا یەکێتی تووشی شەڕێك بووە لەگەڵ پارتی بەهەموو زلهێزەکانی دونیا ناکوژێتەوە)، بەلام هەموو ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و جەنابیشت شایەتن کە چەند دژی شەڕی ناوخۆ بووم، هەر بۆنموونە لەساڵی ١٩٩١و تەنها دوای چەند مانگێك لە ڕاپەڕین، یەکێتی و پارتی لەناوچەی دوکان بەهۆی کێشەوە هێزیان لەسەریەك کۆکردبووەوەو خەریکبوو ئاگری شەڕی ناوخۆ لەوێوە دەستپێبکات، هەمان ڕۆژ چوومە لای بەڕێز مەسعود بارزانی لەهاوینەهەواری سەلاحەدین و قسەم لەگەڵیان کردو ڕۆژی دواتر وەفدێکیان لەگەڵم نارد بۆ دوکان ولیژنەکەمان بردە لای جەنابی کاك مەسعودو کێشەکەمان چارەسەرکرد. ئەوکاتە من نە سەرۆکی حکومەت و نە جێگری سکرتێر بووم و تەنانەت کێشەکەش لەسنوری مندا ڕوویندابوو.

دەیوت شەڕو نیوەشەڕ هەریەکە!

دوای هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ چەندینجار ئێوە گلەیی ئەوەتان لێدەکردم کە بەشداری شەڕی ناوخۆ ناکەم، دەتانووت هەولێر چ قودسیەتێکی تێدایە وا کۆسرەت ناهێڵێ شەڕی ناوخۆ بچێتە هەولێرەوە. هەتانبوو کە ئێستا لەقیادەی گۆڕانە، وتبووی ئەگەر کۆسرەت بەشداری شەڕی ناوخۆ نەکات هەقە لەمەکتەبی سیاسی لایبەرین!

هەر بۆ وەبیرهێنانەوە دەیڵێم لەسەر داوای د.ئەحمەد چەلەبی، سەرۆکی (INC) کە ئەوکاتە یەکێك لەناوبژیوانەکانی شەڕی ناوخۆ بوو، کاتێ مام جەلال و کاك نەوشیروان لەئەورووپاوە هاتنەوە شام و بڕیاربوو کاك مەسعود بچێتە ئیبراهیم خەلیل

پێشنیاریان لێبکات و پێکەوە بێنەوە، لەو کاتانەدا کاك نەوشیروان چەندینجار تەلەفۆنی بۆ من و بۆ برادەران دەکرد دەیووت شەڕو نیوە شەڕ هەریەکە هەمووی تەواوبکەن. منیش لەوەلامدا پێم دەوت قەت شتی واناکەم! ئەوە ئێوەو بەڕێز چەلەبی و هەموو برادەران لەژیاندا ماون بۆ شاهێدی.

جا ئێستا خێرە وا ئۆباڵی شەڕی ناوخۆ لەخۆتان دووردەخەنەوەو دەتانەوێ بەوجۆرە مێژوو چەواشەبکەن؟ لەخەڵك بزرنابێ کە لەسەردەمی خەباتی پێشمەرگایەتی شاخ و دوای راپەڕینیش چەندین جەولەی شەڕی ناوخۆ ئێوە بڕیارتان لێداوەو سەرکردایەتیان کردووە.

هەڵوێستی ئێمەش لەو رووەوە روون بووە، جەنابی کاك مەسعود بارزانی وەك سەرۆکی پارتی دوای چەندین جەولەی شەڕی ناوخۆ، لەدیدارێکی تەلەفزیۆنی و دواتر چەندینجار لەکۆبوونەوەکان و لای دۆستە ناوبژیکارەکانمان ستایشی رۆڵی منی کردبوو کە دژی شەڕی ناوخۆ بووم و وەك سەرۆکی حکومەت رێگەم نەداوە شەڕ پەرەبسێنێ. وتارەکانی ئەوکاتەی د.ئەحمەد چەلەبی سەرۆکی (INC) بەڵگەن لەسەر رۆڵی ئێمە لەرێگەگرتن لەپەرەسەندنی شەڕی ناوخۆو لەمیدیاکانی ئەوکاتەو تەنانەت لەپەرلەمانی کوردستان چەندینجار باسی لەوەکردووە کە بەندە رۆڵێکی شەرەفمەندانەم گێڕاوە لەوەی بەر بەشەڕی ناوخۆ بگرین. پێشنیازدەکەم کاك نەوشیروان، کە خۆی وا نیشاندەدات پشت بەدیکۆمێنت دەبەستێت، بچێت پرۆتۆکۆڵەکانی پەرلەمان بخوێنێتەوە کە کاتی خۆی نەك یەکێتی، بەڵکو برادەرانی پارتی چاپیان کردووە، یان ئەرشیفی تەلەفزیۆن و رۆژنامەکان ببینێ تا راستییەکانی بۆ دەرکەوێت و لەنوسینەوەی مێژووەکەیدا تووشی هەڵەی وا گەورە نەبێت.

بەئینقیلاب نەهاتینە حکومەت

لە بەشێکی تری نوسینەکەیدا کاك نەوشیروان باسی سەرۆکایەتی ئێمە لەحکومەت دەکات و راستەوخۆو ناڕاستەوخۆش توانجی نارەوا لەرەوتی کارەکانمان دەدا، بۆئەمە پێم خۆشە چەند راستییەك باسبکەم کە خۆی پێش هەرکەسێکی تر دەیانزانێ.

پێش یەکەمین هەڵبژاردن بۆ پەرلەمانی کوردستان، لەساڵی ١٩٩٢، و پێکهێنانی حکومەت، لەدابەشکردنی پۆستەکانی نێوان هەردوو براوەی هەڵبژاردندا پارتی سەرۆکی پەرلەمانی بەرکەوت و یەکێتی سەرۆکی حکومەت. لەکۆبوونەوەی مەکتەبی سیاسیدا بەگشتی داواکرا کاك نەوشیروان ببێتە سەرۆکی حکومەت، وتی نایکەم. لێمان پرسی بۆ نایکەی؟ وتی، ئەگەر سەرۆکی حکومەتی باشە بۆچی مام جەلال خۆی نایکات؟ ئەوەبوو دواتر کاك د.فوئاد مەعسوم دیاریکرا، پاش ماوەیەکی کورت ئەوان کەوتنە دژایەتی کاك د.فوئادو دەیانویست لەناو حکومەت پایەی لاوازبکەن و لەناو خەڵکدا بیشکێنن.

هەرگیزیش تالبی سەرۆکایەتی حکومەت نەبووم و بەئینقیلابیش نەهاتووم، بۆ مێژوو دەیگێڕمەوە بیرمە من و کاك شێخ دارۆی رەحمەتی و کاك سەعدی و کاك د.کەمال ئیجازە بووین و چووبووین بۆ ئەڵمانیا، مام جەلال داوای لێکردین بەپەلە بگەڕێینەوە بۆ کوردستان. گەڕاینەوەو لەماڵی مام جەلال کۆبوونەوەی سەرکردایەتی کرا. لەکۆبوونەوەکەدا مام جەلال و کاك نەوشیروان و هەموو برادەرانی سەرکردایەتی داوایان لێکردم پۆستی سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان وەربگرم، خۆم رەئیم لێی نەبوو، وتم نایکەم، مام جەلال و مەکتەبی سیاسی، بە کاك نەوشیروانیشەوە وتیان ئەمە بڕیاری پێشمەرگانەیەو دەبێ بیکەیت. منیش لەسەختترین کاتدا ئەو ئەرکەم قبوڵکرد کە هەڵوێستی سیاسی پارتی و یەکێتی یەك نەبوو، وەزیرو وەکیل وەزیر هەردووکیان خۆیان بە وەزیر دەزانی، سەرۆکی حکومەت و جێگری سەرۆکی حکومەت وەك یەك بوون. هەر لەسەر ئەوەش بوو مام جەلال و کاك نەوشیروان داوایان لێکردم ببمە سەرۆکی حکومەت، چونکە سەرۆکی پەرلەمان بەتەواوی لەدەستی پارتیدا بوو حکومەتیش وەك یەك بووین. کە سەرەتا چوومە حکومەت کوردستان لەبەردەم دوو ئابلۆقەی ئابووریدا بوو، ئابلۆقەی ئابووریی نێودەوڵەتی لەسەر عیراق و هی عیراق لەسەر کوردستان بوو ، گیروگرفتی سنورو کێشەی هەرێمایەتیمان لەگەڵ دراوسێکان هەبوو.

تێکەڵکردنی حزب‌و حکومەت!

ماوەیەکی کورت دوای ئەوە گەورەترین گرفت بۆ بازاڕی کوردستان دروستبوو کە ڕژێمی سەدام ٢٥ دیناری کشاندەوە کە بەشێکی زۆر لەم پارەیە لەکوردستان کاری پێدەکرا، ئێمە لەم کات و سەردەمە سەختەدا حکومەتمان وەرگرت.

لەوسەردەمەدا کاریگەری حزب لەسەر حکومەت ئاشکراو دیاربوو، ئەندازیاری ئەم پرۆسەی حکومەت و حزب تێکەڵکردنە هەر خودی کاك نەوشیروان بوو. کە وەك جێگری سکرتێری گشتی لەساڵی ١٩٩٣ بەرەسمی داوای لەمن دەکرد سەدان دۆنم زەوی لەسلێمانی تاپۆ بکەم بەناوی یەکێتی نیشتمانیی کوردستانەوە. کە یەکێ لەو زەوییانە شوێنی ئەم ئوتێلەی شاری جوانی کاك فاروقی مەلا مستەفا بوو.

ئەوە من بووم داوام دەکرد با حزب دەستوەرنەداتە ناو کاروباری حکومەتەوە، تەنانەت چەندینجار بۆ چارەسەری ناکۆکی نێوان هەردوو حزب و نێوان حزب و حکومەت، لەکۆبوونەوەکانی مەکتەبی سیاسی پێشنیازم دەکرد با مام جەلال و کاك مەسعود خۆیان یەکێکیان حکومەت و یەکێکیان پەرلەمان وەرگرن، تا کەس دەست نەخاتە کاروباری حکومەتەوە. تەنانەت لەکۆبوونەوەی پەرلەماندا، لەمانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٩٤دا وتارێکم پێشکەشکرد کە مام جەلال و کاك مەسعود ئامادەی پەرلەمان بوون، داوامکرد خۆیان بێنە ناو حکومەتەوەو با حزب و حکومەت لەیەك جیابکەینەوە. لەوێوە ئیشوکارەکان جێبەجێبکەن نەك لەدەرەوەی حکومەت و پەرلەمان، چونکە ئەگەر لەدەرەوە بڕیار بدەن ئەو دەورە ناگێڕن. (لەبەرگی ١١ی ساڵی ١٩٩٤ی پرۆتۆکۆڵەکانی پەرلەمان دەقی وتارەکەی تێدایە)، ئەمەی من دەیڵێم گێڕانەوەی بەمیزاج نییە، با کاك نەوشیروان بچێت بیانخوێنێتەوە.

برادەرانی مەکتەبی سیاسی، بەوانەی چوونەتە گۆڕانیشەوە، ئەو ڕاستییانە دەزانن کێ دژی جیاکردنەوەی حزب لەحکومەت بوو؟ کێ دەیویست هەموو بڕیارەکانی حکومەت و تەنانەت بڕیار لەسەردامەزراندنی کارمەندێکیش لەبارەگای حزب بدرێت. کاك نەوشیروان ئەوەندە زاڵبوونی هەیمەنەی حزبی بەسەر حکومەتەوە لا

گرنگ بوو کە رەنگە پێویستم بەهێنانەوەی نموونە نەبێ. ئەم بیرەوەرییانەی خۆی کە بڵاویکردوونەتەوە پڕن لەنموونەی دەستوەردانی حزب لەحکومەت.

ئەوکات بژێوی خەڵك تا رادەیەکی ترسناك خراپ بوو، مووچەی فەرمانبەران بەئاسانی دابیندەکرا، حکومەت هیچ ئیمکانیاتێکی نەبوو، داهات نەبوو، میزانیە نەبوو، رۆژانە مەترسی پەلاماری هێزەکانی سەدام لەسەرمان بوو، ئاڵوگۆڕی بازاڕ نەبوو. کارو کەسابەت نەبوو. خەڵك لەمەینەتیدا دەژیان، دواتر ئاگری شەڕی ناوخۆش هەڵگیرسا، دەستوەردانی دەوروبەر لەناو هەرێم هەبوون. تیرۆر پەیدابوو، تەنانەت تیرۆر کاروانی هاتوچۆی خۆشمانی گرتەوە، باری ئاسایشی ژیانی خەڵك تێکچووبوو. گەنجان بۆ دەربازبوون لەو مەینەتیانە زۆریان رێگای هات و نەهاتی دەرەوەی وڵاتیان گرتەبەر. بریا کوردستان بەو هەلومەرجە سەختانەدا تێنەپەڕیایە بۆئەوەی هیچ گەنجێکی کوردستان ناچارنەبوایە رووبکاتە هەندەران. هەرچەندە بۆ ئەوکاتەش ئەمانە بوونە پشتیوانییەکی دارایی بۆ خێزان و کەسوکاری خۆیان و رۆڵیان هەبوو لەلایەك لەناساندنی کوردو کێشەکەی بەجیهان و زۆرێکیش لەوان توانیان خۆیان دروستبکەن لەئەورووپاو بوونە خاوەن بڕوانامەو شارەزایی جۆراوجۆریان پەیداکردو دواتر گەڕانەوە لەولاتەکەی خۆیاندا رۆڵی باشیان بینی لەگەشەپێدانی کوردستان. کەچی کاك نەوشیروان کۆچی گەنجیش وەك دیاردەیەکی مەوزوعی ئەو سەردەمە دەخاتە ئەستۆی ئێمەوە!!.

پارەمان بەچی داوە؟!

کاك نەوشیروان لەشوێنێکی تری هەوڵدانی بۆ چەواشەکردنی راستییەکان تۆمەتێکی تری دروستکردووە کە دەڵێ: (لەسەردەمی حکومەتەکەی ئەم برادەرەدا هەموو ماڵ و دارایی حکومەتەکە بەفیڕۆ رۆیشت...). پێدەچێ ئەم برادەرە بیەوێ لەمێژوودا ئەوە بە هەڵگەراوەیی تۆماربکات کە خەڵك وابزانێ ئێمە لەساڵی ١٩٩٢وە بودجەو میزانیەمان لە رژێمی بەغداوە بۆ هاتووە. داهاتی حکومەتی هەرێم کۆکردنەوەی گومرگ بوو لەخاڵە گومرگییەکان و دەبوو مووچەی پێشمەرگە،

[illegible]ی حکومەت، کەسوکاری شەهیدان و ئیدارەدانی کاری ڕۆژانەی خەڵك و حکومەت لەگومرگ دابینبکەین. کاك نەوشیروان خۆی ئەوەندە بێ ئاگا نیشاندەدات لەواقعی کوردستان یەکێك نەزانێ بەندەری ئوم قەسرو قەناتی سوێس بەدەستی حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە بووەو ڕۆژانە ملیۆنان دۆلار داهاتی گومرگەکانمان بووە!!. خەمی گەورەی ئێمە ئەوەبوو داهاتی هەموو سنوری حکومەتی هەرێم بەشی ئەوەبکات مووچەی مامۆستایان و فەرمانبەران و کەسوکاری شەهیدان و پێشمەرگەی پێبدەین. ئەولەویەتمان دابینکردنی مووچە بووە، ئەگەر داهاتێکی زیاتریش هەبووبێت بەچی دراوە؟ دراوەتە پێشمەرگەی کەمئەندام و خەڵکی هەژاری ئەم ولاتە. کاك نەوشیروان هەقیەتی ئاگای لەژیانی خەڵك نەبووبێت، چونکە لەهەموو ژیانیدا سەردانی ماڵی چوار شەهیدو چەند پێشمەرگەیەکی نەکردووە، نەچووەتە گەڕەکێك ماڵی هەژارێك بەسەربکاتەوە تا بزانێ خەڵك چۆن ژیاوە؟ وائێستا هاوکاری ماڵە شەهیدو پێشمەرگەیەك بەتالان و بەفیڕۆدان ناودەبات. ئەوەی کاتی خۆی ئێمە کردوومانە چەند گەڕەکێك هەبوو دورلەئەمن و هەندێ خانووی حکومی کە دوای ڕاپەڕین ماڵە ئاوارەو پێشمەرگەو کەسوکاری شەهیدان چووبوونە ناوی. ئێمە بڕیارماندا تاپۆی بکەینە ناوی کەسوکاری شەهیدان و پێشمەرگە دێرینەکانەوە. هیچمان نەبوو پاداشتی ئەو خەڵکە تێکۆشەرەی خۆمانی پێبدەینەوە، خەڵکێك ئازیزترین کوڕی خۆی کردبوو بەقوربانی بۆ میللەتەکەی، ژن و منداڵەکانی بێ کەس مابوونەوە، خانوویەکی کۆنی بەعسمان پێداوە. ئایا بەمە کارێکی باشمانکردووە یان خراپ؟، بەقسەی کاك نەوشیروان بێت خراپمان کردووە!، ئەوکات ئابلۆقەی ئابووری لەسەر هەرێمی کوردستان بوو شەڕی ناوخۆ هەبوو. چەندساڵێك (سن و کیسەڵە) دای لەبەرووبوومی کشتوکاڵی، گرانی لەناو خەڵك بلاوبووبووەوە، ئایا کارێکی خراپمان کرد کە هیچ هۆکارێکی تر نەبوو بۆ ژیان؟!، ئێمە بڕیارماندا بەشێك لەگەنجانی ولاتەکە دابمەزرێنین. پێم سەیرە کاك نەشیروان لەشوێنێ ڕەخنە لەحکومەت دەگرێت گەنجان سەری خۆیان هەڵگرتووەو

لەشوێنێکی تر رەخنە لەئێمە دەگرێت کە گەنجانمان دامەزراندووە.

خەڵك متمانەیان بەحکومەت هەبوو

کاك نەوشیروان خۆی لەگێڕانەوەکەیدا نوسیوویەتی داهاتی تەنها ٣٥٪ گومرگەکانی سنووری سلێمانی بۆ حکومەت بووە. من دەپرسم ئایا گومرگەکانی ناوچەی سلێمانی چەند بووە تا رێژەی ٣٥٪ی بەشی هەموو کاروباری حکومەت و مووچەی فەرمانبەران بکات و بای ئەوەشی زیادبووبێت ئێمە تەخشان و پەخشانی پێوەبکەین؟ ئەگەر حکومەتەکەمان بەوجۆرە بوایە کە ئەو دەیڵێت ئەوە بۆچی خەڵك بەو پەرۆشی و دڵسۆزییەوە بەرەوپیری دەهات، کاك نەوشیروان و ئەوانەی وەکی ئەو بیردەکەنەوە باوەڕم وانییە بیریان چووبێتەوە کاتێ ئێمە دەچووینە هەر شارو شارۆچکەیەك دەیان هەزار کەس دەهاتنە سەر شەقامەکان و جگە لەخۆشەویستی چاوەڕوانی هیچی تر نەبوون لەئێمە، چونکە هیچمان نەبوو بیاندەینێ، بەڵام ئەوان متمانەیان بەحکومەتەکەی خۆیان هەبوو دەیانزانی بەچی بەدەستهاتووەو چۆن گەیشتۆتە ئەو رۆژەو مانەوەو پاراستنیشی بۆ میللەتەکەمان چەند گرنگ بوو؟ هەقوابوو کاك نەوشیروان بۆ نەوەکانی داهاتوو تۆماری ئەو رۆژە سەختانەی بلاوبکردایەتەوە کە بەچی مەینەتییەك دەرگای قوتابخانەو خوێندنگەکانمان کردەوە، چۆن توانیمان زانکۆو پەیمانگەکان دابمەزرێنینەوە. چۆن لەکۆلێژێکەوە دەستمانپێکردو کردمان بەزانکۆیەك کە کاك نەوشیروان بەشانازی بزانێ موحازەرەی تیابلێتەوە. تا وایلێهات کە ئەو رۆڵە جوامێرانەی کورد کە بەهۆی زیندانیکردن و هەڵهاتنیان لەدەستی بەعس و بەهۆی پێشمەرگایەتییەوە لەخوێندن مەحروم بووبوون ئەم پەیمانگەو زانکۆیانە بوونە دەرفەتی ئەوەی دوای چەندین ساڵ لەخەباتی پێشمەرگایەتی بگەڕێنەوە سەر خوێندنەکانیان و زۆربەیان زانکۆو پەیمانگە تەواوبکەن، ئەمە هەقبوو کاك نەوشیروان وەك شانازییەك بۆ حوکمڕانی کوردی باسی بکردایە، نەك وەك مەحسوبیەت و مەنسوبیەت.

بۆ هاتمە سلێمانی؟!

لە[illegible]ی تری نووسینەکەیدا دەڵێ: (وەختێ حکومەتی هەرێمان تەسلیمی دەستی ئەم برادەرە کرد یەکێتی لەزاخۆوە تا کفری بەدەستیەوە بوو، بەلام ئێستا ئەوەتا خۆی و حکومەتەکەی بەئاوارەیی لەسلێمانین). کاك نەوشیروان ئەمە چەندجارێکە ئەو قەوانە لێدەداتەوەو مەسەلەی سلێمانیچێتی و ئاوارەیی دەورووژێنێ و کاتی خۆشی ویستی بیکاتە مەسەلەیەکی سیاسی و بەوهۆیەوە ناکۆکی بخاتە نێوان خەڵکی سلێمانی و هەولێرەوە، هەرچەندە زۆر برادەری خەڵکی سلێمانیش لەم هەڵوێستەی بێتاقەت بوون و نارەحەتن بەوەی هەرجارەی شعوری خەڵکی شارێك بریندارەدەکات بەناوی سلێمانییەوە. لەکاتێکدا سلێمانی پێش ئەوەی بۆ نەوشیروان مستەفا جێی شانازی بێت کە خوا وایکردووە لەوێ گیرسابێتەوە، جێگەی فەخرە بۆ ئێمەو مانانی تیکۆشەرو پێشمەرگە، چونکە تیایدا ژیاوین و میوانداری کردووین. دۆست و خۆشەویستمان لەم شارە هەیەو ئێمەش خزمەتمان کردووە، تەنانەت تەرمی خۆشەویستەکانی خۆشمان لەم شارە ناشتووە کە ئەوەندە بەلامانەوە شارێکی خۆشەویستە.

لەسەر کێشەی کۆمەلایەتی لێمان نەقەوماوە

گەرچی من وەکو کوردستانییەك بەیەك چاو دەڕوانمە هەموو شارەکانی کوردستان و هەمووی بە بەشێك لەجەرگی خۆم دەزانم و شانازیش دەکەم کە چواردە ساڵی تەمەنم لەم شارە بردۆتە سەر، بەلام هۆکار زۆربوون کە وەك نەوشیروان دەڵێ خۆم و حکومەتەکەم بێینە سلێمانی. خەڵك دەزانن ئێمە لەسەر کێشەیەکی کۆمەلایەتی لێمان نەقەوماوەو نەهاتووینەتە سلێمانی، ڕووداوەکانی شەڕی ناوخۆ کە درێژکراوەی ململانێکانی رابردووە ئێمەی گەیاندە سلێمانی و بریا ئەو ڕووداوە تاڵ و تفتانەی رابردوو نەبوایەو بۆ خۆشی و سەیران ڕوومان بکردایەتە ئەم شارە. پێموانییە لەبەرئەوەی کاك نەوشیروان کەوتۆتە بلاوکردنەوەی هەندێ لەوشتانەی خۆی مەبەستیەتی و بلاویاندەکاتەوە ئیتر مێژوو چەواشەبێت. چونکە مێژوو ون نابێ و ئەگەر ڕێککەوتنی درۆگیدا بە بنبەست نەگەیشتایە کارەساتەکان بەو ئاقارە

نەدەچوون و هێشتا خۆشبەختانە زۆرینەی برادەران لەژیاندا ماون. ئەگەر مەسەلەکە پێسپاردن و بەرپرسیارێتی بێت ئەوە لەساڵی ١٩٨٧و لەشۆڕشدا مام جەلال کە سەفەری کرد هەموو ناوچە رزگارکراوەکانی کوردستانی تەسلیم بە کاك نەوشیروان کرد، کەچی کاتێ گەڕایەوە کاك نەوشیروان لەو هەموو ئەمانەتە تەنها قاسمە رەشی تەسلیم بە مام جەلال کردەوەو هەموو ناوچە رزگارکراوەکانی لەدەستدا.

کەسی نەهێشتۆتەوە کە بەخراپ باسی نەکات

سەبارەت بەوەی نوسیویەتی (مام جەلال دەڵێ کۆسرەت کرمانجە، خەڵکی شار نییە. کە بەلەهجەی کۆیە ئەم وشەیە بۆ سوکایەتیپێکردنی پایەی کۆمەلایەتییە). ئەگەر نەوشیروان ئەمەی بۆ ئەوەبێ بەوشێوەیە نێوانی من و مام جەلال تێکبدات، ئەوە بەهەڵەدا چووە. ئێوە ئەوکاتەی لەناو یەکێتی بوون و بەپێچ و دەورا هەوڵتاندەدا نێوانی من و مام جەلال تێکبدەن تا بۆ بەرژەوەندیی خۆتان و بەهێزبوونی نفوزو دەسەلاتان بەکاریبەرن، نەتانتوانی، چونکە تێگەیشتن و لێکدانەوەی ئێمە لەوە گەورەتربوو کە هەر جیاوازیی و ناکۆکییەکیش بەو تەریقەیەی تۆ چارەسەربکەین.

ئەوە ئێمە نەبووین کە لەهەر سەردەم و قۆناغێکی تێکۆشاندا کۆمەڵێ تێکۆشەر بوغزێنین و ململانێمان لەگەڵ هەموویان هەبووبێ. ئەوەی لەبیرەوەرییەکانی خۆیدا نوسیویەتییەوە کەسی نەهێشتۆتەوە کە بەخراپ باسینەکات، خێرە هەموو مەکتەبی سیاسی خراپ بوربن، تەنها خۆی نەبێ! هیچ نەبێ رێزی ئەو ئەندامانەی مەکتەبی سیاسی بگرێ کە ئێستا لەسەر گردەکەن. ئەگەر ململانێکان مەسەلەی گەندەڵی ئیداریی و تەخشان و پەخشانە، خۆ سەردەمانی کۆنفرانسەکانی کۆمەڵەو خەباتی شاخ حکومەت و ئیمکانیاتمان نەبوو تا گەندەڵی تیابکرێت و سەرووەت و سامان تەخشان و پەخشانی پێوەبکرێت، دەپرسم: ئەی کێشەکان و ناکۆکییەکان و تۆمەتەکانی، ئەوکاتە لەسەرچی بوو؟!

بێ ئاگایی لەکۆنگرە

کاك نەوشیروان هەر لەشوێنێکی تری نوسینەکەیدا لەبارەی کۆنگرەی دووەمەوە

دەڵێ: پێوەرێك نەبوو بۆ ئەندامێتی كۆنگرە، مام جەلال، كۆسرەت، جەبار فـەرمان، ئەرێ [illegible]، باجیان بۆ حیمایەكانی خۆیان دابینكرد بەشداری دەنگـدان بـن!) رەنگـە تەنها ئەم قسەیەی كاك نەوشیروان خۆی بـەس بێـت بـۆ وەڵامدانـەوەی و بەخـەڵك بڵێیت قـسەكانی كـاك نەوشـیروان هـیچ پێـوەرێكی نییـە، چـونكە جگـە لـە كـاك نەوشیروان هەموو یەكێتی دەزانن كە هـەڤاڵی كۆچـكردوومان كـاك جـەبار فـەرمان نەخۆش بوو، بەشداری كۆنگرەی دووەمی یەكێتی نەكردووەو ئەوكاتـە لـەدەرەوەی وڵات بـوو. كەچـی كـاك نەوشـیروان بـەوە تاوانبـاری دەكـات بـاجی بـۆ هـەموو حیمایەكانی كردووەو بەشداری دەنگـدانیان كـردووە. ئەمـە دەلیلـە لەسـەرئەوەی گێڕانەوەكانی تریش وەك ئـەوەی كـاك جـەبار وایـەو ئـەوەیان چـەند جێـی بـاوەڕو راستین، قسەكانی تریش هەرئەوەندە راستن.

ئێمە پێمان باش نەبووە بێن لاپـەڕەكانی یـەكتر هەڵدەینـەوەو خیلافـەكانی ئێـستامان ببەستینەوە بە رابردووەوە، ئەگینا ئەوەی كاك نەوشیروان لەكۆنگرەی دووەم كـردی چ پێوەرێكی تیابوو بەعورفی كام وڵات و كۆنگرەی كام حزب ئەو مۆدێلـەی داهێنـا كە پێش ئەوەی پەیڕەو پرۆگرام قسەی لەسەربكرێت پێش هەموو شـت و لـەیەكـەم رۆژی كۆنگرەدا دوای راپۆرتی سیاسی سـكرتێری گـشتی بڕیـاری هەڵبـژاردن درا، سەركردایەتیمان هەڵبژارد بۆ حزبێك كە هێشتا پەیڕەوو پرۆگرامـی بـۆ دانـەنرابوو! ئەمە لـەهیچ وڵاتێكی دونیادا نەبووەو كاك نەوشیروان ئەمەی فـەرزكرد، بۆیـە هـەق نییە باسی پێوەرو یاساو رێسا بكات!

لەدیدارێکی کۆسرەت رەسوڵ عەلی لەگەڵ رۆژنامەی قەبەس-دا: بەهیچ جۆرێک نەوشیروان مستەفا پەیوەندیی بەحزبەوە نەماوە ئامادەکردنی: بەشی هەواڵ و سیاسەت ٢٠٠٩/١١/٢٤

لەچەند رۆژی رابردوودا، نزار حاتەم نێردراوی رۆژنامەی قەبەس-ی کوێتی دیدارێکی راشکاوانەی لەگەڵ کۆسرەت رەسوڵ عەلی جێگری سەرۆکی هەرێمی کوردستان و جێگری سکرتێری گشتیی ی.ن.ك ئەنجامدا، کە تێیدا رۆشنایی خستە سەر جیاوازییەکانی باری دارایی و کارگێڕیی هەرێمی کوردستان لەم چەند ساڵەی دواییداو هەروەها باسی لەجیابوونەوەی نەوشیروان مستەفاو گروپەکەی کردو ئەوەشی تەئکید کردەوە کەئەوانە خۆیان وازیان لەیەکێتی هێناوەو بەهیچ شێوەیەکیش ئەوانە پەیوەندییان بەحزبەکەوە نەماوە، ئاماژەی بۆ ئەوەش کردووە کەوەك سەرکردایەتی سیاسیی کوردستان پێیان باشە هەڵبژاردن لەوادەی خۆیدا ئەنجام بدرێت و خواستی کوردیشی بۆ یەکێتیی ئارەزوومەندانە دووپات کردووەتەوەو جگە لەوەش رووناکی خستووەتە سەر زۆر بابەتی گەرمی رۆژانەی سەر گۆڕەپانی کوردستان و عیراق، لەو بارەیەوە کوردستانی نوێ بەپێویستی زانی کەپوختەیەکی ئەو دیدارە بۆ خوێنەرانی بلاوبکاتەوە.

بەرزبوونەوەی ئاستی بژێوی

کۆسرەت رەسوڵ عەلی لەبارەی دیدی خۆیەوە بۆ شاری سلێمانی لەدەماودەمی رووخاندنی رژێمی بەعسەوە بۆ ئێستا وتی: جیاوازییەکی زۆر هەیە لەهەموو ئاستەکاندا، چونکە ئەوێ رۆژێ لەژێر باری ئابلۆقەی رژێمی سەدام و ئابلۆقەی نێودەوڵەتیشدا بووین، بەلام ئەمڕۆ سلێمانی لەهەموو لایەنەکانی پەرەسەندن و بنیاتنان و گەشەسەندنی کۆمەلایەتی و ئابووریی و ئاستی بژێوییەوە جیاوازەو

بۆ نموونەش نموونەی بەوە هێنایەوە کە لەو رۆژگارەی بەر لەرووخاندنی رژێمدا هەموو سنووری پارێزگای سلێمانی (٥٣) هەزار ئۆتۆمبێلی تێدابوو، لەکاتێکدا ئێستا ئەو ژمارەیە لە (٣٠٠) هەزار زیاترە، کەئەوەش دەکاتە بەرزبوونەوەی داهاتی تاکەکەس.

بەئازادیی رەخنە لەسەرۆك کۆمار دەگرن

سەبارەت بەئازادییە تاکە کەسییەکانیش، جێگری سکرتێری گشتی ئەوەی روونکردەوە کە زۆر ئاساییە هەر هاوولاتییەك لەم هەرێمەدا بدوێن کەبەئارەزووی خۆی رەخنەی توندیش لەحکومەت و لێپرسراوان و لەپێش هەمووشیانەوە لەسەرۆك کۆمار بگرێت بەبێ ئەوەی تووشی هیچ لێپێچینەوەیەکی یاسایی ببێت، ئەمە جگە لەبوونی رۆژنامەگەرییەکی ئازاد کە دەتوانێت رەخنە لەهەر لێپرسراوێکی ولات بگرێت. وتیشی: هەر بۆ نموونە تەنیا لەپارێزگای سلێمانیدا نزیکەی (٥٠) رۆژنامەو گۆڤار دەردەچن کە هەندێکیان ئۆپۆزسیۆنیشن و زۆر توندن وەك هاولاتی و ئاوێنەو رۆژنامە کە ئەمەی دواییان سەربە بزووتنەوەی گۆڕانە کە بەم دواییە لەئەنجامی ئەو جیابوونەوەیەوە هاتەئاراوە کە لەریزەکانی یەکێتیدا بەسەرۆکایەتی نەوشیروان مستەفا–ی جێگری پێشووی سکرتێری گشتی روویدا.

لەکۆمپانیاوە بۆ بزووتنەوەی سیاسی

لەبارەی چۆنێتیی جیابوونەوەکەشەوە کۆسرەت رەسوڵ ئەوەی بۆ قەبەس روونکردەوە کە نەوشیروان مستەفا سەرەتا داوای لەحزب کردووە کە دەیەوێت خۆی تەرخان بکات بۆ کاروباری رووناکبیری و پێکهێنانی کۆمپانیای وشە، کەگوایە لەخزمەتی حزب و حکومەت و پەرلەماندا دەبێت، بەلام کتوپڕ ئەو کۆمپانیایە لەدەماودەمی هەڵبژاردنەکانی کوردستاندا گۆڕدرا بۆ پێکهێنانی لیستی گۆڕان کە ئەو لیستە لەکۆی ١١١ کورسی ٢٥ کورسیی بەدەستهێنا، کۆسرەت رەسوڵ ئەوەشی نەشاردۆتەوە کە خۆی و حزبەکەی خۆشحاڵ نەبوون بەو هەنگاوە، بەلام وتی: لەهەمان کاتیشدا رێز لەبڕیارەکەی دەگرین و وەك سەرجەم هێزەکانی دیکەی

ستان مامەڵەی لەگەڵدا دەکەین.



خۆی دەستپێشخەر بوو

سەبارەت بەوەش کە داخۆ نەوشیروان پەیوەندیی خۆی لەحزبەکەی بچڕاندووە یان حزب ئەو پەیوەندییەی کۆتایی پێهێناوە، جێگری سکرتێری گشتیی روونیکردەوە کە ناوبراو خۆی دەستپێشخەربووە بۆ کۆتاییهاتنی پەیوەندییەکەی و تەئکیدیشی کردەوە ئیتر بەهیچ جۆرێك پەیوەندیی بەحزبەوە نەماوە.

لەبارەی ئەو دەنگۆیانەشەوە کەدەوترێت گۆڕان بەلیستەکەی مالیکییەوە پەیوەست دەبن، کۆسرەت رەسوڵ وتی: ئەوە دوورە لەراستییەوە، چونکە خودی نەوشیروان ئەوەی راگەیاندووە کە لەگەڵ لیستی هاوپەیمانیی کوردستان هاوپەیمانی دەکات.

یەکێتیی ئارەزوومەندانە

لەبارەی ویستی کوردیشەوە بۆ ئەنجامدانی هەڵبژاردنەکەی عیراق لەوادەی خۆیدا، رایگەیاند کەسەرکردایەتیی کورد لەگەڵ ئەوەیە کە لەکاتی خۆیدا ئەنجام بدرێت، چونکە ئەوە پرۆسەیەکی دیموکراتییەو لەو رێگەیەوە ئیرادەی میللی دەچەسپێت و پرۆسەیەکی دەستاودەستکردنی دەسەلات و نەمانی دیکتاتۆرییە.

لەبارەی گرفتی کەرکوکیشەوە وتی: هەموو ئەوەی کورد دەیەوێت بەگوڕکردنی ماددەی ١٤٠ی دەستوورەو وتیشی: هەرچەندە مافی خۆمانە دەوڵەتی سەربەخۆمان هەبێت، بەلام ئەوەی ئێمە داوای دەکەین دەوڵەتێکی یەکگرتووە لەسەر بنەمای فیدرالی و یەکێتیی ئارەزوومەندانە.

١٤٠ وپێشمەرگەو نەوت

کۆسرەت رەسوڵ عەلی لەبارەی رەزامەندیی هەرێم لەئەدای حکومەتی بەغداشەوە وتی: ئێمە دەخوازین لەوەش باشتربێت کە هەیە، بەلام زەحمەتیی بارودۆخەکەش رەچاو دەکەین، بەتایبەتیش لەرووی بەرەنگاربوونەوەی تیرۆریزم و گەندەڵیی دارایی و کارگێڕی، هەرچەندە سەرنج و تێبینیشمان لەسەر ئەدای حکومەتی بەڕێز مالکی هەیە لەرووی چالاك نەکردنی کاری ماددەی ١٤٠ و چارەسەر نەکردنی

پێ[illegible]ه دارایيه‌كانی هێـزی پێـشمه‌رگه بـه‌و پێيـه‌ی ئـه‌و هێـزه به‌شـێكه لــه‌هێزه چه‌كداره‌كانی عيراق، ئه‌مه جگه لـه‌ده‌رنه‌كردنی ياسای نه‌وت و غاز.

بەرگرتنه لـه‌تيرۆر نه‌ك عه‌ره‌ب

لـه‌باره‌ی ئه‌و ڕێوشوێنانه‌شه‌وه كـه لـه‌بازگه‌كانـدا ده‌گيرێنه‌بـه‌ر، جێگـری سـكرتێری گشتيی ی.ن.ك وتی: ئه‌و ڕێوشوێنانه دژی برايانی عه‌ره‌ب نين، به‌ڵكو هه‌موو ئه‌وانـه ده‌گرێته‌وه كه دێن بۆ هه‌رێم به‌بێ گوێدانه نه‌ته‌وه‌و ئايينيان به‌تايبـه‌تی ئه‌وانـه‌ی لـه‌و پارێزگايانه‌وه دێن كه كـاری تـيرۆرو توندوتيـژی تێيانـدا بـلاوه، ئـه‌وه‌ش لـه‌پێناوی پارێزگاريكردنه لـه‌و ئارامييه جێگيره نايابه‌ی كه لـه‌هه‌رێمدا به‌رقه‌راره.

سه‌باره‌ت به‌و بزاوته زۆره‌ی ئاوه‌دانكردنه‌وه‌ش لـه‌سلێمانی و هه‌ڵوێـست لـه‌به‌رامبـه‌ر وه‌به‌رهێنه‌رانی بيانی، ڕايگه‌ياند: بـه‌خێرهاتنی سـه‌رجه‌م وه‌به‌رهێنــه‌رانی ولاتـانی بـراو دۆستمان ده‌كه‌ين به‌پێی ئه‌و ڕێوشوێنانه‌ی كه دانراوه بۆ كاركردن.

لــه‌باره‌ی بۆردومــانی سـنووره‌كانی هه‌رێميــشه‌وه لـه‌لايـه‌ن تۆپخانـه‌كانی ئێرانـه‌وه، جێگری سكرتێری گشتی وتی: ناوه ناوه ناوچه سنوورييه‌كانمان ده‌كه‌ونه به‌ر ئـاگری تۆپخانه‌كانی ئێران، چ لـه‌سه‌ر ئاستی حكومه‌تی هه‌رێم و چ لـه‌سه‌ر ئاسـتی حكومـه‌تی ناوه‌نديش لـه‌ڕێگه‌ی وه‌زاره‌تی ده‌ره‌وه ڕه‌خنه‌مان لـێگرتووه‌و ئيدانه‌مان كردووه، به‌ڵام لايه‌نی ئێرانی ده‌ڵێن بۆردومانه‌كه بۆ ڕێگرتنه لـه‌وانه‌ی لـه‌سنووره‌كانه‌وه دزه ده‌كه‌ن.

## بەڕێز نەوشیروان مستەفا حەڤدە هەزار وشەکەت دۆکیۆمێنتە یان حیکایەتی جەللادو فریشتە؟

ڕێکەوت محەمەد زەکی ٢٠٠٩/١٢/٦

چەند ڕۆژێك پێش ئێستا بەڕێز نەوشیروان مستەفا بەناوی لەنێوان مام جەلال و مندا زیاتر لەحەڤدە هەزار وشەی نووسیوەتەوەو وەك بیرەوەری و دۆکیۆمێنت و لێدوان لە ٧ بەشدا کۆی کردۆتەوە، دوای خوێندنەوەی ئەو حەڤدە هەزار وشەیە دەتوانین بڵێین پێشینان ڕاستیان وتووە کەدەڵێن دۆم بێت و کلاش بۆخۆی بچنێت، هەموو ئەو ٧ بەشە دەخوێنیتەوە، وشەیەك، دێڕێك نادۆزیتەوە کەبەڕێز نەوشیروان هەڵەکان بخاتە ئەستۆی خۆی و خۆی بەلێپرسراو بزانێت لەبەرامبەر تەنیا یەك ڕووداویشدا.

### ململانێی
### نێوان خێرو شەڕ

هەموو ئەو ٧ بەشەم خوێندەوە لەهەموو پەرەگرافێکدا هەستم دەکرد ئەمە ململانێی نێوان خێرو شەڕە، حیکایەتی فریشتەو جەللادە، شەڕی نێوان دوو هێزە یەکێکیان پڕپڕە لەخێرو ئاشتی و پاکیزەیی و نەرمونیانی و بەرامبەر بەهێزێك وەستاوەتەوە کەپێچەوانەی هەموو ئەوانەی تیایە، ئەوەی ئەو نووسێوێتی تەنیا لەنامەی سەربازێك دەچێت بۆ باوکی کەباسی ئازایەتی و جوامێری سوپاکەی خۆیان و شکست و هەڵەکانی دوژمن دەکات، هەموو شتێك لەو حەڤدە هەزار وشەیەدا دەخوێنیتەوە تەنیا هەستکردن بەلێپرسراوێتی نادۆزیتەوە، ئەو ٧ بەشە پڕاوپڕە لەخۆ بێبەریکردن لەئاستی هەموو پێشهات و ڕووداوەکاندا بەباش و خراپەوە، ئەوەش لەهەردووبارەکەدا مەترسیدارە چونکە ئەو کات ئەو سکرتێری گشتیی دووبارە یان کەسی دووەم بووە لەناو یەکێتیدا.

بەڕێز نەوشیروان لەیەكەم دێڕیدا ئیعترافێكی جوان دەكات و دەڵێت (لەدوای راپەڕین سێ جار، هەرجارەی بۆ ماوەیەك لەسێ قۆناغی ناسكدا كوردستانم بەجێهێشت) ئاخر هەرئەمە هۆكاری ئەو رایەی بەشێكی زۆر لەجەماوەری كوردستان بوو كەلەكاتی هەڵبژاردنە پەرلەمانییەكەی كوردستاندا دەیانوت كێ ناڵێت ئەم جارەش لەهاتنە پێشەوەی هەر قۆناغێكی ناسكدا بەڕێز نەوشیروان جارێكیتر كوردستان و خەڵكەكەی بەجێناهێڵێت.

ئەوەی بۆ من مایەی پرسیاربوو ئایا ئەگەر بەڕێز نەوشیروان وەكو خۆی دەڵێت بیرەوەری و دۆكیۆمێنتەكان و لێدوانەكانی سەرەتاكانی دوای راپەڕینی نووسییەوە ئەوە دەنووسێتەوە كەچاوەڕێم دەكرد، با لەدێڕێكی خۆیەوە دەستپێبكەم كەلەبەشی حەوتەمیدا نووسیوێتی (من دەمەویت ئەم ئەزموونە ستالینییەی حزب كۆتای بێ و حزبێكی دامودەزگای مۆدێرن دروستبكەین، ئەوان پڕوپاگەندەی مووچەبڕین و دەركردن و تۆڵەكردنەوەم دوادەخەن)، سەرنج بدەن (تۆڵەكردنەوە) ئەگەر بەڕێز نەوشیروان خەڵكی ئەم ولاتە نەبوایەو ئەم دێڕەمان لەیەكێك لەنووسینەكانیدا بخوێندایەتەوە دوور نەبوو لێپرسراوان بگەنە ئەو رایەی كەداوای راوێژو یارمەتی لێبكەن، هەموو كەس باوەڕ بەمە بكات من باوەڕ بەوە ناكەم و دەڵێم ئەوە تەنیا قسەی كتێبەو باق و بریق و رازاندنەوەی رستەكانە، بۆچی؟ چونكە سەرگوزشتەو بەریەككەوتنم هەیە لەگەڵ كردەوەو یەكێك لەبڕیارەكانی ئەودا، بەڕێز نەوشیروان من ساڵی (١٩٩٢) لەتەمەنێكی منداڵیدا نامەی نهێنیم لەناو لفكەی خۆشۆرندا گەیاندە زیندانە تایبەتییەكەی تۆ لەماڵەكەی خۆت، بەلام بۆ ئەوانە نا كەخیانەتیان لەحزب كردووە یان تۆمەتی گەندەڵیان هەبێت یان دەستیان لەگەڵ دوژمندا تێكەڵ كردبێت، بەڵكو بۆ ئەوانەی كە لەشانە نهێنییەكانی رێكخستنەكانی یەكێتیدا بوون لەم شارەداو تەنیا چەند مانگێك بوو لەزیندانەكانی بەعس رزگاریان ببوو كەچی ئەوان دیلی تۆ بوون، لەبەرچی؟ تەنیا لەسەر بیروڕاو فكری جیاواز لەگەلا تۆ نەك

لەگەڵ یەکێتی ئەگینا یەکێتی خۆی زیندانی دەکردن، تەنیا لەبەرئەوەی پشتیوانی لە کەتولەکەی بەڕێزتیان نەکرد تۆ دەستگیرتکردن، بەهەرحاڵ من وردەکاری و گێڕانەوەی ئەو بابەتە هەڵدەگرم بۆ خاوەنەکانی ئەم کەیسە خۆیان ئەوە مافی ئەوانە نەك من، تۆیەك کەسەردەمی بانگەشەی هەڵبژاردنەکان بانگەشەی بیروڕای جیاوازت دەکرد، بانگەشەی عەدالەتی کۆمەلایەتیت دەکرد، بانگەشەی دادپەروەریی و مافی مرۆڤ و دەسەلاتی یاساو دادوەریی و ئازادیت دەکرد، بەلام خۆ هەموو ئەوانەی دەنگیان بەلیستەکەتدا وەکومن نامەی نهێنی و هەواڵی دەرەوەیان نەگیاندبووە زیندانییە تایبەتییەکەی تۆ کەبۆ ئەوانەت دانابوو نایەنە ژێرباری تۆوە، بەداخەوە ئەوان وەکو من نەگەشتبوونە ئەو جێگا نهێنی و تایبەتیەی تۆ، بریا ئەو زیندانە تایبەتەت بۆ ئەوانە بوایە کە گەندەڵ و خائین بوون نەك بۆ ئەوانەی لەگەڵ تۆ جیاوازبوون.

## حەڤدە هەزار جار
## پاکانەت کردووە

بەلام ئێستا تێدەگەم تۆ شتی واناکەیت یان بۆ نەتکرد، وەلامەکەی ئاسانە چونکە ئەگەر تۆ ئەوەت بکردایە لەبەرژەوەندیی یەکێتیدا دەبوو، خۆت وتەنی تۆ لەسێ قۆناغی ناسکدا میللەتەکەت و یەکێتیشت بەجێهێشتووە، تۆ حەڤدە هەزار جار پاکانەت کردووە منیش حەڤدە هەزارجار باوەڕناکەم، بەڕێز نەوشیروان ئەوەی لەو ٧ بەشەوە ڕووندەبێتەوە ئەوەیە کەتۆ سەرکردیەکی نەفەس کورت و تورەیت، تۆ بەسەرهاتی بێ گوناه و گوناهبارت نووسیوەتەوەو ناوت ناوە دۆکیۆمێنت، دەتەوێت بلێیت هەموو تاوانەکە لەئەستۆی ئەو هەڤالانەدایە کەناوت بردوون.

بەڕێز نەشیروان لەبەشی یەکەمیدا نووسیوێتی (ئەم جارەیان کەبڕیاری گەڕانەوەمدا یەکێتی لەهەولێر پایتەختی هەرێم دەرکرابوو حکومەتەکەی و مەکتەب سیاسییەکەی و سەرکردایەتییەکەی و فەرماندەکانی بەئاوارەیی لەسلێمانی بوون) خێرە جەنابتان

لەو هەلومەرجە ناسکەی یەکێتیدا لەدەرەوە بوون؟ ئەی بۆ بەفریای ئەوانەوە نەگەڕایتەوە؟ هۆکارەکەی؟ ئەی تۆ بەزانایی و لێهاتوی خۆت کە لەکاتی بانگەشەی هەڵبژاردنەکاندا ئەو هەموو نەسیحەتەت کردین بەچەندین زنجیرە لەکەناڵەکەتەوە چۆن نەتتوانی بیانگەڕێنیتەوە هەولێر؟

بەڕێز نەوشیروان تۆ وتوتە (کۆسرەت و جەبار ناکۆکن هەر کەسەیان دارودەستەی خۆی هەیە) ئەی بەڕێز نەوشیروان دارودەستەی خۆی نەبوو؟ ئەی بەڕێزتان لەگەڵ کێ کۆك بوون؟، بەڕێز نەوشیروان ویستویەتی لەڕێگەی بەزاندنی سنوری هاوڕێیەتییەوە هەندێك لەو قسانەی کەقسەی نێوان دوو برادەرن و هی ئەوە نییە بوترێن ئەگەر بەمەبەست نەبێت، ویستویەتی درزێك بخاتە نێوانی جەنابی مام جەلال و کاك کۆسرەتەوە دیارە هەڤاڵ کۆسرەت لەوەلامەکەی خۆیدا وەلامی هەموو ئەوانەی داوەتەوە، بەلام بۆ منی خوێنەر جیاوازییەکی سادەم بینی ئەویش ئەوەیە تۆ لەهەموو نووسینەکەتدا تەنیا بۆ جارێکیش وشەی کاکت نەخستۆتە پێش هاوڕێ دێرینەکەی خۆتەوە مەبەستم هەڤاڵ کۆسرەتە، بەلام کاك کۆسرەت لەهەرجێگایەکدا ناوی تۆی هێنابێت کاکی بەکارهێناوە، بەخوێندنەوەمان بۆ رابردووی مامەڵەی بەڕێزتان لەگەڵ هەڤاڵەکاندا دڵنیام دوای چەند ساڵێك هەر ئاوا ڕێز لەهاوەڵەکانی ئێستای گۆڕانیشت دەنێیت، بەڕێز نەوشیروان تۆ بەناوهێنانی چەند کەسێك و نووسینەوەی پۆستەکانیان دەتەوێت بڵێی ئەوانە بەرپرسن لەهەموو چاك و خراپەیەك و من تەنیا تەماشەکەر بووم و قسەکانم هیچیان نەکردووە، ئەمە دەچێتە ئەقڵی چ یەکێتییەکەوە؟ ئەمە پێچەوانەی ئەو قسەیەی ماوەی پێشوتری خۆتە کە لەسەرەتای دروستکردنی لیستی گۆڕانەوە وتت لەهەموو سەرووەریی و شکستەکانی یەکێتیدا شەریکم و ئەو (١٠) ملیۆن دۆلارە مافی خۆمە.

## بەو قەڵەباڵغییە تەنگەتاو بوون

بەڕێز نەوشیروان تۆ بەشێکی نووسینەکەت تەرخانکردووە بۆ نووسینەوەی سەفەرەکانی جەنابی مام جەلال، دەڵێیت هەر هەلێکی بۆ هەڵکەوتبێ سەفەری کردووە، دەڵێیت سەفەر بەشێکی گرنگی ژیانی مام جەلال پێکدەهێنێت، خۆشت وانیشانداوە کەقسەت نەڕۆشتوەو بێبەریت لەبڕیارەکان، دەشڵێیت م.س پێکهاتبوو لەچەند کەسێك کە تەنیا گوێیان بۆ مام جەلال شلکردووە، ئەی کەواتە کێ یەکێتی بەڕێوە بردووە؟ پرسیارێکی تریش ئاراستە بەڕێزت دەکەم، ئەویش ئەوەیە ئەگەر ئێوە پڕۆژەکانتان نەدەبوونە بڕیارو قسەتان نەدەڕۆیشت چۆن بوو پڕۆژەی هەڵبژاردنەوەی ڕێکخستنەکان و زیادکردنی ئەو هەموو مەڵبەندەتان بەسەر ی.ن.ك-دا سەپاندو بەمەش دەستدرێژیتان کردە سەر پەیڕەوی ناوخۆکەی.

بەڕێز نەوشیروان کەس لەوە تێناگات تۆ کام جۆرە کارکردنەت دەوێت، تۆ پێش چەند ڕۆژێك لەکاتی گەڕانەوەی بەشێکی زۆر لەکادرەکانی گۆڕان لەدەڤەری بادینان بۆ ڕیزەکانی یەکێتی کاتێك جەنابی مام جەلال پێشوازی لێکردن ئێوە وتتان وەزعی کورد لەبەغدا ناسکە چۆن دەبێت سەرۆك کۆمار لەسلێمانی خەریکی کاری حزبی بێت، کەچی ئەوکاتە پشووی جەژن بوو ژیانی ئاسایی و تەنانەت گفتوگۆکانیش وەستابوو، مەگەر مام جەلال هێشتا سکرتێری یەکێتی نییە حەقی نییە کاری حزبی بکات؟ یان بەو قەڵەباڵغییە تەنگەتاو بوون.

## یەکێتی ڕەخنە لە سەرکردەیەکی پێشوو دەگرێت

وریا حەمە تاهیر

٢٠٠٨/١٢/٠٩

سەرکردەیەکی پێشوو و دیاری یەکێتی تۆمەتبار دەکرێت بە بەکارهێنانی دەستەیەکی ناکۆك وەك بریکار بۆ یەکلاییکردنەوەی کۆنە قینی سیاسی.

ئەم راپۆرتە لەسایتی iwpr بلاوکرایەوە.

پارتی سەرۆك کۆماری عێراق جەلال تالەبانی سەرکردەیەکی پێشوو و کاریگەری تۆمەتبار کردووە بە دروستکردنی پشێویی دەستەیی.

بەرپرسانی بالا لە یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان دەڵێن نەوشیروان مستەفا، کە یەکێکە لە دامەزرێنەرانی پارتەکە، هانی دەستەیەکی ناکۆکی داوە ڕەخنە لە سەکردایەتی بگرێت.

دەستەی رەگ – کە ناوەکەی لە کورتکراوەی گۆڕانی دیموکراتی–وە هاتوە، لە سەرەتای نۆفەمبەردا سەریهەڵدا و داوای لە بەرپرسانی بالای یەکێتی کرد ڕێگا بۆ ئەندامانی نوێ چۆڵ بکەن.

ئەندامانی رەگ، کە دواتر لە پارتەکە دەرکران، نکۆڵی لە هەر پەیوەندییەك لەگەڵ نەوشیروان مستەفادا دەکەن و دەڵێن تەنها لە هەندێك ئامانجادا هاوبەشن لە گەڵیدا و لە لایەن ئەوەوە پالپشتی ناکرێن.

دەرکردنی خێرای ئەو ئەندامانە لە ڕیزەکانی یەکێتی وەك کاردانەوەیەکی توند لە [illegible] زۆرێك لە ڕەخنەگرانەوە لێکدرایەوە و ئەو ئەگەرەشی خستەوەڕوو کە سەرسەختیی سەرکردایەتی لەوانەیە پارتەکە بەرەو پارچەبوون ببات.

لەگەڵ ئەوەشدا، بەرپرسێکی باڵای یەکێتی، کە نەیویست IWPR ناوەکەی بڵاو بکاتەوە، وتی ئەم دەستەیە بۆیە دەرکرا، چونکە وەك بریکاری نەوشیروان مستەفا لێکدرایەوە.

"دەستەکە تەواو شوێنپەنجەی نەوشیروانی پێوە دیارە" ئەو بەرپرسە وتی.

نەوشیروان مستەفا دەستی لە پۆستی جێگری سکرتێری گشتیی یەکێتی کێشایەوە دوابەدوای کێشمەکێشێکی ناوخۆیی لەسەر دەسەڵات لە ٢٠٠٦ دا و دەستی کرد بە دامەزراندنی کۆمپانیای وشە، کە کۆمپانیایەکی میدیایی بەهێزە.

لەو لێدوانانەی لە بڵاوکراوەکانی دەزگاکەی خۆیدا بڵاو بوونەتەوە، نەوشیروان مستەفا ڕاشکاوی خۆی وەك ڕەخنەگرێك دەخاتەڕوو بەرامبەر بەو پارتەی کە هێشتا ئەندامە تیایدا و سەرکردایەتییەکەی تۆمەتبار دەکات بە خراپ بەڕێوەبردن و فەرمانڕەوایکردنی تاکە کەسی.

نەوشیروان بەم دواییانە بە IWPRی ڕاگەیاند کە میدیا بەکاردەهێنێت بۆ هاندانی چاکسازی و هیچ پلانێکی نییە بۆ دروستکردنی پارتێکی سیاسی لە دژی یەکێتی.

نەوشیروان وەڵامی پرسیارێکی IWPRی نەداوەیەوە سەبارەت بەبانگەشەکانی یەکێتی کە گوایە ئەو دەستی لە ڕەگدا هەیە.

## کارنامەی سیاسی

دەستەی رەگ کە ئەندامەکانی دانیشتووی لەندەنن لە ٧ی تشرینی دووەم خۆی ڕاگەیاند، و داوای کرد کە سەرکردایەتی یەکێتی دەست لە کار بکێشێتەوە چونکە سەرکەوتوو نەبووە و تووشی گەندەڵی هاتووە.

چەند ڕۆژێك دواتر، چوار دامەزرێنەرەکەی رەگ – شۆرش حاجی، مەلا خدر، هەڤاڵ کوێستانی و هشیار عەبد – لە پارتەکە دەرکران. بەیاننامەیەکی مەکتەبی سیاسیی یەکێتی ئەو چوار کەسەی بە کۆمەڵەیەکی "سەرلێشێواو" وەسف کرد، کە هەوڵی کودەتا دەدەن لە دژی دامەزراوە "هەڵبژێردراوە یاساییەکانی" ئەو پارتە.

بەرپرسی مەکتەبی ڕاگەیاندنی یەکێتی بە IWPRی ڕاگەیاند بانگەشەکانی دەستەکە هیچ بنەمایەکیان نییە.

"تۆمەتی گەندەڵی بۆتە شتێکی بەردەست بۆ هەر کەسێك بیەوێت ڕەخنە لەو کەسانە بگرێتە کە ڕقی لێیانە" ئازاد جوندیانی وتی. "هیچ شتێك لەم تۆمەتانە بەدی ناکرێت."

سکاڵای رەگ، وەك جوندیانی وتی "دەربارەی گەندەڵی نییە بە هەمان ئەو شێوەیەی کە سکاڵاکانی نەوشیروان پەیوەندیان بە چاکسازییەوە نەبوو. ئەمانە گشتیان کارنامەی سیاسیان لە پشتەوەیە." جوندیانی وتی پێی وایە رەگ "بەشێك لە تاکتیکەکانی نەوشیروان"ی خستووەتەڕوو.

لەگەڵ ئەوەشدا، رەگ پێداگری لەسەر ئەوە دەکات کە دەستەیەکی سەربەخۆیە و هیچ پەیوەندی بە نەوشیروانەوە نییە.

"هەندێك لە داواکاریی و ئامانجەکانمان هاوشێوەی ئەوانەی نەوشیروان مستەفان" شۆڕش حاجی، یەکێك لە سەرکردەکانی دەستەکە، بە IWPRی راگەیاند.

"سەرەڕای ئەمەش، چەند جارێك نەوشیروان ڕایگەیاندووە کە پێشنیارەکانی رەگ بەجێن – و ئێمە بۆ ئەوە سوپاسی دەکەین" حاجی وتی. سەرەڕای ئەوە وتیشی "نەوشیروان هیچ پەیوەندییەکی بە رەگەوە نییە."

"کەسانی تر لەوانەیە لێکدانەوەیەکی جیاجیان هەبێت بۆ چەند مەبەستێکی دیاریکراو" حاجی وتی.

## شکستەکانی سەرکردایەتی

ناکۆکیی دەستەیی روخسارێکی یەکێتی بووە هەر لە زووەوە و بەرپرسە باڵاکانی یەکێتی پێشرەوی سێ کۆمەڵەی جیاوازیان کردووە.

لە ٢٠٠٦دا رکەبەرایەتییەکە خەستتر بۆوە دوای ململانێیەکی ناوخۆیی لەسەر دەسەڵات کە تیایدا باڵی گشتی، کە لەلایەن تاڵەبانییەوە پێشرەوی دەکرێت، زاڵ بوو بەسەر بەرەنگاریی لایەنگیرانی نەوشیروان، کە بە "ریفۆرمخوازەکان" ناسراون.

دواتر نەوشیروان دەستی لە سەرکردایەتی کێشایەوە. چاودێران دەڵێن دەرچوونی مستەفا دەرکەوت فاکتەرێکی یاریدەدەر بوو بۆ سەرهەڵدانی چەند دەستەیەکی بچووکتر لە ناو پارتەکەدا. کەرەگ، یان گۆڕانی دیموکراتی، تازەترینیانەو چەند ناوێکی تریشن وەك ڕابوون، یەکبوون و پەیڕەوانی یاسا.

دامەزرێنەرانی رەگ ئەندامی کۆنی یەکێتین کە نەگەیشتوونەتە بە پۆستی سەرکردایەتی و لە دەرەوەی وڵات دادەنیشن.

دەستەکە داوای لە تاڵەبانی و ئەندامانی تری کۆمیتەی سەرکردایەتی کرد، دەست لە پۆستەکانیان بکێشێتەوە. رەگ دەڵێت سەرکردایەتی تووشی گەندەڵی بووە و بەرپرسیاریشە لە شکستەکانی پارتەکە.

"ئێستا، یەکێتی بەرەو چارەنوسێکی نادیار دەچێت" بەیاننامەی دامەزراندنی دەستەکە وتی. "ئەگەر وەها بڕوات، یەکێتی پارچە پارچە دەبێت."

دوابەدوای دەرکردنی رەگ لە یەکێتی، رۆژنامە ناوخۆیی و ئەهلیەکان چەند بەیاننامەیەکیان بڵاوکردەوە بەئیمزای سەدان کەس کەلایەنگری لە دەستەکە دەکەن و هەروەك دیارە ئەندامانی یەکێتی و زۆربەیان لەدەرەوەی وڵات نیشتەجێن.

حاجی وتی سەرکردەکانی یەکێتی دەبایە داواکارییەکانی دەستەکەی تاووتوێ بکردایە لە بری وەسفکردنیان بە ئاژاوەگێڕ. "ترساون لە پاڵپشتیی فراوانی کادیران" وتیشی. "دەیانەوێت نەهێڵن کەسانی تر پەیوەندیمان پێوە بکەن."

لەگەڵ ئەوەشدا، گوتەبێژی یەکێتی مەلا بەختیار وتی سەرکردەکانی یەکێتی سوور دەبن لەسەر بڕیارەکەی خۆیان.

"بڕیارەکەی مەکتەبی سیاسی وەك خۆی دەمێنێتەوە،" وتی. مەلا بەختیار وتی لە کاتێکدا یەکێتی رێگا بە بۆچوونی جیاواز دەدات، "سووریشە لەسەر پاراستنی یەکدەنگی لە نێوان ریزەکانی پارتەکەدا".

هەندێك لە چاودێران هۆشیاریان داوە کە ئەو ڕێوشوێنە لە دژی دەستەکە ئێجگار توند بووە – و لەوانەیە بە خراپی بەسەر یەکێتیدا بشکێتەوە.

"من هیچ هۆکارێکی ژیرانە نابینم بۆ دەرکردنی ئەم کادیرانە" عەدنان عوسمان، سەرنوسەری ڕۆژنامەی ڕۆژنامە، کە بەشێکە لە گروپی وشە بۆ میدیا و نەوشیروان مستەفا خاوەندارێتی دەکات، وتی.

"سەرکردایەتی یەکێتی بڕوای بە لێهاتوویی کەسانی تر نییە، توانای ئەوەی نییە نوێ ببێتەوە و بڕوای بە بیروڕای جیاوازیش نییە."

سەردار قادر، مامۆستای زانستی سیاسی لە زاکۆی سلێمانی، دەڵێت شتێکی نائاسایی نییە کە ئەندامان داوای گۆڕان بکەن لەناو پارتەکەدا و داواکارییەکانی ڕەگ لەم ڕوانگەیەوە تەواو ئاسایین.

بە گوتەی قادر، ڕەگ دەتوانێت مەترسی بۆ سەر یەکێتی دروست بکات لە دەرەوەی پارتەکەوە چونکە " دامەزرێنەرانی سەرکردەی مام ناوەندین لە پۆستەکانیاندا کە دەتوانن کاریگەری لەسەر خانە بچووکەکان دروست بکەن".

"زۆربەی ئەندامانی یەکێتی لە ئەوروپا پاڵپشتیان لەهەنگاوی یەکەمی ئەم کۆمەڵە نوێیە کردووە" وتی.

"ئەمە هانی کەسانی تر دەدات تا زیاتر لەم گروپانە رابگەیەنن ئەگەر یەکێتی

بەردەوام بێت لە رەتکردنەوەی داواکارییەکان بۆ ئەنجامدانی چاکسازی."



قادر دەڵێت رەگ دەتوانێت پارتێکی نوێ دروست بکات بۆ رووبەڕووبوونەوەی یەکێتی مەگەر داواکارییەکانی تاووتوێ بکرێن لە کۆنگرەی داهاتووی حزبەکەدا. لەگەڵ ئەوەشدا، یەکێتی تەنها دوو کۆنگرەی بەستووە لە مێژووی ۳۳ ساڵەیدا و هێشتا رێکەوتێك بۆ کۆنگرەی داهاتوو دەستنیشان نەکراوە.

لە کاتێکدا هیچ دەربازبوونێکی نزیك بوونی نییە بۆ ئەو گرژییانەی لە پارتەکەدا سەرهەڵدەدەن، تاکە هیوا بۆ کۆتاییهێنان ناکۆکیە ناوەکیە بەندە بە ئاشبوونەوەیەکی شیاو لە نێوان تاڵەبانی و نەوشیرواندا.

"ئەگەر تاڵەبانی و نەوشیروان مستەفا بگەن بە رێکەوتنێك، کێشەکان چارەسەر دەبن" قادر وتی. "هەروەها ئەمە کێشەکانی رەگیش چارەسەر دەکات، چونکە داواکارییەکانیان هەمان داواکارییەکانی نەوشیروانن".

وریا حەمە تاهیر پەیامنێرێکی راهێنراوی IWPRە لە سلێمانی. ستافی IWPR لە لەندەن و سلێمانییش بەشداربوون لە نوسینی ئەم راپۆرتەدا

# تاڵەبانی بەکردەوە دەسەڵات بەجێگرەکانی نادات

٢٠٠٨/١٢/١٦

وریا حەمە تاهیر

تاڵەبانی هیچ کام لەدەسەڵاتەکانی خۆی وەك سکرتێری گشتی یەکێتی نیشتمانی نەداوە بە هیچکام لەو دوو جێگرەی، کە لە دواپلینیۆمی دوو ساڵ لەمەوپێشی پارتەکەی، بۆ خۆی دانیان.

هەرچەندە تاڵەبانی زیاتر لە بیست ساڵ جێگری هەبووە، بەڵام هیچ کاتێك جێگرەکەی پۆستی سکرتێری بە وەکالەت وەرنەگرتووە، ئەگەر بۆ ماوەیەکی درێژیش سەفەری کردبێت بۆ دەرەوە، نەیویستووە دەسەڵاتەکانی دیاربکرێن و چوارچێوەی بۆ دابنرێت.

تاڵەبانی دەسەڵاتی فیعلی بەجێگرەکانی نادات

هەرچەندە پێشتر نەوشیروان مستەفا جێگری تاڵەبانی بوو، بەڵام وەك چەندجارێك باسیکردووە، هیچ دەسەڵاتێکی فیعلی نەبووەو بڕیارەکان لای تاڵەبانی خۆی بووە. نەوشیروان مستەفا لەساڵی ٢٠٠٦ دەستی لەپۆستەکەی کشاندەوە، دوای ئەوەی لیستەکەی سەرنەکەوت لەهەڵبژاردنە ناوخۆییەکەی یەکێتیدا.

بەڵام لە پێشهاتێکی چاوەڕواننەکراودا سەرەتای ئەم مانگە تاڵەبانی رایگەیاند دەسەڵات بە جێگرەکانی دەسپێرێت.

لەڕاگەیاندنی کۆتایی کۆبوونەوەی کۆمیتەی سەرکردایەتی یەکێتیدا کە لە ١٢/٣

لا[illegible]ایەوە، هاتووە «هەڤاڵ سکرتێری گشتی بەئامادەبووانی ڕاگەیاند، کە بەپێی ئەو دەسەڵاتانەی پەیڕەو پێی داوە، هەموو دەسەڵاتەکانی خۆی بە هەردوو جێگرەکەی سپارد».

بەڵام ڕاگەیاندنەکە ڕوونیەکردووەتەوە جێگرەکانی تاڵەبانی لەچ کاتێکدا ئەو دەسەڵاتەیان پێدەدرێت، هیچ میکانیزمێکیش نەخراوەتەڕوو بۆئەوەی مومارەسەی ئەو دەسەڵاتانە بکەن کە سکرتێری گشتی یەکێتی هەیەتی.

مستەفای سەید قادر ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتی، لەلێدوانێکدا بۆ هاوڵاتی وتی «لەغیابی مام جەلالدا جێگرەکانی دەسەڵاتیان پێدراوە». بەڵام مستەفا ئاماژەی بۆ ئەوەکرد ڕوونەکراوەتەوە ئایا لەکاتێکدا تاڵەبانی لەبەغداد دەبێت ئەوە بەغیاب دەژمێردرێتو جێگرەکانی ماف وەرگرتنی دەسەڵاتەکانی سکرتێری گشتییان هەیە.

مستەفای سەید قادر جەختی لەوەکردەوە، لەکۆبوونەوەکەی کۆمیتەی سەرکردایەتی یەکێتیدا چۆنیەتی پێدانو مومارەسەکردنی ئەو دەسەڵاتانە ڕوونەکراوەتەوە، نازانرێت جێگرەکانی لەچ کاتێکداو چۆن دەتوانن مومارەسەری ئەو دەسەڵاتانە بکەن.

لەبارەی دابەشکردنی دەسەڵاتەکانی سکرتێر لەنێوان هەردوو جێگرەکەیدا، مستەفای سەید قادر وتی «ئەوەش دیارینەکراوە، ئایا کامیان چ دەسەڵاتێك وەردەگرنو مومارەسەی دەکەن».

شۆڕش حاجی کە کادرێکی ناسراوی یەکێتییەو یەکێکە لە دامەزرێنەرانی ڕەوتی گۆڕینی دیموکراتی (ڕەگ) لەبارەی چۆنیەتی پیادەکردنی دەسەڵاتی جێگرەکانی سکرتێر، لای وابوو کە بەناڕۆشنی هێشتنەوەی وردەکارییەکانی ئەرکو مافەکانی جێگرەکان، ڕەنگە سیاسەتێك بێت بۆ تێکدانو دروستکردنی پەیوەندی هەردوو جێگرەکەی.

### دەسەڵاتەکانی سکرتێری گشتی

لــەمادەی هەشــتەمی پرۆگــرامو پێــڕەوی نــاوخۆی یەکێتیــدا ئــەرکو دەســەڵاتەکانی ســکرتێری گــشتی کــە تاڵەبانییــە لـــە دوانــزە خاڵــدا خراوەتــەڕوو، گرنگترینیــان چاودێریکردنی مەکتەبی دارایی و ئیدارەی گــشتی، سەرپەرشــتی دەزگــای چــاودێری دارایی، فەرماندەی گشتی هێزی پێشمەرگەی کوردستان، دیاریکردنی کاتو شــوێنی کۆبوونەوەکانی کۆمیتەی سەرکردایەتیو مەکتەبی سیاسی.

تاڵەبانی ئێستا وەك سکرتێری گشتی بەفیعلی بڕیاردەری ســەرەکی زۆربــەی جومگــە گرنگەکانی یەکێتییە، هەموو دارایی یەکێتی لەژێر کــۆنترۆڵی خۆیدایــەو راســتەوخۆ لەڕێگەی چەند کەسێکی نزیکی خۆیەوە سەرپەرشتی دەکات.
بــەپێی ئــەو زانیارییانــەی دزەیــانکردووە، ئەنــدامانی مەکتــەبی سیاســی یــەکێتیو جێگرەکانی تاڵەبانی ئاگایان لەداهاتی یەکێتیو چۆنیەتی خەرجکردنی نییە، پێــشتریش لەچەند کاتی جیاوازدا ئەندامانی مەکتەبی سیاسی یەکێتی جەختیان لە ناشــەفافبوونی دارایی حیزبەکــەیان کردووەتــەوە، داوایــانکردووە داهــاتو خەرجییــەکانی یــەکێتی ئاشکرابکرێت.

دوایین گروپ کە داوای ئاشکراکردنی پارەو پــولو دارایــی یــەکێتییان کــرد، چــوار ئەندامی مەکتەبی سیاسی بوون کە بە سەرکردەی باڵی ریفۆرم ناسراون.

تاڵەبانی نەك ئامادە نییە دارایی یەکێــتی تەسلیمی جێگرەکانی بکاتو بڕیاری لەســەر بــدەن، بــەڵکو ئــەو نایــەوێت بــزانن دارایــی یــەکێتی چــەندەو چــۆن دێــتو چــۆن سەرفدەکرێت. نزیکترین کەسەکانی بنەماڵەکەیو نزیك لەخۆی لە ئیدارەی گــشتی داناوە.

د.مەحمود عوسمان سیاسی بێلایەنی کورد، پێیوایە ئاسان نییە سکرتێری حیزب لەناو کوردو رۆژهەڵاتی ناوەڕاستیشدا دەستبەرداری دەسەڵاتەکانی بێت، وتی «شەخسی یەکەم ئەگەر کەسایەتی مێژوویی هەبێت وەك مام جەلال ئەوا مسەیتەر دەبێت، ئەو تەحەکوم دەکات بە ئاراستەو سیاسەتی حیزبەوە».

یەکێکی تر لەئۆرگانە هەستیارەکانی یەکێتی کە تاڵەبانی خۆی بەڕێوەی دەبات فەرماندەیی هێزی پێشمەرگەیە، تاڵەبانی جگەلەوەی ڕاستەوخۆ فەرماندەی فەرمادەیی هێزی پێشمەرگە دەکات، هاوکات نوێنەرێکی خۆی لەو دەزگایە داناوە.

سەرپەرشتیو بڕیاری کۆتایی لەبارەی هێزی پێشمەرگەی یەکێتییەوە بەدەست خودی تاڵەبانی خۆیەتی، تەنانەت جێگری فەرماندەی فەرماندەیی هێزی پێشمەرگە ناتوانێت لەغیابی تاڵەبانیدا بڕیاربدات، دانانی نوێنەری خۆی لەوێ گومانی تاڵەبانی دەردەخات لەفەرماندەکانی هێزی پێشمەرگە.

لەململانێکاندا هێزی چەکدار توانای یەکلاییکردنەوەو سەرخستنی هەر گروپێکی هەیە، وەك چۆن دارایی دەتوانێت دەستەیەك بەهێزبکات بۆ بەڕێوەبردنی پارتێكو کۆنترۆڵکردنو ڕاکێشانی ئەندامانی خوارەوەی حیزبەکە.

هەرچەندە جێگرەکەی تاڵەبانی لەفەرماندەیی گشتی لەباڵی ریفۆرمە، بەڵام تاڵەبانی سەرکەوتووبووە لەدانانی چەندین کەسی نزیك لەخۆی لەناو فەرماندەیی پێشمەرگەی یەکێتیدا، جگە لەوەی ڕێگەی نەداوە جێگرەکەی مومارەسەی دەسەڵاتەکانی بکات.

لەکاتێکدا تاڵەبانی ڕایگەیاندووە دەسەڵاتەکانی بەجێگرەکانی سپاردووە، بەڵام هێشتا

بێ ئەم لەدوو جێگرەکەی سکرتێری گشتی یەکێتی، دەسەڵاتیان بەسەر دارایی‌و فەرماندەیی هێزی پێشمەرگەدا نییە، تاڵەبانی بەفیعلی دەسەڵاتی پێنەداون سەرپەرشتی مەکتەبی دارایی‌و هێزی پێشمەرگە بکەن.



مستەفای سەید قادر وتی «ئەی چۆن دەسەڵاتیان پێدەدات، دەبێت ئاواش ڕێگەیان بدات مومارەسەی ئەو دەسەڵاتە بکەن، واپێویستە ئەوان بتوانن ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی ئەو مەکتەبانە بکەن».

جگە لەهێزی پێشمەرگە دەزگا ئەمنییەکانی یەکێتی لەلایەن تاڵەبانی‌و خانەوادەکەیەوە سەرپەرشتی دەکرێن، جگەلەوەی تاڵەبانی خۆی بەوردی چاودێری دەزگای ئاسایش دەکات، پاڤێڵی کوڕی لێپرسراوی دەزگای دژە تیرۆر بوو، ئێستا لەجێگەی ئەو لاهوری شێخ جەنگی داناوە کە برازای خۆیەتی.

تاڵەبانی بڕیاری کۆتایی دەدات لەبارەی دەستنیشانکردن‌و لابردنی بەرپرسانی یەکێتی لەپۆستە باڵاو هەستیارەکانی حکومەت‌و حیزبدا، ساڵی پێشوو لەکاتێکدا مەکتەبی سیاسی حیزبەکەی گفتوگۆیان دەکرد بۆ دانانی پاڵێوراوێك بۆ سەرۆکی حکومەت، ئەو لەکۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانیدا ڕایگەیاند یەکێتی نێچیرڤان بارزانی وەك سەرۆکی حکومەت دادەنێتەوە.

تاڵەبانی هیچ بوارێکی بڕیاردانی بۆ مەکتەبی سیاسی‌و جێگرەکانی نەهێشتووەتەوە، ئەوانیش داوادەکەن دەسەڵاتەکان دابەشبکرێت.

د. مەحمود عوسمان بڕوای وایە دابەشکردنی دەسەڵاتەکان‌و سپاردنی بەجێگرەکانی لەلایەن تاڵەبانییەوە، بۆ ڕێکخستنەوەو بەهێزکردنی یەکێتی ڕۆڵێکی ئیجابی دەبێت.

د. مەحمود وتی «ئێستا مام جەلال سەرۆك کۆمارە، ڕەنگە نەتوانێت بە ڕاستەوخۆ

رشتی هەموو ئیشەکانی یەکێتی بکات، رەنگە جێگرەکانی کاتیان هەبێت بتوانن کارەکان بکەن حەقە دەسەڵاتیان پێبدرێت، دەسەڵاتەکان دابەش بکات«.



جێگرەکانی سکرتێری گشتی

لەسەرەتای هەشتاکانی سەدەی رابردوودا کاتێك تاڵەبانی لە شاخەوە سەفەر دەکات بۆ شام بە مەکتەبی سیاسی یەکێتی دەڵێت نەوشیروان مستەفا جێگریێتی هەتا دەگەڕێتەوە.

دیاریکردنی یەکەمین جێگری سکرتێری گشتی یەکێتی بەو شێوەیە دەبێت، بەڵام لەکاتی ئامادەبوونی تاڵەبانیدا جێگرەکەی دەسەڵاتێکی دیاریکراوی نەبووە.

مەسەلەی دەسەڵاتەکانی کەسی یەکەم کە تاڵەبانییە، هەر لەسەرەتاوە کێشەی دروستکردووە، نەوشیروان مستەفا لە کتێبی (پەنجەکان یەکتری دەشکێنن)دا باس لەوە دەکات بۆ دیاریکردنی دەسەڵاتەکانی سکرتێری گشتی گفتوگۆی زۆری لەگەڵ هاوڕێکانیدا کردووە لە سەرکردایەتی یەکێتی، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات عومەر شێخموسو د.فوئاد مەعسومیش هاوڕابوون لەگەڵیدا.

نەوشیروان دەڵێت «چەندجارێك لەگەڵ مام جەلال قسەم کرد کە جۆری سکرتارییەتەکەی بگۆڕین بە یەکێ لەم دوو شێوە حکومڕانییەی لەدنیادا هەیە: شێوەی سەرۆکایەتی وەکو لە ئەمریکا هەیە، یان شێوەی پەرلەمانی وەکو لە ئەورووپای رۆژئاوادا هەیە«.

بەڵام سەرەنجام تاڵەبانی رازی نەبوو بەدیاریکردنی دەسەڵاتەکانیو نەوشیروانیش بەدرێژایی مانەوەی لەپۆستی جێگری تاڵەبانیداو هەوڵەکانی بۆ دیاریکردنی چوارچێوەیەك بۆ دەسەڵاتی تاڵەبانیو رێکخستنەوەو ریفۆرمکردنی یەکێتی

سەرکەوتوونەبوو، ناچار لەپۆستەکەی کشایەوە.



دوای دەست لەکارکێشانەوەی نەوشیروان مستەفاو لەپاش دواپلینیۆمی یەکێتی کە لە مانگی کانونی دووەمی ٢٠٠٧دا بەسترا، تاڵەبانی رایگەیاند هەریەکە لە کۆسرەت رەسوڵو بەرهەم ساڵح جێگری سکرتێری گشتی یەکێتین.

بەڵام لەپرۆگرامو پێڕەوی یەکێتیدا لەهیچ مادەیەکدا باس لە ئەرکو دەسەڵاتی جێگری سکرتێر نەکراوە، بەڵکو لە دەسەڵاتەکانی سکرتێردا هەیە کە جێگر لەئەندامانی مەکتەبی سیاسی بۆ خۆی دیاری بکات.
واتە بەپێی پێڕەوی ناوخۆی یەکێتی جێگری سکرتێری ئیشێکی دیاریکراوی نییە، مەگەر لەحاڵەتی ئامادەنەبوونی سکرتێردا، لەلایەن خودی سکرتێرەوە دەسەڵاتیان پێ بدرێت، بەڵام تائێستا کە تاڵەبانی لەبەغداد سەرۆك کۆمارە یان سەفەری دەرەوەی وڵات دەکات، هیچ کاتێك راینەگەیاندووە دەسەڵاتەکانی بە جێگرەکانی بەخشیبێت، یان بەوەکالەت سکرتێری یەکێتی بن.

شۆڕش حاجی وتی «دانانی جێگر بۆ سکرتێری یەکێتی، شتێکی رووکەشەو هیچ کاتێك لەناو یەکێتیدا جێگری سکرتێری یەکێتی نەیتوانیوە، دەسەڵاتەکانی سکرتێری هەبێت».

شۆڕش حاجی وتیشی «بەشێك لەسیاسەتی دانانی دوو جێگرەکەی یەکێتیو گەورەکردنی لەم کاتەدا، بۆ ئەوەیە، کە تاڵەبانی ئۆباڵی شکستەکان بخاتە سەرشانی ئەوان، لەپاشەرۆژدا پێیان بڵێت، ئێوە هەموو دەسەڵاتێکتان هەبوو، بەڵام سەرکەوتوونەبوون لەچارەسەرکردنی کێشەکاندا».

ئەو وردە نارەزاییانەی لەشاخ لەسەر دەسەلاتی تالەبانی هەبوو، لە ١/١/٢٠٠٤ هەشت ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتی کە لەناویاندا نەوشیروان مستەفای جێگری ئەو کاتەی و کۆسرەت رەسول جێگری ئێستای یاداشتێکیان دایە تالەبانی و داوایانکرد دەسەلاتەکانی دیاریبکرێت.

نەوشیروان مستەفا لەو کتێبەیدا نوسیویەتی «مام جەلال پێشنیارەکانی پێناخۆشبوو، هیچیانی قەبوڵ نەبوو، دەیویست وەکو خۆی بمێنێتەوە، وەکو خۆیشی مایەوە، چونکە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی نەیاندەویست تووشی بەرەنگاری ببن لەگەڵی».

پاش ساڵانێکی زۆر لەکێشمەکێش و گلەیی و نارەزایی و یاداشت نوسین لەسەر دەسەلاتەکانی سکرتێری گشتی، هیچ کام لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی یەکێتی، داوای دەست لەکار کێشانەوەی سکرتێریان نەکرد، بەلام لەم دواییانەدا رەگ کە هیچ کام لەئەندامەکانی لەسەرکردایەتی یەکێتیدا نین، داوایانکرد تالەبانی دەست لەکاربکێشێتەوە.

شۆرش حاجی ئاماژەی بۆ ئەوەکرد کە یەکێك لەداواکانیان گۆرینی پەیرەوی ناوخۆی یەکێتییە، بەجۆرێك لە پەیرەوە نوێیەکەدا دەسەلاتەکانی سکرتێر کەمبکرێتەوە. وتیشی «چونکە مەبەست لەدانانی جێگر بەئەزموونی شاخ و شاریش دەرکەوت، کە سکرتێر ئامادە نییە دەسەلاتەکانی خۆی دابەشبکات، بۆیە ئەم کارە ئەوەندەی بۆ شانخاڵیکردنەوەی بەرپرسیارێتییە ئەوەندە بۆ دابەشکردنی بەرپرسیارێتی نییە بەسەر جێگرەکاندا".

**سەرچاوە: رۆژنامەی هاوڵاتی**

## یاداشتکردنی سەردەمی سەرۆکایەتی کاك کۆسرەت....لەتاریق عەزیزەوە بۆ کاك نەوشیروان

■ سلێمان عەبدوڵڵا یونس

دەستنیشانکردنی کاك کۆسرەت بۆ پێکهێنانی کابینەی دووەمی حکومەتی هەرێمی کوردستان، دیفاکتۆیێکی ڕێکخراوەیی بوو بەسەر یەکێتییەوە. لەڕاستیدا بەهەڵەدا ناچین ئەگەر بڵێین یەکێتی جگە لە کاك کۆسرەت هیچ ئەڵتەرناتیڤێکی دیکەی کاندیدکردنی بۆ سەرۆکایەتیکردنی حکومەتەکەی لەبەردەمدا نەبوو، بەتایبەت دوای ئەوەی ئەو حیزبە قۆناغی دامەزراندنی حکومەتی، کە قۆناغێکی مێژوویی گرنگ بوو، بەسەرۆکایەتی دکتۆر فوئاد مەعسوم بەسەرکەوتووانە بەکۆتاییەکانی خۆی گەیاندبوو. بێگومان بەگوێرەی ڕیزبەندیی ڕێکخراوەیی نێو یەکێتی بوایە، دەبوو کاك نەوشیروان وەکو کەسایەتی ژمارە دووی ئەوسای یەکێتی ئەم ئەرکو ئۆباڵە مێژووییەی لەئەستۆ بگرتایە، بەڵام کاتێك بەرێزیان لەتوانایدا نییە ئەم بەرپرسیارێتییە ڕێکخراوەیی‌و دەستوری‌و سیاسی‌و ئیدارییە مێژووییە لەئەستۆ بگرێت، یەکێتی ناچار دەبێت پەنا بۆ کاك کۆسرەت بەرێت بۆئەوەی بەگیانێکی پێشمەرگانەو خزمەتگوزارییانەی بەرزەوە ئەم کۆداوا ڕێکخراوەییەی یەکێتی قبوڵ بکات.

لێرەدا ئەگەر بەچاوی بەرژەوەندیی تایبەتی کاك کۆسرەتەوە تەماشای وەرگرتنی پۆستی سەرۆکایەتی حکومەت بکەین، ئەوا دەبینین لەو سەردەمانە وەرگرتنی پۆستی سەرۆکایەتی حکومەت جگە لەبارقورسییەکی مۆراڵی‌و سیاسی‌و یاسایی‌و ئیداریی نەبێت، وەرگرتنی ئەو پۆستە بۆ یەکێتی نەبێت دەنا بۆ کاك کۆسرەت هیچ جۆرە دەسکەوتێکی تایبەتی‌و سودمەندییەکی تاکەکەسی تێدا نەبوو. چونکە لەڕاستیدا سەرۆکایەتیکردنی حکومەتێکی هەرێمی دیفاکتۆری فیفتی فیفتی کوردی لەدژوارترین هەلومەرجی سیاسی‌و ئابووریی‌و مرۆیی ئەو هەرێمەدا گەورەترین گیانبازی

[illegible]ری‌و بەڕێوەبردنی دەخواست‌و لەهەمانکاتدا پێویستی بەتەرخانکردنی ئەویەڕی توانا هەبوو لەسەرکردایەتیکردن‌و بەڕێوەبردندا، سەرکردایەتی‌و بەڕێوەبردنێك كە ئەودەمانە پێویستی بەسەرکردەی سنبولّی‌و سەرکردەی مەیدانی‌و پراگماتیك‌و لەخۆبردوو هەبوو. ئالێرەدا هیچ زیادەڕۆیی نییە كە بلّێین یەكێتی جگە لە كاك كۆسرەت نەك هیچ سەرکردەیەكی دیكەی ئەلّتەرناتیڤی شك نابات، بەلّكو دەبینین دۆخەكە هێندە سەختە كەسێكی وەكو كاك نەوشیروان بەچاوی موئامەرەوە تەماشای ئەم كاندیدكردنە دەكات‌و لەوەش زیاتر پێیوایە ئەگەر ئەم سەرکردایەتیکردنە كارێكی لەبار بوایە، ئەوا مام جەلال‌و كاك مەسعود بۆ خۆیان دەیانكرد!

بەلّێ ئالەو سەردەمانەدا كاك نەوشیروان بەحوكمی زۆرشت دەیتوانی سەرکردایەتی گۆڕانكاریی گرنگ‌و چارەنووسساز لەنێو یەكێتیدا بكات‌و بێئەوەی پێویستی بەچوونەوە (خەلّوەت)و گەڕانەوە بۆ (شێنێ)و دواتریش خۆدزینەوە لەبەرپرسیارێتییەكانی سەرشانی‌و گەڕانەوە بۆ كەناری تاراوگەی دانوبێكی دیكە هەبێت، بەلّام بۆچی نایكات؟ ئەگەر ئەمە بۆ ئەوسا بێوەلّام بوو، بەلّام دواتر لەگەلّ تێپەڕبوونی كاتدا ئەو لەگردەكە وەلّامان دەداتەوە.

من نالّێم كاك نەوشیروان خاوەنی (موعانات)و تەنگوچەلّەمەو ڕێگریی ڕێكخراوەیی نەبووە، لەهەرشتێك كە ئەو بیویستبایە لەنێو یەكێتیدا بەئاكامی بگەیەنێت، بەلّام لەو دۆخەدا، كە ئەو تیایدا، پەنا بۆ خۆدوورخستنەوە لەیەكێتی دەبات، جگە لەمام جەلال هیچ سەرکردەیەكی دیكەی نێو یەكێتی، هێندەی ئەو دەستكراوەو گوێلێگیراوو خاوەن نفوز نەبووە لەنێو یەكێتیدا. هیچ سەرکردەیەكی دیكە بەقەد كاك نەوشیروان نیوانی لەگەلّ مام جەلال‌و كادیرە پێشكەوتووەكانی یەكێتی مكوڕم‌و چەسپاو نەبووە. هیچ سەرکردەیەكی دیكە نەبووە لەسەر ئاستی جەماوەری‌و لەدەرەوەی یەكێتی لەلایەن خەلّكی بێلایەن‌و چینەكانی خوارەوەی كۆمەلّگای كوردی‌و بەدەر لەمەسەلەی حیزبایەتی پشتیوانیی لێبكرێت، بەلّام بۆچی ئەو ئەم

هەموو پشتیوانییە بەهەدەر دەدات لەیەکێتی دواتر بەگۆڕان وەڵاممان دەداتەوە؟. بەڵێ لەو سـەردەمانەو ئالـەو هەلومەرجانـەدا کـاك نەوشـیروان دەیتـوانی بـەو سـەرمایە (مەعنەوی)و (مەعریفی)و (سیاسی)و (ئایدیۆلۆجی)و تێکۆشـانەی خۆیـەوە بەسـانایی سەرکردایەتی دەربازکردنی یەکێتی لەو قەیرانانە بکات‌و لەپرۆسەیەکی لەسـەرخۆی بەردەوامیشدا دەیتوانی رێبەرایەتی (دووەمین شۆڕشی نوێی یەکێتی) بکات، بەبێئەوەی لەلایەن مام جەلال‌و یەکێتییەوە رووبەڕووی هیچ جۆرە نیگەرانییـەکی بـێ رەوینـەوە ببێت. چونکە لەو سەردەمانەدا نەدەتوانرا بەئاسانی تەکەتول لەگژ کـاك نەوشـیروان راستبکرێتەوەو نەئەویش پێویستی بەپەنابردن بۆ دروستکردنی تەکەتول هـەبوو. لـەو سەردەمانەدا (کات) شمشێر بوو بەدەست کاك نەوشیروانەوە، بەڵام کە ئەو ناتوانێـت بیگرێت‌و قەیرانەکانی نێو یەکێتی پێ شەق بکات، دەبینین چۆن، ئەو شمشێری کاتـە، لەدواجاردا، مێژووی کەسایەتی خـۆیی‌و جەسـتەی نوێبوونـەوەی یـەکێتی دوولـەت دەکات، دوولـەتکردنێك کە بێگومـان دەمێـك بـووە لای کـاك نەوشـیروان بووەتـە خولیا، بەڵام حیزبەکەی هەستی پێناکات.

شتێکی شاراوە نییە کە حکومەتی هەرێمی کوردستان، ئەوساو ئێستاش حکومـەتێکی جوتپارتییە، بەتایبەت لـەسەردمی کابینەکەی کاك کۆسرەتدا، کار گەیشتە ئەوەی ئەم دوو حیزبە هەموو پۆستە باڵاو ناوەنجی‌و بچوك‌و بگرە زۆر بچوکەکانیش لـەسەر دینی (براەان برایی، بەڵام کیسەمان جیایی) دابەش بکەن. کاك کۆسرەت گوتەنی لەلایەن یەکێتییەوە ئەندازیاری ئەم دیاردە ناتەندروستەو زاڵکردنی هەژموونی حیـزب بەسـەر حکومەتدا، کە دواجار حکومەتی کردە ئەنگوستیلـەی دەستی حیـزب، خـودی کـاك نەوشیروان بووە.

بەداخەوە بەکردار سەلما کە هاتنەکایەی سیاسەتی فیفتی فیفتی‌و زاڵکردنـی سیاسـەتی نەشـازیی بـرا بەشـانەی جوتپـارتی، هـەر لـەسـەرەتاکانی خۆیـەوە دەریخست کـە سیاسەتێکی تەندروست‌و لەبارو سروشتی نەبوو، سیاسـەتێك بـوو دواجـار بەشـەڕی براکوژیی کۆتایی هات. بەڵام ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە هێشتا پیـاوێکی نـەیاری

تاریق عـەزیز لەیاداشـتکردنی مێـژووی رووداوەکـانو گێڕانـەوەی بیرەوەرییەکانیدا، لەجێگری سکرتێری گشتی ئەوسای حیزبەکـەی ئێمـە بەئینـسافتر بێتو دادپەروەرانەترو بێلایەنانـەتر لەسـەر ئـەم رووداوە مێژووییانـەی کوردستانی عێراق بدوێت. لەوانەیە ئەگەر مرۆڤ لەیەککاتدا سەیری یاداشتەکانی تاریق عـەزیزو کاك نەوشیروان بکات، توشی سەرسوڕمانو حەپەسانو شـتی لـەوەش زیـاتر ببێـت، چـونکە هێـشتا لەگێڕانـەوەو یاداشـتکردنی ئـەو رووداوانـەدا بەتایبـەت لەسـەر ئاوارەبوونی حکومەتەکەی کاك کۆسرەت بۆ سلێمانی، پیاوێکی نەیاری سەرسـەختی کوردو یەکێتیو حکومەتەکەی کاك کۆسـرەت لـەکاك نەوشـیروانی یـارو هـاوڕێو جێگری سکرتێری ئەوسای حیزبەکەی خۆمان بەویژدانترو بەدیقەتترو بابـەتیتر بێـت.

خوێنەری بەڕێز، تکایە چاوێك بخشێنەوە بە کتێبی (تاریق عـەزیز، رجـل وەلقەزیـە)و ئەوسا خۆت بفەرموو بەراوردێکی دادوەریيانە بکە لەنێوان ئـەوی نـەیاری یـەکێتیو کوردو حکومەتەکەی ئەوسای کاك کۆسرەتو کاك نەوشیروانی جێگری سـکرتێری گشتی ئەوسای یەکێتیو هاوڕێی دێرینی پێشمەرگایەتیو حیزبایەتی کـاك کۆسـرەتو سەرکردەی ئێستای گردەکەو گۆڕان!.

مێژووی رووداوە سیاسییەکانی کوردستانی عێراق، مێژوویـەکی نزیکـەو دوور نییـە، هـەتا مـەرامی چەواشـەکردنی راسـتییەکان بـۆ میللـەتێکی یـادەوەریی لاواز، بەهەڵـەداوان، بکرێتـە ئامـانج. بۆیـە زۆرن ئەوانـەی بێخوێندنـەوە دەزانـن چـۆن بەکاندیدکردنی کاك کۆسـرەت بـۆ پۆسـتی سـەرۆك وەزیرانـی حکومـەتی هـەرێمی کوردسـتان (کابینـەی دووەم) سـەرکردایەتی یـەکێتیو بەتایبـەت مـام جـەلال لەپڕکردنـەوەی ئـەو بۆشـاییەی کـە بـەهۆی کـەنارگیربوونی کـاك نەوشـیروانەوە کەوتبووە نێو ریزبەندی هەرەمی یەکێتییـەوە، بەئاگاییـەکی زۆرەوە مامەڵـەی کـرد. چونکە ئەگەر ئەم رووداوە ئەرێنییە یەکێتی جۆشدەرەوە نەبوایـە، بێگومـان باڵانـسی رێکخراوەیی یەکێتی، هەم لەسەر ئاستی نێوخـۆیی رێکخراوەیـی خـۆی، بەتـەواوەتی تێکدەچوو، هەم لەسەر ئاستی کوردستانیش.

لەسەر ئاستی ڕێکخراوەیی‌و نێوخۆی یەکێتی، بوونی کاك کۆسرەت بەسەرۆك وەزیران ئەرێنیی بوو، چونکە لەدوای بزرکردنی یەکێك لەڕەمزە دیارەکانی نێو یەکێتی کە کاك نەوشیروان بوو، دەبوو وەکو دیفاکتۆێکی ڕێکخراوەیی، ڕەمزێکی دیکە لەنێو یەکێتی لەدایك ببوایە. بێگومان دروستبوونی ڕەمزەکانی نێو یەکێتی بەبڕیاری ڕێکخراوەیی‌و گەلەکۆمەکێی تەکەتولبازان دەستەبەر ناکرێت، بەتایبەت لەنێو ڕێکخراوێکی فرەجەمسەری وەکو یەکێتیدا. هەربۆیە دەبینین کاتێك پرۆسەی بەسنبولبوونی کاك کۆسرەت لەنێو یەکێتی لەپرۆسەیەکی مێژوویی ساغلەمداو بەشێوەیەکی خۆڕسك دەورانی ڕێکخراوەیی خۆی تەواو دەکات‌و بەسنبولبوونی کاك کۆسرەت دەکات بەدیفاکتۆری ڕێکخراوەیی نێو یەکێتی، مام جەلال‌و یەکێتی پەنا بۆ کاك کۆسرەت دەبەن‌و بۆ پۆستی سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستانی کاندید دەکەن‌و بەمەش یەکێتی بەشێوەیەکی لۆژیکییانە دەتوانێت ڕێ لەو هەژاندنە نەرێنییە بگرێت کە چاوەڕێ دەکرا یەکێتی ڕووبەڕووی ببێتەوە، بەهۆی ڕاخزینی ڕەمزو ئەستێرەیەکی سیاسی نێوی، کە کاك نەوشیروان بوو. لێرەدا کاك نەوشیروان بۆ حیزبەکەی وەکو دەستێکی شکاو وابوو هەرگیز جێگەی خۆی نەگرتەوە.!

لەسەر ئاستی کوردستانیش هەبوونی کاك کۆسرەت لەپۆستی بەرزی سەرۆك وەزیراندا، بۆ یەکێتی ئەرێنیی بوو، چونکە یەکێتی لەسەر دەستی کاك کۆسرەت توانی ئەو بالانسە نەك ڕابگرێت، بەڵکو بەلای خۆشیدا پارسەنگی بکاتەوە، بەتایبەت لەهەولێر، یەکێتی توانی بنکە جەماوەرییە بەرینەکەی خۆی بەشێوەیەکی خێرا بەرینتر بکات، بەجۆرێك ئەگەر شەڕی براکوژیی نەبوایەو حکومەت دووکەرت‌و هەرێم دابەشی دوو ناوچەی حوکمڕانیی (سەوزو زەرد) نەکرابایە، کاك نەوشیروان دەزانێت هێشتا تەرازووی قورسایی پارسەنگە کوردستانییەکەی یەکێتی لەسەر دەستی کاك کۆسرەت لەشوێنی دیکە دەبوو. ڕاستە دارستانی گردەکە چڕە، بەڵام با کاك نەوشیروان هەوڵی بێهودە نەدات، چونکە ئاوێنەی گەورەو بێگەردی ئەم حەقیقەتە لەبیرەوەرییەکانی ئەوێندەرێدا ناشاردرێتەوە!.

**مەلا بەختیار : نەوشیروان مستەفا بچوکترین کێشە ناخاتە ئەستۆی من**

مەلا بەختیار لەسەر نوسینەکانی نەوشیروان ئەمڕۆ ٧,١٢,٢٠٠٩ وتارێکی بڵاوکردەوە بەناونیشانی ""من" لەحەوت وتارەکەی "ئەو"دا، ناوبراو لەو وتارەدا ئاماژە بەوە دەکات کەیەکێکە لەو کەسانەی کەبەدوور بووە لەکێشەکانی ناو یەکێتی وەك زۆر کەس وای بۆ دەچوون مەلا بەختیار کێشەی سەرەکی نێوان نەوشیروان مستەفاو تاڵەبانی و یەکێتی بوبێت، بەو بەڵگەی کەلەنوسینەکانی نەوشیروان مستەفادا کەمترین باسی مەلا بەختیار هاتووە.

ئەمەش دەقی وتارەکەی مەلا بەختیارە:

لەم هەفتەیەدا، سەرۆکی کۆمپانیای وشە، حەوت یاداشتە وتاری لەسایتی سبەیدا بڵاوکردەوە. تیایدا، بەتایبەتی سەرگوزەشتەی پەیوەندی خۆی‌و مام جەلال‌ بیروبۆچونەکانی لە دامەزاندنی حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە، هەتا ئەمڕۆ، هەروەها هەڵوێستی بەرامبەر بە هەڤاڵ کۆسرەت رەسوڵ عەلی، رونکردۆتەوە. لەدوتوێی وتارەکانیشیدا، باسی (بەستەزمانەکانی ئەندامانی مەکتەبی سیاسیشی، بەخۆی‌و ئەوانەی سەر گردەکەش) کەموزۆر کردوە..

من لەم وتارەدا، جارێ نامەوێ لەسەر ئەو بۆچونانە، بیروبۆچونی خۆم دەربڕم. چونکە لەم ناکۆکی‌و ململانێیەدا بیروبۆچون‌و پێشبینیەکانم بۆ روداوەکان، لەکۆبونەوە تایبەتەکان‌و راگەیاندنە گشتیەکاندا، دوای ئەوەی رێکخستنیان لەناو رێکخستندا دروستکرد، ئاشکران. نە گومانم لە هاتنەدی ئەم روداوانەدا هەبو، نەگومانیشم لەروداوی تریش هەیە کە بەرێوەن. تەنها دەمەوێت، خۆم لە هەر حەوت وتارەکەدا، چۆنی لەسەر نوسیوم، لەگەڵ ئەو هەمو پڕوپاگەندەی ریفۆرمچیەکان‌و گردەکەی وشە لەدژی من لەدوو ساڵی رابردودا کراوە، بەراورد بکەم.

پێموایە ئەوەی دوورونزیك ئاگای لە کێشەکانی ناو یەکێتی هەبێت، باش دەزانن کە

نزیکەی دوو ساڵە، سەرەنجامی قوڵبونی کێشەکانی ناو یەکێتیو دەرەوەی یەکێتیش، بەشێکن لەو کەسانەی کەوتبوە بەر شاڵاوی پڕوپاگەندەیەکی بێئەمانی کۆمپانیای وشە، چ بەئاشکراو چ بەنهێنی بەندەبو. ئەمە لەکاتێکدا من بۆ ساغبونەوەی ڕاستیەکان بەوتاری ڕەسمی داوای مونازەرەی ئاشکرام لەسەرۆکی کۆمپانیای وشە کرد، ڕازی نەبو. بەڵام پڕوپاگەندە پەیتا پەیتا دژی من بڵاودەکرایەوە، لەژێر کاریگەری ئەو پڕوپاگەندانە، بەسەدان هاوڕێو دۆستو هەڤاڵی خۆم، دڵسۆزانە پێیان دەگوتم: کۆمپانیای وشە خەریکە بەشێکی زۆری ئۆباڵی ئەم کێشانەی هەناوی یەکێتی دەخەنە ئەستۆی تۆ. بۆیە، وریای ناکۆکیەکانو سەرەنجامەکانی بە. منیش هەمیشە وەڵامم وابو، ئەم پڕوپاگەندانەی دژم بۆ ئەوەیە منیش پشتێنی لێبکەمەوەو بەرگری لە یەکێتی نەکەم. دەنا خۆیان باش دەزانن ڕەگوریشەی کێشەکان، بۆ سەردەمی مفاوەزانی ١٩٨٥و کێشەکانی بەرپابونەوەی شەڕو سەردەمی ئەنفالو بۆچونە سیاسیە جیاوازەکان بەرامبەر ڕژێمی عێراق بو. نەك مەسەلەی گەندەڵیو ئەو گرفتانەی ئێستا لە ئارادان. زۆریش نابا ئەم ڕاستیانە دەردەکەون. خۆشبەختانە هەڤاڵ کۆسرەت لەوەڵامەکەیدا هەمان ئەم ڕاستیانەی دوپاتکردۆتەوە.

کورد جوانی وتوە کە وتویەتی: کورد بدوێنە خۆی شەرعی خۆی دەکات. پێموایە سەرۆکی کۆمپانیای وشە، لەم حەوت وتارەدا، کە بەناوی (لەنێوان مام جەلالو مندا) لە ١٩٩١ەوە هەتا ٢٠٠١ نوسیویەتیو تیایدا لە ١٨ ساڵی ڕابردودا گەڕاوەتەوە بۆ ڕەگوریشەی کێشەکان، جارێکیان نەبێ، باسی کۆبونەوەیەکی خۆیو مەکتەبی ڕێکخراوە دیموکراتیەکانو من دەکات. ئەگینا لەرۆژژمێری ١٨ ساڵەی کێشەکاندا، کە لەوتارەکەیدا باسیان دەکات، کێشە بەکێشەو هەڵوێست بەهەڵوێستو ناکۆکی بەناکۆکی لەروانگەی خۆیو دوای جیابونەوەیان دەیانخاتەڕو، دوورونزیك بەرپرسیارێتی بچوکترین کێشە لەو ساڵانەدا، کە گوایە بوەتە مایەی دورکەوتنەوەی لە یەکێتی، ناخاتە سەر من. ئەمەش باشترین بەرپەرچدانەوەی تەواوی ئەو پڕوپاگەندانەیە کە لە دوو ساڵی ڕابردودا، بەشێکیان بەئاراستەی سەرۆکی

دەبیانی وشەو زۆربەی پڕوپاگەنـدەکانیش لـەرق‌و کینـە و بەغیلیـەوە، دژی مـن بەروەکرانەوە.

ئێستا بۆم هەیـە بپرسـم: هـەمو ئەوانـەی کاراکتـەری ئـەم شـانۆگەریە کۆمیدیـەی پڕوپاگەندەی نابەجێی ئەقڵیەتی سیاسی رۆژهەڵاتی بون، لەم هـەموو پڕوپاگەندەیـەی بەنارەوا دەیانکردن، ئاخۆ بلێی ویـژدانیان هانیـان بـدا بـچوکترین رەخنـە لـەخۆیان بگرن‌و بەو عەقڵیەتە سەلەفیەدا بچنەوە؟ هیوادارم وابێ. هەرچـەند گومـانێکی زۆرم هەیە وابکەن. چونکە لـە بنەچـەدا ئـەو رێبـازەی گرتویانەتەبـەر، هێنـدەی لەسـەر قۆسـتنەوەی سـایکۆلۆجیەتی نـارەزایی خـەڵك بینایـان کـردوە، زۆر لــەوە کـەمتر مەسەلـەی سیاسی‌و فکری تیایە. ئەویش بە گولاجی سیاسـی پێکـەوەیان نـاون. نـەك وەکو پێویستیەکی بابەتی.

## یەکێتی ویستی لە پلنیۆم دا نەوشیروان مستەفا بکوژێ!
## ڕێگا مەگەزین:

نەوشیروان مستەفا لە (٢٠٠٩/١١/٢٥) لەماڵپەڕی سبەی کەزمانحاڵی کۆمپانیای وشەیەو ماڵپەڕێکی ئەکتیڤە، بە (٧) ئەڵقە لەژێر سەردێڕی (لەنێوان مام جەلال و مندا، ئازاری ١٩٩٩- شوباتی ٢٠٠١) باس لەمێژووی وردی گەڕانەوەی خۆی بۆ کوردستان و ئەو قۆناغانە دەکات کەتێیدا کوردستانی بەجێهێشتووە، جگە لەوە هەموو ململانێکانی ناو یەکێتی نیشتمانی و خودی تاڵەبانی و کۆسرەت ڕەسوڵ و ئەندامانی مەکتەب سیاسی بەبەڵگە باس دەکات، ئەمە یەکەمجارە نەوشیروان مستەفا ئەم مێژووە وردە ئاشکرا بکات، هەندێك پێیان وایە مام جەلال لەپلنیۆمی چوارەمی یەکێتی زۆر بەتوندی هێرشی کردە سەر مێژووی نەوشیروان مستەفا لەناو یەکێتی و خەباتی ڕزگاریخوازی گەلی کورداو هەوڵیدا بەو وتارە ئاگرینانەی نەوشیروان مستەفا بکوژێ، کوشتنێك کەنەتوانرێ وەك سیمبوڵ و ڕەمزێکی شۆڕش چاوی لێبکرێ، بۆیە نەوشیروان مستەفا کەسەردەمانێکی زۆر هەڵی سوری یەکێتی بووا! ئێستە هەوڵی کوشتنی دەدرێ، کوشتنێك کەوای نیشان دەدەن ئەم کەسایەتیە هۆکاری کارەساتی هەڵەبجە بووەو ئاشبەتاڵی بەشۆڕش کردووەو لەگەڵ سەدام پێکهاتووەو زۆر شتی تریش کەلەپلنیۆم و لەلێدوانی سەرکردەکانی تری یەکێتیدا بەرامبەر بەنەوشیروان مستەفا بەدی دەکرێ، وەك ئەوەی مەحمود سەنگاوی و شێخ جەعفەر شێخ مستەفا لەسەرکردایەتی یەکێتی بۆ سایتی چاودێری زمانحاڵی مەکتەبی ڕێکخراوە دیموکراتیەکان دەڵێن "ئەوە نەوشیروان مستەفا خۆی بووە کە ئەو تەنازولەی بۆ حکومەتی بەعس کردووە، ئەو قسەیە ڕاست نیە کە نەشیروان مستەفا بیڵێت، هەموو لایەك دەزانێت لەم عێراقە گەورەیەدا تەنها کەس کە عەفوو نەکرابێت لەلایەن سەدام حسینەوە تەنها مام جەلال بووە.

سەبارەت بەو قسەیەی نەوشیروان مستەفا کە دەڵێت نەمووچە وەردەگرمو نە

[illegible]ینش كراوم‌و نه‌موچه‌ی حزبیش وه‌رده‌گرم، مه‌حمود سه‌نگاوی وتی: خۆزگه به‌هه‌موو ته‌مه‌نی مووچه‌ی خانه‌نشینی وه‌ربگرتایه، به‌ڵام ۱۰ ملیۆن دۆلاری یه‌كێتی نیشتمانی كوردستانی نه‌بردایه، ئه‌گه‌ر حسابی بكه‌ین نه‌شیروان مسته‌فا هه‌موو مانگێك ۵۰ هه‌زار دۆلار وه‌ربگرێت، ئه‌وا ته‌مه‌نی ناگاته ئه‌وه‌ی كه ئه‌و ۱۰ ملیۆن دۆلاره ته‌واو بكات.

ئه‌ندامی سه‌ركردایه‌تی یه‌كێتی نیشتمانی كوردستان وتیشی: نه‌وشیروان مسته‌فا ئه‌گه‌ر موچه‌ی خانه‌نشیش وه‌ربگرێت وه‌ك پێشمه‌رگه‌یه‌ك هه‌قی خۆیه‌تی، به‌س ئه‌و ۱۰ ملیۆن دۆلاره‌ی یه‌كێتی نه‌بردایه ئه‌بێت ئه‌وه‌ی له‌بیر بێت.

هاوكات شێخ جه‌عفه‌ر شێخ مسته‌فا له‌باره‌ی ئه‌و قسانه‌ی كه نه‌وشیروان مسته‌فا كردی له‌سه‌ر موچه تایبه‌ت به سایتی چاودێر وتی: یه‌كێك ئه‌گه‌ر گه‌وره‌ترین میزانیه‌ی حزبی له‌به‌ر ده‌ست بێت‌و به‌ئاره‌زووی خۆی سه‌رفی بكات، مووچه‌ی بۆچیه؟." بۆ نه‌وشیروان مسته‌فا ناچار بووه ئه‌م ڕاستیانه بدركێنێ و ڕێگا مه‌گه‌زینیش به‌پێویستی زانی ئه‌و نوسینانه ته‌نها له‌ئینته‌رنێتدا نه‌بن:

نه‌وشیروان مسته‌فا بۆچی له ۳ قۆناغی ناسكدا كوردستانی جێهێشت؟

له‌دوای ڕاپه‌ڕین، سێ جار، هه‌ر جاره‌ی بۆ ماوه‌یه‌ك، له‌سێ قۆناغی ناسك دا كوردستانم به‌جێهێشت بوو:

جاری یه‌كه‌م، له‌رۆژانی گفتوگۆی به‌ره‌ی كوردستانی– به‌عس دا.

خولی یه‌كه‌می گفتوگۆ (۲۰ – ۱۹۹۱/٤/۲۸) مام جه‌لال ڕابه‌ریی كرد منی له‌گه‌ڵ نه‌بوم.

خولی دووه‌می گفتوگۆ (۵/۷ – ۱۹۹۱/٦/۱۷) كاك مه‌سعود ڕابه‌ریی كرد منی له‌گه‌ڵ بوم.

زیاتر له‌مانگێ له‌به‌غداد ماینه‌وه دوای گه‌ڕانه‌وه‌مان بۆ كوردستان من بڕیارم دا كوردستان به‌جێبهێڵم. له‌سه‌ر سێ مه‌سه‌له‌ی سه‌ره‌تایی له‌گه‌ڵ مام جه‌لال و هه‌ندێ له‌ئه‌ندامانی مه‌كته‌بی سیاسی ناكۆك بوم:

یەکەم، جۆری بەڕێوەبردنی یەکێتی و گۆڕینی لەچەند ڕێکخراوێکی بێ سەروبەرەوە بۆ حزبی دەزگا و دامەزراو. ئەمەیان ئەگەڕایەوە بۆ ڕۆژانی شەڕی یەکەمی خەلیج.

دوەم، جۆری بەڕێوەبردنی پێوەندی لەگەڵ پارتی.

سێیەم، جۆری بەڕێوەبردنی گفتوگۆ لەگەڵ بەعس.

نەم ئەویست کێشەی ناوخۆ، کە شەڕی خۆبەخۆی چەکداری لێ دروست ئەبو، بۆ یەکێتی دروست بکەم بە تایبەتی لەو کاتەدا لەلایەکەوە گەڕانەوەی بەعس و لەلایەکی ترەوە زاڵبونی پارتی و بزوتنەوەی ئیسلامی هەڕەشەیان لێ ئەکرد. بڕیارم دا سەرکردایەتی یەکێتی و کوردستانیان بۆ بەجێبهێڵم خۆیان بێ مشتومڕ و بەربەرەکانی بەڕێوەی بەرن. بە بێدەنگی لەدەروازەی ئیبراهیم خەلیلەوە چوم بۆ تورکیا و لەوێوە بۆ لەندەن.

جاری دوەم، دوای ئەنجامدانی هەڵبژاردنی گشتی (١٩/٥/١٩٩٢)

بەر لەبەستنی یەکەمین کۆنگرەی گشتی یەکێتی (١/٢٧ – ١٤/٢/١٩٩٢) بە چەند ڕۆژێ گەڕامەوە کوردستان بە هیوای ئەوەی کێشە سیاسیەکانی ناو یەکێتی لەناو کۆنگرەدا بەلادا بخەین. هەندێ لەهاوڕێکانم، بۆ دابین کردنی دەسەڵات و پلەو پایەی تایبەتی خۆیان، لەکۆنگرەدا فێڵیان لێ کردم و دەستیان بڕیم. کێشەکان بە چارەسەرنەکراوی مانەوە، بەڵکو قوڵتر بون.

هەڵبژاردنی گشتی بۆ یەکەمین پارلەمانی کوردستان لەبەردەمدا بوو. پارتی و یەکێتی لەململانێیەکی سەختدا بون. ئەمجارەش نەمویست کێشەی ناوخۆ دروست بکەم، هەمان مەترسیە ناوەکی و دەرەکیەکان مابون و گەورەتر بوبون. ئەوەی لەتوانامدا بوو، لەپرۆپاگاندە و کۆبونەوەی جەماوەری و نوسینی وتار و پشتیوانی لەکاندیدەکان تەنانەت ئامادەکردنی بەرنامەی هەڵبژاردن، بۆ ئەنجامدانی هەڵبژاردن و پێکهێنانی یەکەم حکومەتی کوردستان کردم. ئەنجومەنی نیشتمانی کۆبوەوە (٤/٦/١٩٩٢) و پۆستی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران بە یەکێتی سپێردرا (٤/٧/١٩٩٢) د.فوئاد مەعسوم بوو بە سەرووەزیر. قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی یەکێتی

...وه تا کفری درێژ ئەبووەوە. ئەمجارەش بە بێدەنگی لەدەروازەی ئیبراهیم خەلیلەوە چوم بۆ تورکیا و لەوێوە بۆ لەندەن.

جاری سێیەم، پاش گەرمبونی شەڕی یەکێتی و پارتی.

کە شەڕی یەکێتی و بزوتنەوەی ئیسلامی هەڵگیرسا و، دوای ئەوەش شەڕی یەکێتی و پارتی دەستی پێ کرد، زیاتر لە١٦ مانگ بوو من لەلەندەن دانیشتبوم و دور بوم لەدەزگای بڕیاردانی ناو یەکێتیەوە. خۆم دور ڕاگرتبوو لەکاروباری یەکێتی.

مام جەلال بۆ گەشتی سیاسی هات بو بۆ ئەوروپا. بە تەلەفۆن داوای لێ کردم منیش لەگەڵی بم. بە بیانوی جیاجیاوە ئەمویست خۆم لەو ئەرکە ببوێرم. دوای سەردانی فەرەنسە و ئەڵمانیا هاتە لەندەن. روی لێ نام کە ئەگەر بۆ هاوڕێیەتیش بێ لەگەڵی بچم بە تایبەتی کۆبونەوەیەکی سۆسیالیست ئینتەرناسیۆنال لەتۆکیۆ هەبوو.

لەگەڵی چوم بۆ ئیسپانیا گەلێ کەس و حزب و کاربەدەستمان بینی، خۆمان ئامادە کردبوو بچین بۆ ژاپۆن شەڕی یەکێتی و پارتی لەقەڵادزەوە دەستی پێ کرد(١٩٩٤/٥/١) و بە خێرایی تەنیەوە بۆ رانیە و بادینان و سلێمانی. مام جەلال ئەبو بگەڕێتەوە بۆ کوردستان منیش، وەك مەسەلەیەکی ئەخلاقی، نەمئەتوانی خۆم لەم گەڕانەوەیە بدزمەوە ناچار لەڕۆماوە لەگەڵی چومە سوریا و لەوێوە بۆ تورکیا و بە کۆپتەری تورکی ڕاستەوخۆ بۆ هەولێر (١٩٩٤/٦/٢). یەکێتی لەبادینان و پارتی لەسلێمانی دەرکرا بون. بەڵام هێشتا هەولێر پایتەختی حکومەتی هەرێم بە تێکەڵاوی بە دەست هێزەکانی یەکێتی و پارتیەوە بوو.

زۆری ئەو ماوەیە من خەریکی گفتوگۆ بوم لەگەڵ نوێنەرانی پارتی. بۆ ئەو مەبەستە سەفەری ئێران و تورکیا و فەرەنسا و ئیرلەندەم کرد. بۆ ئاگادارکردنەوەی رای گشتی کورد لەرەوتی گفتوگۆکان چەندین وتارم نوسی و بڵاو کردەوە. لەئاسۆی نزیکدا هەلی ئاشتبونەوەی یەکێتی و پارتیم نەئەبینی. هەلومەرجی ناو یەکێتیش " هەمان تاس و هەمان حەمام" ی جارەکانی تر بوو، نەمئەویست کێشەی ناوخۆ بۆ یەکێتی دروست بکەم دیسان بە بێدەنگی بۆم بەجێهێشتن

نەوشیروان مستەفا چۆن گەڕایەوە کوردستان؟

نەوشیروان مستەفا پاش ئەوەی بڕیاری گەڕانەوەیدا بۆ کوردستان وەك خۆی دەڵێ "ئەم جارەیان کە بڕیاری گەڕانەوەم دا، یەکێتی لەهەولێر، پایتەختی هەرێم، دەرکرابو. حکومەتەکەی و مەکتەبی سیاسیەکەی و سەرکردایەتیەکەی و فەرماندەکانی بە ئاوارەیی لەسلێمانی بون.

نەوشیروانە دەگاتە تاران و ئاگاداری کەسی نەکردۆتەوە بەڵام لەسەفەرەکەیدا دلێری سەید مەجیدیش لەلەندەنەوە هاتۆتەوەو پێکەوە بوون نەوشیروان دەڵێ "لەگەڵ دلێر رێککەوتم من لەتاران بمێنمەوە. ئەو بۆ گەیاندنی پەیامێکی من سەردانی مام جەلال بکا لەقەڵاچوالان. وەڵامی پەیامەکەم بۆ بهێنێتەوە بۆ تاران. ئەوسا بڕیار بدەم بڕۆمەوە بۆ کوردستان یان بگەڕێمەوە بۆ لەندەن.

پەیامەکەم ئەمە بوو: من ئەگەڕێمەوە بۆ کوردستان. بە تەما نیم هیچ پلەو پایەیەك لەیەکێتی و لەحکومەتدا وەر بگرم. ئەمەوێ لەکوردستان بژیم و پشتیوانی ئەو ئەبم. نامەوێ پێشوازی حزبی یا حکومەتی بکرێم. ئەمەوێ بە بێدەنگی بێمەوە. ئەگەر بەوجۆرە رازیە ئەگەڕێمەوە ئەگەرنا بلیتەکەم بۆ دوسەرە ئەگەڕێمەوە بۆ لەندەن. ناوەرۆکی پەیامەکەم رەنگدانەوەی ناخی دڵم بوو.

دلێر لەلای مام جەلالەوە هاتەوە تاران. وتی مام جەلال ئەڵێ وڵات وڵاتی خۆیەتی خۆی چۆن حەز ئەکا وا ئەکەین. بەڵام نە ئەوەی ئەو داوای کردوە و نە ئەوەی من بە تەمای بوم. کە هاتەوە با ماوەیەك میوانی من بێت."

مام جەلال نامەیەك بۆ نەوشیروان دەنوسێ کەتێیدا هاتووە "زۆر بە گەرمی بەخێرهاتنەوەتان دەکەم بۆ کوردستانی رزگار کە لەسەرەتای ژیانتەوە لەبۆی خەباتت کردوەو هیچیشت لەژیان و خۆشی و فیداکاری لێ چاو نەبوە و لێت نەگرتۆتەوە. پڕ بەدڵیش شاد بوم و لەناخی دڵەوە گەشامەوە، بەوەی کە بڕیارتان داوە لەپەنا و لەگەڵ برای دێرینی خۆت درێژە بەو خەباتە بدەیتەوە کە هەموو لاوێتیت لەسەر داناوە، بە راستی یەکێك بووە لەخەبەرە هەرە خۆش و

دەسەڵاتدارەکان."
ڕۆژی ١٩٩٩/٣/١٥ لەکرماشانەوە بە ئۆتۆمۆبیل بۆ دەروازەی پەرویز خان و لەپەرویز خانەوە بۆ قەڵاچوالان، وەکو مام جەلال دای نابوو، نەوشیروان گەیشتەوە کوردستان.

نەوشیروان مستەفا نهێنیەکانی ناکۆکی مەکتەب سیاسی ئاشکرا دەکات

نەوشیروان مستەفا لەو نوسینەیدا کە حەوت بەشە، دەنوسێ "کۆسرەت ڕەسول جەبار فەرمان، عومەری سەید عەلی، قادری حاجی عەلی، ئەرسەلان بایز، عومەر فەتاح، محەمەد تۆفیق ڕەحیم، جگە لەمان کە پاشماوەی ئەندامە هەڵبژێردراوەکانی کۆنگرەی یەکەمی یەکێتین، فەرەیدون عەبدولقادر و عومەری حاجی عەبدوڵا، کە لەکۆنگرەی یەکەمدا وازیان هێنا بوو، مام جەلال هێناونیتیەوە بۆ ناو (م.س).
هەروەها:
شێخ محەمەدی شاکەلی، ڕەسول مامەند، لەدوای کۆنگرەی یەکەم مام جەلال لەئەنجامی ڕێککەوتنێکی سیاسی‌دا لەگەڵ بەشێکی حزبی سۆشیالیست دا هەردوکیانی هێناوەتە ناو (م.س). کاك ڕەسول کۆچی دوایی کرد. شێخ محەمەد ماوەتەوە.
مەلا بەختیار، عیماد ئەحمەد، لەدوای کۆنگرەی یەکەم مام جەلال لەئەنجامی ڕێککەوتنێکی سیاسی‌دا لەگەڵ بەشێکی حزبی زەحمەتکێشان هەردوکیانی هێناوەتە ناو (م.س).
بەندەش، کە لەکۆنگرەی یەکەم دا لەسەر داوای مام جەلال لەگەڵ د فوئاد مەعسوم و د کەمال فوئادا بێ ئەوەی بە فیلتەری هەڵبژاردندا تێ بپەڕین، بە بیانوی ئەوەی لەدەستەی دامەزرێنەر بوین، بۆ ئەندامەتی سەرکردایەتی بە چەپڵەڕێزان هەڵبژێردراین.
مام جەلال زیرەکانە مەکتەبی سیاسی داناوە. ئەوانە چەند دەستەبەند و کەسایەتی

دەزانن به دەگمەن هەموویان لەسەر کێشەیەك ئەتوانن پێك بێن. هەمیشە پێویستیان بە مام جەلال ئەبێ بۆ ئەوەی هاوسەنگی‌یان لەنێواندا رابگرێ. ئەگەر ئەو نەبێ رەنگە نەتوانن ئێوارەیەك، لەهیچ بۆنەیەك دا شایی بێ یا شیوەن، پێکەوە کۆ ببنەوە. کۆسرەت و جەبار ناکۆکن. هەر کەسەیان دارودەستەی خۆی هەیە. هەرکەسەیان ئەیەوێ پێگەی خۆی بەهێز و ئەوی تر لاواز بکا. کۆسرەت کار ئەکا بۆ ئەوەی هەروەك کەسی یەکەمی حکومەتە، ئاوەهاش ببێتە کەسی یەکەمی یەکێتی.

کەمال فوئاد و فوئاد مەعسوم و عومەر فەتاح و ئەرسەلان بایز، شێخ محەمەدی شاکەلی و مەلا بەختیار و عیماد ئەحمەد، لەناو رێکخراو و کادرەکانی یەکێتی‌دا پێگە و پشتیوان و لایەنگریان کەمە. مام جەلال دەستی گرتون و ئەوانیش دەستیان بە مام جەلالەوە گرتوە، لەهەموو شتێك دا پشتی ئەگرن.

لەم کاتەدا کە نەوشیروان مستەفا دوو شەو لەقەڵاچوڵان دەمێنێتەوە وەك ناوبراو نوسیویەتی "کۆسرەت و جەبار پێیان وایە من لەسەر داوای مام جەلال و بۆ پشتیوانی لەو لەبەرامبەر ئەواندا هاتومەتەوە و، ئەو چەند رۆژەی میوانی ئەو بوم لەقەڵاچوالان خەریکی دانانی نەخشە و پیلان بوین دژی ئەوان. زۆر بە توندی کەوتنە دژایەتی من."

دوای یەکەم کۆبونەوەی لەگەڵ تاڵەبانی، نەوشیروان لەکوێوە دەستی بە ریفۆرم کرد؟

ئەو لەنارزایەتی خەڵکەوە دەستی پێکردووە کاتێك بۆ بەخێرهاتنەوە سەردانین کردووە، جگەلەوە زۆرینەی سەرۆك حزبەکانی بینیوە، کەوتۆتە هەوڵی چاکسازی، وەك دەنوسێ "

نیوەڕۆی (٩/ ٤/ ١٩٩٩) مام جەلال و زوربەی ئەندامانی (م.س) میوانی کۆسرەت بوین. دوای هاتنەوەم بۆ سلێمانی ئەوە یەکەمین جار بو لەگەڵ مام جەلال یەکتری

بیبینەوە.مام جەلال وتی: بۆ بەخێرهاتنەوەت و بۆ ئەوەی هەندێ قسە بکەین ئێوارە [illegible]ەردانت، ئێوارەکەی هات و بە دو قۆڵی لەماڵەکەی خۆمان دانیشتین.
لەدوای گەڕانەوەم بۆ کوردستان ئەمە یەکەمین جار بو پێکەوە بۆ باسی سیاسی کۆ ببینەوە.
وتی "ئەوە چەند ڕۆژێکە گەڕاویتەوە سلێمانی، حەساویتەوە، خەڵکی زۆرت بینوە، ئیستا ئەڵێی چی؟"
وتم "ئەو ماوەیەی هاتومەوە زۆر کەس هاتون بۆ لام، بواری کەسم نەداوە ماڵەکەم بکا بە دیواخانی هێرش بۆ سەر یەکێتی و سەرکردەکانی، بەڵام هەندێ شتم لەقسەکانیان دەرهێناوە. شوێنی تۆ لەناو خەڵك دا بەهێزە و چاوەڕوانی ئەوەن ئەو بژارەی دەستت پی کردوە بە ئەنجامی بگەیەنی. ئەوەی من بۆم ساخ بۆتەوە خەڵك لەدو شت زۆر ناڕازین:
یەکەمیان، ئەو جیاوازییە گەورەیەی لەنێوان ژیانی کاربەدەستانی یەکێتی و خەڵك دا هەیە.
دوەمیان، ئەو فەسادە زۆرەی لەم حکومەتەدا دروست بوە، هیچ ئیشێ بێ واسیتە و مەحسوبیەت، ناڕوا. فەساد لەسەرکردایەتی یەکێتی دایە، ئەگەر هەمو کادرەکانی ناوەڕاست و خوارەوەش لابرێ ئەگەر دەسکاری سەرەوە نەکرێ هیچ سودێکی نیە.
خەڵك ئەپرسن:
مام جەلال خۆی دز نیە ئەی بۆچی دزی لەمانە قبوڵ ئەکا؟
مام جەلال خۆی داوێنپیس نیە ئەی بۆچی داوێنپیسی لەمانە قبوڵ ئەکا؟
مام جەلال خۆی پیاوێکی قانونیە بۆچی بێ قانونی لەمانە قبوڵ ئەکا؟
تۆ کەسی یەکەمی، ئۆباڵی مێژویی لەئەستۆی تۆدایە، ئەگەر حوکمڕانی یەکێتی باش و سەرکەوتو بێ پاشەڕۆژ ستایشی تۆ ئەکەن و ئەگەر خراپ و شکستخواردو بێ قسە بە تۆ ئەڵێن..."
پێشتر چەند جارێ بەر لەوەی کوردستان بە جێ بهێڵم و دوای ئەوەش چەند جارێ

لەئەوروپا بە راشکاوی ئەم بابەتانەم لەگەڵ باس کرد بو، هەموو جار بەڵێنی دنی ئەدا بەڵام هیچ جارێ بە جێی نەئەهێنا.



قسەکانی منی بە دڵ نەبو، حەزی نەئەکرد باسی لایەنە رەشەکانی دەسەڵاتی یەکێتی ببیستێ، حەزی ئەکرد باسی دەسکەوت و سەرکەوتن و لایەنە باشەکانی بۆ بکەم، لەگەڵ ئەوەشدا قسەکانی سەلماند.

وتی: "هەقیانە، تۆش یارمەتیم بدە وەرە بۆ کۆبونەوەکانی (م.س)، چاکیان ئەکەم."

وتم: "ئەگەر تۆ چاکی بکەی من سەرباز ئەبم لەلەشکرەکەدا."

وتی: "تۆ سەرباز نابی جەنەراڵ ئەبی."

کوێر تا ئەمرێ بە تەمای چاوە. منیش ئومێدێکم لەلا زیندو بوەوە، ئەگەرچی زۆر کز و لاواز بو، بەڵام ئومێد بو. پیرەمێرد ئەڵێ: "شەوێ پیاوێ لەبەفرا ما، نەمرد، ئاگرێکی دوری دی..."

نەوشیروان مستەفا باس لەگەندەڵی حکومەتەکەی کۆسرەت دەکات

سیستەمی کاری حکومەتی و حزبی و پێشمەرگەیی لەقەڵەمڕەوی یەکێتیدا بە جۆرێ رێك خراوە هەر لایە بۆ خۆی شتێکی سەربەخۆیە لەوی تر.

کۆسرەت سەرۆکی حکومەت و دەسەڵاتداری یەکەمی ناو حکومەتە.

جەبار فەرمان جێگری فەرماندەی گشتی پێشمەرگەیە، بەڵام دەسەڵاتداری یەکەمی ناو پێشمەرگە خۆیەتی.

مەکتەبی سیاسی قەوارەیەکی روکەشە، پێك هاتوە لەچەند ئەندامێکی بێکار و، چەند بەرپرسی مەکتەب و چەند وەزیرێ.

وەزیرەکان لەکۆبونەوەی ئەنجومەنی وەزیران دا لەکاروباری وەزارەتەکانی یەکتری ناپرسنەوە و هەقیان بە سەر یەکتریەوە نیە.

ئەندامانی (م.س) لەکۆبونەوەکانی (م.س) دا لەکاروباری مەکتەبەکانی یەکتری ناپێچنەوە هەقیان بە سەر یەکتریەوە نیە.

لەسەرو ئەمانەوە کەسێ یا دامەزراوێ نیە هەموویان بە یەکەوە گرێ بدا و

لەکاروبارەکانیان بپرسێتەوە.

ئیم[illegible]ل، سکرتێری گشتی، کە بە بێ‌ی پێڕەوی ناوخۆ بەرپرسی هەموویانە، بە زۆری خەریکی سەفەری دەرەوە و بازرگانی و قۆنتەرات و لیوا تایبەتیەکانی خۆی و کۆبونەوەی فراوانی بێ سودی بەردەم شاشەی تەلەفزیۆنە.

داهاتی حکومەت لەتاریکی تەواودایە جگە لەکۆسرەت و وەزیری دارایی و چەند کارمەندێکی پێوەندیدار کەسی کە نازانێ چەندە و چی لێ ئەکرێ و چۆن سەرف ئەکرێ.

بە فیڕۆدانی دارایی گشتی و پێڕەوی نەکردنی پێوانەی قانونی لەدابەشکردنی وەزیفە و پارە و زەوی و خانو و، پێڕەوی نەکردنی یەکسانی لەرەفتارکردن لەگەل هاوڵاتی‌یاندا بۆتە دیاردەیەکی زەق و دزێوی گەندەڵی بەڕێوەبەرایەتی:

– هەزاران کەس دامەزرێنراون بێ ئەوەی دائیرەکانی حکومەت پێویستی پێ‌یان بێ. هەزارانیان "بەدەر لەرێنماییەکان" واتە بێ ئەوەی مەرجی قانونی‌یان تێ‌دا بێ و بە سەدانیان بە "شەهادەی ساختە" بە پلەی تایبەتی و بەرز دامەزرێنراون.

– سەدان خانوی حکومەتی، کە هەندێکیان خانوی وەزیفەن، دراوە بە کەسانی ناموستەحەق و زۆری تاپۆ کراوە لەسەریان یا فرۆشتویانەتەوە.

– قۆنتەرات دراوە بە کەسانێ کە نە بەڵێندەرن و نە بازرگانن. هەندێ لەمانە قۆنتەراتەکان ئەفرۆشنەوە. لەبەر ئەوەی قۆنتەراتەکە دەستاودەست ئەکا و هەرکەسە بەشە قازانجی خۆی لێ وەرئەگرێ. چۆنایەتی پرۆژەکان خراپ و هەندێکی تەواو ناکرێ.

– هەزاران پارچە زەوی دابەش کراوە بە سەر کەسانی جۆراوجۆردا، بە ناوی پێشمەرگە و کادر و تێکۆشەری دێرین و کەسوکاری شەهید... هەندێکیان بە درۆ ئەو ناوەیان لەخۆیان ناوە و، هەندێکیان خانویەك و پارچەیەك زەوی یا زیاتر و هەندێك بە ناوی خۆی و هاوسەر و مناڵەکانیەوە چەندین پارچە زەوی‌یان وەرگرتوە و فرۆشتویانەتەوە.

– سەدان ملیۆن دینار ئەدرێ بەموبەو و سەدان ئۆتۆمۆبیل بۆ ئەموئەو ئەکڕدرێ بێ ئەوەی هیچ لێپرسینەوە یا چاودێریەکی دارایی بە دواوە بێ.
– دەستی گەندەڵی گەیشتۆتە دەزگا زانستی و قەزاییەکان.
بە سەدان خوێندکار "بەدەر لەرێنماییەکان" لەکۆلێجەکانی زانکۆی سلێمانی و لەخوێندنی باڵای بواری جۆراوجۆر بە "قبول خاص" وەرگیراون و، راگری کۆلێج و سەرۆکی بەشەکان بێ گوێدانە پێوەری زانستی و قانونی دائەنرێن و لائەبرێن.
بە دەیان دادوەر و جێگری داواکاری گشتی، بێ ئەوەی مەرجە قانونیەکانیان تێدا بێ، لەدادگا و دائیرەکاندا دامەزرێنراون.
لەم پاشاگەردانیەدا کە مام جەلال ناوی ناوە "تەخشان و پەخشان" گوێ نەدراوەتە یەکسانی هاووڵاتییان، تەنانەت یەکسانی ئەندامانی یەکێتی، هەمووی لەسەر بنچینەی مەحسوبیەت و مەنسوبیەت بۆ کرینی دڵسۆزی و گوێرایەڵی سودمەندەکانە. ئەو سیستەمی کارەی سەرۆکی حکومەت، کە تەنیا سەرۆکی دەسەڵاتی کارگێری و جێبەجێ کردنە، لەماوەی ٧ ساڵ سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیراندا، دایهێناوە، بناغەکانی بە جۆرێ دارشتوە، گەندەڵی (مەحسوبیەت، مەنسوبیەت، بەدبەکارهێنانی دەسەڵاتی کارگێری ودارایی حکومەت بۆ قازانج و ئارەزوی تایبەتی) کردوە بە نەریتێکی ئاسایی و قانونیی بەرێوەبردنی داوودەزگاکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان – ئیدارەی سلێمانی. حەفتەی چەند جارێ لەگەڵ کۆسرەت یەکتر ئەبینین. پێکەوە ئەچین بۆ گەران و پیاسە و سەردان. چەند جارێ قسەم لەگەڵ کرد، باسی نارەزایی خەڵك و خرابی شێوەی کاری حکومەتەکەیم بۆکرد. شتی وا نەك ناسەلمێنێ، بەڵکو زۆری پێ ناخۆشە باسی ئیسلاح و چاککردن و ریفۆرمی دەزگای کارگێری و رێکخستنەوەی ناو ماڵی یەکێتی و حکومەتی هەرێمی لەگەڵ بکەی. پێی وایە هەموو قسەیەکی لەو بابەتە دژایەتیە لەگەڵ ئەو و هەر چاکسازیەك لەهەر دەزگایەکدا بکرێ پیلانگێرانە لەدەسەڵاتی ئەو."
نەوشیروان مستەفا لە (١٩٩٩/٥/٢٨) یەکەم نامە ئاراستەی مام جەلال دەکات

کەبێکهاتووە لە (٦) خاڵ و هەموو کەموکوڕیەکان دەخاتە بەردەست تاڵەبانی، وەك خۆی نوسیویەتی "زۆر جار کە دەربارەی هەندێ مەسەلەی گرنگ لەگەڵ مام جەلال قسەم ئەکرد داوای لێ ئەکردم رەئی خۆمی بە نوسین بۆ بنێرم بە تایبەتی چونکە من زو زو نەمئەبینی. دوای ئەوەی نائومێد بوم لەوەی بە هاوکاری لەگەڵ کۆسرەت هیچ چاکسازیەك بکرێ پەنام بۆ مام جەلال برد."

نەوشیروان مستەفا بەدوای داهات و سەرفی داهات دا دەگەڕێ

ناوبراو نوسیویەتی "ئەمویست بزانم داهاتی کوردستان چەندە؟ سەرچاوەکانی چین؟ چۆن سەرف ئەکرێن؟

حکومەتی هەرێمی کوردستان بودجەی ساڵانە یا مانگانەی نیە. پشت بە داهاتی رۆژانە ئەبەستێ و بەو پێیە موچەی فەرمانبەران ئەدا و پارەی یارمەتی بۆ ئەم و ئەو سەرف ئەکەن.

هیچ کەس و هیچ دەزگایەك نیە لەسەرو سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانەوە بە حسابات دا بچێتەوە بزانێ چۆن سەرف ئەکرێ.

سەرۆکی ئەنجومەن سەقفێکی دیاری کراوی نیە بۆ سەرفی پارەی رۆژانە و مانگانە، خۆی ئازادە.

لەهەموو بازگە سەرەکیەکانی گومرگدا لەسەر سنورەکان دوای کۆکردنەوەی داهاتی گومرگ بەر لەوەی پارەکە بگوێزرێتەوە بۆ بانك شتێکی داهێناوە بە ناوی (صرف خاص) بە پسولەی تایبەتی پارەکەی بۆ سەرف ئەکرێ بێ ئەوەی بچێتە حسابی بانك یان حکومەتەوە.

هەروەها لەو پارەیەش کە ئەچێتە بانکەوە و ئەخرێتە بەردەس وەزیری داراییەوە بەشێکی لەلایەن سەرۆکی وەزیرانەوە بە پسولەی تایبەتی بێ هیچ رونکردنەوەیەکی هۆی سەرفی، سەرف ئەکرێ.

سەر لەبەیانی (١٩٩٩/٦/٦) لەگەڵ کۆسرەت یەکترمان بینی. پرسیاری جۆری دابەشکردنی داهاتم لێ کرد. وتی:

[illegible]٪ بۆ ئیدارەی گشتی واتە بۆ یەکێتی

٥[illegible]٪ بۆ پێشمەرگە

٣٥٪ بۆ حکومەت

یارمەتی حزبەکان (حکومەت ئەیدا):

٤,٠٨٨,٠٠٠ چوار ملیۆن و هەشتاو هەشت هەزار بەمجۆرە:

٢,٠٠٠,٠٠٠ بزوتنەوەی ئیسلامی

٧٠٠,٠٠٠ سۆسیالیست

٦٠٠,٠٠٠ زەحمەتکێشان

٢٥٠,٠٠٠ پارێزگاران

١٠٠,٠٠٠ دیمۆکراتیخوازان

١٢٨,٠٠٠ هاوپەیمانی

٢٠٠,٠٠٠ حشع

٦٠,٠٠٠ الحزب الوگنی العراقی

٥٠,٠٠٠ کۆمۆنیستی کرێکاری

٣٦,٠٠٠,٠٠٠ (سی‌وشەش ملیۆن) موچەی فەرمانبەران

یارمەتی شەهیدان

٢,٢٥٠,٠٠٠ شەهیدانی شەڕی ناوخۆ (فەرماندەیی ئەیدا)

٢,٠٠٠,٠٠٠ دەزگای شەهیدان ئەیدا

٥٤٣,٠٠٠ حکومەت ئەیدا

کۆسرەت ڕەسوڵ، خەتی سور دەبەزێنێ

نەوشیروان دەربارەی کۆسرەت ڕەسوڵ نوسیویەتی "کۆسرەت بۆ راکێشانی لایەنگر، وەکو بۆ عیماد ئەحمەدی باس کردوە تیۆریەکی هەیە ئەڵێ: "لەشاخ مبادئ، لەشار مصالح". جا بەهۆی ئەو دەسەڵاتە زۆرەی دراویێ و ئەو پارە بێ حسابەی لەبەر دەستی دایە دەستی خستۆتە ناو هەموو داوودەزگا حکومەتی و حزبیەکانەوە. ناو

وەزارەتەکان و فەرمانگەکانی، (م.س) و مەکتەبەکانی، مەڵبەندەکان، هێزەکانی پێشمەرگە، بە گفت و گەف هەوڵی داوە دڵسۆزی و گوێڕایەڵی زۆرترین ژمارەیان دابین بکا.

ژیان سەختە، دەرامەتی موچەخۆر کەمە، پێویستیەکان زۆرن و دابین کردنیان ئاسان نین. ئەم لاوازیەی دۆزیوەتە.

ژمارەیەکی زۆر لەبەرپرسەکانی یەکێتی و پێشمەرگە و حکومەت بۆ بەدەسهێنانی دەسکەوتێکی مادی: پارە، سەیارە، زەوی، خانوو... رۆژانە سەردانی ئەکەن و دڵسۆزی خۆیان دەرئەبڕن.

کۆسرەت بەو پێوەندیەی لەگەڵ کادرەکان و خەڵك دروستی کردوە بایی بووەو لەخۆی گۆڕاوە. خۆی لەمام جەلال بە گەورەتر و بە بەهێزتر ئەزانێ. پێی وایە بە ئاسانی جێگەی ئەوی پێ ئەگیرێتەوە. تەنانەت لەم لا و ئەو لا بە ئاشکرا ئەپرسێ ئەگەر هەڵبژاردن بکرێ لەناو خەڵك دا ئەم دەرئەچێ یان مام جەلال؟ کامیان رەئی زۆرتر ئەهێنن؟

ئەو وتارانەی لەبۆنەی جیاجیادا خوێندویەتیەوە، کۆی کردونەتەوە و لەکتێبێك دا، لەشێوەی ئەو کتێبانەدا کە بۆ ماوتسیتۆنگ و کیم ئیل سۆنگ و سەدام حسێنیان کۆ کردۆتەوە، چاپی کردوە.

مام جەلال لەچەند ساڵی رابوردودا هەموو شتێکی لەکۆسرەت قبوڵ کردوە و چاوپۆشی لەهەموو شتێکی کردوە و ئیستاش ئەیکا، ئەمە نەبێ. ئەمە بەزاندنی خەتی سورە. چونکە هەرگیز بیری لەوە نەکردۆتەوە یەکێکی تر جێگەی بگرێتەوە چ جای ئەوەی جێگەکەی داگیر بکا. لەلای مستەفای سەید قادر وتویەتی: "کۆسرەت سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانە و کارگێڕی مەکتەبی سیاسیە، چی تری ئەوێ؟ شوێنەکەی منی ئەوێ؟ نایدەمێ." بۆ ئەوەی سنورێ بۆ ئەمە دابنێ، لەباتی ئەوەی روبەڕو لەگەڵی بدوێ و بە راشکاوی قسەی لەگەڵ بکا، ئەویش لەلای خۆیەوە کەوتۆتە کار دژی کۆسرەت:

– [illegible] و کۆبونەوە گشتیەکانی دەزگا ڕێکخراوەیی و پێشمەرگەییەکاندا دژی [illegible]گەری و گەندەڵی ئەدوێ و باسی بژار و پاکسازی ئەکا، هەندێ جار بە ئاشکرا و هەندێ جار بە ژێرزارەکی پەنجە بۆ کۆسرەت ڕائەکێشێ. ئەم وتارانە لەکوردستانی نوێ و لەرادیۆ و تەلەفزیۆندا بڵاو ئەکرێنەوە.

– لەچەندین بۆنەدا و، لەبەر چاوی چەندین کەس، باسی ئەوە ئەکا گۆیا "کۆسرەت کرمانجە و خەڵکی شار نیە" کە بە لەهجەی کۆیە ئەم وشەیە بۆ سوکایەتی پێکردنی پایەی کۆمەڵایەتی کۆسرەت بە کاری دێنێ.

– دەستی خستۆتە ناو وەزارەت و دەزگا کارگێڕیەکانەوە. جێگۆڕکێی بە هەندێ لەقایمقامەکان کردوە. لەکاتی کۆبونەوەی ئەنجومەنی وەزیراندا بە بەرچاوی کۆسرەتەوە بە تەلەفۆن قسە لەگەڵ وەزیرەکان ئەکا و تەعلیماتیان ئەداتێ."

نەوشیروان مستەفا لەگەڵ مەلا بەختیار و ئەرسەلان بایز دەگاتە شەڕ

لەگەڵ مەلا بەختیار، بەرپرسی مەکتەبی ڕێکخراوە دیمۆکراتیەکان، چەندین مەسەلەمان باس کرد کە پێوەندی بە ڕێکخراوی پیشەییەوە هەبو. لەمیانەی قسەکاندا پرسیم: ئەو ساڵانەی پێشمەرگە بوین چەند جار کەوتوینەتە تەنگانەوە ژمارەمان کەم بۆتەوە مەترسی لەناوچونمان لەسەر بوە، بەڵام هەرگیز نە کەسمان بە زۆر کردوە بە پێشمەرگە و نە کەسمان بە زۆر هێناوەتە ڕیزی ڕێکخستنەوە. ئیستا کە نە لەتەنگانەداین و نە مەترسی لەناوچونمان لەسەرە، گەنجێ ٦ ساڵ سەرەتایی ئەخوێنێ، ٦ ساڵ ناوەندیو دواناوەندی ئەخوێنێ، ٤ ساڵ لەزانکۆ ئەخوێنێ، کە خوێندن تەواو ئەکا هەزار داڵغە و خەیاڵ و خولیا و ئارەزو لەسەریدایەتی. ئەیەوێ دابمەزرێ موچەیەك وەربگرێ بەشی ژیانی بکا. ئەیەوێ ژیانی خێزانی دامەزرێنێ، ئەیەوێ خانوی هەبێ تیا بژی، ئەیەوێ هاوسەر بگرێ... ئێمە بەو وەزعەوە کە هەمانە ناتوانین هیچ کام لەو پێویستیانەیان بۆ دابین بکەین. کە ئەوە ناتوانین بکەین بۆچی بە زۆر "ئیستیمارەی ئینتیما"ی پێ پڕ بکەینەوە، بەبێ ئارەزوی خۆی بیکەن بە ئەندامی یەکێتی تەنیا بۆ ئەوەی دابمەزرێ.



مەلا بەختیار هەڵچو، وتی: زانیاریەکەت ڕاست نیە. ئێمە بە زۆر کەس ناکەین بە

وتم: زانیاریەکەی من ڕاستە و چەندین بەڵگەم بە دەستەوەیە. ئەو هەر نکولی لێ کرد بۆ ئەوەی نەبێ بە شەڕ، بێ ئەوەی بگەینە هیچ کۆبەندیەك، کۆتاییمان بە کۆبونەوەکە هێنا.

لەگەڵ ئەرسەلان بایز، بەرپرسی مەکتەبی ڕێکخستن و، بەرپرسی ئامادە کردنی کۆنگرە، چەندین مەسەلەی ڕێکخراوەییمان باس کرد، باسی مەڵبەندەکان و مەکتەبەکان، هەڵسەنگاندنی هەمە لایەنەی سیاسەتی یەکێتی، لەمیانەی قسەکاندا پرسیم: ئەندامانی سەرکردایەتی یەکێتی بە تەمان هەتا کەی لەو شوێنانەی خۆیاندا بمێننەوە ڕێگە نەدەن بە ئەندامی نوێ، بە تایبەتی گەنج، بێنە ناو دەزگا سەکردەییەکانەوە.

جەوی کۆبونەوەکە گرژی تێکەوت. بۆ ئەوەی نەبێ بە شەڕ، بێ ئەوەی بگەینە هیچ کۆبەندیەك، کۆتاییمان بە کۆبونەوەکە هێنا.

ئەوانەی (م.س) زۆربەیان بەستنی کۆنگرەیان پێ خۆش نەبو. نەیان ئەویست جارێکی تر بچنەوە بەردەم هەڵبژاردن. ئەیانویست تا هەتایە لەپایەکانی خۆیاندا بمێننەوە.

ئەرسەلان و مەلا بەختیار ئەوەیان کرد بە بیانو هانایان بۆ مام جەلال برد کە:

من هەڤاڵان ئیهانە ئەکەم

بەم جۆرە گفتوگۆیە ریزەکانی یەکێتی تێك ئەچێ، پشێوی تێ ئەکەوێ

من ئەمەوێ یەکێتی تێك بدەم.

مام جەلال لەسەر شکاتەکەی ئەوان، بێ هیچ لێکۆڵینەوە و لێپرسینەوەیەك، کۆبونەوەکانی ڕاگرت. من ئەمەم بە لایەنگریی ئەوان و بە ئیهانەم دانا بۆ خۆم. جارێکی تریش بەڵێن و کار و کردەوەکانیم هاتەوە بەرچاو. جارێکی تریش بە کردەوە دەسەڵاتەکانی خۆی خراپ بە کار هێنایەوە و، سەلماندیەوە ئەوەی ئەیڵێ جیاوازە لەوەی ئەیکا.

ئەم کردەوە چی بکەم:

[illegible] برۆمەوە بۆ دەرەوە؟

بێدەنگی هەڵبژێرم؟

فەرمانە ناڕاستەکەی جێبەجێ بکەم دەس لـەدرێژە پێدانی کۆبونەوەکان هەلبگرم؟

بە گژیانا بچمەوە؟

وازیان لـێ بهێنم، بە تایبەتی هێشتا هیچ زەمینەی ڕێکخستن یا ئاڕاستە کردنـی هـیچ جۆرە ناڕەزاییەکی کاریگەر دروست نە بوبو؟

بڕیارم دا واز بهێنم و، بیر لـەڕێگەیەکی تری کار بکەمەوە.

من لـەدڵی خۆم دا خەریکی تاووتوێ کردنی ئەو باسانە بوم نامەیەکی مام جـەلالم بـۆ هات.

مام جەلال هێرشی دوژمنانە دەکاتە سەر نەوشیروان مستەفا

ڕۆژی (٤/١١/ ٢٠٠٠ ) ئەمڕۆ مام جەلال نامەیەکی درێژی بۆ ناردم. لـەنامـەکـەدا بە لایەکی دا ستایشی زۆری کردوم و دەوری منی لـەیەکێتی دا بەرز کردۆتـەوە، بـە لایەکی تری دا هێرشێکی دوژمنانەی تونـدی کردۆتـە سـەرم. هـەموو ئـەو قـسە و قسەلۆکە ناڕاستانەی چەند وەختە ناحەزەکانم لـەناو بالـەناکۆکـەکـانی یـەکـێتی دا و لـەناو خەڵك دا بڵاوی ئەکەنەوە گۆیا من دژی هەولێری و کـەرکـوکی و بـادینی و یەزیدی و پێشمەرگەی کۆن و ژن و عەرەب و چی و چی... م ئـەم لـەم نامـەیـەدا هەمووی بە کوردیەکی ڕون و ڕەوان لـەدژی من "تەوسیق" و "تەقنین" کردوە. لـەمێژ بو ئەم بیستەوە و، گومانم ئەکرد ئاشی بـەرهـەمهێنانی سـەرچـاوەی بڵاوکردنـەوەی زۆری ئەو قسە و باسانە هاوڕێکانی خۆم بن، ئەم نامەیە گومانەکەی کردم بە یەقین.

ئەم نامەیە ئەشێ بەشێ بێ لـەو جەنگە نهێنی و ژێر بەژێرە پروپاگەنـدەییـەی لــەدوای ڕاپەرینەوە بە جۆرێکی سیستەماتیك لـەناو یەکێتیو دەرەوەی دا کاری لـەسەر ئەکـرد بۆ جێگیرکردنی خۆیو هەڵکەندنی من. لـەپێش کۆنگرەی یەکەمەوە دەستی پێ کرد بو، لـەڕۆژانی کۆبونەوەکانی کۆنگرەی یەکەمدا بە فراوانی کـاری بـۆ کـردو، دوای

[illegible]ەش تا ئێستا درێژەی پێ ئەدا. ئەم نامەیەش نمونەیەکێتی. ئەگینا کەسێك پانزە بۆی خۆشترین قۆناغی تەمەنی بە پێشمەرگایەتی لەشاخەکانی کوردستاندا بەسەر بردبێ‌و، لەجزیرەی سوریاوە بە پێ سنورەکانی سوریا، تورکیا، عیراق‌و سنورەکانی ئێران‌و تورکیاو عیراقی پێوا بێ‌و پەیوەندی هاورێیەتی لەگەڵ سەدان تێکۆشەری سەرانسەری کوردستان دروست کردبێ، ئەچێتە عەقڵی کێوە ئەو کەسە رقی لەهەولێری‌و کەرکوکی‌و بادینی بێ.

لەخۆمم پرسی:

- تۆ بڵێی ئەم هەموو سالەمن شێت بوبم بۆیە داومەتە شاخ؟

- تۆ بڵێی کەسێ دێوانەی خۆشەویستی نەتەوەو نیشتمانەکەی نەبێ کە کەرکوك‌و هەولێرو بادینان، بەشێکین بتوانێ بەرگەی پانزە ساڵی ژیانی پێشمەرگایەتی سەردەمی دەسەڵاتی بەعس بگرێ؟

- تۆ بڵێی ئەو هەمووو جەولەو شەروشۆڕو ناخۆشییانەی لەناوچەکانی هەولێر کردومەو زۆربەی هەرەزۆری پێشمەرگەو کادیرو فەرماندەکانی هەولێرو خۆشناوەتی‌و باڵەکایەتی کە تا ئێستاش لەنزیکترین هاورێکانمن ڕاست نەبێ؟

لەخۆمم پرسی:

- ئایا ئەتوانم لەگەڵ کەسێك دا کاری جدی بکەم کە هەمووو بۆچونەکانی منی لەسەر گۆڕینی شێوازی سیستمی کاری حزبایەتی کورت کردۆتەوە بۆ ئەم شتە شەخسیانە کە هیچیان ڕاست نین؟

- ئایا ئەتوانم لەگەڵ سەرکردەو کادرانێکی وادا کار بکەم کە لەجیاتی بیرکردنەوە لەچاککردنی ڕێکخستنی حزب‌و داوودەزگاکانی، کەوتونەتە ململانێیەکی قێزەون بۆ پارێزگاری لەدەسەڵات و بەرژەوەندیە تایبەتییەکانی خۆیان؟

- ئایا ئەتوانم درێژە بە کارکردن بدەم لەگەڵ سەرکردەیەکدا کە بە هاوکاری ئەوانەی لەخۆیەوە نزیکن بەردەوام پروپاگەندەی دوژمنانە بۆ هەر قسەیەکی من ئەکەن کە بێ مەبەست یان بۆ مەبەستێکی دیاریکراو وتومە؟

ئەوانە هەمووو هەوڵێکی خۆیان خستۆتە گەڕ بۆ ئەوەی زۆرترین خەڵـك چـەواشـە بکەن‌و بیروبۆچونەکانی من‌و هەوڵـەکانی من بۆ ڕیفۆرمی ناوخۆی یەکێتی بـە خـراپ پیشان بدەن‌و بە ئاقارێکی تری دا ببەن.

– من باسی چاککردنی ئەدائی حکومەت ئـەکـەم ئـەوان ئـەڵـێن رقـی لـەهـەولـێرە، لەبادینانە، لـەکەرکوکە.

– من باسی چاککردنی ئەدای ئاسایش، ڕێکخستن‌و ڕێکخراوەکـان ئـەکـەم، ئـەوان ئەیخەنە قالیی تۆڵـەو رق‌و قینەوە.

– من ئەمەوێ ئەم ئەزموونە ستالینییەی حزب کۆتـایی بـیێ‌و حزبێکـی داوودەزگـای مۆدێرن دروست بکەین، ئەوان پروپاگەندەی موچەبڕین‌و دەرکردن‌و تۆڵـەکردنەوەم.

## نەوشیروان مستەفا

## لەکاتی لێپرسراوێتیدا زۆرترین نامەی واسیتەی ئاراستەی حکومەت کردوە

جەوهەر کرمانج:

جەوهەر کرمانج کادیری پێشکەوتووی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و یاریدەدەری سکرتێری گشتیی بۆ کاروباری رووناکبیری لەدیدارێکدا لەگەڵ کوردستانی نوێ تیشك دەخاتە سەر دروشمە بریقەدارەکانی کۆمپانیای گۆڕان و وەڵامی ئەو پروپاگەندە ناڕەوایانە دەداتەوە کەماوەیەکە سەرانی کۆمپانیای وشە دەیکەنە سەر یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و رایگەیاند: نەوشیروان مستەفا کەجێگری سکرتێری گشتیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بوو لەکابینەی ئەوکاتەی حکومەتی هەرێمی کوردستاندا لەئیدارەی سلێمانی کەس نەبوو هێندەی ئەو خەڵك دابمەزرێنێت و ئەوەندەی ئەو نامەی واسیتە بۆحکومەت بنێرێت، بۆیە بەرزکردنەوەی دروشمی جیاکردنەوەی حزب لەحکومەت لەلایەن برادەرانی گۆڕانەوە تەنیا بانێکەو دوو هەوا، وتیشی: سەرۆك مام جەلال لەپێش هەموو کەسێکەوە بەرنامەی دژایەتیکردنی گەندەڵی و هەوڵدان بۆ چاکسازی و گۆڕانکاری راستەقینە دەستپێکردووە، بەلام ئەو برادەرانەی گۆڕان لەکاتی خۆیدا نەك هەر پشتگیریان نەکرد بەڵکو دژایەتیی جێبەجێکردنی بەرنامەکەیان کرد.

## زەنگێك بۆ بەخۆداچوونەوە

جەوهەر کرمانج لەبارەی ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی ٢٠٠٩/٧/٢٥-ی پەرلەمان و سەرۆکایەتیی هەرێمی کوردستان رایگەیاند: ئەنجامەکانی هەڵبژاردن ئەنجامێکی چاوەڕوانەکراو بوو، بۆئەوەش چەند هۆکارێك هەبوو کەدیارترینیان کارکردنی هەندێك کادیری یەکێتی بوو بۆلیستی گۆڕان لەژێر پەردەی ی.ن.ك-دا و هەروەها کۆمەڵێك هەڵەو کەموکورتی لەشێوازی کارکردنماندا هەبوو کەبەشێکی زۆری ئەو

کەسایەتییانەش سەرچاوەکەیان ئـەو کادیرانـە بـوون کەبـەناوی ریفۆرمـەوە لـەناو یەکێتی نیشتمانیی کوردستاندا کاریان دەکردو ئەوەش هۆکـار بـوو بۆدروسـتبوونی نارِەزایی لای خەڵك، وتیشی: لـەلایەکی دیکەوە ئەنجامـەکانی هەڵـبژاردن زەنگێـك بوو بۆ بەخۆداچوونەوەو جیابوونەوەی ئـەو کەسـانەش کـەکاریان بۆلیـستی گـۆڕان دەکردلـەیەکێتی، هۆکارێکی زۆرباشبوو بۆبەخۆداچوونەوەی زیـاتر، چـونکە ئـەوان لـەناو ڕێکخستنەکانەوە هەوڵی بنکۆڵکردن و لێکترازانی ریزەکانی یەکێتی-یان دەدا بۆیە جیابوونەوەیان لـەیەکێتیی بووبە مایەی پاکبوونەوەی ریزەکـانی یـەکێتی و ئێـستا یەکێتی دەتوانێت زیاترو باشتر بەخۆیدا بچێتەوەو لەپلینۆمیـشدا بـەوردی گفتوگـۆی ئەوبابەتانـە کـراو ئێـستا یـەکێتی لـەقۆناغێکی تازەدایـە کـەقۆناغی خۆبنیاتنانـەوەو نەهێـشتنی گەنـدەڵی و دەسـتەگەری و پاراسـتنی یەکرِیزییـە، هـەروەها زەنگێکـی بەخۆداچوونەوەش بوو بۆ هەموو لایەنەکانی ترو دەبێـت هـەموان بەخۆداچـوونەوە بکەن و چارەسەری کێشەو کەموکورِییەکانیان بکەن و سوود لەئـەزموونی رابـردوو وەربگرن.

## بارودۆخێکی دڵخۆشکەر

لەبارەی بـارودۆخی نـاوخۆیی یـەکێتیی نیـشتمانیی کوردسـتان دوای جیابوونـەوەی ژمارەیەك لەکادیرەکانی، جەوهەر کرمانج وتی: لـەراستیدا بارودۆخی ی.ن.ك پـێش بەستنی پلینۆم بارودۆخێکی ئاسایی نەبوو جگە لەخەڵك کادیرەکانیش نـارِازیبوون و پەیوەندییـەکان ئاسـایی نـەبوون، بـەلام ئێـستا دوای ئـەوەی لەپلینۆمـدا بـەوردی دەستنیـشانی هەڵـەو کەموکورِییـەکان و هۆیـەکانی نـارِازیبوون کـراو رێگـەکانی چارەسەریش دەستنیشانکران و ئێستاش بریارو راسپاردەکانی پلینۆم جێبەجێدەکرێن، بۆیە ئێستا بارودۆخی ناوخۆیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بـارودۆخێکی گونجـاوو دڵخۆشـکەرییەو پلینـۆمی ئـەمجارەش جیاوزاییـەکی زۆری هـەبوو لـەگـەڵ پلینـۆمی پێشووتر داو زۆر رەخنەی وردو راشـکاوانە گـیران و پێموایـە دوای بەسـتنی پلینـۆم

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان چووەتە قۆناغێکی باشترو کاراترو گەشەدارترو پێشکەوتووتر.



## جێبەجێکردنی پەیمانی ئاکار

لەبارەی ئیمزاکردنی پەیمانی ئاکاریش لەلایەن هەڤالانی مەکتەبی سیاسی و گرنگی ئەو پەیمانە بۆنەهێشتنی دەستەگەری، جەوهەر کرمانج وتی: یەکێك لەنەخۆشییە کوشندەکانی ناو ڕێکخستنەکانی یەکێتی مەسەلەی دەستەگەری بوو کەزیانێکی زۆری بەهەموو بوارەکانداو بۆنەهێشتنی ئەو دەستەگەرییەش لەپلینۆمدا زۆر قسەکراو دیارە ئەوەش تەنیا هۆکارەکەی مەکتەبی سیاسیی نەبوو، بەڕاستی هەقە کادیرانی یەکێتیی قبوولی دەستەگەری نەکەن، بۆیە ئیمزاکردنی پەیمانی ئاکار رۆڵێکی گرنگ دەبینێت لەنەهێشتنی دەستەگەریداو ئەرکی هەموو کادیرانی یەکێتییە کەبەجدی کاربکەن بۆجێبەجێکردنی پەیمانی ئاکار.

جیاکردنەوەی حزب لەحکومەت

لەبارەی بەرزکردنەوەی دروشمی جیاکردنەوەی حزب لەحکومەت لەلایەن ئەو کەسانەی کەپێشتر ناوی خۆیان نابوو باڵی ریفۆرم و ئێستاش بەناوی بزووتنەوەی گۆڕانەوە کاردەکەن، جەوهەر کرمانج وتی: ئەو بەڵێنانەی کەپێشتر لیستی گۆڕان لەهەڵمەتەکانی هەڵبژاردندا دایان بەخەڵك ناتوانن هیچی جێبەجێبکەن وهیچیشیان پێناکرێت و هیچیشیان پێنەکراوە، بۆیەمەسەلەی جیاکردنەوەی حزب لەحکومەتیش تەنیا دروشمێکی بریقەدارە کەبرادەرانی گۆڕان بەرزیان کردووەتەوەو پێشتر کاك نەوشیروان مستەفا کەجێگری سکرتێری گشتیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بوو لەکابینەی ئەوکاتەی حکومەتی هەرێمی کوردستاندا لەئیدارەی سلێمانی کەس نەبوو هێندەی ئەو خەڵکی دابمەزرێنێت و ئەوەندەی ئەو نامەی واسیتە بۆحکومەت بنێرێت، بۆیە بەرزکردنەوەی دروشمی جیاکردنەوەی حزب لەحکومەت لەلایەن برادەرانی گۆڕانەوە تەنیا بانێکەو دوو هەوا، واتە ئێستا بەهەوایەکی تر دەیانەوێت

[illegible] مەسەلەیە بکەن ، بۆیە ئەگەر کاتی خۆی ئەو ئەوکارەی نەکردایە ئێستا ڕە[illegible] خەڵك باوەڕی بەو دروشمانەی برادەرانی گۆڕان بکردایە، بەلام لەکاتێکدا کەئەو لەدەسەلاتێکی بەرزی حزبدا بوو، هەموو ئیدارەی حکومەتیشی خستبووە ژێر دەستی خۆی کەچی ئێستا ئەوان بەجۆرێکی تر باس لەو مەسەلەیە دەکەن و ئەوەش جێگەی سەرسوڕمانە.

## کاری نوێنەرانی کورد

لەبارەی ئەدای کاری نوێنەرانی کورد لەبەغداو ڕەخنەی نابەجێ و بێبنەمای سەرانی کۆمپانیای گۆڕان لەو ڕووەوە، جەوهەر کرمانج وتی: بەڕاستی تاوانە ئەوان بەو جۆرە هێرشی ناڕەوا دەکەنە سەر نوێنەرانی کورد لەبەغدا، بەلام دیارە ئەوەی لەشەڕ نەبێت شمشێری تیژە، ئەو برادەرانەی ئێمە خۆ بەشێکیان کاندیدی خودی کاك نەوشیروان بوون، بەلام لەبەرچاوی هەمووان دیارە ئەوانەی کەزیاتر شەڕیان کردلەسەر مەسەلەی کوردو هەرێمی کوردستان و ماددەی ١٤٠ و کەرکوك و هەڵبژاردن و مەسەلە چارەنووسسازەکان و ئەو بابەتانەی تر کەپەیوەندییان بەکوردەوە هەیە زیاتر ئەو کادیرو ئەندام پەرلەمانانە بوون کەکاندیدی کاك نەوشیروان نەبوون و ئێستاش لەگەڵ لیستی گۆڕاندا نین و ئەوەش دیارە، ئەو کاندیدانەش کەدژی بەرژەوەندییەکانی کورد قسەیان دەکرد ئەو ئەندامانەن کەکاندیدی کاك نەوشیروانن و ئەوە ئەوانن کەکەمتەرخیان کردووە، بۆیە دەبوو ئەوان پێشتر گلەییان لەکاندیدەکانی خۆیان بکردایە.

لەناو یەکێتی دا ویستێکی تەواو هەیە بۆ دژایەتیکردنی گەندەڵی

لەبارەی بەرز کردنەوەی دروشمی گەندەڵی و دژایەتیکردنی گەندەڵی لەلایەن بزووتنەوەی گۆڕان–ەوە، جەوهەر کرمانج وتی: گەندەڵی لەهەموو دنیادا بەڕێژەی جیاجیا هەیە، بەلام لەناو یەکێتی دا ویستێکی تەواو هەیە بۆ دژایەتیکردنی گەندەڵی

ڕیـبەرکردنی و ئـەوەش بەشـەوو ڕۆژێـك بنـەبڕ ناکرێـت و پێویـستی بـەکات و کارکردنی زیاترو دانانی کەسی شـیاو هەیـە لـەشـوێنی شـیاودا کەپێـشتر برادەرانـی ئێستای گۆڕان لـەزۆر جێگدا ڕێگربوون لـەدانانی کەسی شیاو لـەشوێنە شـیاوەکانداو ئەو دروشمەش پەیوەندی بەبرادەرانی گۆڕانـەوە نییـە، چـونکە سـەرۆك مـام جـەلال لـەپێش هـەموو کەسـێکەوە بەرنامـەی دژایـەتیکردنی گەنـدەڵی و هەوڵـدان بـۆ چاکسازی و گۆڕانکاری ڕاستەقینە دەستپێکردووە، بـەلام ئـەو برادەرانـەی گـۆڕان لەوکاتەی کەلـەناو یەکێتیدا بـوون نـەك هـەر پـشتگیریان نـەکرد بـەڵکو دژایـەتیی جێبەجێکردنی بەرنامەکەی سەرۆك مام جەلال-یان دەکرد، لـەپلینۆمیش قـسەی زۆر بەجێ لـەسەر ئەوبابەتە کراو ئێستاش یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بەرنامەی جـددی هەیە بۆ دژایەتیکردنی گەندەڵی و ئەنجامدانی چاکسازی و پاکـسازی و گۆڕانکـاری ڕاستەقینەو دانانی کەسی شیاو لـەشوێنی شیاودا.

خۆئامادەکردن بۆ هەڵبژاردنەکان

لـەبارەی خۆئامادەکردنیش بۆ هەڵبژاردنەکانی داهاتووی عـیراق، جەوهـەر کرمـانج وتی: دیارە هەڵبژاردنەکانی داهاتوو لـەعیراقدا چارەنووسـسازترن لـەهەڵبژاردنـەکانی ڕابردوو، بۆیە مەسەلـەکە پەیوەندی بەچارەنووسی هەموو کـوردەوە هەیـەو پێویـستە هەموو لایەك کارکردن لـەسەر بەرژەوەندییـە نەتەوەییـەکان بخەنـە پـێش کـارکردن لـەمەسـەلـە حزبییەکانـداو دەبێـت هـەوڵی جـددیمان بـۆ بەدەسـتهێنانی مافـە بەدەستنەهاتووەکانی گەلـەکەمان بێت و ئەوەش بەپاراسـتنی یـەکڕیزی و هـاودەنگیی دەبێت لـەمەسەلـە چارەنووسسازەکاندا، بۆیە دەبێـت هـەموو لایەنـەکان هەوڵبـدەن میکـانیزمێکی گونجـاو بدۆزنـەوە بۆپاراسـتنی دەسـتکەوت و ئەزموونەکـەمان و ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو پیلانانەی کەبەردەوام ناحەزانمان لـەدژمان دایدەڕێژن.

## نەوشیروان مستەفا بێدەنگی شکاند

## نێوان تاڵەبانیو نەوشیروان، ململانێی دوو هێزە نەك دوو کەسایەتی

عومەر ستار

دواجار، نەوشیروان مستەفا سەرۆکی بزووتنەوەی گۆڕان، لە بەرانبەر هێرشەکانی جەلال تاڵەبانی سکرتێری گشتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان، بێدەنگی هەڵنەبژاردو بە دوورو درێژی وەڵامی دایەوەو چەندین نهێنی نێوان خۆیو تاڵەبانی ئاشکراکرد.

ئەو گێڕانەوە چەند بەشییەی نەوشیروان مستەفا بڵاویکردووەتەوە، بە وەڵامی ئەو قسەو تۆمەتانەی جەلال تاڵەبانی ئەژمار دەکرێت، کە لە پلینیۆمی چوارەمی یەکێتی نیشتمانی کوردستاندا بەرانبەری کردبووی.

ئەوەی نەوشیروان مستەفا لە سیاسییەکانی تر جیادەکاتەوە، بەوە ناسراوە کە بە زمانی یاداشتو دۆکیۆمێنتی مێژوویی وەڵامی نەیارەکانی دەداتەوە، نەك بە زمانی قسەکردن لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنو رووپەڕی رۆژنامەکان.

چوارشەممەی رابردوو ١١/٢٥، لە نووسینێکی حەوت بەشیدا، نەوشیروان مستەفا سەرۆکی بزووتنەوەی گۆڕان، یاداشتەکانی لەگەڵ جەلال تاڵەبانی سەرکۆماری عێراق بەناوی «لەنێوان مام جەلالو مندا....لە ئازاری ١٩٩٩- شووباتی ٢٠٠١) بڵاوکردەوە.

نەوشیروان مستەفا جێگری پێشووی سکرتێری گشتی یەکێتی، بە دوورو درێژی باسی لەوە کردەوە، کە لەو ماوەیەی لەگەڵ تاڵەبانی کاری سیاسی کردووە چی لەنێوانیاندا روویداوە، هەروەك ململانێو ناکۆکییەکانی یەکێتیش دەخاتەڕوو.

نەوشیروان مستەفا، کە چەند ساڵێك لەمەوبەر تەنیا خاوەنی کۆمپانیایەکی راگەیاندن بوو، لەوێوە دەستپێکرد، ئێستا رابەری بزووتنەوەیەکی سیاسی بەناوی «گۆڕان»ەو ٢٥ کورسی لە پەرلەمانی کوردستان هەیە.

بەپێی ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی ٧/٢٥ ی پەرلەمانی کوردستان، نەوشیروان مستەفا شاری سلێمانی لە هاورێیو هاودەمە سیاسییەکەی پێشووی جەلال تاڵەبانی سەندەوەو توانی بە جیاوازییەکی زۆر پلەی یەکەم بەدەستبهێنێت.

ئێستاش، کە لایەنەکان لە چاوەڕوانی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقدان، سەرۆکی بزووتنەوەی گۆڕان چاوی لە دووبارەکردنەوەی ئەنجامە بەدەستهاتووەکەی سلێمانییە لە پەرلەمانی عێراقو شاری کەرکوك، چونکە ئەگەر ئەو ئەنجامە لە کەرکوك دووبارە بکاتەوە، ڕەنگە زەنگی کۆتایی مەرگی حیزبەکەی تاڵەبانی لێبدات، لەبەرئەوەی بەئەستەم دەبینرێت جارێکی تر یەکێتی بتوانێت سلێمانی لە گۆڕان وەربگرێتەوەو بە لەدەستدانی کەرکوکیش، یەکێتی بە حیزبێکی میوان لە پارێزگاکاندا دەمێنێتەوە.

ئاراستەی ململانێکانی نێوان گۆڕانو یەکێتی، لە ململانێی نێوان دوو هێزی سیاسییەوە خەریکە بەرەو ململانێی نێوان دوو کەسایەتی «نەوشیروانو تاڵەبانی» دەگۆڕێتو ئەوان قسە لە بارەی رابردووی یەکترەوە دەکەنو هەڵەکانی رابردوو دەخەنە ئەستۆی یەکتر.

نەوشیروان مستەفا بە ئاشکرا لە نووسینەکەیدا جەلال تاڵەبانی سکرتێری گشتی یەکێتی بەوە تۆمەتبار کردووە، کە تەنیا کار بۆ مانەوەی خۆی دەکاتو نایەوێت چاکسازی لەنێو یەکێتیدا بکرێت، بۆ ئەمەش چەندین رووداوی مێژوویی

ئەو دانی بەوەداناوە هەر لەدوای راپەڕینەوە، کە کوردستانی جێهێشتووە، ناکۆکی لەگەڵ جەلال تاڵەبانیو ژمارەیەك ئەندام مەکتەبی سیاسی یەکێتیدا هەبووەو لە کۆنگرەی دووەمیشدا هاوڕێکانی فێڵیان لێکردووەو دەستیان بڕیوە.

نەوشیروان مستەفا لە بەشی حەوتەمی نووسینەکەیدا، کە تەرخانی کردووە بۆ قسەکردن لەسەر دووەمین کۆنگرەی گشتی یەکێتی، تاڵەبانی بەوە تۆمەتبار دەکات، کە کەسە نزیکەکانی خۆی بردووەتە پێشەوە، هەروەها باس لە چەند خوویەکی خراپو باشی تاڵەبانی دەکات، بەڵام سایتی سبەی سانسۆڕیان کردووە.

لە کۆتایی نووسینەکەیدا نەوشیروان مستەفا لە ڕێگەی گێڕانەوەی ڕووداوێکەوە، ئاماژەیەك دەداتە خوێنەر کە هێرشەکەی تاڵەبانی بۆ سەر ئەو لە پلینیۆمدا، یەکەم هێرشی تاڵەبانی نییە، ئەو دەنووسێت «پێش دەستلەکارکێشانەوەم مام جەلال نامەیەکی درێژی بۆ نووسیم بە لایەکدا ستایشێکی زۆرو بە لایەکی دیکەشدا هێرشێکی دووژمنانەی کردووەتە سەرم، ئیتر من بۆم یەقین بوو سەرچاوەی زۆری ئەو قسەو باسانە هاوڕێکانی خۆمن».

هەروەها باس لەوە دەکات، دوای ئەوەی لە تشرینی دووەمی ٢٠٠٠دا نامەی دەستلەکارکێشانەوەی پێشکەشکردووە، جارێك لەگەڵ تاڵەبانی دانیشتووەو بە ئاشکرا بە تاڵەبانی وتووە «من نە باوەڕم بە خۆت هەیە نە بە قسەکانت نە بە حیزبەکەتو نە بە سەرکردایەتییەکەت».

شێخ جەناب، یەکێك لە هەڵسووڕاوە دیارەکانی بزووتنەوەی گۆڕان، دەڵێت «ئێمە هەموومان پێمان باش بوو کاك نەوشیروان وەڵامی چەواشەکارییەکانی تاڵەبانی بداتەوە».

وتیشی «تاڵەبانی بەردەوام هەوڵی ئەوەی داوە دەسەڵاتی یەکەم خۆی بێتو بۆ ئەو مەبەستەش باڵەکانی یەکێتی لە دژی یەکتر بەکاردەهێنا».

ئاواتی شێخ جەناب، روونی دەکاتەوە، کە ململانێی فیکری لە کۆنگرەی یەکەوە کاتێك کۆمەڵە هەڵوەشێنراوەتەوە لەنێوان مام جەلالو نەوشیروان مستەفادا دەستیپێکردووە، وەکو ئەو دەڵێت «تاڵەبانی لەو کاتەوە تێزێکی هەلپەرستانەی هێنایە ناو حیزبەوە، هەر ئەو کات ٪٩٠ ی پێشمەرگە بەدەست کۆمەڵەوە بوو».

ئەو سەرکردەیەی گۆڕان باس لەوە دەکات، کە تاڵەبانی هەر جارەو دەستی بەسەر باڵێکدا هێناوە لە دژی باڵەکەی دیکە تا دەسەڵاتی خۆی نەکەوێتە مەترسییەوەو لە کەسایەتییەکانیشی دەدا، روونیشی کردەوە «سەرەتای لێدان لە کاك جەبارەوە دەستیپێکردو لە ساڵی ١٩٩٢-٢٠٠٠ لە کاك کۆسرەتی دا».

لە گێڕانەوەی یادەوەرییەکانیدا، نەوشیروان مستەفا بەشێکی گرنگی تەرخانکردووە بۆ باسکردنی کۆسرەت رەسولو خستنەڕووی هەڵەکانی کاتێك سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی حکومەتی هەرێم ئیدارەی سلێمانی بووە.

لەمبارەیەوە، ئاواتی شێخ جەناب وتی «کاك نەوشیروان یاداشتی ئەو ماوە زەمەنییەی گێڕاوەتەوەو لەبەرئەوەش باسی لە کۆسرەت رەسوڵ کردووە، چونکە ئەو لە کۆنگرەی یەکدا پشتی مام جەلالی گرتو کۆمەڵەی لەتکرد».

ناوبراو ئاشکرای کرد «کاك نەوشیروان لەو شوێنەدا کە دەڵێت هاورێکانم لە کۆنگرە فێڵیان لێکردم بە ڕوونی مەبەستی لە کۆسرەت ڕەسوڵە».

بە بۆچوونی ئەندامێکی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان، ململانێی نێوان جەلال تاڵەبانی و نەوشیروان مستەفا، ململانێی نێوان دوو کەسایەتی نییە، بەڵکو ململانێی نێوان دوو هێزی سیاسییە.

فەرید ئەسەسەرد ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی، پێیوایە «ئەو ململانێیەی نێوان مام جەلالو نەوشیروان مستەفا لەنێوان دوو ڕەوتی سیاسی جیاوازدایە، نەك دوو کەسایەتی».

لەدوای بڵاوکردنەوەی گێڕانەوەی یاداشتی یادەوەرییەکانی نێوان تاڵەبانیو نەوشیروان مستەفا، تا ئێستا یەکێتی هیچ وەڵامێکی نەداوەتەوە، بەڵام بەپێی ئەو زانیارییانەی دەست هاوڵاتی کەوتوون، بڕیارە جەلال تاڵەبانی سکرتێری گشتی یەکێتی خۆی وەڵام بداتەوە.

## هاوڵاتی وردەکارییەکانی ناو پلنیۆم بڵاودەکاتەوە

### بەشی یەکەم

بەشێکی زۆری بەشداربووانی پلنیۆمی یەکێتی: شکستەکانی ٢٥/٧و تەکەتولات لەئەستۆی مەکتەبی سیاسیو سەرکردایەتیدایە

تایبەت بە هاوڵاتی

پارتە سیاسییە کوردییەکان یەکێك لەگرفتە سەرەکییەکەیان ئەوەبووە، کەبەردەوام نەیانتوانیوە لەکاتو شوێنی دیاریکراوی خۆیدا کۆنگرەی خۆیان بگرن، هەمیشە بەهۆی ئاڵۆزی باری سیاسی کوردستانو بەهۆی کێشەو گرفتەکانی ناوخۆییەوە کۆنگرەیان سپاردووە بەکاتێکی نادیارو چارەسەری کێشەو گرفتەکانیشیان لەسەر یەك هەڵچنیووەو سپاردویانە بە کۆنگرە.

یەکێتی نیشتمانی کوردستان بەپێی پەیڕەوی ناوخۆکەی دەبوو تا ئێستا پتر لە ١٠ کۆنگرەی خۆی بگرتایە، بەڵام تازە لەم رۆژانەدا پلنیۆمی چوارەمی بەستو بڕیاریشە لەساڵی ئایندەدا گۆنگرەی سێیەمی خۆی بگرێت، ئەوەی وایکرد کە یەکێتی دەست بجوڵێنێو پلنیۆم ببەستێت، وەك لەزاری هەندێك لەسەرکردایەتیو راگەیاندنەکانیانەوە بیسترا‌وە، ئەوەبوو کە کۆمەڵێك کادیرو ئەندامانی سەرکردایەتی ریزەکانی ئەو حیزبەیان بەجێهێشت، پاشان لەهەڵبژاردنەکانی ٢٥/٧دا یەکێتی زەبرێکی کوشندەی بەرکەوتو هەرێمی سەوزی دۆڕاند.

شکستەکانی یەکێتی لە ٢٥/٧دا سەرکردایەتی ئەو حیزبەی تاساندو تا ماوەیەکیش سکرتێری ئەو حیزبە «دەیویست بزانێت چی روویداوە»، هەر بۆیە یەکێتی بۆئەوەی زەبرێکی تری بەرنەکەوێت، لە ٢٩/١٠ بۆ ماوەی ٣ رۆژ بەئامادەبوونی نزیکەی

[illegible]ری ئەو حیزبە پلنیۆمی بەست.

پلنیۆم[illegible]ی بۆ یەکێتی دەکات

لەپلنیۆمدا بەمەبەستی تێپەڕاندنی قەیرانەکانی یەکێتی کۆمەڵێك پێشنیار خرایە بەرچاو، کە زۆرترین‌و گرنگترینیان لە راپۆرتە ٣٥ دەقیقەییەکەی تالەبانیدا هاتبوو، تالەبانی راپۆرتەکەی کردبووە دوو بەشی سەرەکییەوە، بەشێکی وەك راپۆرتێکی گشتگیر تەرخانکردبوو بۆ هەلومەرجی سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌و ئابووری کوردستان‌و عێراق، بەشەکەی تریشی تەرخانکردبوو بۆ ئەو کێشەو گرفتانەی بەرەورووی یەکێتی بوونەتەوە، لەگەڵ دەستنیشانکردنی چەند خاڵێك وەك پێشنیار بۆ رێگاچارەو دەربازبوون، کە گرنگترینیان ئەمانە بوون:

• گەشەپێدانی (ی.ن.ك) بۆ پاراستنی دیموکراتیەت‌و کۆمەڵگای مەدەنی لە هەرێمی کوردستان‌و عێراق‌و پاراستنی دەستوورو دیموکراتیەتی عێراق لە نەیارو لەو حیزب‌و لایەنانەی کە لەژێر ناونیشانی جیاجیاوە دژ بەدەستکەوتەکانی کورد دەوەستنەوە وەك بەعسییەکان کە نایانەوێت هیچ شوێنێکی ناوچە دابڕاوەکان بگێڕنەوە سەر هەرێمی کوردستان.

• رێکخستنەوەی یەکێتی‌و پتەوکردنی ریزەکانی‌و نەهێشتنی دەستەگەری بەتەواوەتی‌و بژارکردنی گەندەڵکاران تیایدا، لەگەڵ هۆشیارکردنەوەی خەڵك لە مەترسییەکانی دژە دیموکراتیەت‌و ئەوانەی بەهەڵە خەڵکی لە دیموکراتیەت تێدەگەیەنن.

• هاندانی رێکخستنەکان بۆ ئەوەی چیتر بچنە ناو خەڵکی‌و خەڵکی هۆشیاربکەنەوەو لە کێشەو گیروگرفتەکانیان بکۆڵنەوەو چارەسەریان بۆ بدۆزنەوەو هاوکاریان بکەن.

• پاراستنی هاوپەیمانێتی یەکێتی‌و پارتی‌و هەوڵدانی زیاتر بۆ گەشەپێدانی پەیوەندییەکانیان لەگەڵ هەموو دۆست‌و هاوپەیمانان‌و دەوڵەتانی دراوسێ‌و دەوڵەتانی ئەورووپی.

• پتەوکردن‌و پاراستنی هاوپەیمانێتی‌و گەشەپێدانی پەیوەندی بەلایەنە شیعەکان.

ڕەنگدانەوەی ئۆپۆزسیۆنی پارچەکانی تری کوردستان لەسەر بناغەی ڕێز لە ئیرادەی یەکترو موراعاتکردنی ڕەوشی واقیعی.
- برەودان بەهێزی پێشمەرگەو گەشەپێدانو ئامادەسازیان لە ڕووی چەكو مەشقی سەربازییەوە، پێویستە چەکیان بۆ پەیدا بکرێت، ئەمەش بەومانایە نا کە ئامادەکاری دەکرێ بۆ شەڕ، بەڵکو بەمەبەستی ئەوەی کەخۆسازدان بۆ شەڕ، شەڕ دووردەخاتەوە.
- گرنگیدان بەکەرتی کشتوکاڵو گوندەکانو ئاوەدانکردنەوەیانو دانانی پلانی باش بۆ نەهێشتنی کێشەی کەم ئاوی.
- چاکسازیو پاکسازیکردن لە ناو حکومەتو کەمکردنەوەی مووچەی وەزیرو پەرلەمانتار.

تاڵەبانی بەشێکی تری ڕاپۆرتەکەی تەرخانکردبوو بۆ باسکردن لە کەسایەتیو ڕۆڵی نەوشیروان مستەفا لەناو یەکێتیدا، ئەمە لەگەڵ گێڕانەوەی ڕووداوەکانی چەندین ساڵی ڕابوردوو چۆنیەتی سەرهەڵدانی کێشەکانی ناو یەکێتیو کاریگەری نەوشیروان لەسەر کەموکورتییەکانی سیاسەتی یەکێتیو ئاشکراکردنی هۆکاری هەندێك لە گرفتو شەڕی ناو یەکێتیو لایەنەکانی تر.

تاڵەبانی لەم بەشەی ڕاپۆرتەکەیدا زۆر بەتوندی قسەی لەسەر نەوشیروان مستەفا کردو ئۆباڵی زۆربەی زۆری ڕووداو کارەساتەکانی یەکێتیو گەلی کوردی خستە ئەستۆی نەوشیروان مستەفا.

گفتوگۆی بەشداربووەکان لەسەر ڕاپۆرتی سکرتێر

لەبەرئەوەی لە ڕاپۆرتەکەی تاڵەبانیدا زۆر گرنگی بەڕەوتی گۆڕانو ئەو کەسانە درابوو کە یەکێتیان بەجێهێشتووە، هەروەها لەبەرئەوەی کە بەتوندی هێرش کرابووە سەر نەوشیروان مستەفا، بەگشتی کەشوهەوای پلنیۆمەکە واکەوتەوە کە بەشێکی سەرەکی لەقسەو باسی ئامادەبوان لەسەر ئەو باسە بێت، تەنانەت یەکێك لە کادیرە

[illegible]ی یەکێتی بەدەنگی بەرز لە هۆڵەکە هاوار دەکاتو دەڵێت «ئێستا لەم قاعەیە خەڵك هەیە دەنگی بە گۆڕان داوەو سەر بە گۆڕانە، هەق وایە بیاندۆزینەوەو بە کۆی دەنگ دەریانکەینە دەرەوە». کەسێکیش لە ڕێکخستنەکانی ئەورووپا دەڵێت «پێویستە ئێمە هەڵوێستەیەك بکەین لەسەر ئەو ڕێککەوتنە ستراتیژیەی نێوان یەکێتیو پارتی، چونکە ئێمە ئێستا خەتێکی فاسل هەیە لە نێوان ئێمەو جەماعەتی گۆڕان، بەڵام برادەرانی پارتی بە ئاشکرا لە ئەورووپا دەبینینو دەبیستن کە کۆبوونەوەیان لەگەڵ دەکەنو دانیشتنی جۆراوجۆریان لەگەڵ ئەنجام دەدەنو پەیوەندی باشیان لەگەڵیان دروستکردووە ئەمەش نازانین چۆن تەفسیری بکەین».

بێژەرێکی تەلەفزیۆنی دیاری یەکێتیش دەڵێت «ئێمە کەسمان لێ زیاد نییە، لەم هەڵبژاردنەش خەڵك هەبووە، گۆڕانیش نەبووەو دەنگی بەمەسعود بارزانی نەداوە، ناکرێت، ئێمە ئیتر بە لادەرو دژ بە بەرژەوەندییەکانی یەکێتی ناویان بەین».

مەکتەبی سیاسی هۆکاری کێشەکانن

بەشداربوانی پلینۆم بەشێکی گفتوگۆکانیان تایبەتبوو بە کێشە ناوخۆییەکانی یەکێتیو تەکەتولات کە جەستەی ئەو حیزبەی خواردووە، لەم ڕووەشەوە لەپلینۆمدا لیژنەیەك بۆ ئەم کێشەیە پێکهێنراو حاکم قادر ڕاپۆرتی لیژنەکەی خوێندەوە کە ئەم ڕەخنەو ڕاسپاردانەیان هەبوو:

- کار نەکردن بەپەیڕەوی ناوخۆی (ی.ن.ك).
- کەموکورتییەکانو دروستبوونی ئەم حاڵەتانە کە یەکێتی بەم ڕۆژەی گەیاند خودی سەرکردایەتیو مەکتەبی سیاسین کە لە ئەنجامی تەکەتولاتو دژایەتیکردنی یەکتر کاریانکردووە.
- دەوام نەکردنی مەکتەب سیاسییەکان وەکو پێویستو گرتنە دەستی چەندین پۆستو ئیشوکاری لاوەکی کە ناتوانن هیچیان وەکو پێویست بەڕێوەبەرن.
- بۆ دانانی پۆستە حیزبیو حکومییەکان مەکتەب سیاسیو سەرکردایەتی کێبەرکێیانە لەسەر دانانی خەڵکی خۆیان نەك لەسەر ئەساسی کەفائەتو لێهاتوویی.

• بوونی جیاوازیکردنو خزم خزمێنەو مەحسوبیەتو مەنسوبیەت.

• سکاڵای کەس گوێی لێناگرێت.

• بوونی جیاوازی زۆر ئیمتیازاتی شەهیدانو خەڵکیش هەیە شەهید نەبووەو کراوە بە شەهید.

• بوونی وەلائی شەخسی تارادەی ئەوەی کە لە وەلائی حیزبی بەهێزتر بێت.

• کەس ناتوانێت لە سەروەتو سامانی بەرپرسان بپرسێتەوەو نەبوونی سزاو پاداشت.

• بڵاوبوونەوەی نەخۆشی دەستەگەریو پەتای گەندەڵی لە هەموو جومگەکانی (ی.ن.ك).

• مەبدەئی جیاکردنەوەی حیزب لە حکومەت جێبەجێ ناکرێتو درێژەی هەیە.

• لێپرسینەوە لە ئەنجامی هەڵبژاردنەکان بکرێت.

• لیژنەی سکاڵا لەناو یەکێتی جێگیر بکرێت.

• ژنان لەپاشەکشەدان دەبێت لەیەك ڕێکخراودا ڕێکبخرێن.

گفتوگۆی بەشداربوان

لەسەر کێشە ناوخۆییەکان

بەشداربوانی پلنیۆم زیاتر دەستیان خستە سەر کێشە ناوخۆییەکانی یەکێتیو لەبارەی ڕاپۆرتەکەی ئەم لیژنەیەوە بەشداربوان داوایانکردووە لیژنەی نەزاهە لەناو یەکێتیدا دروستبکرێت بۆ لێپرسینەوە لەهەموو لێپرسراوەکانو ئەندامانی کۆنگرە بەهەڵبژاردن بێتو دووربێت لە مەحسوبیەت.

هەروەها بەشداربوان داوایانکردووە لێپرسینەوە لە ئاکامی هەڵبژاردنەکانی ۷/۲۵ بکرێت و مەکتەبی سیاسی واز لە دەستەگەری بهێنن.

لەم ڕووەوە کادیرێك وتوویەتی «مەکتەبی سیاسی هەیە (۳۵) ساڵە لەو پۆستەدا نایەتە خوارەوە»، داواشیکرد کە ئەگەر ئەمجارە خۆیان هەڵبژاردەوە با دەنگیان پێنەدرێت.

[illegible] مەلا بەختیار دەڵێت: سەبارەت بەرەخنەگرتن لە تەکەتولات میساقی شەرەف لەلایەن مام جەلالەوە ئیمزاکراوەو دەخرێتە دەنگدانەوە، ئەگەر بەدڵتان نەبوو هەڵوێست وەربگرن.

با ئەو هەموو نوێنەرەی سکرتێر نەمێنێت

کۆسرەت رەسوڵ سەبارەت بە کێشە ناوخۆییەکانی یەکێتی زۆر بەتوندی قسەی کردووەو وتوویەتی: هەموومان بەرپرسیارین لە ئەنجامەکانی هەڵبژاردنەکەی ۷/۲۵، بەڵام نابێت بێ ئومێد بین.

کۆسرەت رەسوڵ باسیلەوەکردووە «مەرج نییە مەسئولەکان بگۆڕین، بەڵام داوا دەکەم ئیتر واز لە تەکەتولات بهێنرێت».

هەروەها راشکاوانە کۆسرەت رەسوڵ وتوویەتی «من تەکەتولاتم کردووە، چونکە خەڵکی تر کردوویەتی، بۆیە منیش تەکەتولاتم کردووە وەکو ردفعل، با هەموومان واز لەو خەت خەتێنە بهێنین، ئەمە خەتی گشتییەو ئەمە خەتی فیسارە».

کۆسرەت رەسوڵ باسیلەوەکردووە «خەڵك هەیە زۆر دەم درێژی دەکات، بەڵام خەڵك دەیناسێت لە هەمووی گەندەڵترە، با ئەم هەموو نوێنەری مام جەلالە نەمێنێت، با ئەم هەموو سەنتەری عەشایەرییە نەمێنێت، بەناوی ئیل بەگ و عەشیرەتی ترەوە کە پارەی زۆریان بۆ سەرف دەکرێت بە بەلاش».

سەرکردایەتی یەکێتی کەسی پێ زیادناکرێت

لەپلێنۆمدا لیژنەیەك بۆ ئەو کەسانە دانراوە کە یەکێتیان بەجێهێشتووەو لەریزەکانی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتیدا بوون، دکتۆر فواد مەعسوم و دکتۆر خەسرەو راپۆرتی ئەم لیژنەیەیان ئامادەکردووەو بەم ئەنجامە گەیشتبوون.

- لەکۆی ۲۱ کەس جگە لە (۳) ئەندام نەبێت رایان لەسەر ئەوە بووە کە پێویست ناکات کەس لە شوێنی ئەو برادەرانە دابنرێت کە چوونەتە دەرەوەی حیزب تاکو کۆنگرە، چونکە رەنگە زیانی لە قازانجی بۆ ئەم قۆناغە زیاتر بێت.
- دەستەگەری لەنێو مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی بەئاشکرا هەیەو بووەتە هۆی

تێکردنی پەیوەندییەکانی ناو یەکێتیو کاریگەری خراپی بەجێهێشتووە.

• پێویستە مەکتەبی سیاسی رای خوارەوە وەرگرن بۆ بڕیارە هەستیارەکان.
• کارگێڕانی مەکتەبی سیاسی دەبێت کاری تر نەکاتو دەوامی خۆی بەباشی بکات.
• پێشنیاریان کردووە کە کۆنگرە لە ٢٠١٠/٤/١٥ تاکو ٥/١٥ ببەسترێت بەپێچەوانەوە تاکو ٢٠١٠/٦/١ شەرعیاتیان بمێنێت.
• چیتر پەیرو پێشێل نەکرێت تاکو کۆنگرە.
• رەخنەی ئەوەیان لە سەرکردایەتی گرت کە ئەنجومەنی ناوەندیان تاکو ئێستا دروستنەکردووەو پێویستە لەدوای پلنیومەوە دروستبکرێت

لەپلنیۆمدا داواکراوە،مەکتەبەکانی کۆمەڵایەتیو رێکخراوە دیموکراتییەکانو مافی مرۆڤ دابخرێن

بەشی دووەمو کۆتایی

تایبەت بەهاوڵاتی

کادیرەکانی یەکێتی لەپلنیۆمدا زۆر بەتوندی رەخنەیان لە راگەیاندنی یەکێتی گرتووەو داواشیانکردووە مەکتەکانی کۆمەڵایەتیو مافی مرۆڤو مەکتەبی رێکخراوە دیموکراتییەکان دابخرێن، بەڵام مەلا بەختیار پشتگیری لە مەکتەبی رێکخراوە دیموکراتییەکان کردووە، کە خۆی سەرپەرشتی دەکات.

یەکێتی نیشتمانی کوردستان دوای گەورەبوونی کێشە نێوخۆییەکانیو شکستەکانی لە هەڵبژاردنەکانی ٧/٢٥ بڕیاریدا پلنیۆم ببەستێتو رۆژی ١٠/٢٩ پلنیۆم بە ئامادەیی ١٥٠٠ کادیری ئەو حیزبە دەستپێیکرد، هاوڵاتی ناوەڕۆکی راپۆرتێك بڵاودەکاتەوە کە لەناو پلنیۆمەوە ئامادەکراوە.

پارتیو یەکێتی سەریان لە کەرکوکییەکان شێواندووە

ناوچە دابڕاوەکانی هەرێم لەپلنیۆمەکەی یەکێتیدا بەشێکی گفتوگۆکانی بۆ

[illegible]ەو لیژنەیەکی تایبەتی بەسەرۆکایەتی رزگار عەلی بۆ دانراوە، لە راپۆرتی ئەم لیژنەیەدا بەپێویست زانراوە کە یەکێتی پێداگری بکات لەسەر جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ی دەستوورو مانەوەی هێزە هاوبەشەکەی کورد-عێراق- ئەمەریکا لەناوچە دابڕاوەکاندا.

بەشداربوانی پلنیۆم پاش خوێندنەوەی راپۆرتی لیژنەی ناوچە دابڕاوەکان رەخنەی توندیان لە یەکێتیو پارتی گرت لەو ناوچانەو ئەندامێکی پلنیۆم وتی «ئەو کەلاوانەی کە بەناوی ئاوەدانییەوە دروستکراون یان تەواو بکرێتو بدرێت بەو خەڵك، یان ئیتر باس لە ئاوەدانی ئەو ناوچانە نەکەین«.

کادیرێکی تر باسی لە فرقەی ١٢ی سوپای عێراق کردوکە هاتوونەتە کەرکوكو بەپلان کاردەکەنو بەپێویستیشیزانی کوردیش رەدیان بدەنەوە، هەرچەندە وتیشی «کێشەکە سیاسییەو کاری سەربازی هیچ گرنگییەکی نابێت«.

کەسێکی تریش ئاماژەی بەوە کرد کە کۆچکردن لە ناوچە دابڕاوەکان زۆر زیادیکردووە، بەهۆی سیاسەتی ئەو سوپایەوە کە لە ناوچەی جەلەولاو سەعدیە جێگیر بووە. هەروەها (٨٣٧٥) کەس ناوی لە سجیلی دەنگدەران نەهاتووەتەوە کە خۆی یەکێکە لەوانە.

کێشەی حیزبایەتیو ناکۆکی نێوان یەکێتیو پارتی لە کەرکوك مشتومڕێکی زۆری لەسەرکراو یەکێك لە بەشداربووەکان وتی «ئەوە بووە بەکێشەیەکی گەورە لە کەرکوكو چەند ساڵە پێوەی دەناڵێنین کە بە دوو شێوە سیاسەتو دووِ خیتابی سیاسیو دوو ئەدەبیاتی حیزبی کار دەکرێت، خەڵکەکە لەو نێوەدا بەهۆی ئەم سیاسەتەوە سەریان لێشێواوە«.

هەر لەشرۆڤەکردنی راپۆرتی ناوچە دابڕاوەکاندا قائیمقامی خانەقین ئاماژەی بەکۆمەڵێك کێشە کردووەو وتوویەتی «وەزیرە کوردەکان لەبەغدا دەتوانن چارەسەری بکەن، بەڵام نایکەنو ئەدایان باش نەبووەو نەیانتوانیوە لەگەڵ ئەندام پەرلەمانەکان پێکەوە دیفاع لە خەڵکی ناوچە دابڕاوەکان بکەن«.

## [illegible]یاندن پەیامێکی ڕۆشنی نییە

تەنیا ٢ رۆژ پێش دەستپێکردنی پلنیۆم ١٠٦ کادیری یەکێتی لە هەولێر لەیاداشتێکیشدا پەیامێکیان ئاڕاستەی پلنیۆم کردو باسی تەکەتولاتو گەندەڵییەکانی ناو مەکتەبی ناوەندی راگەیاندنیان کردبوو.

ئەم کێشانەو دەیان کێشەی تر لەسەر دەزگاکانی راگەیاندنی یەکێتی لەپلنیۆمدا قسەی لەسەرکراو لیژنەیەك بەسەرۆکایەتی ئازاد جوندیانی بۆ ئەم مەبەستە پێکهێنراو راپۆرتێکیان بۆ پلنیۆم ئامادە کرد.

لەراپۆرتەکەی لیژنەی راگەیاندا هاتبوو «راگەیاندنی یەکێتی پلانی کورتو درێژخایەنی نییەو خیتابێکی سیاسی یەکگرتووی بۆ رووداوەکان نییەو پەیامێکی یەکگرتووی رۆشنی سیاسی بۆ راگەیاندن نییە».

راپۆرتەکە چەند راسپاردەیەکی لەخۆگرتبوو، کە تیایدا هاتبوو «یەك پەیامی مەکتەبی سیاسی هەبێتو راگەیاندنیش یەك پەیامی هەبێت، هەروەها کۆنفرانسی راگەیاندن بکرێتو بەرنامەی درێژخایەن بۆ راگەیاندن دابنرێت».

## راگەیاندن زۆر گرنگی بەپارتی دەدات

بەشداربووەکانی پلنیۆم لەسەر ئاستی دەرەوە راگەیاندنی یەکێتیان بەزۆر لاواز هەڵسەنگاندو لەسەر ئاستی ناخۆش پێیانوابوو «هەواڵەکان ئەوەندەی شتەکانی پارتی زەق دەکەنەوە، پارتی خۆی ئەوەندە ئیهتمامی پێنادات».

بۆ ئەم مەبەستەش باسیانلەوەکرد کە «لەهەواڵەکاندا باسی نێچیر دەکرێت لەکۆبوونەوەکاندا، بەڵام عیماد ئەحمەد لەپاڵیەوە دانیشتووە باسی ناکرێت».

ئەو رەخنەیەی کە زۆربەی کات رووبەڕووی میدیای دەسەڵات دەبێتەوە، لەپلنیۆمیشدا رووبەڕووی راگەیاندنی یەکێتی بووەوە، کە «راگەیاندنی یەکێتی هەر باس لە کۆبوونەوەو هەڵسوکەوتی بەرپرسانی یەکێتی دەکات، خەڵکیش ئامادەنییە بیخوێنێتەوەو گوێی لێبگرێت، چونکە ئەو هەواڵانە پەیوەندی راستەوخۆی بەخەڵکەوە نییە، خەڵك کێشەی هەیە دەبێت گرنگی بە خەڵك بدرێت».

[illegible] لەمبارەیەوە وتوویەتی «دەبێت خۆمان کەموکورتییەکانی خەڵك‌و حکومەت باس بکەین، ئەگەرنا خەڵکی نان‌و پیازی پێوە دەخوات». هەروەها ئاماژەی بەوەشکردووە کە «ئەهەمیەتی هەواڵ گرنگترە لە ڕێزبەندی پلەو پایەی بەرپرسەکان، لە ڕۆژنامەو ڕاگەیاندنەکاندا پێویستە ئەوە ڕەچاو بکرێت».

«با بەشێك لە مەکتەبەکان دابخرێن»

مەکتەبەکانی یەکێتیش لەپلینۆمەدا گفتوگۆیان لەسەرکراو لیژنییەکیش بەسەرۆکایەتی شۆڕش ئیسماعیل بۆ مەکتەبەکان پێکهێنراو ڕاپۆرتێکیان پێشکەشی ئامادەبوان کرد.

ئاڵا تاڵەبانی لەبارەی مەکتەبەکانەوە داوایکردووە «زۆربەی مەکتەبەکان نەمێنن، چونکە زۆربەی ئەم مەکتەبانە وەزارەت‌و دائیرەی حکومی خۆیان هەیە، ئیتر چ پێویست دەکات ئەم سەرلێشێواندنە دروستبکرێت».

ئاڵا تاڵەبانی وتووشیەتی «مەکتەبی کۆمەڵایەتی، مافی مرۆڤ، ڕێکخراوەکان ئەمانە لەکۆمەڵگای مەدەنیدا بوونیان عەیبەیە».

مەلا بەختیاریش لەوەڵامدا پشتیوانی لە مەکتەبی ڕێکخراوە دیموکراتییەکان کردو وتی «پەیوەندی حیزب‌و ئەو ڕێکخراوانە پەیوەندییەکی دیموکراتییە، بەبێ هیچ دەستتێوەردانێك، ئەوان خۆیان ئازادن».

هەر لەم کاتەدا دکتۆر بەرهەم بەشداریدەکات‌و دەڵێت «کادیری یەکێتی مەغدوورەو سیستمەکانی ناو یەکێتی غەڵەتەو پێویستی بەچاککردن هەیە، ئەگەر ئەوە نەکەین ناخۆشی تر چاوەڕێمانە».

لیژنە بۆ مەکتەبی سیاسی دانەنرا

وەك چاوەڕوان دەکرا ئەندامانی مەکتەبی سیاسی لە زۆربەی کێشەو کەموکورییەکان خۆیان دوورخستەوەو پلنیۆم هیچ لیژنەیەکی بۆ مەکتەبی سیاسی دروستنە کرد، لەم بارەیەشەوە ئەندامێکی مەکتەی کۆمەڵایەتی وتوویەتی «ئێمە داوامانکرد لیژنەیەك لەسەر مەکتەبی سیاسی دروستبکرێت، چونکە لەم پلنیۆمەدا

لیژنە بۆ هەموو شتەکان دروستکرا، بەڵام ئەم لیژنەیە پشتگوێخرا«.

زۆرکردن لەسەر فیکری جیابووەوەکان



ئەگەرچی پێش بەستنی پلنیۆم زۆربەی ئەنـدامانی مەکتـەبی سیاسـیو سـەرکردایەتی باسیانلەوەدەکرد کە پلنیۆم کێشەی ئەو ئەندامانە یکلایی دەکاتەوە کە چوونەتە نـاو بزووتنەوەی گۆڕان، بەڵام رۆژانی پلنیۆم ئەم کارە پێچەوانە بووەوە...

## [illegible]شیروان ) گرەو لەسەر ئەسپی تۆپیوو ئەکات

(١)

نوسینی حسێن بەفرین

سەرەتا ئەمەوێ ئەوە بلێم لەم کاتەدا کە ئەم نووسینە بلاو ئەکەمەوە، ئەبینم حیزبە کوردیەکان خەریکن خۆیان و خەلك بۆ دەنگدان و هەلبژاردنی (پەرلەمان) تەیار ئەکەن، من لە لایەن خۆمەوە بە دلنیایی یەوە ئەلێم شتێکی وەها، دوورو نزیك هیچ پەیوەندییەکی بە من و نووسینەکەمەوە نی یەو وەزعەکەش چۆنەوچۆن نی یە بە لامەوە گرنگ نی یە چونکە من هیچ بڕوایەکم بە هەلبژاردن و دەنگدان نی یەو نەبووە ئەوەش بە شێوازێکی تری خەلك خەلەتاندن ئەبینم و لام وایە فێلێکە لە فێلە ئەفسانەیەکانی بورژوازیەت و کردەوەیەکی وەهاش تا ئێستا لە بستێکی سەر زەویدا هیچی بۆ مرۆڤایەتی سەوز نەکردووە تا گول بۆ کورد بگرێت.

هەروەها ئەمەوێ ئەوەش ڕوون کەمەوە کە ئەم نوسینەم لەم کاتەدا هیچ پەیوەندی یەکی کەم تا زۆری بەو شەپۆلی (بەناو رەخنەو قسەو باسانەوە) نی یە کە کۆمەلێك خەلکی (ئەملاو ئەولا)ی (پارتی و یەکێتی) بەرامبەر بە کاك (نەوشیروان) ئەیکەن و پلەو پایەی خۆیانی پێ قایم ئەکەن، بەلکو قسەکانی من ڕاست و ڕەوان لەسە ئەو کتێبی (ئێمەو ئەوان)ەیە کە خۆی لەم کاتەدا خراوەتە بازاڕەوەو ناشمەوێ چاوی لێ بنوقێنم و ئەوەی ڕاستی بێت ئەمەوێ منیش وەك قەلەمێك ئەوەی هەیەو بووەو لە سنووری ئەو قسانەدا شیاون بۆوتن بیخەمە بەرچاوی مێژوو، چەندەش درێژە بکێشێت بەلامەوە گرنگ نی یە بەلکو ئەوەی بەلامەوە گرنگە، وتنی ئەو بەسەرهات و شتە شاراوانەیە کە لە پشتی پەردەوە تا ئێستاش حەشار دراون، لە سەرووی هەموو ئەمانەشەوە سەرهەلدانی بیروڕای بزووتنەوەیەکی پڕ مەترسی ڕۆشنبیری و کۆمەلایەتی و سیاسی (شۆڤینیەتی کورد)ە کە لە دوای (ڕاپەڕین)ی (١٩٩١)وە جارێکی تر دەستی داوەتە خۆ کۆکردنەوەو سەرەجوولە.. سەرەتاش لە

بری ئەدەبی‌و رۆشنبیری یەوە هاتە پێشەوەو دواتر خەریکە بەرەو بوارەکانی کۆمەڵایەتی‌و سیاسی‌و تەنانەت حیزبایەتیش بەرێکەوتووە چونکە ئەو بیرورایەی (شۆڤینیەتی کورد) هەر لە ساڵەکانی پەنجای سەدەی بیستەمەوە تا بە ئەمڕۆ ئەگات سەری هەڵداوەو خەریکی خۆ چەسپاندنە، بە تایبەتی لە (١٩٩١) بەدواوە زیاد لە پێویست دەرگای کارکردن‌و خۆ ڕێکخستنی لەسەر والاّ کراوەو پاش ئەوەی بوارەکانی ئەدەبی‌و فیکری‌و رۆشنبیری بۆ خۆی قۆرخ کرد، وا خەریکە بەرەو بواری کۆمەلاّیەتی سیاسی هەتا (حیزبایەتی) یش گوورِ ئەسێنێ ئەمرِۆ وەك ئەوەی (هەنگی لە داردا دۆزبێتەوە)و خواستەکانی خۆی لە کەسێتی ئەو (پیاوە)دا دیبێتەوە خۆی لە دەوروبەری مۆڵداوەو وەك رابەرێکی سیاسی (بێ هاوتا) ناوی ئەبات‌و خەریکی سازدانی پڕوپاگەندەیەکی بێ سنوورە بۆ ئەوەی زوو بێت یا درەنگ لە سایەی ئەوەدا ئەو (بزووتنەوە فاشیستی) یەی خەونی پێوە ئەبینرێت لە دایك بێت، ئەو (پیاوە)ش چ لە شاخ‌و چ لە دوای (راپەرین)ی (١٩٩١)وە کەمتەرخەمی لە بردنە پێشەوەی ئەو حالە نەکردووەو بە (ئاگایی)یەوە کاری بۆ کردووەو کۆمەکی پیادە کردنی داوە وەك قەناعەتێك بە هاوتەریبی خۆی چاوی لێ ئەکات، ئەگەر دوێنێ ئەم (بیرورا شۆڤێنیە) بە شێوازەکانی (خۆ بە کوردزانین)و (بەسەرزارەکی شوسیالیستویست)و.......هتد ئیدعای بۆ خۆی کردبێت ئەوا ئەمرِۆ بە شێوازەکانی: (تازەگەرچی، مۆدێرنێتە خواز، ریفۆرمباز، بەدەم خۆ بە دژی دەسەلاّتزان‌و ....... هتد) خۆی ئەنوێنێ. چونکە (فاشیەت) چەندە دەربڕی لوتکەی دڕندەیی ئیمپرالیزمە بەرامبەر بەوە ئەوەندەش هەڵگری ماکی دەمارگیری‌و تاریکبینی وردە بورژوازی گەلانی ژێر دەست‌و داگیرکراوە، ئەگەر ئەم نووسینە تا ئێرە بە پێشەکی چوونە ناو بابەتەکە وەربگرین‌و بەسەریدا بێینە سەر کتێبی (ئێمەو ئەوان). ئەبینین ئەم کتێبە وەك لە ناوەکەیدا دەرئەکەوێت باس لە بابەتێکی دیاریکراو ناکات بەڵکو لە چەند وتارێکی جیاجیا پێکهاتووەو هیچیان ناچنەوە سەر یەکتر بەڵکو هەر یەکەیان لە شتێك ئەدوێت‌و هیچ هاوبەشیەك لەگەڵ یەکدا کۆیان ناکاتەوە، دیارە لە هەمووشیان

گرنگ ئەو وتارەیە کە ناوی کتێبەکەی بۆ خۆی مسۆگەر کردووە، منیش بە پێی نەزانم ئەو باسە بکەمە جێگەی قسە لەسەرکردنی کتێبەکە تا لەوێوە بەرەو جەرگەی مەبەستی هەردوولا هەنگاو هەڵگرم، پێم وانی یە نووسەر نکۆڵی لەوە بکات ئەگەر وا نەبێت مانای وایە بە گۆترە ئەو بۆچوونەی هەڵبژاردووە، ئەوەش مانای نی یە چونکە ئەو لەو نووسینەدا ئەو شتانە دیاری ئەکات کە لای ئەو مانای خۆی هەیەو دەست بەسەرداریان نابێتو بە بیربڕوای وەرگرتووە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی وەك وتارەکانی تری نووسەر نی یە وەك بابەت سەیری کرابێت بەڵکو بە (جدی) هەوڵی نووسینی داوەو قسەی خۆی تیادا کردووە، ئەگەر دوای ئەوە بێینەوە سەر دەقی نووسینی (ئێمەو ئەوان) ئەبینین هەر لە سەرەتاوە بەم جۆرە ئەو (ئێمە)یەمان پێ ئەناسێنێ ئەڵێ: (ئێمە ئەوانەی رەخنە لە دەسەڵات ئەگرن) ل٥٩ /ئێمەو ئەوان/ هەروەها بۆ (ئەوان)یش ئەڵێ: (ئەوان ئەوانەی داکۆکی لە دەسەڵات ئەکەن) ل٥٩/ ئێمەو ئەوان/ ئەمە ئەو ڕاستی یەیە کە هەر لەسەرەتاوە خۆی دەناسێنێو پێت ئەڵێ ئەوان کێنو کێ نین، (ئێمە)کەی تریش بۆمان هەیە قسە لەسەر ئەم (ئێمەو ئەوان)ی هەموو (ئەوان)ەکان بکەینو بزانین راستو رەوان (ئەوان) کێنو تا چەندە ئەو جیاکردنەوانەیان راستو دروستی تیایە. کاتێك (نووسەری ئێمە) بڕیاری ئەوە ئەدا کە کارو کردەوەی (ئەوان) تەنها کێشەی (رەخنە لە دەسەڵات) گرتنەو هیچی تر، ئەمەش بەو مانایە دێت کە (ئەوان) هەر لە سنووری بازنەی دەسەڵاتدانو نایانەوێ لێی دەرچنو بچنە سنووری (ئۆبۆزسیون) یەوەو دژایەتی راستەقینەی (دەسەڵات) بکەن، ئەمە ڕاستی یەکەو خەڵکی بێ ئاگاو ناهوشیار هەڵیان گێراوەتەوەو بە (ئۆپۆزسیون) بوونی حساب ئەکەن، لەوە ئەچێ هاوکارانی خودی نووسەر ناراستەوخۆ لە پشتی ئەو ئیدعا کردنەی ناو خەڵکەوە بنو بە (ئیزدیواجیانە) کار لە کێشەکەدا بکەنو لە سەرەوە جۆرێك دیاردەکە باس بکەنو لە ژێریشەوە جۆرێکی تر هەڵسوکەوت بکەن.

هەرچۆن بێت گرنگ ئەوەیە (نووسەری ئێمە) خۆی ئەنی یە راستی دا ناوەو هەرگیز

خۆی به (شیاو)ی ئەوە نازانێت لەو سنووره لابدات‌و لە بازنەی دەسەڵات بچێتە دەرەوە، هەر کەسیش نووسەر بناسێت ئەزانێت ئەو راستی یەکەی وتووەو خۆی بە رەخنەگرێك زیاتر نازانێت‌و ئەو هاشوهوشەی کە بە دەمیەوە ئەکرێت بایەو بەلای (هین)دا ئەڕوات، ئەو درۆ ناکات چونکە خۆی بەشێکی زیندووی ئەو دەسەڵاتەیەو چۆنی بوێت وەها بۆی سەرئەچێت، ئەو خۆی عادەتی وایە حەزی لە دانیشتنی سەر (کوردسی دەسەڵات) نی یە کەچی یاری بە (کورسی دەسەڵات) ئەکات‌و لە هەموو بڕیارێکدا دەست ڕۆیشتووەو براگەورەی زۆرینەی ناو دەسەڵاتی حیزبایەتی کوردە، ئەمەش حەقیقەتێکە منالی سەرجادەش هەستی پێ ئەکات.

[illegible] پێویستی یەکی مێژوویی ئەم پرسیارانە قوت ئەکاتەوەو داوای ڕوونگردنەوەیان ئەکاتو ئەڵێت: ئەو هۆیانە چین کە نووسەری (ئێمەوئەوان) ناچار ئەکات خۆی لە سنووری دەسەڵاتدا قەتیس بکاتو حازر نەبێت حیزبێکی تر بۆ سەر حیزبە زۆرو زەبەندەکانی کوردی باشوور زیاد بکات؟ تۆ بڵێیت ئەو هەموو هاشو هووشەی کە لە میدیاکانی هەردوو حیزبی دەسەڵاتدارەوە لە لای خەڵکی (ئەم لاو ئەولا)وە دەربارەی ئەم (پیاوە) ئەکرێت جێ ی بڕوا پێکردن بێت یا شتی تری لە پشتەوەیە؟ تۆ بڵێیت لە بواری تاکتیكو تاکتیکبازیدا هەوڵدانەکانی ئەو (پیاوە) لەگەڵ (سکرتێری گشتی یەکێتی)دا دوو دیوی یەك پارە نەبن؟ تۆ بڵێیت ئەمەش جۆرە گاڵتەجاڕییەك نەبێت کە دەسەڵاتی حیزبایەتی کورد دایناپێت بۆ بەگەڕخستنو هاندانی (خەڵکی بێزار بووی کورد) بەرەو سندووقەکانی دەنگدانو نیشاندانی دیوی (بە حساب دیموکراتی) ئەو دەسەڵاتە؟ پێم وایە وەڵام دانەوەی ئەو پرسیارانە سەرەڕای ئەوەی زۆر شت ڕوون ئەکاتەوە لە هەمان کاتدا ڕێگەش بۆ نزیك کەوتنەوە لە (ئەسپەتۆپیو)وەکە خۆش ئەکات.

لەبەرئەوە بە ئەرکی سەرشانی خۆمی ئەزانم بەر لەوەی لە هەر دەرگایەکی تر بدەم بە پێ ی ئەم شوێنە وەڵامی تەواوی ئەو پرسیارانە بدەمەوە کە ڕوبەڕوم بووەتەوە، هەرگیز ئەو وەڵامدانەوەیەش بە لەرێ لادانو دوورکەوتنەوە لە بابەتەکەی نازانم بەڵکو بە پێچەوانەوە لە زۆر لاوە ڕووناکی ئەخاتە سەر هەندێك نهێنی شاراوەی مێژووی سیاسیو حیزبایەتی کوردو ڕاستکردنەوەی ئەو شتە چەوتانەی بە گوێ ی ئێمەومانانیشدا دراوە، لەبەرئەوە بۆچوونە ناو باسەکەوە پێویستە بەلای کەمەوە (چەند دێڕێکی درشت) لە ژیانی سیاسی کۆنو نوێ ی کاك (نەوشیروان) بخەینە بەرچاوان تا هیچ نەبێ (کەمێك) لە کەسێتیو باری تێگەیشتنی سیاسیو جۆری بیروبۆچوونی (ئەو) تێ بگەین بۆ ئەوەی بەهۆیەوە بتوانین قسە لەسەر کێشەکان بکەین، وەك ئەزانین کەسێکی وەك نووسەری (ئێمەوئەوان) بۆ (نیو سەدە) ئەچێت

خەریكی كاری سیاسیو حیزبایەتی یەو ئەوەش بۆ (ئەو) وەك (پیشە)یەكی سەرەكی ژیانی لێهاتووە بۆیە لێرەدا وا پێویست ئەكات ئاماژەیەكی زۆر كورت بەو حیزبو رێكخراوانە بكەین كە ئەم (پیاوە)ی تێدا گۆش بووەو بە درێژایی ژیانی كاریگەریان لەسەر بیرو بۆچوونو هەڵسوكەوتی بووە، ئەویش بەم جۆرەیە:

بەر لە تێكچوونی (كۆماری مەهاباد) لە باشووری كوردستانو لە (١٦ ئابی ١٩٤٦)دا بە نوێنەرایەتی (هەمزە عەبدولاّ) لە لایەن (بارزانی) رەحمەتی یەوە لە شاری (بەغداد) بە ئامادەبوونی (٣٢) نوێنەر كۆنگرەی دامەزراندنی (بەلاّیەكی نەخوازراوی سیاسی) بە ناوی (پارتی دیموكراتی كورد)ەوە بەستراو لە دوایی دا ئەمانە بۆ سەركردایەتی ئەو (پارتی) یە هەڵبژێردران:

١. مەلا مستەفا بارزانی سەرۆك
٢. شێخ لەتیف شێخ محمود جێگری یەكەمی سەرۆك
٣. كاكە زیاد جێگری دووەمی سەرۆك
٤. هەمزە عەبدولاّ سكرتێری حیزب
٥. میرحاج ئەحمەد
٦. د. جەعفەر
٧. علی عەبدولاّ
٨. سالّح یوسفی
٩. عەبدولكەریم تۆفیق
١٠. رەشید عەبدولقادر
١١. رەشید باجەلان
١٢. مەلا حەكیم خانەقینی
١٣. عەونی یوسف
١٤. تەها محێدین مەعروف
١٥. مستەفا خۆشناو

١٦. عەبدولسەمەد محەمەد



هەروەها لە ئازاری (١٩٥١)دا هەر لە شاری (بەغداد) کۆنگرەی دووەمی بەستو لە (٢٦)ی کانوونی دووەمی (١٩٥٣)یش لە شاری (کەرکوك)دا کۆنگرەی سێهەمی بەستو ناوی حیزب لە (پارتی دیموکراتی کورد)ەوە کرا بە (پارتی دیموکراتی کوردستان)و ئەم کەسانەش بۆ سەرکردایەتی هەڵبژێردران:

١. بارزانی سەرۆك

٢. میرحاج

٣. د. جەعفەر

٤. برایم ئەحمەد سکرتێری حیزب

٥. نوری شاوەیس

٦. عەلی عەبدوڵا

٧. نوری ئەحمەد تەها

٨. جەلال تالەبانی

٩. عومەر مستەفا (دەبابە)

١٠. عەلی حەمدی

١١. ڕەشید عەبدولقادر

١٢. حمە ئەمین مەعروف

١٣. جەلیل هوشیار

دوای ئەوەی عێراق بووە کۆماریو بارودۆخە سیاسیو کۆمەڵایەتی یەکە گۆڕدرا (پارتی) ناچار بوو لە (٦)ی تشرینی یەکەمی (١٩٥٩)دا کۆنگرەی چوارەمی بگرێتو هەر لەو کۆنگرەیەشدا باڵی (هەمزە عەبدوڵاو ساڵح حەیدەری و حەمید عوسمانو ساڵح روشدی و شێخ شەهاب شێخ نوریو کەسانی تر) لەسەر بیروبڕوای چەپگەرایی لە حیزب دەرکرد.

جارێکی تر دوای ئەوەی (مۆڵەتی ڕەسمی وەرگرت) بۆ چارەسەرکردنی کێشە حیزبی



[illegible]ەکان لە (٥ تا ٨)ی مایسی (١٩٦٠) کۆنگرەی پێنجەمی لە شاری (بەغداد) بە [illegible] گرت‌و ئەم کەسانەی بۆ سەرکردایەتی هەڵبژارد:

١. بارزانی سەرۆك

٢. برایم ئەحمەد سکرتێر

٣. نوری شاوەیس

٤. عومەر دەبابە

٥. د. مراد عەزیز

٦. ساڵح یوسفی

٧. عەلی عەبدوڵڵا

٨. عەلی عەسکەری

٩. هاشم عەقراوی

١٠. جەلال عەبدولرەحمان

١١. ناهیدە شێخ سەلام

١٢. عەبدوڵلا ئیسماعیل

١٣. ئەحمەد عەبدوڵلا

١٤. عەلی حەمدی

١٥. عەبدولحسین فەیلی

١٦. جەلال تاڵەبانی

١٧. سەید عەزیز شەمزینی

١٨. نوری ئەحمەد تەها

١٩. عەبدولرەحمان زەبیحی

بەلاَم وەزعی سیاسی لە عێراقدا بەرەو تێکچوون ڕۆیشت‌و (پارتی) لە ئەیلولی (١٩٦١)دا بە ناوی ڕزگاری کوردستان‌و بەدەستهێنانی مافی کورد دەستی دایە چەك‌و دروستکردنی هێزی پێشمەرگە، لە دوای ڕووخانی دەسەلاّتی (عەبدولکەریم

قاسم)و هاتنه سەرکاری حیزبی (بەعس) و (قەومی یەکان)، پارتی کەوتە (مفاوەزات) بەلاّم لە ئەنجامدا هیچی سەوز نەکرد، لە (شوباتی ١٩٦٤) جارێکی تر (بارزانی) بە خاتری (مفەوەزات) شەڕی وەستانەوە، ئەوەش بووە هۆی تێکچوونی بارەگای پارتی لە (ماوەت) کە بە (مەکتەبی سیاسی) ناو ئەبرا و (بارزانی)و بەمەش شەڕی براکوژی دەستی پێکردو (پارتی) بووە دوو بەش، بەشێکی بە ناوی باڵی (مەکتەبی سیاسی) کە بە (جەلالی) ناوی دەرچوو.... بەشەکەی تریش بە (مەلایی) ناسرا.... بەرلەوەی (بارزانی) هێرش بکاتە سەر بارەگای (مەکتەبی سیاسی) لیژنەی ناوەندی لە (١)ی نیسانی (١٩٦٤) لە (ماوەت) کۆنفرانسێکی بەستو قسەو باسی لە سەربەیانی (دەی شوبات) کردو بڕیاری لابردنی (بارزانی) یان لە سەرۆکی پارتی بەکۆی دەنگ دا.

لە ئەنجامی ئەو شەڕەدا (جەلالی)یەکان کران بە دیوی (ئێران)داو برانە شاری (هەمەدان)، بەلاّم دوای یەکدو ساڵ (بارزانی) ڕێ ی پێدان بگەڕێنەوە کوردستان، لە دوای ئەو ڕێکەوتنەی (پارتی)و (حکومەتی عێراقی) کە بە بەیانی (٩)ی حوزەیران (١٩٦٦) ناسراوە (جەلالی یەکان) چوونە پاڵ (حکومەت)و لە (کەلار) کۆنگرەیەکیان بە ناوی (کۆنگرەی شەشەمی پارتی) لە (٢٢ بۆ ٢٧ ی مارتی ١٩٦٧) گرتو ئەم کەسانە بۆ سەرکردایەتی هەڵبژێردران:

١. برایم ئەحمەد سکرتێر
٢. عومەر دەبابە
٣. عەبدولرەحمان زەبیحی
٤. جەلال حسامەدین تاڵەبانی
٥. ئەحمەد عەبدولاّ
٦. محەمەد حاجی تاهیر
٧. عەباس حسین
٨. سەعدی دزەیی

٩. ئەحمەد دزەیی
١٠. حمه مین فەرەج
١١. کەمال محی یەدین
١٢. حیلمی عەلی شەریف
١٣. روشدی عەلی شەریف
١٤. عەلی عەسکەری
١٥. کەمال فوئاد
١٦. مەلا عەبدولاّ (مەلا ماتۆڕ)
١٧. خالید دلێر

ئەمەش بووە هۆی ئەوەی چەند ساڵ شەڕی خوێناوی لە نێوان ئەم دووباڵەی (پارتی)دا ڕوویداو سەدان ڕۆڵەی ئازای کورد کرانە قوربانیو هەزارانیش ئاوارەو ماڵ وێرانی پێگەیشت تا دوای ڕێکەوتنی (حکومەتی بەعس)و (بارزانی) لە ساڵی (١٩٧٠)دا هاتە دیو بە (بەیانی ١١ی ئازار) ناسرا، ئەوسا باڵی (جەلالی) لەسەر داوای (پارتی) بەناوی کۆنگرەی حەوتەمی حیزبەوە ناوی خۆی کرد بە (پارتی شۆڕشگێڕی کوردستان)و خۆی ڕادەستی ناو ڕیزەکانی (پارتی) کردەوە، ئەوەی شایەنی باسکردنە ئەوەیە کە لە (١٩٧٢/١٢/٢٧) بەیانێك بە ناوی (چەند کادرێکی پارتی شۆڕشگێڕی کوردستان) بۆ ئەو مەبەستە بلاّوکرایەوە کە کۆتایی یەکەی وەها بوو: (ئێمە لێرەدا ئەو داواکردنەی کۆنگرەی حەوتەمی حیزبی شۆڕشگێڕی (حل کراو) دووبارە ئەکەینەوە کە لە کۆتایی بەیانە مێژوویی یەکەیدا کراوە، ئەوەش خەباتی بەردەوامە لە پێناوی توندکردنو بەهێزکردنی یەك ڕیزی پارتی دیموکراتی کوردستانو یەکگرتنی گەلی کوردمانو ڕۆژ بە ڕۆژیش کۆببوونەوە لە دەوری سەرکردایەتی بارزانی یە لەبەرئەوەی زەمانەتی هەموو سەرکەوتنەکانمان ئەکات: ئیمزا پارێزەر برایم ئەحمەد، ئیمزا پارێزەر جەلال تالەبانی، ئیمزا پارێزەر عومەر مستەفا، ئیمزا عەلی عەسکەری لە ١٩٧٢/١٢/٢٧) ئیتر هەموو شتەکان

گرابوون‌و ئاو بە ئاگردا کراو ئەوەی چووەوە ناو (پارتی) چوو، ئەوەش [illegible]ڕەوە بۆ خۆی دورکەوتەوە، لێرەدا کێشەی دروستبوونی ڕێکخراوێکی عیلمانی هاتە ئاراوە کە ناوی (کۆمەڵە)ی بەسردا سەپاو زۆر (درۆی شاخدار) بەدەم لە دایك بوونی ئەو بە ناو ڕێکخراوە (نیوە مردوو نیوە زیندوو)ەوە کراوەو نوسراوە ( کە ئێرە شوێنی باسکردنی نی یە) ئێمە ئەبینین کەسێکی وەك کاك (نەوشیروان) تا ئەم کاتانەش هیچ نەبێ هێندەی (حەمەی حاجی تاهیر یا خالید دلێر یا کەسانی تر) ناوی نەهاتووە تەنها ئەوەندە نەبێ وەك کادرێکی ئەعلامی ناوی هەبووە ئەویش لە دەرکردنی گۆڤاری (ڕزگاری)دا بوو کە دوای بەیانی (١١)ی ئازاری (١٩٧٠)یش بەهۆی بەسەرهاتێکی ناخۆشەوە ناچار بوو لە وڵات هەڵهات‌و ڕووی لە ئەورووپا کرد، دوای هەڵهاتنی (ئەو)یش ڕووداوە سیاسی یەکانی باشووری کوردستان هەر درێژەی هەبوو تا لە (١٩٧٥)دا بە پێی پیلانی (جەزائیر) کورد زیانی کردو دووچاری (ئاشبەتاڵ)ێکی چەکداری‌و کۆمەڵایەتی‌و سیاسی بووەوە (کە ئێرە جێ ی باسکردنی نی یە).

دوای (١٩٧٥) جارێکی تر لێرەو لەوێ جوڵە کەوتەوە ناو کۆمەڵگاو وردە هێزی چەکداری (جۆربەجۆر) سەری هەڵداو خۆی بۆ ژیانی (پارتیزانی) تەیار کرد، لەوانەش (کۆمەڵە – بزووتنەوە – پارتی (قیادە مۆقەتە – پاسۆك) کە لە ئەنجای ڕێکەوتنی نێوان (کۆمەڵەو بزووتنەوە)دا (یەکێتی نیشتمانی) پێکهات‌و دواتر (بزووتنەوە لە ڕێکەوتنەکە چووە دەرو لەگەڵ باڵی (د. مەحمود عوسمان) ڕێکەوت‌و (حسك)یان دروست کرد، دوای ئەوەی (کۆمەڵە) بە ناوی (یەکێتی نیشتمانی) مایەوەو (بە خەیاڵ) چەند باڵێکی سیاسی داتاشراو بە ناوەکانی (بزووتنەوە – خەتی گشتی) کرایە هاوڕێ ی تەنیا کەوتنی (کۆمەڵە)و مەیدانی بە حساب ململانێ ی جیاوازی بیروڕا، ئەمەش تاکتیکی (سکرتێری گشتی یەکێتی) بوو کە ئەیویست بە قەناعەتێکی (ماوی)یەوە هیچ نەبێ (سیهانۆك)ێکی کورد دەرچێت لە دوای شەهید بوونی (کاك ئارام) (کۆمەڵە) ئەقلێتێکی تازەی بە بەرداکراو کرا بە (کۆمەڵەی

ڕەنجدەرانی کوردستان)و بە (حازرو بزری) تەسلیم بە کاك (نەوشیروان) کراو لە دوای کۆنفرانسی یەکەمی (١٩٨١)وە وردە وردە ئاژاوەی بیروڕا کەوتە ناو ڕیزەکانی ئەو (کۆمەڵە) ئەقڵ تازەیەوەو دەیان ڕێکخراوی چەپی وەك (کارگەران)ی لێ جیابووەوەو دواهەمینیان (ئاڵای شۆڕش)بوو کە بە (ئاشەکەی مەلا بەختیار) ناسراو لە دوای ڕاپەڕین بە ناوی (حیزبی زەحمەتکێشان)ەوە گەڕایەوە ناو (یەکێتی نیشتمانی)ی دایکیەوە وەك ئەوەی نە بای دی بێت و نە بۆران.

بۆ کەسێکی وەك کاك (نەوشیروان) ئەمانەی باسکران هەموو ئەزموونی سیاسی و حیزبایەتی لەبەرچاوگیراون و خۆی شایەتی ڕوودانی هەر هەموویانە لەبەرئەوەیە نایەوێت حیزبێکی تازە بخاتە سەر زیادکردنی ژمارەی حیزبەکان بەڵکو ئەو وەك (یەکێتی نیشتمانی کوردستان – باڵی ڕیفۆرم) خۆی ڕائەگەیەنێت و هیچی تر.

وای بە پێویست ئەزانم بۆ وەڵامی پرسیارەکانی تر کە ماون وەها بدوێم:

لە (١٩٨١/٧/٩)دا ڕۆژی یادی شەهید بوونی (بورهان مستەفا) ناسراو بە (فەرهاد) بوو من بۆ دواجار جانتاکەم دابەشاندو سەرکردایەتی (یەکێتی نیشتمانی)یم جیٚ هێشتو بە دوو نامەی (سالار عزیز) و (ناوەندی کۆمەڵە)وە کە وەك بەهانە بوون بۆ وازهێنانم لە پێشمەرگایەتی بەرەو (بۆکان) و سەرکردایەتی (کۆمەڵەی زەحمەتکێشان) ڕۆیشتمو ماوەیەك وەك میوان مامەوەو دواتر چووم لەسەر سنوور لە (بلەکێ) دانیشتم ئیتر لەو ڕۆژەوە منیش خرامە لیستی (عێراقچێتی) یەکەی (یەکێتی)یەوەو کەوتمە ژێر چاودێری (د.ك.د)وە کە دەزگایەکی جاسوسی بوو لە لایەن شەخسی کاك (نەوشیروان)ەوە دروست کرابوو ئەندامانی ئەم دەزگا جاسوسی یە قەمعی یەش ئەبووایە (سەرف نەوشیروانی) بوونایە.
کە ئەو سنوورە لە لایەن (کۆماری ئیسلامی ئێران)ەوە گیرایەوە ئیتر من ناچار بووم ڕوو بکەمە دێهاتەکانی شارباژێر چونکە بە ڕەچەڵەك خۆم خەڵکی ئەو ناوە بووم خەڵك حورمەتیان بۆ دائەنام ئەگەر چی تا ئەهات (د.ك.د) تەنگی پیٚ هەڵ ئەچنیمو هەر دەمە نادەمێك ناچار ئەبووم لەبەر بیٚ جیٚو ڕێگەیی ڕوو لە دیٚ یەك بکەمو (د.ك.د)یش لە ژێرەوە خەڵکی ئەو دیٚ یەیان لیٚ رائەسپاردم کە ئەمە (عیراقچی)یەو سەر بە (موخابەراتی عیراقی)یەو ئاگاتان لە هەڵسوکەوتی بێتو هاتوچۆی مەکەنو نزیکی مەکەونەوەو .... هتد، بە ڕاستی (ب.ف.) کە بەرپرسی (د.ك.د)ی ئەو ناوە بوو زۆر ناخۆشی کرد بوو لەم هەموو (دیٚ بە دیٚ کردنەدا) کوڕێکی جوانم بە ناوی (تێبین)ەوە بوو بە قوربانی ئەو وەزعە ناخۆشەی کە پیاوەکانی کاك (نەوشیروان) بەسەر منیاندا ئەهێنا، دوای مردنی کوڕەکەم زۆر بیٚ وەزعو ڕیٚ بوومو ماڵو منالم هەر یەك نارد بۆ جیٚ یەك، لەو کاتەدا بوو (فەرهاد سەنگاوی) بە شیرە شیرە ناخۆشەکەی هەڕەشەی (بانچەپی) لە رادیۆوە راگەیاند ئەو راگەیاندنە زەنگی

مەترسی گرتن و لێدان و کوشتن بوو کە (یەکێتی) ئەیویست بیکات ..... بە برادەرانم وت (ئیتر ئەوە نیشانەی دەست وەشاندنی یەکێتی یەو زۆری بۆ هاتووەو من ئەزانم دەست ئەکات بە تەسفی یە کردنی جەستەیی و هار ئەبێت)، لەبەرئەوەی من بێ چەك بووم و پێشمەرگە نەمابووم و برادەرانم زۆریان بۆم هێنا کە ئەبێ لەو ناوچانەی ژێر دەسەلاتی (یەکێتی) دوور بکەومەوەو ڕوو لە ناوچەی (جود) بکەم بۆ من ئەوێ سەلامەت ترەو بە گوێم کردن جوابم بۆ برادەرانی پارتی ناردو ئەوانیش ڕێ گریان نەکردو چوومە ئەو ناوچەیە، بە چەند ڕۆژێك دوای من (یەکەم مەفرەزەی ئالای شۆڕش)یش لە لایەن شەهید (شێخ حسینە سوور) پەڕینەوەو هاتنە ئەو ناوەو دوای یەکدوو ڕۆژ (شێخ حسین) سەردانی کردم و یەکترمان دی و لەو دیدارەدا قسەیەکی خۆشی شەهید (عوسمانی قالە منەوەر)ی بۆ گێڕامەوەو وتی: ( کە گەیشتینە لای لقی چوار (عوسمان) ئێمەی دی و بەسەرسووڕمانەوە بەخێرهاتنی کردین و وتی یا شێخ ئەوە شکور تەسلیمی برادەرانی پارتی بوون، منیش بە پێکەنینەوە وتم: نەوەڵا کاك عوسمان ئێمە ڕێکخراوێکین بە ناوی (ئالای شۆڕش)ەوە لە (یەکێتی) جیابووینەتەوەو ئەمانەوێ لێرەوە دەست پێ بکەینەوەو (پارتی) وەك دۆست و پشتێکی سیاسی یارمەتیمان ئەدات و هاودەرد یمان ئەکات، ئەویش پاش کەمێك مات بوون و بێ دەنگی پێی وتم: کاك شێخ بە ڕاستی ئەو کاك (ئیدریس)و کاك (مەسعود)ە بەستەزمان و قوڕبەسەرن و نازانن و خەریکن بێچووە مار بەخێو ئەکەن). بە ڕاستی وابوو من ئاگادارم کە (پارتی) چەند دڵی بە برادەرانی (ئالا) خۆش بوو، بڕوای وابوو (ئالا) مایەی ڕووخاندنی قەڵای (یەکێتی)و بڕانەوەیەتی و ئیتر مەرگی (جەلالی) بە چاوی خۆی ئەبینێ و هەموو ململانێ یەك تەواو ئەبێ ئەگەر چی (ئالا) لە ڕەگەوە (یەکێتی) هەڵتەکان و کارێکی وای بەسەرهێنا جارێکی تر نەبووەوە بە (یەکێتی)یەکەی جاران بەڵام (بە هەزارو یەك فێڵ) خۆی گرتەوەو توانی لە ڕێگەی (ئێران و حزبی شیوعی و پاسۆك و حسك)ەوە (پارتی)شی ناچار بکات (بەرەی کوردستانی) لەگەڵدا پێك بهێنێ و دواتریش ببێتە بەشێك لە دەسەلاتی ناو ولاتەکە

وەك هەیە. ئەگەر لە سەر ناوەڕۆكی ئەو قسەو باسەی پێشەوە بێین بۆ ڕۆژێكی وەك [illegible]ین و لەبیروبۆچوونی (پارتی) وردبینەوەو سەیری هاتو هاواری گوایە جیابوونەوەی كەسێكی وەك كاك (نەوشیروان)یش بكەین كە لە چاو جیابوونەوەی (ئاش)دا لە هەموو ڕوویەكەوە جیاوازەو سەنگو قورسایی یەكی تری هەیە كەچی (پارتی)نە بەو(دۆعایە ئەڵێ ئامین)و نەموویەكیش لە لەشی ئەجوڵێنێو نە بە قەد نووكە دەرزیەكیش دڵی پێ خۆشەو نە لایەن گری لێ ئەكات تەنانەت دژیشی قسە ئەكاتو حەزی لە چارەی نی یە لە بری ئەوەی لەگەڵ ئەودا هاوپشتی بكات ئەچێ لەگەڵ خودی (یەكێتی)دا هاوپەیمانی ئەكات ئەمە بەڵگەی ئەوەیە (دەزگای پاراستنی پارتی نەنووستووەو شتێك ئەزانێو دڵی بە (بازی) یەكەش خۆش نی یە). منیش لای خۆمەوە ( لە سەدا نەوەدونۆ) بڕوام وایە كە (خیشكردنەكەی كاك (نەوشیروان) تەنها (بازی)یەو هیچی تر (خیشكردن واتە (مانگرتنو تۆران) وشەیەكە لە ناوچەی شارباژێر بەكاردێتو ئەم خیشكردنە لەناو مەسئولە گەورەو بچووكەكانی (یەكێتی)دا وەك نەریتی لێهاتووەو كردوویانە بە خوو، زوو زوو خیش ئەكەنو ئاشتیش ئەبنەوە جاری وا هەیە ئەو خیشكردنە خوێنیشی تیا ئەڕژێت).

بە لای منەوە لەناو (یەكێتی)دا (بازیو بازیكردن) جۆری زۆرە رەنگە هێنانەوەی یەكدو نموونەی دوای سالأنی (ڕاپەڕین) خراپ نەبنو زۆرتر بۆچوونەكەی ئێمە (بەوەی كارەكە) تەنها (بازی) كردنە پشت ڕاست بكاتەوە، یەك لەو نموونانە دوای (ڕاپەڕین) یەكێتی هاتە سەر ئەوەی (بەرەی كوردستانی) هەڵ بوەشێنێتەوە بۆ ئەو مەبەستە ویستی ڕادەو ئاستی جەماوەری خۆی دیاری بكات جا دەست بۆ كارێكی لەو جۆرە بەرێت بۆیە هات بە نهێنی داوای لە چەند كەسێك كرد دەست بە (مانگرتن) بكەنو داواشی لە ڕێكخستنەكانی ناوەوەو دەرەوەی شاری (سلێمانی) كرد هەموو جۆرە ڕێگەو قەرەباڵغی یەك بۆ پشتگیری لە (مانگرتوان) بەكاربهێنێ، ئەوەبوو كرایە هۆسەیەك هەر مەپرسە، دوای ئەوە لە لایەن (سكرتێری یەكێتی)یەوە (بەیان)ێك بلاوكرایەوەو داوای لە (مانگرتووان) كرد ئیتر مانگرتن بەسەو دوایی بە

مانگرتنەکە بهێنن بە دوایدا یەکسەر ئاو بە ئاگردا کراو مانگرتن تەواو بوو، لە پاش (یەکێتی) بانگەشەی ئەوەی کرد کە (بەرە) دەووری بەسەر چووەو پێویستە کورد هەنگاوێکی تر بڕواتە پێش‌و ئیدارەو پەرلەمان‌و حکومەت دروست بکات، سەرەتا (پارتی) خۆی حەریج نیشانداو کەوتە نازو نوزو شتی وا کەچی لە پڕ ئامادەبوونی خۆی بۆ دەنگدان‌و هەڵبژاردن دەربڕی‌و کارەکە دەستی پێکردو بە پێچەوانەی بۆچوونەکانی (یەکێتی) یەوە ئەو (٥١) کورسی بەرامبەر بە (٤٩) کورسی بەدەستهێنا لە ئەنجامی ڕێکەوتنێکی ژێر بە ژێردا هەردوولا (پەرلەمان)ێکی (پەنجا بە پەنجا)یان دروست کردو حکومەتێکی ساوای بە ناوی (حکومەتی هەرێم) یان ڕاگەیاند، لێرەدا ئەچمەوە سەر ڕووداوی (مانگرتنەکە) تا ڕوونی بکەمەوە (یەکێتی) بۆ لە (بازی) یەکەیدا شکستی هێناو بۆچوونەکەی (لەسەدا سەد) دەرنەچوو، لەو قەرەباڵغی دروستکردنە کە بۆ (مانگرتووان) ئەنجام ئەدرا، یەکێتی لای وابوو (لەسەدا نەوەد) خەڵکی کورد لەگەڵ ئەودایەو دەنگ بۆ ئەو ئەدات‌و بەمەش (پارتی) ئەکات بە مریشکی ئاوە ڕووت کراوەو (لەسەدا هەشتا زیاتری) کورسی ناو (پەرلەمان) مسۆگەر ئەکات‌و (حکومەت) بە دەست ئەو ئەبێت‌و چی بوێت بە دڵی خۆی ئەیکات بۆیە نەمانی (بەرە)ی ڕاگەیاندو ئیدعای بۆ (پەرلەمان) و (حکومەت) کرد ئەوەبوو دەریش کەوت ئەو دوای قەرەباڵغی کەوتوەو هیچی تر.... یەکێکی تر لە (بازی)یەکانی (یەکێتی) دەنگدان بوو لەسەر دەستووری عێراق، بۆ ئەو مەبەستە لە سەرەوە خەڵکی هان ئەدا دەنگ بۆ دەستوورەکە بدەن‌و لە ژێریشەوە خەڵکانی وەك (شێرکۆو مێرکۆی) ڕائەسپارد خۆیان بکەن بە کوردی عەیارە بیست‌و چوارو کەس لەوان کوردتر نەبێت‌و بە ناوی (ریفراندۆم)ەوە ئیمزا بۆ سەربەخۆبوونی کورد کۆبکەنەوە ئەوە بوو لەوەشدا سفری هێناو بەردێکی بۆ نەجولاو هیچی پێ سەوز نەبوو، ئەم (بازی) کردنە دوو ڕوویانە لە تەمەنی سیاسی (یەکێتی)دا زۆرو زەبەندەو هەمووشی مایە پوچ دەرچووەو سەیریش ئەوەیە (تەڕ بوون) بەخۆ ناگرێ‌و هیچی بە خەیاڵدا نایەت، من گردی (ریفۆرم) و شتی وا بە

(یانی) یەك لەو (بازیانە) ئەزانم کە (یەکێتی) پێ ی راهاتووەو قوماری بەدبەختی خۆی [illegible]کات تا بزانێ ئەیباتەوە یا نا، وەك وتم ئەوەی باسکرا لە (سەدا نەوەدو نۆ)ی ئەو ئیحتیمالانەیە کە (خیشکردن)ەکەی کاك (نەوشیروان) تەنها (بازی) کردنەو دیوی دووەمی پارەکەیە، ئەوەی ئەمێنێتەوە تەها (یەك ئیحتیمالە لە سەدەکە) ئەویش ئەوەیە ئەگەر پێداگرتنەکەی کاك (نەوشیروان)بەتەوای پشتکردنە (یەکێتی)یەبێت گوایە بنەماڵەیەك حوکمی ئەکات ئەو ئامادە نی یە بگەڕێتەوە ناوی‌و ئەویش بە مافی خۆی ئەزانێ باڵێکی جیاوازی تری (یەکێتی) بێت کە ڕەنجی بۆ داوە ئەو مانای وایە دەستێکی (ئەمریکی‌و بەریتانی‌و حکومەتی عێراقی) لە پشتەوەیەو لەگەڵ خواستەکانی ئەوان ئەڕوات‌و دژە شەپۆلی ئەو دەسەڵاتەیە کە خۆشی دەستی لە دروست کردنی دا هەبووەو ئەبێ ئەوسا ئیعلانی (ئۆپۆزسیون) بوون بکات‌و خەڵکی هانبدات بەخۆپیشاندان‌و ئاژاوە نانەوە دەسەڵاتی (پارتی‌و یەکێتی) ناچار بە مل پێدان بکات، لە وڵاتی ئێمەدا کارو کردەوەیەکی لەو چەشنە بیەوێ‌و نەیەوێ زۆرتر بەرەو چەك هەڵگرتن‌و سەنگەر گرتن ئەبات‌و ئەوانیش لە وەزعێکی وەهادا پیاوی ئەو جۆرە بار هەڵگرتنە نین‌و دوژمنان بە قازانجی خۆیانی‌وەر ئەگێڕن‌و لەوانەشە ڕووداوێکی وەك ساڵی (شەست‌و شەشی) لێ بکەوێتەوە ئەمە ئەگەر (یەك ئیحتیمال) لە (نەوەدونۆ) بەهێزترو خۆسەپێنەرتر بوو ئەگین بە غەیری ئەوە شتەکە تەنها (بازی)یەکی سیاسی یە بە مەبەستی وەگەڕ خستنی خەڵکی (بێزاربووی کورد)ە بۆ سەر سندوقەکانی (دەنگدان) تا لای خەڵکی دنیا وەهای دەرخەن کە دیموکراسی بەرقەزارەو خەڵك بە گیان‌و دڵ ئەوانی ئەوێ‌و دەنگیان بۆ ئەدات ..... ئەمەش لەم ڕۆژانەی پروپاگەندە کردن بۆ هەڵبژاردنەدا دەرکەوتووە خەڵکی بۆ ئەو مەبەستە جوڵێنراوە... ئێستا (بازی)یەکە سەری گرتووە گەورەترین تاوانیش ئەکەوێتە ئەستۆی خودی کاك (نەوشیروان) چونکە زۆر (بێ بەزەیی) یانە خەڵکی بێ ئاگاو کەم مافی بردەوە بەر سێبەری چەقۆی درۆو دەلەسەی (یەکێتی‌و پارتی) تا کارەساتەکەی (ئیسماعیل پێغەمبەر) راست دەرچێت‌و قوربانی یەکە مسۆگەر بێت .... تا ئێرە ئەمانە کورتە وەڵامی ئەو پرسیارانە بوون کە ئەبووایە بەبێ وەڵام نەبوونایەو پەنجەیان لەسەر هەندێك راستی دابنایە.

(٤)

هێشتا پێویستییەکی مێژوویی‌و نەتەوەیی وام لێ ئەکات هەر لەم شوێنەدا بهێنمەوەو بیروڕای خوێنەر بۆ سەر کێشەیەك ڕابکێشم کە دوای هەڵبژاردنی ئەمجارەی (هەرێم) سەری هەڵداوەو پێویستی بە لێدوان‌و قسە لەسەر کردن هەیە چونکە گرنگی کێشەکە بەرادەیەك ترسناکی خۆی دەرخستووە کە کاریگەری نەك هەر لەسەر هەر تاکێکی کورد هەیە بەڵکو چارەنووسی نەتەوە بوونی کوردیش ئەخاتە گەرووی نەمانەوە، لە حاڵێکی وەهادا هەر تاکێکی کورد بیەوێ‌و نەیەوێت ناچارە بەر لەوەی بڕیار بدات پێویستە بیر بکاتەوەو لە خۆی بپرسێت: چی بکات؟ منیش وەك تاکێکی کورد هەرچەشنە بیروراو ئایدۆلۆژیایەکم هەبێت فەرزە ئەوەی لەسەر ئەو کێشە پڕ مەترسی یە ئەیزانم بۆ خەڵکی ئەم وڵاتەی ڕوون بکەمەوە تا دڵسۆزان‌و خەم خۆرانی ئەم گەلە لەسەری بێنە دەنگ‌و بەر لەو کارەساتە بگرن کە چاوەڕوان ئەکرێت، ئەویش وەك من تێ ی ئەگەم بەم ڕەنگەیە: بە لای منەوە کوردی کۆمەڵگای باشووری کوردستان سەرەڕای پێکهاتە چینایەتی یەکانی لە دوای (ڕاپەڕین)ی (١٩٩١)ەوە بەناوی دەسەڵاتی حیزبایەتی کوردەوە بەم شێوەیە دابەش بووە:

١. خەڵکانی هەژارو زەحمەتکێش‌و بێ دەرتان کە لە ئێستای ئەم کۆمەڵگایەدا ئاستی هەرە خوارەوەی کۆمەڵانی خەڵکی گرتووەو هەرچی چەوسانەوەی کۆمەلایەتی‌و نەتەوەیی هەیە بە هی سیاسیشەوە بەسەرشانی ئەوانەوەیە ئەتوانرێت بە خەڵکی (فلیقاوە)ی ناو کۆمەڵ ناو ببرێت.

٢. دەسەلاتی نەگریسی حیزبایەتی کە بە شێوەی جۆر بە جۆری (مافیای سیاسی) ئاستی هەرە سەرەوەی کۆمەلایەتی ئەو کۆمەڵگایەی بۆ خۆی دابین کردووەو هەموو سەوداو مامەڵەیەکی سیاسی‌و ئابووری‌و تەنانەت دەستەکەوتە کۆمەلایەتی یەکانیش لە دەستی زەبەلاحی ئەودایە بە بڕیاردانی مان‌و نەمانی ئەو کۆمەڵگایە شەوە.

٣- خەڵکانی (هاوردەی کورد زمان)و (کاسەلیس)و (مشەخۆر)و (هەلپەرست)و (بێ بار) کە بۆشایی نێوان ئەو دەسەلاّت‌و خەڵکە چەوساوەیەی پڕ کردووەتەوە، ئەم جۆرە خەڵکانە بە ئارەزووی خۆی شەن‌و کەوی کێشە کۆمەلاّیەتی یەکان ئەکات‌و بۆ تێرکردنی بەرژەوەندی یە شەخسی‌و تایبەتی یەکانی خۆی بۆ ئەوەی تەمەنی خۆی درێژ بکاتەوە شانی داوەتە بەر دەسەلاّت تا نەکەوێت، ئەمانە بە پێ ی بارودۆخی سیاسی‌و دەسەلاّتی حیزبایەتی ژمارەیان لە گۆڕان‌و زیادو کەمیدایە لە ساڵانی (نەوەد)ەکان بۆ (دوو هەزار) لە (سەدا پەنجا)ی کۆمەڵ ئەبوون، لە دوو هەزاریش بە دواوە ڕێژەکەیان زیادی کردووە ئەمانە لە لایەکەوە کاسەلێسی حیزبن‌و لە لایەکی ترەوە تەواوکەری دەسەلاّتن، لەم سەرەوە دەسەلاّت لەسەر کارو کردەوەو بیروبۆچوونی ئەمان ئەلەوەڕێت‌و لە سەرەکەی تریشەوە ئەمانیش بە بوونی دەسەلاّت خۆیان قەڵەو قەڵەوتر ئەکەن، لە داگیرکردنی پلەوپایەی ئیدارە کردنی دەوڵەتەوە بیگرە تا ئەگاتە کارکردن بە ناوی کۆمپانیاو بازرگانی جیهانی یەوە.

ئەمانە هەمەچەشنەن لە وردە نووسەرو ڕۆژنامەنووس‌و فەرمانبەرو بازرگان‌و قاچاخچی یەوە حسابی بۆ بکە نا بەو خەڵکە مەسئولانە ئەگات کە( کورد زمانی) هاوردەن‌و ئێرە وڵاتی دووەمیانەو خۆیان (ئەورووپی زادەن) و (ئیسقاتی کورد بوونی ئێرە)یان کردووە وەك داگیرکەرهاتونەوەو لە ڕێگەی حیزب‌و حیزبایەتی یەوە خۆیان سەپاندووەو بوون بە سەرچاوەی فەسادو بەرتیلخۆری‌و گەندەڵی ئابووری‌و سیاسی‌و تەنانەت ئەخلاقیش، بە دەم شتێکن بە کردەوە شتێکی ترن، لە سەرەوە دەسەلاّت دەمە زەرد ئەکەنەوەو لە بنەوە کۆمەڵگا هەرەس پێ ئەهێنن.

هەر کەسێك یا هەر هێزو سیاسەتێك بیەوێت کۆمەڵگایەکی لەم جۆرە بگۆڕێت‌و دەسەلاّت‌و خەڵکی چەوساوە لە یەکتر نزیك بکاتەوە ئەبێت ئەو خەڵکە هاوردە( کورد زمان) و (کاسەلێس) و (مشەخۆر) و (هەلپەرست) و (بێ بار)ەی نا ئەو بۆشایی یە لە ڕەگ‌و ڕیشە بهێنێت‌و پێکهاتەی دەسەلاّتیش جەم‌و جۆر پێ بکات، ئەمەش بە لای کەمەوە شۆڕشێکی کۆمەلاّیەتی ئەوێت تا هەر شتێکی تر، ئەو گۆڕانکاریانەش نە بە

فسەو زماندرێژی ناو (پەرلەمان) و نە بە خەڵك تیژکردن بۆ سەر جادەو شتی وا پێك بەڵكو بە زەبری شۆڕش و شۆڕشی خاوەن ئایدۆلۆژیاو بیرو بەرنامەی تۆکمەی واقیعی پشت بەستوو بە خەڵكی چەوساوەی وڵاتەکە خۆی دێتە دی.

لەسەرو بەندێکی وەها شێواوداو لە بگرەو بەردەیەکی وەها جەنجاڵی ئێستای کۆمەڵایەتی دا هێشتا کێشەیەکی تر بە شاراوەیی هەیە ئەگەر کاری کوردانەو هۆشی ژیرانەی لە گەڵدا بەکار نەیەت، دڵنیام سەرتاپا کۆمەڵگای کوردی باشوور بە دۆڕاندن ئەدات، ئەو کێشە شاراوەیش لە داهاتوویەکی نزیکدا پێ ی ئەوترێ کێشەی (ئیدارەی پارێزگاکان) کە کاتی خۆی (بەڵگەی نهێنی) یەکەی کەوتە دەست ئێمەو لە ژمارە (٢)ی (هەڵوێست)ی ١٥/٤/٢٠٠٢ دا بەم جۆرە بڵاومان کردەوە:

بيان الى الشعب العراقي

29-11-2003

(تەعلیق) دان

ئەمـە بەرنامـەی ئەمەریکی‌یەکانە بـۆ ئـایندەی ئـەو عێراقـەی چـاوەڕوانی ئەکـەین بۆیـە بـەر لەوەی ئـە نجام بدرێ پێویستە ئێمەی کـورد چارەسـەری دۆسـیەی خۆمان بکـەین نـەگین پە نجەی پەشـیمانی ئەگەزین!

اتفاقية ١٥ تشرين الثاني

جدول زمني لعراق ذا سيادة و ديمقراطي و آمن

لێرەدا پێویستە پەنجە بۆ ئەو بارودۆخەی کوردی باشووری تیایە ڕابکێشم ئەویش ئەوەیە: ئێمەی کوردی باشوور لە دوای ساڵی (١٩٩١)ەوە تا ئێستاش لە لایەن وڵاتانو گەلانی جیهانەوە خوێندنەوەی کارەساتێکی مرۆیی بۆ کێشە کۆمەڵایەتیی و نەتەوەیی یەکانمان ئەکەنو وەك کێشەیەکی سیاسیی و نەتەوەیی نابینن هەر بۆیە لەو ڕۆژەوە تا ئەمڕۆ لە لایەکەوە واین لەبەر ڕەحمەتی پیلانێکی سێ گۆشەی:

(ئەمەریکی، عێراقی، عەرەبی)و لە لایەکی تریشەوە واین لەبەر چەقۆی پیلانێکی [illegible]ی: (تورکی، سووری، عێراقی، ئێرانی)یشدا لە عێراقیشدا لە دڵەوە هیچ خێرێکی عەرەبی‌و ئیسلامی بە شیعەو سونی یەوە نی یە دانی خێر بە ئێمەدا بنێت هەر بۆیە کاتی خۆی لە دەستووری تازەی عێراقیدا ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی بوونی هەر (هەرێم)ێك بە مەرجی (سێ شار) دابنرێت تا ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەوەی ئەیخوازن بە دەستی بهێننەوەو بەهۆیەوە (ئاشبەتاڵ) بە بوونی کورد بکەن، ئەمە ڕاستی یەکەو بە شاراوەیی هەیەو دان لە کورد جیڕ ئەکاتەوەو لێوی لێ ئەکرۆژێت، ئەوەی بە حاڵ لە (ئەلف‌و بێ)ی سیاسەت بزانێت بەڕوونی هەست بەوە ئەکات کە لە هەڵبژاردنی ئەمجارەی (هەرێم)دا دیاردەیەکی سیاسی ئەوتۆ بەڕێوەیە کە بەرەو ئەوە ئەچێت ئەگەر هیچی پێ نەکرێت خۆ ئەوەی پێ ئەکرێت بە لای کەمەوە (ئیدارەی پارێزگای سلێمانی) بۆ خۆی مسۆگەر بکات‌و بەوەش بە پێی دەستوور ڕێی پێدراوە لە یەکگرتوویی (سێ شار)ەکەی (هەرێم) بێتە دەرو سەربەخۆیی ئیداری خۆی ڕابگەیەنێت، بەکردەوەیەکی ئەوتۆش (هەرێمی کوردستان) فت ئەبێت لەبەرئەوەی لە دەستووری عێراقیدا هیچ (هەرێم)ێك نابێت لە (سێ شار) کەمتر بێت، ئەوسا کوردستانیش ئەنرێتە گۆڕو کورد ئەگەڕێتەوە بۆ حاڵەتی سیاسی دەورانی پاشایەتی‌و شتێك نامێنێتەوە پێی بوترێت نەتەوەی کورد یا سنووری کوردستان، هەر لە بەرئەوە ئێمە لە (٢٠٠٤)دا نووسیمان: (ئەمە بەرنامەی ئەمەریکی یەکانە بۆ ئایندەی ئەو عێراقەی چاوەڕوانی ئەکەین بۆیە بەر لەوەی ئەنجام بدرێ پێویستە ئێمەی کورد چارەسەری دۆسیەی خۆمان بکەین ئەگین پەنجەی پەشیمانی ئەگەزین) هەڵوێست / ژمارە (٢) / زۆر سەیرە کورد لە بری ئەوەی بەرەو ڕزگاری‌و پێکهێنانی دەوڵەتی کوردی بڕوات تازە خەریکە بەرەو گومڕابوون‌و قۆناغەکانی بەر لە (حوکمی زاتی) ئەگەڕێتەوە لەبەر ئەو مەترسی یە سامناکە بوو نەمویست بچمەوە سەر ئەسڵی باسەکەم کە لە سەرەتاوە لێ ی دابڕا بووم بۆ ئەوەی وەك کوردێك ئەو ڕاستی یە ڕوون بکەمەوەو ئەو نهێنی یە جارێکی تر بدەمەوە بە گوێ ی هەر کەسێکدا کە

خۆی بە کورد ئەزانیٚو بە (قسەی قۆڕ)ی ئەمو ئەو دەستی لە کورد بوونی خۆی بەر نەداوە.



(٥)

کاتێك ئەگەڕێینەوە سەر کتێبی (ئێمەو ئەوان) ئەبینین نووسەر وەها ئەڵێت: (ئێمەو ئەوان ناکۆکیەکانمان لەسەر چین؟). بەکار هێنانی پرسیار لەسەر شێوازی (ناکۆکیەکانمان لەسەر چین؟) لە فەرهەنگی سیاسەتدا خۆبەخۆ مانای جیاوازی فیکری‌و ئایدیۆلۆژی ئەخاتە ڕوو، بەلاّم کە لە ناوەڕۆکی نووسینەکە ورد ئەبینەوە بە ئاسانی ئەبینین، نووسەر هەست ناکات جیاوازیەکی فیکری‌و ئایدیۆلۆژی بنەڕەتی لەگەڵ (ئەوان)دا هەبێت بەڵکو ئەوەی هەیەو نی یە هەر ڕواڵەتەو هەریەك ئاقاری فیکری‌و یەك شێوازی ئایدیۆلۆژی (ئەوان)ەی هەیە بەلاّم ئەوەی هەیە (ئەوان)ە بە خواست‌و ئارەزووی نووسەر هەڵسوکەوت ناکەن بۆیە (ئەم) لەگەڵ (ئەوان)دا ناکۆکی هەیەو وەك ناحەز ئەیان بینیٚ، ئێمە جاریٚ لە باسکردنی ئەو نەبوونی جیاوازی فیکری‌و ئایدیۆلۆژیایەی نووسەر خۆمان ئەبوێرێن‌و بۆ کاتی خۆی هەڵ ئەگرین. ئەوەی لێرەدا گرنگە ئەوەیە قسە لەسەر ساغکردنەوەی (ناکۆکیەکان)ی هەردوولا بکەین کە ئەو باسی کردوون، بۆ ئەوەی زووتر بێینە دەست ئەو لای خۆیەوە کار ئاسانی بۆ کردووین‌و ئەڵیٚ ئێمە (ئەوانەی ڕەخنە لە دەسەلاّت ئەگرین)و ئەوانیش (ئەوانەی داکۆکی لە دەسەلاّت ئەکەن). بە پێی ئەم پێناسەیە بێت، کورد وتەنی (مردوو لەوە پاکتر ناشۆرێت) چونکە ئەو لە سنووری بازنەی دەسەلاّتەوە قسان ئەکات‌و ڕەخنەی خۆی ئەگریٚو هەر خۆشی وەها بڕیارێکی داوە، کەچی هەر بە دوای ئەوەدا ئەڵیٚ: (ئەڵێن: ناکۆکیەکان بنەمای فیکریان نیە، بەڵکو لەسەر شتی شەخسیە..... ناکۆکیەکان لەسەر پڕۆژەی سیاسی نیە، بەڵکو لەسەر

پارەو دەسەڵاتە ... ئەم قسانە بۆ پووچکردنەوەی ناوەڕۆکی فیکریو سیاسی [illegible]و سووککردنی ئەو ململانێ سیاسیەیە کە لە نێوان دەسەڵاتو (موعارەزە)دا دەستی پێکردووە) ل٥٥/ ئێمەو ئەوان/ ئەم قسانە پاشگەز بوونەوەیە لەو پێناسەکردنەی پێشتر ئاماژەی پێکراو جۆرێکە لە فووکردنە خۆو خۆ پەڕانەوە، ئەگین ئەگەر کێشەکە لەسەر پرۆژەش بێت جا هەر جۆرە پرۆژەیەکیش بێت ئەوە بەڵگەی جیاوازبوونی فیکرو شتی وا ناگەیەنێ هەروەها مانای ململانێ ی سیاسیش نی یەو مانای سەرهەڵدانی (موعارەزە)ش نادات بە دەستەوە چونکە هاتنی (موعارەزە) بۆ ناو گۆڕەپانی دژایەتی کردن پێویستی بە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانەیە: کێ (موعارەزە)یە؟ لەسەرچیو؟ چی ئەوێو؟ بەرنامەی چی یە؟ ئەگەر کێشەی (موعارەزە) بەو جۆرە ئەبێت، ئەوا (موعارەزە) بوونی نی یە بەڵکو ئەوە هەستی ناڕەزایی بوونە، پێویستە ئەم دوو دیاردە کۆمەڵایەتی یە لە یەکتری جیا بکرێنەوەو تێکەڵ بە یەك نەکرێن، جەماوەری (موعارەزە) سیاسەتی خۆی هەیەو بۆچوونی خۆی لایەو بەرنامەی خۆی پێ یەو یەکەمین کاری هەوڵدانە بۆ گۆڕینی دەسەڵاتو جێگرتنەوەی، (موعارەزە) جەماوەرە جەماوەرێکی هوشیارو سیاسیو ڕێکخراوە بەڵام خەڵکی نارازیی تەنها خەڵکەو بێ سەرو بەرەیەو هیچ پێناسەیەکی لا نی یەو جڵەویشی بە دەستی (تالآنچی) و (ئاژاوە گێڕان)ەوەیەو لە تالآنو ئاژاوە زیاتر هیچی تر نازانێت، لەبەرئەوە تێکەڵ کردنی ئەو دوو دیارە کۆمەڵایەتی یە بە تایبەتی لای خەڵکی سیاسیو سیاسەتخواز پشێویو گومڕایی لێ ئەکەوێتەوە من دڵنیام کەسێکی وەك کاك (نەوشیروان) ئەم دوو دیاردە کۆمەڵایەتی یەی وەك یەك وەرگرتووە بۆیە لە باسکردنەکەیدا تووشی ئەو دووفاقیە (ئیزدیواجێتە) بووەو خۆی لە دوو ئاستدا ئەبینێتەوەو دوو بۆچوونی جیاواز بە یەك زمان دەرئەبڕێت، ئەوەتە کاتێك پێناسەی سیاسی خۆی ئەکاتو خۆی بە (ئەوانەی ڕەخنە لە دەسەڵات ئەگرن) بە ئێمە ئەناسێنێت، کەچی کاتێك خەڵکی ناڕەزاییو بێزار بوو لە دەسەڵات ئەبینێ، خۆی بەوە باس ئەکات کە ئەو ناکۆکیو ململانێ ی لەگەڵ دەسەڵاتدا

هەیە، بە قسەی خۆی ناکۆکیو ململانێکەشی هەم فیکریو هەم سیاسی یە بەوەش بە (موعارەزە) نیشان ئەداتو دەری ئەخات کە ئەو لەیەك کاتدا دوو چەشنە بۆچوونو میتۆدو قسەکردنی لە دوو شوێنی جیاوازەوە هەیە، لە حالێکی وەهادا ئەگەر ڕاست بکات ئەوا هەر نووسەر بۆ خۆی لەو پێناسەی (ئێمەو ئەوان)ەدا بە هەڵەدا چووەو بە بێ ئەوەی بەخۆی بزانێت کار بۆ دوو شتی جیاواز ئەکاتو قسەش لە دوو شوێنی جیاوازەوە ئەکات، هەم (ڕیفۆڕم خواز)ەو هەم ئاڵای (گۆڕان) بەرز ئەکاتەوە، وەك ئەوەی بە خەڵك بلێت من بۆ خۆم خەریکی (ڕیفۆڕم) ئەبمو خەڵکینە ئێوەش خەریکی (گۆڕان) بن تەنانەت لەبەر دڵی ئێوە وا (قورئان)یش ماچ ئەکەم لە لایەکەوە ئەیەوێ بە گفتی درۆی سیاسیانە ئێمە دەستەوسان بکاتو لە لایەکی ترەوە ئەیەوێ بۆ پاڵپشت دروستکردنو پشتیوان پەیداکردن بۆ قسەکانی خەڵك وەها چاو بەست بکات کە ناکۆکیەکانی هەردولا نەشتی شەخسیەو نە لەسەر پارەو دەسەڵاتە، لە کاتێکدا ئەو ڕاست بکات یانا، ئەگەر ناکۆکیەکانی نێوانی هەردوولاش لەسەر بنەامی ململانێ ی سیاسی بێت، ئەوا ئەو کات هەم هەوڵدانەکە شتی شەخسیو هەم لەسەر پارەو دەسەڵاتە چونکە لە هەموو کۆمەڵو کۆمەڵگاو لە هەموو ڕۆژو ڕۆژگارێکداو لە هەموو جێ یەکیشدا سیاسەت خۆبەخۆ کار لە پێناوی بەرژەوەندی تایبەتی دا ئەکاتو لە دنیاشدا سیاسەتی بێ بەرژەوەندی نی یەو نەبووە چونکە سیاسەت هەم شتی شەخسی ئەپارێزێتو هەم ویستی تاقمو چینی کۆمەڵایەتی ئەنجام ئەدات ئەگەر وا نەبێت ئەوە وەك ئەوە وایە مرۆڤ و خەڵکەکانی ئەو کۆمەڵگایە سەری (گا) یان لێ بەسترا بێتو هەم بە مرۆڤ و هەم بە (گا) چاویان لێ بکرێت دیارە نووسەر لەوەها کۆمەڵگایەکدا سیاسەت ئەکاتو ئەیەوێت بەو بڕوا دوو فاقیەی دەستی بە داوێنی یەوە گرتووە خەڵكو خوا گومڕا بکاتو وا بزانێ بەو جۆرە کارو بۆچوونە (پێدار و بێ پا)ی بۆ کەوی کراوە، لەبەرئەوە ئەو پێ بزانێتو پێ نەزانێت خۆی لە خۆیدا دووچاری چەواشەیی هاتووەو ئەو قسەو باسانەی ئەو تاسەرو بۆ هەمیشە ناچنە گیرفانی کەسی ترەوە، کورد ئەڵێ (پەتی درۆ کورتە)،

[illegible] وایە ئەو کەسانەی (خوا)شیان ئەوێ‌و (خورما)شیان ئەوێ لە ئەنجامدا هیچ بە هیچ نادەن‌و گرەوی سەرکەوتن بە دەست ناهێنن. ئەمەوێت ئەوە بڵێم کە ئەو ((ڕۆبسپیێر)ی سەردەمی عەولەمەیە نایەوێت لەسەر کورسی دەسەڵات دابنیشێت تا (خەنیمە) سیاسی یەکانی خۆی تەفرەو تونا نەکات‌و گۆڕەپانەکەی بۆ چۆڵ نەکرێت، ئەگەر (ڕۆبسپیێر)ی شۆڕشی (فەرەنسا) لەو سەردەمانەدا وەها کاری سیاسی کردبێت ئەوا شتێکی رون‌و ئاشکرایە کە کاك (نەوشیروان)یش هەمان کەسێتی‌و هەمان سیاسی یە لە سەردەمی عەولەمەدا دووبارە ئەبێتەوە (مارکس) وتەنی ئەویان بە شێوەی تراژیدی‌و ئەمیان بە شێوەی کۆمیدی یە، بەڵام لە سەردەمی عەولەمەو لەناو کۆمەڵگای کوردیدا کە بە قەناعەتی (ئەو) خەڵکەکەی (سەری گا)ی لێ بەستراوە، کۆمەڵگایەکیش کە بەو چەشنە بێت کارکردنی سیاسی‌و قسەی سیاسی وەها هەڵ ئەگرێت هەر لەبەرئەوەیە ئەو لە سەرەتادا وا خۆی بە ئێمەی گوایە (نیوە مرۆڤ و نیوە گا) ناساند کە هەر لە ناو سنووری بازنەی دەسەڵاتدایەو لەوێوە چاکسازی‌و پاکسازی خۆی ئەکات بەشێوەی ڕەخنەگرتن کەچی دواتر وەها خۆی بەرچاو ئەخات کە نەخێر ئەو وەك ((موعارەزە))یەك لەگەڵ دەسەڵاتدا هەڵسوکەوت ئەکات (ئیتر دەری نەخستووەو ساغی نەکردووەتەوە (موعارەزە)کە کێ‌و کێ نی یە). بە بڕوای من کەسێك لەیەك کاتدا ناتوانێت هەم لەناو بازنەکەدا بێت‌و هەم لە دەرەوەی بازنەکەشدا بێت چونکە ئەگەر ئەو کەسە هاتوو لە ناوەوەی بازنەکە بوو ئەوا لە هەمان کاتیشدا بوونی لە دەرەوەی بازنەکەدا ڕاست نی یەو خۆ ئەگەر لە دەرەوەی بازنەکەشدا بێت ئەوسا لە هەمان کاتدا بوونی لە ناوەوەی بازنەکەدا ناڕاستە ..... لەبەرئەوە ئەو کەسە پێویستە تەنها لە یەك شوێندا بوونی هەبێت‌و بەس، جا بۆیە بە پێی ئەو پێوانەیە کاتێك نووسەری (ئێمەو ئەوان) خۆی وەك هەبوویەکی ناو بازنەی دەسەڵات ڕائەگەیەنێت ئەوا خۆ دەرخستنیشی بە ناوی ((موعارەزە))وە تەنها درۆیەکی زەقی سیاسی یەو تەنها فریوودانێکی رووتی سیاسیانەیەو بۆ خۆ شیرین کردنی ناو خەڵکی بێزار بوو، خەڵکی ناڕازی لە

دەسەڵات ئەیکات تا بە پشتیوانیی و بە کۆمەکی قەرەباڵغی ئەوان هێزو توانا بۆ [illegible]ەکان)ی پەیدا بکات و خۆی پێوە با بدات ئەوەش لە دوایی دا ئەو بیەوێت و نەیەوێت لەم کۆمەڵگایەی ئەو بە (نیوە مرۆڤو نیوە گا)ی ئەزانێت تەفرەدان و دەستخەرۆ بوونی خەڵکی لێ ئەکەوێتەوە تا هەر شتێکی تر، کوردیش بۆ وەها ڕووداوێك خراپی نەوتووە کە ئەڵێ: (ئەگەر جارێکت خەڵەتاندم خوا بت گرێت ئەگەر دووجارت خەڵەتاندم خوا خۆم بگرێت).

(٦)

کاتێك کاك (نەوشیروان) دێتە سەر باسکردنی پرۆژە بە حساب (سیاسی و کۆمەلایەتی و دادپەروەری و .......هتد)یەکەی ئەیەوێت لە ڕێگەی سۆز جولاندن و هەست بزواندنەوە ئێمە بە لای خۆیدا ڕاکێشێت و بڕوای ئەوەمان لا سەوز بکات کە ئەو کاتێك باس لە خواردنی پارەو پولو موچە ئەکات ئیتر ئەو لەسەر هەقەو جێ بە ناهەقی ئەوان (ئەوانەی داکۆکی لە دەسەلات ئەکەن) لەق ئەکات جا ئەو لە بیری چووەتەوە یا بە ئەنقەست خۆی لەوە گێل ئەکات کە ئەو بەر لە هەموو شت کەسێکی (سیاسی ویست)ە و گوایە هەموو تەمەنی بۆ شتێکی وەها بە فیڕۆداوەو ماوەیەکی دوورو درێژیش خۆی بە ڕابەری ڕێکخراوێکی (خۆ بە مارکسیەتزان)ی بە خوێنی شەهیدان سوور بوو ئەدایە قەڵەم و بە حسابی خۆی بۆ ڕزگاری نیشتمان و نەهێشتنی چەوسانەوەی نەتەوەیی و کۆمەلایەتی کاری ئەکرد کەچی ئێستا دوای بە (شوودان)ی ئەو ڕێکخراوەیە سەری زمان و بنی زمانی باس (لەسەر جۆری بەڕێوەبردنی ولات) ئەکات ئەویش تەنها خۆی لە (ناکۆکیەکانمان لەسەر بودجەی هەرێم)و (ناکۆکیەکانمان لەسەر بێدادی لە دابەشکردنی مووچەدا) ئەبینێتەوە. بۆ لێکدانەوەی ئەو مەبەستەو ساغکردنەوەی بەر لە هەموو شت پێویستە ئاماژە بەو (تیور)ە جۆر بە جۆرانە بکەم کە کاك (نەوشیروان) وتەنی: (لەسەر جۆری بەڕێوەبردنی ولات). خراونەتە بەر دەستی کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتی تا بزانین ئەو بیرو

بۆخوێنەی نووسەری (ئێمەو ئەوان) ئەچێتە کام خانەی ئەو تیۆرانەی قسە لەسەر (ئیدارەو بەڕێوەبردنی ولاٌت) ئەکەن.

لە مێژووی مرۆڤایەتی دا بە تایبەتی لە سەدەی بیستەمی ڕابوردوودا کۆمەڵێك بیروڕاو بۆچوون بۆ بەڕێوەبردنی ژیانی کۆمەڵو کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتی سەریان هەڵدا کە دواتر وەك (تیور) ناوزەد کرانو ناسران، ئەوانیش بە ناوەکانی: (تیوری بیرۆکراتی، تیوری بیرۆکراتی نویٚ، تیوری بەڕێوەبردنی زانستی، تیوری دابەشکردنی ئیداریو .....هتد) کە لە ئەورووپاو ئەمەریکا لەسەر دەستی کەسانی وەك: (ماکس ویبەر، هەربەرت سیمۆن، ڕۆبەرت مەرتۆن، سیلزنیك، تایلۆر، ئەمەرسون، کرۆزیر، هنری فایولو .....هتد) هاتنە ئاراوەو قسەو باسیان لە سەرکراو لەگەلٚ یەکدا تاوتویٚ کران، ئەگەر لێرەدا ئەو بیروڕایەی کاك (نەوشیروان) لەگەلٚ هەریەك لەو تیورانە بەراورد بکەین، بۆمان ئاشکرات ئەبێت کە ئەو بیروڕایەی ئەو (بەزۆر)یش ناچێتە خانەی هیچ کام لەو تیورانەو هەر ئاگاشی لەوەها قسەو باسێك نی یەو بە خۆشیدا ڕانابینیٚ هیچ بەڵگەیەکی (قەناعەت) پێکراو بۆ ڕێکخستنو شێوەی بەڕێوەبردنی کۆمەڵی کوردەواری لەخۆ بگرێتو وەك بۆچوونێکی شارستانیش چاوی لیٚ بکرێت، بەڵکو ئەو بیروڕایەی ئەو زۆرتر لە بازنەی (عەشایەرگەری)دا جیٚ ئەگرێتو وەك قسەی کەسێکی (عەشایەر) باس لە گرفتەکانی کۆمەلٚ ئەکات، ئەویش سەبارەت بە خەڵکانی حیزبیو وا بەستە بە دەسەلاٌتی ئەو حیزبەوەیەو بەشەکانی تری کۆمەڵگا وەك نەبوو ڕەچاو کراون، ئەمەش وەك ئەوەی نووسەر خۆی لە لوتکەی ڕزگاریدابەدی بکاتو هەموو شتێك بەلای ئەوەوە کۆتایی هاتبێتو هیچ کێشەیەکی نیشتمانیو نەتەوەیی بۆ کورد لە ئارادا نەمابێت، هەر لەبەرئەوە هەموو کێشە نەتەوەیی یەکانی کورد بە لای ئەوەوە هاتووەتە سەر باسی پارەو (حولدان)ی ئەو پارەیەو شەڕکردن لەسەر دەسەلاٌت، هەموو جارێکیش داوا لە خوێنەر ئەکات کە خۆی سەرپشك بێت لە وەلاٌمدانەوەی ئەو پرسیارانەی ئەو ڕووبەڕووی ئەکاتەوە بەوەی ناکۆکیەکانی ئەوان (لەسەر شتی شەخسیە یان لەسەر

فەلسەفەو شێوەی حوکمڕانیە؟) بە ڕاستی ئەگەر کاری خەباتو تێکۆشانی سیاسی کورد بەو دەردە گەیشتبێتو بەو جۆرە دووچاری (بن بەست) بوو بێتو هەموو کێشە کۆمەڵایەتیو نەتەوەییو نیشتمانیەکانی هاتبێتە سەر شەڕی چارەنووسی پارەو دەسەڵات، ئەوا کاتی خۆی زۆر چاکمان پێکابوو کە بە کاك (نەوشیروان)مان ئەوت سەرکردەی (سۆشیال عەشایەرەکان)و بکوژانی شۆڕشو بیری ئازاد بوونی کوردستان، چونکە کورد چ وەك سەربەخۆیی نەتەوەییو چ وەك ڕزگاری سیاسی، هیچی بە هیچ نەکردووە، ئەوەی لە باشووریش هەیەو نی یە، تەنها (بوارێکی ڕەخساو)ی پێ ئەوترێ کە ئەویش دەیان ساڵە بە قازانجی بازرگانانی (حیزبی)و (سیاسەتبازان) تەواو بووە تا هەر شتێکی تر بێتو زۆرتریش چاوەڕوانی (ئاشبەتاڵ)ی ئەو (بوارە ڕەخساوە) ئەکرێ تا ئەوەی کورد ئازادکراو بێتو بڕابێتەوە چونکە دوای ڕووخاندنی (سەدام)و داگیرکردنی عێراقو دەم چەور کردنی حیزبەکانی کورد لە لایەن ئەمەریکاوە بەوەی قاچی لێ ڕاکێشنو دەستی ڕزگار بوون بخەنە ژێر سەریانو بکەونە ملۆمۆش کردنی سەروەتو سامانی ئەو وڵاتەو ئەمەریکاش لەبەرخاتری دزینی سامانی بە لێشاوی عێراق چاوی ڕەحمەتیشی لەوانە، بەڵام لە بنەڕەتدا کارەکە پێچەوانەیەو کورد هیچی بە هیچ نەکردووە تەنانەت شەخسی کاك (نەوشیروان)یش کاتێك ئەیەوێت باسی ئەو پارە مۆڵۆ کەڵەکە کراوە بکات کە بەناوی بەشی کوردەوە بە ئەحزابی کورد ئەدرێت، ناتوانێت پەنجەی بۆ ڕاتەکێشێتو بازی بەسەردا بدات ئەویش ئەوەیە کە ئەڵێ: (لە نێوان ساڵانی ٢٠٠٤ دا تا ٢٠٠٧ تەرازووی هێزی سیاسی لەناو عێراقدا بە قازانجی کورد بوو، کورد بەهێز بوو لایەنە عەرەبیەکانی عێراق هێشتا خۆیان ڕێك نەخستبووە لەبەر ئەوە پشکی هەرێم لە بودجەی گشتی عێراقدا لە (ئەنجوومەنی نوێنەران)دا بێ مشتومڕ ئەڕوێنرا ...... ساڵی ٢٠٠٨ تەرازووی هێز لە نێوان کوردو لایەنە عەرەبیەکاندا – بە شیعەو سوننەشەوە – خەریك بوو بە قازانجی عەرەب بگۆڕێ) ل٥٧ /ئێمەو ئەوان/ ئەمە دان نانە بەو ڕاستی یەدا کە هێشتا هیچ بە هیچ نەکراوەو لایەنە عەرەبیەکان

تەنانەت خۆیان رێك نەخستووەتەوە بۆیە دنیاکە مات‌و بێ مێشوولەیە ئەگین کێشەکە هەر بەردەوام بوونەوەی گەمەی (مشك‌و پشیلە)یەو کۆتایی نەهاتووە لە شتێکی وەها چارەنووسیی دا پشت بەستن بە ئەمەریکا گەورەترین قومارە بە ژیانی کوردەوە ئەکرێت...... لە سەرێکی ترەوە بە پێویستی ئەزانم ئاماژەش بەوە بکەم کە بۆچی ئەحزابی کورد پشتێنیان لێ کردووەتەوەو تەنها مشت‌و مڕیان لەسەر پارەو دەسەڵاتەو بیر لە هیچی تر ناکەنەوە؟ ڕاستی یەکەی ئەوەیە کە ئەم حیزبانە گەورەو بچوکیان بە بێ جیاوازی دەوریان بەسەرچووەو باویان نەماوەو هیچ (تواناو برستێکی) ئەوتۆیان پێ نی یە تا جارێکی تر ئامادە بن خۆ لە قەرەی خەبات‌و تێکۆشانی شاروشاخ بدەنەوە هەر لەبەر ئەوەش دروشمە درۆینەکانی (مافی مرۆڤو دیموکراتی‌و ئازادی بیروڕا دەربڕین‌و مەدەنیەتچێتی‌و مۆدێرنباز)یان بەرز کردووەتەوەو دیعایەی (باو نەمانی) چەکداری‌و هەوڵدان بۆ ڕزگاری (بە پاش‌و پێش) بڵاو ئەکەنەوەو هەوڵ ئەدەن کۆمەڵگا بەوە ڕابهێنن کە (دیالۆگ‌و کاری مەدەنی) شیاوی مرۆڤی سەردەمەو تاکە ڕێگەی بەدیهێنانی ئامانجەکانیەتی، کەسێکی وەك کاك (نەوشیروان)یش هیچی لە هەڤاڵە (کۆن)و (نوێ)یەکانی زیاتر نی یەو ئەویش یەکێکە لە (دیعایەچی)یەکانی بڕوای بە درۆو دەلەسەی دیموکراتی‌و مەدەنیەت‌و ڕیفۆرم هەیەو ئەیەوێ بە ئەقڵی (عەشایەریە)وە دەرسی مەدەنیەتی سەردەمی (عەولەمە)مان تێ بگەیەنێت‌و فێری ئەو شێوە کوردیەمان بکات کە خۆی ئەیزانێت، بۆیە چاو لە ڕاستی یەکان ئەنوقێنێ‌و خۆی لە کێشە بنەڕەتی یەکانی نەتەوەیی‌و نیشتمانی گێل ئەکات‌و باس لە شەڕی چارەنووسی پارەو دەسەڵات ئەکات‌و بە گەورەترین کێشەی کوردی ئەناسێنێت، ئێمە ناڵێین ئەو سەرووەت‌و سامانەی (باندەکانی حیزب‌و سیاسیە بازرگانچی)یەکان ئەیدزن‌و بۆ خۆیانی ئەبەن گرنگ نی یەو پێویستی ژیانی خەڵکی کورد نی یە بەڵکو ئەوەی ئەو دزی‌و تالانی یەی پێکهێناوە بێ دەنگ بوونی خەباتە، لەبەرچاو خستنی سیاسەتە، سەرکوێر کردنی گەلە، شێواندنی ڕاستی یەکانە..... تەواوی ئەوانە بوونە هۆی لە دایك بوونی ئەو

بیدەنگیو زمان کڕبوونە کە وەزعێکی ئەو تۆی سەپاندووە کە هەر لە (پۆلیس)ێکەوە تا (وەزیر)ێك دز بێتو لە پاسەوانێکی بەر بارەگای حیزبێکەوە تا سەرۆکی حیزبێك بەرتیل خۆر بێت ، لە (پۆلیس)ێکەوە تا سەرۆکی ولاتێك تالانچی بێت.

(٧)

بەشی کۆتایی

لەبەرئەوەی ئالۆزیەکی زۆر لە نووسینی (ئێمەو ئەوان)دا هەیەو قسەکردنێکی زۆرتریشی ئەوێتو منیش نامەوێت بیکەم بە (بنێشتە خۆشە)و لەوە زیاتر پێوەی خەریك بم، ئەمەوێت لێرەدا بە کورتیو بە کوردی باسەکە ببڕێنمەوەو پێ لەسەر (ئەسپە تۆپیوو)ەکە دابنێمو بەوەندەش کۆتایی پێ بهێنم.

جا بۆ کورت کردنەوەی کێشەکە ئەڵێم:

(ئەلێکساندەر گلێمان) شانۆگەریەکی ناوداری هەیە بە ناوی (ئێمەو ئەوان) کە ئەویش لە بنەڕەتدا قسە لەسەر گەندەڵی ئەکات، ئیتر نازانم کاك (نەوشیروان) وەها شتێك ئەخوێنێتەوە یا نا تا بە هۆیەوە بکەوێتە جۆرە لێکچوونێکی ئەدەبی لەو ڕەنگە، بەڵام ئەوەی هەیە، ئەوەیە نووسەری ئەم (ئێمەو ئەوان)ە چەشنی نووسەرەکەی لەمەڕ خۆمان دووچاری بیری تەسکی ناوچەگەری نەبووەو واش باس لە (ئێمەو ئەوان) ناکات، ئەگەر لێرەوە بچینەوە سەر باسە ئەسڵی یەکەو بە وردی دەوری بکەینەوە، ئەبینین ئەو نووسینە بە پاشکۆیەك کۆتایی پێهاتووەو هەم بەکارهێنانەوەی ئەو پاشکۆیە لەم نووسینەداو هەم بابەتی ناو پاشکۆکە جێ ی سەرنجەو مرۆڤ ئەخاتە سەر خولیای پرسیارو پرسیارکردنو ناچاری ئەکات هەوڵی دۆزینەوەی گرێ ی پێکەوە بەستنەوەی هەردوولا بە یەکتریەوە بدات، بە گوێرەی قسەی نووسەر ئەم پاشکۆیە کە باس لە (پرۆژە)یەك ئەکات ساڵی (١٩٩٩) نووسراوەو دراوە بە (ئەنجومەنی پلاندانان)ی ئەو کاتو دواتر پشتگوێ خراوەو هیچی لە بارەوە نەکراوە کەچی

دوای تێپەڕبوونی (دە) ساڵ بەسەر ئەو وەزع و باسەداو دوای ئەو هەموو بە حساب

کەدا اندارییانەی بەسەر ئەوان و عێراق و کوردستان و تەنانەت دنیاشدا هاتووە، ئەبینین

ئەو جارێکی تر تازە بە تازە زیندووکردنەوەی ئەو (پڕۆژە)یە لە باس و لێدوانێکی

ئێستادا بەجێ ی خۆی ئەزانێ و وبەکارهێنانەوەی بە پێویست ئەبینێ، بە لای منەوە

ئەو دووبارە کردنەوەیە مانای سیاسی و فیکری خۆی هەیەو پێویستە قسەی لەسەر

بکرێت، ئەگەرچی لە ڕواڵەتدا باسی (پڕۆژە)یەك وەك پاشکۆ لە نووسینەکەدا

هاتووە بەڵام لە ڕاستی دا ئەو (زۆرزانانە) هەموو نووسینەکەی بۆ خزمەتی ئەو

(پڕۆژە)یە نووسیوەو وەك ڕوونکردنەوەیەکی ئەو (پڕۆژە)یەش قسەی لەو بارەیەوە

کردووەو هیچی تر.

بۆیە بە لای منەوە (پڕۆژەکە) بووە بە جەوهەری سەرتاسەری نووسینی (ئێمەو

ئەوان)و وەك تاکتیك لێرەدا جێ ی کراوەتەوە .... بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو

تاکتیکەش حەز ئەکەم ئاماژە بەوە بکەم کەخۆی یاسای نووسین بە هەموو جۆرەکانی

یەوە (واتە لە شیعرەوە تا وتارو ڕۆمان و نووسینی مێژوویی و شتی تر) بەم شێوەیەیە:

تۆ وەك خوێنەرێك ئەبێت بە دوای ئەو قەناعەتە فیکریەی نووسەردا بگەڕێیت کە لە

هەر بابەتێکی نووسیندا هەیەتی تا بزانی ئەو چی ئەوێت و بۆچی مەبەستێك شتێکی

وەهای نووسیووە لێرەشدا ئێمە وەك خوێنەر بەرامبەر بە نووسینی (ئێمەو ئەوان) ئەو

مەبەستە لە باسی خودی (پڕۆژەکە)دا ئەبینیتەوەو لەوێدا بەرنامەیەکی سیاسی و

کۆمەڵایەتی ئەبینین کە بە قەولی نووسەر (فەلسەفەو شێوەی حوکمڕانی)یە بۆ

بەڕێوەبردنی کۆمەڵگای کوردی باشوور..... بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەستە

شاراوەکەش چاك وایە چەند ڕێگەیەك لێرەو لەوێ بگرینە بەر کە هەموو ئەچنەوە

سەر مەبەستە دیارو نادیارەکەی نووسەر ویستوویەتی، لێرەدا من نامەوێت باس لە

دەقی (پڕۆژەکە) بکەم کە خۆی لە خۆیدا بەشێوەیەکی گشتی شتێکی تا بڵێ ی

خەیاڵی یەو لە خەونیشدا نایەتە دی، بەڵام ئەوەی لای من پێویستی بە قسە لەسەر

کردنە ئەو بۆچوونە سیاسی و فیکرە (ئەنتیکە)یەی نووسەرە کە جاران ئەو وەك

خەڵکێکی سیاسیو دواتریش وەك هەڵگرێکی بیری نەتەوەیی خۆی ڕاگەیاندووە
[illegible]ی هەموو سنووری بیروبیرکردنەوەکەشی لە وەها بازنەیەکدا ئەخولێتەوە کە ئەو
بە خەیاڵ لە هەموو زەویدا نیشتمانێکی ئەوێت ناوی کوردستانەو لەوێشدا شارێکی
بەلاوە هەموو شتێکە کە ناوی (سلێمانی)یەو لەو شارەشدا تەنها گەڕەکێکی لا
مەبەستە ناوی (بەرخاناقا)یە کە ماڵی خۆیانی ئامێز گرتووەو (ئەمی) تیادا پەروەردە
بووە.... ئێمە لێرەدا بۆ ئەوەی لەو پڕۆژەیە بگەین پێویستە ئەگەر بۆ
چاوتروکاندنێکیش بێت ژیانی سیاسی نووسەری (ئێمەو ئەوان) بەسەر بکەینەوە تا
لێ یەوە هەقیانەتی کەسێتی سیاسیو حیزبی ئەو بناسینو لەو (شعورە)ش تێ بگەین
کە ئەو (پڕۆژە)یەی پێ نووسراوە بۆ بەدەستهێنانی ئەو مەبەستە ئەڵێن کەسێکی وەك
کاك (نەوشیروان) بەوەها بیرو بۆچوونێکەوە (کە پێشتر ئاماژەی پێکرا) گەورە
ئەبێتو ئەچێتە حیزبێکی سیاسی کوردەوە بە ناوی (پارتی دیموکرات)، لە حاڵێکی
ئەوتۆدا ئەو بیەوێو نەیەوێ چارەنووسی بەو لایەنەوە گرێ ئەدرێت کە بیرو
بیرکردنەوەی (ئەمی) هەیەو دواتر بە باڵی (جەلالی) دژ بە (مەلایی)و پاشانیش بە
(یەکێتی نیشتمانی) دژ بە (بنەماڵەی بارزانی) ناسراو خۆی بە ڕێکخستن کرد .....
لە ساڵانی شەستەکانی سەدەی بیستەمەوە تا بە ئەمڕۆ ئەگات کە نزیکەی چل –
پەنجا ساڵە ئەو (دوو باڵە حیزبی) یە یا ئەو (دوو بنەماڵە)یە هەزارویەك کارەساتی بێ
ئامانو پڕ مەرگەساتیان بەسەر کوردی باشووردا هێناوە هەر لە شەڕی براکوژیو
کورد کوژی یەوە تا کارەساتی ئەنفالو وێرانکردنی کوردستانو هەڵهاتنی دوای
ئاشبەتاڵی (١٩٨٨)و جارێکی تر گەڕانەوەیان بۆ ناو کوردستان بەهۆی شەڕی
کەنداوو ڕاپەڕینی دەستکردی (١٩٩١) لە ڕێی پشت بەستن بە جاشەکانو هاندان
بۆ ڕاکردنی بە کۆمەڵی خەڵکی لە (١٩٩١)داو کەڵك لێ وەرگرتن بۆ پێکهێنانی
گوایە (حکومەتێكو پەرلەمانێك) بە ناوی (هەرێم)ەوە دواتر بلاوکردنەوەی
نەخۆشی دزیو گەندەڵی لە تەواوی کۆمەڵگادا لە ڕێگەی ئەو (حکومەت)ە
خۆیەوەو ئیفلیج کردنی هەستی ئینسانیو نەتەوەی مرۆڤی کوردو هاندانی بۆ

[illegible]ن بەرەو هەندەرانو دواجاریش خەساندنی کۆمەڵگای کوردەواری بە پێی پلانو نەخشەی بەرژەوەندی خۆیانو بەستنەوەی چارەنووسی ئەو گەلە بەرکێفی دەسەڵاتی ئەمەریکیو بەریتانی یەوە کە چارەنووسێکی ڕەشو نادیارە. لە هەموو ئەو کارەساتانەدا کەسێکی وەك کاك (نەوشیروان)یش زۆرجار دەوری کاریگەری بینیوەو بە پێی ویستی خۆیو حیزبەکەی هەنگاوی هەڵگرتووەو دیکتاتۆرێکی بێ ئامانیش بووە، زۆرجار کاری دڵتەزێنو نامرۆڤانەشی ئەنجام داوە ...... لە (پرۆژە)کەشیدا ئەو ویستە زاڵمانەیە دیارەو بە ئاشکرا هەیە، ئەو لە وەها (پرۆژە)یەکدا تەنها شاری سلێمانی بە حکومەتو بە تەواوی کوردستانیش ئەزانیێو چوار پارچە بوونی کوردستانو ژێر دەستەیی کوردو شتی وا لە فەرهەنگی بیرکردنەوەی ئەودا وەك کۆتایی پێهاتبێت وایە، لە پشتی ئەوەشەوە حساب نەکردن بۆ هێزی بەرامبەرو ئیدارەی بەرامبەر لە باشووری کوردستانداو سووربوونی لەسەر وەها بیرکردنەوەیەك ئەوە نیشان ئەدات بەوەی ئەو بنەماڵەیە دوژمنی سەرەکی بیروباوەڕی ئەون.... ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کاك (نەوشیروان) لەهەر بەرەو حیزبو ڕێکخراوێکدا بێت تەنانەت ئەگەر ئەو ڕێکخراوەیەش ڕێکخراوی (مافی مرۆڤ)یش بێت ئەو تا مردن ئەوە بیروڕایەتیو کاری بۆ ئەکات (یەکێك لەو بەڵگانەش هەڵبژاردنی (٢٠٠٩/٧/٢٥) بوو کە بە ناوی گۆڕانەوە ئەوەی کرد کە دیمان) کوردیش خراپی نەوتووە کە ئەڵێ (خوویەك گیرا بە شیری تەرك ناکرێت بە پیری)، کەسێکی وەك کاك (نەوشیروان)یش بە درێژایی ژیانی (ئێستاو داهاتووشی لەگەڵدا بێت) بەو ئەقڵیەتە سیاسیو بەو قەناعەتە فیکریەوە ژیاوەو ئەژیو ئەم (پرۆژە)یەش نموونەی ئەو بۆچوونەیەتی کە ژیانی سیاسیو فیکری خۆی لەسەر بنیات ناوە، ئەمەش قسەیەکی (حەسەنی شیرین)ی ڕەحمەتیم بیر ئەخاتەوە (ئەو خۆشی ئەیناسێت) کە وتبووی: (ئەگەر (مەلا مستەفا)ش واز لە (مەلایی) بێنێتو ببێتە (جەلالی)... من هەر (مەلایی) بوومو هەر (مەلایی)یش ئەبم).

## سێ سەرنج

١-بەهۆی ئەو نووسینەوە لەم بەینەدا کەوتوومەتە خوێندنەوەی کتێبەکانی کاك (نەوشیروان)و تا ئێستا من هیچی ئەوم نەخوێندبووەوە ئەوەی سەرنجم لە خوێندنەوەی ئەو کتێبانەدا ڕائەکێشێت ئەو موقەست وەشاندنە سەیرانەیە کە ئەو هەڤاڵە لە گێڕانەوەی ڕووداو و شتەکاندا کردوویەتی زۆرجار لەبەر دڵی (سکرتێری گشتی) بە دەستی ئەنقەست موقەستی بۆ سەروو گوێ کردنی ڕووداوەکان بەکارهێناوەو چۆنی ویستووە وەهای لێکردووە وەهاش موقەستکاری تیادا کردووە، من تا ئێستا هەستم نەئەکرد کە کاك (نەوشیروان) ئەوەندە کەسێکی سەیر بوو بێت بەڵکو وام ئەزانی گرەوی لە ڕاستگۆیی بردووەتەوە بەڵام بە داخەوە من تووشی بەدحاڵی بوون ببوومو خراپ تێگەیشتبووم.

٢- ئەم نووسینەی من هیچ پەیوەندییەکی بە دەنگدانو هەڵبژاردنەوە نی یەو نامەوێ خەڵك تۆمەتی چەوتم بۆ بهاوێت، هەڵبژاردن ئەکرێ یا ناکرێت بەلای منەوە یەك پوولی قەڵب ناهێنێو ئەوەی خەڵکی باشوور بناسێت ئەزانێ دەسەڵات چۆن هاتووە هەر وەهاش ئەڕواتو گۆڕان بەهاشو هوش پێك نایەت، ئەگەر من دەستم بڕۆیشتایە بێ سێو دوو کردن ئەو(حکومەتۆ)کەیەی هەرێمو (پەرلەمان)ەکەشیم ئەدایە دەست کاك (نەوشیروان) تا بمزانیایە (ئەگەر)ی بێ سەوز ئەبوو یان نا !

٣-لەم ماوەیەدا لە ڕۆژنامە (نابووتەکەی) کۆمپانیای وشەدا بە درێژایی یەکدو ژمارە پیاوە (گرگن)ەکە لەمەشدا هەڵیدایەو دەمی کردەوە بە فەلسەفە لێدان تەنانەت لە بارەی بۆچوونی مارکسیشەوە هەندێك لاژگە لاژگی کرد، پێم وایە لە بیری چوو بوو کە چەند ساڵ لەمەوبەر ئەو ئەهات لەسەر دژایەتی کردنی مارکسیەت خۆی لای دەسەڵاتی حیزبایەتی کورد شیرین ئەکرد کەچی ئێستا فیزی پێوە لێ ئەدات، بۆیە من لای خۆمەوە بەو پیاوە (گرگن)ە ئەڵێم زەحمەت مەکێشە تۆ پیاوی ئەوەنیت باسی مارکسیەت بکەی، چاك وایە بڕۆیت خۆت بە دزیو فزیە ئەدەبیەکانتەوە خەریك بکەیت تا خوا هەقت ئەسێنێو ڕۆژێك لە ڕۆژان پەردە لەسەر تۆش لائەچێت.

سوپاسنامەکان

لەناخی دڵمانەوە زۆر سوپاسی بەڕێزوخۆشەویست

پێشمەرگە. نوسەروڕەخنەگرومێژونوس. سکرتێری "کۆمەڵەی ڕەنجدەران". جێگری سکرتێری پێشوی "ی ن ك". سەرۆکی بزوتنەوەی "گۆران" ی ئێستا : بەڕێز (نەوشیروان مستەفا ئەمین) دەکەین کە لەکاتی چاپکردنی بەرگی یەکەمی (ژیان ونهێنییەکانی نەوشیروان مستەفا) دا. بەهەزاران کەس ڕۆژانە دەچونەلای و قسەی درۆوهەڵبەستراو ناڕەواو چەوتیان سەبارەت بەئێمەو کتێبخانەکەمانیان پێوتبو..... بەلام بەڕێزیان هیچ هەڵوێستێکی توندو ڕەقی بەرامبەرمان نەنواند....بەبێ ئەوەی کە ئێمە لەنزیکەوە بناسێ و بەبێ هیچ ئاگاداریەکی خۆی زۆرێك لە کتێبەکانی ئەومان لەچاپدا... جارێکی تر ڕێزوسلاو خۆشەویستیمان بۆی.

*

سوپاس بۆ هەریەك لە بەڕێزان

کاك حسێن بەفرین کە ڕێگەی بلاوکردنەوەی دو بابەتی خۆی پێداین

دکتۆر حسێن محمەد عەزیز کە ڕێگەی بلاوکردنەوەی بابەتێکی خۆی پێداین

کاك حەمەسەعید حەسەن (بەبێ ئاگادرکردنەوەی خۆی کتێبی "قەڵەم وشمشێر"مان لەم کتێبەدا چاپکردوە)

کاك پشکۆ نەجمەدین (کەلە بەرگی یەکەمی (ژیان و نهێنییەکانی نەوشیروان مستەفا) دا. ناميلکەيەکی بەڕێزيمان چاپکردوە بەبێ ئەوەی ئاگاداری بکەينەوە! سەيرتريش ئەوەبو : بێ لەوەيش لەبيرمان چوبو سوپاسێکی بۆبنوسين!. سوپاسيشی دەکەين کە تاکوئێستا هيچ ڕەخنەوگلەيی يەکی بۆنەناردوين...)

*

سوپاس بۆ

کاکە ڕێبین ی ئەحمەد هەردی.. سوپاسی ئێمە بۆ کاك ڕێبین تەنیا ئەتوانین لەم دێڕەدا کورتی کەینەوەو بڵێین : ڕۆژی هەزارجار بەقوربانی ئەوخۆڵەبم کەبەسەر دەمی تەرمەکەی ئەحمەد هەردی وەیە... ئێمە هەتا مردن قەرزاری ئەو هەناسەیەشین کە ڕۆژانە کاك ڕێبین هەڵی ئەکێشێ....

*

سوپاس بۆ

کاکە ئاسۆس ی ئەحمەد هەردی

کاك شوان محمەد لە ڕۆژنامەی ئاوێنە

کاك کاژاو جەمال لە ڕۆژنامەی هاوڵاتی

کاك ئاوات محمود خاوەنی کتێبخانەی ڕۆژی نوێ

"کاك شوان ئەحمەد

کاك ئازاد بەرزنجی

کاك ڕەوف بێگەرد

کاك دکتۆر شاهۆ

کاك مەریوان ی وریا قانع

کاك ئاراس فەتاح

کاك بەختیارعەلی

کاك شۆڕش جوانڕۆیی"

سوپاسی ئەو بەڕێزانەی کە ناویان لە کەوانەدایە لە کاك شوان ئەحمەدەوە هەتا شۆڕش جوانڕۆیی ... بەومانیە سوپاسیان دەکەین کە خۆشەویستیو ڕێزی ئەوان بو ئێمەیان لە دڵی کاك ڕێبین ی ئەحمەد هەردی دا خۆشەویستکرد.....

کاکە ئاکام جەمال سەرپەرشتیاری کتێبخانەی هاوڵاتی

کاك عومەری چایچی لە چاخانەی شەعب

کاکە فازیل و پەیام ی گوڵ و مەریوانی خۆشەویست و هەورامانی براو هاوڕێم....

بێستون لەگۆڤاری ڕۆشنگەری کە چاوپێکەتنێکی کاک نەوشیروان ی بۆ هێناین لە ژمارە ۹ ی ڕۆشنگەری دا.

کاك سەروەر کەریم کە ئەویش ژمارەیەکی گۆڤاری نڤاری بۆهێناین ئەویش هەر چاوپێکەوتنێکی کاك نەوشیروان ی تیابو.

کاك ئەبوشوان لەحیزبی شیوعی کە بەبێ ئاگادارکردنەوەی خۆی نامیلکەیەکی ئەویشمان لە کتێبەدا چاپکردەوە

*

زۆر زۆر سوپاسی تەواوی ئەو گۆڤارانەیش دەکەین و چاوی یەك بەیەکی ستافەکانیان ماچدەکەین... دەستی ماندوبونیان ئەگوشین... هیوامان وایە کە تەمەندرێژو لەشساغبن و ڕۆژنامەنوسی چالاك و زیرەك و لهاتوتریان تیادروستببێ... جارێکی تر سوپاس بۆ ئێوە هەر لە چاپچیەکانتانەوە هەتا خاوەنی ئیمتیازەکانتان... سوپاس.

*

سوپاسی تایبەتمان بۆ هاوڕێی خۆشەویست و بەڕێز بەڕێز کاکە سۆران عومەر کاکە سۆران عومەر دەکەین لە گۆڤاری ڕێگا مەرکەزێن .

*

سوپاسی تایبەتیشمان بۆ هەردوبرای خۆشەویست و ئازیزی دڵ وچاومان

کاکە ئەبەز گۆران

کاکە عەبدوڵا گۆران

*

زۆرسوپاسی کاکە هێمن کەریم لە گۆڤاری کلیل و لە گۆڤاری فشار...

*

زۆر زۆر لەناخی دڵمانەوە سوپاسی بەڕێز کاك سالار حەمەعەلی مستەفا ئەکەین کە لەبەرگی یەکەمی ژیان و نهێنییەکانی نەوشیروان مستەفادا دیدارێکی بەڕێزیمان لە

کتێبی "کێشەی ئافرەتان وبزوتنەوەی ژنان لەنێوان وەهم و واقیـدا" وەگـرت....
بەڵام لەبیرمان چوبو سوپاسی بکەین... لەباتی جارێك هەزارجارسوپاسـی ئـەین و دوهەزارجاریش داوای لێبوردنی لێکەین... چـونکە غـەدرێکی گـەورەمان لەبـەرزی کرد...

زۆر زۆر سوپاسی براوهاورێی خۆشەویست کاکە زانیارمحەمەد... کە کتێبخانەکـەی خۆی خستۆتە بەردەستمان......

# ژیان و نهێنییەکانی نەوشیروان مستەفا




چاپ و بڵاو کردنەوە
کتێبخانەی جەماڵ عەلی بابە